حكوومەتی هەرێمی کوردستان - عێراق
وەزارەتی رۆشنبیری
21

# ئازادی یا مەرگ

نووسینی:
نیکۆس کازانتزاکیس

وەرگێر:
کەریمی حسامی

ئەنجومەنی وەزیران
وەزارەتی رۆشنبیری
بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و هونەر
لیژنەی چاپەمەنی
بلاوکراوەی ژمارە (٢)

ناوی کتێب: ئازادی یا مەرگ
چاپی کۆمپیوتەر. ١٩٩٣ سوید
چاپی کتێب. ١٩٩٧ کوردستان
مۆنتاژ: ناسر ئیبراهیمی

سەرپەرشتی چاپ: مومتاز حەیدەری

حکومەتی هەرێمی کوردستان ـ عێراق
وەزارەتی رۆشنبیری (۲۱)

# ئازادی یا مەرگ

نووسینی:
**نیکۆس کازانتزاکیس**

وەرگێڕ:
**کەریمی حسامی**

کۆمپیوتەر: ستۆکهۆلم ـ ۱۹۹۳
چاپ: کوردستان ـ ۱۹۹۷

# ڕوونکردنەوەیەک ...

**خوێنەواری خۆشەویست ...!**

لە٣/٣/١٩٩٣دا، نووسەری ناسراوی کورد مامۆستا کەریمی حسامی - دانیشتووی سوید - ئەم شاکارە بەناوبانگەی نووسەرو ڕۆماننووسی مەزنی یۆنانی نیکۆس کازانتزاکیس لەگەڵ نامەیەکی تایبەتی بۆمی ڕەوان کرد، تاکو یەکێتی نووسەرانی کورد لەسەر ئەرکی خۆیان و بە قازانجی خۆیان چاپ بکەن، بەڵام بەداخەوە، باری دارایی یەکێتی نووسەران لە ئاستی چاپ دانی ئەم کتێبە گەورەیە نەبوو، لەتەک هەندێ هۆی لاوەکی.. بەهەرحاڵ، لە ڕێکەوتی ١/٢/١٩٩٧دا، دووبارە نامەیەکی دیکەی بۆمی ڕەوان کرد، تێیدا داوای ئەوەی کردبوو، بەهەرچۆنێک بێ، پێی خۆشە لە کوردستان چاپ بکرێ، منیش ڕێکەوتی١٨/٢/١٩٩٧، باسی ئەم مەسەلەیەم لەگەڵ بەڕێز مامۆستا فەلەکەدین کاکەیی وەزیری ڕۆشنبیری کوردستان بە ئامادەبوونی، بەڕێز مامۆستا عەبدولکەریم فندی بەڕێوەبەری ڕۆشنبیری و هونەر کرد.. بۆ مێژوو دەڵێم بەڕێز مامۆستا فەلەکەدین یەکسەر پەسندی کردو مامۆستا ع. فندی ڕاسپارد بۆ جێ بەجێ کردنی ئەوە لە سایەی کابینەی سێیەمی حکومەتی کوردستان و وەزارەتی ڕۆشنبیری کوردستان، شاکاری ئەدەبی و شۆڕشگێڕی نیکۆس کازانتزاکیس بە شانازی یەوە کەلێنی ڕەوای خۆی لە کتێبخانەی کوردی دەگرێتەوە.. لێرەدا هیواخوازین مامۆستا کەریمی حوسامی لەش ساغ و تەمەن درێژ بێ، تاکو زیاتر کتێبخانەی کوردی دەوڵەمەند بکات.. ئەوەی شایانی باسە، مامۆستا کەریم حسامی بەدەیان کتێبی نووسراو وەرگێراو پێشکێشی کتێبخانەی کوردی کردووە.

**سوپاس بۆ دڵسۆزو هەمخۆرانی**
**ئەدەب و ڕۆشنبیری کورد**

**مومتاز حەیدەری**
**١٩/٢/١٩٩٧**
**هەولێر/ کوردستان**

# چەند وتەیەک

ئەم چەند دێڕە نابێ بە پێشەکی ئەم رۆمانە شیرینە حیساب بکرێ، چونکە هەرچی من بە ناوی پێشەکی نوسیبام. نە دەگەیشتە یەک لە سەدی ئەو پێشەکیە کە بە رێز کاک محەمدی قازی بۆی نووسیوە.هەر وەها نەشیدەتوانی ئەم تابلۆیە نیشان بدا کە نووسەر بە قەلەمێکی سیحراوی، ئەڤین و جوامێری و خەسیسی و دڵرەقی و دلاوالەیی وفیداکاری مرۆڤی تێدا نەخشاندوە.

بەڵام من بۆ چی دەگۆ وەرگێڕانی راچووم و ئەوەندەی لە توانامدا هەبوو بە کارم هێنا کە رۆمانێکی رەسەنی یەکێ لە نووسەرە هەرە بە ناوبانگەکانی بێگانە بکەم بە کوردی و بیخەمە بەر دەستی خوێنەرانی بەرێزی نەتەوەکەم.

یەکێ لە زانایانی فەلسەفە دەڵێ: هەموو بەرهەمێکی ئەدەبی و کولتوری و سیاسی و...بە مەبەست و ئامانجی تایبەتی دێتە بەرهەم. خوێنەر پێویستە لە گەڵ خوێندنەوەی بەرهەمەکە لە ئامانج و مەبەستی نوسەر و یا وەرگێڕ شتێک هەڵگرێ، لێوردبوونەوەو تێگەیشتنی ئەم نوکتەیەش پێویستەو خوێنەر لە تێڕوانین و بەسەردا رۆیشتنی رەمەکی و بە پەلە دەباتە قولایی دەریای بیرو هەڵێنجان و لێکدانەوە.

کاتێ ئەو رۆمانەم لە ماڵی برادەرێک دیت، هەر لە سەرەتاوە وشەی [ ئازادی یامەرگ} کە دروشمی شۆڕشگێڕانی راستە قینەیە بۆ لای خۆی راکێشام. داوام کرد بە ئەمانەت وەری بگرم.دنیایەک سوپاس بۆ خوشکە سوهەیلای ماملێ، کتێبەکەی بە ئەمانەت دامێ، بەو شەرتەی بۆی بنێرمەوە. ئێستاش دوای تەواو کردنی وەرگێڕانی بە سوپاسێکی بێ پایانەوە بۆی دەنێرمەوە.

دەستم کرد بە خوێندنەوەی. وەک میقناتیسی پێوەبێ بەدوای خۆیدا راپکێشام و نەمدەتوانی وەلای بنێم. لە نێوئاخنی کتێبەکەدا شوێنی شوێن و رووداو وزەلامی ئەوتۆ دەبووم، دەمبا لە کوردستانم. رووداو وکارەساتگەلی کوردستانم دەهاتەوە بەر چاو و خۆم لە نیشتمانی داگیر کراودا دەدیتەوە. بۆ جاری دووەم دەستم کرد بە خوێندنەوەی. هەستێک هانیدام کە بیکەم بە کوردی.

بەڵام ئەم هەستە لە نێوان بارستایی و قەبەیی کتێبەکە و نە بوونی دەرەتانی چاپ و بڵاو کردنەوەی دا، قەتیس مابوو. ئاخرەکەی پارسەنگی قورس بەلایەکەی دووەمدا کەوت، ناوی خودام لێهێناو ئاشتەراتم بڵێم وەرم گێڕاوە، بەڵکوو بە گوێرەی توانا بە ئەمانەتەوەکردوومە بە کوردی.

کریت دوڕگەیەکە وەک کوردستان لە لایەن تورکی عوسمانیەوە داگیر کراوە. ئەو پاشایەی لە ئەستەمبوڵەوە بۆ سەرکوتکردنی خەڵک ناردوو یانەتە کریت، بۆ کوردستانیشیان ناردوە. خەڵکی

کریت نه‌چوونه ژێر بار، ساڵه‌کانی ۱۸۲۱.۱۸۳٤، ۱۸٤٤، ۱۸٥٤، ۱۸۸۸ دژی ده‌سه‌لاتی ئیمپراتوری وه‌سمانی راپه‌ڕین. کوردستانیش خه‌بات و راپه‌ڕینی که‌متری به خۆوه نه‌دیوه. راپه‌رینه‌کانی: ,« عبدالرحمان پاشای بابان[۱۸.٥] ،محه‌مه‌د پاشای ره‌واندزی = میری کوره =[۱۸۱٤]، به‌درخان پاشا[۱۸٤۲]، یه‌زدان شێر[۱۸٥٥]، شێخ عوبه‌یدولای نه‌هری[۱۸۸.] شێخ مه‌حمودی نه‌مر[ ۱۹۱۹- ۱۹۲۳]، سمکۆی شکاک[۱۹۲۱] شێخ سه‌عیدی پیران[۱۹۲٥]، شۆرشی ئاراوات[۱۹۳.]، راپه‌ڕینی ده‌رسیم[۱۹۳۷]، کۆماری کوردستان له مه‌هاباد[۱۹٤٦]، و راپه‌ڕینی بارزان و ئیلول و..دیمه‌نێکی رێکچووی کریت و کوردستان به خوێنه‌ر نیشان ده‌ده‌ن.جێگای سه‌رنجه هێندێ داب و کاراکتێر و بیرو بۆچوون و فیداکاری ڕێکچووی ئه‌م دوو میلله‌ته له رۆمانه‌که‌دا خۆ ده‌نوێنن.

« له‌بری [ رێبه‌ری پیرۆز] له تابوتێکی داردا به ده‌رمه‌ر رۆکێش کرابوو. مه‌زاری به رده‌که کون کرابوو موسڵمان پاره‌یان تێداویشت و داوایان له پیری‌پیرۆز ده‌کرد که له دنیاو قیامه‌ت کاریان راست بێنێ»

له کوردستانیش سه‌دان چاک ویری [redacted] به‌ردیان له ده‌وری کۆکراوه‌ته‌وه‌و داریان له سه‌رچه‌قاوه و به‌رزو پالیان پێوه هه‌لاوه‌سیوه [redacted] ، ده‌چنه سه‌ریان و داوای مرادو مه‌قسودیان لێده‌که‌ن.

« خه‌لیفه له‌به‌ر خودای ده‌پاراوه و ده‌یگوت: «ئه‌ی خودای من تاکه‌ی ؟ تا که‌نگێ ده‌بێ خوێنی کریتی‌یان برژێ، ئاخر ئێمه‌ش گیان له‌به‌رین تاکه‌نگێ؟ پاشان خه‌لیفه روو له خه‌ڵک ده‌کاو ده‌ڵێ: « رۆڵه خۆشه‌ویسته‌کانم خودا له گوناحاتم خۆشبێ، من واز له موسیبه‌تی مه‌سیح دێنم و بیر له کریت له نیشتمانم ده‌که‌مه‌وه.»

له کوردستانیش هه‌زاران ده‌ست به‌ره‌و ئاسمان به‌رز ده‌بنه‌وه و له به‌ر خودا ده پارێنه‌وه‌و ده‌ڵێن تاکه‌نگێ؟ خودایه تا که‌ی کورد ده‌بێ هه‌ر ئاوا ژێر ده‌ست و به‌شخوراو بێ و وه‌لامی داخوازی ره‌وای به کوشتارو گولله بدرێته‌وه؟ به‌لام زۆر له مه‌لاکانی کورد به پێچه‌وانه‌ی خه‌لیفه‌ی خاچپه‌رستان بۆ ئه‌وه‌ی بیر له کوردستان و نیشتمانیان بکه‌نه‌وه [redacted]

« هاریلاتوس له ره‌وه‌ندی شۆرش دا سه‌روه‌تێکی زۆری وه‌سه‌ر یه‌ک نابوو.ئه‌و گواره‌و ئه‌نگوستیله‌و به‌ردی به قیمه‌ت و ملوانکه‌و سکه‌ی عه‌تیکه‌ی به قیمه‌تی هه‌رزان له فه‌قیرو هه‌ژار و موحتاجان کریبوو، سندوقی له جه‌واهیرو ئاڵتون پر کرد بوو.»

له کوردستانیش هاریلاتوسی وا زۆرن که له ره‌وه‌ندی شۆرشدا به فرۆشتنی چه‌ک و که‌ره‌سه‌ی شۆرش و به دزی و راووروت سه‌روه‌تیان وه‌سه‌ر یه‌ک ناوه. ته‌نیا فه‌رقێکی له‌م بواره‌دا دێته به‌رچاو ئه‌وه‌یه که هاریلاتوسی کازانتزاکیس کابرایه‌کی سوتخۆری ده‌ستبڕی پیسی چاو چنۆک بوو، به‌لام هاریلاتوسه‌کانی کوردستان زۆربه‌یان فه‌رمانده‌و به‌رپرسی حزبی و پێشمه‌رگه‌و کاربه‌ده‌ستی شۆرش و سه‌رۆک جاش بوون.

«له کۆلانه ته‌نگه‌کان و گه‌ره‌که دووره که‌وتوه‌کان په‌نابه‌راتی کریتی مات و بێده‌نگ له حه‌ساری مه‌دره‌سه چۆله‌کان و عه‌مبارو کاوله‌کان بۆ ئه‌وه‌ی هیچیان هه‌بێ له سه‌ر عه‌رزی

دادەنیشتن و بە سەر یەکدا دەکەوتن.یونان ئەو دایکە خەفەتبارە لە زاری خۆی دەگێڕاوە تا خواردەمەنی بدا بە کریتیە برسی‌و لێقەوماوەکان. تەنانەت پیاوەکانی هەرە لەچەریش زاری کیسەیان ئاواڵە دەکردەوە...»

بۆچما کوردستانیش وانەبوو؟ کوردستانی رۆژهەلاّت ئامێزی بۆ برا پەنابەرو لێقەوماوەکانی کوردستانی خواروو ئاواڵە نەکرد بۆوە.؟ ماڵ و مزگەوت و مەدرەسەی شارو دێهاتی کوردستانی رۆژهەلاّت لە هەرتک کارەساتی ۱۹۷۵ و ۱۹۹۰. نەکرا بوون بە مزڵ و ماڵ و پەنای کوردە لێقەوماوەکان؟ چما خەڵک بۆ یارمەتی برا ئاوارەکانیان هیچ دریغی کردبوو؟ تا ... بێگومان یونانیش هەر ئەوەندەی یارمەتی پەنابەرانی کریتی داوەو بەڵکوو کەمتریش. تەنیا فەرقێکی چکۆڵە لەم ناوەدا خۆدەنوێنێ. ئەویش ئەوەیە پێم وانیە کریتیەکان ئاوایان پاداشی یونانیەکان دابێتەوە !

« ... خوێندن بە کاری چی دێت؟ ئەوەندەی پێت دەکرێ مەهێڵە منداڵەکانت بخوێنن. کریت بە تفەنگ ئازاد دەبێ...»

لە کوردستانیش واهەبوە لە گەڵ خوێندن و خوێندەواران و رۆشنبیری و رۆژنامە بەربەرەکانی کراوە. بە چاوی سوک سەیری روناکبیرو خوێندەواران کراوە.

« ... کریت پارونکی چەور ونەرمە . دەولەتە گەورەکانی دنیا ئێستا بەرژەوەندی خۆیان لەوەدا دەبینن کە ئەم پاروە دە قاپی سوڵتانی دابێ. .... ئێستا هەر یەک رێگا هەیە، ئەویش ئەوەیە لە گەڵ سوڵتان وتوویژ بکەین. شتێکی زیاتر وەربگرین. دیارە ئەوە هەمو ئێسکێکە دەیهاوێنە پێشمان. بەلاّم بروکە گۆشتێکی پێوەیە پێویستە تا بە ئازادی دەگەین بیلیسینەوە...»

ئەم جۆرە باس و دەمەتەقەیە لە کوردستانیش کەم نەبوەو لەوانەیە ئێستاش هەر جێگای باس بێ.پێویست نیە هەموو دیاردەو رووداوە وێکچوەکانی ئاوودۆخی کوردستان و کریت کە لە رومانەکەدا خۆ دەنوێنن باسبکرێن. خوێنەری بەرێز دە چەند لوڵایی نێو ئاخنی رومانەکەو چێژی لێ وەر دەگرێ. ئەوەندە هەیە وێکچوونی گەلێک شوێنی باروودۆخی کریت و کوردستان، لە گەڵ چێژی قەڵەمی سیحراوی کازانتزاکیس و وەرگێڕانی رەوان و شیرینی کاک محمدی قازی بوونە هۆی پاڵپێوە نەری هەرە گرنگی من لەم کارە دا. ئەوە کوردیەکەشی لە بەر دەستی خوێنەرانی بەرێز دایەو لە هەڵەو ناتەواوی و ناڕەوانی و کەمو کوڕی داوای لێبووردن دەکەم .

دەمەوێ پڕ بە دڵ سوپاسی کاک ناسری ئیبراهیمی، کاک مومتاز و کاک حەمەدەمینی سیراجی بکەم کە لە نووسین و ئامادە کردنو پێداچوونەوەی ئەم کتێبەدا یارمەتیان داوم.

کەریمی حسامی ... ۲۱ دیسامبری ۱۹۹۲.

# پێشەکی وەرگێڕی فارسی

نیکۆس کازانتزاکیس Kazantzakis یەکێک لە ڕوخساوە هەرە پرشنگدارەکانی ئەدەبی سەردەمی یونانە کە لە ساڵی ١٨٧٣دا لە شاری کاندی(هراکلیونی پێشوو) ناوەندی دوورگەی کریت هاتۆتە دنیاوە، سەردەمی منداڵی لە جەنگەی شەڕەکانی نیشتمانی کریتی لە گەڵ داگیرکەرانی عوسمانی ڕابواردوە و نیشتمانپەروەری قارەمانانی ئەو شەڕانە وەهایان کارکردۆتە سەرئەم نووسەرە گەنجە کەلەگشت نووسراوەکانی‌یەتایبەت لە «ئازادی یا مەرگ»دا ڕەنگدەدەنەوە.

لە گەنجایەتی‌دا لە ئاتێن خەریکی خوێندنی زانستی حقوق بوو، پاش وەرگرتنی دیپلۆمی دوکتورا لە حقوقچووە پاریس ولە لای هانری بیرگسون(H.BErGSON) فەیلەسوفی فەرەنسەیی‌خەریکی‌خوێندنی فەلسەفە بووەوەها کە«بیرگسون» و «نیچە» کاریان کردۆتە سەر ڕوانگەی فەلسەفی ئەو. پاشان لە ئەڵمان و ئیتالیاش چوار ساڵ خەریکی خوێندن بوو لە ئەدەبیات و هونەرە جوانەکان‌دا. وردە وردە دەستی کرد بە نووسینی بابەتی ئەدەبی (ڕۆمان و نومایشنامە). ١٩١٢-١٩١٣ لە شەڕەکانی بالکان‌دا چۆتە خزمەتی نیزامی. دوای شەڕ، لەگەڵ یەکێک لە دۆستەکانی بە ناوی «گیۆرگ زۆربا» کە ئیلهامی ڕۆمانی بە ناو بانگی «زۆربای یونانی» لە ژیان و خصوصیاتی ڕوحی ئەو وەرگرتبوو، خەریکی دەرهێنانی کانگا بوو، چونکە لەم کارەدا سەر نەکەوت، بوو بە هەواڵدەری ڕۆژنامەیەکی ئاتینی.

پاشان سەردەمی سەفەرەکانی دەست پێکرا. گەلێک وڵاتی‌وەک: ئەسپانیا، ئینگلیستان، ڕوسیا، میسر، چین و ژاپۆن گەڕا. دەکرێ بگوترێ کە چونیەتی حاڵی کازانتزاکیس لە چۆنیەتی سەفەرەکانی‌دا کورت دەکردێتەوە. کاتێک لە چین و ژاپۆن گەڕاوە کتێبی «باخە بەردەکان» و پاشان «ئۆدیسە»ی نووسی. ڕۆمانە گەورەکانی. بێجگە لە «زۆربای یونانی» هەموویان پێوەندیان بە دوا ساڵەکانی تەمەنیەوە هەیە. لە ساڵی ١٩٤٥دا چووە نێو سیاسەت و بۆ ماوەیەکی کورت بوو بە وەزیری فەرهەنگی یونان، بەڵام زوو کشایەوە تا جارێکی دیکە بگەڕێتەوە ئامێزی کاری خۆشەویستی کە نووسەرییە. لە ساڵی ١٩٤٧ بوو بە ڕاوێژ کەری ئەدەبی یونیسکو لە «ئانتیب»، شاری بچوکی فەرانسە لە نیزیک «نیس» لە قەراخ «کوت دازور» جێگر بوو. ساڵی ١٩٥٧ لە ئەڵمان کۆچی دوایی کرد و لە نیشتمانەکەی «کریت» بە خاک ئەسپێرا.

شوێنەوار و بەرهەمەکانی ئەو لە بابەتی جۆر بە جۆرەوە زۆرن. وەک فەلسەفە، سەفەرنامە، نومایشنامە و ڕۆمان لەوانەیە گەورەترین شوێن پەنجەی ئەو، بێجگە لەڕۆمانەکانی خەیالی‌بەرهەمێکی شیعری‌یەلە بارەی ڕووداوی < ئۆدیسە> کە لە ڕاستی‌دا کلکە و تەواوکەری ئۆدیسەی «هۆمێر» شاعیری کلاسیکی یونانی‌یەو لە ٣٣ هەزار شیعر پێک هاتوە.

لە شوێنەوارەکانی ئەو لە بواری شیعردا :«مارو گوڵی هێرۆ»(١٩٠٦)- لە بواری‌نووسراوە کانی لێکۆڵینەوەیی: «لە سەفەردا»(١٩٢٧) و «باخی بەردەکان» - لە بواری‌درام‌دا «نیسە

فورتکاس» و «ئولیس» و «مەسیح»(١٩٢٨) و «ملیساتره»(١٩٥٣)- لە بواری رۆمانەوە «زوربای یونانی»(١٩٤٦) و «مەسیحی دووبارە چوارمیخەکراو »(١٩٥٤) و «ئازادی یا مەرگ»(١٩٥٦) و «ئاسیز،هەژار»(١٩٥٧)دەگری ناو ببرێن.

پاش خوێندنەوەی کتێبەکانی «ئەوینی یونانی» و «مەسیح» «دووبارە چوارمیخە کێشراو» و هێندی شرێنەواری دیکەی، زۆر کەس لایان وایە کە کازانتزاکیس نووسەرێکە بڕوای بە دینی مەسیح هەیە. لە کاتێکا ئەم خەیالە زۆر راست نیە. ئەو جاروبار هێندیجار لە یەک دەمدا هەم مەسیحی بووە و هەم بێدین، هەم ئازادەچی بووە و هەم ئینسان دۆست، ئەویش وەک ئیلگریکۆ EL- GRECO نگارکێشی گەورەی یونانی پێوەندی بە هیچ مەکتەبێکەوە نیە و خۆشی بناخەدانەری هیچ مەکتەبێک نیە. بەر لە هەموو شت کریتییە. خەسلەتی گیانی ئەو، خەسلەتی گیانی خەلکی کریتە.

* * *

بە گەنجیەتی سوسیالیست بوو. لە سەفەری روسیادا لە رادە بەدەر بوو بە موخلیسی لینین. لە نیشتمانی خۆیدا زۆرجار بە تاوانی بیروباوەری ئازادیخوازانە کەوتە بەر ئازارو راونانی حکومەتە کۆنەپەرستەکان و دوورخرایەوە. سالی١٩٢٥ لە وەلامی ئەو بوختان و تۆمەتانەی کە ناحەزانی کۆنەپەرست و روناکبیر کە بە ئازادەچییان دەزانی، سپارەیەکی دیفاعی نووسی بە ناو ونیشانی «ئاپۆلۆژی» کە خاتوون «ئالنی کازانتزاکیس»ی خێزانی لە ئاخری ئەو کتێبەدا کە لە بارەی مێردەکەی نووسیویەتی، هێناویەتەوە. ئەم سپارەیە کە لە کریت نوسراوە فرە سەرنج راکێش و فێرکەرە.

بەتایبەت لەم روانگەوە کە شێوەی بیروباوەری سیاسی ئەم نوسەرە مەزنە بە جوانی روون دەکاتەوە. گێرانەوە هێندی بەشی لەم پێشەکیەدا بێ فایدە نیە. دەنووسێ:

«لەوەلامی ئەم بوختانەی بۆ منیان هەلبەستوە ، بە پێویستی دەزانم لە چەند وشەیەکدا شێوە بۆچوونی خۆم لە مەسەلەی کۆمەلایەتیدا روون بکەمەوە:

١- ئەمرۆ دنیا لە قۆناخە مێژوویەکاندا لە کام قۆناخدایە؟

٢- ئەرکی من و هەر تاکێکی دیکە کامەیە؟

پاشان لە روونکردنەوەی مەسەلەی هەوەلیاندا کە خلەی بیروباوەری ئەوە ئاوا دەلێ:

ئەلف- بە تەواوی دلنیام کە کۆمەلی بۆرژوازی لە ئێستادا لە حاست چارەسەرکردنی پێویستیەکانی زەمانی و نەهێشتنی نیگەرانیەکان کۆمەلی مرۆڤایەتیدا ،دا ماوە و دەستە دوستانە.

- لە بارەی ئابووریەوە بورژوازی لە سەر ریکخراوی تاکیی بەرهەم هێنان، واتە لەسەر بناخەی دزی و دابەشکردنی ناعادلانەی سەروەت دامەزراوە.

- لەبارەی کۆمەلایەتیەوە، هیچ ئەخلاقێک لە ئارادا نیە کە پێوەندی نێوان ئینسانەکان پشت بەو ببەستن.

- لە بارەی سیاسیەوە، چینی دەسەلاتدار بە گوێرەی بەرژەوەندی خۆی و بە خەرجی زۆربەی تاکەکانی میللەت سیاسەت بەرێوە دەبات و هەر گۆرانێک لە دەزگایەکان و لە

کاربەدەستەکانی‌دا بێ ناکام دەبێ.

«لە سیستمی بورژوازی‌دا ئاوات و ئامانجێکی بەرزی ئەوتۆ نیە کە بتوانێ تێکۆشانی تاکەکانی ولات رێک بخا و بۆ لایەکیان رێنوێنی بکا کە بە ئازانجی گشت تاکەکانی کۆمەل بێ و گیانێکی شەرەف و بەشەر دۆستی وەبەرنێ. هەروەها ئیمان، یانی بڕوانێکی بالاّ سەری هزیەکانی تاکەکەسی لە گۆری‌دا نیە کە ئاهەنگی بیروباوەر و هەست و کردەوەی ئینسانەکان لە رادەیەکی پارسەنگ‌دا رابگرێ.» .وئێمە ئەمڕۆ لە بەرامبەر خۆمان‌دا شانۆیەک دەبینین کە عادەتەن لە کۆتایی تەواوی شارستانیەتە جۆر بە جۆرەکانی مرۆڤایەتی‌دا، لەسەردەمە جیاوازەکان‌دا دیتراوە.یەک چین کە لە سەرەتاوە روحانی و موغەکان، پاشان ئەمیرو خان و سەرەک عەشیرەت و بورژوازەکان، هاتوون و دەسەلاتیان گرتۆتە دەست و نەزم و دەسەلاتی پێش خۆیان تێکداوە. پاشان ماوەیەک کە ئەم چینانە تووانایی لەرازو نشیو دەبین، چینێکی دیکە دێت و چینەکەی پێشوو وەلا دەنیت. ئەمەیە کە بە ئاهەنگ یا پارسەنگ،ر یا بە جولەی دەماری مێژوو ناو نراوە .

بورژوازی‌کە دەرەبەگایەتی وەلاناوە، لەسەردەمی دەسەلاتداری خۆیدا ئەوەندەی بۆی گرابێ لە باری چەندی‌و چۆنی هەوێنی داوە بە فیکر و هونەر و زانست و کاری ئینسانەکان.بەلاّم ئێستا بە شێوەیەکی لە پارێزراو نەهاتوو سەرەو ژێر دەبێتەوە. ئێمە ئێستا لە سەردەمی ئەم سەرەوژێر بوونەوەیەدا دەژین.هەربۆیەش بینینی‌لایەنی باشی یەتی و بەرەو روو بوونی بۆ ئێمە دژوارە.بەلاّم ئەم خلۆر بوونەوەیە، یا ئەم ترانەوەیە ئەوەندە خێرایە کە بورژواکانی هەرە پێست ئەستووریش وردە وردە ترسیان لێ پەیدا دەبێ.

«لە کۆمەلی مرۆڤایەتی‌دا دوو چەشنە پلو پای روونو دیار بەرچاو دەکەوێ:

١- هێندێ هەولْ دەدەن تا بە خەبات دژی هەموو جۆرە بیرو کردەوەی موخالیفیان‌واقعیەتی دنیای بورژوازی بپارێزن.

٢- هێندێکی دیکەش هەول دەدەن تا نەزم و سیستمی بورژوازی بڕوخێنن و لە جێگای ئەو نەزمێکی بە قسەی خۆیان بەراستی دادپەروەرانەتر و راست‌تر دابمەزرێنن.

دەستەی هەوەل، واتە خۆپارێزەکان، دەسەلاتیان بە دەستەوەیە و مالی خۆیانە و ئەرکی سەرشانیانەلە ئیدەئۆلۆژی و بەرژەوەندی خۆیان بەرگری بکەن. ئەم دەستەیە چوونکە یاسای مسۆگەری «پەیدا بوون» و «هەلْدان» و «فەوتان» قبول ناکا، هیوا دارە کە موجیزەیەک رووبدا و بۆ هەوەلین جار لە مێژوودا چینی ئەوان بۆ هەمیشە لەسەر کورسی دەسەلاّت رابگیرێ. لەگەل ئەوەش تا ئەمڕۆ مێژوو لەت شتی‌وای نشان نەداوە کە سابیتی بکا هەولْ و تەقەلای ئەوانیش تا سەر ناکامی دەبێ. چونکە ئەگەر وابایە ژیان لە شکلی کەم و کۆری سەرەتایی خۆی‌دا گۆرانی بەسەردا نەدەهات.

واباشە ئەم قسە بەناوبانگەی «گوریە» وەبیر خەینەوە کە دەیگوت: «کاتێک خوا ویستی دنیا دروست بکا. مەلائیکە خۆپارێزەکان هاواریان لێ هەستا و گوتیان خوایە دەست لە ساختمانی دنیا مەدە. بەلاّم خوا گوێ نەدانێ و ئێستاش کە ئێستایە گوێ‌یان ناداتێ».

«بەلاّم کام چینە کە جێگای چینی بورژوازی دەگرێتەوە؟ من بڕوای تەوام هەیە کە ئەوە چینی

کرێکاره. ئەم چینە لە قوناغی هەوەڵی سەردەمی پەیدا بوونی خۆیدا کە «نەوع دوستی‌یە» واتە لە خوانی [پلە] یەک تێ پەڕیوە، بەو مانایە کە ئیتر وەک سەدەی پێشوو هیوای بە کەرەمی دەوڵەمەندان نیە و داوای خێر و سەدەقەش ناکات. لە قوناغی دەوهەمیش کە «دادپەروەریە» واتە لە خوانی دوهەم تێپەڕیوە، و بە دوای ئەوەشەوە نیە کە مانای ئوسولی حقوقی بورژوازی تێ بگا و ئەوی بکاتە نموونەی پێوەندی‌یە کۆمەلایەتی و تاکەکانی خۆی. ئەو ئێستا لە سەردەوانەی قوناغی سێهەم واتە خوانی سێهەم دایە و دڵنیایە کە دەسەلات دەگرێتە دەست، چونکە ئەمە، جەبری مێژووە.

«ئێمە ئێستا لەسەدەمێکی قەیرانیی مێژووی مرۆڤ داین کە چینێک بە هەموو توانای رواڵەتی خۆیەوە لە رووخان دایە و بناخەکانی ئەلەرزن. ئەم چینە پارسەنگی غەریزەیی خۆی لەدەست داوە و لە حالی لێک بلاو بوون دایە، چونکە ئیتر بروای بە هیچ نیە.

«هەر لەم کاتەدا چینێکی دیکە لە حالی پەیدا بوون دایە، بەلام دامەزراوەیەکەی هێشتا تەواو نیە. ئەم چینە هێشتا تەواو روون نەبۆتەوە و هێشتا ئەوەندەی شعور نیە کە هەست بە دەسەلاتی هێزی خۆی بکا. ئەو هێشتا کۆیلەیەکی بەردەستەو لە تەقەلای ئازادی دایە».

«نرخە قەدیمیەکان ئەو بروایەی کە بوو هێزی پتەو بوون و مانەوەیان و کێش و مانایەکی پێ دەبەخشین لە کیس‌یان چوە. بایی‌یەکانی تازە، هەمیشە لە حالی گۆڕان و پێ گەیشتن‌دان و هێشتا شکلێکی سابیتیان نیە.

بێگومان تراژێدی سەردەمی بە ترس، کە ئێستا ئێمە تێی‌دا دەژین هەر لەوەدایە کە چینێک دەگوێزرێتەوە بۆ چینێکی‌تر».

«دوو رووداو، ئەو ترسەیان بە سامتر کردوە کە بورژوازی لەگەلی رووبەروە.

١- بۆ هەوەڵین جار لە مێژوودا، ئێمە دەبینین کە کارێکی لە یاسا بەدەر روودەدات: بەو مانایە کە هەر پێنج قارەی کورەی زەوی، ئەمڕۆ لە جولانەوەیەکی تێکرایی‌دا بەشدار دەبن. بۆ هەوەڵین جار لە مێژوودا تەواوی خەڵکی سەر زەوی دەبن بە خاوەنی یەک وێژدان و تەواوی رەگەزەکان لە سپی و رەش و زەرد، بۆ یەک مەبەست رێک دەکەون، رووخانی شارستانیەتی یونان و رۆم، لەبەرامبەر ئەو کارەساتەی کە بۆ بورژوازی روو ئەدات، بە مەسەلەیەکی بچوک و ناوچەیی دەژمێردرێ.

٢- رووداوی دیکە کە ترسی بۆ بورژوازی بە سام‌تر کردوە، مەسەلەی وەخەبەر هاتنی نەتەوەکانی ئاسیایی و ئافریقایی‌یە ئوروپایی‌یەکان بۆ ئەوەی میللەتەکانی ئاسیا و ئەفریقا بکەنە گۆشتی دەمی تۆپ و لەشمەرەکانی نێو نەتەوەیی‌دا کەلکیان لێ وەرگرن، وێژدانی نەتەوەیی‌یان تێدا وەخەبەر هێنان و قەولیان پێ‌دان کە دوای شەر و سەرکەوتن ئازادی و سەربەخۆیی ئەوان بەرەسمی دەناسن. بەو مەبەستە چەکداریان کردن، و فێریان کردن کە چۆن شەر بکەن و ئوروپایی‌یان بکوژن. پاشان بۆماڵی‌خۆیان گەڕانەوەو دوای شەرو سەرکەوتن بەڵێنەکانیان نەبردە سەرو بە ناچارتەواوی موستەعمەرەکان راپەڕین و داوای سەربەخۆیی‌یان‌کرد ولەبەرامبەر ئەم حەقیقەتە گەورەی جیهان‌دا، حەقیقەتێکی بچوکی جیهانیش هەیە ئەویش بوونی نەتەوە بچووکەکانە. با بزانین پێوەندی نێوان ئەم دوو حەقیقەتە چی‌یە؟ هێندێ ئێژن پێوەندی گەلێکن، زۆرن. دەڵێن

گەلاڵەی خەباتی چینایەتی لە وڵاتانی بچووکی پەرە نەگرتو، وەک وڵاتانی گەورەی سەنعەتی روون و دیار نیە. زۆر لە وڵاتانی بچوک تازە لە ژێر باری ئیستعمار هاتونە دەر و سەربەخۆ بوون. لەم وڵاتانەدا بورژوازی هێشتا لە هەموو دەرەتانێکی خۆی کەلکی وەرنەگرتوە. کرێکاران و رەنجبەری مەزراو کشت و کاڵیەکان کەمن و زۆربەشیان نەخوێندەوارن و هەڵدانی بیریان نیە. کەوابوو لەم وڵاتانەدا خەباتی چینایەتی مانای نیە. ئەگەر هەر یەک لەم وڵاتانە لە دنیا جیابان و بە تەنیا ژیابان، منیش بڕوام دەکرد کە چەندە سەدە ئەم پێک هەڵپرژانەی نێوان چینەکان رووی نەدەدا. بەڵام ناکرێ لەم‌سێ ئەسڵەخافڵ‌بی.

یەکەم- ئەمرۆ هیچ وڵاتێک ناتوانێ بە تەواوی لە دنیا جیابێتەوە و بە تەنیا بژی. هیچ هێزێکی مرۆڤایەتی لە توانای دا نیە بیر لە سنووری جوغرافیایی‌دا تەنگە بەر بکا.

دوهەم- وڵاتە گەورەکانی سەرمایەداری و پێشکەوتوو ئێمە بۆ جەغزی قازانجی ئابووری خۆیان رادەکێشن و هەموو رۆژێ باری قورسی چەوسانەوە کە شکڵی ئیستعماری هەیە لە سەرشانی میللەتەکانی لاواز زیاتر دەکەن. جانەوێ و نەمانەوێ ، ئێمە بە عەرابەی سەرمایەداری ئورووپا و ئەمریکاوە بەستراوینەوە. تەواوی مەسەلە ئابوورییەکانی ئەوان لە لای ئێمە خێرا رەنگ ئەداتەوە. بەچەشنێک کە هەر تاگرێکی ئەوان بیکەنەوەوە، دووکەڵەکەی دەچێتە چاوی نەتەوەکانی کزو بێ دەسەڵاتەوە.

سێهەم- ئەوەش لە بیر نەبەینەوە کە ئەگەر بۆ بەجێ گەیشتنی کارێکی مێژوویی، تا پێش شەری جیهانی تێ‌پەڕبوونی چەند ساڵ و چەند بەرە (نسل) پێویست بوو، ئەم رۆ لە کاتێکی کەم‌دا تەنانەت لە دەمێکدا، بەجێ دەگات. خێرایی ئاڵووگۆری جیهانی رێگا دەدا کە هەر بیرێک لە هەل و مەرجی پێویستدا لە ماوەیەکی کورت‌دا جێ‌بەجێ بکرێ. هەر لەبەر ئەوەشە کە تەنانەت لە یونان و لە هەموو وڵاتێکی بچووکی دیکەش‌دا خەباتی چینایەتی هەیە و رۆژ بە رۆژ توندتر دەبێ.

دیارە من دەزانم ئاواتی هەرە دڵنیا ئەوەیە کە لە یونانیش‌دا وەک شوێنەکانی دیکە، بە قۆناخ و رێبازی جۆربەجۆر بە شێوەی نەزم و سروشتی و بە هێدی و هێمنیەتیەکی زۆر بە خەباتێکی پوخت کە تایبەتی خۆمان بێ، ئاڵووگۆر پێک بێت. بەڵام لەم جیهانەدا هەموو شت بە نەزم و بە مەنتیق بەرێوە ناچێ. کەڵێک کێشا و گیانداران لە بەین چوون، مێژووی زۆر میللەتان ناتەواو ماوەتەوە چونکە ئەوان نەیانتوانیوە لە ئاست دواکەوتوەکانی کاروانی خیلقەت خۆیان لەگەڵ رەوشتی ژیانی بەجۆش و بێ‌بەزە رێک بخەن.

نەرمی و مەنتیق حوکمی دەکرد کە ژیان‌مۆڵەتی دابا بەم کاڵ و کرچانە تابێ بگەن و بیرۆن، بەڵام لە فیزیک و لە مێژوودا مۆڵەت‌بە کەس نادەن: هەر کەس دەتوانێ با بۆ رزگاری خۆی تێ بکۆشێ!

«سەردەمی ئێستا بۆ هەموو خەڵکی جیهان سەردەمێکی بە هەست و گەپرا نیە. بۆ یونان و وڵاتە بچووکەکانی دیکە ئاڵۆزترە. چونکە بە بەڵگەی مێژوویی و رەگەزی، ئێمە دواکەوتووین. ئەو مۆڵەتەی کە بۆ ئێمە هەیە تا خۆمان لەگەڵ هەنگاوی پێشکەوتنی جیهان رێک بخەین، خێراتر لەوە رادەبرێ کە ئێمە بمانەوێ بە ناهەنگی ویستی رەگەزی و نەتەوەیی خۆمان بڕۆین. بەڵێ

بێگومان ئەم مۆڵەتە زۆر کورتە».

«بمانەوێ یا نەمانەوێ، ئامادە بین یا نەبین بەم زووانە لافاو هەڵدەستێ و مۆڵەتمان نادا تا ئێمەش پێی بگەین و بە دوایدا بڕۆین. ناچار حەقیقەتی بچووکی ناوچەیی ئێمە لە حەقیقەتی گەورەدا تاڵ دەبێ.

«کەوابوو ئەرکی ئێمە چییە؟ ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە خۆمان ئامادە بکەین. چۆن؟ بە تەواوی سەرنجی ئەم سەردەمە ناسکە مێژووییە بدەین کە لەویدا دەژین. میللەت روون کەینەوە و نەوەرزکی تازەترو شەریفتر بدەین بە بیری کارو دادپەروەری. کۆمەڵانی خەڵک تەنیا لەم رێگایەوە دەتوانن ئامادە بن تا لە کۆزناخی تێکەیشتنی ماڵەکانیان بۆ لۆزناخی بەجێگەیاندنی ئەرکەکانیان تێ پەڕنوکاتێک مۆڵەتەکە تەواو بوو بەرپرسی کەسایەتی خۆیان وەئەستۆ بگرن.

«وەک من بزانم خەبات تەنیا خەباتی چینایەتی نیە. سەربەخۆیی ئابووری تەنیا وەسیلەیەکە بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی بیری مرۆڤ. پێویستە بۆ دابینکردنی ئاسایشی مادی زۆربەی خەڵک تێبکۆشین تا پاش گەیشتن بە ئامانج، تێگەیشتنی مرۆڤ لە بەختەوەری بۆ پلەیەکی بەرزتر بەرێ».

«ئاشکرایە بورژوازی بۆ پووچ کردنەوەی ئەم تێکۆشانە هەوڵ دەدا هەمیشە تۆمەتی بێ ئەخلاقی و جنایەتکارانە بۆ بیروباوەری نوێ هەڵدەبەستێ. ئەوەش زۆر سروشتییە. چوونکە بیری نوێ بێجگە لە کەوای حەقیقەتێکی تازە شتێکی‌تر نیە. دەبەوێ بە لە ریشە دەرهێنانی بیری کۆن کە تێتر بەرناهێنێ و کۆسپی ژیانە، خۆ لە زەوی قایم بکات. ئەم بەڵایانە وەبیر بێنینەوە کە لە ساڵەکانی هەوەڵی پەیدا بوونی دینی مەسیحدا بە سەر مەسیحیەکانیان هێنا. بزانن چۆن پارێزەرانی مەزەبی کۆن، لایەنگرانی ئایینی تازەیان راودەناو ئازاریان دەدان و هەوڵیان دەدا تا دینی تازە پەیدا بوو لە گەرادا بخنکێنن».

«لەم سەردەمە ئاڵۆزەدا ئێمە دەژین، هەموو مرۆڤێک دەبێ بە بیرێکی هەڵسەنگاو بە ئیرادەیەکی پتەو لە دوو جەبهەی جیهانیدا کە پێک هاتوە، هەڵوێست بگرێ. تەنیا لە سەردەمی هێمنەتی و بەرامبەریدایە کە تاک مافی ئەوەی هەیە گۆشە نشین بێ و بێجگە لە ئاسوودەیی خۆی و پێوەندی خۆی لەگەڵ خەڵک بیر لە هیچی دیکە نەکاتەوە. بەڵام لەو رۆژانەدا، گۆشەگیری قۆرەماخی و ئاسایش خوازی نەخۆشییەکی زۆرناحەزی بێ دەرمانە».

گێڕانەوەی تەواوی سپاردەی دیفاعی کازانتزاکیس لەم پێشەکیە کورتەدا نایەتەوە، هیوادارم هەر ئەوەندەی کە هێناومانەتەوە، نیشان دەری شێوەی بیرکردنەوەی ئەم نووسەرە مەزنە بێ.

گەلێک لە نووسەر و زانایانی ئورووپایی لە حاست ئەو ئەستێرە پرشنگدارەی ئەدەبی یونان ئیرادەتیان هەبووە.

ئالبرت شوایتزێر تا دوا هەناسەی ژیانی لەبن سەری بوو. ئالبرت کامو نووسەری فەرانسەیی دۆستایەتی هەبوو. ئێمە لە خوارەوە وەرگێراوی نامەیەک دێنینەوە کە کامۆ چەند رۆژ درای وەرگرتنی خەلاتی نوبل بۆ خێزانی بێوەژنی کازانتزاکیسی نووسیوە. گرنگی ئەم نامەیە لەو ئافەرینەدایە کە کامو لە شوێن و پایەی کازانتزاکیس دەکات:

«١٦ی مارسی ١٩٥٩

خانمی خۆشەویست، زۆر بەداخەوە نەمتوانی ببمە میوانی ئێوە. من هەمیشە بە ئافەرینەوە روانیومەتە شوێنەوارەکانی مێردی رەحمەتیت. ئەگەر ئیجازە بفەرمووی عەرزت دەکەم کە هەمیشە سەبارەت بە وان هەستم بە خۆشەویستیەکی تایبەتی کردووە، تەنانەت بەوە خۆشحاڵ بووم لە ئاتین، لە کاتێکدا کە دەزگا نەزەرێکی خۆشی لە ئاست گەورەترین نووسەری خۆی نەبوو، لە کۆبوونەوەی گشتیدا بیروباوەری ئافەرینی خۆم دەربڕیم، ئەو پێشوازیەی کە گرێ گرەکانی خوێندکارو رووناکبیر لە قسەکانی منیان دەکرد جوانترین نیشانەی ئافەرینێک بوو کە لە نووسراوەکانی مێردی تۆیان دەکرد. ئەوەش لە بیرنابەمەوە، لەم رۆژەدا کە من خەلاتی نوبل-م وەرگرت ، مێردی تۆ سەد کەرەت لەمن موستەحەقتر بوو، تێلگرافی پیرۆزبایی ئەوم وەرگرت. دوای ئەو تێلگرافە بوو کە بە سەرسوڕمانەوە زانیم کە چەند رۆژ پێش مردنی تێلگرافەکە لێدراوە... بە مردنی ئەو یەکێک لە گەورەترین هونەرمەندی ئەم دوایەی سەدەی ئێمە لێمان ون بوو. من لەوکەسانەم، بۆشاییەکی کە ئەو بەجێی هێشتوە هەستی پێ دەکەم و هەمیشەش هەستی پێدەکەم».

کازانتزاکیس حەزی لە وەرگێرانی شوێنەواری کلاسیکیش هەبوو، لە یەکێک لە نامەکانیدا دەنووسێ: «خۆزیا پێنج سەد ساڵ ژیابام تا توانیبام تەواوی شوێنەوارەکانی کلاسیک وەربگێرم».

مەیدانە پر جۆشەکانی رۆمانی «ئازادی یا مەرگ» گریت دەگرنەوە. گریت دوورگەیەکە لە میدیترانە کە پتر لە هەموو جێگایەک بەر لە مێژوودا شەر و هەرای لەسەر ساز بوە. ئەم دوورگەیە لە بەر ئەوە شوێنی بە یەک گەیشتنی سێ قارەی ئاسیاو ئەفریقا و ئورووپایە، یەکێک لە بنکەکانی گرنگی شارستانیە کۆنەکان بوە. بێگومان شارستانیەتی پرشنگداری یونانی قەدیم بەم دوورگەیە قەرزدارە. ٣هەزار ساڵ پێش زایین شارستانیەتی دەروشاو لەم دوورگەیەدا هەبوە و هێشتا وێرانەکانی کۆشک و عیبادەتخانەکانی هەر ماوە. نیزیکەی ساڵی ١٧٠٠ی پێش زایینی بوومەلەرزەیەکی بەسام ئەم دوورگەیەی لەرزاند و کۆشکەکانی وێران کرد. بەڵام دووبارە هەموو شت دروست کراوە و شارستانی پرشنگداری «منهوان» لە سەدەی ١٧ تا ١٥ی پێش زایین گەیشتە تەوپەری درەوشان. لەو کاتەدا بوو کە توانایی دەریایی و شارستانی «پێش هیلنی» کریت گەیشتە بەرزترین پلە و پەرەی گرت. لە ئاخری سەدەی یازدە شارستانی کریت بەرەو ئەوتان رۆیشت. ئەم دوورگەیە بوو بە بەشێک لە ملکی یونان. دوای مردنی ئەسکەندەر و بلاو بوونی ئیمپراتووری ئەو کریت ئیوە سەربەخۆیی وەرگرت. بەڵام لە ئاوەدانی و شارستانی خەبەرێک نەبوو. خەڵکی کریت بە دزیەتی دەریایی دەژیان و دەبوونە کۆسپی دەسەلاتی رۆمی بەسەر دەریاکاندا ئاخرەکەی ساڵی٦٧ی پێش زایین ئەم دوورگەیە کەوتە دەستی رۆمیەکان. لەم مێژوە بەدواوە چارەنووسی کریت-یش وەک هەریمەکانی رۆمی رۆژهەلاتی لیهات.

لە سەدەی ١٩ی زایینیدا موسلمان بە سەر ئەم دوورگەیەدا زاڵ بوون و دەسەلاتی دەریایی میدیترانەی رۆژهەلاتیان گرتە دەست. ماوەیەکیش ئیمپراتووری بیزانس و پاشان وینیزیەکان لەوێ حکومەتیان کرد و بورج و قەلای زۆریان لە شوێنی بەناوی «خەندەق» دروست کرد کە ئێستا ناوی «کاندی»یە. بەڵام ساڵی ١٦٤٥ لاتی عوسمانی گەیشتە وێ و ساڵی ١٧١٥ قەلای ڤینیزیەکان بە

دەستی تورکەکان گیرا. عوسمانیەکان جارێکی دیکە ئیسلامیان هێناوە ئەم دوورگەیە. سەردەمی کۆیلەتی و چەوسانەوەی کریتیەکان دەست پێکرا. خەڵکی کریت لە ئاخری سەدەی ١٨ و سەرەتای سەدەی ١٩ لە تورکان هەڵچەرخینەوە. بەڵام راپەرینەکەیان سەرکوت کرا. پاش راپەرینێکی تری خوێناوی، فەرمانی ساڵی ١٨٦٨ تا رادەیەک خودموختاری دا بە کریت. لەگەڵ ئەوەش لە بەر زوڵم و زۆری تورکەکان ساڵی ١٨٩٧ بە پشتیوانی چەکدارانەی یونان شۆرشی گشتی و گەورە دەست پێکرا و دەستی عوسمانیان لەم دوورگەیە کورت کرایەوە و سەربازانی تورک ١٨٩٨ دوورگەیان چۆڵ کرد. پاشان کریت بە چاوەدێری دەوڵەتە گەورەکانی ئورووپایی کەوتە ژێر سەرپەرشتی دەوڵەتی عوسمانی و پاش شەڕەکانی باڵکان ساڵی ١٩١٣ بە تەواوی دەگەڵ یونان کەوت.

خەباتی رزگاریخوازی کریتیەکان لە سەرانسەری سەدەی نۆزدە دژی تورکە عوسمانیەکان چوارچێوەی ئەسڵی کتێبی «ئازادی یا مەرگ» پێک دێنێ. ئەم رۆمانە لە هەوەڵین دیتندا وەک رۆمانێکی مێژوویی دێتە بەر چاو بەڵام بە هێزێکی وەها سەرکێش لە چوارچێوەی ئاسایی «رۆمانێکی مێژوویی» دەردەکەوێ کە پاڵەوان میکلس قارەمانی کتێب، لە ئورووپیدا، نیستکانی شووشەی ئارەقخۆری خانە خوێ تورکەکەی بە دوورقامکە وردو خاش دەکات. نووسەر لەو بارەوە لە جێیەک دەنووسێ: «تۆ تاقە کەسێک نی، لەشکرێکی! ئەگەر تووڕەی ئەوە یەکێک لە باپیرەکانتە لە هەناوتدا دەنەڕێنێ و کەفی هێناوەتە سەر لێوانت، ئەگەر خۆشت دەوێ، دیسان ئەوە یەک لە باپیرەکانتە کە لە قووڵایی هەناوتدا قاقا لێ دەدا...».

نووسەر لەم کتێبەدا سەدان کەسی خۆ وڵاتیدوورگەی نیشتمانیخۆی دێنێتە سەر شانۆ کە زۆربەیان تارمایی‌باووپاپیرانی خۆیەتیو لەم بەزم و رەزمەدابێ پەروا نشاتیان دەدا. چونکەبە راستی لە زەینی هونەرمەندا، لە نێوان ئەو دوانەدا ناکۆکیەک نیە. ئەم رۆمانە لەگەڵ ئەوەش کە باسی شۆرشی نیشتمانیی کریتە لە ساڵی ١٨٨٩دا دەروانێتە بەسەرهاتی ئەڤینیش کە لەسەر نامینە جوانی چەرکس ژنی نوری بەگ یەکێک لە پیاو ماقوڵەکانی تورک، لە نێوان دوو قارەمانی کریتیدا رووددەدا. بەڵام ئەوە تەنیا وێنەیەکی رووکاری شپرزەو هەر لەو کاتەشدا رازاوەی رۆمانەکەیە. نیوێکی رووداوەکە لە شاری کاندی «جێی لە دایکبوونی نووسەر» رووددەدا و لەگەڵ ئەوەش کە خوێنەر دەبێ خۆی لەبەرامبەر زەبری بە دوای یەک دابگرێ، دەکەوێتە ژێر تەئسیری هەستێکی وەها بەهێز و شادی هێنەر کە دەڵێی ئەم شارە و دانیشتووەکانی لە نیشتمانی خۆی باشتر دەناسێ. نووسەر بە قەڵەمی سیحراوی پەردەکان دەدڕێنێ، فیداکاری یا ترسەنۆکی هەر یەک لە قارەمانەکان بە جوانی دەردەخات. بەم وەسفە رادەکاشانۆهەوە بەترسەکانیش بۆ دیتن بێن. دەڵێی قارەمانی ئەو کتێبە هەموویان لە نوورێکی ئەبەدیدا شۆراونەوەو لە بەر ئەوە لە گوناحباری رەحشیبەوە بوون بە رۆڵەی خودا. بەڵام تا... خودای ئەڤین و خۆشەویستی ئەت بۆ ئەم خەڵکە نەبوو، بەڵکو خودای تووڕە و تۆڵە، واتە ئەو خودایەی کە لە کتێبی زەمانی کۆن (تەورات)دا دەبینین.

چیرۆکی کتێبەکە فرە تەکان دەرەو زۆر لە رووداوەکانی لەوانەیە جێیباوەر نەبن، بەڵام هەر کەسێک تۆزێک شارەزای وەزعی کریت و مێژووی ئەو بێ، دەزانێ کە قارەمانەکانی کتێب

راستن. هەر چەند نووسەر هێندێ لەوانی گەورەتر لە واقیع نشان داون. ئەویش خۆی مەرجی بنەرەتی حەماسەیەکی ڕەسەنە. دەبێ وەبیر بێنەوە کە داستان لە کوێ و لە چ زەمانێکدا ڕوودەدا. لە دوورگەیەکی لە دنیا دوور کەوتە کە سالانی زۆر لە ژێر کەلەوەی ئیستعماری عوسمانیەکاندا بوە و هیچ دەستێک لە هیچ شوێنێک بۆ یارمەتی ئەو درێژ نەکراوە، تەنیا کریتیەکان خۆیان بوون «بە تفەنگەکانی خۆیان خودایان بانگ کردوە، لە دەروازەی خودا ڕاوەستان و تفەنگەکانیان بەرەو خوا تەقاندوە تا ئەو گوێی لێ بێت. بەڵام ئەو نەی بیستوە».

هەر لەم دوورگەیەبوو کە ٢٠٠ شۆڕشگێڕ و ٦٥ قەشە دروشەووریژ لە عیبادەتخانەی ئارکادیەدا لەبەرامبەر ١٥٠٠٠ تورکدا بەربەرەکانیان کرد. ئاخرەکەی کە دوژمن دەرگای عیبادەتخانەی پەلاماردا، شۆڕشگێڕێکی گەنج بە دەمانچە بوشکە باروتەکانی ئاگردا کە لە عەمباری ژێرزەوی دانرابوون لە نەتیجەدا عیبادەتخانە ڕووخا و ٦٠٠ ژن و منداڵ کە لەوێدا خۆیان شاردبۆوە لەگەڵ سەدان کەسی بەرگری و پەلاماردەر لەم تەقینە مەزنەیەدا لە بەین چوون

ئازادی یا مەرگ! کریت دوورگەیەکە لەوێدا ئاگر لە دوای ئاگر بڵێسە دەدا. تەنانەت لە سەردەمی ئاشتیشدا زۆر لە قارەمانەکانی ئەم داستانە ئاگری ئەمریەنی بۆ پێشەوەیان دەبا. ئەوان وەک باو وباپیرانیان لە مەرگ ناترسن. حەز لە ژیانی مادی دەکەن. لەوانەیە کردەوەی ئەوان لە لای ئەم گیانە پارێزگارانەی کە لە شیمالی سپی و بێ هەتاوی ئورووپا دەژین بە گوناح دابنرێ. بەڵام لە سەرکریت تەپ و تۆزی نور و ئاگر هەڵدەستێ. ئەم کتێبە حەماسەی قارەمانی، فاجیعەی ئینسانییە.

بۆ خۆی دنیایەکە پڕ لە خۆشەویستی، پڕ لە نوور و ئاگر کە هەڵۆیەک بە باڵیپان و بڵاو لە سەرەوەی دەفریندایە. ئەم هەڵۆیە کازانتزاکیسە.

# ئـازادی یا مـەرگ

پاڵەوان[١] میکێلس وەک هەموو جار کە توورە دەبوو، ددانی دەچیرەوە دەبرد. دەماتێکی لای ڕاستەی لە لێوی هاتبوە دەرو لە ڕەشایی سمێلی دادەبروقا. لە «دکانەکەی» پێنیان دەگوت «پاڵەوان بەرازە» ئەم ناوەی چاک ڕێ دەوەشاوە. لە کاتی توورەبوونی تەواودا، بەو چاوە خڕو لیلانە و پشت ملی کورو دەریەریو و سینگی پان و بەهێزی و بەو ددانە دەر پەڕیوەی بەراستی وە بەرازێک دەچوو کە چاوی بە مرۆڤ کەوتوە و هەستاوەتە سەر پاشوان، ئامادەی ئەمباز بوونە.

ئەو نامەی بەدەستیەوە بوو پێچایەوەو خستیە بەر پشتێندی ئاوریشمی. ماوەیەکی زۆر وشەبە وشە نامەکەی حنجە کردبوو تا لە ماناکەی تێ بگات. لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئەو ساڵیش نایەتەوە! دیسان دایکی چاوە ڕەش و خوشکی زەحمەتکێشی بێ ئەو جێژنی پاک دەکەن. گۆیا ئاغا هێشتا هەر دەخوێنێ!...»

ئاخر ئەو ئاغایە چ دەرسێکی ژارەمار دەخوێنێ و تاکەی ئەبێ بخوێنێ؟! لە ڕووی هەڵنایە دان بە شەرمەزاری خۆی دابنێ و بێتەوە کریت، چونکە کچە جوولەکێکی هێناوە!...

ئاخ، کوستاروس، برا خۆشەویستەکەم، بەراستی ئەم کورە ناسک و نازلیبەی تۆ خوێنی بنەماڵەی ئێمەی پیس کردوە!. خۆزیا تۆ زیندوو بای و ئەم کوڕەت وەک مشک بەلاقێک هەڵاوەسی با!».

ڕاست بۆوە. پیاوێک بوو وەک دێو، سەری وە میچی دوکانەکە دەکەوت. کە دەهات هەستێ، پێچی بە گوڵنگی کە پرچە ئاڵۆزەکانی ڕاگرتبوو، کراوە. پاڵەوان میکێلس پێچەکەی گرت و دووبارە توند لەسەری هاڵاند. پاشان خۆی گەیاندە دەرکی دوکان و هەر لەوێ بۆ هەوا مژین ڕاوەستا.

کاریتوس شاگرد دوکان، لە پێش ئاڵقە تەنافێکی کەشتی کروشمەی کرد بوو، ئەو کوڕە گوندیەکی کورتە باڵا بوو کە ترس لە سەروچاو دەباری. ڕەنگی پێستی وەک قەرەلوو ڕەش بوو. چاوی ترسەنۆک و هەڵساوی هەبوون. لە بنەوە را چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد، واتە لە پاپۆزەکان و سەتڵی ڕەنگاو ڕەنگ و بۆشکەی لیل و زنجیری ئەستووری لەنگەری کەشتی و گشت کەل و پەلی دەریاوانی کە لە دوکان دا هەبوون.

---

*(١) لێرەدا پاڵەوان وەرگێڕاوەی وشەی کاپیتانە کە بە پیاوی ئازاو شەرکەرو نەترس دەگوترێ. (واش آگل صادق هدایت) نموونەی ئەوانەیە. ئەو پاڵەوانانە خاوەنی سروشتی ڕاستی و پیاوەتی و فیداکاری و جوامێرین. «وەرگێڕ ف»*

بەڵام ئەوەندە هەراسان بوو لە ڕاستیدا بێجگە لە خاوەنەکەی خۆی کە بە قەڵافەتی زەلام چوارچێوەی دەرگای پڕ کردبوو و بە تووڕەیی لە لەنگەرگا ڕامابوو، هۆشی لە هیچ نەبوو. پاڵەوان میکێلس مامی بوو، بەڵام ئەو پێی دەگوت: «خودان»[1] و لە بەرامبەریدا لە ترسان دەلەرزی.

پاڵەوان میکێلس بۆڵە بۆڵێکی لێهات و لەبەر خۆیەوە گوتی: «دەڵێی ئەم شەو گرفتاریم کەمە، ئەو سەگەش بانگی کردووم بۆ ماڵی خۆی! ئاخر چکاری بەمنە؟ خەمی برازاکەم کەم بوو، ئەوەش بوو بە سەربار. دایکی وێستبووی نامەی بۆ بنووسم و منیش نووسیم. تاعوون بیبا!»

پاڵەوان میکێلس لە لای چەپی خۆی،تەماشای دەریاو لۆتکە و پاپۆڕانی کرد. لوتکەوانەکان، عەمباڵەکان بە نێو بۆشکەی ڕۆن زەیتوون و شەراب و خر نووری شامی دا هاتوو چۆیان دەکرد. هەراهەرایان بوو، جنێویان دەدان، گاریەکانیان بار دەکرد و با بەتاڵیان دەکردن، وەپەلە کەوتبوون تا پێش ڕۆژ ئاوا و داخستنی دەروازەی شار ئیشی خۆیان تەواو بکەن. ئاوی دەریا دەهاتە سەرو بۆنی نارنجی ڕزیو خرنوب و شەراب و ڕۆن زەیتوون لە لەنگەرگا دەهات. دوو سێ ژنی ماڵتی وەنەبو کەوتوو بە جلی ڕەنگاو ڕەنگ و جلف لەسەر ئیسکلەی لەنگەرگا ڕاوەستا بوون. و بە دەنگی گبراو لەگەڵ لۆتکەوانێکی ورگ زل کە بە لۆتکەی پڕ لە ماسیەوە لە ڕاوە ماسی دەهاتەوە گاڵتەیان دەکرد.

خۆر لە ئاسۆی ڕەنگە سووری ڕۆژئاوا، ئاوا دەبوو. ئاخرین ڕۆژی مانگی مارس تەواو دەبوو. بایەکی ساردی شەماڵ دەهات و شاری کاندی لە سەرمان دەلەرزی. دوکاندارەکان دەستیان ڕێک دەخست و قاچیان لە عەرزی دەدا بۆ ئەوەی گەرم بنەوە، کوڵاری گیا بەهەمەنان و با شەرابی «رزم» یان دەخواردەوە لە لووتکەی چیای «سترومبولا» لە دوورەوە بەفرباریبوو. دوورتر چیای «ئیدا» ڕاست ببۆوە و بەفرێکی قورس و بەستراو لە دۆڵ و لاپاڵان، پارێزراو لە با بریقەی دەهات. وە تیتۆلێکی سپی دەچوو کە کرابێتەوە. بەڵام عاسمان لە سەر لەنگەرگا ساو و پاک وەک ئاوێنە دەدرەوشا.

پاڵەوان میکێلس تەماشای قەڵایەکی دەکرد کە لە لای ڕاستی ئەو لە بەرەگەی لەنگەرگا بەرز ببۆوە و دیوارەکانی یادگاری سەدەی (ڤێنیز) کە بە دەستی ڕەعیەتەکانی مەسیحی دروست کرابوون، شاری کاندی یان دەورەدا بوو ڤینیزیەکان و تورکەکان و یونانیەکان بناخەکەیان بە خوێن ئاو دابوو. شێرەکانی مەرمەڕی کە کتێبی ئینجیلیان بە چنگاڵەوە بوو، تەوروزینەکانی تورک کە هێندێکیان لە بەردەگانی سەر دەرانەی بورجی قەڵا چوو بوونە خوارو هەر وەک خۆی مابۆنەوە، یادگاری ئەو ڕۆژە خوێناویانەی پاییزی بوون کە تورکە عوسمانیەکان پێش چەند ساڵ گەمارۆی نائومیدی بە سەر شاری کاندی دا زاڵ ببوون. ئەمرۆ گیاو گوڵ و هەنجیرە کێویلکە و پنگ لە تەلشتە بردەکاندا شین ببوون.

پاڵەوان میکێلس سەرو بنی قەڵای تەماشا کرد وەدەماری لاچانگی هەستان و هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا.

(1) لە دەقەکەیدا ئەرباب نووسراوە.

لەبن ئەو پورجە. لە پشت ئەم دیوارە کە شەپۆلی دەریای ڕێ کەوت. ئەو زیندانە لە عنەتیە هەلکەوتبوو کە شەوانە مەسیحیەکانی زنجیرکراوی تێدا مردبوون. پالەوان میکلیس لە بەر خۆ بیری کردەوە: «لەشی مرۆڤیکی (کریتی) بەو هەموو تواناو هێزەوە ناتوانی گیانی ئەو هەلگرێ. بەلێ ناتوانی... من لە خودا ڕەنجاوم کە بۆچی لەشی ئێمەی کریتی لە پۆلا دروست نەکرد تا توانیباامان سەد سالْ، دووسەد سالْ و بەلکوو پتریش تا ڕۆژی ئازادی دورگەکەمان بەربەرەکانی بکەین».

کەوتە بیری برازاکەی دوور لە نیشتمانی کە بە دابی ئورووپاییان پەروەردە دەکرا و دیسان توورە بوو لە بەرخۆیەوە گوتی: «ئێژن لەوێ دەرس دەخوێنن، بەلام دیار نیە چ زانستێکی شەیتانی دەخوێنن! ئەوەش وەک «جس‌گورک»ی مامی کە مامۆستای مەدرەسەیە، ئاغا مامۆستایەک، لوت بەرزێک، عەینەکیەکی قەرنەبووی لێ پەیدا دەبێ».

لە بەر توورەیی تفی فڕێدا و کەم مابوو تفەکەی بگاتە دوکانی ئاغا دیمیتروس کە ڕاست بەرامبەر دوکانی ئەو گیای دەرمانی دەفرۆشت. دیسان لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئەی بەرەی بە فیزی میکێلسی شێت کە بە تورک‌خۆر ناسرا بووی، تۆکە قەت لەبەرامبەر زالمدا چۆکت داتەدا بوو، ئێستا بزانە چت لێ بەسەر هاتوە!».

با پیرە گەورەی بە سامی‌ئەو میکێلسە شێت، بە هەموو تین و توانای لە لەشی‌دا زیندوو بۆوە. تا ئەو کاتەی ئەو باپیرە بەرێزە کوڕ و نەوەی هەبن، بەراستی نەمردووە.

پیرە پیاوانی کاندی جاروبار باسیان دەکرد کە لە رۆخەکانی دورگە دەسووڕاوە و دەستە خەپلەکانی بە بەر چاوەوە دەگرت و تەماشای ئاسۆی دووری دەکرد تا ئەو پاپۆڕانە ببینێ کە ناوی نابوون «کەشتی موسکوی». پیرە میرد فیشی گەورەی بەلاری لە سەر دەنا بە درێژی دیوارەکانی قەلای کاندی‌دا هاتوو چۆی دەکرد، پالی وە بورجی لەعنەتی دەدا و رق بە رقەی تورکان «گورانی مەسکەوی» دەگوت. دەیانگوت ریش و پرچی درێژ بوون، چەکمەی درێژی لە پێ دەکرد و قەت دەری نەدەهێنان. کراسی رەشی دەبەر دەکرد و وەک «کریت» تازیەدار بوو.

ڕۆژەکانی یەکشەمۆ دوای نوێژی مس، بە کۆنە کەوانێک کە یادگاری بابەگەورەی بوو دەگەڕا. واتە کەوانەکەی دەشانی دەکرد و جۆرکێکی پڕ لە تیری بە خۆوە هەلدەواسی.

پالەوان میکێلس برژی تێک نان و بە بۆلە بۆل گوتی: «ئەوانە پیاو بوون! بەلێ ئەوانە پیاوی بەراستی بوون نەک وەک ئێمە ژنانێلە! تەنانەت ژنەکانیشیان لە خۆیان کەمتر نەبوون لەوانەیە دڕتریش بووبن. بەداخەوە جسنی ئادەمیزاد بەرە و پاشەوە گەڕاوەتەوە.

جارێکی‌تر بیرەوەریەکان هێرشیان بۆ مێشکی پالەوان میکێلس هێنا. بابە گەورە و دایە گەورەی هاتنەوە بەرچاو. پیرێژنێکی رەق و تەقی وەحشی بە نینۆکی تیژ و رەشی پڕ لە چلک. پیرێژن کاتێک پیرو کەنەفت ببوو، مالی پڕ لە کوڕو نەوەی بەجێ هێشتوو چوو بوو ئەشکەوتێکی قوولی سەرووی گوندی لە بن چیای «ئیدا» بیست سالی تەواو هەر لەوێ مابۆوە. هەر ڕۆژێ یەکێک لە نەوەکانی کە لەو دەوروبەرە شوویان کردبوو، نانێکی جۆو چەند دەنکە زەیتوون و گۆزەلە شەرابێکیان بۆ دەبرد، ئاویش چەندی ویستبای لە ئەشکەوت‌دا هەبوو. ڕۆژی جێژنی پاک-یش دوو هێلکەی سوورکراوی بۆ دەبرا تا بۆ مەسیح جێژن بکات. پیرێژن هەموو

ڕوژێ بە پرچی ئاڵۆز و بڵاوی بە نیوکی درێژ و کۆتە کراسێکەوە، بە ڕەنگی پەڕیو و قەڵافەتێکی وەک ڕموزنە دەهاتە دەرکی ئەشکەوت و تەماشای خۆری دەکرد کە تازە هەڵدەهات. ماوەیەکی زۆر باسکە ڕەقەکانی بۆ رادەوەشاند. دیار نەبو لەبەری دەپاڕێتەوە یا تف و لەعنەتی دەکا.

پاشان دەچۆوە دە ئەشکەوتێ. بیست ساڵ بەم ڕەزالەتە رای بوارد. تا ڕۆژێکی بەیانی ئیتر کەس لەبەر دەرگای ئەشکەوت ئەوی دیت. مەسەلە روون بوو. چوون لە دوای قەشەی گوندێ، بە جروە چوونە ئەشکەوت. تەرمی سەرما بردوویان لە قەڵشتێکی وەک تابوتدا دیتەوە قاچێکی بەدەستەوە بوو، سەری کەوتبوە نێو ئەژنۆکانی.

پاڵەوان میکێلس سەری راوەشاند و ڕووی لە زیندوان وەرگێرا و جارێکی‌تر مردووەکان لە قووڵایی ویژدانی‌دا بزر بوون.

لە دووکانی ڕووبەڕووی ئەو، ئاغا دیمتروس بە چاوی ئاوساو خەواڵوو لە سەر نیو تەختێکی بچووک دانیشتبوو، قاچی هاویشتبوونە سەر یەک و بە مێش کوژێنک کە لە باڵی ئەسپ دروست کرابوو مێشەکانی لە دەوروبەری کیسەی مێخەک و بنێشت و دارچین و شروشەی ڕۆن دەوەدەکرد.

ئاغا دیمتروس هەمیشە وەک زەعفەران ڕەنگی زەرد و گەش و شادنەبوو. جار جار خۆی دەخوراند و باوێشکی دەهاتێ و چاوی لەسەر یەک دادەنان تا دەمێک خەوی لێ بکەوێ. هێشتا تەواو خەوی لێ نەکەوتبوو، وای زانی کە لەو بەرەوە پاڵەوان میکێلس تەماشای دەکا. مێش کوژەکەی بە دابی سڵاو بۆ راوەشاند. بەڵام دراوسێ‌ی لە تفتکی فیل دەربەڕیو ڕووی لێ وەرگێڕاو ناچار ئاغا دیمتروس دەستی کردەوە بە باوێشک و وێژێنکان.

پاڵەوان میکێلس دەستە ئەستوورەکانی لەبەر پشتێن راکرد. نامە پێچراوەکەی دیتەوە، دەری هێنا و ورد وردی کرد و بە بزلە بزڵ گوتی: «وادیارە مامۆستایەک بۆ بەدناو کردنی بنەماڵی ئێمە بەس نەبوو، ئێستا یەکی دیکەش دەیەوێ بێتە مامۆستا! ئەویش کوری کێ؟ کوری تۆ «کۆستاروس»برام، تۆ بووی عەمباری باروتت ئاگردا و عیبادەتخانەی «ئارکادی»ت بە هەموو پاکەکان و خاجەکانی عیسا و قەشەکان و مەسیحیەکانو تورکەکانەوە تەقاند».

«دەلاک»ی دمەکچی مەشهور کە عەبایەکی لە خۆ وەرگرتبوو بە پەلە بۆ لای لەنگەرگا دەرۆیشت تا بۆشکە شەرابێکی کیسامۆسی وەرگرێ کە رای ئەسپاردبوو. لە دوور چاوی بە پاڵەوان میکێلس کەوت کە پێچەکەی هێناوەتە سەر برۆیان، زانی کە خۆی نیە. لای‌دا و لەبەر خۆیەوە نوزەی دەهات و دەیگوت: «دیسان ئەو جانەوەرە خەراپ هەستاوە!».

ئاخرەکەی رۆژ بە سەرچیای «ستروموولا»دا ئاوا بوو. کۆلانەکان تاریک بوون سپیایی منارەکانی ڕەنگیان گۆڕا. لە لەنگەرگا بازرگان و کاسبکارو لۆتکەوان و تەنانەت سەگەکانیش کە لە بەیانیەوە تا ئەو دەم وەڕی بوون هەستیان بە هیلاکی کرد. هەوا ئارام دەبوو. پاڵەوان میکێلس کیسە تووتنی لەبەر پشتی هێنا دەر، سیغارێکی هەڵپێچا و کەم کەم قینی نیشتەوە. لەگەڵ ڕیشی ڕەشی دەستی کرد بە یاری و بە نارەنار دەیگوت: «کورەکەم، کورە چکۆڵەکەم تراساکی‌یە و من ناترسم، ئەوە کە شەرافەتی بنەماڵی ئێمە رزگار دەکات. هەر ئەوە شورەیی مامی «چس گورگ» و برازا لوت بەرزەکەم کە شەرم نەبگرتوە خوێنی ئێمەی لەگەڵ خوێنی ژنە جوولەکەیەک پیس کردوە- دەشواتەوە. ئەو چرای بنەماڵی ئێمە هەڵ دەکات».

ئەوەی گوت و لە پڕ ژیانی بە جوان و خودای بە دادپەروەر هاتە بەرچاو و ئیتر عەیبی لە خوا نەگرت. تورکێکی پیرو کورتە بالا، بە روومەتێکی کونـە و کۆنە کراسێکی خاوێن، بە ترس و لەرزەوە لێی وە نیزیک کەوت. سەری هەڵێنا و تەماشای پاڵەوانی کرد. پاڵەوان دیتی و سەرێکی راوەشاند و پرسی:

- عەلیاغا چت گەرەکە؟

عەلیاغا دراوسێی ئەو بوو. بەڵام پاڵەوان میکێلس هەر ئەوی دەزانی هەیە. ئەو لەم شەیتانۆکە ئەنیر ئەمێ یانە بێزار بوو. عەلیاغا کاتی پاش نیوەڕۆی لەگەڵ ژنە یونانیان بە گورەوی چنین و قسەی ژنانە رایدەبوارد. پیرە مێرد گوتی:

- ئاغا نوری بەگ منی ناردوە. سلاوی لێ دەکردی و دەیگوت زۆری پێ خۆشە کە ئەم شەو زەحمەت بکێشی و میوانی من بی.

- زۆر باشە. پێشتر نوکەرەکەی خۆی ناردبوو. تۆ وەدوای کاری خۆت کەوە.

- گوتی کاری زۆر پێویستی بە تۆ هەیە.

- گوتم برۆ وەدوای کاری خۆت کەوە.

پاڵەوان میکێلس ئەی دەتوانی ئەم دەنگە بیبیسێ کە وەک دەنگی خراجان دەچوو. عەلیاغا بێ دەنگ بوو، بە ترسەوە بە بن دیواردا لێزمالکی دایە و رۆیشت.

پاڵەوان میکێلس لەبەر خۆوە گوتی: «من کارم بەو ماڵە تورکە نیە. نازانم ئەو سەگە چی لە من دەوێ؟ من ناچم. ئەگەر کاری بە منە، با خۆی بێت». پاشان بانگی کرد:

- هۆی کارتیوس!... وەرە، بچۆوە ماڵ و ماینی من ئامادە کە! پاڵەوان لە پڕ لەسەری دابوو بە سواری خولێک بدا و بحەسێتەوە. بێگومان پاش گەران، ئیتر بیری بابە گەورە و دایە گەورەو برازاکەی و نوری بەگی نەدەکرد.

بەڵام لەو کاتەدا کە دەیویست دوکانەکەی داپخات، لە کۆڵانەوە دەنگی حیلەیەکی شادو پشوو تازەی هاتە گوێچکە. حیلەی ئەسپەکەی ناسی و رووی وەرگێڕا. ئەسپێکی کوێت هەر بریقەی دەدا بە رەسەنی و بە ناز وا دەهات کە هەموو لەشی هەڵمی لێ هەڵدەستا. کوڕە تورکێکی پێخواس جڵەوی ئەسپەکەی گرتبوو. ئەسپێ بێ لغاوی بە شاری کاندی دادەگێڕا، تا ئارەقەی لێ وشک بێتەوە. ئەو ئەسپە دەبێ بە سەرڕەو لە رێگای دوورەوە هاتبێ. چونکە لە زارو سنگ و نێوڕانی هەڵم هەڵدەستا. بەڵام حەیوان هێشتا لە تین و تەوا نەکەوتبوو. دەی پرماند، باڵە تەرەکانی رادەوەشاند، دەی حیلاند و جاروبار سمکۆڵی دەکرد. دەنگێک لە دوکانی ئاغا «پاراسکەواس»ی سەرتاش هات و گوتی:

- ئەوە ئەسپی نووری بەگە. کوڕینە باشی تەماشا کەن پێنج شەش کەس کە سەریان ئەتاشی بوو، بەکیش بە ڕیشی سابوناوی چوونە دەرکی دوکان و راوەستان وڕما. کابرایەکی «مالابارێ» بە ریشێکی رەشی وەک ریشی بزن گوتی:

- سوێند ئەخۆم ئەگەر لە من بپرسن لە ئەسپی نووری بەگ و ژنەکەی سەرپشک بم، من ئەسپەکەی هەڵدەگرم.

یانارۆس-ی رەنگرێژ کە تازە ریشی تاشی بوو، لە بەر ئەوەش کە سمێڵی درێژ و داو داوی

وەک پشیلەی هەبوو، مبستیگری- شیان پێ دەگوت، هەڵبدایە و گوتی:
- گەللە گەرا ئامینە خانم یارویەکی شاز و بێ وێنەیە. تەمەنی لە ٢٠ ساڵ پتر نیە. زۆریش شوخ و شەیتانە. ئەو هەڵبژێرە، بەدبەخت، حەرامەت لە تازیە بێنە دەرا
ریش بزن گوتی:
- پێم گوتی ئەسپەکەم پێ باشترە. من خۆم بە تیکەڵاوی لەگەڵ ژنی تورک پیس ناکەم. وەستا «پاراسکەواس»ی دەلاک کە مقەست بەدەست دەربەری بووە دەری، بە دەنگێکی نەرم گوتی:
- کورینە، من نە ئەسپم دەوێ و نە خانم. ئەوان هەموویان دەردی سەرن.
ریش بزن رووی وەرگێرا و گوتی:
- ئەحمەق، ژیان گشتی دەردی سەرە. مرۆڤ ئەگەر بخوازێ ئاسوودە بێ، دەبێ بمرێ. من ئەوە پێت دەڵێم کە لەو هارت و پورتانە بە ئێمەی «کریتی» ئەلێی، چونکە ئەگەر بزانین ئەو قسانە بە نیازی خەراپ دەکەوی.زیندە بە گۆڕتدەکەین.
وەستای قەقبر لەرزی. ئەو مرۆڤێکی ساکار و لاواز بچووک و بە عەدەب و میهرەبان بوو لە دڵی خۆی دا دەیگوت: چۆن توانویە بۆ سەررو ریش تاشینی ئەم وەحشیانە لە کریت دا بێنێتەوە. هەموو جار کە چیاییێەکی کریتی لە دەرکی دوکانەکەی پەیدا دەبوو، وەستای دەلاک تێک رادەبوو. بە تەرس و لەرزەوە دەی روانیە قەدو بالای، لە خۆی دەپرسی لە کوێوە دەست پێ بکات؟
چیایی کە چەند مانگ بوو ریشی نەتاشی بوو، حەمامی نەکردبوو، ئەی دەزانی چەند ساڵە سەری نەتاشیبوە. وەستا دەلاک خاولی رادەوەشاند، دەستی دەدا مقەست و بە دەوری کورسی‌کابراێ کریتی‌دا دەگەرا کە لە بەر ئاوێنە تەماشای خۆی دەکرد. ئەو مرشتەریە سەیرە، دەلاکی دەخستە بیری ئەو بەرانانە کە وەپێش مێگەل دەکەون. یان دەی خستەوە بیری «من مبماس» ئیمامی شوانان کە «پاراسکەواس» خۆی جارێک وێنەکەی لەپەردەیەکی نەقاشی‌دا دیبوو. کابرا تەوەندەی تورک بەسەرو ریشەوە هەبوو کە دە سەرتاش نەیانەتوانی پاکی کەنەوە.
لەپر مقەستی وەستا «پاراسکەواس» بچوک دەبوەوە. لە کام لاوە پەلاماری ئەو موو بەرازە و ئەو پەشم و جەنگەڵە بە ترسە بدات؟ وەستای گزە لۆک هەناسێکی هەڵدەکێشا و بریاری دەدا دەست پێ بکا. هاواری خوای دەکرد و سابوونی لێ دەدا.
بە بیستنی قسەگانی ریش بزن وەستا تێکرا بوو. پشووی نەدەهات. قسەگانی ئەوی دووپاتە کردەوەو گوتی:
- زیندە... زیندە؟بۆچی دەتانەوێ من زیندە بە گۆر بکەن؟
- چونکە هیچ دەزانی ئەوانەی وەک تۆ قسە دەکەن، ئێمە چی‌یان پێ ئێژین؟
- نازانم... تکایە پێم بێژە.
- ئێمە بەوانە ئێژین: مردوەکان.
وەستا دەلاک بە زەحمەت تفی قوت دا و وەک‌ئەوی بیستبێی لە قوژبنی دوکانەکەی‌دا مات بوو.
ستیفانیس گەمیەوانی پێشووی پاپوری «عەبار» کە لە شورشی ١٨٧٨دا تورک نوقمی‌یان

کردبوو راست لەو کاتەدا بە شەلە شەل بەرەودا تێ پەڕ دەبوو: خۆمپارەی پا پێوی تورکەکان ئەژنۆی شکاند بوو. لەو دەمەوە دەشەلی. بەو کارە لە گەڕەکی لەنگەرگا دەسووڕاوە. ستیفانیس دوو گۆزەچاتی هەبوون. یەکیان راست و لوس وەک شەم. کاتێک رۆژگاری «کریت» خۆش دەبوو دەی هێنا دەر، ئەوی دیکە خوارو بەگرێ و گوڵ، کاتێک پەڕ وەردەگەڕا و هەوا بۆنی باروتی لێ دەهات، بەدەستیەوە دەگرت. گەمپەوان ئەو رۆژە گۆزەچانە گری دارەکەی بە دەستەوە بوو. کاتێک وتووێژی ئەوانی بیست راوەستا و گوتی:

- کورینە شەر مەکەن، کارەکان دەکەونە ڕێ.

- بزانێ ستیفانیس، تۆ بێژە، کامیانت دەوێ؟

- ئەی گەوجینە! باشە، ئەوە روونە، سواری ئەسپی بەگ بم و ئامینە خانمیش باوەنمە پاش تەرکم، ئەوکارەی کە [سن ژۆرژ] کردی!

موشتەریە سەر ئاشراوو نەئاشراوەکان کە ئەوەیان بیست، یەک دەنگ هاواریان کرد:

- منیش، ستیفانیس، منیش، منیش، خوا لە زارت بروانێ!

پاڵەوان میکێلس دە ئەسپەکە راما بوو کە بە نازو فیز بە پێش ئەودا دەهات و گەردنی درێژ وەک گەردنی قوو هەڵدەتەکاند. ئەسپ چاوی بە پیاوەکە کەوت فرت بوو. دەتگوت دەیناسێ. پاش هێندێ رامان حیلاندی.

پاڵەوان لێی چوە پێش. چونکە خۆی پێ ڕانەگیرا، چوە تیژیکتر. بۆ ئەوە نەمابوو کە ئەسپەکە بلاوێنیتەوە، دەست لە بەدەنی گەرمی بدا، کەفی زاری لە دەست بگرێ. کورە تورکەکە تێ گەیشت، ئەسپەکەی راگرت. دەستی قورسی پاڵەوان میکێلس کەوتە سەر سینگی پان و بە نارەقەی ئەسپەکە کە ملوانەیەکی پیرۆزە و نیسکێکی فیلی لە ملی کرابوو. دەست بە حەزو شۆقەوە بە سەر گەردن و لووت و نێو چاوانی دا تێ پەڕی و چوە نێو یاڵە تەڕەکانی. هەر بەو شوق و زەوقەوە بە سەر پشت و کەفەلی دا هات و چوە بەر زگی کە هەلمی لێ هەڵدەستا. حەیوانی جوان و شوخ ملی راکێشا و لە کاتێکدا هەناسەی گەرمی بەسەر پرچە رەشەکانیدا بلاو دەکردەوە حیلاندی. لە پڕ کەیفی گەمەی هەستا، بە ددان پێنچی پاڵەوانی گرت و رای وەشاند و بەی دەداوە. حەیوان بە نیگای شەیتانی چاوی لە کابرای ریش رەش دەکرد کە لە پێشی راوەستا بوو. کابراش دەتگوت لە خۆشیان دەفرێ. پاڵەوان میکێلس قەت بەم خۆشەویستیە بە تەماشای هیچ ئادەمیزادێکی نەکردبوو. سەبروکە لە گەڵ ئەسپ دەستی بە قسان کرد، حەیوان سەری بەردا بۆوە و لا روومەتی وەک لاواندنەوە لە شانی پاڵەوان دەخست. پاڵەوان بە خێرایی پێنچەکەی لە زاری ئەسپ رفاند و هەروا بە تەری لەسەری ناوە. پاشان بە کورە تورکەکەی گرت: «باری تەواو بوو، دەتوانی بڕۆی». پاڵەوان میکێلس لە کاتێکا هەروا تەماشای ئەسپەکەی دەکرد کە دوور کەوتبوو، لەبەر خۆیەوە گوتی: «دەچم!... بەڵێ دەچمە لای!».

ئەم بڕیارەی گوتووپڕ بوو. گورج گەڕاوە تا دوکانەکەی دابخات و پاشان بۆ لای ماڵی نووری بەگ کەوتە ڕێ.

بەڵام پاڵەوان ستیفانیس لە کاتی لاواندنەوەی ئەسپ خۆی لێ دەبۆسە نابوو. ئێستا پاڵی وەدارێکی وا دابوو لەسەر رێگای شێن ببوەوە و سلاوی لێ دەکرد. پاڵەوان ستیفانیس لەو پیاوە

زارشره نەدەترسا. بۆ چما ئەویش بۆ خۆی کەسێک نەبوو؟ بۆچما ئەو هەر ئەو گورگی ناودارنەبوو؟ بۆچما لە هەموو شۆرشەکانی ساڵەکانی ١٨٥٤ و ١٨٦٦و ١٨٧٨دا. چەند جار ئالقەی گەمارۆی دەزگای شەری تورکەکانی نەشکاند بوو بۆ یارمەتی بە مەسیحیەکان ئازوقە و کەلُ و پەلی لە لەنگەرگاکانی دوور لە مەیدانی شەر بەتالُ نەکردبوو؟ کاتێک لەشەیان لە تۆپ بەست بوو نوقمی دەریایان کردبوو، ئەو هەر چەند خوێنی لە ئەژنۆ دەتکا، بەمەلە تا کەنداوی سنت پلاژ چووبوو، ئەو ناوانەی کە «ئەلمومەنی ئاتین» بو کەشتی بەواتی بە ناو بانگ «کوراکاس»ی گەورەی وڵاتی مسارای‌دە نارد بە ددان گرتبوونیەوە و لە بەر پەلاماری لافاو نەجاتی‌دا بوون. ئەوەش راستە کە بە دوای ئەوەدا، ژیان هیلاک و ماڵ وێرانی کردبوو. جلەکانی کۆن ببوون. هێشتا هەر چەکمە پینە کراوەکانی سەردەمی کەشتیەوانی لە پێ‌دا بوو. هەمیشە بە زەحمەتێکی کۆڵنەدەرانە هەتا لەنگەرگا دەچوو، تەماشای لۆتکەکانی دەکرد. ئەگەر دڵی پر دەبوو، پێ‌ی گرنگ نەبوو، پێی خۆش بوو بۆتی قیری بۆ بێت و گوێچکەی بە دەنگی هاوار و بەخێرهاتن و دەنگی لافاوەکان کەوە بەردی لەنگەرگاکان دەکەون بزرنگێنەوە، لە شێکی داکەوتوو، گێرفانی خالی و پانتۆلی دڕاو بوو، بەلام دڵی لە قەفەس سینگی‌دا بە هێز راوەستا بوو، هەر وەک نیگارێکی لە کەشتی کێشراو تەماشای دەریای دەکرد.

ئێستا دلێرانە خۆی هاویشتبوە سەر گۆچان و لە پێش پاڵەوان میکێلس چەقی بوو. بانگی کرد و گوتی:

– بلێ بزانم پاڵەوان، داخوا ئەم وتووێژەت بیست کە لە پێش دوکانی دەلاک دەست پێکرا بوو؟ ئەگەر قەرار بێ لە ئەسپ و ژنی نووری بەگ سەر پشک بی، کامیان هەڵدەبژێری؟

پاڵەوان میکێلس گوتی:

– من لەگەڵ قسەی جلف نیوانم نیە.. بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە بۆلای دوکانەکەی خۆی کەوتە رێ. بەلام گورگی دەریا دەست هەڵگر نەبوو. وەسەر خۆی نەهێنا و بە دوای قسەکەی خۆی‌دا گوتی:

– دەلێن نووری لە قوستەنتەنیە لەگەڵ خۆی هێناویەتی. لەوە دەچێ چەرکس بێ. دەلێین ژنێکی وەحشی و جوانە. لەو ژنانەیە کە پیاو دەخۆن. دەسێ لوعبەتان‌ەی دراوسێی من لە رێگای پیرەدایک و قولەرەش ئەو ژنە نەدیەیە، لە هەموو رووداوەکانی ماڵی نووری بەگ ئاگادار دەبن. خوا قەوەتی زمانیان بدا، لە هەرچیەک لەم دەوروبەرە دانیشن، دەیگێرنەوە.

پاڵەوان میکێلس بە تووڕەیی گوتی:

– پاڵەوان ستیفانیس، پێم گوتی من قسەی جلفم پێ‌خۆش نیە.

مەلەوانی سەر رەق دەستی هەڵنەگرت، ئەو ئیجازەی بە کەس نەدەدا کە قسەکانی ببڕێ. دەزگای شەری تورکەکان بەو هەموو تواناوە نەیتوانیبوو ئەو بترسێنێ. ئەو کابرایە کێ بوو کە پاشە کشە بەو بکا. دەبوایە هەرچۆنێک بێ گوێچکە بۆ قسەکانی کەشتی‌وان رابگرێ. ستیفانیس گوتی:

– پاڵەوان میکێلس، لە بیر خۆ مەبەوە کە نووری بەگ دەستە برای تۆیە. کەوا بوو تۆ دەبێ هەرچی لە ماڵی ئەوان رادەبرێ، ئاگاداری بی. وادیارە ئەم جەنابی بەگە، ئەم درندە بەسامە، بە

سەعات نارام و گوێ لە مست ،خۆ دەخاتە بەر پێی ئەو ژنە وچاو لە چاوانی دەکا. لەو کاتەدا خانم سیفاری خۆی بە ملی بەگەوە دەنێ و کەیفەکەی بە وەتەخت دەکا. هەروەها دەڵێن کاتێک ئەو ژنە ولاتی خۆی وەبیر دێنەوە، دەکەوێتە یادی چادرو بۆنی پەین و شیر و حیلەی ئەسپان. لە دین دەردەچێ، فینجانەکانی چا دەشکێنێ. شوشە عەترەکان تورر هەڵدەدا و لە داپانەکەشی دەدا...

ئاخرەکەی پاڵەوان میکێلس بە مرە مرەو گ سەگی کێشکچی گلێلی لە بزمار هێنا دەرو بە توندی دەستی پیرە گورگی دەریای لە دەرگی دوکانی خۆی وەلابرد.ستیفانیس ئەگەر خۆشی ویستبای نەیدەتوانی زمانی خۆی گرێ بدا. باشتر بوو لە هەوەڵەوە لەگەڵ ئەو کابرا وەحشیە تووشی قسەوباس نەبایە، ئێستا کە دەستی پێکردوە، هەرچی دەبێ با ببێ. لەبەر ئەوە غیرەتی بەر تەدا وچۆنی بۆی کرا بە گورجی قسەکانی خۆی ئاوا کۆتایی پێ هێنا.

. وادیارە ئەو خانمە ئێرەیی بە ئەسپی نوری بەک دەبا،شەوی پێشوو نوری ویستبووی لە ئامێزی بگرێ بە لام ئەو بەرگری کردبوو. گوتبووی لە پێشدا دەبێ دڵی من رازی بکەی. هەرچی داوات لێ دەکەم وابکەی، نووری گوتبووی هەرچی بخوازی خۆشەویستم. هەموو شتێکی من ئی تۆیە. خانم گوتبووی دەبێ ئەسپەکەت بێنیە حەسارێ، چراکان هەڵکەی تا من باش ببینم، پاشان لە بەر چاوی من سەری ببری. یەک بە هەناسە هەڵکێشان سەر بەردەداتەوە، دەچێتەوە ژووری خۆی، دەرگا لەسەر خۆ دادەخات، دەست و پێوەندەکان بیستبوویان تا ڕۆژ لە ژوورەکەدا هاتوو چۆی کردوە و نالاندوویە. من بۆیە ئەم حکایەتەم بۆ گێڕایەوە کە ئاگادار بی. وادیارە لە دوای ناردوی بچیە لای. دەیەوێ تۆ ببینی. تۆ بچوو. عەلیاغا بۆ منی باس کردوە. ئەوندەیە تۆ دەبێ بزانی کە عاشق و مەعشوق ئیوانیان پیس تێک چوە.

ستیفانیس دەستە زوورەکانی خۆی پێک داهێناو لەوە کە توانی بووی بە بێ ترس قسەکانی بکا، سوکبار ببوو. پاشان لێی زیاد کرد و گوتی:

– پاڵەوان میکێلس، ئەوەی دەمزانی پێم گوتی، ئیتر ڕاست یان درۆ نازانم.

پاڵەوان میکێلس دەرگی دوکانی داخست وگلیلەکەی خستە بەر پشتێند و رووی کردە کەمبەوانی پاپور نوقم کراو و بە شێوەیەکی سووک گوتی:

– ئێوە دەریاوانەکان ڕێز لە ناموسی هیچ کەس ناگرن. کەوتە ڕێ. ستیفانیس بە «های» و، بە بزەی لیوەوە گوتی:

ئێوەی هەردەوان دەچی دەگەن! ئێوە دوورتر لە سەری کەپۆتان جێگای دیکە نابینن. پاشان بە شەلە شەل و بە ناڵوکەوە دوور کەوت. دەتگوت لە پر ترسی ڕێ نیشتوە.

پاڵەوان میکێلس پێچەکەی هێنابوە سەر برۆیان، چاوەکانی لەبەر ڕیشووی پێچەکەی دیار نەبوون. نەپدەویست نە کەس ببینێ و نە کەس بیبینێ. بە حاڵێکی مۆن و ڕق هەستاو بەرەو گەرەکی تورکان کەوتە ڕێ.

ئاخرەکەی خۆر ئاوا بوو. دەنگی دەهۆل و زورنا هەستا. کێشکچییەکانی تورک چوار دەروازەی شاریان داخست. ئیتر تا بەیانی خۆر هەڵات کەس نەیدەتوانی بێتە نێو شار. تورک و فەلە تا ڕۆژ لە نێو شاردا حەپس بوون.

شەو کەم کەم درەنگ دەبوو تاریکای دادەپۆشی . ئیتر ژنێک لە گەڕەک و کۆڵانان نەدەبینرا. لە ماڵان چرا هەڵدەکران و سفرە رادەخران. پیاوەکانی بە ژن و ماڵ بە پەلە بۆ ماڵ دەگەڕانەوە. هەرزەکاروودم رووت لە مەی خانەکان خەریکی خواردنەوە دەبوون. شاری کاندی کە لە تاریکیدا نوقم ببوو، دانیشتوە برسیەکانی بۆ نان خواردن لە خۆدا کۆ کردبۆوە.

سەعاتێک بوو سێ خوشکی (بەسگیک بوو)، واتە «سێ لوعبەتان» لە پشت دەرگای ماڵەکەیان راوەستا بوون و گوێچکەیان هەڵخست بوو. ئەوان سێ کونیان لە دەرگا کردبوو. هەر سێک لوتیان بە دەرگاوە دەناو بە ئیشتیا چاویان لە ڕێبواران دەکرد و لە بارەی چاکەو خەراپەی خەڵک قسەیان دەکرد. هەر سێ خوشک وەنێو کەوتبوون. چونکە بە پرچ و برۆ و مژۆلی سپی و چاوی سووری وەک کەروێشک لە دایک ببون، بە رۆژ قەت لە ماڵ نەدەهاتنە دەر. هەتاو لە چاوی دەدان و ناچار بە بێ سەبری چاوەڕوانی شەو دەبوون تا لە پشت کونەکانی دەرگاوە خۆمات کەن و چاو لە هاتوو چۆی خەڵک بکەن. کەس لە زمانی ئەوان ئەمین نەبوو. کۆڵانی ئەوان ڕێگای هاتوو چۆ بوو. ماڵەکەیان لە سەر کۆڵانێک بوو کە گەڕەکی تورکان لەوێ دەبڕایەوە و گەڕەکی فەلان لەوێوە دەست پێ دەکرا. ئەوان گشت تێپەڕیوەکانیان دەبینی و هەر یەکەش ناوێکیان لێ دەنان و تازە ئەم ناوەی بەسەردا دەبڕا. هەر ئەوانیش بڕا ماموستاکەیان ناو نابوو «چس گورگ».

ئەوان تەواوی رۆژ لە ژووری خەریک نان و چێشت بوون. هەوریان دەشوشت. جلیان دەدروو، هیچ تەنگ و چەڵەمەی دیکەیان نەبوو. هەر سێک لە شوو کردن و لە ژانە سەری دایکەتی خۆیان نەجات دابوو. خوا برایەکی وەک زێڕی پێ بەخشی بوون بە ناوی «ئاریستوتلیس»ی دەرمان فرۆش. ئاریستوتلیسی فەقیر تەواوی رۆژ لەسەر پێ رادەوەستاو کاری دەکردو تۆزو مەلحەمی دروست دەکرد لە گەنجیەتی دا جاروبار کیژێکی جوان یا ژنێک لە خێزانێکی باشیان بۆ پێشنیار دەکرد. ئاریستیوتلیس وەک دەزگیران سەرووریەکی رازاوەی هەبوو.

دوکانی دەرمانفرۆشیەکەی لە ناوەندی شاری کاندی لەسەر مەیدان بوو دوکانەکەی پڕ بوو لە شوشە دەرمان و ئاوی گوڵان و سابوونی بۆن خۆش. هەموو رۆژێ کاتی رۆژئاوا،ماموستاوحەکیمەکانی شار بۆ چارەسەر کردنی مەسەلە گرنگەکانی مرۆڤایەتی لە دوکانی ئەو کۆ دەبوونەوە. ئاغا ئاریستیوتلیس کز و داماو بێ ئەوە خۆی قسە بکات، گوێچکەی بۆ قسەکانی ئەوان هەڵدەخست و بە چاوی جگولانەو بۆر و ماندوو تەماشای دەکردن و سەری تاسی رادەوەشاند. سەرو وەزعی جۆرێک بوو دەتگوت بە هەمووان دەڵێ:

- تۆ هەقتە.. هەق بە تۆیە..

بەڵام ئەو بیری لە تەمەنی بەفیڕو چووی خۆشی دەکردەوە. بێچارە داخی دەخوارد کە خۆزیا ژنی هێنابا. ئەم داخەش بۆ ژن نەبوو، خوا لە فیکری ئاوای دوور خستبۆوە، تەنیا لەبەر ئەوە بوو کە کوڕێکی هەبایە و باش خۆی دەرمانخانەکەی بە ساحیب کردبایە. ئەوەش خۆی قایدەو داب بوو... ساڵی تێ دەپەڕین و مووی ئاغا ئاریستوتلیس سپی دەبوون. ددانی دەکەوتن. پشتی کووڕ دەبوو. روومەتە تووت و سوورەکانی چرچ دەبوون. ئێستا ئیتر درەنگ ببوو، ژیانی بە فیڕۆ چوبوو، پیری سەری لێدا بوو. هەر وەک ئەو کەسانەی پەنا بۆ ئارەق دەبەن ئەویش دەیویست بە بنێشت جاوین رابردووەکان فەرامۆش بکات. کە وابوو رۆژ هەتا ئێوار ئاغا ئاریستوتلیس کاوێژی دەکرد.

ئیوارەش لەگەڵ گوێ دان بە قسەکانی مامۆستا و حەکیمەکان لە بارەی جەبر و ئیختیار مانەوەی روح و یا لەم بارەوە کە داخوا ئەستێرەکان ئشتەجێن، سەرەتا سەکەی رادەوەشاندو دەیگوت:
«ئیتر ئێستا ژنیش بێنم کورم نابێ.. ئیتر من بێ کورم... بێ کور».
هەروا کە لە بەر پێشخوانەکە دەسکاوێنگی لە بەر دەم بوو، بێئیشتی دەجاوت بە خەفەتباری توزەکانی تێکەڵ دەکرد.
بەڵێ، ئەو شەوە زووتر لە جاران «سێ لوعبەتان» بە نیگەرانی لە پشت کونەکانی دەرگا راوەستان. هەوا سارد بوو لە سەرمان هەر سێک دەلەرزین و دەست و لاقیان سڕ ببوو. بەڵام تازابانە چاوەڕووان بوون. چونکە بزنیان کردبوو کە کارەساتێکی سەیر دەقەومێ. چاوەسووڕو چکۆلەکانیان بە کونی دەرگاوە نووساند بوو لە دوورەوە تەماشای چرای سەر دەرگای ماڵی نووری بەگیان دەکرد کە سەوز دەچوو.
ناگلایە خوشکە چکۆلەکە گوتی:
- چاوتان بکەنەوە، لەو ماڵە شتێک دەقەومێ، ئەو قسانەی پیری وایان بە ئێمە گوت، لە بیر مەبەنەوە!
ئالیا لێی زیاد کرد و گوتی:
- بەگ ئەم شۆ بە گرژی چووە ماڵ. من خۆم دیتم. هەر گەیشتەوە و پێلاقەی بە دەرگا دادا. دەرگا کرایەوە و گوێم لە هاوارێک بوو. بێگومان دیسان لە توکەرەکەی داوە.
ئوفروزین بزەیەکی تاڵی هاتێ و گوتی:
- دەبێ کامیان هەڵبژێرێ، ئەسپەکە یا ئامینە؟ من ئەم دەوێست لە جێگای ئەوبم.
«سێ لەعبەتان» خەریکی باس و خواس بوون لەپڕ کوچەیان تاریکتر هاتە بەرچاو. تێکرا بوون، بە جار لە یەکتریان دەپرسی. هەرسێک چاویان لە کونەکان بری و بە نارە نار گوتیان:
- پاڵەوان میکێلس!
لە راستیدا هەر ئەو دێوە بوو کە بە سەرو روی گرژ و ریشێکی رەش و باتولێکی ماهووتی ئابی و چەکمەیەکی بریقەدار، چوست و چالاک لەو لاڕا دەهات. برۆ ئەستوورەکانی لە بن ریشووی پێنجەکەی‌دا ون ببوون، دەستی لە بەر پشت نابوو تا خەنجەرە دەسک رەشەکەی لەبەر پشتبەندی دا بشارێتەوە. بە بن دیواردا دەهات. بە پەنا ئەم دەرگایەدا تێ پەڕی کە خزیان لێ‌مات کردبوو. تاوێک ئاوڕی داوە، دەتگوت هەستی کرد کە چاوی لێ دەکەن لە تاریکی‌دا چاوی تروسکا، سێ خوشک هەناسەیان راگرت و لەرزین. پیاوەکە بە هێدی و بە فیز تێپەڕی و لەبەرامبەر دەرگای سەوز راوەستا. چاوێکی لەم لاولا کرد. کۆلان چۆڵ بوو تەنانەت پشیلەش دیار نەبوو. خێرا بە کۆلانە تەنگەکەدا دەرگای ماڵی نووری بەگی بە پالێک کردەوەو چوە ژوور سێ خوشک هاواریان کردو ناگلایە لە کاتێک‌دا خاچی دەکێشا گوتی:
- وای خودای من! دیتتان چۆن چوە ژوور؟ راست وەک دزێکی دەریایی.
- ئاخر بەگ چکاری بە پاڵەوان میکێلس هەیە؟ بێگومان شتێکی لەبن سەری‌دایە. من گرێو دەکەم کە بۆ فرۆشتنی ئەسپەکەیەتی.
- یا بۆ فرۆشتنی ئامینەیە.. هەرسێ خوشک جارێکی وەقرتەقرت کەوتن.

پاڵەوان میکێلس لە پێش‌دا لالی ڕاستەی لە دەرگا بردە ژوور و بە دردۆنگی‌یەوە سەیرێکی ئەم لاولای خۆی کرد. چاوی بە خولامی ڕەش کەوت کە چاوەڕوانی بوو. خولامێکی پیرو لاواز بوو کە میراتی باوکی نووری بەگ بوو بۆی بەجێ مابوو. ئەم خولامە تەواوی ڕۆژ و تا ئێوەشەو وەک سەگ لە پشتی دەرگای کالسکەخانە بێدەنگ مات دەبوو، کێشکی دەکێشا. لەوە دەترسا خەوی لێ بکەوێ، چونکە هەمیشە لە خەونی‌دا خودان لی‌ی تەدا. لە پڕیە چاوی بە ئەسرینەوە رادەپەری و دیسان بۆ لای دەرگ دەچوو و لە جێگای خۆی بە هەوای ڕۆژ بوونەوە ئەژنۆی لە ئامێز دەگرت.

کە پاڵەوا میکێلس دیت، ویستی ڕاست بێتەوە. دەنگی ئیستانی سواوو لەق و لۆلی کە ژانیان دەکرد دەبیسرا. تا پاڵەوان میکێلس قامکی گەیاندە سەرشانی، وەک لەنەردا دەهاتەوە و ڕێگای بۆ چۆل کرد.

میوان بە کاوە خۆ بە نێو گوڵدانی گەورەی سووری گوڵ و میخەکی هیندی‌دا چوە پێش. دارێکی لیمۆ لە قوژبنێکی باخ گوڵی کردبوو، بۆنی عەتر هەوای پڕ کردبوو. باخچەکەش کە تازە ئاو پرژێن کرابوو، بۆنی کود و شەمدانی لێ دەهات. لە ئاخری باخەکە، لەو شوێنە کە خانوو بەرەی ئاغا لە تاریک و ڕوون‌دا دەدرەوشا، کەوێک هێشتا لە قەفەسەکەی‌دا خەوتبوو. دەنگی پێکەنینی ژنان لە پشت پەنجەرەکانەوە دەبیسرا.

پاڵەوان میکێلس سەری بەرداێوە و بە بێزاری هەوای هەڵدەمژت. لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: «من لێرە چ دەکەم؟ ئێرە بۆنی تورکی لێ دێ!».

ڕاوەستا و ئاوڕێکی داوە، هێشتا بۆ گەڕانەوە درەنگ نەبوو. تەنیا خولامەڕەش ئەوی بینی بوو. هێشتا کاتی هەبوو کە لەوێوە دەرکەوێ. بێگومان «کاریتوس» لەو سەعاتەدا مایەنەکەی زین کردبوو. پاڵەوان دەیتوانی سواری بێت و لە سەرەوە تا ئاخری مەیدان بچێتە خوارو هێندێ بحەسێتەوە. بەڵام شەرمی کرد و لەبەرخۆیەوە گوتی: «دەڵێن ترساوە، نا... نا... پاڵەوان میکێلس بۆ پێشەوە».

بڕیاری داو خێرا چوە پێش، دەرگای ئەسلی خانوو کرابۆوە. فانوسێکی گەورە بە شووشەی سوور و سەوز لە سەر دەرگا هەڵواسرابوو. نووری بەگ خۆشی کراسێکی پنۆکاوی سور و سەوزی لەبەر دابوو لە چوارچێوەی دەرگادا ڕاوەستا بوو. ئەو دەنگی دەرگا کردنەوەی باخی بیستبوو. دەنگی قاچی میوانەکەشی ناسی بوو هاتبوە پێشوازی. نووری پیاوێک بوو ڕێچوو، تەلەو سنگ پان و ڕوومەت خڕو چاوڕەش. بە جوانی و هێمنی خۆر هەلاتی، ئەو شێرانەی وەبیر دەخستەوە کە لە پێشوودا ژنە تورکەکان بەشکڵی مانگی چاردە لە مافوورە شازەکانی ئێرانیان دەچنی. شاڵوارێکی ماهوتی عابی لە پێ‌داو پشتبەندێکی سووری گوشتی لە پشت بەستبوو. پێنچێکی سپی لە سەر بوو کە مووە ڕەشەکانی ڕاگرتبوو. عەتری لە بن هەنگلی دابوو، بۆنی حەیوانێکی درندەی لێ دەهات. حەیوانێک کە لە بەهاردا وەجۆش هاتبێ. هەنگاوێک بۆ پێشەوە چوو، دەستە ئەڵەوەکانی بۆ میوان درێژ کرد و گوتی:

– پاڵەوان میکێلس بمبوورە کە بانگم کردووی بۆ ماڵێ، پێویست بوو، دەزانی بۆچی؟

پاڵەوان میکێلس بۆڵەیەکی کرد و بێ ئەوە کە هیچ بێژێ بە دوای بەگ‌دا چوە ژوورێ. لەبەر دەرگا وەشک کەوت و ڕاوەستا. ئەم کارەی بێ بڕوایی نشان دەدا. سەیرێکی ژوورەکەی کرد.

کەسی نەدیت چرایەکی گەورە لە پێش کاناپە هەلکرابوو، لە مەنقەلێکی گەورەدا ئاگر دابوو، هەوای گەرمی وەتاخەکە، بۆنی تووتکە لیمۆی لێ دەهات. لە قوژبنێکی ژوورەکە لە سەر مێزێکی خڕ ترنگەیەکی چینی گەردن درێژ و دوو پیاڵە و چەند شتی خواردن دانرابوون. هەردووکیان لە سەر نیو تەختێک لە نزیک یەکتر دانیشتن. جێگای پاڵەوان میکێلس کەوتبوە پەنا پەنجەرەیەکی داخراو کە دەیڕوانیە حەساری. نووری بەگ قوتوویەک سیغاری لە ئاسنی رەش کە کەوانێکی سەدەفی لە سەر کێشرا بوو، لە بەر پشتی هێنا دەرو کردیەوە و بۆلای دەستەبرای راداشت. ماوەیەک بێ ئەوەی قسە بکەن، سیغاریان کێشا. بەگ پەشۆکاو دەهاتە بەرچاو، نەی دەزانی لە کوێوە دەست پێ بکات. چۆن مەتلەبەکە دەربڕێ کە میوان نەرەوێتەوە. ئەو باش دەیزانی کە پاڵەوان میکێلس پیاوێکە زوو دڵی دێشێ، ئەو قسەی ئەوشۆ پێی دەگوت، زۆر گرنگ بوو. ئاخرەکەی گوتی:

– پاڵەوان میکێلس چۆنە پێکەوە ئارەقێک بخۆینەوە! ئەو ئارەقە تایبەتیە بە من لەبەر خاتری تۆ ئەسپاردومە.

پاڵەوان میکێلس بۆ ئەوە نیشان بدا کە ئارەق ناخواتەوە، دەستی لەسەر پیاڵەکەدانا و گوتی:

– نووری بەگ دەتویست چی بە من بێژی؟

بەگ کزخەیەکی هاتێ و داهاتەوە تا سیغارەکەی لە خۆڵەمێشی مەنقەلدا بکوژێنێتەوە و ڕەنگی سوور هەڵگەڕا و گوتی:

– من لەگەڵ تۆ رک و راست دەدوێم. پاڵەوان میکێلس نارەحەت مەبە.

پاڵەوان بێدەنگ بوو. بەگ لەجێی خۆی رابوو تا بەردەرگا چوو. دوگمەی کراسەکەی کردەوە. گەراوە لە جێگەی خۆی دانیشتەوە. لە پڕ هەستی کرد کە سەرپێیەکانی تەنگن، بێ ئەوە دیار بێ لە لاکی دەرهێنان و قاچی رووتی لە سەر عەرزی فێنکی ژوورەکە دانا. پاشان رووی کردە هاوڕێ بێدەنگەکەی.

ئێستا بەک بڕیاری دابوو. خەریک بوو دەست بە سمێلی دا بێنێ، بەڵام لەبەر ئەوە نەوەک پاڵەوان بە خەراپی بزانێ دەستی داناوە. ئاخرەکەی هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

– «مانووساکاسی» برای تۆ خەریکە سووکایەتی بە دەوڵەتی عوسمانی دەکا. دوێنێ بە بۆنەی ٢٥ی مارسەوە دیسان سەر خۆش بوە، کەرێکی لە سەر شانی داناوە و بردوویەتە مزگەوت کە بە قسەی خۆی تووێژ بکات. من ئێستا لە گوندی دێمەوە. هاومەسلەکەکانی من گشتیان توورەن. هاو تایبەتەکانی تۆش چەکیان دەست داوەتێ، دەترسم بەدبەختیەکی گەورە بێتە پێش. ئێستا من تۆم ئاگادار کرد تا دوایە تەبەی سکاڵا بکەی. من بە ئەرکی خۆم زانی تۆ ئاگادار بکەم، ئەرکی تۆش ئەوە بوو گوێچکە بۆ قسەکانم رابگری. ئێستا خوا چت لە دڵی دەنێ وابکە! پاڵەوان میکێلس گوتی:

– بخۆینەوە.

بەگ پیالەکانی پڕ کرد، بۆنی بادرەنگ هەستا، پاڵەوان پیاڵەی لە پیاڵەی نووری بەگدا و گوتی: «بە سلامەتی».

نووری بەگ بە هێدی لە کاتێکا چاوی لە چاوی پاڵەوان میکێلس بڕیبوو، وەڵامی داوە:

- بە سلامەتی!
پاڵەوان میکێلس هەستا و ریشوی پێچەکەی کە نیوچاوانی گرتبوو، لای‌دا و گوتی:
- نووری بەگ هەر بۆ ئەوە منت بانگ کردبوو کە ئەو قسەم پێ بڵێی؟ هەر بۆیە بوو؟
بەگ بە ئەسپایی پشتبەندی میوانەکەی گرت و گوتی:
- ئەگەر باوەرت بە خوا هەیە مەرۆ. ئەم رووداوە ئێستا هەر پزیسکێکە، بەڵام لەوانەیە تەواوی کریت ئاگر تێ بەردا. براکەت راسپێرە دەست لە ئێمە هەڵگرێ، هەر دووکمان خەڵکی گوندێک و ئاو وخاکێکین. داتیشە با ئەو مەسەلەیە بپرینەوە.
پاڵەوان میکێلس گوتی:
- براکەم لە من گەورەترە. بۆتە شەست ساڵ. کورو نەوەی هەن، مێشکی لە سەری دا هەیە بێجگە لەوانە، ئەو ئازادە هەرچی بکا. من ناتوانم دەست لە کاری ئەو وەربدەم.
- ئاخر تۆ گەورەی گوندی، بە قسەی تۆ دەکەن.
- قسە شتێکی بەنرخە نووری بەگ هەروا بە هاسانی لە زار دەرنایە.
بەگ هەوڵی‌دا بە سەر خۆیدا زاڵ بێت. لێوەکانی گەست. چاوێکی لە پاڵەوان میکێلس کرد کە هەستابوو دەیویست بروا. لە دڵی خۆیدات گوتی: «ئەو کافرە لە بنەماڵێکی سەرکێشە. لەگەڵ ئەو رێک کەوتن ناگرێ. ئێمە پێکەوە گزنە حیسابمان هەیە کە دەبێ پاکی بکەین. بۆچما هەر ئەو (کوستاروس)ەی برای ئەو نەبوو- ئاگری لە گۆزی بەربێ- باوکی منی سەربری؟ من نەوددەم ساڵ بووم. نەوەندەم دان بە جەرگم داگرت تا ببم بە پیاو و تۆڵەی باوکم بکەمەوە. بەڵام قەت بۆم هەڵنەکەوت چونکە (کوستاروس) لە تەقاندنی عیبادەتخانەی (ئارکادی)دا کوژرا. ئەو دەم کورەکەی هێشتا شیرەخورە بوو. ئەگەر ئەوم کوشتبایە عەیب دەبوو. ناچار راوەستام تا گەورە دەبێ کاتێک گەورە بوو. سمێلی هات وەک ماسی لە دەستم دەرپەری و رۆیشت. وادیارە بۆ خوێندن چۆتە فەرەنگستان. کەی دێتەوە نازانم. خوێنی باوکم هێشتا هاواری تۆڵە دەکات».
بەگ رابوو تا بەر دەرگا چوو لەوێ راوەستا. قین لە سینگی‌دا هەڵدەچوو، دەنیشتەوە و نەدەتەقی. رووی لە پاڵەوان میکێلس کرد ریشی پاڵەوان پڕو قرژن لەبەر شوقی چرا دەدرەوشا. دەیانگوت: ئەو سوێندی خواردوە تا دوورگەی کریت ئازاد نەبێ ریشی نەتاشێ.بەگ لە دڵی خۆیدا گوتی: «بلاّ ئەو کافرە ئەوەندە راوەستێ تا ریشی دەگاتە سەر ئەژنۆیان. با بگاتە بەری پێی و تەنانەت لە عەرزیش بچێتە خوار. بەڵام کریت قەت ئازاد نابێ. ئێمە بە خوێن کریتمان گرتوە. ٢٥ساڵ لەبن بورج و قەڵاکانی ونیزی شاری کاندی شەرمان کردوە... ئێستا کریت لە دەست ئێمە دایە و بەری نادەین ئەگەر ئەویش ئێمە بەردات. ئەو ئێستا بۆتە بەشێکی خوێن و گۆشتی ئێمە».
بەگ بە یادی باوکی و بە یادی تەواوی ئەو موسلمانانەی لە دەوروبەری خەندەکی کاندی‌دا کوژرابوون. هەناسەی هەڵکێشا. لە نێوان ئەو و پاڵەوان میکێلس‌دا خوێن رژابوو.
پاڵەوان میکێلس نووری بەگی لادا تا خۆ بگەیەنێتە دەرگا و لەو کاتەدا گوتی:
- نووری بەگ وەک گا پشوت نەبە و خۆت مەخنکێنە! ئەوەی تۆ لە منت دەوێ نابێ.
مرۆڤێکی خاوەن ئیرادە بوو، بە سەر قینی خۆی‌دا زاڵ بوو، دەنگی ئەوی کرد و گوتی:
- پاڵەوان وامەرۆ. خۆت نارەحەت نشان مەدە. با خەڵک وانەزانن کە ئێمە شەرمان

بوو.ئەگەربە قسەکانمدڵت بەشاوە، من قسەکانم وەردەگرمەوە. نە من هیچم بە تۆ گوتوە و نە تۆش هیچت بیستوە. ئاخر ئێمە دەستە برا نین؟ من تۆم بانگ کردبوو کە پیاڵێک لێ بدەین و شتێک بخۆین. ئێستا کە لە گوند هاتوومەوە کەوم هێناوە. گۆشت کەومان هەیە. لام وا بوو خەراب نیە گۆشت کەو پێکەوە بخۆین و یادی سەردەمی منالی بکەینەوە کە یاریمان دەکرد.

نووری بەگ وانە کەوێکی لێ کردەوە و بۆ پاڵەوانی راداشت. پاڵەوان میکێلس گوتی:

– ناخۆم. ئەورۆ ئێمە بەرۆژوین.

نووری بەگ بە دەست نارەزایی دەربری و گوتی:

– سوێند بە خوداوەند ئەگەر زانیبام خاوباری رەشم بۆ دێنای. پیاڵەکانی پر کرد لە شەراب. پیاڵەی خۆی هەڵێنا و گوتی:

– بە سلامەتی تۆ پاڵەوان میکێلس! من زۆر خۆشحالم کە بۆ خواردنەوەی پیاڵە ئارەقێک بە دەنگی منەوە هاتی. وەرە لێم وەرگرە و بزانە، خوێنی من وەک ئەو ئارەقە برژێت ئەگەر قەت خەراپەی گیانی تۆم بوێت!

ئەوەی گوت و چەند دڵۆپە ئارەقی بە عەرزیدا کرد.

نێوچاوانی پاڵەوان میکێلس کرایەوە. دووبارە لە سەر کاناپەی نیزیک پەنجەرەدا نیشتەوەو گوتی:

– منیش، نووری بەگ خەراپەی تۆم قەت بە گیان ناوێ، بەڵام وا باشترە قسەکانمان بە وردی بکەین. پیاڵەکەی پێدا کرد. دووبارە هەر دووکیان بێدەنگ بوون. بەگ گەرمای بوو. هەستا پەنجەرە کردەوە. لە باخی دەنگی چۆرە چۆری ئاو دەهات. عەتری سوورە گوڵ و گوڵی لیمۆ دەهاتە ژوورەکە. لە حەرەمسەراوە دەنگی قاقای ژنان دەبیسرا. ئەم دوو پیاوە هەروا بێدەنگ بوون. نووری بەگ هەوڵی دەدا کە دووبارە سەری قسە دامەزرێنێ. پاڵەوان میکێلس لەگەڵ گوێدان بە دەنگی فوارەی ئاو و قاقای پێکەنینی ژنان بۆنی باخیشی هەڵدەمژت. قین و تووڕەیی دیسان دڵی وەژان خست. و لە دڵدا بیری دەکردەوە: «پێکەنینی ژنان و عەتری گوڵان و ئارەق خواردنەوە لەگەڵ تورکان ئەوەبۆتۆ بوو بە مانای کریت». لای پەنجەرەی وەها پێوە دادە کە بە دەنگێکی سامناک پەنجەرە داخرا. نووری بەگ بە دەنگێکی نارەحەت گوتی:

– بم بوورە پاڵەوان میکێلس، بە بێ پرسی تۆ پەنجەرەم کردبۆوە. ئەوەی گوت و پیاڵەکانی پڕکردەوە.

پاڵەوان میکێلس رووی وەرگێڕاو چاوی لە کابرای تورک کرد. هەر دووک لە گوندێک لە دایک ببوون. یەکیان کورە بەگ، خاوەنی گشت زەوییە باشەکانی گوندی و ئەوی دیکەش کوڕی پاڵەوان وسیفاکاس،ی رەعیەت بوو کە بێجگە لە بەردەلان هیچی دیکەی بۆ نەما بۆوە.

لەو سەردەمەدا مەسیحیەکان هەقیان نەبوو بە سواری هاتووچۆ بکەن.سیفاکاس تەنیا گوێ درێژێکی هەبوو. کاتێک لە رێگادا تووشی «هێنالی» ئەلەکۆ و باوکی ئەو نووری بەگە دەبوو، دەبوایە لە ولاغەکەی دابەزێ و رێگا بۆ بەگ چۆڵکا تا تێپەڕێ. بەڵام شەوێک سیفاکاس کە سەری گەرم داهاتبوو لە گوێ درێژ دانەبەزی. «هێنالی» بە قامچی وای لەسەریدا کە خوێنی پێدا هاتە خوار. پیرە مێرد زماتی نەگەڕاو راوەستا. لە دڵی خۆیدا گوتی: «مەسیح تورکی

ئەڵبانی نیە. ئەو مەسیحی تورتزدوکسە. ڕۆژێک هەقی منی لێ دەستێنێتەوە!»
نیزیکەی ساڵێک تێپەری بوو کە شۆرشی ١٨٦٦ ڕوویدا. «کوستاروس» کوڕە گەورەی «سیفاکاس» لە دەرەوەی دیوارەکانی کاندی، بەگی خوێنخۆری وەگیر کەوتبوو. لە بن پردی «پەندو» لە سەر بەردێک وەک مەر سەری بڕیبوو. ئێستا کوڕی ئەو «هێنالی»یە لە شاری کاندی لە خانووی گەورە و بە باخچە و حەسار و فوارەدا دەژیا. کاتێک هەوا خۆش دەبوو هەموو ڕۆژێ ئێوارن بە سواری لە گەڕەکی یونانیەکان دەسووڕاوە و ئەسپی لنگ دەداوپریشکی ئاگر لە بەردەکانی کوچە هەڵدەستا.
پاڵەوان میکێلس قوتو سیغارەکەی هێنا دەرو سیغارێکی هەڵبەست. بە لێوەیەوە نا و کونە تفنکی پڕ بوون لە دووکەڵ. تەی دەزانی لە ئاست ئەم تورکەی لە پەنای دانیشتبوو، قینی هەبوو، خۆشی.دەویست یا بێزار بوو. ماوەیەک ئەو پرسیارەی لە خۆ دەکرد، بێ ئەوە کە وەلامی بۆ بدۆزێتەوە. کاتێک ئەم دوانە بە هەڵکەوت لە کۆڵانە تەنگەکانی کاندی و لە مەزرای دەرەوەی شار بە سواری تووشی یەک دەبوون، پاڵەوان میکێلس هەستی دەکرد کە بە دیتنی ئەو دڵی شاد دەبێ. تەی دەزانی دەبەوێ بیکوژێ، یا لە ئامێزی بگرێ و وەک دەستە برایەک بە سینگیەوە بکوشێت.
کاتێک هەر دووکیان منداڵ بوون لە حەسارێ پێکەوە یارییان دەکرد، رایان دەکرد، بە شەر دەهاتن، ئاخرەکەشی ئاشت دەبوونەوە. ڕۆژێکی ئێوارێ کە هەر دووکیان ببوونە پیاوی تەواو، بە سواری لە بن پردی «پەندو» لە دەورووبەری خانووبەرەی کلاو غەرەنگی نووری، نیو سەعات دوور لە شاری کاندی، بە سواری تووشی یەک بوون. ماوەیەک شان بە شانی یەکتر، بێ دەنگ دەرۆیشتن. هەر دووکیان تووڕە و گڕژ بوون و لە دەست یەکتر هەراسان. تا لە نێوان تورک و فەلەدا کوشت و کوشتار کرابوو. کریت دووبارە دەهات ئاگر بگرێ. رەعیەت هەڵچەرخی بووتەوە.
هەر دووکیان گڕژ و تووڕە دەرۆیشتن. قەلا بەناو بانگەکانی ڤێنیزی شار لەبەر شەبەقی‌تاو پەردا رەنگی سووریان دەنواند. پاڵەوان میکێلس لەبەر خۆیەوە بیری کردەوە: «من تاکەی دەبێ ئەو سەگە ببینم کە هەموو جارێ سەرخۆش بێ و لە گەڕەکی مەسیحیان بسووڕێتەوە و ژنان عەزیەت بدا». نووری یەکیش لە دڵی خۆی دا دەیگوت: «من تاکەی دەبێ ئەو کافرە ببینم هەموو جا. ـە سەر خۆشی ئەسپ غار دا و ئابڕووی دەوڵەتی عوسمانی ببات؟».
هەر پارەکە نەبوو کە پشتێندی منی گرت و وەک مشک ڕەحەوای خستم و هاویشتمیە سەر بانی دوکانەکەی؟ خەڵک لێمان کۆبوونەوە و ناچار بە پێژەدا هێنایانە خوارو بووم بە گاڵتە جاری خەڵک».
ڕوومەتی نووری بەگ سوور هەڵگەڕان. لە حەیفان شێت دەبوو. ڕووی کردە پاڵەوان میکێلس و بە سەریدا نەڕاندی:
- هۆی پاڵەوان میکێلس، لەم شارەدا جێگا بۆ من و تۆ نیە. یا تۆ دەبێ من بکوژی یا من تۆ.
-گرێچکە بە فەرمانی تۆم نووری خۆشەویست. دەتەوێ لە ئەسپ دابەزین و لێکی دەزکەین؟
نووری وەلامی نەداوو چاوێکی لە کابرای یونانی، لەو شەڕوانە بە قیزە کرد و لە تەماشا کردنی

چاوی پڕ بوون. لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو پیاوە، چ سەرفرازێک، چ ڕەشیدێکە! قەت نە قسەی زیادی دەکا و نە قیشاڵ. نە لەگەڵ کەمتر لە خۆی بەشەڕ دێ. تەنانەت بۆ مردنیش سەر شۆڕ ناکات. خۆش بە حالی ئەو کەسە، کە دوژمنی ئاوای هەیە!» ئاخرەکەی گوتی:

- نا پاڵەوان میکێلس، نا. ئێمە بەو زوانە شەڕ ناکەین. چوونکە بەراستی حەیفە ئەوەی گوتم وەری دەگرمەوە. نە پێغەمبەری من و نە مەسیحی تۆ هیچیان ڕازی نین. من لە سەر ئەو باوەڕەم کە تۆ پیاوێکی ڕەشیدی. وەرە با بە جۆرێکی دیکە خوێنمان تێکەڵ بکەین.

- بەجۆرێکی دیکە؟

- بەڵێ، براگیان با ببینە هاو پەیمان.

پاڵەوان میکێلس ڕکێفی لە مایینی خۆ داو وەپێش کەوت. ڕق ئەوکی گرتبوو. تا ماوەیەک گوێی دابوە تەپەتەپی خوێنی کە لە شارەگی ملیدا لێی دەدا. کەم کەم هاتەوە سەرخۆ مێشکی روون بۆوە. لە بیری ئەوە کە خوێنی خۆی لەگەڵ خوێنی ئەم کورە ئاغا ئازدارە تێکەڵ بکا و ئیتر قەت نەتوانێ بیکوژێ، وەجۆش هاتبوو، ڕەنگە لە خۆشیان بووبێ. دەبوایە ئەم لێکرەی لە خۆ دوور خاتەوە کە هەموو جارێ لەگەڵ تووشی نووری بەگ دەبوو. دەستی بۆ خەنجەر دەبرد. ئەو مرۆڤە هەرچەند تورک بوو، مایەی شاتازی کاندی بوو. کەس نەیدەتوانی عەیبی لێ بگرێ. مرۆڤێکی ڕاستگۆ، باش، میهرەبان، دەست ئاواڵە، جوان و بە کورتی مرۆڤێکی تەواو بوو. پاڵەوان میکێلس جڵەوی مایینی هەڵەنگاوت و ڕاوەستا. نووری بەگ ڕکێفی لە ئەسپی داو گەیشتە پەنای. پاڵەوان بێ ئەوە ئاوڕی ویێ بدات گوتی:

- با بڕۆین!

هەر دووکیان مات و بێدەنگ بۆ لای خانووبەرەی کلاو فەرەنگی نووری بەگ وەلاخیان ڕاداو لە حەساریێ وەژوور کەوتن. نۆکەرهاتە پێش و وڵاخەکانی بردە تەویلە.یەک دوودەستی لێک دان وکڵفەتێکی پیر بە سەردانواندن هات، بەگ گوتی:

- ئەو کەڵە شێرە بۆیە گەورە بکوژەوە. شەرابی کۆن لە سارد او بێنە دەرو دوو دەستە نوێن بە لێفەی ئەتڵەسەوە ڕایخە. ئێمە ئەو شۆ لەم خانوەدا دەخۆین و دەخەوین. دەرگا داخە.

کاتێک تەنیا مانەوە لە بن پیرە دارە زەیتوونێک لە نێوەڕاستی حەساریێ کە نێوی کلوڵ بوو بەلام هێشتا بەری دەهێنا و گوڵی دەکرد، بەرەو ڕووی یەکتر وەک تورکان لە عەرزی دانیشتن.خۆر ئاوا ببوو تەنیا ئەستێرەی زوهرە گەش و بە ناز بە نێو گەڵاکانی دا شەبەقی داوێشت.

نووری بەگ لە جێ هەستا و کۆزەڵەیەکی هەڵگرت کە بە شێوەی کانی گشتی گوندیەوە هەڵتراشرابوو، ڕێبوار ئاویان پێ دەخواردەوە و سڵاوەتیان بۆ گیانی «هینالی» دەنارد کە سازی کردبوو. پاشان گەڕاوە لە جێگای خۆی دانیشتەوە خەنجەرەکەی هەڵکێشا و گوتی:

- بە ناوی پێغەمبەر و مەسیح!

پاڵەوان میکێلس باسکی هەڵکرد و باسکە ڕەش و سووتاو بە هێزەکانی وەدەرکەوتن. نووری بەگ نووکی خەنجەرەکەی بردە پێش و گەباندیە، ڕەگی باسکی پاڵەوان، خوێنێکی گەرم و ڕەش دەرپەڕی. نووری کۆزەڵەکەی بردە پێش و بە قەد قامکێک خوێنی تێ کرد. پاشان پێنجەکەی

لەسەری کردەوە و توند برینەکەی پێچاو گوتی:

- ئێستا نۆرەی تۆیە پاڵەوان میکێلس!

پاڵەوان میکێلس بە ناوی مەسیح و پێغەمبەر دەست بە کار بوو. خەنجەری هەڵکێشا و باسکی گرشانی و نەرمی نووری بریندار کرد و خوێنی لێ گرت و برینەکەی پێچا.

هەر دووکیان گۆزەڵەکەیان هێنا نێوە راست و بێدەنگ و بێ هەست بە نووکی خەنجەر خوێنەکەیان لێکدا. شەو درەنگ بوو، دووکەڵ لە دووکەڵکێشی کلاوفەرەنگی دەچوە دەرێ. تورکمەکان لە ژێرخان خەریکی نان خواردن بوون. ئەم دوو پیاوە پاش ئەوەی خەنجەرەکانیان بە مووی خۆیان پاک کردەوە، خستیانەوە کالان و نووری بەگ گۆزەڵەی هەڵگرت و بە دەنگێکی بەرز و پتەو وەک دەنگی دوعا دەچوو گوتی:

- دەخۆمەوە بە سلامەتی تۆ پاڵەوان میکێلس، برای هاو پەیمانی من. من بە پێغەمبەر سوێند ئەخۆم کە هەرگیز نە بەقسە، نە بە کردەوە، نە لەشەر و نە لە ئاشتیدا ئازارت پێ نەگەیەنم. بۆ تۆڵە ئەستاندنەوەی من یوتانی دیکە زۆرن و بۆ تۆڵە ئەستاندنەوەی تۆش تورکی دیکە زۆرن.

ئەوەی گوت و گۆزەڵەی بە لێوانەوە نا و بە ئەسپایی قومێکی لە خوێنی تێکەڵبوو خواردەوە، لێوەکانی سڕیەوە و کوزەڵەی دا بە پاڵەوان میکێلس. پاڵەوان کوزەڵەی وەرگرت و گوتی:

- دەخۆمەوە بە سلامەتی تۆ نووری بەگ، برای هاو پەیمانی من. سوێند دەخۆم بە مەسیح کە هەرگیز نە بە قسەو نە بە کردەوە و نە لە شەرو نە لە ئاشتیدا ئازارت پێ نەگەیەنم. بۆ تۆڵە هەستاندنەوەی من تورکی دیکە زۆرن و بۆ تۆڵە هەستاندنەوەی تۆش یونانی دیکە زۆر. پاشان گۆزەڵەی بە زاریەوە نا.

پاڵەوان میکێلس پەنجەرەی کردەوە، سیغارەکەی فڕێ دا دەر. قرنچکە سیغار وەک ئەستێرەیەکی بچووک و رەنگ سوور کەوتە نێو گوڵدانێکی میخەکی هیندی و لە نێو گوڵداتەکەدا کە تازە ئاو درابوو. کوژایەوە.

لە جێی خۆرابوو. روومەتی گرژ ببوو. بەگیش بە ترسەوە هەستا و گوتی:

- پاڵەوان میکێلس، من ئاموێ بە دڵ بەشی لە ماڵی من وەدەرکەوی. لە بیرمەبەوە ئێمە برای هاو پەیمانین. خوێنی خۆمان تێکەڵ کردووە.

- من لە بیرم نەچۆتەوە و هەر بۆیەش تا ئێستا هەر دووکمان زیندووین.

بیرەوەری شەوی گێرینی بن دارە زەیتوون و خانووی کلاو فەرەنگی وەبیر هاتەوە. ئەو خواردنە بە تام و چێژە و شەرابی کۆن و ئەو خەمە خۆشەی کە لە نێو لێقەر دۆشەکی ئەتلەسدا کردبوویان. گۆزەڵەی هەڵگرت و پیاڵەی پڕ کرد و بە سەریەوەنا،جارێکی دیکەش پڕی کردو خواردیەوە. ئاخرەکەی دانیشت وگوتی:

- ئەگەر لە ماڵێ چاوەشێک، گۆرانی بێژێکت هەیە بانگی کە بێ و دمەگ لێ داو وئامان ئامان، یێکمان بۆ بلێ، من خنکام.

نووری کەیف خۆش بوو. نوورەیی پاڵەوان میکێلس وەخۆشی گەرابوو. واتە کەوتبوە نێو ئارەق و دەعات نوقم دەبوو. لە پڕ ویستی بۆ شاد کردنی برای هاوپەیمانی خۆی کارێکی گەورە و بەرزتر لە نشانەی دۆستی و ئەوین بکات. تا ئەو پیاوە توورە و تۆسنە رام بکاو تۆزێ شاد و سەرخۆشی

بکات. ماوەیەکی درێژ بیری کردەوە و لە ماڵێ چاوی گێڕا تا شتێک بدۆزێتەوە و بیدا بە برای خۆی.

جەواهراتی قەدیمی، چەکی زێڕنشان کە بە دیوارەوە هەڵواسرابوون یا پارچەی کەتانی و ئاوریشم کە پڕی بەغدانەکان بوون، چی بداتێ؟ لە پڕ کەوتە بیری حەرەمسەرا و بیری بە نرخترین گەوهەری خەزێنەی خۆی. بزەیەکی هاتێ و رووی کردە میوانەکەی و گوتی:

- ئەم شەو لە بەر خاتری تۆ کارێک دەکەم کە تا ئێستا هیچ تورکێک بێجگە لە برای خۆی بۆ کەسی نەکردووە.

پاڵەوان میکێلس تەماشایەکی کردو هیچی نەگوت. جارێکی دیکەش پیاڵەکەی پڕ کرد، نووری لە جێی خۆی هەستا و چوە بەر دەرگی حەرەمسەراو بانگی کرد:

- ماریا!

قەرەواشە پیرەی قولەڕەش لە پلەکان هاتە خوار. ژنێکی پیرو گەنەفت و بێ ددان و خاچێکی زێری بچووک لە گەردنیدا.

نووری پێی گوت:

- بە خانمت بڵێ، سێ تارەکەی هەڵگرێ و بێتە ئێرە.

قەرەواشی ڕەش بە سەر سوڕمانەوە چاوی دەرپەڕیوەکانی هەڵێنا و تەماشای کرد.

بەگ بە دەست هەڵتەکاندنێک دەنگیدا و گوتی:

- یالا برۆ، ئیترا

پاڵەوان میکێلس کە دەیویست پیاڵەکەی پێنا کا لەولای داناو ڕووی کردە نووری بەگ و بە پەلە گوتی:

- ئەو کارە یانی چی؟

- ئەوە بۆ دڵخۆشی تۆیەو من بڕوام بە تۆ هەیە.

- نا، ئەوە کارێکی باش نیە و شوورەیی و شەرمە. بۆ تۆ شەرمە ژنت بێنیە بەرچاوی بێگانەیەک.

نووری تۆزێ وشک کەوت و گوتی:

- من بڕوام بە تۆ هەیە. لە فەرمانەکەی پەشیمان بۆوە، بەڵام تازە نەیدەتوانی وەریگرێتەوە. لە جێ هەستا بالنجێکی لەسەر ئەو تەختەکە دانا و یەکی دیکەی بە دیوارەوە نا تا جێگای خاتم ڕەحەت بێ. پاڵەوان میکێلس لە جێ خۆی هەستا و گڕی چراکەی تۆزێ داگێشا. نوورێکی نەرم لە ژوورەکە بڵاو بۆوە. دەسحێنێکی دەنگ وردی لە مەرجانی ڕەشی هێنا دەر و لە کاتێکا لە بەر توڕەیی چاوی دە عەرزی بڕیبوو، دەسحێنەکەی دەگێڕا.

لە ڕەتاغی سەرەوە دەنگی ژنان و قیژە قیژ و دەنگی لاق و دەرگای کراوە و پێوەدراو دەهات. پاشان ماوەیەک بێدەنگی باڵی کێشا.

پاڵەوان میکێلس چاوی هەڵێنا و لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئەو دێڵە سەگە نایە. ئەو ژنێکی جەرگسی وەحشی و سەرکێشە. نایەوێ بە قسەی بکا. باشترا هەزار کەرەت باشترا کام شەیتان پێشی ڕێی ڕشتنی من دەگرێ؟ من دەڕۆم!».

بەڵام لە پڕ لەو کاتەدا کە دەیویست بڕوا، دەنگی تەقە تەقەیەک لە پیلکانەکان هات. پلیکانەکان یەک یەک دەیان ناڵاند. پاشان دەنگی شادی هێنەر و خرم و هۆری بازنەو خرخاڵان دەبیسرا. نووری چوە پێش. دەرگای حەرەمسەرای کردەوە دەستی بە سنگ و لێو و نێوچاوانەوە نا و سڵاوی کرد و بە نەرمی و خۆشەویستی گوتی:

- قەدەم بەخێر ئامینەخانم.. فەرموو... وەرە ژوور.

ژنێکی جوان لە رووناکییەکی کەم دا هاتە ژوورو وەتاقەکەی رووناک کرد. روومەتێکی خڕ وەک روومەتی نووری. بەڵام زەریف و پڕ. چاوی گەورە و بادامی.سوورو سپیاو گراو، دەست و پەنجەی بە خەنە، سێتاریکی بچووکیبە دەستەوە، دەنگوت منداڵێکی لە ئامێز گرتوە قاچێکی لووسی لە سەندەڵی سووردا شاردبۆوە، هێنایە پێش و سەری هێنا ژووریٚ و کە چاوی بە نیسیٚی پیاوێک لە پەنا پەنجەرە کەوت، رەبەوە و تەزاندی. نووری بەگ باسکی گرت و گوتی:

- نازەنینی من، شەرم مەکە. ئەوە برای منە. من زۆر جار باسی ئەوم بۆ تۆ کردوە. ئەوە پاڵەوان میکێلس-ە. من و ئەو هەر دوکمان دڵ تەنگین. تۆ لوتف بکە و هێندێ سێتار-مان بۆ لێدە و هەوایەکی وڵاتی خۆتمان بۆ بڵێ تا خەم لە دڵمان بسڕیەوە. هەر بۆیەش ئێمە تکامان لێ کردووی کە بێیە ئێرە.

پاڵەوان میکێلس چاوی بەرداوونەوە و گوێ دەدایە. دەسچیبەکەی لە دەستیدا خڕکردبۆوە وای رێک دەکوشی، کەم مابوو دەنگەکانی وردەبکات. ئەو تەعریفی ئەم ژنە چەرکسە وەحشیی و دەنگی خۆش و گۆرانیەکانی بیستبوو. ئەوەی بیستبوو کە شەوانی جێژنە لە پشت پەنجەرەکان گۆرانی دەڵێ و گەرەک دەشێوێنێ.

تورک رفەلە هەموو لە کۆڵانی تاریکدا کز دەبنەوە تا گوێ بدەنە دەنگی خانم. لەو کاتیشدا نووری لە پشتی پەنجەرەکانەوە مەمکی ئامینە لە دەست دەگرێ و بە سەرعەرزوعاسماندا فیز لێدەدا.دەڵێی کورەی زەوی گرتۆتەدەست.

بۆنی توندی عەتر پاڵەوان میکێلسی تێگەیاند کە خانم وە نیزیک دەکەوێ و بۆ لای ئەم جێگایە دێ کە بەگ بۆی ئامادە کردوە. خانم بە پێش پاڵەواندا تێ پەری. سەرتاپێ تەماشای کرد و چاوی ترووسکان. راست لەو کاتەدا کە پاڵەوان میکێلس چاوی هەڵدێنا نیگایان تێک هەڵەنگوت. بەڵام هەر دووکیان گورج نیگایەکەیان لێک لادا.

خانم لە نێو باڵنجەکان دانیشت و قاچی هاویشتنە سەر یەک، پاشان بە عیشوە و ناز گوتی:

- چەندە تاریکە!... دیار بوو دەیویست بیبینێ.

نووری رابوو پلتەی چراکەی هەڵکێشا. ژوورەکە رووناکتر بوو. روومەت و دەست و پەنجە لە خەنە گیراوەکانی خانمی چەرکەسی دەدرەوشان.

پاڵەوان میکێلس چاوی هەڵێنا و لە بنەوە چاوێکی لێ کرد. بەڵام گورج سەری بەرداوە. دوو دەنکە دەسچیب لە دەستیدا ورد ببوون. خانم کەیفی بزووت بوو گوتی:

- سڵاو، پاڵەوان میکێلس.

دەنگی گڕی کابرا لە گەرووی هاتە دەر و گوتی:

- سڵاو ئامینە خانم. ببوورە!

- خانم پێکەنی. لە وڵاتی ئەو ژن بە سواری ئەسپ و بێ چارشێو شان بە شانی پیاو شەڕیان دەکرد. لەوێ ژن و پیاو بە کەیفی خۆیان دەستیان تێکەڵ دەکرد و لەزەتیان لێک دەبرد. بەڵام باوکی بە منداڵی ئەوی بە پادشایەکی پیری ئەستەمبوڵ فرۆشتبوو. پاشان ئەو بەگەی «کریتی» ئەوی لە پاشا دزیبوو لە گەڵ خۆی هێنابوو. بە جۆرێک ئەو دەرفەتی نەهێنابوو لەگەڵ پیاوان ڕابوێرێ و کامی دڵیان لێ بگرێ.

ئێستاش هەر چاوی بە پیاو دەکەوت وەک داعبای برسی دڵە کوتەی دەگرت و دەلەرزی. تەواوی ڕۆژ لە پشت پەنجەرە لاقی داوێشتە سەر لاق و تەماشای لاوە جوانەکانی تورک و عەلەی دەکرد کە بە کۆڵاندا تێ دەپەڕین. لە هەیوەسان مەمکەکانی داوسان. کاتێک بە پەچەی ئاوریشمەوە لە گەڵ دایانی پیر دەچوو گەڕان، حەزی دەکرد بە پێش ئەو چایخانانەدا تێ پەڕێ کە پیاوی زۆر لێ دادەنیشتن. یا لە گەڵ عەمباڵ و لۆتکەوانی ئازا و بە جەرگ بچێتە قەراخ لەنگەرگا. یا لە دەروازەکانی شار لە گەڵ گوندیەکانی ڕیش نەتاشراو وچڵکن و بۆگەن لە ئارەقە کە دەهاتنە شاری کاندی تێکەڵ بێ. خانمی چەرکەسی کونە تفنگی دەلەرزین و هەوای هەڵدەمژت. بەڵام نەی دەتوانی لە بۆگەنیی ئەو هەموو پیاوانە تێر بێ....

ڕۆژێک بە دایانی پیری گوت:

- ماریا، بەو خودایە ئەگەر ئەوانە ئەو بۆنەیان لێ نەهاتبایە هەر تەماشاشم نەدەکردن!

- ڕۆڵە، باسی کێ دەکەی؟

- باسی پیاوان دەکەم. مەگەر تۆ کە گەنج بووی چت دەکرد؟

پیرێژنی ڕەش هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:

- ڕۆڵە، من تەنیا باوەڕم بە خوا هەبوو.

ئەو شەوەش لە لای پاڵەوان میکێلس پەڕەی کەپۆی خانمی چەرکەسی لێی دەدا. لە ماتی و بێدەنگی‌دا تەماشای دەکرد. زۆر جار نووری بەگ تەعریفی ئەم پیاوەی کردبوو کەوا لە لای دانیشتوە. مەگەر خۆی چەند جار لە بارەی ڕەشیدی و جوامێری و بەدمەستی ئەو، لە بارەی ئەم وەحشیەتی‌یە کە نەی دەهێشت لەگەڵ ژنان بدوێ و باسی ژنانی بۆ بکەن، داستانی نەبیستبوون؟ئێستاش کە مێردەکەی خۆی ئەو پیاوەی هێناوە، چەرکەسیش بەرامبەری دانیشتبوو پەڕەی کەپۆی بە تەماعی‌لێی دەدا، دەتگوت دەیەوێ ئەم هەوایەی کە نێوان ئەوو پیاوەکەی گرتوە قووتی بدات.

نووری بەگ گوتی:

- ئامینە، نازەنینی من، تکا دەکەم هەوایەکی وڵاتی خۆتمان بۆ بلێ، تا خەم و ڕەنجی ئەم دنیایە لە بیر بەرینەوە. ئێمە مردین.. بەزەییت پێمان دابێ!

دەنگی وەک قاسپەی کەو لە گەرووی خانم هاتە دەر. پاشان سێ تارەکەی لەسەر ئەژنۆ داناو دەستێکی بە سیمەکان داهێنا و ئاوازێکی لێ‌هات. بەگ کە زۆر بە کەیف بوو گوتی:

- نازەنینم دەتەوێ چمان بۆ بلێی؟

- هەرچی خۆم دەمەوێ.

سێ‌تار وەناڕەنار کەوت. لەپڕ لە گەرووی خانم کە تۆزێ بۆ پێشەوە هاتبوو دەنگێکی ناسکی

ژنانه هاتە دەر، وەک فوارەی ئاو کە لە عەرز هەڵدەقولێ. ماڵەکە لەرزی و دەتگوت رووخا. پاڵەوان میکێلس هەستی کرد کە دەنگێک لە مێشکی‌دا دەبیسێ. دەنگێکی وەک هەرای شەر و پەلامار. لەبەریژ دەست و گەرو و سەرو پەراسوانی دا هەستی بە خۆشی و لەزەتێکی لە رادە بەدەر کرد. چیاکان ئەوی دەبوون. دەشتەکان لە رەنگی کلاوی سەربازانی تورک سوور هەڵگەرابوون. پاڵەوان میکێلس بە سواری ئەسپە رەشی نووری بەگی پەلاماری دەدان. هەزاران شەروانی کریتی دەسرە رەش بە دوای ئەودا دەهاتن. هیچ کەسیان لە پێش نەبوو. ئاوەدانیەکان دەسووتان. منارەکان بە زەبری تەوەرزین وەک سەری براو دەکەوتنە عەرزی. خوێن لە ئەژنۆی بەرزگی ئەسپانی دەدا. پاڵەوان میکێلس تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد. ئیتر نە کریت مابوو نە قەلا و بورجی کاندی. نەدەریا شوێنەواری مابوو نە خانووی دانشتن و نە مزگەوتیش بە سواری ئەسپی نووری بەگ وەژوور کلیسای ئەیا سۆفیا کەوت. لەوێ لە ئەسپ دابەزی. نیشانەی خاچی کێشا. چاوی لەگومبەزی کلیسا کرد کە لە عاسمان راوەستا بوو. زەنگوڵەکان گشتیان لە گزوی خۆیان هاتبوونەدرە مورتسوفلوس ەی مجێوری کلیسای (سن مێانس) کە چل گەز درێژ بوو، شریتی زەنگوڵەکانی گرتبوو لێی دەدان. خۆشی‌لەگەڵ زەنگوڵەکان دەی نەڕاند و دەی ناڵاند و سەمای دەکرد.

پاڵەوان میکێلس لاجانێکی بە هەر دوو دەست رێک کوشی. لە پڕ دنیا لە بزووتن کەوت. کریت و شاری کاندی و ماڵە بەگ و بەگ خۆشی هاتەوە بەرچاو کە پیاڵەی شەرابی بە دەستەوە بوو تەماشای ئامینەی دەکرد و هەناسەی هەڵدەکێشا. باڵی خەیاڵی پاڵەوان میکێلس شۆڕ بۆوە و چزوە نێو زیندانەکەی خۆی. دەنگی خانمی چەرکەس بێدەنگ ببوو.

تا ماوەیەکی زۆر کەس هیچی نەگوت. ئاخرەکەی ئامینە بزووت و دەستی کرد بە لێدانی سێ‌تار کە لەسەر ئەژنۆی بوو گوتی:

- ئەوە هەوایەکی کۆنی چەرکەسیە. کاتێک سوار دەچنە شەر ئەو گۆرانیە دەڵێن. نووری رابوو. ئەژنۆی دەلەرزین. لە ژنەکەی وەنیزیک کەوت. پیاڵەی هەڵێنا و گوتی:

- بە سلامەتی تۆ ئامینە! من بیستوومە پێغەمبەر سلاوی خوای لە سەر بێ سێ شتی خۆش ویستوە: «عەتر و ژن و دەنگی‌خۆش.» تۆ ئامینەی من هەر سێکیانی. خوا هەزار ساڵ و بەڵکوو دووهەزار ساڵیش ئەمەنت بداتێ! یەک سەر جامەکەی پێدا کرد. پاشان رووی کردە پاڵەوان میکێلس و جامەکەی بۆ پڕ کردو گوتی:

- بخۆوە براکەم... بە سلامەتی تۆیە.

پاڵەوان دوو قامکی دەپیاڵەکەی ناو پاشان لێکی کردنەوە و شووشەکە جرنگ جرنگ شکا و نارەق بە سەر مێزەکەدا رژا. پاڵەوان کە چاوی رەشکە و پێشکەی دەکرد، بە دەنگێکی گیراو گوتی:

- بەسە!

ئامینە قیژاندی. نەختێک خۆی هەڵێنا و بە چاوێکی سەرسوڕمانەوە تەماشای پاڵەوانی دەکرد. قەت دەستی هیچ مرۆڤێکی وا بە قەوەتی نەدیبوو. رووی کردە مێردەکەی و گوتی:

- نووری بەگ تۆ دەتوانی کاری وابکەی؟... دەتوانی؟

نووری بەگ ڕەنگی پەڕی. هەموو هێزی خۆی لە دەستی ڕاستەی‌دا کۆ کردەوە. دوو قامکی دەجامی شەراب‌نا. بەڵام خۆی دزراند. لەم زلڕان بازیە پەشیمان بۆوە. تارەقێکی ساردی لێ نیشت. تەریق بۆوە. بە چاوێکی تاریک و وەحشی تەماشای پاڵەوانی کرد و لە دڵی‌دا گوتی:
«جارێکی دیکەش لەگن ژنەکەم گاڵتەی پێ کردم. ئیتر ئەم وەزعە دەر ناپەڕێ، بەسە» باسکی ئامینەی گرت و ڕایوەشاند و بە تووڕەیی بەسەری‌دا گوڕاندی:
- بچۆوە ژووری خۆت!
ئامینە کە کولمەکانی سوور هەڵگەڕابوون، جارێکی دیکەش پرسی:
- تۆ دەتوانی وابکەی؟.ها... دەتوانی؟
بەگ دەنگی‌دا:
- گوتم بچۆوە ژووری خۆت! پاشان سێتارەکەی وەها لە دیواردا وردو خاش بوو. ژنی چەرکەسی بزەیەکی بەکەم گرتنی هاتێ و گوتی:
- تەنیا شکاندنی سێتارت لە دەست دێ نووری! بەراستی ئەو کارە هەر لە تۆ دێ.
هەستا و لە کاتێکا جلەکانی وەدەستی پاڵەوان میکێلس دەکەوت، بە پێش ئەودا تێ پەڕی. جارێکی‌تر هەوا پڕ بوو لە عەتر. پاڵەوان میکێلس هەستی کرد کە دەستی دەسووتێن.
ئامینە وەک گاڵتە پێ کردن و هاندان و کەڵەوەکێشی، یەک دوو جار بە دەوری نووری‌دا سووڕاوە و بە نیگایەکی سووکانە تەماشای کرد و پاشان بە پلیکانەکان‌دا لە پێش چاو ون بوو.
ئەو دوو پیاوە تەنیا لە بەرامبەر یەک ڕاوەستا بوون. بەگ دەستی بە سمێڵی‌دا هێناو پشووی ساراو ئاڵۆز بوو. پاڵەوان میکێلس بێ بزووتن، بە ڕوویەکی گرژ و مۆنەوە تەماشای نووری بەگی دەکرد. هەر دووکیان دەستیان لە سەر دەسکی خەنجەر بوو. ئاخرەکەی نووری زمانی هەڵپچڕا و بە شێوەیەکی ناحەز گوتی!
- پاڵەوان میکێلس برۆ، وە دوای کاری خۆت کەوە.
پاڵەوان لە وەڵام‌دا گوتی
- نووری بەگ هەرکاتی ویستم دەڕۆم. جامێکی دیکەشم بۆ پڕکە تا پێی‌دا کەم!
نووری بەگ دەسکی خەنجەری دەگوشی. بەخێرایی سەیرێکی چرای کردو ویستی غاردا بیکوژێنێتەوە. ئەو دەم هەر دوو لە تاریکی‌دا بەشەڕ دەهاتن. هاوار بۆ تیشکاوا نووری بە خێرایی بروسکە فیکری خۆی سووک کردو ڕەشک کەوت. پاڵەوان میکێلس بەکاوە خۆ گوتی:
- جامێکی دیکەم بۆ تێکە بیخۆمەوە، دەنا ناڕۆم.
نووری بۆلای مێزەکە هات، لاقی قورس بوون. تارەقی لێ دەچۆڕاوە. بوتڵی ئارەقەکەش قورس بوو. دەستی بەگ دەلەرزی. پیاڵە ئارەق پڕکرا. هێندێکیش بەسەر بەرماوی ئەودا ڕژا. پیاڵەکەی نیشانی پاڵەوانی‌داو گوتی:
- وەرە بیخۆوە!
پاڵەوان میکێلس گوتی:
- پیاڵەکەم وەدەستی دە!
بەگ بۆلەیەکی وەک ناڵینی لێ‌هات. پیاڵەی هەڵگرت و وەدەستی پاڵەوان میکێلسی‌دا.

پاڵەوان بە گرژی و بە قیز بۆ لێوی بردو گوتی:
- بە سلامەتی تۆ نووری بەگ. من بە خواهیشتی تۆ دەرۆم. بە براکەشم دەڵێم کە ئیتر سەرۆکایەتی بە دەوڵەتی عوسمانی نەکات.
پاشان لێوی بە ئاوەق تەر کرد، پێچەکەی توند لەسەری بەست و وەدەرکەوت.
فانوس خەتێکی سەوزو سووری داویشتە نێو باخ. پاڵەوان بە کاوەخۆ بێ ئەوە کە ئاور بداتەوە بۆ لای دەرگا رۆیشت.
ئێستا ئیتر شەو داهاتبوو. لە شاری کاندی هەموو نانی شەویان خواردبوو، هەموو سەرمایان بوو، دەخەوتن. پەنجەرەکان یەک یەک دادەخران. کاتی ئەوە هاتبوو هەموو نوێژەکانیان بکەن و بنوون. چەند کەسێک لە دەرەوە هێشتا دەسووڕانەوە. چەند ئەوینداری‌کیش بە بەر پەنجەرە داخراوەکانی یارەکانیاندا دەهاتن دەچوون. لە خانوویەکی بچووک دەنگی قسان دەهات.
«سێ لەعبەتان» لە پشت دەرگای ماڵەکەیان دەلەرزین. پاڵەوان میکێلس هێشتا نەگەیشتبوە کۆڵان. چوونکە شەو بوو، براکەیان وەک جاران بێدەنگ و بێ کەیف هاتەوە. خوشکەکان سفرەیان داخست. پێکەوە چەند قسێکیان کرد:
- سۆزی چ لێ بێنین؟ ئیتر نە رەژی ماوە، نە رۆن زەیتوون و نە نەوت. «ئارسیتوتلیس» دەبێ ئەوانە هەموو ئامادە بکات. هەرسێ خوشک لەگەڵ سفرە داخستن و هەڵگرتن قسەیان دەکرد.
بابوونەی‌کولاویان ئامادە کرد کە بۆ دامالینی خوراک پێویستە. کراسی درێژی شەویان کردە بەروتەزمی نوێژیان کرد. بەلام بیریان هەر لە لای دەرگای سەوز بوو.
پاڵەوان میکێلس بۆ چوونەوەی ماڵ، رێگای هەرە دووری هەڵبژارد. لەو شەوەدا نەی دەتوانی خۆی لە چوار دیوارێک‌دا حەبس بکات. دڵی لە قەفەسی سنگی‌دا لێی دەدا و لە لەشی‌دا گیر نەدەبوو. لە تەکاو شاری کاندی زۆر بچوک هاتە بەرچاو. ئەوەندە بچوک کە جێگای ئەوی تێدا نەدەبوەوە. ماوەیەکی زۆر بەرێگادا رۆیشت. لە دیتنی خانوو کۆلان و خەڵک هەستی بە خەفەت دەکرد. بە هەنگاوی بەرز و دانی دەچیرەوە بردو بەرەو پێش دەچوو. دەتگوت وەدوای کەوتوون.
گەیشتە شەقامێکی پان و چۆڵ. چەند فانووسی ئەوتی نوورێکی سوور و دووکەلاویان خستبوە سەر شەقامەکە. لەو بەری بازاری، کەبابخانەیەکی تورکان و چاپخانەیەک و دوو سێ مەیخانە هێشتا ئاواڵە بوون. یەکێک بە ناو بانگی کرد. بە خەیاڵی ئەوە کە دەنگی پاڵەوان «پولیکسینگیـە» هەنگاوی توند کردن تا خۆی لێ بپارێزێ. گەیشتە دەرکی ماڵە پاشای و پێش حەوزی فوارەی مەرمەر کە بە پەیکەری شێری ڤێنیزی رازابوە. چاوی هەڵێنا چنارە گەورە لەعنەتیەکەی دیت. لە تاریکی شەودا قاچی کێشا و لە دڵی‌دا گوتی: «خوا ئاخری پاشاوەکانتان وەخێر گێڕێ».
مەسیحیە شۆرشگێڕەکان پشتاو پشت بە دەستی پاشاکان لەو چنارە هەڵاوسرابوون. بە هاوین و زستان تەنافی گرێ دراویان لە لقی هەرە ئەستوری ئەم دارە هەڵاوەسی بوو تا ئامادە بێ. پاڵەوان میکێلس بە تووڕەیی چاوێکی لەو پیرە دارە کرد و راست وەک لەگەڵ تورکێک قسە بکات، لەبەر خۆیەوە گوتی: «سوێند بە ئاینم کە ئاینی مەسیحە، ببور دەست دەدەمێ‌و چناری لەعنەتی، لە عەرزت رادەکێشم.»

دیسان کەوتە ڕێ، بە کۆڵانە تەنگ و تاریکی وسێ تاقیدا کە دەگەیشتە مەیدانی گەورەی شاری گاندی، ڕۆیشتە خوارێ. کۆلانێکی چۆڵ. بەقەی کراسەکەی کردەوە و هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشا. لەولا لە سەرووی شار دەریا وەک ئاوێنەدەدرەوشا و دەیناڵاند. لە دەورو بەری ئەو چیاکان خەتێکی خۆڵەمێشی مەیل بە عابییان لە ئاسۆدا کێشابۆ ئەستێرەکان لە ئاسمانی بەرزەوە نووریان بڵاو دەکردەوە. پاڵەوان میکێلس وەک ئەسپێکی کەف کردوو خێرا دەهات و دەچوو. گەیشتە ئەو خەندەکە کە قەڵاتی شاری دەورەدابوو. لەبەرامبەر ئەو، لە سەر تەپۆڵێک چەند خانووی تەوی دیار بوون. ئەوان خانووی «گولان» بوون. لە خوارەوەی ئەوێ و هەورازتر لە دەریا تەپۆلکەیەکی دیکە دیار بوو. پێیان دەگوت: «حەوت تەبەرزین». پێش دووسەد ساڵ تورک لە پشتی ئەو تەپکەوە شاری کاندیان پەلامار دابوو، گرتبوویان و حەوت تەورەزین یان لەوێ لێ بەجێ مابوو. لە نێوەڕاستی دەریا دوورگەی چۆلی «دیا» وەک کیسەڵ سەری لە ئاو هێنا بۆ دەر.

پاڵەوان میکێلس لە پشتەوە گوێ لە دەنگی ژن و خشەخشی کراسی ئاوریشم بوو. پیرە تورکێک بە پشتی کووڕ و فانووس بە دەستەوە پەیدا بوو. لە پشت سەری ئەو دوو ژن کە پەچەی ڕەشیان گرتبوو، چەتریان هەڵدابوو، بە ئەسپایی دەیانگوت و پێدەکەنین. شەو پڕ ببوو لە بۆنی عەتری ئەوان. پاڵەوان میکێلس تێکرا بوو، بە بۆڵە بۆڵ گوتی: «ئەوشۆ هەموو شەیتانەکان وەدوای من کەوتوون. بەڵام دەستیان پێم ڕاناگات».

ڕووی بۆلای بەحر وەرگێڕا تا ژنەکان نەبینێ. لەپڕ هەنگاوی خێرا کردن تا زوو بگاتەوە ماڵێ. بێگومان ژن و کیژەکەی لە دوورەوە دەنگی لاقیان دەبیست. ئەو دەم ئەو دەکۆخی و ئەوان هەڵدەهاتن تا خۆیان بشارنەوە. ئەو پێلاقێکی بە دەرگا دادەدا، تا لێی بکەنەوە و لە پشت دەرگا کەسی نەدەبینی. نە ژنی و نەمناڵەکانی و نە سەگەکەی هیچیان لەوێ نەدەبوون. ئەودەم تەنیا دەماوە و لەوانە بوو بتوانێ بڕیار بدات.

کاترینای ژنی و ڕێنێوی کچی لە بن چرا بەلادا دەهاتن و چاوە ڕوانی ئەو بوون. جێگایەک لە پشت سەری ئەوان بوو، پاڵەوان هەمیشە لەوێ دادەنیشت. بێجگە لەو کەس نەیدەتوانی لەوێ دانیشێ. نیوتەختێکی باریک کە لەبن دیوار و لە نێزیک پەنجەرە دانرابوو بەسەر حەساردا دەیڕوانی. تەنانەت ئەگەر باوکی منداڵانیش لە ماڵ نەبایە، سێبەری قورسی ئەو لەو جێگایە هەست پێدەکرا. ژن و کیژەکەی نەیان دەوێرا زۆری لێ وەنێزیک کەون.

هەر دووک هەستیان دەکرد کە دەستیان وەوی دەکەوێ. ئەو هەست پێ کردنە وای لێ دەکردن کە بە ترس و لەرز بکشێنەوە.

دایک شتێکی دەچنی. شۆقی چرا لە پرچە بۆروخاوێنەکانیو لەبرۆ کەوانیەکان و ڕوومەتە خڕەکانی دەدا و نیوێک لە زار و چەنەگەی پانی ڕووناک دەکرد. لە سەر تاپۆی ئەو خۆشەویستی و مرحیبەت دەباری. لە کچێنیدا قەدوباڵایەکی جوان و ڕێک و پێک و لەباری هەبوو. کیژی پاڵەوانێکی ڕاستەقینە بوو. پاڵەوان «تراسیوولس رواس»ی باوکی کوڕی نەبوو. کاترینای کچی وەک کوڕان دەبزووتەوە. پاشان کاتێک شووی کرد بوو کەوتبوە چنگ نەڕە شێرێک. لە ساڵەکانی هەوەڵیدا، خۆی گرتبوو، منە منێکی گرتبۆوە، بەڵام کەم کەم دای نواند بوو چۆن دەیتوانی لەگەڵ پاڵەوانێکی وەک میکێلس پەنجە بازی بکا؟

توانا و ئیرادە و کەڵلەرەقی ژنەکە، جێگای خۆیان دابوو بە موحیبەت و مودارا و خۆشەویستی. هەمیشە دەی چنی و بیری دەکردەوە. سەردەمی ژیانی وەک ئاوێکی روون و تێ پەڕیو بە پێش چاوی‌دا دەرژیشت. جاروبار سەری هەڵدەێنا. تەماشای دەکرد. لە ژوور سەری، لە دەوروبەری، لە چواردیواری ژوورەکەی، رەسمی تەواوی قارەمانانی شۆڕشی ۱۸۲۱ کە گشتیان پڵنگی واقیعی بوون، بەریز لە قابی رەش‌دا دەبینران. لە نێوەراست و لە پێش قاپێکیان چرایەکی زێوی پچووک دەسووتا.

بای کاترینا سەبروکە سەری رادەوەشاند و بێدەنگ‌دە بوو. هەم لە ماڵی باوکی و هەم لە ماڵی مێردی تەمەنی لە نێو چەک‌دا رابواردبوو. لە شۆڕشی ساڵی ۱۸۷۰دا، پێش شوو کردنی، ئەویش وەک پیاوان بە تفەنگ و فیشەکدانەوە شەری کردبوو. تا ئەهێلی تورک گوندەکەیان بگرن. کاتێک منداڵ بوو، لە سەردەمی شۆڕش‌دا، ئەویش لەگەڵ منالانی‌تر، فیشەکی لە پەری ئەم کۆنە کتێبانە وەردەپێچا کە قەشەکان لە کلیسا دەیانهێنا. کاترینا بۆنی باروتی باش دەناسی و خۆشی دەویست. پاڵەوان میکێلس مێردێکی باش و بە ئینساف بوو کاترینای خۆش دەویست. بەلام ژیانی ئەو بۆ ژنێک فرە دژوار و سەخت بوو. جارجار سکالای دەکرد.

بای کاترینا ئەوەی دەی‌چنی لەو لای دانا و جارێکی‌تر سەری بەرز کردەوە. لە ژوور تەختەکە رەسمێکی باسمەیی گەورە وکۆن بە دیوارەوە هەڵاوەسرابوو. نیشانی دەدا کە فەلەستینیەکان گاڵتە بە سامزن دەکەن و رای دەکێشن لەگەڵ خۆیانی بەرن. دێوێکی مل ئەستوور لە نێوە راستی دەبینرا کە دەست و قاچیان بە تەناف وسیرمەی چەرم و بە زنجیر بەستبوو. پیاوانی تووڕە دەیانکێشاو بۆ پێشەوەیان دەبرد هێندێکی دیکەش بە شیشە تێکوتان ئازاریان دەدا و گاڵتەیان پێ‌دەکرد. لە سەر بورجێک، لە پشت پەنجەرەیەکی بچووک کە میلەی ئاسنی تێ‌گیرابوو، ژنێکی سازوعیشوەگەر بە سینگی رووت قاقا پێدەکەنی. ئەو ژنە دەلیلە بوو. بای کاترینا هەموو ژوورەکەی سەیر کرد، دەتگوت هەروەڵ جارە ئەوانە دەبینێ هەناسێکی هەڵکێشا و جارێکی دیکەش بە خەفەتەوە کاری خۆی دەست پێکردەوە.

کیژەکەی گەورە کچێکی پازدە ساڵە، قەدو باڵایەکی جوان و بەرچاو، چەنەکەی پان وەک چەنەگەی دایکی، خاوەن ئیرادە و بڕیار، برۆی پان و درێژ و وەک برۆی باوکی، تزرەکەی دەیچنی لەولای داناو سەری هەڵێنا و دەستی کرد بە لاواندنەوەی پشیلەکەی کە لەبەر دەستانی راکشابوو. لە دایکی پرسی:

- دایە، بیر لە چی دەکەیەوە؟ بۆ هەناسە هەڵدەکێشی؟

دایکی لە وەلام‌دا گوتی:

- دەتەوێ بیر لە چی بکەمەوە؟ لە ژیانی خۆم لە تۆ کە کەوتوویە چنگالی شێرێک. لە خوشکە بچولەکەت کە ناچار بووم حەبی خەوی بدەمێ تا خەوی لێ بکەوێ و نەگری. کاتێک ئەو منالە دەگری، باوکت لە تووڕەیی شێت دەبێ. ئەو بێچگە لە «تراساکی» نایەوێ منالەکانی دیکە ببینێ، ئەویش چونکە وەخۆی دەچێ.

بای کاترینا تەماشایەکی بەری مێبێن کرد و گرێچکەی هەڵخست و گوتی:

- رۆڵە هەژارەکەم. مات بوو و خەوی لێ کەوتوو! پاشان گوتی:

– ڕاست وەهایی دەچیٚ! تۆ دەزانی کە چۆن توورە دەبیٚ، چۆن برژیان تیٚک دەنیٚ؟ چۆن لە هاڤاڵەکانی دەداو چۆن لە لاوە تەماشای ژنان دەکا؟

«رینیو» وەڵامی نەداوە. ئەو لە باوکی دەترسا. بەڵام خۆشی دەویست و تەعریفی دەکرد. لای وابوو هەرچی باوکی دەیکا باشە. ئەگەر ئەویش پیاو بایە، راست وەک باوکی دەبزووتەوە. ئەویش تەنیا گوری ریٚگا دەدان بیٚنە لای. کچەکان دەبوایە کاتی باوکیان دەهاتەوە، دەبوایە رابکەن و خۆ بشارنەوە. «رینیو» پاش تەمەنی ١٢ ساڵە کە دەهات مەمکی خڕ بن، باوکی لیٚی ئەدەخە کرد کە نەبەتە بەرچاوان. سیٚ ساڵ بوو باوکی نەدیبوو. کاتیٚک باوکی لە ماڵیٚ بایە، دەبوایە ئەو لە تاشپەزخانە و یا لە ژووری بچووکی خۆیدا حەبس بووبایە. لە دوورەوە دەنگی قاچی باوکی دەناسی و گورج هەڵدەهات و خۆی دەشاردەوە. پشیلەکەشی دەنگی قاچی خاوەنەکەی دەناسی. کلکی شۆڕ دەکرد و بەر لە کیژەکە رای دەکرد. «رینیو» ئەم نەرم و زەبت و رەبتەی بە راست دەزانی و هەقی دەدا بە باوکی. دیارە نەی دەتوانی رووتی کاتەوە کە بۆچی وایە. بەڵام دڵنیا بوو کە باوکی هەقبەتی.

بای کاترینیاش هەر وای بیر دەکردەوە. بەڵام نەی دەتوانی لە لای خۆی دان بە هەقانیەتی میٚردەکەی دابنیٚ. ئەویش ئەگەر پیاو بایە وەک میٚردەکەی و وەک پاڵەوان «رواس»ی باوکی دەبزووتەوە. هەر ئەوە نەبوو کە ماوەیەکی زۆر ئەویش باوکی نەدەدیت؟ ئەوەدەم کە گۆیا بیست ساڵە بوو و هیٚشتا گەورە کچ بوو، شەویٚک سەربازی تورک خانووی پاڵەوانی پیریان گەمارۆ داوە باوکی تا توانیبوو لیٚی کوشتبوون، بەڵام ئەوان زۆر بوون... تورک ئاخرەکەی گرتوویانە و بردوویانەتە حەسارو ویستوویانە بیبەنە کاندی لای پاشا ئەو دەم کاترینا ودایکی لە ژووریٚ دەرپەریبوون. چاوی بە باوکی کەوتوە کە جلەکانی هەموو دراون و خویٚنی لە بەدەنی دەتکاوە. لە کاتی رۆیشتن‌دا دەستی هەڵیٚنا بوو گوتبووی:

– خاتراوە! ژنەکان نارەحەت مەبن. خوا ئاگادارتان بیٚ! نوێژی (مس)م بۆ بکەن. من بۆ ئازادی دەمرم. مەگرین. کاترینا تۆ میٚردی بکە، کوڕت بیٚ بە ناوی منی بکە «تراسووس».

پاڵەوانیان هیٚنا بوە کاندی و لە بەردەرکی ماڵی پاشا لە بن ئەو دارە گەورەیان داناببوو. پاشان دەلاکی تورک هاتبوو، بە چەقوو بە زیندوویی کەوڵی کردبوو. پاشان مستەفا پاشا، ئەو سەگە بیٚشەرمە، دەستووری دابوو تا کیسە توورتنی لە پیٚستی ئەو بۆ دروست بکەن.

تەواوی شەو ئەوانە وەبیر کاترینا دەهاتنەوە. لەگەڵ ئەوەش سەردەمیٚکی خۆشی لەگەڵ پاڵەوان میکیٚلس رابواردبوو، نەدەبوایە لە دەست ئەو سکاڵای هەبیٚ. پاڵەوان میکیٚلس مرۆڤیٚکی شەریف و بەریز و بە گوڕ بوو. هەرگیز تەماشای ژنی دیکەی نەدەکرد. دەستی لە وەرەقی تومار نەدەدا. لەچەرو چاو چنووک نەبوو.ساڵیٚ پتر لە دووجار بۆ شادی و رابواردن سەرخۆش نەدەبوو. ئەوەش بۆ پیاویٚک ئاساییە. پیاوی وا هەیە لەوەش خەراپتر دەکا. بەڵام ساڵیٚک بوو ژیان بۆ کاترینا پتر وەزەحمەت دەکەوت. پاڵەوان میکیٚلس بە هیچ جۆر نەیدەویست لە بارەی کچیٚکی ساڵی رابردوو لە کاترینا ببیسێ، هیچ ببیسیٚ. هەموو رۆژیٚ بەیانیان کە دەرگای دەکردەوە بچیٚتە دوکان، بە سەر ژنەکەیدا دەی نەراند کە:

– من نامەویٚ ببینم، ناومەویٚ دەنگی ببیسم، ئەو منداڵە ئەو چاوە شینانەی لە کویٚوە هیٚناوە؟

بیجگە لەو منالە شیرەخۆرە لە خێزانی ئەواندا کەس چاوی شین نەبوو. ئەو لەعنەتیە چۆن چاوی شین بوون؟ دەتگوت شتێکی پیس ڕێی کەوتۆتە لای‌خێزانی ئەوان، دەتگوت خوێنی پیس بوو. پالەوان میکێلس خۆی لە ئاست ئەم وەزعە ڕاندەگرت.

دایکی هەژار فرمێسکی دەخواردەوە و دەنگی نەدەکرد. دەیتوانی چی بە مێردەکەی بلێ؟

ناچار سەبری کردبوو، پێشە و لە بەرامبەر پەیکەری میکائیلی مەلائیکەدا کە گیانێکی مەلۆتکە و لەرزیوی وەک منالێکی مەلۆتکەی بە دەستەوە بوو. پەیکەرەکەشی هی ئەو بنەمالە بوو. ئەژنۆی دادەنان و دۆعای دەکرد. لە بەرامبەر پەیکەردا دەگریا و دەپاراوە. ئاخر مەگەر میکائیل پاسەوانی مالی ئەو نەبوو؟ بە پارانەوە داوای لێ دەکرد کە لە گەلْ مێردەکەی قسە بکات، شەوێک بێتە خەوی، لێی تووڕە بێ و دلە رەقەکەی تۆزێک نەرم بکات.

پالەوان میکێلس بە ڕۆژ لە دووکان ڕای‌دەبوارد. «کاریتوس» شاگردی لە مالەوە نانی بۆ دەهێنا. ئەو دەم، دایک منالەکەی لەسەر ئەژنۆی خۆی دەپێچاوە و دایدەنا هەرچەندی دەگریا با گریابایە. بەلام ئەگەر شەو دادەهات، حەیێکی خەوی دەدایە تا بنوێ و تا بەیانی وەخەبەر نەیە.

دەنگی «تراساکی» هات کە لە رەتاخی سەرەوە نووست بوو، لە خەودا قسەی دەکرد. دایکی بزەیەکی هاتی و گوتی: «وەفەتیرە لە خەویش‌دا ئاسوودە نیە، هەمیشە خەو دەبینێ کە ڕێ دەکەوێ و لێ دەداو بە سەر لەشکردا ئەمر دەکا و تورکان دەکوژێ... کاتێک گەورە بێ، ئەوەی ئێستا لە خەو بیبینێ، دەیکا، ڕاست وەک باب و باپیرانی... خوایە ئەو «کریت»ە تاکەی دەبێ قوربانی بدات؟»

دایک و کچ بێدەنگ بوون. ڕینیۆ لە پەنجەرەوە تەماشای شەوی دەکرد. هێشتا بای شەمال دەهات. دەنگێک لە کرکرەی پەنجەرەکانەوە هات.ناوە ناوە دایکێک‌دەبیسرا کە لای لایی بۆ منالەکەی دەکرد و بێشکەی ڕادەژاند. ڕینیۆ چاوی لە سەر یەک دانان. گوێی دابوە دەنگی‌لای لایی و بێشکە و مەمکی دەجوولانەوە. پاش ئاوێک بۆ ئەوە ڕچەی بگۆرێ، بە دایکی گوت:

- ئەرشۆ باوکم وەدرنگی کەوت.

- دەلێن نووری لە دوای ناردوە... نازانم ئەو سەگە چی لە گیانی ئەو دەوێ؟

ڕینیۆ پێکەنی و بە فیزەوە گوتی:

- بابم دیسان پشتێندی دەگرێ و تووڕی دەداتە سەریانی.

دایە سەری ڕاوەشاند و گوتی:

- بەلێ، بەلام نووریش پاشان بە تۆلەی ئەوە دەمەسیحی دەکوژێ. پێم گوتی: کە چارە رەشی «کریت» قەت بنەی نایە.

- تا باوکم زیندووبێ، من ناترسم.

- منیش لە بارەی باوکم هەروام دەگوت. بەلام تورکەکان شەوێکە...

کاترینا بێدەنگ بوو. پشیلەکە لە سەر ئەژنۆی ڕینیۆ تێکڕابوو.گرێچکەکانی بەرەو کوڵان قوت کرد. ژنەکان گرێچکەیان هەلخست. ڕینیۆ بە پەلە دەرزیی و دەزوو مەقەستی کۆ کردنەوە.

لە پێش ئەودا پشیلە بۆ ئاشپەزخانە هەلاتبوو. گیژی لار گوتی: «وادێتەوە ...»

- لە پشت دەرگای حەسارێوە دەنگی کۆخەیەکی وشک هات، «خزیەتی».

دایک هەستاو گوتی:

- دەچم چێشتەکەی بۆ گەرم دەکەمەوە. وادیارە ئەم شۆ نایەوێ کەس ببینی. ئەم گزخەیە بە ئانقەست و هەر بەو مەبەستەشە.

دەرگا بزووت و کرایەوە. پاڵەوان میکێلس هاتە ژوور. دەرگای داخست و بە ئانقەست خۆی گرت. لە حەسار تێپەری و چوە ژووری ماڵ. تەماشایەکی دەوروبەری کرد کەس دیار نەبوو. پێچەکەی دانا و سوخمەی قەڵایە درووی بە ئارەقەی داگەند. پاشان چوو لەسەر تەختی نیزیک پەنجەرە کە دەیرواتیە باخچە و جێگای دایی خۆی بوو دانیشت و دەسرەی لە بەرپشتی هێنا دەرو ئارەقەی سەروملی سریەوە و پەنجەرەی کردەوە تا باشتر پشوو بدات.

ژنەکان لە ئاشپەزخانە ئاگریان هەڵکرد تا نانی بۆ گەرم کەنەوە. پاڵەوان میکێلس گوێی لە دەنگیان بوو. پێی وابوو دەنگی زیقەی منالە شیرە خۆرەکەی بیستوە، نووزەیەکی بەسەر داهات. گوێچکەی هەڵخست، لە بێدەنگی بەدەر هیچ نەبوو. سیغارێکی پێچاوە و دایگیرساند. بەڵام زاری تاڵ بوو، سیغارەکەی لە پەنجەرەوە فرێ دا دەرێ.

پای کاتریتا بە مەجوعمە نانەوە هاتە ژوور و دەی‌ویست لە سەر میزی دابنێ. پاڵەوان بێ ئەوە سەر هەلبرێ گوتی:

- برسیم نیە، هەڵیگرە لای بە.

ژن بێ ئەوە دەنگی لە بەر بێتە دەر مەجوعمەی هەڵگرت و لەبەچاوی وون بوو.بێدەنگی ماڵەکەی داگرت. پاڵەوان میکێلس لە جێی خۆی هەستا، دووبارە سوخمەکەی کردەوە بەر و پێچەکەی لەسەر هالاند و بۆ لای دەرگا چوو. پاشان راوەستا، ئاوێنێ لە شک‌دا ما و سەیرێکی دەوروبەری خۆی کرد. رەسمی قارەمانانی شۆرش بە تفەنگ و فیشەکدان و حەوت تیر و بە سمێلی بادراو قژی درێژی تاسەر شانیان بە دیوارەکانەوە دەدرەوشان.

• پاڵەوان تا دەمێک خۆی لە بیر بردەوە. لە رەسمەکان راما و یەکە یەکە سلاوی لێکردن. ئەو نە ئاگای لە بەسەر هاتیان هەبوو، نە دەیزانی چ هونەرێکیان نواندوە. ئەیدەزانی لە کوێ بەشەر هاتوون و خەڵکی کوێن. «رۆمێن»، یان «مۆرەیی». خەڵکی «کریت»ن یا دوورگەکانی دیکە. زۆریشی ئەو مەسەلە پێ گرنگ نەبوو. تەنیا شتێک بۆ ئەو گرنگ بوو، ئەویش ئەوە بوو. ئەوانە گشتیان لە گەڵ تورک بەشەر هاتبوون. هەر ئەوەندە بۆ ئەو بەس بوو. لێکۆڵینەوەی مەسەلەکانی‌تر کاری مامۆستایان بوو. لە پێش رەسمێکیان، هەر وەک لە بەرانبەر پەیکەری پیرۆزدا شەوو رۆژ چرایەکی بچووک دایسا. کاتێک هۆیەکەیان لە خاوەن ماڵ دەپرسی بە وشکی لە وەلامدا دەیگوت: «ئەوە رەسمی سێ کاراپس کالیسە». پاشان لە بارەی مەسەلەکانی دیکەوە قسەی دەکرد:

کاراپس کاکیس فەرماندەی هێزی فەرەنگیان بوو کە میکێلس،ە شێتەی بابە گەورەی پاڵەوان میکێلس-یش لەم هێزە دا بوو. شەرێک کە یونانیەکان لە شوێنی بە ناوی «غالید» لە نیزیک ئاتێن لە مەتەریز دابوون تورکەکانیش راست لە بەرانبەر ئەوان خیوەتیان هەڵدارە میکێلسە شێت سەر خۆش بوو. فەرماندەی هێزیش دەستوری داوە تا بەیانی کە چارەرواتی هێزی بارمەتیە، کەس لە مەتەریز نەیەتە دەر. ژمارەی مەسیحیەکان کەم بوو. تورک چەند هەزار کەس بوون. میکێلسە

شێت و چەند «کریتی» دیکە بە سەرخۆشی لە مەتەریز دێنە دەر کە تورکان پەلامار بدەن. پێش وەخت لە نێوان دوو لەشکردا دەبێتە شەرو «کاراپس کاکیس» دەکوژرێ.

پاڵەوان میکێلس لەبەر خۆیەوە گوتی: «خەتای بابە گەورەم بوو. بەڵێ خەتای بوو... هەر چۆنێک بێ خۆشی بە گوشت چوو و ئێمەش هەمورمان دەگوژرێن».

پاڵەوان میکێلس چوە حەساریّ.چالاو وداره مێوکەی دەورەی چالاوی دا پۆشی بوو، عەمباره ئاوی پەنا چالاوکە.گوڵدانی کەلەدەوره دانرابوون، هەموو ئازاریان دەدا. لە حەساری چوه تەویلە. ماینە سپیەکەی لە تەویلەدا بریقەی دەدا. حەیران... گوێی راوەشاندن. خاوەنەکەی دیت. لە خۆشیان حیلاندی. پاڵەوان لێی وەنیزیک کەوت. بە بەری دەستە پانەکانی لاواندیەوە. تا ماوەیەکی زۆر دەستی بە مل و یاڵ و پشت و بەرسکی دادەهێنا... ئەو حەیوانێکی گەرم و بە موحیبەت و هەمیشە فەرمان بەردار بوو.قەت خاوەنەکەی ئازار نەدابوو هەتا ئاخری عومری وەک لەشی خۆی هەمیشە لە پەنای بوو.

دەستی پاڵەوان میکێلس ماوەیەکی زۆر لە نێو یاڵە درێژە و پرەکانی ماینەکەدا مایەوە. هەستی دەکرد کە گەرمی لەشی حەیوانەکە دەگاتە بەدەنی ئەویش. لە پڕ وای زانی کە پشت ملە ئەسترووەکەی خۆشی باڵی لێ رواوە و دە ئەوەندە بە قەوت بوە و قەلافەتێکی وای پەیدا کردوە کە دەتوانێ بە سەر دیوارو حەسارەکانی شاری کانندیدا بفرێ و بە حیلە حیلێک بە دەشتەکانی دەوری شاردا، راست بۆ لای ماڵی نووری بەگ بڕوا.

لە عەرزو لە بەدەنی ماینەکە هێزێک بەرز دەبۆوە و دەگەیشتە پانیەی کابرا. لەوێوە بۆ ئەژنۆکانی و خاڵگەی پڕ دەبوون و سنگی وەها دەئاوسا کەم دەما بتەقێ. ئەم هێزە قەوەتێک بوو لە عەرز و لە بەدەنی ماینەکە هەڵدەستا. هێزێکی وەحشی بوو. پاڵەوان لە بەر دەرگاوە بانگی کرد:

- کاریتوس!

ژنەکە هاتە دەرو گوتی:

- کاریتوس نوستوە.

- راستی کەوە.

چاوەروانی کاریتوس بوو. سیغارێکی داگیرساند. ئیتر تامی تاڵی لە زاری دا نەمابوو. سەیری ئەو دووکەڵەی دەکرد کە لە لووتی دەهاتە دەرو چاوەروان بوو.

کاریتوس خەو ئالوو گەیشتێ چاوەکانی‌دەکوشی. قژی ئالۆزو لیباسی شپرێو بێ پێلاو بوو کاریتوس هەرزەکارێکی ١٢ساڵە و کوری «فانوریوس»ی برای بوو. بە کورەکەی دەگوت:

«ئەوانە دەبانویست کە من و تۆ بکەنە مامۆستایەکی دەلقەک. بۆ چما نابینی کە «چس گورگی» مامت تووشی چ رۆژێک بوە؟ نازانی شاگردەکانی چۆن سەری داوێنە سەر و گاڵتەی پێدەگەن؟ بەدبەخت. ئەگەر دەرس بخوێنی چاوت خەراپ دەبن. ناچار دەبێ چاویلکە لە چاوت کەی. لە دوکانی من بێنەوە. کاتێک گەورە بووی، ئاقڵ لەسەریدای.دراوت دەدەمێ، دەیکەیە دەسمایە و رێگای خۆت دەدۆزیەوە». ئەو قسانەی بە «فانوریوس»یش گوتبوو.بیماملینە، لێی بدە بیکە پیاو».

پاڵەوان میکێلس پشت ملی هەتیوی گرت و رایوەشاند تا باش وەخەبەری بێنێ. پێی گوت:
- بچۆ لەسەر حەوز دم و چاوت بشۆ تا باش وەخەبەر بێی. پاشان وەرە کارم پێتە.
کاریتوس چوە حەسار، لە چالاو ئاوی هەڵکێشا، دم و چاوی شوشت، بە نینۆکان سەری بە شانە کرد و چوە کن مامی و گوتی:
- ئێستا وەخەبەر هاتووم.
پاڵەوان میکێلس دەستێکی لە سەر شانی دانا و گوتی:
- دەچی دەرگای ئەو پێنج ماڵانە لێ دەدەی کە دەیان ناسی، بەردێک دەست دەدەی. ئەوەندەی دەکوتی تا دەرگات لێ دەکەنەوە حالی بوری؟
- بەلێ... تێ گەیشتم.
- ماڵە «پادکش» ماڵی «مستیگری» ماڵی «کاپامبس»، ماڵی بیرتزلدۆ» مزکەوتیش کە ماڵی «ئەفەندی»یە.
- ئەفەندی تەپاڵە؟
- بەلێ، ئەفەندی تەپاڵە. بە هەمووان دەبێژی مامم پاڵەوان میکێلس سلاوتان دەگەیەنێ. سوزی شەمۆیە.. رۆژی یەک شەمۆ پێویستە هەمووتان بێنە ئێرە، تێ گەیشتی؟
- تێ گەیشتم.
- زۆر باشە، برۆ!
پاشان بانگی ژنەکەی کرد و گوتی:
- سێ مریشکان بکوژەوە. چێشت لێنێ. نان و نانی شیرین دروست کە. ژێر زەمینەکەش خاوێن کەوە و ئامادە بێ. مێزی پێنچک کورت وچەند نیو تەخت و چەند پیاڵەش لەوێ دانێ!
ژنەکە دەیویست بێژێ: «رۆژی پارێزی پێش راپەرینی مەسیحە. تۆ بۆ چما لە خوا ناترسی؟»
بەلاّم پاڵەوان بە دەست بێدەنگی کرد و ژن لاڵ بوو. هەناسێکی هەڵکێشا و چوە ژووری. بە رێنیزی کچی کە هەوری دەشوتن گوتی:
- هاوار بۆ من تەلەندەر، دیسان میوانمان هەیە. دەستوری داوە کە سێ مریشک بکوژمەوە، ژێرزەمینیش تەرو تازە خاوێن کەمەوە.
دەنگی تەقەتەی پیلکان دەهات. پاڵەوان میکێلس دەهاتە سەر بچێ بخەوێ.
رێنیز پرسی:
- چ باسە! هێشتا شەش مانگی تەرارددراو تێ نەپەریوە.بەلاّم لە خۆشیان دڵی لێی‌دەدا. ئەو پێی خۆش بوو ماڵەمیشە پر بێ لە جم و جۆڵ. ئەگەر پیاو لە ژێر زەمین کۆ دەبوونەوە شەرابیان دەخواردەوە و ئەو کەیفی دەکرد.
دایک بە پرتە پرت گوتی:
-دیسان ئەو پیاوە لەسەری داوە. شەیتان چۆتە کلیشەی،خاچی کێشا: «خوایا ئەگەر کوفرێ دەکەم بم بەخشە، چ بکەم، ئیترخۆم پێ‌راناگیرێ! ئەو ئیتر رۆژەکانی پارێزی پێش‌راست بوونەوەی مەسیحیش لەبەرچاو ناگرێ،ئیترلە خواناترسێ!»
جاریکی دیکەش بە ناهومێدی کەوتە بیری میکائیلی مەلائیکە و گوتی:

- چەندە لە بەر پێخانی چۆک دابنێم و دوعا بکەم! نازانم وتا ئێستا چەندە رۆژ و چەندە شەمم لە سەر میحرابەکەی سوتاندوە. بەلام هەموویان بێ کەلک بوون چونکە ئێستا هەر دووک پێکەوە یەکیان گرتوە . رێنێز گوتی:

- ئاخا ئەگەر منیش پیاو بام هەر وەک ئەوم دەکرد. ئەو رۆژانەی دڵتەنگ دەبووم ئەوانەم بانگ دەکردە ژێر زەمین و مەستم دەکردن، گۆرانیم پێ دەگوتن و پێم لێ دەدان و سەمام پێ دەکردن. بەو کارە خۆم خۆش دەکرد. پیاوەتی لەوە بە دەر هیچی تر نیە!

# ٢

لە کاندی ئەوشەوەشەوێکی تاڵ بوو. هەوا پڕبوو لە تۆزی بەهاران. تۆزێ پێش نیوەشەو لەجیاتی گزەبای شەماڵ، هەڵیکردە بایەکی گەرمی شەدار کەشیرەی دارەکانی زیاد دەکرد. ئەو بایە کەلە ئەفریقای شیمالیەوە دەهات، بەسەر دەریای لیبیدا تێدەپەڕی و دەشتی (مسارا)ی دەبڕی، بەسەربورج وقەڵای شاردا تێپەڕی و بەبن دەرکو پەنجەرەاندا خۆی خزاندە ژوورەکان و وەک پیاوکەوتە سەر ژنان و وەک ژنیش کەوتە سەر پیاوان هەمووی لەخەو کردن. لە مانگی ئەپریلدا ئەنبالە شەوێکدا خۆیگە پاندە دوورگەیە کریت»

پاشای شاری کاندی کە سەرەڕای پیری و کەوتوویی هەوەسی هەستابوو، لەخەو ڕاپەڕی و هەزنگ دەستی لێکدان تا سولەیمان قولەرەشی خولامی بانگ بکات. کاتێ خولام هات، گوتی:
سولەیمان پەنجەرەی وەکە، دەخنکێم . . . چەندە گەرمە ئەوبایە چیە؟

- گەورەم ئەوە بای ئەفریقایە، گەرمە بەڵام زیانی نیە. مەترسە، ئێمە بەو بایە ئێژین بای خەبار، چونکە خەباربندەگەیێنێ. - بای خەبار، ڕاستە بەڵام لەعنەت لەو بایە. بچۆ فاتمی قەرەواش بێنە، کەبفەهەستاوە. گزۆناوێکی سارد وپاوەشێنەکەشم بۆ بێنە، خۆم باوەشێن کەم. ئەو کرێتە لەعنەتیە ئاخری دەمکوژێ.

* * *

- خەلیفەی ئورتودوکسی کاندی". ش بە ۸۰ ساڵ تەمەن وریشی سپی درێژەوە لەجێ ڕاستەوەبوو، پاڵی وەپەنجەرەی بارەگای خەلافەت دا، تاهێندێ هەوای فێنک بژێ. هەموو شت ئارام بوو، ماڵەکان لەتاریکیدا خەویان لێکەوتبوو. لەحەساری بارەگای خەلیفە پیرە دارەلیمۆ گوڵی دەکرد و عەتری هەموو شوێنی داگرتبوو. لەئاسمانیش هەزاران چرا لەبەرانبەر تەختی خودا دابیسان. خەلیفە بەترس و پارانەوە لەعاسمانی پڕلە ئەستێرە ولەهەوای شەو ولەماتی قوڵی ڕەبیانیدا، تا دەمێک لەشی زەلامی هەرسەرمەقولاتی لێدەدا. پاشان هاتەوە سەر زەوی وهەستی بەسووکی و ئارامی کرد. لەحاڵێکدا نانێشکی وەپەنجەرەی ماڵی خوادابوو، خاچی کێشاو دوعای دەفعی شەیاتینی خوێندو فووی پێداکرد . ئێستا ئیتر لەشی سووک و فێنک بوو، چووە دەجێ ووراکشاو پاک و خاوێن خەوی لێکەوت.

نیزیکی سەعاتێک دوای نیوەشەو، پاڵەوان میکێلس بە تووڕەیی و نارەحەتی لێفەی لەسەر خۆ لادا ولەسەر دۆشەک دانیشت وگۆزەئاوی لێ نیزیکبوو، هەڵیگرت ودمی پێوەنا، دووسێ قومی خواردەوە تا خەوی هەوەسبازی لێ بڕەوێتەوە کە تەواوی شەو هەراسانی کردبوو. بەڵام خەو وەک دزێک چنگی لێ قایم کردبوو، وەک ژن خۆی پێوەتووساندبوو، نەیدەویست بەربیدا. پاڵەوان بەبۆڵەبۆڵ گوتی؟ «من لەعنەت لەخەو دەکەم، ئەو خەوەکەدەرگا لەشەیتان دەکاتەوە. »

ڕاست بزوەبەیێ پەتی چوە خوار ولەحەسارێ ستڵە ئاوێکی فێنکی لەچاڵاو هەڵکێشاو بەسەریداکرد، تا ئاگری دەروونی بکوژێنەوە. بەڵام هێشتاتامێکی شیرنی لەزاریدا مابوو. گنجی توورەیی لەنێو برۆکانیدا هەر دیار بوون. چژوە سەر دۆشەک ڕدانیشتو پەنجەرەی کردەوە. دەرەوە هێشتا تاریکبوو. گوێچکەی هەڵخست، کاندی لەخەوداببوو. دەنگی هەتاسەش نەدەبیسرا. بایەکی نەرم گەیزێنی ئاو وخاکی لێدەهات، بەنێو پەلکەمێوانیدا دەسووراوەو گە لاکانی وەدەنگ دەهێنا.

پاڵەوان میکێلس پاڵی وەدیواریدا وخەریکی سیغار کێشانبوو. ئیتر نەیدەویست دەستخۆشی ئەو خەوە شەیتانبەیێ،بوای بەخەوتن نەبوو. سیغاری دەکێشاو تەماشای پەیکەری میکائیلی مەلائیکەی دەکرد،کە میکلە شێتەی عاسمانانەو تووڕێنکی پڕ لەتیری بەشانیداکردەولەلای ڕاستەی دەمانچەی زێرینی خاچ لەسەر بریقەیان دێ، لەلای چەپەی تاجی بووکێنی کەلەگوڵی نارنجی بەهاری دروستکرابوو،پاک وخاوێن دیاریدەدا. لە ژووری کاترینادەنگی ناخ دەبیسرا. لەعەمباری قاتی سەروو مشکێک زیڕاندی، پشیلە بێدەنگ و گووج و گژڵ سەرکەوت،پاشان ماتی و بێدەنگی باڵی کێشاو جارێکی تر ماڵەکە لەخەودا نوقم بوو. پاڵەوان هەروا سیغاری دەکێشاو قین و شەرم لە نێو چاوانیوەلا نەدەچوون. چاوی بڕیبوە پەنجەرە پچووکەکەی ئەوبەری، چاوەڕوانی هاتنەدەری خۆر بوو.

بەڵام خۆر بەم زووانە هەڵنەدەهات. شەو هەروا تاریکبوو، بایەکەش هەردەهات و خۆی بەماڵاندادەکرد. بەسەرتەختی «سێ لوعبەتان»دا تێپەڕی کە سێ خوشکی گەورەکچ دەست لە دەستی یەک بەکراسی سپی خەو لێی نوستبوون.(ئاگلاتە) جارویار باسکە چرچەکانی کە مانای نازولاواندنەوەیان نەدەزانی لێک دەکردەوە، دەتگوت قدیلەی دەدەن، قاقاپێدەکەنی.

بەڵام زوو هێدی دەبزوەو مات دەبوو. ئەوژوورە گەورەیە بە سێ سندوقی جلی «سێ لەعبەتان» گیرا بوو، بۆگەنی لێدەهات.

ئێستا نیوەشەو تێپەڕیبوو.(چس گورگ)ی برای برای پاڵەوان میکێلس لەپشت مێزی پچووکی خۆی دانیشتبوو، دەتگوت هێشتا سەرمای پیرێژنییە، پەتوویی دەخۆ وەرپێچا وەو سەری بەسەر کتێبێدا گرتبوو.بەشۆقێکی زۆر تەماشای مێژووی شۆرشی دەکرد.لەو شەڕی براکوژی،لەو تاڵان و خەیانەتانە، هەرلەو کاتەشدا لەو قارەمانەتیانەو ئەڤین بەئازادی.«چس گورگ» جارویار چاویلکەکەی لەسەر چاوی لادەبرد و بەبیانوی ئەوەی خوێندنەوە چاوی ئازار دەدا خاوێنی دەکردەوە. سەعات بەدوای یەکدا رادەبردن و بایەکەش هەردەهات.پاشایەتی مانگی ئەپڕیل دەستی پێدەکرد.لەوکاتەدا کە پاشای تورک و خەلیفەی ئورتودوکس لەنیگەرانیدابوون، «چس گورگ»ی پشت کوڕدەلەرزی و چاویلکەی پاک دەکردەوە.

بێجگە لە «چس گورگ» و «سێ لوعبەتان» تەواوی خەڵکی کاندی لەبەر بای گەرمی ئەوشەوە دەهاژان.ئەو ژنانەی بەتەنیا نوستبوون، لێفەیان لەسەرخۆیان لادەبرد، پشوویان سوار ببوو، نەیاندەزانی ئازاریان چیە.ژنە بەمێردەکان لەخەودا ئامێزیان دەکردەوەو لەمێردەکانیان دەگەڕان.لەهەموان زیاتر «گاروفالیا» لەخانوە چکۆلەکەی نزیک لەنگەرگا کەتازە بەقسڵ سپیکرابۆوە، لەمێردەکەی دەگەڕا.ناهەقیشی نەبوو، چونکە یەکشەمۆی ڕابردوومێردی بە «کاپامبس»ی چەرچی کردبوو کەلارێکی زەلامی ملئە ستوور بوو.تراساکی بوە شاهیدی مارەکردنیان.ڕۆژەکانی هەوەڵێ نەیاندەویست تاوێک لێک جیا ببنەوە، گاروفالیا بەتوندی داخوازی

ئەو خۆشبەختبە بوو.چاوەکانی لەبەرگوڕمی شەهوەت بێحاڵ بوون. ماوەیەکبوو کاتی هاتبوو کە چێژە لەژیان وەرگرێ. وەک گوڵێک کەلەبیریان چووبێ ئاوی بدەن، دەهات سیس دەبوو.بەڵام لەپڕ ئەو خوایەی شوو دروست دەکا، کایامبیسی بۆ گەیاندبوویە.کایامبیس چەرچیەکبوو رۆژی شەممۆیان بەبانگ کردن گوندی وەسەر خۆدەگێڕا، خەڵکی کاندی نەبوو، لەچیاکانی دەوروبەر لەدایکببوو، بەڵام سێ‌ساڵبوو، وڵاتی خۆی بەجێ هێشتبوو، نەیدەتوانی بگەڕێتەوە.باوکی مردبوو، مێگەلەمەڕێکی‌بۆ ئەوو براکەی بەجێ‌هێشتبوو، لەسەر بەشەمیرات و لەسەر بەرانە گەورەکە لێیان بیوەشەر و خوێنیان وەجۆش‌هاتبوو، چەقۆیان لێک کێشابوو، لەبیریان کردبوو کە لەدایک وبابێکن. کایامبیس براکەی خۆی کوشتبوو، بەران و مێگەلە مەڕی‌بەجێ‌هێشتبوو، راێکردبوو، هاتبوە شاری کاندی و مابۆوە.هەژارو بێکار بە کەپەنکی شوانی وپێڵاوی دڕاو، چڵە ریحانەیەکی لەپشت گوێچکەی دادەناو بەمەیخانەکانی شاردا دەگەراو گۆرانی دەگوت.رۆژێکیان پاڵەوان میکێلس دیتبووی ، بانگی‌کردبوو :

ـ کایامبیس تۆ شەرم ناکەی بەو قەدوقەوارەوە، دەسوورێیەوەو گۆرانی گەدایی دە چڕی.وەرە من شتێکت دەدەمێ کەبتوان کاسپی پێوەبکەی و پیاوانە بژی.دراوێکی کەمی دابویە. کایامبیس کەرێکی کریبوو، هێندێ وردەواڵەی وەک دەزو وبێشت و سابوون و ئاوێنە وعەترو شتی‌وای کریبوو، قەرتاڵەیەکی پردەکرد و لەدێهات چە رچیەتی دەکرد و بەوەدەنگە خۆشەی بانگی دەکرد.

لەبەرامبەر ئەوەدا پاڵەوان شتێکی لێ ویستبوو: شەش مانگ جارێک ئەگەر بانگی کرد گیرنەبێ بچێتە کن پاڵەوان و تا ئیزنی نەدا لەلای بێت. رۆژێکی بەیانی لەگوندی کرۆسونا، لەسەر کانی چاوی بە گاروفالیا کەوتبوو، خۆشی گەرەک ببوو. لەگوندیەکانی پرسیبوو: داخوا لەخێزانێکی نەجیبەو باوکی پیاوێکی بەرێزە؟ خوازبێنی کردبو رێک‌کەوتبوون ، بەکشەمۆی راْبردوو تراساکی لەحەساری کلیسا تاجە گوڵی لەسە ری بوکێ نابوو.چونکە پاڵەوان میکێلس خۆی نەکەسی مارە دەکرد رنەکەسی دەشوشت.دەیگوت پێش هەمووشت ئەشێ کریت ئازاد بێ.

بووک وزاوا هەشت رۆژبوو لەژووریدا دەرگایان لەسەر خۆ پێوەدابوو، مانگی هەنگوینیان بوو. کایامبیس جاروبار رادەبوو، تفاق بدا بەکەرەکەی، گاروفالیاش خواردنێکی سووکی ئامادەدەکرد، دەیانخوارد وپاشان درێژ دەبوونەوەو تێک بەردەبوون.مەسیحیش لەقاپی وێنەکەیەوە لەبنەوە تەماشای دەکردن و بزەیەکی دەهاتێ و بەرەکەتی بەسەردا دەرژاندن.تەنیا لەو رێگایەوە بێشکەکانی کریت پردەبوون لەزارۆک وتفەنگیش بەبێ گۆڕان لەباوکەوە دەگاتە دەستی کوڕ وهەر لەو رێگایەشەوەو هەربە هێزی ئەومانگە هەنگوینانەوە، ئاخرەکەی لەوانەیە رۆژێک کریت ئازاد بێ.

شنەبایێکی بەهاری تا ئەولای کاندی ودیوارەکانی ڤێنیزی هات وگەیشتە گوندی گولان.ژنو پیاوێک کەتازە شاییان کردبوو، بەگوڕ وگەرمی تێکەڵی یەکببوون.خۆرە قامکی پیاوەکەی بردبوو، کێمی زەردی لێدەهات.ژنەکەش کەپۆی خۆرە لێی دابوو، بەو حاڵەش ژنی جحێڵ ئاگری گرتبوو، وەک پشیلە هەر دەیباوانید و گەرم داهاتبوو.پەڕیەکی سپی بەسەر دەرچاوی دادابوو، مێردەکەی دەئامێزیدا رێکدەکوشی.هەولێدەدا کوڕێکی بۆ دروست کا، بۆئەوەی زەلیل وکوێل لەدنیا نەبڕێن.

لەولای شاری کاندی لەوکاتەدا کە دوو زەلیل تێکەڵی یەکتر ببوون «باربایانیس» بەقۆڵی هەڵکراو ولەشی ئارەقاوی فانۆسێک بەدەستەوە، بەلەقەلەق بەکۆڵانی تەنگ وتاریکدا دەچۆوە ماڵێ

ولەعنەتی لەچارە نووسی خۆی دەکرد. تاقەشتێکی پاش مردنی ژنەکەی بۆی بەجێمابوو، خەونێکی ناسوودەبوو.بەڵام بۆچما خەڵک دەیهێشت بەبێ ژانەسەر چێژە لەخەو ببینێ؟ لەبەیانیەوە بە کۆڵانەکاندا دە گەڕا، زستانان بۆ گەرمبوونەوە چای دارچین وهاوینان بۆ فێنکایەتی شەربەتی دەگێڕا.دچۆوە تاوێنکبێوێ، ژنی دراوسێ و یا یەک لەخزمەکانی دەهات منداڵی ببێ، دەبوایە باریابانیس بچێ مامانی بکا، چونکە مامانیش بوو.باوکەفەقیرەکەی نالبەندبوو.لە زانی گەرومایتیش سەری دەردەچوو، زانستەکەی بۆ کورەکەی بەجێهێشتبوو.ئەو بۆ ژنانی بەکاردەهێنا. ئەوشەوە پلاژیای خوشکەزای نەجات دابوو. کارێکی چەند دژوار، سێ سەعات هەوڵیدابوو، تامنداڵەکەی لەبەر بردبوو، منداڵێکی خڕنەو ڕەش، کوڕیشبوو.

باریابانیس بەرێگادا دەرۆیشت و لەبەر خۆیەوە دەیگوت و لەعنەتی بۆ چارەنووسی خۆی دەنارد.لەپشتەوە گوێی لەدەنگی سمی ئەسپێک بوو، بەڵام نەک ئەو ئەسپانە کە ڕێنجەی دەخۆن و تەرسی دەکەن.باریابانیس لەدەنگی نەرمی قاچەکانی کە دەتگوت لۆکەیان لەناڵە کانی بە ستوە، وەلەو عەترەی بەهەوادا بڵاوی دەکردەوە، ناسی و زانی ئەو سوارە کێیە.چوونکە هەودڵجارنەبوو کە تووشی ئەو سوارە دەبوو.خۆی بەدیواریەوە نووساند، خاچی کێشاو ڕاوەستا. سوار نەرم وسوک دەتگوت لەهەوا غاردەدا، وەنزیک کەوت وبۆنی عەترەکەی بڵاو بۆوە.باریابانیس لەبەر خۆیەوە ناوی خوای هێناو گوتی: « ئەی سن میناسی پیرۆز سڵاوت لێ بێ. »

وەک ئیماندارێک چاوی هەڵێناو تەماشایکرد.سن میناس، ئەو پیری نووڕانی، ئەو پشتیوانەی کاندی، سواری ئەسپی لغاو زێڕ، لەکاتێکا نیزەیەکی سوورلەسەر شان و زرێنکی بریقەدار لەبەردا. بەریشی کوریەی ماش وبرنجیەوە ڕاوەستابوو.ئەو بەگوێرەی دابوشوێن، هەموو شەوێ کاتێک کاندی لەخەوی خۆشدادەبوو، بەگورجی لەپەیکەری خۆی دەهاتەخوار وبەبن دیوارەکانی شاردا دەچوو گەڕەکی بوناتیەکان. ئەگەر کەسێک دەرگای پێوە نەدابا، ئەو پێیەوە دەدا.ئەگەر مەسیحیەک نەخۆش کەوتبا، لەبەر پەنجەرەی ئەو رادەوەستاو دوعای بۆدەکرد، تا خوا شیفای دەدا. ئەو لەبەر چاوی خەڵک دیارنابێ، تەنیا سەگ دەتوانن ببینن و کلکەسووتەی بکەن. لەتەواوی شاردا دوو کەس دەتوانن ببینن. یەکیان باریابانیس و ئەویتریان ئەفەندی تەپاڵە ئەو حاجیە شێتەیە.

سن میناس کاتێک لەگەڕانی شەوانە بۆوە، دەچێتەوە دەقالبی پەیکەرەکەی،کەسیش نازانێ کەشەوچقەوماوە.مۆرتزۆفلوسی خزمەتکاری کلیسا نەبێ کەبەیانیان لەکلیسادا دەسووڕێتەوە ئەسپی ئەم پیاوە موبارەکە بەتەڕی دەبینێ.

باریابانیس کەچاوی بەسوارەکە کەوت دەڕوا و لەتاریکیدا ون دەبێ، نشانەی خاچی کێشاو لەبەر خۆیەوە گوتی:« ئەو شەویش ئەوە دیتم.ئەوە.بۆمن پێوە هاتنە». نانێکی قەندی تایبەتی کە هەویرەکەی بەشەرابی شیرین گیرابۆوە و لەپاداشی زەحمەتی مامانیی پلاژیادا وەری گرتبوولەباخەڵی دەرهێنا وبەنیشتیاو بەخۆشیەوە دەستی بەخواردنی کرد. ناخرەکەی گەیشتەوە کاولەکەی خۆی وفانۆسەکەی کوژاندەوە.

پاڵەوان میکێلس سەفاری دەکێشاولەفیکردابوو.مێشکی وەک مێش هەنگرین هەر وزەوزیبوو.

هەرچی لەژیانیدا بەسەری هاتبوو، هەرچی خۆشی ویستبوو، یالبی بیزاربوو، گوندەکەی، بارکی ،خانووەکەی، خەڵکەکەی بەتورک و فەلەوە،گشتی وەبیر دەهاتنەوە.لەوکرابوساپوە تا عیبادەتخانەی«توپلو»،واتەلەوسەری گریتەوە تائەم سەری. بیری لەم لوتکەوە بۆ ئەو لوتکەو لەم شۆرشەوە بۆ ئەو شۆرش دەرۆیشت ونەیدەویست لەهیچ جێ تۆزقە بگرێ.تەنیا لەدەوروەی زاری سوورو هەوەسبازدا دەگەڕا وبەنیو لێوانیدا دەچوەژوور ونەیدەویست بێتەوەدەرێ.

بەتوورەیی لەجێ رابوو، دەتگوت فەرمانی پێدراوە کە لەرەحەتیو ئارامی دەوون و خەیاڵ دەست هەڵگرێ ولەو سەرە بێتە خوار ولەجیهانیدا نەزم بەرقەراربکا. پاشان رووی بۆ لای پەنجەرەی پچوک وەرگێرالە عاسمانی تاریک راماو گوتی:«خۆزیا زووتر دەبوو بەرۆژ تا بزانم چیبە سەر دەهات . » لە پلیکانان هاتە خوار و چوە حەساری. دیسان ستلێک ئاوی ساردی بە سەر خۆداکرد وەهەستیکرد حاڵی باشتر بوە.لەبەر دەرگای ماڵێ دانیشتو چاوەروانما.

لەولاشەوە نوری بەگ بەهاتوچۆ شەوی دەگەیاندەرۆژ. دەچوە نێو باخ ودەهاتەوە ژوور. سیغاری بەسیغاری دادەگیرساند.بێ ریچان ئارەقی دەخواردەوەو دەیناڵاند و تەماشای پەنجەرەی حەرەمسەرای دەکرد.خانمی چەرکەسی دەرگای لەسەر خۆ گاڵەدابوو، نەیدەهێشت بێتەژوورێ، لەکوتی قفڵەوە بەسەریدا دەگوراندو دەیگوت:

- ئیتر تۆم ناوێ، تۆ ئابرووی منت بردوە، تۆ ئیتر لەمن ناوەشێیەوە. خۆشی نەیدەتوانی چاو لەسەر یەک دابنێ، نیوەرووت لەبەر پەنجەرە راوەستابوو،باسکەکانی بەرەو گەرەکی یونانیەکان لێک دەکردەوەو دەمارەکانی دێناوە سەرخۆ.لەو تاریکیەدا بژ وریش و دەستەبەلەوەتەکانی پاڵەوان میکێلسی دەهاتە بەرچاو.نوری بەگ دەیناڵاندو لەبەر خۆیەوە دەیگوت:« ئەم ژنەهەڵیەتی هەتی بەدەستە». دەستی کرد بەگریان و دیسان گوتی:«بەو زوانە بەدەردی ئەفەندی تەپاڵە دەچم.هەموو جارێ کە ئەو کافرە میوانداری دەکا، منیش بانگ دەکا تابیم بە گاڵتەچی.»

بەیانی زوو خولامی رەش چاوی بەخاوەنەکەی کەوت لەبەر دەرگا نوستوە، وەک سەگ خۆی خڕکردۆتەوە،سەروسنگ ولیباسی بە ڕشانەوە پیس بوە.

ئەفەندی تەرسە بزە لەسەر لێوی خەوی لێکەوتبوو.شەوی پێش بۆیان راگەیاند بوو کە لەماڵی پاڵەوان میکێلسی میواندارییە.ئیتر تا هەشت رۆژان خەم وخەفەتی برابوو.لەو ماوەیەدا تا دەفەلێشا گزتلێنی بەرازی دەخوارد و شەرابی دەخواردەوە.تا هەشت رۆژ لەدەست نەداری نەجاتی دەبوو. پاشان جەهەنەم خوای دەکرد دەدڕا.

ئەفەندی چاوی لەسەر یەکدانان وگەمەی بەریشە تەنک و خورمایەکەی کرد و خەوی لێکەوتەوە.لەو کاتەدا کە نوری بەگ بیری لەوە دەکردەوە، ئەفەندی خەونی دەبینی.لەخەویدا دیتی دەرگا کرایەوە و بەرازێکی زەلام وەژوور کەوت ، خاوێن وقەڵەو ولێمیشی لەسەر بوو.لە جیاتی تەلبیم و دوعا کێردێکی دەملی کردبوو. بە راز کەچاوی بەئەفەندی کەوت، هەستا سەر پاشوانیسەری بۆدانواند.کێردی لەملی کردەوەو دەگەرووی خۆی راکرد، پاشان وەعەرزی کەوت. ئەفەندی دیتی بەراز لە گەلای لیمۆ پێچراوەتەوەو باش برژاوە وبۆنێکی خۆشی لێ هەڵدەستێ.لەخۆشیان هاواری لێ هەستاو لەکاتێکا زاری پڕدەبوو لەئاو، لەخەو راپەڕی.

لەو سەعاتەدا کە هەژار ونەداران لەسەر گورەی زەوی وەجۆش دەهاتن و هێدی دەبوونەوە،

ڕەلجیان دەکێشاو تیک دەوەروکان،تاقی ئاسمان بەشێوەیەکی هەست پێنەکراو دەسورا، ئەستێرەکان جێبەجێ دەبوون و ئەستێرەی بەیانی هەروەک زەنگوڵەی ڕاوەشێنراو، وەسەر لوتکەی چیاکان دەکەوت.لەحەساری ماڵی پاڵەوان میکێلس کەڵە شێر چاوە خڕەکانی لێک کردەوەو تەماشای ئەوشتانەی کردکە لەو سەرانە ڕادەبرا.پاشان باڵی لێکدان و بای دەچیکڵدانەی کرد و دەستی کرد بەبانگدان.ڕووبەڕوو لەماڵی«کراسۆ گئورگیس» ی جوتیاری دەوڵەمەند، نێرەکەرێکی قبرسی کونە تفنگی فشکرد و هەوای بۆنی لەوەڕی هەڵمژی وکلکی کردە ئاڵاو زەڕاندی.

کاندی لەخەو وەخەبەر دەهات.لەوسەرەوسەری گۆلان، لەکانی ئیدۆمنە تا دوکانی نانکەری «تۆلۆپاتاس»،گەرەکی پاڵەوان میکێلس وەجموجۆڵ کەوتبوو.لەپێشدا بای«ماستراپاس» قاچی مێردەنیمانداری زەنگوڵە فرۆشەکەی کردەوە کەهەموو شەوێ لەتەختی دەبەست.چونکە ئێرەیی پێ دەبرد و دەترسا شەو بچێتە زگ «ئامێنا» ی کارەکەریان کە بە قەڵافەتێکی وەک دێوی وەمەکی وەک گوانی مانگا لە متبەقێ دەنوست.لەو ترسانە هەموو شەوێ دەیبەستەوە. کاتێک شەو دەیویست بچێتە سەرئاوێ،دەبوایە ژنەکەی وەخەبەر بێنێ تالاقی بکاتەوە. بەوحاڵەش سەرێکی پەتەکە هەربەدەست ژنەکەیەوە دەبوو تەوەکوو لەبەر دەستی ڕابکاو خوارەی بکا.

پاڵەوان «پولیکسینگیس» پێش تاوێک لە شەوگەڕی هاتبۆوە.ئاغادیمتروس لەپەنا بای «پینلوب» ی ژنی باوێشکی دەهاتێ. خانم ئەو شۆش وەک شەوەکانی دیکە بەکەیف نەبوو.بەبۆڵە بۆڵ لێفەی لەسەر خولادا.لەتەمەنی ٤٥ ساڵیدا لەشی وەها گەرم دەبوو، دەهات گڕبگرێ.با سارد دەبۆوە.ئەوێ ڕۆژێ لای بەیانی لەگەرمان دەهات ئاگر بگرێ. لەتەختەکەی هاتەخوار، بەبێزاری و توڕەیی چاوێکی لە ئاغا دیمتروس کرد کە هەروا باوێشکی دەهاتێ. چوە بەر پەنجەرەو مەمکەکانی وەبەر بایدان تا فێنک بنەوە.

ئاسمان سپی هەڵدەگەرا، پەلەوەرەکان لەدەوروبەری ماڵێ وەخەبەر هاتبوون.لەم خوارە لە ماڵی کراسوگئورگیس بولبولێکی دەنگخۆش لە قە فە سەکەیدا ڕۆژی کردبۆوە و دەیخوێند. بای پێنلوب هەناسێکی هەڵکێشاو بەناڕەنار گوتی:

ـ خۆش بەحاڵی بای کراسوگئورگیس، هەر چەند مێردەکەی دیهاتیە، بەڵام گە نجەو بەهێزە. هیچی لەژنەکەی وەچاو نیە.گونجکەی هەڵخست، دەنگی پرخەیەک وەک خڕکەی گاجوتی لەماڵەکەی بەرامبەریان دەهات.کراسوگئورگیس قەڵەو بێ شاڵوار لەسەر گازی پشتێ نوستبوو. سمێڵی بۆنی پیوازو شەرابی لێدەهات.ژنەجحێڵەکەی «کاتینتیـــا» ی کیژی باربایانیس، تێرئاو وکامرەوا ، بزەیەک لەسەر لێوان، لە تەنیشتی نوستبوو.وەک کۆتر لەخەودا غەڵبە غەڵبی بوو. خەونی دەبینی کە تازە بیوە دەسگیران و لە باخێکدا لەگەڵ ئەویندارەکەی قۆڵ لەقۆڵ دەگەڕان.کراسوگئورگیـــی دەسگیرانی یەکی نەتاشراو نیە، لاوێکی جوانچاک بە سمێڵی تنج ڕەقۆی درێژی ئابەنووسی و دەمانچە بەقەدەوە، هەناسەی بۆنی دارچینی لێدەهات. ڕاست وەلاوێک دەچووکە وێنەکەی لەماڵی پاڵەوان میکێلس دیبوو.لەسەری نووسرابوو:«ئیتاناسیوس پاکوس».لەو کاتەدا کە لاوەکە دەستی هاویشتبوە نێو قەدی و پێکەوە چووبوونە گەرانێ، خەونێکی ئورس وەک دارەمێوێکی پڕلە هێشوە ترێی ڕەش،بای کاتینیتسای داگرتبوو، ئەویش وەک کۆتر گمەی دەهات.

وای لێهات کەشەیتان دەستی گەیاندێ.کراسوگئورگیس دەنگی ژنەکەی بیست خۆی بزاوت

وچاوی لێک کردەوە و گوتی:

ـ ژنەکێ، چت لێهاتوە بەو بەیانیە لێوانت دەلێسیەوە، وەک کۆتر گمەت دێ!چما نانی لەندی بەهەنگوین وگوێزدەخۆی؟

ژن وەخەبەر هات. بەمێردەکەی گوت :« لێم گەڕێ با بنوم، خەوم دێ، دەستم لێ هەڵگرە !!
دوو بارە چاوی لێکنان وبەناهومێدی هەوڵیدا لەتاریکیدا دە سگیرانەکەی بدۆزێتەوە.

هەوڵین دوکەڵی قەڵەو ونەستوور لە دوکەڵکێشی تەندووری «تۆلۆپاناس» ی نانکەر بۆ ئاسمان دەچوو. نانکەری پیر کزوکەوتوو، بۆنەوەی خەم وخەفەتی بڕەوێنێ، هەستابوو کاری دەکرد.کەسێکی ئاقەکورێکی بیست ساڵەی موو زەردی جوانچاکی هەیە و بۆ عاملاتدنێنی درێخی نەکردوە،وەک گلێنەی چاوی پاراستوویەتی، بەڵام پێش سێ ساڵ ڕۆژێکیان لەپڕ کورەکەی بای دەکا وهەموو لەشی دەبێتە زیپکە و نینۆکی هەڵدەوەرن،چۆن دەتوانێ بێ خەمرخەفەتبێ؟ ئێستا لێرەکانیشی دەهات پاسێن.بەڵام دایکو بابی نەیاندەناردە خانووی گولان، نەیاندەتوانی لەتاقەکوڕیان جیا ببنەوە.چونکە بێجگەلەو کەسیدیکەیان شک نەدەبرد.لەترسی ئەوەی کەس نەیبینێ لەژووریٚ حەپسیانکردبوو.ئاخر تولوپاناس چۆن دەیتوانی‌خەوی خۆش بکا وزار بۆ پەیف لێک کاتەوە.؟خۆی بەتانوهەویرەوە خەریک دەکردو لەکزڵانان بۆ فرۆشتنی کولیچەو نانی لەندی دەستکردی خۆی دەسووراوەو هەمیشە کاریدەکرد.بەڵام کاتێک دەبینی کورە تاقانەکەی ڕۆژ لەڕۆژ پتر بەرەو توانەوە دەچێ و گۆشتە ڕزیوەکانی لەسەر جێگا هەڵدەوەرن،چۆن دەیتوانی ئەرامۆشی بێتێ؟.

تولوپاتاسی پیر کە خۆی بەکارەوە خەریک کردبوو.ئاخەم وخەفەمی بڕەون، سەری هەڵبڕی دیتی کە پەنجەرەی خانووی ڕووبەڕووی هێشتا ڕووناکە.بە خەمو پەژارەوە سەری راوەشا ند و گوتی:« فەرانسەیی فەقیر ائز هێشتا خەفەت دەخۆی: توی بەدبەختیش خەمێکت لەدڵدایە، ئەم دڵەی مرۆڤ قەت خۆشی لێ نابینێ.

لەراستیشدا چرای ماڵی ئەو ژنەفەرانسەییە هەژارە تەواوی شەو نەکوژابۆوە.فەقیرە دەکۆخی و تفی فڕێدەدا و هەناسەی هەڵدەکێشا.ئەوە ژنی دوکتور «کاساپاکیس» بوو.دوکتور لەفەرانسە هێنابووی، لەو سەری دنیا لەگوندی تورکانی دانابوو.خانم لەسەرەتاوە تەنیا هەناسەی هەڵدەکێشا، پاشان دەکۆخی و ئێستا خوێنیشی لەزاری دەهات.دەیانگوت دوکتورئیترخۆشی ناوێ.دەگەڵ ئەرەواشەکەی دەنووست کە وەک مایین وابوو، خەڵکی گوندی (ئازکالو) بوو.خانمی فەرانسەیی بە سکاڵا بە دوکتوری گوتبوو:« ئەم ڕێگا ئاسنەی قەرار بوو بەپێش ماڵی ئێمەدا تێپەڕێ کوانێ‌ئ؟ تۆ لەپاریس وات بەمن نەگوتبوو!

دوکتور بەبێشەرمی بەژنەکەی پێکەنیبوو، گوتبووی:

ـ ئێمە لە گاندی بەکەرێ دەڵێین : ڕێگای ئاسن!

پاڵەوان مێکێلس مات وبێدەنگ لە حەساریٚ وەستا بوو. چاوەڕوانیبوو ڕۆژ بێتەوە.لەگەڵ خوێندنی کەڵە شێری سەری هەڵێنا دیتی ئاسمان ڕووناک دەبێ. بەپەلە چوو ژوورەکەی. لیباسی کردەبەر و پشتێندە درێژەکەی چەند جار لەپشتێ هاڵاند و خەنجەرە دەسک ڕەشەکەی لەبەر پشتێ چەقاند.پاشان گۆزەلە ڕۆنی هەڵگرت، چراکەی پڕ کرد کە وە پتە پت کەوتبوو.سەرێکی پەیکەری

پشتیوانی (میکائیلی مەلایکە)ی کرد و گوتی:

- من دەڕۆم، هەر قسێکی هەمانبوو پێکەوە کردمان. دەڕۆم و ماڵەکەش بەتۆ دەسپێرم.هاتەحەساری، ماینەکەی زینکرد و دەرگای کردەوەو خۆی هاویشتە سەر زینی و بەرەو دەروازەی لازارە کەوتەڕێ.هەوا روناک دەبوو.دەروازەوانی تورک کلیل بەدەست دەچوون چوار دەروازەی شار بکەنەوە.دەرگای ماڵە کان هێشتا داخرابوو، بەڵام دووکەڵ لەهێندێ ماڵان هەڵدەستا.بارباپانیس لەماڵ هاتبووەدەر و بۆ فرۆشتنی شتەکانی بەکۆڵاناندا دە گەڕا.هاواری دەکرد و چای زەنجەفیل و خەستی دەگێڕا.پاڵەوان میکێلس ڕکێفی لێداو بەغار بەپێش چنارە زەلامەکەی داری مەسیحیەکاندا تێپەڕی.دەوری مەیدانیدا و گەیشتە (سێ تاق).تاوێک راوەستاو تەماشای دەوروبەری خۆی کرد.چیاکان وردە وردە زەوەدەهەڵدەگەڕان. (زاڵم کێو)بەکەمەرگاشەبەرد و هەڵدێر بوو.لە پشتەوە چیای(ئیدا)وەک مرۆڤێکی بەسام و سەرسپی‌و بە فیز وێستابوو. لە لای راستە پەیکەری وەرگەڕاوی عەزیا کەپێیان دەگوت (پۆشتاس) دەبینرا.جەغزی باریکی سەوزو عابی کەوتبوونە سەر رەنگی سپی دەریا کە لەدوورەوە دەبینرا.لۆتکە رەشەکانی ماڵتی ئێستا بە باتازۆی سوورەوەلەنێوە راستی دەریادا بوون.خۆر سەری لەپشت لاکاوەکان هێنابوە دەر وخەرمانەیەکی لەدەوری دەبینرا کەنیشانەی بای گەرمبوو.ماین ئاوڕیداوە چاوی بەخۆر کەوت.لەخۆشیان چاوی زەقبوون و باڵەکانی بە نیشانەی سڵاو راوەشاند و حیلاندی.

تەپڵیان لێدا، ئاڵای عوسمانی بەدارەکەیدا بۆ سەرێ‌هەڵکشا.دەروازەی گەورەی کاندی بەدەنگێکی وشک کرابوەوە.ئەو گوندیانەی کە لە بەرەبەیانیەوە لە پشت دەروازە چاوەروانبوون.بەبارەدار و زوخاڵ ومەشکەی شەراب ورۆنی زەیتون و قەرتاڵەی پڕ لەسەوزی و میوە .کریەی پڕلەهەنگوینەوە، بەجارێک بە پاڵەپەستە رژانە نێو شار.بۆ هاتنەنێو شار هەموویان دەبوایە بەژێر تاقێکی تاریکدا بڕۆن کەلە دیواری قەلای ئێنێبۆی هەڵکەنرا بوو. لەژێر ئەم تاقە بەردیە هاوار وهەراودەنگی لاکی زەلامان وزەڕەی کەرو ولاخان تێکەڵ دەبوو. دەنگی دەدایەوە.پاڵەوان میکێلس بەنێو ئەوحەشیمەتەدا ڕێگایەکی بۆ خۆی کردەوە.گەیشتە مەزرا وبۆلای رۆخی دەریا شۆڕ بۆوەو لەوێوە بەرەو زاڵم کێو و زەویەکانی[سورەگل] رکێفی لێدا.لەلای راستەی زەوی بۆنی سەوزەی لێ دەهات و لای چەپیشی دەریا بوو.خۆر هاتە خوار و وەک تەلەسمێکی ئاڵتون بەملی ماینەکەوە هەڵاوەسرا .پاڵەوان ئاوڕی داوە لای رۆژ هەڵات و نیشانەی خاچی کێشا و لەژێر لێوانەوە ناوی عیسای مەسیح و میکائیلی مەلایکەی هێنا.

کاندی نوقمی نوور بوو.خۆر پاش رووناک کردنی دوکانەکان و گومەزی شینی کلیسای (سن میناس) ئەمجارە نووری بەسەر بانی خانوەکان وکۆڵانە شەدارەکاندا دەپڕژاند.گەورەکچەکان پەنجەرەیان دەکردەوە، پیرێژنەکان پێشوازیان لێدەکردتاگەرم بنەوە.نیشانەی خاچیان دەکێشاو شوکرانەیان دەکرد کە مارسی دوور خستۆتەوە. مارس ئەو قاتڵە لەعنەتکراوە کە دوژمنی ژنانە.ئێستا پیرێژن دەیانتوانی لەبەر تیشکی هەتاو خۆ گەرم کەنەوە و بەخێر هاتنی مانگی ئەپریل ، مانگی حەزرەتی سن ژۆرژ بکەن.

گوێدرێژەکانی کریتی گورج بەهەموو دەروازەکاندا رژانە نێو شار و کلکیان کردبوە ئاڵاو بەزەڕە زەڕ مزگێنی بەهاریان رادەگەیاند.

بای پێنلوپ هاته حه سار وباوێشکێکی بەدەنگی هات.ئێسکەکانی وەدەنگ هێنا.ئەو زۆر پیر نەبوو.سمتێکی زل وگۆشتی ژێر چەنەی داکەوتبوو.باش دەیخوارد و هەزمی دەکرد.جلی دەشوشتن، کاباتەتی دەکرد، ئاغا دیمتروسی مێردی وەک ئەسپ دەلەوەڕاندو خزمەتی دەکردو هەموو شەوێش هەولی دەدا تۆزێک بیحەسێنێتەوە.منالی نەدەبوو، پشیلەو بلبل و سروشتی خۆشدەویست. ئەوێ ڕۆژێ لەبەیانیەوە لەرزێک پشتی داگرتبوو. ئەگەر ئادەمیزاد نەبایە و کلکی هەبا،وەک کەرکلکی دەکردە ئالاو دەیزەڕاند، تا بەدراوسیەکان رابگەیێنێ لەجیاتی تەمەڵی باشترە ڕابن و لە خۆر کەلک وەر بگرن و بزەڕێن و لە نێو گیادا بگەوزێن.چونکە بەهار بوو! ئەو ڕۆژە ماڵ لە بای پێنلوپ وەتەنگ هاتبوو.گورج چێشتی لێنا و قەرەواشەکەلچەکەی ناردە لای بای کاتەرینای خێزانی پالەوان میکێلس وگوتی:

- برۆ بلێ خانمی من سلاوت دەگەیێنێ و دەڵێ: ئەگەر دەتەوێ نان وچێشت هەلگرین.هەوای خۆشەبچینە سەحرایە.بەلام کاتەرینا چۆن دەیتوانی بچێتە سەحرایە؟ بۆ بەیانی ڕۆژی دوایی پێنج مفتەخۆر دەهاتن و بەسەری وەردەبوون.دەبوایە مریشکان ئامادە بکات.یەکیان بکوڵێنێ و نێو زگی پرکا لەشرە وبرە. ئەویتریان بکاتە سوپ. لەوەلامدا گوتی:

- بەخانمەکەت بێژە ببوورێ، ئەمڕۆ ناتوانم. ئەگەر دەبەوێ دوای نیوەڕۆ تەشی هەلگرێ و بێتە ئێرە، دراوسیەکان دێن، عەلیاغاش دێ، گەمەی دەکەین.نەترسێ، پالەوان میکێلس ئائێواری نایەتەوە.

بای پێنلوپ نێوچاوانی تێکناو کلفەتەکەی ناردە ماڵی مادام ماستراپاس وبای کراسوگورگیس ولای خوشکی پالەوان پۆلیکسینگیس.بەلام یەکیان چاوەروانی قەشە مانۆلی بوو.یەکیان لەبەر ژانەسەردەینالاند، سێیەمیان نانی متفەرکی بۆ نوێژی عیشای ڕەبیانی دەکرد.جگەلەوەش قاچی ئەوەندە ئاوسا بوو، نەیدەتوانی هەتکاو هەلێنێ.

مادام پێنلوپ دلی ئێشاو بەپرتەو بۆلەگوتی:

- ئەی مردولەی خوێڕی! تۆزێ چاو بکەنەوە، خوا ئەو چاوانەی هەر بۆ جوانی نەداوە بەئێوە.وەرە مارولێنۆ بچۆ لای ماسلای ژنی دوکتوری.ئەو هەر چەندە فەرانسەییە بەلام تائەکەسێکە دەزانێ بەهار یانی چی!.خێزانی دوکتور ناوی مارسیل بوو، بەلام ئەو پێی دەگوت (ماسلا).خانمی فەرانسەیی بەئاخافتنی سەیری یونانیبوو هۆی گالتەو پێکەنینی ئەو.بێجگە لەوە هەمیشەباسی شارێکی گەورەی دەکرد کەناوی پاریس بوو.دەیگوت : زۆر لەکاندی مەزنترە.دەیگوت ڕوبارێکی گەورەی هەیە، بەنێو شەقامەکانی شاردا دەڕوا.لەوێ ژنیش وەک پیاوان دەچنە قاوەخانانو بێ شەرمکردن قسەیان لەگەل دەکەن.لاقی ڕووتیان تا سەرووی بەلەکیان بەپیاوان نیشان دەدەن.دیارە ئەو قسانە درۆبوون، بەلام ئەو ژنە فەرانسەییە بە روو هەلمالاوی باسیدەکرد.بڕوای بەقسەکانی خۆی دەکرد و زۆر جار چاوی پڕدەبوون لەئاو.بەلام بۆچی ئەو ژنە ئەوەندە شانازی بەمێردەکەی دە کرد؟ کابرا تەنانەت شەرمی نەدەکردکە لەگەل کلفەتی مالەکەیان دەستی تێکەل کردبوو.مادام پێنلوپ دەیگوت :« بەو ماسلا فەقیرە بێژە لەگەل من بێتەگەران،تا(سێنت ئێرن) دەچین.ئەم گەرانە تۆزێ بیروباوەری دەگۆڕێ.» کلفەت بەسەر شۆڕی گەرایەوەو گوتی :«ئەویش ئێژێ ناتوانم بێم.تەواوی شەو کۆخیوەوچاوی نەچۆتە خەو.با بۆ

ڕۆژێکی تر بێت.»

مادام پێنلۆب لەدین دەرچوو.بیری لەهەموو دراوسێکان کردەوە.چیکا؟بانگی کۆلێرا بکا؟ نا..نا..خوا نەکا.مێردەکەی مردوو شۆڕە وخۆشی قنی دێنێ.شەو خەیاڵ هەڵبەدگرێ و مردوو بەپێشیدا ڕێژە دەڕژێن. خوا چاکی بۆهێناوە ، مێردەکەی مردوان ڕووت دەکاتەوەتا بەکفنی تەوان جێ لیباسەکانی پڕکاتەوە.کە وابوو مردوو هەقیانە نارەحەت بن و بێنە بەر چاوی ژنەکەی. نا..نا..هێنانی ئەو بێجێیە.بەدوای مادام(ئەڕکانودەولە)ئەو ژنە کەپۆزلەدا بنێری و پێی بڵێ :وەدەکرێ مادام ئەزیەت بکێشێ و لەگەڵ مادام پێنلۆب ژنی عەتاری گەڕەگ بچێتە گەرانێ؟» ئەو ژنەئێستیا دەکا کە باوکی لەئەستەمبوڵ وەرگێڕی ڕەسمی بوە.لەگەڵ سەدری ئەعزەم قوماری کردوە.دوای مردنی ئەو هەموو ساڵێ کیسە لیرەیەکی ئاڵتونی عوسمانی وەک بەرات لە لایەن سەدری ئەعزەمەوە بۆ ژنەکەی دەنێرن. ئێستا مادام خاوبار بەکەوچک دەخوا.چش..بلاَ بە ئەسکوێ بخوا.. بلاَ قەشەی گەورەو پاشاش بچن سەری بدەن. فرتزلا کاتی جحێڵبوو هیچ پیاوێکی پەسند نەدەکرد، ئێستا کە بۆتە پیرە قۆزتر دەبێ دانیشێ و ترشی بخوا.خوا چاکی بۆ هێناوە.براکەڕولالەکەشی چاکی بۆهاتوە.دەڵێن زۆر جار منداڵ تاوانی باوکیان دەدەنەوە.وادیار بوو جارێک لەئەستەمبوڵ فەلەیەکیان دەبرد تا بەتاوانی کوشتنی تورکێک لەداری بدەن.باوکە ناجسنەکەی واتە وەرگێڕی ڕەسمی لەو ڕاستیە ئاگادار بوو، واتە دەیزانی کەئەو فەلەیە قاتڵ نیە، جاوەرە لەو کابرا ترسەنۆکە قسە دەرکێشە ؟ بەدبەختە ترساو هیچی نەگوت.دیارە کورەتاقانەکەی بە لاڵی لەدایک بوو.نا...نا.. تۆ نابێ لەگەڵئەو بچیە گەرانێ، ئەویش بخوازێ تۆ نابێ بچی.

« ئەدی چۆنە (رانگلیو) بانگ بکەم.؟ بەڵام ئەویش ناتوانێ لە گەڵم بێ.ئەو ئێستا خەریکە جل وجیاز ئامادە دەکاو ڕۆژی جێژنی پاک شوو بە چسگورگی مامۆستا دەکا.تەو بەدبەختە ئەو کابرایەی لەکوێ دیتەوە؟.ئەمەیان بەو زۆرزانیەو ئەویشیان مردولە بەو قەدو قەوارەیەو بەو چاویلکانەوە. دیسان خۆزیا کچەکە خۆشی ویستبایە.لەعنەت لەهەژاری و بێکەسی...ئەو برا خوێڕیەی کە وا بەفیزەو خۆی بێ جوانە و بە سەعاتی ئاڵتوونەوە کۆلاَنان دەکا، تەواوی بەشە میراتی ئەوی بە ڕابواردن و لۆتیایەتی فەوتاند.»

مادام پێنلۆب پاش بیر کردنەوەیەکی زۆر بڕیاریدا . لە دارە مێوەکە هێندێ گەلاَی چنی وچۆزە متبەق دۆڵمەی هەڵبەست و هێندێ نان و زەیتون وچەند پورتەقاڵ وقومقومەی شەراب و قاوەو شەکر وکەچکوچەنگاڵی هەڵگرت وچوە حەسارێ و بە قەرەواشەکەی گوت:« وەرە وەدوام کەوە، پێویست بەو کیژەش ناکا.» دەرگای داخست و بەرەو لەنگەر گا کەوتەرێ.مادام خەپلەو قەڵەو بوو.لەرۆیشتندا ستە زلەکانی وەک دووگەی مەڕەکانی (کاپادوکیە)کەتازە بۆ کریشبان هێنا بوون ، بەراست و چەپدا بابدەدان.خۆشی ئەوەی دەزانی و پێی نارەحەتبوو، بەڵام چی پێدەکرا.؟ بۆ ئەوەی دلی خۆی بداتەوە دەیگوت: بۆچما ئەو قەڵەویەش وەک شتیتر خوا نایدا؟ دیسان شوکر چاک نیە قاچم وەک لاقی پولیکسینکا نەئاوساوە. سوپاس بۆ خوا هەروا تەڕوتازەم و ئێستاش خۆم بە دەکچان ناگۆڕمەوە و خۆم لەبەر دە لاوی مل ئە ستور ڕادەگرم.بەخۆڕایی نیە خەڵک پێم دەڵێن شێرە ژن»!

مادام پێنلۆب بێ ئەوەی پەلەی بکا بەلەنجەولار بە شەقامی گەورەی پڕ لە بازرگان و پیشەساز

وەرزێردا تێدەپەڕی، چ هەڕاوهوریایەک، چ پلاروڵاتاوێک! لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئەم خەڵکەی کاندی چەندە وەحشی و نەعاملاون»! لێوەکانی گەست. ئەو خۆی خەڵکی رتیمنۆ بوو. شانازی بەوە دەکرد. دەیگوت: «خەڵکی کانە پیاوی شمشێرن، خەڵکیرتیمنۆ پیاوی پێنووس و خەڵکی کاندی پیاوی ئارەق و شەرابن.» خەڵکی کاندی ئێواران لەکار دەگەڕانەوە، دەچوونە مەیخانەو شەرابیان دەخواردەوە. دەگەڵ خواردنەوەش ورگیان پڕدەکرد لە گۆشتی وشک کراوی ماسی (ماگڕۆ) و کەبابی بەرخیان دەخوارد. تێکرا بۆنی ئارەق و شەرابیان لێدەهات. چاوەڕە لەبارەی پاکو خاوێنی و هێمنەتی و شازادەیی خەڵکی رتیمنۆ قسەت بۆ بکەم. لەگشت شاری کاندی تەنیا دیمتروسی مێردی لەگەڵ خەڵکی تر فەرقی هەبوو. بەڵام ئەویش زۆر لەنێوەوە چرو بوو، هەر وێژنگی دەهاتێ. بەو حاڵەش هیچ نەدەما کە شەو بۆ وەخۆ خستنی مێردەکەی نەیکا. بەڵام فایدەی چی؟ زەحمەتەکەی بەخۆڕایی دەچوو. خۆزیا ئەویش خەڵکی رتیمنۆ بایە.!!

هەناسێکی هەڵکێشاو لە لەنگەرگا وەنیزیک کەوتبوو. لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە.: ئێستا کابرا دەبێ خەریکی مێش دەرکردن بێ. بەدبەختە هەر بەکاری ئەوەی دێ. بەڵام ئاغا دیمتروس کە لە راوەشاندنی مێش کوژەکەی ماندو ببوو، لاپەڕی دەفتەرە گەورەکەی ئەودیوئەم دیوەدەکرد وئەو چێشتانەی بە دوو رەنگ تێدا یادداشت دەکرد کە بەرۆژ دەیخواردن. :گۆشت بەجەوهەری سوور وخواردنەکانی دیکە بەجەوهەری بنەوش. لەدەریای موتاڵاو خوێندنەوەی ئەو خواردنانەدا نوقم ببوو کەلەماڵێ لێی دەنان. بەخەیاڵ جارێکی دیکەش تامی دەکردن و زاری پڕدەبوون لەئاو.. .. ئاخرەکەی گەیشتبوە ریزی خواردنەکانی رۆژەکانی دوایی و بەئیشتیایەکی تەواو دەتگوت دەیانخوا بە ئەسپایی حنجەی دەکردن :

- .٢ی مارسی ١٨٨٩: باقلەی تازە لەگەڵ کەنگر وپیوازی شین، فرەڕۆنی زەیتون. خواردنێکی فرە بەتام بوو.

- ٢١ ی مارس : کولەکەی برژاو لەگەڵ سیر. حەیف ئەو [تورتوپالاسە] بەرازە هەمووی سوتاندبوو. لەپڕ کیژێکی چکۆلە لەدەرکی دوکانەکەی پەیدا بوو گوتی: «ئاغا دیمتروس، خانمی من کریستوناکیس ناردومی پێنج گرام مەستەکیم بدەیە بۆ دروستکردنی موورەبیا». بەڵام ئاغا دیمتروس تووشی نەخۆشی تەمبەڵی ببوو. بەسپایی سەری لەسەر دەفتەر هەڵگرت و گوتی:

- رۆڵە گیان ! من مەستەکیم هەیە، بەڵام لەو سەرەیە. پاشان خۆی لەبەر یەک کێشاوە و تا توانی خۆی هەڵمساند تا منداڵەکە تێبگەیێنێ کە مەستەکی لەو سەری دنیایە. کچ ڕۆی. ئاغا دیمتروس چۆوە نێو دەریای موتاڵای دەفتەرەکەیەوە.:

- ٢٥ی مارس :رۆژی پەیامی جوبرائیل بۆ مریەمی پاکیزە. ئەو رۆژەی کە دەتوانی ماسی بخۆی و شەرابیش بخۆیەوە. ماسی مورێنای کوڵاو لەگەڵ ئاوی لیمۆ. ماسی مورێنای سوورەوە کراو لەگەڵ رۆنی باینجان و جەعفەری، ماسی مورێنای برژاو لەگەڵ سیری تازە، سەڵادی خەیار، فرە بەتام بوو.»

ئاخرەکەی لەتەماشای دەفتەر ماندو بوو، دیسان مێش کوژەکەی هەڵگرتەوە و هەناسێکی هەڵکێشا وگوتی: «منی کوڕی پاڵەوان پێنسوکۆلوسی ناسراو ئێستا تووشی چ ڕۆژێک بووم. بابەگەورەی من بە پابۆڕی جەنگی پڕ لە مادەی سوتاندن، پابۆرەکانی دوژمنی ئاگر

تیهەردا. باوکم بەتفەنگ تورکی دەکوشتن،منیش بە مێش کوژ مێشان دەکوژم بە راستی ها..!!»

ڕوومەتە نەرم و گۆشتنەکانی هەڵمساند و خاڵی کردنەوە. کاتێک باوکە شەڕانیەکەی هاتەوە یاد، لە پڕ دوکان لەبەر چاوی چکۆڵە بۆوەو وای لێهات جێگای تێدا نەبێتەوە. باسکەکانی لێک کردەوە، دەستەکانی بەراستەو چەپەدا بەدیوارێدا دەکێشا و دەیویست وەک سامسۆن دیوارەکان بە مست بڕوخێنێ تا دنیا فرەوان بێ‌و ئاغا دیمیترۆسی تێدا نەخنکێ.

ڕاست لەو کاتەدا کە خۆی بۆ ڕوخاندنی دیوارەکان ئامادە دەکرد، لەپڕ هەوای دوکان تاریکبوو، مادام پێنلوب بەهەناسە بڕکە بەو قەڵافەتی زەلامی وەک بورجێک لە دەرگای دوکان ڕاوەستا. کاتێک دیمیترۆس چاوی پێکەوت، سەری بەرداوەو لەدڵی خۆیدا گوتی:«ئیتر چی لەگیانی من دەوێ؟ شەوی پێ کەمە، ڕۆژیش دەست هەڵناگرێ.سەڵتە چەندە بە وازەا خوارەوەی دەڵێی ئاگری گرتوە. هاوار لەدەست ئەو ڕیتمنزیە لەعنەتیانە!». بەدەنگی بەرز گوتی:

- بەخێر هاتی . سەری خستەوە سەر دەفتەرەکەی. ژنەکەی بەسەریدا نەڕاندی و گوتی:

- یالا ڕاست بەوە پیرە مێرد! رابە . .دەمانەوێ بچینە مەزرایە. تۆی بەدبەختیش هەوایەک هەڵدەمژی و پشوێک دەدەی..مەزرا ئێسکەکانت گەرم دادێنێ.لێرە وەک بۆقی نێو لیتە پاں دەبیەوە.رابەو خۆت بپێچەوە.خواردنێکی کەمیشم لەگەڵ خۆم هێناوە.ئەو خواردنەی تۆ پێت خۆشە.پاشان سەری دانواند وبەسپایی بە گوێچکەی گوت:

- بایەنجانی سوورکراوەو بیباری زۆر. دەزانی چۆن پێت دەکەوێ، بەتایبەت لەهەوای ئازاد و لەو مەزرایە. ئاغا دیمیترۆس هەراسانبوو، لەکاتێکدا خۆی بە تەپرتەختەکەوە دەنووساند،هاواری کرد:« نا...نا... من نایەم، نایەم.»

- وەرە دیمیترۆسە چکۆڵەکەم، تکا دەکەم وەرە، بەڵێن دەدەم نارەحەتت نەکەم.

بەڵام ئاغا دیمیترۆس مێش کوژەکەی توند ڕادەوەشاند و دەتگوت مادام پێنلوب مێشە لەگۆشتی نیشتوەو دەری دەکا.جارێکی دیکەش هاواری کرد:

- گوتم نایەم .مەگەر نابینی ئەمڕۆ دنیایەک کارم هەیە. بە حیسابەکانم ڕادەگەم، تا بزانم دوکانەکەم چۆنە. ؟ تکایە خۆت تەنیا بچوو.

مادام پشت ملی قەرەواشەکەی گرت و گوتی:

- برۆ با بڕۆین ماروليو، دراوسێم تۆی، مێردم تۆی، با بڕۆین ونانی خۆمان لەبەر تاوێ بخۆین. بە توڕەیی سێتە زلەکانی بۆ مێردەکەی بادا و گاڵتەی پێکرد و بەرەو ماڵێ کەوتە ڕێ.لەڕێگا تۆک ودوعای لەچارەنووسی خۆی دەکرد و دەیگوت:« من دەبوایە ژنی لاوێکی مل ئەستور بام کە باشی دەخوارد ودەیخواردەوەو ئیزنێکی حسابی دەبوو. دەیتوانی دەدوازدە منالم بۆ دروست کا و حاڵم بێنێتەوە سەر خۆ. دەبوایە هەر لە ڕیتمنۆ کە جێگای ئاغایانە بمابوە نەک لێرە لەگەڵ ئەم کەرانەی کاندی !»

دەرۆیشت وبەتوڕەیی لەبەر خۆیەوە قسەی دەکرد. پاشان وردەوردە بڕسیبوو. تەماشایکرد حۆز هەڵدەکشێ.لەبەر بۆنی گزوگیا کونە تفنگی وەپتەپت کەوتن.کیژەکە لەرتاڵەی خواردنەکانی بەدەستەوەبو، هیلاک پشوی دەر نەدەهات.لەڕۆیشتندا پێڵاوە کون‌کونەکان لەقاچی هاتنەدەر و ناچار دایکەندن و لەسەر بایەنجانە سوورکراوەکانی دانان.

مادام پێنلوب لەپێش کلیسـای سێ‌میناس ڕاوەستا. خاچی کێشاو لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئەی حەزرەتی سێ‌میناس خۆت ئاگات لەدەردی من هەیە و یارمەتیم بدە!»

دەنگی هاوار وپێکەنین دەهات، کۆڵان پڕبوون لەمنداڵ کە بۆ قوتابخانە ڕایان دەکرد. تازە زەنگی مەدرەسە لێدرابوو. مادام دڵە کوتەی گرت وڕاوەستا تەماشای زارۆکانی دەکرد. لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئاخ!... خۆزیا ئەو منداڵانە هی من بان. ئەگەر هەموشیان لە دیمیتروس ئەبان! خوایە بمبورە!!»

تاوێک پێش چاوی تاریکبوو. کەوتە بیری گەلێک پیاوان کە لەکۆڵانێ باڵەگرندی و یا لەخەودا دیتبوونی. لەبەر خۆیەوە گوتی: «خوایە لەگوناحانم خۆشبە. بەڵام پێم وایە کە ژنی باربابانیس ئەو سەلیتە ماڵانگەڕە هەڵقبوو. ئەو قاحبەیە کە م پیاوی هێشتوە کە لەگەڵی نە نوستبێ و منداڵی بۆ دروست نەکردبێ؟. خوا دەزانێ هەر ئەم دراوسێ پچکۆڵەی من، کاتینیتسـای ژنی کراسۆکۆرگیس لە کام پیاو پەیدا کردوە!»

ئەم باربابانیسـە گێل و حۆلە، ئاخرەکەی بۆنی کردوەو شتێکی زانیوە. ئەو کلکی کەڵەشێری لەگیرفانی ژنەکەیدا دەبینێ و دەستێ لێدەدا، بەڵام چی پێدەکرا. ڕۆژێک زۆر ئەخۆش دەبێ، ژنەکەی بانگ دەکار پێی دەڵێ:

- وەرە ژنەکە! تۆ ئەو خوایە ڕاستی بڵێ. داخوا ئەو منداڵانە هەموویان لەخۆمن؟. ژنەکەی بێدەنگ بوو. کابرا دووپاتەی کردەوەو گوتی: « دە بیژە.. ڕاستیەکەی بڵێ. لەچی دەترسی؟ دەبێتی ئەوە دەمرم. سەلیتە لەوەڵامدا دەڵێ:

- ئەدی ئەگەر نەمردی؟

مادام پێنلوب بەوەبیر هاتنەوەی ئە م قسانە، بزەیەکی هاتێ. لەڕێگا لایدا، تا منداڵەکانی مەدرەسە تێپەڕن. لەو نێوەدا چاوی بە تراساکی کوڕی کاتەرینای دراوسێی کەوت. دەستی برد بۆ قەرتاڵە ی کە پرتەقاڵ دەرێنێ و بیداتێ. بانگی کرد :

- تراساکی... هۆی تراساکی ! بەڵام تراساکی نەیبیست. دەستی هاوێشتبوە سەرشانی دوو منداڵان و قسەیان دەکرد و قاقا پێدەکەنین. لەلای ڕاستەی (مانولیو ماستراپاس) ولەلای چەپەی(ئاندریکوس کراسوکۆرکیس) دەڕۆیشتن. هەر سێک بێ ئەوەی لەچەنە لێدان ماندوبن، دەیانگێڕاوە کە ڕۆژی پێشوو کاتێک‌مامۆستا چس‌گۆرگ وستوویە فێری گۆرانیەکیان بکا کە دەبوایە یەکشەمۆی داهاتوو لەگەڕانی یەکۆمەڵدا بیچڕن. ئەوان لەبەر دەرکی کلاس ساچمەی ڕاویان بڵاو کردۆتەوە. منداڵەکان تێکرا گۆرانی (دیسان بەهاردێ) یان گوتبوو. چس‌گۆرگ زۆر بەکەیفبوو، خەتکێشەکەی ڕادەوەشاند. پاشان گوتبووی: منداڵینە بایچین ئەم گۆرانیەی لەحەسارێش بڵێین. دووسبەی کاتێک بە پێش سێ‌تاق دا تێ دەپەڕین، شانازی دەکەین کە دەزانین چاکی بڵێین. باڵا بۆ پێشەوە. لەم خۆشی وکەیفەدا خۆی وەپێش کەوتبوو، کاتێک پێی لەساچمان نابوو، هەڵخلیسکابوو، وەک مشک وەعەرزی کەوتبوو. چاویلکەکەی ورد وخاش ببوو.

ئاندریکوس شلەژاو پرسی:

- پێت وایە جێنەکی شکابێ؟

- نا .. پێم وانیە .

تراساکی‌دڵنیای کرد وگوتی:« پەراسوی کابرای شکان.مەگەرگوێت لەتەقەی نەبوو؟ ئەوە دەنگی شکانی پەراسوەکانی‌بوو.»
مانولیو کەلەخۆشیان دەستی لیکدەدان گوتی:
- بێگومان پەراسوی شکاون.چونکە دەنگی ناخی لێهات. نەیدەتوانی هەستێتەوە، هاواریشی دەکرد و چاویلکەکەی دەویستەوە.
- ئێستا تێگەیشتین چۆن توانیمان خۆمان لەو گەرانی بەکۆمەڵ نەجات بدەین.چۆنیش دەتوانین ئەم کارەی گوتومانە ئەنجامی بدەین.تێدان؟ دووهاشاڵەکەی هاواریان کرد ؟ تێداین ...
سەگێک بەوێدا تێدەپەری. منداڵ بەردیان لێ دەست داپەو کەوتنە دووی. لەمزگەوتی نزیک کلیسا دەنگی شەرو هەرا دەهات.منداڵەکان راوەستان.تراساکی گوتی:
- بێگومان حەمیدە مەلایە لەئەفەندی دەدا.راوەستن سەیری بکەین.هەرسێک هەستانە سەر پەنجان تاسەریان گەیشتە راستی پەنجەرەی مزگەوت.چاویان بەحەسارێکی گەورەی پرلەگیاوگوڵ کەوت کە مەرقەدی ئەولیایەکی لێ دەبینرا هەزار پەرۆی رەنگاورەنگ بەداری سەر مەرقەدەکەوە هەڵاوەسرابوو.لە نزیک قەبرەکە دایکێکی پیر بە قژی پەرێشان ولووتێکی درێژ ریێی پەتی بەدەستێک ملی کورەکەی گرتبوو، بە دەستێکیش دارێکی تیژ کراوی بۆ ترساندنی کورەکەی هەڵدەسوڕاند و هاواری دەکرد:
- دیارە تۆ لەخوا ناترسی.دیسان دەچیە لای ئەو رۆمیانەوگۆشتی بەرازدەخۆی و شەراب دەخۆیەوەخۆپیس‌دەکەی.حەبست دەکەم و بەوداروەی هەموو لەشت دەشکێنم و ناهێڵم بچی.
ئەفەندی پەلەقاژەی بوو کە خۆی لەچنگ دایکی رزگار بکا، دەیزیراند.پیرێژن هەڵیدەسوڕاند و بەسەریدا دەیگوڕاند:
- نا...نا.. تۆ نابێ بچی. ناهێڵم بچی. دەتەوێ دیسان بچی گاڵتەت پێ بکەن ؟!! لە بیرت چوە کە تا مەست دەبی. لە گور خواردنی خۆت پەشیمان دەبیەوە ودەست بەگریان دەکەی؟ لەبیرت چوە کە میزەرەکەت فرێدەدەی و تەرسی دەسەرت هەڵدەسوی و بەکۆڵانانا دەگەرێی و وەک کەر دەزەرێنی؟ رۆمی وەدوات دەکەون و توێلکە لیمۆت پێداداەدەن و پێت دەڵێن : (ئەفەندم تەرسە) !تۆ لانی کەم ریز لەو پیرە پیرۆزەش ناگری کە باپیری تۆیە. پیرێژن هەروا جنێوی پێدەدا و قەبرەکەی نیشان دەدا کە بە پەردەی رەنگاورە نگ رازابوە. ئەفەندی دەستی بۆ ئاسمانێ هەڵێنا و گوتی:
- دایە سوێند دەخۆم کە شەووڕۆژ بیر لەوە دەکەمەوە و تەنیا لەفیکری ئەوەدام.
- کەوایە بۆچی خۆت توشی گوناح دەکەی!- بۆچما تۆ ناتەوێ منیش وەک باپیرو ببمە پیاوی خودا ؟ باشە من ئەگەرگوناح نەکەم چۆن پاک دەبمەوە؟ ئەگەر توشی گوناح نەبم، چۆن هەست بە پەشیمانی و تۆبە دەکەم؟ دەگریم و لەبەر خودا دەپاڕێمەوە؟ سەرە تاسەکەم بەخەڵک نیشان دەدەم؟ نا... کەوابوو چۆن دەتوانم ببمە پیاوی خودا ؟
حەمیدە مەلا واقی وڕما. جارێک تەماشای کورەکەی دەکرد وتاوێکیش لە گۆڕی پیری پیرۆزی دەڕوانی.سات دەبوو لەوانەیە کورە شێت وگێلەکەی‌هەقی بووبێ.کێ دەزانێ ئەو حکایەتانەی لە پیرو پیاوچاکانی دەگێڕنەوەلە باپیرە پیرۆزەی ئەویش راست نەبێ.؟ ئەو لەسەرەتاوە تەمەنێک

تووشی گوناحی جۆربەجۆر بوە. کاتێک لەکار کەوتوە و ئیتر هیچی پێنەکراوە و نەیتوانیوە لەشەراپی باش و ژن لەزەت وەرگرێ، بەرەو تاعەت و خواپەرستی گەراوەتەوە. ڕۆژێک چوبوە سەر منارەی (سنت کاتە رینا)بۆ خواردن و خواردنەوە نەهاتبوە خوار.لەوێ گریابوو، لەخۆیدابوو، حەوت شەو ورۆژان نالاندبووی، فرمێسکی رشتبوو.پاشان لەپڕ هاوارێکی ئەوەندە بەسامی لەسنگی وەدەر نابوو کە شار لەرزیبووە ئاسمان پڕبیو لەقەلەرەشە.خوا رەحمەتی بەسەرداباراند بوو، کە لەوە زیاتر رەنج نەکێشێ.داعباکانی خۆی نارد بوو تا لەبەر یەکی هەڵدرن وبیخۆن.داخوا باشترین رێگا بۆ پاکبوونەوە ئەوە بوو؟ حەمیدە مەلا نەیدەزانی چبکا.داخوا دەبوایە هەروا ئەفەندی بکوتێ، یا خۆ بیخزێنێتە قوژنێک و خۆی گەرم کاتەوە؟دارە تیژ کراوەکەی بە قەبرەکەوە نا وملی کورەکەی بەردا و بە پێکەنینەوە گوتی:

- باوابێ! چەدەکەی بیکە .بخۆ و بخۆرەو شەقبەرە.پاشانیش ئەرسی دەسەرت هەڵسوو.بەدڵ شکاوی ڕوویکردە قوژنێک کە هەتاو گرتبووی.

ئاندریکوس گوتی: « حەیف لێی ئەدا ».

تراساکی گوتی:« خەمێ مەخۆ، بابم سبەی دەستی پێرادەگا. پاشان ئانیشکێکی دەسنگی کوتا و گوتی:

- جارێ وەرن با بڕۆین. سبەی کاتی رۆژئاوا نوێژی ئێمەیە.من دێم بانگتان دەکەم.ئێوە هەر تکتان قولاپی خۆتان بێنن، منیش تەنافێک دێنم.

ئاندریکوس گوتی: من دارێکیش لەگەڵ خۆم دێنم.

مانولیوس گوتی: منیش گولمیخێک دێنم.

- نیکولای کوری میستیکریش لەگەڵ خۆمان بەرین. ئەو متاڵێکی بەقەوەتە.

مانولیوس گوتی : باشە، ئەدی ئەگەر باوکی کیژەکە بمانبینێ چۆن ؟

تراساکی بە قیزەوە گوتی : با بزانێ. گرنگ نیە، چما ئەو دەتوانێ لێمانبدا؟ خۆ ئەو خەڵکی کریت نیە، خەڵکی (سیرا)یە.

ئاندریکوس پرسی: بۆچما دەتوانین بیهارینە سەرشانمان ؟ لانی کەم سەت کیلۆ دەبێ.باشە ئەگەر هاواری کردئەو دەم چی؟

تراساکی ئێو چاوانی تێکنا وگوتی: « باش گوێ بگرە ئاندریکوس ! بۆ دەستپێکردنی ئەو کارانە ئەشێ غیرەتت هەبێ .تۆ ئەگەر غیرەتت نیە برۆ، لەجیاتی تۆ یەکی تر پەیدا دەکەم.»

ئاندریکوس بەو قسانە تێکچوو، ئەڕاندی وگوتی: من؟ من دڵێکم هەیە بە قەدرایی چیا.

تراساکی گوتی : سبەی دیاری دەکا. جارێ وست بەو بەکەس مەڵێ. سبەی رۆژی رابواردنی باوکمە، من ئازاد دەبم. تۆش رابکە لەماڵێ وەدەر کەوی. بێژە دەچمە نوێژی شێوان. بۆ هەڵکردنی شەم وردە پوڵێک لە دایکت بستێنە، بادامی پێدەکڕین.

مانولیوس پێشنیاری کرد : بەشی ئەویش بدەین.

- نا بۆ بیدەینێ، خۆمان دەیخۆین.

* * *

لەوکاتەدا پاڵەوان میکێلس پێچەکەی هێنابوە سەرچاوان بە بناری (زاڵم کێو)دا تێدەپەری، لە لای چەپەی دەریا شەپۆلی دەداو ولە لای چەپەشی چیای وەحشی قسل سەری کێشابوو. چیایەکی مەلعون کە هەر کاتێ مەسیحیەک بە پەنایدا تێپەرێ،نیشانی خاچ دەکێشێ و تورک ودوعا لە حکومەتی عوسمانی دەکا. چونکە هەر ئەشکەوت وخڕ و دۆڵێکی ئەم چیایە بدەنەوە، ئێسقانی مەسیحیە کوژراوەکان دەدرەوشێنەوە.(١) پاڵەوان میکێلس نیشانی خاچی کێشا. پێش دەساڵ هەر لەسەر ئەو بەردانە کریستوفیسی برای و دوو کوریان کوشتبوو. کەسوکاریان دوای چەندرۆژ بە فڕینی قەلەرەشەو سیسارگە کەچەڵە مەیتەکانیان دۆزیبوونەوە. ئەم کارەساتە راست رۆژی غوسلی(تعمید)ی تراساکی قەوما بوو. براو برازای پاڵەوان میکێلس شاد رسەرخۆش لەکاتێکا گۆرانی ومسکوی یان دەگوت، بۆ ماڵێ دەگەڕانەوە. تورک بۆسەیان بۆ دانابوونەوە و ناپیاوانە بەسەریان دادابوون،پاش ئەوەی زمانیان بڕیبوون، هەرسێکیان کوشتبوون.

پاڵەوان میکێلس رکێفی لێدا و بەنارەنار گوتی: «ئای کریتی بێکەس !چەند پشتە وا تۆ چارەرەشی و دەناڵێنی؟ئاخر کێ وەڵامی هاواری تۆ دەداتەوە؟ بۆ ئەوەی خودا موجیزەی خۆی نیشانبدا،دەبێ یەکێک هەرەشەی لێ بکا. گەورەکانی ئەم دنیایەش هەر ئاوان.کەوابوو چەک دەست دەیە.تەنیا لەو رێگایەوە رزگار دەبی»

هەناسەیەکی هەڵکێشا وبەچاوی پڕ لەفرمێسکەوە سەیرێکی دەریاو دەرو دەشت وچیاکانی کرد، کونە تفنگی لێ فشبوون.زەویەکانی کریت بۆنی پێنگیان لێ دەهات.دیسان بەنارەنار گوتی:«چەندە جوانە کریت چەندە جوانە»(٢) خۆزیا دەبووم بەهەڵۆ ولەبەرزایی عاسمانەوە تەماشای هەمووم دەکرد.»

١ ـ هەر وەک سەربازە گومناوەکەی عەبدوڵا پەشێوی شاعیر.

٢ ـ هێمن . یش دەڵێ: « بەهەشتە کوردەواری من بەهەشتە»

لەراستیدا ئەگەر هەڵۆیەک بە نیوەرۆ بەسەر کریت دا گەڕابایە،دەیتوانی لە گشت جوانیەکانی چێژە وەرگرێ: لە لافاوەکانی بەر هەتاوی ، لەرۆخەکانی رەڵم ورووناکی وەک مانگ،لەهەوراز ونشێو یە ،لاتی رەنگ سووری، لەتەماشای ئاوایەکان و خانووەکانی،لەعیبادەتخانەکان کە سەرتاپا سپێن ولەسەر بەردەلانی رەنگ تلخ و لە چیاو یا لەپێدەشت و مەزرا دروستکراون .لەو سێ شاری شەهید (کانە و رتیمنو وکاندی)بەبورج وقەلای ڤێنیزی و بەو کلیسایانە کە بەدەستی تورکان دیل کراون و کراون بە مزگەوت !.خوداش ئەگەر لەماوەی ئەم چەند پشتەدا کریتی لەبیر نەبردبایەوە، لەش وگیانی ئەوی ئەدابا بەتورکان ئێستا ئەوی دەدیت.نا..نا..غەڵەتم کرد.کریت بەلەش وگیان تەسلیم نە ببوو، چونکە کریتیەکان خۆیان رادەگرت، یاخی دەبوون و ئامادە نەبوون بەڵگەی دیلیەتی خۆیان کە خوا مۆری کرد بوو ئەوانیش مۆری بکەن. ئەوە زوڵمێکی گەورە بوو.گشتیان بەرەو ئاسمان سەریان هەڵدێنا وهاواریان دەکرد کە:«ئەوە زوڵمە!» هەر وەک مەسیحە پاکەکان بۆ تۆڵەی ئەو زوڵمە نەبەخشراوەی خوا شەریاندەکرد.بیریان لەوە دەکردەوە کە:« نەکا ئەم خودا میهرەبانەش مرۆڤێکی شەڕوان بێ و لە جێگایەکی دیکە و لە سەر ئەستێرەیەکی تر لەگەڵ تورکی دیکە لەشەر دابێ، یا بانگی بکەین!»

هێندێ گەل و نەتەوە هەن کە بە دوعاو پاڕانەوە بانگی خودای دەکەن.هێندێ بەتەسلیم و تەوەکول بانگی دەکەن. هێندێکیش بەکوفر وجنێو.بەڵام خەڵکی کریت بەتفەنگ بانگی خوای دەکەن.هەموو لەبەر دەرگای خوا رادەوەستن، تفەنگەکانیان ئاگر دەدەن تا خوا تەقەی تفەنگان ببیسێ.سوڵتانی تورکان کە هەوەڵجار تەقەی تفەنگان دەبیسێ،بە قوڕە قوڕ هاوار دەکا، ئەی پاخیەکانی سەر کێشا تووڕە دەبێ،پاشاو سەرباز وجەلو کێشان دەنێرێ.ئورووپاییەکان هاوار دەکەن،وای لەو بێ شەرمیە.پاپۆرەزرێدارەکانی شەریان بۆ سەرکوتکردنی لوتکەو پاپۆرە چکۆلەکانی کریت بۆ نێو دەریاو بۆ ئاسیاو ئەفریقا دەنێرن. یونانی لەقەو بەپاڕانەوە دەڵێ: راوەستن ،بەهەست بن، خوێناویم مەکەن.! بەڵام کریتیەکان لەوەڵامدا دەڵێن :«ئازادی یا مەرگ» دیسان مست لە دەرگای خودا دەدەن.

پاش شۆڕشی ١٨٢١قین ورێ سەبری خەڵک رۆژ بە رۆژ زیاد دەبوو. کریت دڵی پڕبوو لە خوێن لەژان وزوڵمو سوکایەتیدا دەژیا.حەزی شێتانە لە ئازادی ئاقڵی تێکدابوو.جانەوەرێکی بەسامی پەلاماردەداکە چنگاڵی لێ قایم کرد بوو،بەڵام گۆشتی بەدەنی خۆی لیک هەڵدەدری.ئاواپێکانی خۆی ئاگر تێبەردەدا. رەز و زەیتوونەکانی خۆی لەرەگوو ریشە دەر دەهێنا. تەرمی کوژراوەکانی خۆی لە بناری چیا رشک و بەپارەکانەوە تا بارەگای خودا تێک وەر دەپێچا. پاشان بە لەشێکی خوێناوی دیسان دەکەوتەوە بندەستی وکزیلەتیەوە. لە ١٨٦٦ دا کلیسای (ئارکادی) تەقاند .لە ١٨٧٨ دیسان شۆرشی کرد و بەڵام بێفایدە بوو. دووبارە تەسلیم بوو، ملی بۆ زوڵم و زۆرە راکێشا. ئێستا لە سەروبەندی ساڵی ١٨٨٩ جارێکی تر خوێنی لە دڵی دێت. مەسیحیەکان لە گوندەکانی خۆیان کلاوریان پاشەو پێش لە سەردەنا، ئەوە نیشانەی سەربەخۆیی بوو .دەستیان دەخورا و لە ئاسۆی دوورەوە چاویان لە رێگای یونان و دوورتر لە رێگای رووسیا بوو. باپیریان لە ناخیاندا زیندوو دەبۆوە.نەهرەتەیان دەهات، گشتیان لە ماڵ و لە گوندەکانیاندا پیشیان هەڵدەهات و خەریان لێ رەوی بۆوە. هەموو یەکشەمۆیان داوایان لە ماموستاکان و لە قەشەکان و دەهۆڵکوتەکان دەکرد کە سروودی چارەرەشی کریت - یان بۆ بخوێنن. بەڵکوو تورەبن و ناچار بن راوێژێک بکەن.بە تایبەت لە بەهاردا کە زەوی گەرم دادەهات و ژیان دەستی پێدەکردەوە، دڵی کریت - یان پەشێو تر دەبوو. تورکەکان ئەوەیان دەزانی و بۆ هێدی کردنەوەیان فەرمان و سەربازیان دەنارد.

پاڵەوان میکێلس لەوە زیاتر رەنج و دەردی کریتی دەدەر نەدەبرد.رکێفی لێدا وله زاڵم کێو تێپەری و زەویەکانی خۆڵە سووری بری و گەیشتە رۆخێکی دەوورە دراو بە پەڵمی ورد. زۆر برسیبوو.لە پێش میوانخانەی بیوەژن دابەزی. خاوەنی میوانخانە بیوەژنێکی تەور تازەو قەڵەو چرە پێشی. پاڵەوان رووی وەرگێرا .ئەو ژنی رووهەڵماڵاو و خۆ دە رخەری خۆش نەدەویست. بیوەژن بە دیتنی پاڵەوانی لە شەیتانیان چاوی بریقەیان دەدا.بە ئەدایەکەوە پرسی :

– چۆنە رێت هەتلە کردوە پاڵەوان .؟ ئەگەر بەرۆژوو نی،خواردنی کەروێشکمان هەیە لەگەڵ زیرەو پیواز. داهاتەوە کە کورسیەکی بۆ بێنێ، پاڵەوان چاوی بە گەردنی کەوت. بیوەژن چاوێکی لێداگرت و گوتی:

– دەتوانی گۆشتی بخۆی، گۆتاجی نەخۆش و رێبوار بە نیوە دەتووسرێ.

پاڵەوان تووڕە بوو، هەر چەندە خواردن ئامادەو ئەویش برسی بوو، گوتی:« هیچم ناوێ برسی نیم، خۆی هاویشتە سەر زینی و بە سەر ڕەو دوور کەوتەوە، کوێستانی بەجێهێشت و گەیشتە دەشتێکی ئارام و پانو بەرین کە وزە وزی مێش هەنگوین لە خەڵەفان و چریکەی پەرەسێلکە لە هێلانەکانیان دەبیسرا. ئەو ڕۆژە هەوەڵی مانگی ئەپریل بوو، گزیت لە تیشکی هەتاوی بەهاردا شاد و شەنگوڵ دەدرەوشا.بەڵام پاڵەوان دڵی بەوانە نەدەگیرساوەو بە سەر ڕەو مایینی ڕادەدا.بۆ کوێ دەچوو؟ بەیانی بەتەما کوێ لە ماڵێ هاتبووەدەرێ؟کێ وەدوای کەوتبوو؟ تەمێکی تاریک سێبەوی خستبوە سەردڵی.وا ی لێهاتبوو ڕوخی پانوبەرینی بەر تیشکی هەتاوی بە لێڵی دەدیت .جادە لەبەر لاقی وەچۆمێکی ڕەوان دەچوو.دوورتر چیا وەک دووکەڵێک دەجولاوە .دوو جوتیاری پیر بەسواری هێستری تێدەپەڕین.دەستیان بە سینگیەوە ناو سلاویانکرد و گوتیان :
«راوەستاو بێ پاڵەوان میکێلس». بەڵام ئەو تەوانی نەدیت.بێ ئەوەی جوابی سلاویان بداتەوە بە پەناباندا ڕەتبوو. فیکرێک هەڵیگرتبوو. بۆ لای چێ ژوانی تووری دەبرد. لە خەیاڵی خۆیدا دەهاتو دەچوو. بەرزایی دیواری حەساری دەپێوا. وەک دزێک بیری لەوە دەکردەوە کە بەکوێدا و چۆن بە دیواردا سەرکەوێ؟.پاشان هەموو شت لە خەیاڵیدا تێکەڵ دەبوو. لە خۆی دەپرسی کە دوای سەر کەوتن و چوونە نێو باخ بەکام لادا بڕوا؟
نێو چاوانی ئارەقەی کرد. دەستی دەبەر پشتێ ڕاکرد لە دەسکی خەنجەرەکەی دەگەڕا و لە بەر خۆیەوە گوتی؟ «تەو سەگە هەقیەتی. یەک لە تێمە دەبێ بمرێ».
دەسکی خەنجەرەکەی هەروا بەدەستەوە دەگوشی. پێی وابوو لەو دیوارە بەرزە سەر کەوتوە و چۆتە نێو باخ بەبێن گوڵدانی پڕ لە گوڵ لە بەر شۆڕی فانۆسی شووشەسووور سەوز تێدەپەڕێ.لە پەنجەرەکانی ژوور سەری گوێی لە قاقای پێکەنین بوو. ئارەقە بە نێو چاوانیدا هاتە خوار ببە لامل و پشتیدا شۆڕ بۆوە. لە پڕ بە چاو ترقاندنێک وریا بۆوە کە بۆ کوشتنی نووری نەهاتوتە ئەوێ.شە یتان دەستی‌گەیاندبوونە. شەیتانێکی نە ناسیاو، زاڵم، وەهیچ شەیتانێک نەدەچوو. شەیتانێکی شادو بەکەیف و بێخەیا بوو، بۆنی‌میسکی لێدەهات ودموچاریشی هەر باسی ناکرێ. دموچاوی ژنبوو. لە پڕ تەڕاندی و لەبەر خۆیەوە گوتی :« ئاخ ... پاڵەوان میکێلس ئەوە شەرم ناکەی!؟. »
ئارەقی نێو چاوانی بە دەسرەی سڕی . چیاوەک خۆی هاتەوە بەرچاوی. ڕوخی دەریا ڕوون بۆوە، چۆم لە ژێر پێیانی لە ڕۆیشتن ڕێستا و بۆوە بە شەقام. ئێستا وەبیر خۆی دەهێناوە کە بۆچی لە شار ولە دەروازەی(لازارە) دەرکەوتوە و دەیەوێ بچێتە کوێ.شەوی رابردوو قەولی بە نووری دابوو، دەبوایە بەڵێنی خۆی بەرێتە سەر.دەچوە( سن‌ژان)تا (مانوساکاس)ی برای ببینێ. بۆ ئەو گوندە پڕ لە دارو درەختە کە ڕێگای سەعاتێک لە (پیتروکفالو) بێشکەی بنەماڵەی پاڵەوان دوور بوو. پێش چەند ساڵ بای قەزاو قەدەر (مانوساکاس)ی وەک دەنکە گەنم لەوێ شین کردبۆوە. ڕەگو ریشەی داکوتا بوو. پشکوتبوو، ئێستا وەک داریەڕوێکی گەورە لە نێوە ڕاستی گوندی شیرەی عەرزی دەمژی و لق و پۆپی بلاو دەکردەوە و کوڕ و نەوەی زۆری وەسەرێک دەنان.
ڕۆژی ١٤ی سپتامبری ١٨٦٦ ڕۆژێکی لە بیر نەکراو بوو.مانوساکاس لەگەڵ دەستەی خۆی تورکی راودەتان، هاتە گوندی (سن ژان).لەنێو خانویەکی پاک و خاوێندا چاوی بە ژنێکی جوان

کەوت دەگریا و قژی دەڕنینەوە.تازە بووک بوو .تورک لە بەر دەرگا. سەری مێردەکەیان بڕیبوو.جنێوی بەخوا دەدا وردەبگوت :« نا... نا ..خودا دادپەروەر نیە ، مەسیحی نیە ، تورکی خۆش دەوێ بێگومان وایە. بەمانوساکاس کە تەمەنی خۆی لە ٤٠ ساڵەدا و دووساڵبوو خێزانی مرد بوو کە چاوی بەو ژنە بێکەسە کەوت،حەپەسا.دەستەکەی خۆی ناردە حەساریێ وخۆشی هەروا بە سەرو قژی ئاڵۆز و بیچمێکی وەحشیانە بۆنی باروتی لێدەهات چوە ژوورێ. ژنی لاو بە دیتنی ترسا و دەموچاوی خۆی داپۆشی و هاواری کرد : « یا مریەمی پاکیزە! »

مانوساکاس ئەوەندەی دەیتوانی ڕووخۆشی نیشاندا و لە ژنەکە نیزیک بۆوەو گوتی:« بگری جوانکیلە بگری. تادەتوانی بگری . گریان خەم لادەباو هێمنایەتی دێنێ. منیش سەردەمێک ژنم هەبوو تورک کوشتیان.ناڵاندم و گریام تا فرمێسکم لە چاوان بڕا. گریام ، گریان ژانی شکاندم. چۆکی لەکن ژنەکەی دادا و تێی ڕاما کە دەگریاو لەخۆی دەدا. لە خۆشیان دڵە کوتەی گرتبوو. خۆزیا دەیتوانی دەئامێزی‌گرێ و بە خۆیەوە بکوشێ.کە دەیبینی سینگی لە بن کراسی وەدەر کەوتوە و بەدەن لە بەر گریان گەرم داهاتوە و بە ئارەقەی بۆنخۆش تەڕ بوە، مانوساکاسی شێت کردبوو. تا ئەو دەم بۆ هیچ ژنێک وا شێت نەبیووبەسپایی و لەسەر خۆ دەستی هاوێشتە سەرشانی و بە دەنگێکی پڕ لە خۆشەویستی و دڵدارانەوە گوتی:

– ئیتر بەسە جوانکیلە بەسە. گریان بەسە.دەنا چاوە جوانەکانت خەراب دەکەی.زگت بەو چاوانەت ناسووتێ!ئێما سروشت جوانتر لە چاوی تۆ چاوی دروست کردوە؟ئەمێکی کە ئێستا کەوتوومە ژێر پێی تۆ، پاڵەوان مانوساکاسی بە ناوبانگم. خۆم هەڵناکێشم، بەڵام لە (کسانا) وە تا (سیتیا) کەس نیە من نەناسێ.

لەترسی ئەوەی زۆری گوتبێ و ژنەکە لێی بڕەوێتەوە بێدەنگبوو. بەلام خۆشی پێ ڕانەگیرا، هێندێکی دیکەش لێی وەنیزیک کەوت. سەری بەرداوە وبەدەنگێکی نەرم ولاواندنەوە هەر دەردو چەرمەسەریەکی بەسەری هاتبوو بۆی گێڕاوە. پاشان باسی شۆڕشی کرد ،ئەو شۆڕشەی کە چەندەبیرەژن و هەتیوی بەجێ هێشتوە، بۆتە هۆی ڕژانی ئەوەندە فرمێسک کە ئەگەر کۆ کرابانەوە چۆمێکی گەورەیان لە ئەو سەرەو سەری کریت وەڕێ دەخست. پاشان گوتی: بۆ ئارام بوونەوەی دڵو دەروونت. باشترە بیر لەو هەموو کارەساتە بکەیەوە.ئەوە چارە نووسی کریتە. هەر کریتیەکی لەدایک بێ، دەبێ ئەو چارە نووسە قبوڵ بکا و زار بۆ سکاڵا نەکاتەوە.

ژنەکە وردە وردە سەری هەڵدێنا چیرۆکی خەم و پەژارەی ئەوانیترکوڵی‌دڵی دادەمرکاند. چاوەکانی سڕیەوە، کەپۆی خاوێن کردەوە و دەستی بە قسان کرد: کە چۆن مێردەکەیان کوشتوە. خوێنی بەر دەرگای نیشانداو گوتی: ئەم خوێنە قەت ناشۆمەوە، دەمەوێ هەر لەبەر چاوم بێ. تا مردن بیری لێ بکەمەوەو بە یادی ئەو ئەسرین بڕێژم.

مانوساکاس بەسپایی دەستی بەلۆ و شان و ئەژنۆیان داهێنا و گوتی:

– مادام هەقتە. منیش بۆ ژنەکەی خۆم هەرئاوا دەگریام. تورک بەم بیانوە کە مێردەکەی یاخیە لە حەساریێ کوشتیان، حەساری ماڵەکەم پڕ ببوو لە خوێن. بەلام باران باری و هەمووی شوشتەوە.بەردەکان وەک پێشوو سپی بوونەوە،

هەناسێکی هەڵکێشا و پتر نیزیک بوەو گوتی: باشە، دەبینی دڵی پیاو وەک ئەو بەردانە

وابه.ورده ورده خوێنی ئەو پاک دەبێتەوە و هەموو شت لەبیر دەشتەوە. کاتێک زانی کە ژنەکە بەو قسانە نارەحەت دەبێ، باڵتە گەرمەکەی خۆی داکەند وبەسەر شانی ژنەکەی دادا و گوتی:

«هەوا ساردە سەرمات دەبێ.»

ژنەکە لەرزی و تێکڕا بوو. دەتگوت پیاوێک خۆی بەسەر داداوە. خەریکبوو باڵتەکە فڕێدا، بەڵام ترسا تەکا مانوساکاس پێی ناخۆشبێ.خۆی ماتکرد و لە بن باڵتەکەدا خۆی خڕ کردەوە .لەپێشدا بۆنێکی گەرمی نێرینە لە باڵتەکە دەهات. ترسی خستە دڵی .پاشان کەم کەم هەستیکرد کە گەرمایەکی خۆش بەهەموو لەشیدا دەگەڕێ. لە شانیەوە دەچێتە پشتی و سک و پەراسوانیشی دەگرێتەوە. مێردەکەی وەبیر هاتەوە. هەوەڵین لەئامێز گرتنی ودەستە نەرمەکانی کە شەوی هەوەڵێ بە لەشیدا دەخزین وپارانەوەی هاتەوە بیر. بە شانی رووت سەرمای بوو، بەڵام ئێستا هەستی بە گەرمایی دەکرد.تۆزێ هاتۆوە سەر خۆ.دەنگی هەناسەی پیاوی لەسەر سەری خۆی دەبیست.لە تاست ئەو هەستی بە مرحیبەتێکی شیرین و ئارام دەکرد.رووی وەرگێڕاو بە مانوساکاسی گوت:

– من هیچی خواردنم نیە بیدەمێ .تۆ لە شەر دێیەوە، دەبێ برسیبی.بەڵام ئەو تورکە سەگانە دارو نەداریان بردووم.

مانوساکاس لە وەڵامدا گوتی: «نا خانم .. من نامەوێ هیچ بخۆم.خوا هەڵناگرێ تۆ برسیبی من چۆن خواردنم پێدەخورێ. ئایا تۆ دەبێ خۆراکگری و سەبر بکەی تا پێکەوە نانی بخۆین .بیا سوێند بە مەسیح منیش لەگەڵ تۆ لە برسان دەمرم. لە گوتنەکەی پەشیمان بۆوە. ویستی پێنەی بکا گوتی: «ببوورە کە وا ڕک و ڕاست لە گەڵت دەدوێم. نازانم چۆنت بۆ روون کەمەوە؟ دەترسم باوەڕم پێنەکەی. هەتاسێکی هەڵکێشا، ویستی سیغارێک هەڵبەستێ. بەڵام پەشیوان بوو. بە جارێک پەشۆکا بوو. ژنەکە چاوەکانی بە برژانگی درێژەوە کە شەونمی ئەسرین تەڕی کردبوون، هەڵێنا و تەماشای کرد. دەیویست هێندێ شتی لێ بپرسێ، بەڵام دەترسا. دەیویست قسەی لێ دەرکێشێ، بە لام شەرمی دەکرد. مانوساکاس گوتی:

– دەزانم نابێ بەڵام ناتوانم قسەی دڵم دەر نەبڕم. دەمەوێ بە شەرافەتەوە راستیەکەت لە گەڵ باسبکەم. بەخوات سوێند دەدەم قسەکانم بە خەراپە وەر نەگری. ئەگەر درۆ بکەم خوا هەر لێرە سزام بدات. کەهاتمە ئێرەو تۆم بە گریانەوە بینی، وەک کێردم لەدڵی راکەن وابوو.باوەڕ بکە جوانکیلەی من باوەڕ بکە من مرۆڤێکی پاکم.من ژنی وەک تۆ جوانم نەدیوە و تیەتی خێرم هەیە. بۆچی دڵت بەشاوەو بۆ دەتەوێ بڕۆی؟ دەزانی دەستیشم لێ نەداوی. تکا دەکەم گوێ بدە قسەکانم، تۆ مێردت مردوە ،منیش ژنەکەم. لەم جیهانەدا هەر تکمان تەنیا ماوینەوە.کەوابوو وەرە ماڵی من ولەگەڵ من لەژێر میچێکدا بژی.

ژنی لاو هاوارێکی لێ هەبستاو لە قوژبنێک خۆی کۆ کردەوە. دەلەرزی و دانی لێکدەدان. مانوساکاس راببوو بۆ لای دەرکی دەرێ رۆیشت تا ژنەکە هێدی بێتەوە.سەیرێکی هاڤاڵەکانی کرد لە حەسار هەمیانەیان کرد بوونەوەو نانیان دەخوارد، دوورتر تەماشای مەزرای ئاوەدانی پڕ لە دارە زەیتون و ئاشەکانی کرد کە بە بای دەگەڕان. پاشان برپارێکی دار لە بەر خۆیەوە گوتی: «من لێرە دەمێنمەوە، زەویەکانی ئێرە باش و بە رێژەون، خۆشم دەوێن.ئەو ژنەش ژنێکی باش و بە بەرەکەتە. منداڵی باشی دەبن. ئەویشم خۆش دەوێ. من هەر لێرە ریشە دادەکوتم. سوێند بەو رۆژە

که له سەرسەرمان راوەستاوە، هەر لێرە ریشە دادەکوتم.»

کاتێک هاتەوە ژوور.ژنەکە دوگمەی کەوای کردبۆوە، پرچی بەشانە کرد بوو، تۆزێ لێوەکانی بەددان گەستبوو تا سوور هەڵگەڕێن. باڵتەکەی هەر لەسەر شانی بوو. بەنازو عیشوەیەکی تایبەتی گوتی:

– پاڵەوان مانوساکاس ! ببوورە، بەلام قسەکانی تۆ لە نەزاکەت دوور بوون. تۆ ئەگەر قسەکانیشت راست بن، ئەوە گوناحێکی گەورەیە.چونکە خوێنی مێردەکەم لە دەرگا رژاوەو هێشتا هەر گەرمە.

مانوساکاس هەناسێکی هەڵکێشاو دەستیکرد بە هاتوچۆ.بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێ گوتی :

خۆزیا پارووە نانێک و قومە شەرابێک دەبوو، خۆزیا تۆش خانمی خۆشەویست دوگمەی کەوای منت قایم دەکردەوە، خەریکە وا لێیبێتەوە. چونکە خۆم ئەو کارەم لەدەست نایە.

بیوە ژن بێدەنگبوو. زگی پێ سوتا، راست بۆوە، دەرزی و دەزوی دیتەوە.کابرا لەبەر پێیانی بە چۆکداهاتبوو. ژن لە شەرمان سوور هەڵگەڕا و پەلەی کرد کە زوو کارەکەی تەواو بکا. پاشان هەستاو چوو دۆلابچەی کردەوەو گوتی:

– من درۆم کردوە. تورک هەموو شتێکیان نەبردوە. سفرەیەکی سپی لێک کردەوەو لە سەر مێزی راخست و خانوەکەی پێ روونا‌ک بوو. پاشان لە ژوورێکی تر ئاگری کردەوەو خەریکی چێشت لێنان بوو. مانوساکاس سیغارێکی هەڵبەست، کورسیەکی هێناو وەک خاوەن ماڵ بە سام لێی دانیشت. تەماشای دەرەوەی دەکرد بەلام هەستی راگرتبوو تا بزانێ لە ژووری چرادەبرێ. دەیبیست کە ژنەکە بە چالاکی دەجولێتەوە، ئاگر خۆش دەکا، بۆشقاب و کەچک و چەنگاڵ دەر دێنێ. ئەو دەنگانە ئەویان لە شادی و بەختەوەریدا نوقم دەکرد. بە عومری خۆی قەت ئەوەندە ئاسودەیی و ئەوەندە بەرسیەتی و ئەوەندەش سەبر و حەوسەلەی بە خۆوە نەدیبوو. چونکە دەیزانی کە ئەو ژنە جوانچاک و شۆخو شەنگە کە وا ئێستا نان بۆ هەردوکیان ساز دەکا. پاش ماوەیەک، واتە دوای ئەو ماوەیە کە بۆ لە بیرچوونەوەی مردوو پێویستە، بۆ هەمیشە لە سەر سفرە و لە نوێن و جێدا لە گەڵی دەبێتە شەریک.

بەمجورە مانوساکاس کریستینای هێنابوو، لەو گوندەش مابۆوە. ژنەکە سگی پڕبوو لەسەر یەک دوانەی ببوون. حەساری ماڵی پڕ ببوو لە منداڵ. پێش ماوەیەک هەوەڵێن نەوەشی لە دایک ببوو. مانوساکاس بەو رووداوە. لە رۆژی لە دایکبوونی نەوەکەی ئەوەندە شاد و سەرخۆش ببوو، کەرێکی هاویشتبوە سەر شانی بردبوویە مزگەوتێ نوێژێ بکا.

پاڵەوان میکێلس لەبەر خۆیەوە گوتی: « کارێکی بە جێی کردوە.ئەگەر منیش لە جیاتی ئەو بام هەر وام دەکرد و خەراپتریش. بەلام چونکە ئەولم داوە هەرچەند لە من گەورە ترە دەبێ سەر کزنەی بکەم. هەرچی بێ من گەورەی ئەو گوندەم».

لە دوورەوە لە بناری چیا ئاوایی (پترۆکفالو) دەرکەوت. خوارەوەتر لە دەشتێ لە نێو دارستان گوندی پچوکی (سن ژان) گوندی کریستینا دەبینرا.پاڵەوان رکێفی لێدا ، ماینەکە گوندی دەناسی، حیلاندی وهەڵیکردە چوارناڵ. دەروازەی ماڵی مانوساکاس ئاواڵە بوو. پاڵەوان میکێلس بێ ئەوەی لە ماین دابەزێ، سەری دانواند و هاواری کرد:

- هۆی .. کاکە مانۆساکاس !

خێزانی ماڵی گشتیان لە دەوری مێزێک کۆ ببونەوە نانیان دەخوارد. مانۆساکاس پاڵیدابۆوە.قامچیەکەی بە پەنا دەستی بە بزمارێکەوە کردبوو. کریستینای ژنی بەزامبەری ئەو لاتی هاوبەشبوونە سەرپەک و شاد وبە کەیف دەهاتە بەرچاو. کەمێک لەڵەو ببوو، هەر چەندە مەمکەکانی بڵ ببوون، بەڵام رووەمەتی وەک سوورە گوڵ دەدرەوشان. مانۆساکاس کە دەنگی برای بیست دەرپەڕی و هاتە حەساری. دەستێکی بۆ برای درێژ کرد و گوتی: « برام بەخێر هاتی. دابەزە کاتێکی چاک هاتووی، سفرە راخراوە.»

پاڵەوان میکێلس گوتی:

- بە تاڵوکەم . دەرگا پێوە دە وەرە دەرێ دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم.

- خەبەری خۆشت هێناوە یا خەبەری ناخۆش؟

- خۆش یا ناخۆش، دەرگا پێوەدە.

مانۆساکاس دەرگای داخست تا منداڵەکان هیچ نەبیسن.لە پاڵە وان میکێلس وە نیزیک کەوت.

پاڵەوان گوتی: « برام مانۆساکاس ! گوێ بگرە .تۆ کە ناتوانی ئارەق بخۆیەوە، باشترە نە خۆیەوە.»

مانۆساکاس نێو چاوانی تێکنا و گوتی:

- بۆ چی ئەوەی بەمن دێژی؟

- بۆیە چونکە خودا کەری بۆیە نەخولقاندوە کە سواری شانی ئادەمیزادبێ. بەڵکو بۆیە خولقاوە کە ئادەمیزاد سواری بێو کەلکی لێ وەرگرێ. تێگەیشتی؟

- تێگە یشتم. دیارە نوری بەگی هاورێت دڵی پەشاوە وتۆی ناردوە سەرکۆنەم بکەی. ئێستا تۆخۆشت دڵت پەشاوە یان نا؟

- نا، هەوڵ مەدە خۆت لە باسەکە لادەی. تۆ کە هەلوێستی من دەزانی. بەڵام ئێستا دەستپێکردنی شورش بە قازانجی خاچپەرستەکان نیە.

مانۆساکاس تورەبوو گوتی:

- تۆ خۆت ئەگەر سەرخۆش دەبی و گۆرانی(مسکوی) دەڵێی چۆنی؟ کاتێک بەزۆر دەچیە قاوەخانەو پاوانی دەکەی، پشتێندی بەگان دەگری و دەیان هاوێیە سەربانی، داخوا دەفیکری خاچپەرستاندای؟ ئەوەش هیچ.بێشەرمیت گەیاندۆتە رادەیەک، دێیە حەساری من و دەرسم پێ دەڵێی.

ئەوەی گوت وداهاتەوە بەردێکی دەستدایە و بەڵام دووبارە دایناوە. پاشان جڵەوی ماینەکەی گرت و گوتی:

- ها... بۆچی مات بووی؟ هیچت نیە بیڵێی؟ داخوا من هەقم نیە ؟ برۆ، ئیتر ئامەوێ حکایەتم بۆ بکەی.

پاڵەوان بێدەنگبۆ. لە راستیشدا شتێک نەبوو باسی بکا. مانۆساکاس هەڵی بوو، خۆشی کاتێک سەر خۆش دەبوو، ئیتر بیری لە هیچ شتێک نەدەکردەوە،کریت و خاچپەرستی لە بیرخۆی دەبردەوە، لێی سواردەبوو، بەهەمرو لایەکدا رایدەکرد. کوڕەی زەوی لەبەر چاوی پچوک دەبۆوە،

دەبویست لە ژێر سمی ئەسپدا وردو خاشی بکات. بێجگە لەوە چی نەدەکرد؟!

پاش تاوێک بێدەنگی، کاتێک مانوساکاس دیتی براکەی بزی تێکناوە و تەماشای چیاکانی دوور دەکا، گوتی:

- بۆ وەڵام نادەیەوە؟ وەڵامێکت نیە؟ بەڵام مەترسێ. دەزانم دەردی تۆ چیە. تۆزێک ئاقڵ بە. تۆ مرۆڤێکی بەغیرەتی تێدەگەی. دوویاتی دەکەمەوە، چارە نووسی کریت هەر ئەوەیە. کە وابوو لێ گەڕێ با کوڵی دڵم داڕێژم. ڕۆژی جێژنەش هێسترێک لە سەر شانم دادەنێم و دەیبەمە مزگەوت تا لە پەنای ئەو کەرە نوێژێ بکا. پاشان ئەگەر ویستیان با بمکوژن.

- تۆ دەکوژن چش، ئەوان کریت دەکوژن .

- خەمی کریت مەخۆ. وا بە هاسانی ناتوانن بەسەر کریت دا زاڵ بن. بە لێ، ئێمە ئادەمیزادەکان دەکوژن ، بەڵام ناتوانن کریت بکوژن. کریت جانەوەرێکی ئەبەدیە. تاوێک بێدەنگ بوو، هەناسێکی تاڵی هەڵکێشا و گوتی :

- برام، بەو خوایە من لەم کاولە وێرانە بەدا وەختە قڕ بم. چما تۆ نازانی؟ من خۆشم لە کاتی ئاسایدا ئاگام لە هیچ نیە. بەڵام ئەختێک ئارەق دەخۆمەوە، زەینم ڕوون دەبێتەوە و دڵم وەک دڵی تۆ پڕ دەبێ. بێجگە لەوە، من کە ناتوانم بچمە ئەستەمبوڵ سوڵتانی بکوژم. کەوابوو لێگەڕێ با هەر لێرە لە سیبی ئاخری بدەم. چونکە ئەم کارە دڵم هێدی دەکاتەوە.

پاڵەوان میکێلس ڕکێفی لێدار گوتی:

- کاکە مانوساکاس! لەم بارەوە باش بیر بکەوە. بە تایبەت کاتێک بە تەنیا بوی چاک فیکری لێ بکەوە و چۆنت پێ باشە وابکە. بەڵام لە بیرت نەچێ کە کریت لە سەررووی هەموو شتێکە. من بێجگە لەوە قسەی دیکەم نیە. ماڵیاوا.

- ئەوە چیە ،دابەزە شتێک بخۆ. ئاڵوکەی مەکە، هەر لێرەش بنوو.لە سایەی خواوە خانوەکەمان گەورە بە.جێگای تۆ دەبێتەوە. برازاکانت ببینە، کریستینای ببینە، هەوەڵ تەوەمان تازە لە دایک بوە ببینە. دەمەوێ ناوی بنێم ئازاد، تا ڕۆژێک مانای ئازادی بزانێ.

- لە زمانی منەوە سڵاو لە هەموان بکە،من بە ئاڵوکەم.

- ناتەوێ شتێکی پچوک هەڵگری و بچیە گوندی سەری پیرە باپمان بدەی؟

- گوتم کاتم نیە. زۆر بە پەلەم. سبەی بەیانی زوو کارم هەیە، خوا حافیز.

پاڵەوان میکێلس خۆی خوار کردەوە. جڵەوی ماینی هەڵەنگاوت و لە حەساری چوە دەرو بە دەشتێدا ڕابدا. بە کەیف بوو.مانوساکاس وەک پیاو لە بەرامبەری وەستا بوو.ئەگەر پاڵەوان میکێلس لە خۆ ڕانان بێزار نەبایە باسکی بۆ لێک دەکردنەوەو لە ئامێزی دەگرت. بە سەر ڕەو دەڕۆی، زوو گەیشتەوە کاندی. لەخۆشیان هەر ترینگەی دەهات. چونکە جارێکی دیکەش بۆی هەڵکەوتبوو کە بێتە ماڵەی خۆی ببینێ و ئاڵیکاتەوە . ئەوەشی بە دڵ بوو.

* * *

تەواوێک لە نیوەڕۆ تێپەڕیبوو، خۆر لە ئاسمان وردە وردە شۆڕ دەبۆوە. ژنە دراوسێکان کە زانیبوویان پاڵەوان میکێلس لە ماڵێ نیە، لە حەساری ماڵی مادام کاتەرینا کۆ ببوونەوە و مەکینەی

بەرگدرون وتەشی و سەوزی کە دەبوایە پاکی کەنەوە لەگەڵ خۆیان هێنابوو. مادام پێنلوب و خوشکی پاڵەوان پولیکسینگیس و کاتیەنستای ژنی کراسوگوزگیس و مادام ماستراپاس. لەو رۆژی شەمزیەدا گشتیان شادو بەکەیفبودم بە پێکەنین بوون. هەرتوو تەواو دەبوو. بەیانی ئەو رۆژە بۆ حەسانەوەو خۆشخواردن و قسەی زۆر و بێ پایان تەرخان دەکرا. بەراستی خوا قیکرنکی باشی کردبوو کە یەکشەمۆی دروستکردبوو.

کاتیەنستا بە هەوایەکی گۆرانی گوتی:

- ئەرێ تۆسا تۆ ئەو خەبەرەت بیستوە؟ دەڵێن دوێ شەو لە ماڵی میستیگری دەنگی هاوار دەهات و گویا ژنەکەی لێی دەدا.

مادام پنلوب گوتی ؟

- ئەدی ئەو سمێڵ جوانانە بۆ چی دەبێ؟ خۆزیا دیمیتروسی مێردی من سمێڵی ئاوای هەبان. بەراستی سمێڵی قیت و چەورکراوی میستیگری بۆ تەماشا دەبێ. مرز بە دیتنیان لەشی دەلەرزێ.

مادام ماستراپاس کە هەمرو شەوێ قاچی مێردەکەی لە تەختی دەبەست، گوتی:

- من لام وایە میستیگری باشترە سمێڵەکانی بدا بە ژنەکەی وخۆشی داوێنی ژنەکەی لەبەرکا.

مادام کریسانتی بەپێکەنینەوە گوتی:

- پێرێ شەو میستیگری لە نیوە شەودا خەڵکی بە گریان و هاوار راستکرد بۆوە. براکەم کە لەو کاتەدا بەرێدا تێدەپەرێ و گوێی لە هاوار دەبێ، شەوی دوایی بە میستیگری دەڵێ :«ئاخر تۆ بۆ دێڵی ژنەکەت لێت بدا؟ بەسە، بەو مستە زلانەت پانی کەوە. شەرم ناکەی؟تۆ ئابڕووی هەمو پیاوێکت بردوە.» پێتا نزانە لەوەلامدا چی گوتبوو؟ گوتبووی: «بۆ چی پاڵەوان پولیکسینگیس بۆ چی‌شەرم بکەم؟ من ئەم حاڵەم پێخۆشە».

تێکرا لە قاقای پێکەنینیاندا. ڕێنیز راست بۆوە قاوەو مرەبا وشیرنباتی وشک و کولیچی هێنا. راست لەو کاتەدا عەلیاغای دراوسێیان لەبەر دەرکی حەساری پەیدا بوو. شاڵێکی سەوزی هاویشتبوە سەر شانی. گزرەویەکی نیوەچڵ و چەند شووشەی کامرا چنینی بەدەستەوە بوو. کزسە و دم وچاوی بێ توک و پاکو خاوێن. کراسێکی کۆنی پینەکراو لەبەردا. بەڵام سپی هەر بریقەی دەهات.لاقە لاوازەکانیشی لەبەر خاوێنی لە کەوشی دڕاودا دەدرەوشان.

مادام کاتەرینا بە ئەدەبەوە لەبەری هەستا و گوتی:

- عەلیاغا بەخێر هاتی. وەرە قاوەیەک وەخۆ.

کابرا کە بۆ میوانداری سەری دەرێدا بوو، گوتی:« مادام سرپاس.ئێستا قاوەم خواردۆتەوە. تەنانەت پاروە شیرنباتێکیشم لە قاوەدا تەڕ کردوە و لەگەڵ مورەبای ئاڵوباڵو خواردوومە. زۆر سرپاس.

- قەیدی چیە، لیرەش شتێک بخۆ. هەمیشە زۆر خواردن باشترە لە تێر نەخواردن. ژنە دراوسێکان کە شارەزای هیممەتی بەرز و فەقیری پیرە مێرد بوون، تێکرا گوتیان:

بۆ ئەوەی هارکاری ئیمەت کردبێ، لیرەش شتێک بخۆ!

عەلیاغای چارەرەش درۆی دەکرد، نە قاوەی هەبوو نە نانی شیرین و مورەبا. هەمرو تەمەنی

هەر بە بڕسیەتی رابوارد بوو. تاقە خەمی لە ژیانیدا هەر خەمی بێ خواردەمەنی‌بوو. بێجگە لە خواردن و چێشت لێنان هیچیتری باس نەدەکرد. هەمیشە لیکی بە چەنەیدا دەهاتە خوارێ. ژنەکان بۆ سەر گەرمی و پێکەنین توختەی لاوازی ئەویان پەلامار دا. مادام ئاتینێتسای شەیتان چاوی لە ژنەکان داگرت و پرسی:

– عەلیاغا، ئەمڕۆ بۆ نیوەڕۆ چت لێنابوو؟ ئاخر تۆ زۆر لەخەمی سکت دای. خوا بزانێ چی خۆش و بە تامت لێنابوو!

عەلیاغا لە خۆشیان بزەیەکی هاتێ. تفی قوت دا و بە ئیشتیاوە دەستی پێکرد: «فڕوجی ئەمڕۆ زۆر تەڕو تازە بوو. خەیار ترشی بوتانیشم کڕیبوو، سفرەم پێ ڕازاندبۆیەوە. سۆسی جوجەش لەوانەبوو کە خۆم دروستم کردبوو. جوجکەم لە فڕنیدا کردبوو کەباب و سوور ببۆوە.» دەیگوت و زاری پڕ دەبوو لە ئاو وهەناسەی هەڵدەکێشا. ژنەکان لە پێکەنین دەکەوتن. دیسان لێیان دەپرسی و سەر کۆنەیان دەکرد:

– چاسە عەلیاغا! هەمیشەگۆشت وسۆس و گۆشت و سۆس. بۆ سلامەتیت باش نیە. جارو بارێش دەبێ سەوزی بخۆی، زۆر خواردنی گۆشت باش نیە. مادام ماستراپاس گوتی:

– من ئەو شۆر بۆشقابێک سەلادی کولاوت دەدەمێ تا ڕیخۆڵەت فێنک بێتەوە. تۆ ئەوەندە گۆشت و بەهاراتت دەڕیخۆلان ئاخنیوە، هەموو بوونە سۆس.

ماد. کەرێناش گوتی:

– منیش نردوە نانێکی تازەی گەنمت دەدەمێ. ئەونانە سپیەی تۆ دەیخۆی مەعدەت قورس دەکا.

ماد. پنلوب گوتی:

مرۆڤ هەر شتێکی زۆری بخوا، خاوپاریش بێ لە دڵی دەدا. من هێندێ زەیتونی بێ ڕۆنت بۆ دێنم هەر چەندە تاڵە، بەلام بۆ ئیشتیا زۆر باشە. بیخۆ وخەبەرێشن بدەوە.

لەبەر ئەوەی کە پیرە مێردی بە هیممەتی تورک لە گەرەکی یونانیەکان دەژیا و بە سەدەقەو یارمەتی ئەوان رۆژگاری دەبردەسەر، ژنەکانیش پێیان رادەبوارد. کاتێک خواردنی عەلیاغا جارێکی دیکەش ئەوها دابینکرا، ژنەکان باسەکەیان گۆڕی و فرە ویژیان درێژەی هەبوو. هاتنە سەر باسی دەشت و مەزرا و باسی پیاوان کە هەموویان جیزن و هەر گۆشتی حەرامیان پێ باشە. کاتینیتسا گلەیی لە مێردەکەی کرد کە زۆر دەخوا و لە خەودا پرخەی دێ و ناهێڵێ شەو بنوێ....

لەو کاتەدا (مورتزوفلوس) مجێوری کلیسا، ئەو پیاوە وردو ناحەزە، سواری زەنگوڵەی گەورەی کلیسای سن‌مێناس ببوو، دەستی دەهێنانگوێ ناببوو، گوێی داببوە زەنا زەنای شار کە وەک وزە وزی خەڵفی مێش هەنگوین دەچوو. هەرای دەستفرۆشەکانی گەرۆک و تەقەی دوکانی ئاسنگەران و هاوار وپارانەوەی سوالکەران لە بەر دەرکان و چەقرلوری سەگان و حیلەی ئەسپان و دەنگی زەنگوڵەی بزن و مەڕان کە بەو شێوە لە ئەسایخانە سەریان دەبرین. لێکی هەڵدەواردن.

ئەو هەموو هەراوهوریایە مورتزوفلوسی توورە دەکرد. وای لێدەهات بنەڕێنێ و لە کاتێکا دەستی بۆ تەنافی زەنگوڵەکان درێژ دەکرد کە لە بان سەریەوە هەڵاوەسرابوون، دەیگوت:

«بێدەنگ بن! ئێستا ئیتر نۆرەی منە! ئەوە ۷۵ ساڵە ئێوە دەدەر دەبەم، ئیتر دڵم لە ئێوە تێک هاڵاوە» مورتزوفلوس زۆربەی کات بێدەنگ بوو.هەرگوتنێکی هەبایە بە سێ زەنگوڵە کە وەک سێ زار وسیزمان دەچوون ،دەری دەبڕی. ئەو بە نهێنی بێ ئەوەی کەس بزانێ هەر سێکی ناو لێنابوون. زەنگوڵەی ئێوە راست کە لە هەموان گەورە تر بوو،ناوی نابوو(سن میناس). زەنگوڵەی لای راستە ناوی (ئازادی) بوو. ئەوی لای چەپەی ناوی نابوو (مەرگ).هەمیشە لە پێشدا دەنگی (سن میناس) بەرز دەبۆوە کە قورس و پیاوانەو شەڕانی بوو.لە پڕ ئازادی وەدەنگ دەهات.هەوایەکی شاد و ساف و بلوری هەبوو.

دەوای هەموان (مەرگ). دەنگێکی گیراو گورتی لێدەهات. ئەم سێ دەنگانە لە ناخی مجیوری پیر، واتە ناخی گریت بەرز دەبوونەوە. قین و ئاواتی رەعیەتەکانیان لە بان خانوی خاچپەرستان و گەرەکی تورکان و بارەگای پاشاوە بە هەموو جێیێک رادەگەیاند. بەم چەشنە گیانی (مورتزوفلوس)کە سەرتاپێ لە زێو وسەفرەق بوو، بەم سێ دەنگە پیرۆزانە لە جێژنەکانی وەک نوئیل ر پاک و جێژنی (سن میناس)کە رۆژی پازدەی نوامبرە و بە تایبەت لە جێژنی (سن ژورژ)کە رۆژی جێژنی پاشای یونانە ، دانیشتوە زنجیرکراوەکانی کریتی دڵگەرم دەکرد.

مورتزوفلوس لە دنیای پشکوتووی خەیاڵی خۆیدا (سن ژورژ)ی دەبینی کە بە سواری ئەسپێکی سپی. جلیتقەی کورتی چیندار و سەڵتەی چنراو لە بەرداو کاڵەی سووری بە گوڵێنگ لە پێدا، دەمانچەیەکی زێوی بە قیشەکەوە بە قەدیەوە بە کریت دا دەسوڕاوە. ئەو شازادە خانمە چکۆڵەی(ئازادی) سواری پاشتەرکی خۆ کردبوو.ئەو شازادەی ئاتین بوو هەموو ساڵێ رۆژی ۲۳ی ئەپریل دەهاتە کاندی و لە پاپۆڕ دادەبەزی.مورتزوفلوس کە بە سێ زەنگوڵەوە هەڵاوەسرا بوو، بە کەم کەسێرو لە کاتی هاتنە دەر لە پاپۆڕ و هاتن بۆ لای شار دەیبینی.پاشان بە راکێشانی تەنانی (سن میناس) و (ئازادی) و (مەرگ) بەخێر هاتنی دەکرد.

مورتزوفلوس پیاوێکی بەد ئەخلاق بوو. لە رۆژێکی وەک ئەورۆدا، واتە رۆژی یەکی مانگی ئەپریل پێش ۷۵ ساڵ - بە راستی ئەمەن چەندە خێرا تێ دەپەرێ - لە دایک ببوو.بۆ هەروەڵێن جار ئەو شەوە هەستی بە پیری کرد بوو.کەوتبوە ئەو فیکرە کە بێ ئەوەی ئازادی کریت ببینێ دەمرێ.داخوا لەم رۆژە پیرۆزەدا کەسێکە لە جیاتی ئەو زەنگوڵەکان وە دەنگ دێنێ؟ تا .مورتزوفلوس تاقەتی ئەوەی نەبوو. دەیگوت: قەت نابێ! تەنانەت شەبتانیش روحی منی بردبێ لەو رۆژەدا دەگەڕێمەوە و ئارمایی من بە زەنگوڵەکانەوە هەڵداوەسرێ و هەرایەکی سەیر ساز دەکا.

ئارەقەیەکی ساردی لە پشتی ئەستور و نێو چاوانی بە گنجی نیشت. داخوا لەو رۆژەدا زیندوو دەبێ؟ داخوا تا ئەو رۆژە نامرێ؟ دەستەکانی دەلەرزین و لە کاتێکا دەستخۆشی ئەو هەستە خەفەتاویانە ببوو، زەنگی نوێژی خەوتنانی لێدا.

لەو کاتەدا کە لە حەساری ماڵی پاڵەوان میکێلس وتو وێژ لە بارەی ژن و پیاو درێژەی هەبوو ، عەلیاغاش ببوو باوەڕی پێغەمبەری لەو بارەوە بۆ ژنان روون دەکردەوە. دە نگی زەنگوڵەکان بەرز بۆوە.ژنەکان گورج دەستیان لە کار هەڵگرت، شرەو بڕەی خۆیان کۆ کردەوە، نیشانی خاچیان کێشا و بۆ رۆیشتن رابوون.

ئێوارەی رۆژەکانی شەمۆ بۆ گەرمکردنی ئاوی حەمامێ لە دەرکی هەموو ماڵەکان ئاگر

دەکرابەوە. کیژە کارە کەرەکان بە پێی پەتی پێش دەرگاکانیان دەشوشت. حەسارە بەرد تێکگیراوەکانیان گەسک دەدا. گوڵەکانیان ئاو دەدا. پیرێژنەکان ئاگردانیان لە بزمارەکان دەکردەوە و لە گەڵ خوێندنی تایبەتی مردوان بخور وعود وکوندوریان بە ماڵێ وەر دەکرد.

لەو کاتەدا کە هەوەڵین دەنگی زەنگوڵە هەستا، قەشە مانولی بە هەناسە برکە لە گەڕانی ئاسایی پاک کردەنەوەو تەبەروکی خۆی دەگەڕاوە. ئەو ڕۆژە لە بەیانیەوە بە بۆنەی ڕۆژی هەوەڵی مانگ ، ئاوی متقەرکی بە سەر خانواندا کردبوو. لە بەر هەموو دەرگایەک ڕاوەستا بوو، پێکە ئارەقێکی پێدا کردبوو. لە هەموو ماڵێک بۆشقابە خواردنێکیان دابوویە. ئەویش گوڕج خستبوویە گیرفانی عەباکەیەوە. لەو سەعاتەی ڕۆژدا سەر تاپێ تەڕی ئارەق وبەڵام بەکەیفبوو. گەیشتەوە ماڵێ و لەدەرگای دا و گوتی:

- هۆی ... ژنەکە لە کوێی ؟

ژنی قەشە شادو بە کەیف وقەڵەو وخڕین، بە زاری بێ ددانی وەک کاوڵ، لە کاتێکا سەر پێیە کۆن و دڕاوەکانی بە خشە خش بە دوای خۆیدا دەکێشا، بەغار هات. ئەو ژنە دەبێ لە پێشدا زۆر جوان و شۆخ بووبێ کاتێک خاڵی ڕەشی وەک دەنکە تیمبوت سەرنجی قەشەی ڕاکێشا بوو. بەڵام ئێستا ئیتر تەنیا خەرواره گۆشتێک بوو لە بن جەنگەڵێک خوریدا شاردرا بۆوە. لە گەڵ ئەوەش چاوە برسی و بە مەکرەکانی دەدرەوشان. کە چاوی بە عەبای قەشەی کەوت کە پای کردبوو، گوتی:

- سڵاو باوکی روحانی! دەتەوێ گیرفانەکانت بەتاڵ کەم؟

قەشە مانولی کە لە حەسار وێستا بوو، باسکە تۆکناویەکانی هەڵێنا و گوتی: «تەشتێکی بێنەو گیرفانەکانم خاڵی بکە!

ژن تەشتێکی گەورەی گڵی هێنا و دەستی کرد بە خاڵی کردنی گیرفانەکانی قەشە کە لە باخەڵیەوە تا بەری پێیانی گرتبوو. خواردەمەنی جۆر بە جۆر وزۆر، لە هەڵواوە بگرە تا کفتەو خەیار ترش و پوستەو خورما و بادام و شیرینی بە گوێز و پەنیر و بەهارات و...هەمووی دە تەشتی کرد. قەشە گوتی:

- گوێ بگرە بزانە ئەو مورتزوفلوسە شەیتانە چدەکا؟ زووبە زوو، کابرا گوێچکەی کەڕ کردم.

ئاخرەکەی تەشت پڕبوو. ژن بە تەماعەوە تەشتی دەست دابەو گوتی:

- هیچ تەما... هەر چیبوو هێنامە دەرێ. قەشە کە باری سوکبوو ، بە هەنگاوی بەرز بەرەو نوێژی خەوتنان کەوتە ڕێ.

* * *

کاتێک مادام (کریسانتی)بۆ ماڵێ گەڕابۆوە ، شاڵی جوانی کشمیری بە پشتە پانەکەی دادابوو.پاشان دوو نردوە نانی متقەرک و شوشە شەرابێک و شوشێک ڕۆنی زەیتونی دە قەرتاڵێکی نابوو لەو کاتەدا کە قەشە مانولی داوێنی عەبای بەلا داکرد بوو،بە غار تێدەپەڕی، ئەو دەرگای ماڵی دادەخست وبە هەنگاوی قورس بەرەو کلیسا دەچوو. کریستانی بە گەنجی بەژن باریک و جوانبوو.بەڵام بە گوزەشتی زەمان پڵ ببوو. چاوی کەم بینا ببوون و چەند تاڵە مووی لە

سەر چەنەگەو لێوی خوارەوە ڕوا بوون. قشە مانۆلی لەگەڵ ئەوە کە چاوێکی تەماعکارانەی لە قەرتاڵەکە دەکرد ، سڵاوێکی لە مادام کرد و گوتی:

- سن مێناس ئاگادارت بێ مادام کریسانتی.

بەڵام کریسانتی لە پیری لەشی وەر پێچرابوو، قاچی ئاوسا بوون و قورس ببوو. دەمارەکانی ژانیان دەکرد و بیری لە شتێکی تر دەکردەوە. بە ورتە ورت لە بەر خۆیەوە دەیگوت: «ئاخ.. ئەی سن مێناس، دەزانی من هەموو ڕۆژێ شەمێیان نانی مێفەرک وشەراب و ڕۆنی زەیتون بۆ تۆ دێنم. تۆش ئەو کارەم بۆ جێبەجێ بکە، ماوەیەکە داوات لێدەکەم. کارێکی وابکە لە پێش براکەم دا بمرم . ئەو پیاوێکی دەست ناواڵەیە، بە فانۆسی تەشریفاتی چاکم دەنێژێ.»

بە ڕێوەبەرانی کلیسای سن مێناس ئەو فانۆسە جوانانەیان تازە لە قوستەنتەنیە وە هێنا بوو. ئەو فانۆسانە بە ڕووکاری زێوین وشوشەی ڕەنگاورەنگ و پشتبەندەی ئاوریشمی ڕەنگ ڕەش دەدرەوشانەوە. بۆ ناشتنی تەرمی گەورە پیاوان نەبایە ئەو فانۆسانەیان نەدەهێنا. بەڵام مادام کریسانتی کە بەداخ و حەسرەتەوە دەهات پیر دەبوو، تا ئێستاش لە ئەڤین و مێرد کردن چێژی نەکرد بوو.لەم دنیایە تەنیا یەک شتی دەویست، ئەویش ئەوە بوو کە فانۆسی تەشریفاتی بێننە سەر قەبرەکەی. لە گەنجیەتیدا زۆر جاران داوای لە سن مێناس کردبوو کە مێردێکی باش و جوان و ئەقیبداری خاو وخێزان و دەست بڵاوی بە نسیب بکا. پاشان کە ناهومید بوو، داوای لە سن مێناس دەکرد کە یارمەتی پاڵەوان پۆلیکسینگیسی برای بدا، تا کاروباری بیگرێ. لە ڕاستیدا کاتێک شۆڕش نەبایە. پاڵەوان بێکار دەمارە. ئەو دەم لە بەر دەروازەی (کانە) دوکانی دادەنا، شەراب ڕوزن زەیتون و کشمیش و بادامی لە جوتیاران دەکری و بە بار بە بازرگان و یا بەقەولی خۆی بە (گەورە کەران)ی دەفرۆشتەوەو بەو چەشنە کیسەی خۆی لە لیرەی مەجیدی و ئاڵتونی ناپلیۆنی پڕ دەکرد. مادام کریسانتی دەیگوت: «یا سن مێناس! یارمەتی براکەم بکە تا کاروباری بە برەو بێ،چونکە ئەگەر بەدەوێ نانی مێفەرک و شەراب و ڕۆن زەیتون کە بۆ مرۆڤێکی پیرۆز پێویستە لێت نەبڕێ، گەرەک یارمەتی بدەی.کارێکی وابکە ئێمەش بۆ خواردن نانێکی بە ڕەحەتمان هەبێ.» خواردنی باش وەک مێرد و منداڵ دڵ دەحەسێنێتەوە. عەلیاغا دەیگوت : من بۆیە نامەوێ قەڵەو بم چونکە نامەوێ بۆ کرمەکانی عەرزی خواردن ئامادە بکەم.» بەڵام ڕاستیەکەی ئەوە بوو کە ئەو هیچی نەبوو بیخوا.

بەرەو کلیسای سن مێناس هەڵکشا و پاش ئەوەی لە کانی(ئیدومنە) تێ پەڕی، ڕاوەستا و لە بەر خۆیەوە گوتی: «سوپاس بۆ خوا جێگای سکاڵا نیە، لە ئێمەش خەراپتر هەن! » ئەو ژیانی خۆی بەدڵ و داو بۆ خزمەتی برا ملهوڕەکەی تەرخان کردبوو. جلەکانی دەشۆرشت و پینەی دەکردن، چێشتی بۆ لێدەنا و مالی بۆ خاوێن دەکردەوە. بۆ قەدو باڵای ئەو نەمابوو: « چەندە ڕەشید و نەجیبە!» دیارە زۆر وەدوای ژنان دەکەوت. بەڵام قەی چیە، بۆ چما خوا ژنی بۆ پیاو دروست نەکردوە ؟

ئەو لە گەڵ پاڵەوان پۆلیکسینگیس برای گیانێک بوون لە دوو لەشدا. ئاواڵ دوانە بوون، بەڵام ئەو زوتر پیر ببوو، پیری زۆری خستبوە سەر یەک. لە کاتێکدا براکەی جوان وباش مابوو.بەڵام ئەوە گرنگ نەبوو. چونکە ئەسڵ براکەی بوو. لە لایەکی دیکەوە لە هەمو خۆشیەکانی برایدا

بەشدار بوو. خۆشی رادەبوارد.لەگەڵی دەچوو گەڕان و ڕابواردن. کەواتەوو خەمی چی کە بەتەنیا لەجێدا دەنوست .کاتێ براکەی لای بەیانی لە رابواردنی شەوانە دەگەڕاوە، شادو شەنگوڵ لە جێ دەردەپەڕی، پێڵاوەکانی لەپێ دادەکەند،ئاوی بۆ گەرم دەکرد دەست و چاوان بشوا. ئنجا ئێک قاوەی تاڵی بۆ ساز دەکرد کە بێتەوە سەر خۆ. بە دزی براکەی بۆنی ئەو عەترەی دەکرد کە ژنان دە سەرو سمێڵیان دابوو. ئەوە تاقە لەزەتێک بوو کە کریسانتی فەقیر لەم جیهانەدا لە ئەڵین چێشتبووی. بەڵام لەم دوابیانەدا چونکە پیر ببوو، قاچی ئاوسا بوون و ئازاریان دەدا. لە لایەکی دیکەشەوە فانۆسی تەشریفاتی تازە هاتبوون، تەنیا یەک شتی لە سێ میناس دەویست، ئەویش ئەوە بوو کە لە پێش براکەیدا بمرێ و دوای مردنیشی بتوانێ لە ناشتندا لەو فانۆسانە کەڵک وەرگرێ. بۆ ئەوەی دڵی سێ میناس وەدەست بێنێ هەموو شەوی شەمزیان دیاری بۆ دەبرد.

مادام کریسانتی لە بەر خۆیەوە دەدوا و راست وچەپ سڵاوی لەم ولەو دەکرد. سەیر سەیر لە هەورازی بە ورتکە بەرد فەرشکراو سەردەکەوت.لە سەر هەموو پێچێک ئاوڕێک دەوەستا دەتگوت بە دوای تەرمی کابرایەکی دەوڵەمەندا بۆ گۆڕستان دەچێ.

پاڵەوان پۆلیکسینگیس برای لەو سەری شاری کاندی کە گوێی لە دەنگی زەنگولانەبوو، بە پەلە دەتگوت ماندولین لێدەدا، نیشانەی خاچی کێشاو رابوو کە دوکان دابخات. پاڵەوان پیاوێکی جوانچاک بوو. نیگایێکی سیحراوی هەبوو.هەمیشە وەک لاوێکی بیست ساڵە لیباسی دەبەردەکردکە بریتی بێ لە: شاڵوارێکی سواری و سوخمەیەکی گوڵنوزی و پشتێندێکی پانی ئاوریشمی و پۆتینی زەرد و سپی کە کوڕە جوانەکانی تورک و مەسیحی دەیپێی دەکەن و لە دیوی ژوورێ بە قەیتانی سوور بەستراوە تا لە کاتی رۆیشتندا ما هیچەی قاچەکانی باش دیار بن. فێسی بەلاسەریەوە نا و ریشوەکانی بە جوانی بە سەر شانی چەپەیدا بەرداوە رەبە هەنگاوی نەرم و سوک بۆ لای دوکانی باشترین سەرتاشی شار ، مسیۆ پاراسکەواس کەوتە رێ تا بەدابی ئاسایی شەوی شەمزیان ریشی بتاشێ. جارویار لە رێگا رادەوەستا و سڵاوی لە دۆستە دوکاندارەکانی دەکرد. لە گەڵ ئەم و ئەو گاڵتەی دەکرد و باپیالە ئارەقێکی لێدەدا و پاشان بە هەنگاوی سوک دەکەوتەوە رێ.هەموو جارێ فێسەکەی لارتردادەنا. کەیفی بەوە دەهات کە لەشێکی ساخ و سەلیمی هەیە و هەموو ئازای یەدەنی وەک سەعات کار دەکا.هەستی دەکرد کە بێ خەم و خەیاڵە و بەوە خۆشحاڵ دەبوو. رۆژێکیان نوکتەیەکی لە کتێب دا خوێند بۆوەو کاری تێکرد بوو: «لە کاناریس - یان پرسیبوو تۆ چۆن توانیوتە ئەو هەموو هونەر و دلاوەریە لە خۆت نیشان بدەی؟ ئەو پاڵەوانە قارەمانە لە وەڵامدا گوتبووی: کوڕینە گوێ بدەنێ. من هەمیشە بە خۆم گوتوە : کونستاندی! ئاخرەکەی تۆ رۆژێک هەر دەمری!»

لەم رۆژەوە پاڵە وان پۆلیکسینگیس کڵاوی لار دادەنا و لە هەموو دەرفەتێک. لەشەر ولە شادیدا بەخۆی دەگوت : «پۆلیکسینگیس ئاخرەکەی تۆ رۆژێک هەر دەمری !» لە گۆڕستان قەبرێکی فرەوان و گەورەی لە بەردی مەڕ مەڕ وەک بن عەرزێک بۆ خۆی ساز کردبوو. لە چوار لاوە کوڵەکەی هەبوو. بالیفی لە هەمو لایەک دانابوو. مێزێکی بچوکی لە نێوە راستێ دانابوو. قەفەسەیەکی دە دیواری قەبرەکەی گرتبوو، هەمیشە پڕ تڵە ئارەق و چەند ئیستکانی لێ دەبوون، کاتێک کەیفی دەبوو قەرتاڵەیەکی پڕ دەکرد لە خواردەمەنی و دوو سێ کەسی لە دۆستەکانی

هەڵدەگرت و دەیبردن بۆ گۆڕستان و لەوێ دەستیان دەکرد بە ئارەق خواردنەوەو بە باسی ژن و شەڕ و مردن رایان دەبوارد.

بەڵێ پاڵەوان بە دڵێکی خۆش بۆ پێشەوە دەچوو. شەوێکی خۆش و ئارام بوو. گەڵای داران نەدەبزوت. عەتری سوورەگوڵی مانگی ئەپریل لە حەساری ماڵانەوە بۆنی دەهات. پیادە رۆکانیان ئاو پرژێن کرابوو بۆنی خۆڵیان لێ دەهات. بیری لەوە دەکردەوە کە بەم زوانە سەرتاش سابونی لە روومەتی دەداو ریشی دەتاشێ، ئاوی (ئوستو خودوس)ی بە قژەکانی دادەکاو ئەوەندەی جوان دەکا ناناسرێتەوە ، لە بیست ساڵیش گەنجتر دەنوێنێ. پاشان بە کۆڵانە تەنگ و تاریکەکاندا دەسوورێتەوە تا بزانێ هاڤاڵەکانی چییان بە سەر هاتوە.

هەناسێکی هەڵکێشاو لە دڵی خۆیدا گوتی: «لەعنەت لە شەیتان! ئەگەر بە راستی خوایەک هەیە، ئێستا کاتی ئەوەیە کە موجیزەیەک بنوێنێ، من ئێستا هەرەتی لاوەتیمە و ئێستا موجیزە بە کارم دێ. تا چەند ساڵ لەمەو بەر منداڵ بووم، ئەوەندەم نەدەزانی کە نرخی ژن و شەراب و شعر بزانم.بەو زوانە هێزم لەبەردا نامێنێ. کاتێک گورچیلەو دانم لە کار کەوتن، ئیتر ناتوانم چێژە لە ژیان بکەم.ئەو دەم بە حەسرەتەوە تەماشای ژنان دەکەم. وەک ئەو رێویە ئەفسانەییە خۆم دڵخۆشی دەدەمەوە... ئاخ ئەی سن ژۆرژی پچکۆڵەی من، لە نێو هەموو پیرۆزەکاندا تۆ باشتر لە قسەکانم تێدەگەی. بڕوام پێت هەیە.لەرەسمدا کە بە سواری ئەسپی سپی دەتبینم کە ژنێکت سواری پاشەرکی خۆت کردوە. ئافەرینت لێ دەکەم. ئاخ ... ئەی حەزرەتی سن ژۆرژ، ئەی هاو ناوی من ، یارمەتیم بدە و دڵنیا بە کە من دەست لە سەر دەست دانانیم»

ئەوەی گوت وکلاوی هێنا نێو چاوانی وبەرەو شەقامی گەورەی شارتا. ئەو شەقامە یەکێک لە دوو جادەی ئەسڵی شاری کاندی بوو.لە دەروازەی رۆژ ئاوای (کانە)وە دەست پێدەکرا و لە دەروازەی (لازارە) کە مەیدانی گەورەی شار وسێتاق و باخی پاشای تێدا بوو،دەبڕایەوە. لەو دەورویەرە لە نێوە راستی پۆلە داران بورتکەیەک پچووک دانرابوو کە رۆژەکانی هەینی دەستەی موسیقای تورک دەهات موسیقای لێدەدا. شەقامی دیکە راست ئەو شەقامەی دەبڕی، لە دەروازەی تازەوە دەستی پێدەکرد و بۆ لای خوارەوە تا دەهاتە لەنگەرگا. لە چوار رێی ئەو دوو شەقامە مەیدانێک هەبوو بە ناوەندی شار دەژمێردرا. شەقامی گەورە جێگای چەکمە درو و شرشە فرۆش وقاوەخانەی یونانییەکان بوو.دوکاندارەکان لە گەڵ کرێکار و شاگردان لە بەر دەرکی دوکانان رادەوەستان و گاڵتە و گەپ و قسەی قۆڕیان دەکرد، وای بە حاڵی ئەفەندی یا پشت کورێک یا خێلێک یا شەلێک و یا شێتێک بەوێدا تێپەڕیبا. ئەو دەم چەکمە درو تێکڕا لە قالبەکانیان دەدا، شاگرد دەستیان دەکرد بە فیشقەو فیتو لێدان. بارانی لیمو وبایەنجانی رزیو بە سەر ئەو فەقیرەدا دەباری.

ئێوارەی شەمۆ شادی گەیشتبوە ئەو پەڕی. ئەو شەوە لە شەقامی گەورەش هەرا بوو. بەو حاڵەش دەنگی زەنگوڵەکانی نوێژی خەوتنان توانیبوی بە سەر دەنگەکانی دیکەدا سەر کەوێ. سرپاس بۆ خوا کە وا دیسان حەوتوەکی دیکەش رادەبرد، شاگردی وەستاکانی پیشەیی و دوکانە ئاسن فرۆشەکان بەر سینگەکانیان لە خۆ کرد بووەو ئاویان بە دەستی وەستاکانیان دادەکرد کەدەمو چاویان بشۆن. وەستاو دوکاندار پاش ئەوەی دەست و چاوسان دەشۆشت و سەرو سمێڵیان لێکو

لوس دەکرد. بە فنجانێک قاوەو تەلیانێکەوە پاڵیان وە دەرکی دوکانەکان دەدا. زوو سەرو کەللەی (روشینە)ی قولە رەش کە وەک کێو لە گۆشتی رەشی بریقەداردا بوو. بە مەمکی داچۆراوی تا سەر سینگی و بە گەردانەی مورووە شینەکەوە پەیدا دەبوو. روشینە هەمیشە شادو بەکەیف بوو. پێدەکەنی، نیگایەکی بە مەکری هەبوو، دانەکانی لە بەر سپیەتی دەبریقان. تەبەقێکی پڕلە کولیچەی بە کولیچەی لە سە ر سەری دادەناو دەیگێڕا.

(تولوپاناس)یش لە لای کانی (ئیدومنە)وە دەهاتو وەک هەمیشە خەمبار و بێدەنگ بوو. بە دەستێک تەبەقی پڕ لە کولیچە و بە دەستی دیکەش نانی شیرینی بۆنخۆشی دەگێڕا. لە کاتی ئاوادا شەقامی گەورە ئیتر جادەی گشتی نەبوو. بەلکوو خێمەیەکی گەورەی ئەعبانی بوو کە لەویدا نوقلْ و شیرنباتیان دەدا بە میوانان.

پاڵەوان پولیکسینگیس ئاوێک راوەستا و بە فیز و لوت بەرزی تەماشای گەرەکی یوناتیانی دەکرد. دوکانەکان گشتیان رازابوونەوە. تورکێک لەوێ نەبوو کە هەواکەی پیس بکا. مەسیحیەکان پێدەکەنین و گاڵتەیان دەکرد. زەنگوڵەکان لێ یان دەدا. پاڵەوان لە بەر خۆیەوە دەیگوت: «ئەو شەقامە بەهەشتی راستیە و بێجگە لە ئاڵایەکی خاچ لە سەر، هیچ کەمایەسیەکی دیکەی نیە. بەڵام من دڵنیام ئەو ئاڵایەش بە تێکۆشانی ئێمەی کریتی پەیدا دەبێ». پاشان لە کاتێکدا لە چەپ و راست سڵاوی لە ئاشناکانی دەکرد، بەرەو دوکانی سەر تاش کەوتە رێ.

* * *

سێبەر دادەکشان. بانگدەر چوبوە سەر منارە تا موسڵمانان بۆ نوێژی شێوان بانگ بکا. بەڵام بەر لەوەی نەعرەتەی خۆی بۆ لای ئاسمانان بەرێ بکا، ئاوێک لە دوودڵیدا مایەوە. مێزەری سەوزی کە لەسەر ئارەخچنی سپی لە سەر بەستبوو، رێکو پێکی کرد و چاوێکی لە خوارێ و لە دەوروبەری خۆی کرد و لە بەر خۆیەوە گوتی: «ئەڵلا ئەڵلا ! ئادەمیزاد هەر چەندی کاری چاکیش بکا، هەرگیز ناتوانێ پاداشی چاکەی تۆ بداتەوە کە دوو چاوت بۆ تەماشای دنیا پێ بەخشیوە.»

بە سپایی داهاتەوە . لە تەماشای دیمەنی رەنگاو رەنگ و پڕ لە جوڵانەوەی کاندی، بەو منارە سپیانەو باخی سەر سەوز وگومبەزی مزگەوتەکان و خانەقای دەرویشان بە ئاڵای پێغەمبەرەوە، هەستی بە شادی و خۆشی کرد.بە سەر سوڕمانەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا :« بەراستی ئەم شارە پیرۆزە، هەموو شتێکی هەیە، هەموو شت! هەرچی مرۆڤ بخوازێ: لەژنی جوان و لاوی شۆخ! بۆ نموونە هەر ئەو نووری بەگە .کاتێک بە سواری ئەسپی رەش دەیبینم کە بە هەموو لایەکدا غار دەدا، هەست دەکەم کە لە تەمەنی بیست ساڵی دام. کەلچی جوانی واهەیە کە پێستی بەدەنی وەک نانی تازە تورت وسپیە. کاتێ لە قاوەخانان گۆرانی دەڵێن، مرۆڤ سەر خۆش دەکەن. پیاو نازانێ لە مزگەوتان عیبادەتی خوا بکا یا لەقاوەخان؟ من تەنانەت بۆنی ناخۆشی ئەو شارەشم پێ خۆشە کاتێک بە دەروازەی لازارەدا دێمە ژوور و بۆنی تەرسی هێسترەکانی کریتیم بۆ دێ، لە خۆشیان دڵم گەورە دەبێ. من ئەو بۆنەی کاندی بە هەموو عەتری دنیا ناگۆڕمەوە.ئەم بۆنە تا رادەیەک وە بۆنی بن هەنگڵم دەچێ کە هەموو لێی بێزارن و من پێم خۆشە .»

پانگدەر هەناسەیەکی درێژی هەڵکێشا، هەر وەک دەستی دە بنانگوێی ئاپورە لە پڕ دەنگی ساف و زوڵاڵ و پڕ لە پاکی و پاڕانەوەی تێ هەڵکرد. دەنگێک بوو خەماوی و بە چریکە، لە جوانیدا دەستی لە هەموو زەنگوڵەکانی مورتزوفلوس ئەستاند بوو.ڕاست بۆ لای خۆر دەچوو، بەرز دەبۆوە و ئاسمانی دەقەڵاشت و پانگی خوای دەکرد و لە پڕ وەک پەڕەسێلکە بە سەر کاندی دا دەهاتە خوار. دەتگوت هەموو بوونی خوای خوازدۆتەوەو پێی سەر خۆش بوە.

* * *

لەو کاتەدا کە پانگدەر تاریفی جوانی نوری بەگی دەکرد و ئیرەیی پێ دەبرد، نوری بەگ بە دڵێکی خەمبارەوە لە خانوبەرەی کلاو فەرەنگی خۆی دەگەڕاوە کە چۆن بوو لەوێ بحەسێتەوە. بەلام پەڵەیەکی شەرم و شورەیی کە هەستی دەکرد بە سەروچاو وسینگیەوە نووساوە ، دەیسووتاند.لە حەیفان زاری کەفی کردبوو. ئەسپەکەشی کە لەو ڕۆژەدا حاڵی باش نەبوو، سەر سمی دەدا.

دەریا لە دوورەوە سوور دەچوو. هەر چەند بای نەدەهات بەلام شەپۆلی دەدا. نووری بەگ لە چەمی بوفبرۆ پەڕیەوە. ڕەز تازە پەلکیان وەدەر دەنا. دار بادام گوڵیان کرد بوو.دار هەنجیر عەتریان دەپرژاند. ئەڕاندی و لەبەر خۆیەوە گوتی: « ئیتر هیچ شتێک من هێدی ناکاتەوە. هیچ شتێک ! ئەی دەریا لەبەر چاوم دوورکەوە، ئەی دارەکان، ئەی ڕۆژ ! »

دووبارە کەوتەوە بیری پاڵەوان میکێلس. بە خەیاڵ دەیبینی کە دوو قامکی دە پیاڵەی ئارەق ئاوەو دەتگی شکانی پیاڵەکەشی دەبیست، چاوەکانی ئامینەشی هێنا بەر چاوی کە سەری سوڕ مابوو لە سوێیان دەسوتا. بە دەتگێکی بەرز گوتی :« تف لەمن ! خۆزیا زەوی لێک دەبۆوە وتوتی‌دەدام. من کە ئیتر بە هێزترین پیاوی وڵاتی خۆم نیم ژیانم بە کاری چی دێت؟ من ئەو ژیانەم ناوێ !» ڕووداوەکانی شەوی ڕابردووی وەبیرهاتەوە.چ هەنگامەیەک ! چ خواردنەوەیەک کە بیرە هێزی سەرخۆشی و لە بەر دەرگا لە پیسایی کەوتبوو ! تەواوی ئەوانەی وەبیر دەهێناوە. خەوی لێ ئەوتبوو. هاوارێکی بە سامی وەک نەهرەتەی درندەیەکی وەحشی لە خەوی ڕاپەڕاند بوو. ئەم د نگە لە گەرووی کێ هاتبوە دەرێ؟ بەیانی‌کاتێکی خوڵامی ڕەش دیتبوویەوەو خاوێنی کردبۆ وە.خ رنەکە لە بەین چوو بوو.بەلام خەنجەرێکی وەدڵی‌کەوتبوو.

ئێستا بە پەنا قەبرستانی تورکەکاندا دەڕۆیشت. بەردی کێلەکان کە ڕاست ڕاوەستا بوون، بەو خەتی خوارە پێچەی نووسراو و بە سەری مەڕ مەرپەوە کە دەتگوت مێزەرن ، لە دوورەوە وەک حیسانی بەردی دەچوون کە تازە لە قەبر هاتوونەتەدەرو دەیانەوێ لە عەرز جیا ببنەوەو بپەڕنەوە بۆ شاری کاندی. نووری بەگ لە لای دەریاوە لە لووتکەیەکی گۆرستان بە چاو لە گڵکۆی باوکی دەگەڕا کە لە نێو درو داراندا دیار بوو. کاتێک قەبرەکەی دیتەوە لە ترسان لەرزی. وای هاتە بەر چاو کە مێزەری مەڕ مەڕی کێلی قەبرەکە جوڵاوەو بۆ دوابە خزیوە.(هێنالی) خوێنخۆر کە زیندوو بوو کاتێک توڕە دەبوو مێزەرەکە ی ئاوا لە پشت سەری دادەنا. دنیا لە دەوری سەری نوری بەگی سوڕا. ئەسپەکەی سەر سمی دا و بۆ لای قەبرەکەی چوو. نوری بە ترسەوە دەستی بە یاڵی ئەسپەکەی گرت کە بەکەوێ.جڵەوی ئەسپەکەی کێشا. ئەسپ هەستا سەر پاشوان و دەستی بە

بەدفەری کرد. ئەوە هەوەڵجار بوو کە ئەسپی نوری بەگ سەر سمی دەدا. ئەوە خۆی خەبەری کارەساتێکی شووم بوو. نوری بەگ هاواری کرد،ویستی دابەزێ و بچێتە سەرگۆڕی باوکی دوعای بۆ بکا. بەڵام لە مردوو ترسا. لەپڕ هەموو شت لە مێشکیدا روون بۆوە.ئێستا خەونی شەوی رابردووی بە ئاشکرا دەبینی. هێنالی لە بان سەری راوەستا بوو، بە کراسێکی دڕاو وسەرتا پێی بە قوڕو لیتە داپۆشرا بوو.ئەو کە لە هەموو ژیانیدا بەری پێی لە سەر خۆڵێ دانەنابوو، ئێستا بێ پێڵاو بوو.بە سەر نووریدا دەیبەڕاندودەیگوت : « ئەحمەق ! هیچ دەزانی ئەوە چەند ساڵە بە دەوری ماڵی تۆدا دەگەڕێم؟ راست لە ساڵی ١٨٦٦ وە واتە بیست ساڵ لەمەو بەر ! تەماشای من کە ،وام دەزانی کە کوڕم هەیە ، کوڕی تاقانەم ، شەو رۆژ لە فیکری منذا دەبێ و بێجگە لە تۆڵە ئەستاندنەوەی من بیر لە هیچیتر ناکاتەوە... لە جیاتی ئەوە هەمیشە دەنگی پێکەنین و موسیقاو گۆرانی لە پەنجەرەی ماڵی تۆ دەبیسم. ئەو دەم غەریب و بێکەس باری شەرم و شوورەیی خۆم لە کۆڵان و سەحرا دەکێشم. کوڕ ئەگەر بۆیە ئەبێ رۆژێک تۆڵەی باوکی بکاتەوە ، ئیدی بە کاری چیدێ؟ تۆش بێ ئەوەی شەرم بکەی، خوێنی خۆت لەگەڵ خوێنی برای قاتلی من تێکەڵ دەکەی. ژنی خۆت بێ پەچەو چارشێو بەو نیشان دەدەی. وای لە تۆ .. بێکارە ... کافر ! »

ئەم جنێوانە نوری‌یان تووڕە کرد. ویستی هاوار بکاو بڵێ : « پیرە مێرد لە قەبریشدا ناهێڵی ئاسوودە بم. ئیتر دەستم لێ هەڵگرە ! » بەڵام وشەکانی لە زاریدا تێک دەهاڵان و دەبانخنکاند.رکێفی لە ئەسپی دار پێش رۆژ ئاوا بوون بە دەروازەی (کانە) دا چۆوە نێو شاری کاندی و بۆ لای گەرەکی یونانیان ئاژوای.

* * *

هەر لەو کاتەدا پاڵەوان میکلیس لە دەروازەی لازارە لەو سەری شار وەنێزیک دەکەوت. ماوەیەک بوو ماینی خۆشتر داژوا، چونکە خۆر لە دەریا چۆبوە خوار و ترسی ئەوە هەبوو کە دەروازەکانی شار دابخرێن. لە دوور گوڵەکانی دەبینی کە بۆ گەرانەرەی گەرەکی خۆیان رابوون. ئەوانە هەموو رۆژێ لە بەر دەروازەی کاندی لە نێو خاک و خۆڵ دادەنیشتن و دەستە سەقەتەکانیان بۆ خێر و سواڵ درێژ دەکرد. لەکاتی رۆژئاوا رادەبوون و بۆ خانووەکانیان دەگەڕانەوە. ئەم ئیوارەیە ژن و مێردە گەنجەکە کە شەوی پێشتر یەکتریان توند دە ئامێزێ گرتبوو، وەپێش کاروانی کەوتبوون. لە پەنا یەکتر بە تاڵوکە و لالوت دەرۆیشتن. گشتیان بێدەنگ، بە دم و چاوی خۆرە لێدراو ی بێ دم و گوێ رێگایان گرتبوە بەر. هێندێک کوێر بوون ، هێندێک چونکە لێویان نەبوو دەتگوت پێدەکەنن.هەموش پەلەیان دەکرد، دەتگوت رۆژی قیامەتە وئەوانە بە زوڕنای ئیسرافیل لە قەبری هاتوونە دەرو بەڵام لە بەرتاڵوکەیی هێندێ گۆشتی لەشیان لە قەبریدا بە جێماوە. پاڵوان میکێلس رووی وەر گێڕا، دیتنی ئەم ئەخۆشیە دڵی تێکدەدا. لە بەر خۆیەوە گوتی :« تەنیا ساخو سلامەتەکان هەقی ژیانیان هەیە، ئەوانی دیکە بە کار نایەن. » رکێفی لە ماینێ دا و لەو کاتەدا کە دەروازەوانی تورک کلیلی دەروازەکانی شاریان بە دەستەوە بوو، بەرەو رۆژ ئاوا شەبپووریان لێدەدا و ئالای عوسمانی لە سەر دار دەهاتە خوار، لە دەروازە تێ پەڕی و هاتەوە ژوور.

# ٣

ئەویٚ شەویٚ باو باران بوو .سروشت بە ماتی لە نیگەرانیدا وێستا بوو.هەوا قورس دەبوو. گەلاٌ تازە شینبوەکان لە تاریکایی شەودا خەفەتبار لێک دەهالاٌن.هەرەشەیەکی گەورە گرانایی هاویشتبوە سەر شار.

پاڵەوان میکێلس خەوی تێکچو بوو.خەڵکی کاندی لە مانگە شەودا پەنجەرەکانیان دەکردەوە و دوگمەی کراسەکانیان دەترازاند تا باشتر هەناسە هەڵکێشن. چەند پیرێژن کە هەستیان بە گەیشتنی بەدبەخت دەکرد، لە بەر دەرگای ماڵەکانیان دانیشتبون. بەلاٌم لە ترسی ئەوی نەکا فیکرەکەیان وەراست بگەڕێ، لێویان لێک نەدەکردەوە.مەلاتیکەی عەزابی کاندی لەعنەتی لێبیٚ، لەوانە بوو دەتکیان بیسیٚ و ئەو بەلاٌیە بەسەر شار بێنیٚ کە هێشتا بڕیاری بۆ هاتنی نەدرا بوو.

ئەوان زۆریان دەگوت، هەوڵیان دەدا کە باسی شتی بیٚ مانا بکەن و تەنیا شتێک بێژن کە پێی دامرکێن. بەلاٌم هەر لە جیٚ دەگەڕانەوە سەر ئەو مەسەلەیە کە فیکری ئەوانی بە خۆوە خەریک کردبوو: «وە بیرت دیٚ؟ جاری دوایش بەلاٌیەکی ئاوا، «بێدەنگ بە بەد بەخت .» وچما لە ژێر قاچت دەنگی گرمە نابیسی!» «.. گوتم بێدەنگ بە..»

پاشان دەچوونەوە ژوور ، دەرگایان دادەخست و چاوە روانی ئاخرین هێزی هێندی بوونەوە، واتە هەلاٌتنی خۆر دەبوون. ئاخرەکەی ئەو ئەستێرە گەورەیە، داپۆشراو بە پەردەیەک هەوری ڕەنگ مسی، بە بیچمێکی گرژ و ڕەوەکەوە سەری لە پشتی چیاکانەوە هێنا دەر. منارەکان ڕەنگی ئاگریان لیٚ نیشت. دەریا ئەرخەوانیبوو. هەر لەو کاتەشدا مورتزوفلوس هەر سێک زەنگوڵەی وە دەنگ هێنان. لە گەڕەکی یونانیەکان لە هەموو لاوە دەرگا دەکرانەوە.گەورەی ماڵەکان پاک و خاوێن بە جلی تازەو کراسی سپی دەهاتنە دەر. ژن و مێرد لە نێوە ڕاست و خەسوو نەختیٚ دواتر، زارۆک بە جلی جوانەوە لە پێشەوە دەرۆیشتن.کوڕە لاو دەسرەی سپیان بە دەستەوە و گەورە کچیش قەیتانیان لە پرچەکانیان گرێدا بوو. هەموویان دەچوون تا لە خزمەت شاسواری وەلینیعمەتی کاندی، واتە سن میناس دوعا بکەنو گویٚ بدەنە قسەکانی خەلیفە کە ئەو رۆژە وەعزی دادەدا و نانی متفەرکی بەسەر ئیمانداراندا بەشدەکرد، چونکە ئەو رۆژە یەک شەممۆ بوو. ئەو رۆژە کارو کاسبی نەبوو.دوکانەکان نەدەکرانەوە.ئاوادارترین بازرگانی دنیا، واتە شەیتان خۆی، تەواوی ئەو رۆژە دەنوست کە وابوو بێجگە لەوە کە بچن گویٚ بدەنە قسەکانی خوا کارێکی دیکەیان نەبوو. ئەو کارەش خەرجێکی نەبوو، کەس هیچی لە کیس نەدەچوو. رۆژی دوایش هەر لە بەیانیەوە سەر لە نوێ گەزو تەرازوو یان دەست دەدایەو سەودار چەنە لێدان دەست پێدەکراوە.هەر کەس لە دەستی هاتبا، کلاٌوی لە سەری ئەویتر دەنا. شەش رۆژ هی شەیتانیەو رۆژێکیش هیٚ خودایە.ئێوە هەروو رۆژیٚ شەمێک پیٚ بکەن و خەباڵتان ئاسودە بیٚ.کلیسا وەک ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە

دەدرەوشا. بۆنی میوەو کەندری لێدەهات و وەک کەندوی پڕ لە مەلائیکە و پیاو چاک و ئادەمیزادانەمرگەمەی دەهات. لە بەر ئەوەی جێگای ئەو هەموو ئیماندارە نەدەبۆوە، کۆمەڵێکی زۆر لە ژێر دالانی سەر داپۆشراوی کلیسا و یا لە حەسارێدا مابوونەوە. خەلیفە بەر ئەدو قەوارەی بەسام و ریشی سپی و کەوای چنراوی قەشەیی و قەیتانی ئاڵتوونی، لەسەر میحراب وە داعبایەکی ئاسمانی دەچوو کە بۆ چارە دیری بە سەر کاری ئادەمیزادان و ترساندنیان هاتبێتە سەر زەوی.

قەشە مانولی بە کراسی زێرکفتەوە بۆ لای میحراب دەهاتە پێش و باسێکی ئینجیلی لە بەر خۆیەوە دەگوتەوە کە مەسەلەی رۆژ بوو.راست لەو کاتەدا کاپامپس و ژنەکەی بۆ چوونی کلیسا لە ماڵێ دەهاتنە دەر.ئەوان یەکشەمۆی رابردوو پێکەوە زەماوەندیان کرد بوو. ئێستا بە گوێرەی داب هەر بە جلی بوکێنیەوە دەچوون تا لە پێش وەلینیمەتی کاندی، واتە سن میناس وە پاڕێن و نانێکی گەورەی بۆنخۆشی بۆ بەرن کە بە دارچین وکوندو ر و شەکر دروستکرابوو.

خانوە پچکۆڵەی ئەوان لە نیزیک لەنگەر گا لە شوێنێ بوو کە سەرەتای گەرەکی جولەکانە و لە کولانێکی تەنگی ماربیچ کە بای شەماڵ دەیکوتاو خوێی دەریاش دەیسوتاند.گاروفالیا قۆڵی خستبوە قۆڵی مێردەکەی و هەر دووکیان بە فیز دەچوونە پێش و لە کاتێکدا دڵیانەوە سلاویان لە سروشت دەکرد کە لە جێژن و خۆشیدابوو. وای،گەرەکو کۆلان چەندە خاوێن و بریقەدار بوون و بە دارەکانی ئەو بەرەو بەر چ عەترێکیان بلاو دەکردەوە.بەردرگان پێدەکەنین، زەوی وەک بوک خۆی رارەدبۆوە. هەندێ دڕووی شووروەی باخەکان گوڵی سپیان دەرکرد بوو. کاندی وای لێهاتبوونەدەسراوە. گاروفالیا لە بنەوە چاوی لە مێردەکەی دەکرد وله دڵی خۆیدا دەیگوت «خودایە ئەو هاتەران پاتەرانە چیە قەشەکان دەیهۆننەوە؟ بەهەشت هەر ئەوەیە کە لەم دنیایەدا هەیە حوایە من تکات لێدەکەم کە بەهەشتی دیکە بە نسیبی من مەکە!» ئێستا هەرتک گەیشتبوونە مەیدان و تاوێکی دیکە لەو پێنجە پاپاندەداوە و دەگەیشتنە کلیسا.کاپامپس تەماشایەکی ژنەکەی کرد. هەستی کرد کە تەواو تێکچوە.لە پڕ وای هاتە بەرچاو کە زەوی بە هەموو گیان لەبەرێکەوە تابوت بوە و بێجگە لەو لەشە گەرمەی پەنا ئەو بەو کراسی تەنک و داوێن و ملوانکەوە کە بۆنی خۆشی ئینسانی لە زاری دێ، کەسیتر نەماوە.کاپامپس لە پێرێوە هێندی خەمناک بوو، چونکە دەبوایە وەلامی داوەتی پاڵەوان میکێلس بداتەوە. ئەو مەسەلەیە بۆ ئەو زۆر گران تەواو دەبوو کە هەشت رۆژ لە ژنەکەی وەدوور کەوێ و نەتوانێ دەنامێزی بگرێ. لە نێوە راستی مەیدانێ راوەستا.ئەو کە خەڵکی ئەسقاکیا بوو، سن میناسی کاندی و دابو رەسمی ئەو شارەی بە هێند نەدەگرت. ئەوانە قازانجی چیان بۆ ئەو هەبوو؟ لە جیاتی ئەوەی لە ماڵی خۆی بحەسێنەوە، بۆچی دەبوایە بچێتە کلیسا و کاتی خۆی لەوێ بە فیرۆ بدا؟ خودا هەمیشە لەو لاوانە خۆش دەبێ کە تازە زاوان. ئەو ئیتر کاتێکی زۆری نەمابوو.ئێستا پاڵەوان میکێلس ئەو شێرە قین ئەستورە لە ساردای خۆی لەوانەیە چاوەروانیبێ. کاپامپس باسکی ژنەکەی گوشی و چاوێکی لێداگرت و لە کاتێکدا لەبەر هێرشی شەهوەت وە هەناسە برکە کەوتبوو گوتی:

- ژنەکە ! چدەبوو ،گەراباینەوە بۆ کاولەکەی خۆمان؟

- چۆنی تۆ دەخوازی ماناکیسی خۆشەویستم.

هەرتکیان وەک رەدوایان کەوتبن گەڕانەوەو بە ماوەیەکی کەم لە مەیدان چوونە دەر. بە پێش چنارە گەورەو بەر دەرگای ماڵی پاشادا تێپەڕین و بە پشت کۆڵانەکاندا گەیشتنە لەنگەرگا، کاپامپیس بە گورجی دەرگای کردەوەو چوونە ژوور و دەرگایان داخست وبە جووت لەسەر تەخت لێی کەوتن.

* * *

پاڵەوان میکلیس بەیانی زوو چووبوە ژێرخان و چاوە ڕوانی میوانان بوو. لە لای راستەی سێ چەلەنگ شەراب لە سەر دوو تەختەی گەورە دانرابوون.لە لای چەپەی دوو گۆزەی پڕ لە ڕۆنی چراو گەنم دەبینران. لە بان سەری شریتی هەنجیر و هەنار و بەهێ و کاڵەکی وشک کراو بۆ زستان هەڵاوەسرا بوون.سا رداو بۆنی شەرابی لێدەهات.زوو مریشکی کوڵاو وماسی و سوسیان دەهێنا و بۆنی هەواکە دەگۆڕا.

پاڵەوان میکێلس لە سەر چوارپایەک دانیشتبو، سەری بە دەسرەیەکی رەنگ تاریک پێچا بوو. پاڵی وەدیواری دابوو، چاوی بڕیبوە دەرکی سارداو کە بەرەو رووی ئەو دەکرایەوە.بە تەواوی ماتبوو. هیچی نە دەبینی و بیری لە هیچ نەدەکردەوە.تەنیا جاروبار بە دەست، وەک گاز لێواری مێزەکەی پێش خۆی دەکوشی وداڕەکەی دە نوشتاندەوە.

فیکری بە قورسایی دڕندەیێکی دەستە مۆکراوی کوێر لە خەو دابوو، بەڵام دڵی دەکوڵی، تا ئێستا ژیانی بە خۆشی رابوارد بوو. لە هیچی کەم نەبوو.بە هێز بوو، ژنێکی ئاخر خێری هێنا بوو، باوکی خاو وخێزانبوو، هەموو رێزیان لێدەگرت.کوڕەکەی راست وەخۆی دەچوو.کەوابوو لە مردن نەدەترسا، چونکە تراساکی رێبازی ئەوی درێژە پێدەدا. کوڕەکەشی وەک خۆیَ خاڵێکی لە ملی بوو.بڕۆی ئەستور و چاوەکانی ورد و خڕ و رەشبوون.کەوابوو پاڵەوان خەفەتی چی هەبوو.؟مارەیەک بوو تاقەتی هیچ شتێکی نەبوو.پێنەدەکەنی، گاڵتەی نەدەکرد، قسەی واشی نەدەکرد کە خەڵکی تر پێبکەنن. هەر چەندە لە زاتدا مرۆڤێکی روو گرژ و تۆسن بوو. رۆژێک مانولاکیسی زن برای کە پیاوێکی نازەنین بوو، هاتبوە ماڵیان و ویستبووی شەو لە لای ئەوان رابوێرێ. بەد بەخت پێکەنیبوو. پاڵەوان میکێلس بە توورەیی چاوی لێکرد بوو. ما نولاکیس بە جارێک نارەحەت ببوو، لێی دابوو رۆیشتبوو.پاشان پاڵەوان میکێلس بە کورەکەی گوتبوو: « کابرا شەرم ناکا پێدەکەنێ، حەیای نەبوو.»

هێندێ جار بیری دەکردەوە، لە دڵی خۆیدا دەیگوت: « کاتێک کریت ئازاد بوو، دڵی منیش ئازاد دەبێ. کاتێک کریت ئازاد بوو منیش پێدەکەنم.» لەگەڵ ئەوەش کە زۆر لە مێژ نەبوو خەونی بە ئازادی کریتەوە دیبوو، لە خەویدا کریت ئازاد بوە و زەنگوڵەکان لێدەدەن، کۆڵانەکان پڕبوون لە گەڵای سوور و گوڵی نەستەرەن.پاپۆرێکی زۆڵی سپی لە لەنگەرگا وێستا بوو، شازادەی ئاتین هاتبوە خوار و داهاتبۆوە کە عەرزی کریت ماچکا. پاڵەوان میکێلس خۆی کلیلی شاری کاندی لەسەر کەشەفی زێو دانابوو، چاوە ڕوانبوو کە پێشکێشی شازادەی بکا، هەرچی بێ کریت ئازاد ببوو، بەڵام دڵی ئەو هێشتا هێدی نە ببۆوە. بە توورەیی نەڕاندبووی گوتبووی:« بۆ چی وام لێهاتوە؟ کەمو کوڕی چیم هەیە؟ وەختە شێت بم.» خوێن چووبوە دەمێشکی، چاوی سوور هەڵگەرا

بوون، پێی وابوو سەری دەتەقێ.کریت لە بەر چاوی دەهاژا و دەهات نوقمی دەریا بێ. ئەو نێتر دورگە نەبوو، جانەوەرێکبوو کەوتبوە سەر ئاوی دەریا. (گزرگۆن)ای خوشکی ئەسکەندەری مەزن بوو کە دەینالاند و دمی لە ئاوێ دەناو دەیکردە باوباران. لەو کاتەدا کە پاڵەوان میکێلس گوێچکەی دابوە ناڵینی جانەوەر، هەستی کرد کە فیکری ئالۆز بوە و لەپڕ کریت رەنگی گۆڕا. لە نیوەراستی دورگە دارچنارێک ریشە ئاژۆی کردبوو دەهات گەورە دەبوو. لقوپۆپی‌دەردەکرد وجەرگ و ریخۆڵەو هەناوی دورگەی هەڵدەلوشی. تەرمی باپیرەکانی دە بینی کە کە بە پێخاوسی و بە شین هەڵگەڕاوی و زمانی دەرهاتوو، بە لقی‌دارەکەوە سووڕدەخۆن. هەر لەو کاتەشدا بایەکی توند دارەکەی دەبزاوت. لەو دەمەدا کە پاڵەوان چزکی لە بەرانبەر دادابوون، لە پڕ گشتیان لە بەر چاو ونبوون. فیکر لە مێشکیدا نەما. بێجگە لە فانۆسێک کە بە شوشەی سەوز وسوور رووخساری نوری بەگی رووناک دەکرد وبوتڵە ئارەقێک و کەوێکی برژاو و لەو سەری وەتاغیش ئەو لێوانەی لە پیاڵەدا وەک دەنکی مرواری پیکەنینیان لێ هەڵدەوەری و دوو برۆی چەرکەسی، هیچ شتێکی تر نەما.

پاڵەوان رابوو، مستێکی وەهای لە دیواری دا هەموو خانوەکە لەرزی، بە تورەیی چاوی بڕیە دەرکی ساردا و چونکە گاڵتە چیەکان نەهاتبوون جنێوی دەدان. گاڵتە چیەکان لە چوار گۆشەی شاری کاندی کەوتبوونە رێ. باکێنشی خاوەن مەیخانە بەیانی زوو پێش هەموان لە خەو رابوو، لە بەرامبەر وێنەی مەولای خۆیدا« نوتر دام» راوەستا بوو.دوعای دەکرد کە دڵی بە قەوەت بکا، چونکە پێی وابوو دەچێتە شەڕێکی گەورە. ئەو شەرە هەشت شەو وهەشت رۆژی دەخایاند.ئەگەر نۆتردام یارمەتی نەکردبایە، کاری کرابوو. پێش چەند ساڵ تکای لە قەشە«نیکودم» کردبوو کە رەسمێکی حەزرەتی مریەمی بۆ بکێشێ، بەلام نەک ئەو مریەمەی کە نگارکێش دەیکێشن: دایکێک و مناڵێکی شیرخۆر بە ئامێزیوە.بەڵکو ئەو مریەمەی کە خۆی بە خەودا دیتبووی.واتە ژنێک بە شکڵ و قەوارەی ژنی‌دارتاش، هێشوە ترێیەک بە ئامێزەوە بە قەد مناڵێکی شیر خۆرە. قەشە لە پێشدا گوتبووی: «شتیوا نابێ. چونکە ئەو مریەمەی تۆ دەڵێی لە کتێبدا نە کێشراوە.کێشانی ئەو بە شکڵێکی دیکە گوناحە. ئەشێ عیسای مەسیحی بە ئامێزەوە بێ، نەک هێشوە ترێ. باکێش بۆ ئەوەی قەشە رازی بکا بەڵێنی پێدابوو بێجگە لە هەقی نگار کێشانەکە بوتڵێک ئارەق ودوو کیلۆ ماسی مۆرێناشی بۆ بێنێ. قەشە نیکۆدم رازی ببوو. چەند جار نیشانەی خاچی کێشا بوو، دەستبکرد بوو بە کێشانی رەسمی مریەم و هێشوە ترێ.

ئەو رۆژە باکێش بە دەربێوە لە بەرامبەر رەسمەکەدا وێستابوو بە گریانەوە دەپاڕاوە و دەیگوت:

- یا نۆتردام! تۆ خۆت ئاگاداری مەیخانەو مەیخانەچی بانی چی. ئێستا ئەوە تۆ بەجێ‌دێڵم و دەچم تا بە پلیکانی سارداوی ماڵی پاڵەوان میکێلس دا بچمە خوار. تۆ خۆت دەزانی مانای ئەو کارە چیە؟ لە بیرت نەچێ بۆ وەدەست هێنانی تۆ پارەی نەغد وماسی مۆریناو ئارەقم داوە. کەوابوو لەفریام کەوە، مەهێڵە بکەوم. پاریدەم بدەکە تواناى ئەو ئارەق خواردنەوەم هەبێ. سەر خۆش نەبم، لە ڕشانەوەو پیسکردنی دەرو دیوار بمپارێزە پاشانیش تە ی خانمی من دڵی ئەو پاڵەوان میکێلسە، ئەو درندە وەحشیە نەرم بکە کە زووتر مەرەخەستمان بکا. هەشت شەو وروژ یەکجار

زۆره ، خودایه، حەزرەتی مریەم ، یەکجار زۆره.

پاکیش لەچێ هەستا.لیباسی دەبەر کرد، دەفەی دەستدابەو چوە حەساری مالاوایی لە ماروسیوی خێزانیو دوو کچەکانی کرد و ئەسپاردی کە دوو رۆژ جارێک بچن سەری بدەن و ئەحوالی بپرسن. بۆ خەرجی حەوتویەک پارەی دانیو داوای لە کچە گەورەکەی کرد چونکە مامۆستاو لە وانیتر تێگەیشتوتر بوو، شتێکی بۆ لە پارچە کاغەزێک بنووسێ. و حسبە گیرفانی تەماشایەکی ملەکەی کرد، دەتگوت دەیەوێ مالاوایی لێ بکا جارێکی دیکەش بستەی حاجی کێشا و کەوتە رێ.لە پێشدا سەرێکی لە مەیخانەکەیدا، کاغەزی بەدەرگاوە نوساند، لە کاغەزەکەدا نووسرابوو «خاوەنی مەیخانە لەبەر پێراگەیشتنی کارەکانی، ماوەیەک دیار نابێ». کەمێک هێدی بووە، بەرەوماڵی پالەوان کەوتە رێ. وەدرەنگی کەوتبوو، دیارە ئەو دێوە بێ شاخ و کلکە هیچی پێ نەدەگوت، بەلام تیو چاوانی لێنێک دەنا، هەر ئەوەندەش بۆ ئەم بەسبوو.

کاتێک بە پێش ماڵی براگەورەکەیدا تێدەپەری کە تاجرێکی گەورە بوو، هەنگاوی توند کردن. لە بەر خۆیەوە گوتی: خوا بکا نەمبینێ، دەنا دەزانێ دەچمە کوێ‌دیسان قسەم بۆ ساز دەکا. کەرە گەورە ئەگەر نارازیە با بچێ خۆ بخنکێنێ.» کەپۆ زەلامەکەی خوراند و بە بۆڵە بۆڵ گوتی: «بەڵێ با بچێ خۆی لەدار بدا.بەوی چی کە من چەدەکەم؟ئاخ ئەی کەرە گەورە! لە بیرت نەچی ئەو رۆژانە چ دەردێکم دایەی! خۆم نەمدەزانی چزنم، خوارە خوارە دەرزیشتم و وەدیواری دەکەوتم. لەپڕ لەگەڵ ئەو جەنابە کە لە ماڵە گەورەکەی دەهاتە دەر تێک هەڵەنگوتین. کە چاوی بەمن کەوت، تیو چاوانی تێکنا وگوتی: «ماتولی لەعنەتی! شەرم ناکەی هەی ئارەق دەخۆیەوەو دەخۆیەوەو دەخۆیەوە؟ منیش توند خۆم بە دیواریەوە نووساند وگوتم : «تاجرە کەرەی لەعنەتی!ئێوش تەریق نابیەوە کە ئارەق ناخۆیەوەو ناخۆیەوەو ناخۆیەوە؟.» دوروسێ کەس بەوێدا دەهاتن، دەستیان کرد بە پێکەنین. کەرە گەورەی ئیمە رایکرد ئەمما راکردن!»

پاکیش لە رێگادا لەبەر خۆیەوە دەیگوت:«من دەمتوانی ببم بە قەشە. چونکە بە ئیرادەی خوای رۆژی پیرۆزی هەینی لە دایک ببووم.ئاخر باوکیشم قەشە بوو.بێجگە لەوە کێ دەزانێ منیش نەدەبووم بە قەشە.بەلام چوونی مەدرەسەو منگە منگ و رێکو پێکی بۆ من کارێکی فرە چکۆلە بوو.هەر لە منالیەوە دەفەم والبندەدا کە بەرد بە بستنی وە سەما دەکەوت.هیچ شاییو بەزمێک نەبووکە بەشداری نەبم. هەمیشە زووترلەهەموان دەگەیشتمێ و ئیتر دەستمهەڵگرنەبووم. هەر بۆیەش «سێ کچەکان» نازناوی پاکیشیان داومێ.وردە وردە دە، دستم کرد بە ئارەق خواردنەوە وام لێهات ئیتر بە بێ شەراب نە دەژیام. هەر بۆیە مەیخانەم کردەوە. ئەسپاردم رەسمێکی حەزرەتی مریەمم بۆ بکێشن کە بە کارم بێ.مریەمێکی ئەوتۆ کە لە دنیای مەسیحیەت دا کەس نەیبێ، مریەمێکی ئەوتۆ کە لە گەڵکو بانگم کرد. کاریشی هەبێ گورج بەدوای مندا بێ.ئیستا ئەو مریەمە لە کن خۆمە و نایدەم بە هیچ قاحبە دایکێک.ساڵی رابردوو ئەو پالەوان پولیکسینگیە چەنەیە ریستی بە ئەمانەت لێم وەرگرێ تا راپیپێرێ یەکێکی وێنەی ئەوی بۆ دروست بکەن. داخوا من ئەوەی بە ئەمانەت دەدەم بەکەس! ئەویش من؟ بە کێ؟.پێم گوت : «ئەی پالەوان پولیکسینگیس بۆ چما تۆ ماینی خۆت بە قەرز دەدەی بە کەس؟نا .. باشە .. کە وابو منیش مریەمی خۆم بە قەرز نادەم بە تۆ!»

باکینش هەروا کە دەڕۆیشت لە بەر خۆیەوە قسەی دەکرد. لە پەنا کانی ئیدزمنە تووشی میستیگری و بیرتولدو بوو کە هەردووکیان بە هەناسە بڕکە بۆ ماڵی ئەو دێوە دەڕۆیشتن. ئەوەندە توند وێک کەوتن کەمی مابوو دەفەی باکینش بدڕێ و کڵاوی بیرتولدو بکەوێتە خوارێ. میستیگری گوتی:

– بۆ وابە پەلە دەڕۆن خۆ دەزاری گورگ باوێن. تۆزێ ڕاوەستن، سیغارێک بکێشین. سیغار دڵمان بە هێز دەکا. هەر سێک لە سەر لێواری کانی دانیشتن و کیسە توتنیان هێنا دەر. میستیگری بەو ئەدو قەوارە زلە کە لەگەڵ بە ساڵا چوونی پان ببۆوە و بەو لاقە زلامانەی وەک لاقی فیلی لە نێوە ڕاستێ دانیشتبوو. ئەگەر ئەو لاقە زلانە نەبان کەس سلاویشی لێ نەدەکرد. چونکە خەڵک سلاو لە کەسێک ناکەن کە ژنەکەی دەیکوتێ. بەو بڕۆی پان وسمێڵی ڕەق و داوداوی وەک پشیلە دەچوو.

بیرتولدو پیرە پیاوێکبوو وردیلەو تەر وتەمیز و خوێن شیرین. بیچمێکی تایبەتی بەڵام خۆشە ویست. چەنەگەی درێژ و تازەش ڕیشی تاشیبوو. دوو قژ لەسەر لاجانگی بادرابوون و ڕۆن و عەتریان تێدرابوو. لە کاندی و بەڵکو لە هەموو کریت، تاقە پیاوێکبوو، بێ ئەوەی گوێ بداتە خوداو خەڵک لوس لوس سمێڵی تاشیبوو. خەڵکی کریت تائەو دەم لایان وابوو کۆسەیە. گوێ یان نەدەدایە، بەڵام کە زانیان سمێڵی دەتاشێ لێی تووڕە بوون و دەیانگوت: « شتبوا قەت نابێ. نەزمی گشتی تێک دەدا، ئیتر ژن و پیاو لێک ناکرێنەوە. هێندێ کەس تۆزێلکە لیمۆ بەردیان پێدادەدا. هێندێکی دیکەش کە بە ئەدەب بوون، وازیان لە سلاو وئەحواڵپرسی هێنابوو. ڕۆژێک باربابانیس لە کاتێکدا دەستی بە سمێڵی خۆیدا دەهێنا بیرتولدی خستە بەر تەوس و پلار و گوتی: « لێرە کەس ئەو لوتی گەریەی پێ خۆش نیە. لە کریت دوو جۆرە ئینسان دەژین، نێر ومێ. لێرە کەس پێویستی بە نەنێر نەمێ نیە.! ڕۆژێکی یەکشەمۆ کە بیرتولدو شۆخ و شەنگ بە سێبتارەوە بە پەنا سێ‌تاقدا دەڕۆی، تووشی میستیگری بوو شەشدانگ مەست. ویستی لە بەر چاوی خەڵک ڕووتی کاتەوە تا بزانێ ژنە یا پیاوە. چەند کەس بە ڕۆژوو بوون نەیانهێشت. میستیگری لەو کارە ئەوەندە پە ژیوان بۆوە دەستیکرد بە گریان و بیرتولدوی وەئامێزێ گرت. سەری بە سینگیەوە نا و لاواندیەوە. ئەوەندەی ماچکرد کە هاواری لێ هەستا و گوتی: « بابە لێم گەڕێ خنکام. »

لەو ڕۆژەوە ئەوەندە بوونە دۆست وەک گوێی گەڕێ جووت بوون. شانسی بیرتولدو لەوە دابوو کە خەڵکی کریت نەبوو. خەڵکی دورگەی زانت بوو. بە هەڵکەوت « کورتێ » یش بوو. زۆر جار لە خۆی دەپرسی کە بۆ چی هاتۆتە کاندی نێو ئەم وەحشیانە. ناویشی بیرتولدو نەبوو. ناوی ڕاستی کۆنت « مانزاوینو » بوو، بەڵام چونکە لە هەموو وەرزێک هەر سەرمای دەبوو کە لەماڵێ دەهاتە دەر هەمیشە ئەو شنێلە درێژەی بە خۆ دادەدا کە بە تێپەڕبوونی زەمان سەوزهەڵگەڕابوو. قسەکانیشی وە قسەی خەڵکی ئاسایی نەدەچوو. لاقەکانیشی خوار وخێچ بوون. پیاوێکی شۆخ و ترسەنۆکیش بوو. خەڵکی کاندی نێویان نابوو « بیرتولدو ».

بەم حاڵە ساڵ بە ساڵ لە ئەژماری شاگردەکانی کەم دەبۆوە. کریتی بۆچی دەبو فێری لێدانی سێتار بن؟ دەنگی کەرانەی خەڵکی کاندی بۆ گۆرانی و هەوای خۆشی زانتی دروست نەکرا بوو. لە

لایەکی دیکەشەوە بیرتولدوی فەقیر برسی بوو، ناچار لە قاوەخانەکانی شار دەسوڕاوە. چیرۆکی ژیانی خۆی بە ئاردا وێژێکی خۆش دەگێڕاوە. ڕابردووی پڕ شکۆی خۆی، باسی شازادە خانمان، گۆرانی شەوانە لە بن پەنجەرەی دڵبەران و میوانی و شەو نشینیەکانی وڵاتی خۆی دەگێڕاوە. سێتاری لە سەر ئەژنۆ دادەنا و لێی دەدا و گۆرانیە کۆنەکانی بە هەوای زۆر شیرین و نەرم دەگوت. خاوەنی قاوەخانەش پیاڵەیەک قاوە و بیسکویتێک و ڕەحەتەلقوم و کەچکە مورەبایەکی دەدایە. هێندێ جار ئیجازەی وەر دەگرت کە دەحەتەلقومەکەی بەرێتەوە، چونکە لە گەڵ خاوەن ماڵەکەی کە پیرەژنێکی ٨٠ ساڵە بوو پێکەوە دەژیان. ئەیدەویست شیرینیەکە بە تەنیا بخوا. بە تایبەت پیرەژنی فەقیر دانی لە زاریدا نەمابوو، بۆ ڕەحەتە لقوم شێت دەبوو.

شەوێک پاڵەوان میکێلس لە پیاڵە فرۆشی «تریالۆنی» گوێی دابوو چیرۆکە ڕاست و درۆیەکانی ئەو، گوتبووی ئەو کابرایە بۆ ژێر خانی من دەناڵێ.» ئەو شەوە بیرتولدو باسی «زانتی» دەکرد وەک گوڵی سەر تۆپی ڕۆژهەڵات. دەیگوت تا ئێستا قەت پێی تورکانی ڕێ نەکەوتوە. سروودی میللی یونان لەوێ گوتراوە. پاڵەوان بانگی کردبوو گوتبووی:

– ئاغا بیرتولدو ئەختێکیش گوێ بدە من. «تۆ ئەجیبزادەی، کاندی ئەشێ تۆ بەخێو کا. من مرچەیێکی کەم ودایی بۆ تۆ دەبڕمەوە. بەڵام بەو شەرتەی هەر کاتێ بانگم کردی بۆ ژێر خانی خۆ م، دەبێ گیر نەبی.» کۆنت سەری بۆ دانواند بوو لە وەڵامدا گوتبووی: «زۆر باشە، من بەندەی پچوکی تۆم ئەی پاڵەوانی نامدار.»

میستیگری لە کاتێکا لە خۆشیان هاواری دەکرد، پیرە مێردی پێچابەوە. باکیش گوتی: «بیرتولدو پیرە نەقیرەکەم تازایە. ئێمە هەموومان بە پێشوازی تۆفانەوە دەچین.»

بیرتولدو گوتی: «گرنگ نیە ئاغای باکێش. من تێبینی پێویستم کردوە. تەماشا کە. بوخچەیەکی لە بن هەنگڵی هێنا دەرێ. باکێش دەستی لە بوخچەکەداو پرسی:

– ئەو بوخچە چی تێدایە؟

پیرە مێردی بە تەکبیر سوور هەڵگەڕاو گوتی: «لیباسی زیادی بۆ گۆڕینی جلەکانم.»

میستیگری لە کاتێکا قونچکە جغارەی فڕێدەدا گوتی:

– باشە گۆڕینە بەسە. ئێستا کە حەسابینەوە با بەرەو غاری سوور بکەوینە ڕێ. بڕۆین بە ئەمما خودای.!

هەر سێکیان بەرەو ماڵی پاڵەوان میکێلس کەوتنە ڕێ. تا نزیک کلیسای سن میناس، پێش مزگەوتی سنت کاترینا ئازایانە چوونە پێش. دیتیان ئاخرین میوان کە «ئەفەندی»یە دێتە خوار و بە خۆڕاییش دەیویست بە نیوە ڕاستی شەقامدا بڕوات.

ئەفەندی پیاوێکی زۆر پیر نەبوو. ریشێکی خورمایی تەواو نەتاشراو و چاوێکی بێڕەنگ و مات. مێزەرێکی زۆر سپی لە سەری دەهالاند کە کفنیشی بوو، بۆ هەموو شوێنێ بە سەریەوە بوو، تا ئەگەر مردبا، دەخۆی وەر پێچێ و بۆ بەهەشت ئامادە بێ. پێشتر چوو بوو مەککە و لەو دەمەوە لەبەر گەرمای زۆر و پیس و پۆخڵی و کردەوەی شێتانەی مەزهەبی، مێشکی تێکچوو بوو. کەللەی پڕ ببوو لە ترسی خودا و ئاگری جەهەندەم. کاتێک هاتبوە کاندی ببوە مەلای مزگەوتێک کە یەکێک لە باپیرەکانی لەوێدا نێژرا بوو. دەرسی بە منالانی تورک دەگوت. لێی دەدان و لێیان

دەدا. تا رۆژێک برایی برازای نووری بەگ سەری دەشکێنێ و مەکتەبخانەی مەلا بە یەکجاری دادەخرێ.

مزگەوت لە نزیک کلیسای سن میناس لە حەسارێکی گەورەی بەر فرەواندا بوو لە گژو گیا. لەو سەری حەسارەکە سێ ژووری بچووکی کاولبوو. قەبری پیری پیرۆزیش لە نێوە راستی حەسار لە تابووتێکی داردا بە مەر مەر رووکێش کرابوو. مێزەرێک لە بەردی سەوز لە سەر کێلەکە ساز کرابوو. کێل پڕ بوو لە پەتی ئاوەزێر کراو کە باران و هەتاو شۆرشتبوویانەوە. لە دەوروبەری گۆڕەکە تەبوتەخت و چوار پایە دانرا بوون. رۆژەکانی هەینی ئیماندار دەچوون لە سەریان دادەنیشتن و تەماشای پیری پیرۆزیان دەکرد. قەلیانیان دەکێشاو گاڵتەو گەپیان دەکرد. حەمیدە مەلای دوعاخوێنی دایکی ئەفەندی قاوەی بۆ چێدەکردن. مێزەرە بەردەکە کون کرا بوو. موسڵمان پارەیان تێداویشت وداوایان لە پیری پیرۆز دەکرد کە لە دنیاو قیامەت کاریان راست بێنێ. ئەوانیش وەک خاچپەرستەکان داوای شتی زۆریان لە پیری خۆیان نەدەکرد. تەنیا بە خواردنی باش و ژنێکی جوان و دڵخۆشی هەر تک دنیا وازیان دەهێناو رازی دەبوون. بۆ ئەوەش کە پیری پیرۆز لە دەرگای خودا تکایان بۆ بکا، دیاریان بۆ دەبرد. هەموو رۆژێ لەگەڵ زەردەی خۆر ئەفەندی لە پەنا قەبری بابی بە دابی تورکان دادەنیشت و قورعانێکی گەورەی لە سەر رانی پانرا دەکرد و لە گەڵ خوێندنەوە ئەوەندە بۆ پاش و پێش خۆی دەلەقاند، سەرە گێژەی دەگرت. کاتێک هەوا سارد دەبوو، هەڵدەستا. باسکی لێک دەکردنەوەو هەڵدەپەڕی و سەری بەسەر شانیدا خوار دەکردەوەو ئاوی لەزاری دەهات. نیوەرۆیان کە لە برسان ریخۆڵەی بادەدران، لەجێ رادەبوو، لەم سەرەو سەری حەسارێ دەستی دەکرد بە راکردن و وەک گا دەبۆڕاند. هەموو لەشی لە ئارەقەدا تەڕدەبوو. دراوسێکان لە پشت مێلەی پەنجەرەی مزگەوتەوە تەماشایان دەکرد. هێندێک پێدەکەنین وبەعزێک زگیان پێدەسوتا ،هاواریان دەکرد:

– هۆی ئەفەندی ! تۆیی خوا بۆ رادەکەی؟ چت لێقەوماوە؟ لەوێ چدەکەی؟

بێ ئەوەی تاوێک راوەستێ، لە وەڵامدا دەیگوت: « هیچ نیە ... هەناوم ئاگریان گرتوە.»

کاتێک لە بەر دەستی پیرە دایکی هەڵدەهات ،دەچوە کۆڵان و لە شەقامدا ئەمبەرەوبەری دەکرد. منداڵە یۆنانیدەکەوتنە دوای،بەردیان پێدادەدا. سوارە رێی شەقامی پێ رێبار بوو، کە دەگەیشتە سوارە رێ، وەیدەزانی لە رووبار دەپەڕێتەوە، بەڵام کە وەبیری دەهاتەوە مەلە نازانێ، لە ترسان پاشەو پاش دەکشایەوە. هەموو جارێ کە پاڵەوان میکێلس بەزمی ساز دەکرد، ئەفەندیشی دەهێنا تا تورکێکیش لە نێو بەزمێ دابێ. ئەفەندی لە سەروبەندی داوەتەکەدا نیگەران دەبوو. دڵە کوتەی دەگرت تا دەهاتن بانگیان دەکرد. تا دەگەیشتە ئەو رۆژە کە کاریتوس لە مزگەوتێ لە دوای دەهات و بە سرتە پێی دەگوت: «پاڵەوان میکێلس سڵاوت دەگەیێنێ و بۆ ساردای ماڵێ بانگت دەکا» رۆژی دەژماردن.

لە تەواوی ساڵدا لە سۆنی شەراب و گۆشت بەراز نەمابوو. بەڵام پێغەمبەرەکەی گۆشت بەراز و شەرابی لێ حەرام کردبوو. ئەفەندی نەدەبوو رووەتی ژنانیش ببینێ. ئەوە هەموو لەشی دەلەرزاند. رۆژێکیان کە ژنێکی خەڵکی بنفازی گاڵتەی لەگەڵ کردبوو، ئەفەندی وەعەرزی کەوتبوو، کەفی هەڵخراند بوو. لە هەموو ژیانیدا تاڵە لەزەتێکی خۆش و بەڵام حەرام بۆ وی ئەوە

بوو کە هەر شەش مانگ جارێک لە ماڵە پاڵەوان میکێلـــی شەراب بخواتەوەو گۆشت بەراز بخوا و بۆ شەش مانگ ورگی پڕ کا. لەو بارەوە بە پاڵەوان میکێلـــی دەگوت:

- پاڵەوان تۆ ئەو خودایە بترسێنە، خەنجەرم لە سەر ڕەگی ئەستۆ ڕابگرە و بە سەرمدا بنەڕێنە و بڵێ: ئەگەر گۆشت بەرازی نەخۆی و شەراب نەوەخۆی سەرت دەبڕم. بەڵێ پاڵەوان تۆ مەجبورم کە تا ئەوەی دەیکەم ،بۆم بە گوناح نەنوسری.!! بەو فێڵە شەرابی دەخواردەوەو گۆشت بەرازی دەخوارد و بۆ ئارامی دڵی ئەو جنێوانەی ئەو شەش مانگە قیڕیان بوو، هەڵیدەڕشتن. هەر چەند پێغەمبەرەکەی قسەی سوک و جنێوی قەدەغە کرد بوو. هەرچی لە حەزرەتی سن میناس و یا بە ئەولی خۆی لە (دراوسێی دیوار بە دیواری) دەیزانی، بۆ هەموو کەسی دەگێڕاوە. مزگەوتی ئەفەندی دیواری بە کلیسـای سن میناسەوە بوو. کاتێک سن میناس لە نیوە شەودا بە سواری ئەسپی لە کلیسـا دەهاتە دەر، ئەفەندی دەنگی دەبیست. ترسی ڕێ دەنیشت و خۆی لە بن لێفەدا دەشاردەوە. بەیانی زوو ئەوتی لە چرای باپیری خۆی دەدزی تا بە نهێنی چرای سن میناس پڕ بکات.

لە ساڵدا ١٦ ڕۆژ ئەفەندی لە ساردارخانەی پاڵەوان میکێلـــی وەک مرۆڤێکی ئاسایی دەیخوارد و دەیخواردەوەو جنێوی دەدان.فیکری باش کاری دەکرد و هەناسەیشی ئاگریان نەدەگرت. دەیتوانی بە بێ ترس لە شەقام بپەڕێتەوە.بەڵام بەداخەوە کاتی خۆش وەک بروسک رادەبرن. ئەفەندی فەقیر دەگەڕاوە بۆ مزگەوت و دیسان بە نوێژ و عیبادەتەوە خەریک دەبوو.

ئەو شەوە لە خۆشیان خەوی لێ نەکەوتبوو. هێشتا بەیانی بەر نەدابوو لە خەو ڕاپەڕی. لە ترسی ئەوەی دایکی وەخەبەر بێ، بە ئەسپایی دەرگای کردبۆوە و بە بێخواسی لە حەساری چوبوە دەر و لە کۆلانێ بە بن دیواری کلیسـاي سن میناس دا ، لە مەدرەسەی یۆنانیان تێ پەڕیبوو گەیشتبوە مزگەوتی سنت کاترینا و لەوێ ڕاوەستا بوو.ئارەقەیەکی سارد بەهەموو لەشیدا هاتبوە خوار. ئێستا دەبوایە بچێتە پیادە ڕەوی ئەوبەر خۆیگەیێنێتە ماڵی پاڵەوان میکێلـــی. هەنگاوێکی هاویشت و بەڵام کورج کشایەوە. لەرزی. ئەوە کۆلان نەبوو بە پێش لاقانیدا دەڕۆیشت ولە نێوان دوو پیادەڕۆدا کەفیدەکرد. چەمێکی قوڵبوو کە داری زەلام و گاشە بەردی لەگەڵ خۆ دەهێنان. ئەفەندی پاڵی وەدیواری داو ئارەقەی نێو چاوانی سڕیەوە. تەماشای شەقامی چۆڵی کرد و لە بەر خۆیەوە گوتی: «سە یرە! نە تورک و نە فەلەو تەنانەت جولەکەش، گیانلەبەر بێرەدا تێناپەڕێ کە زگی بەمن بسوتێ».

ئەفەندی بەهەناسە برکە چاوە ڕوانبوو لەوبەری شەقام هەرلە ماڵەکەي بەرەو ڕوی ئەو سوسیون و شەراب و گۆشت بەراز ئامادە بوو.لە بەر خۆیەوە گوتی: « کابرا غیرەتت هەبێ، بازدێک بدەو لەئاوی وەپەڕە.!» دیسان هەنگاوی داویشت، بەڵام کە چاوی بە سوارە ڕێ دەکەوت ،دەکشاوەو پاڵی وەدیواری دەدا! لە بان سەری ئەو منارەی مزگەوتی سنت کاترینا سپی و جوان دەدرەوشا و ڕۆژیش بانی خانوەکانی روناک دەکرد. لەولاتر لە دوکەڵکێشی تەنوری «ئیوانیانۆس»ی نانکەر دوکەڵ دەهاتە دەر. لە ماڵەکەی بەرامبەری مامرێک لە قرتە قرتی دیار بوو هێلکەی دەکرد.لە کلیسـای سنت میناسەوە دەنگی خۆشی زەبور خوێنان دەهات..

- زۆر سەیرە، مەسیحیەکی تیمانداریش بۆ چوونی کلیسـا بێرەدا تێناپەڕێ. لەئەگاو ترس

هەڵیگرت و دەستی کرد بە هاوار:

- ئەی خاچپەرستەکان فریام کەون، لە هاوارم وەرن!

لەو بەری شەقام دەرگایەک کرایەوە. دەرگایەکی گەورە مالآن کە ئالقەیەکی مەفرەقی قورسی پێوە بوو. مسیو «هاریلاتوس لیون داراکیس» سەرانی چاو چنۆک هاتە دەرێ. ئەو پیاوێکی قەڵەوی کورتە باڵاوریش و سمێڵێکی زل وزەق و قرژن و قامکی ئەستور و توکناوی هەبوو.کەوشێکی سێ تەخت لە پێدا، عەبایەکی قاوەیی لە بەر و وەکازێک بە دەستەوە کە سەرێکی زێو ونەخشی سەرە شێرێکی لێ هەڵکەنرا بوو. بنە چەکەی دەچۆوە سەر بنەماڵێکی قەدیمی ڤینیزی کە ببوە یونانی. لە سەرتالآی بنە ماڵەی باپیرانی شێرێک نەخش کرا بوو، لە سەر بورجی ماڵەکەشیان وێنەی شێرێک کێشرا بوو.

هاریلاتوس دەچوە کلیسا کە چاوی بە ئەفەندی کەوت، پێکەنینێکی شەیتانی هاتێ، ئەو هەمیشە بە دیتنی لێقەوماوان کەیفی ساز دەبوو. بانگی ئەفەندی کرد: «خۆی پیرە مێردی فەقیر مەترسێ وەپەڕە بزانم.

ئەفەندی بەدبەخت بە پاڕانەوە گوتی: «تۆ ئەو خوایەی لە بان سەری هەرتکمانە، وەرە دەستم بگرە و یاریدەم بدە بە وەپەڕم. دەچمە ماڵی پاڵەوان میکێلس و ناتوانم!

کلفەتێکی گەنج بە لێوێکی هەوەس بزوێن و روومەتێکی رەش ئەسمەرەوە هاتە بەر دەرگا.ئەڤینداری هاریلاتوس بوو. هەموو شەوێ خۆی دەگەیاندە سەر جێگای و دەپاڵی دەخزا و هەوڵی دەدا ئەوەی پیاو دەیکەن ئەویش بیکا. کلفەت بە گاڵتەوە تەماشای دەکرد و لەگەڵ ئەوەش کە دەستی وەبەر نەدەهێنا قاقا پێی پێدەکەنی. شەوێک پێی گوت :

- ئەریاب تۆ دەبێ هەموو رۆژێ لە خوێنی هێلکەیەک بخۆی! تالی بکەوە بەتەما خودای!!

کابرا هەمو، رۆ.ی هێلکەیەکی هەڵدەتوڕاند تا بە ڤەوەت بێ. شەوێک کلفەتی شەیتان هێلکەیەکی وەدەست سەرانی دا و گوتی:

- ئەریاب ئەوڕۆ لە بیرت چوو هێلکەکەت بخۆی. هانێ هەر ئێستا مریشک کردوویە!

هاریلاتوس چەقوی هێ دەر و هێلکەی کون کرد و هەڵیتوڕاند.

ئەفەندی دیسان هاواری کرد: «هاریلاتوس، بۆ خاتری خوا نەجاتم دە..»

کابرا دەستیکرد بە پێکەنین و گوتی: «دەتەوێ بچی دیسان گۆشت بەرازی بخۆی؟ بەد بەخت، گوناحە مەچوو!

- دیارە تۆ بڕوات بە خوای نیە، وەرە دەستم بگرە و بیپەڕێنەوە، یارمەتیم بدە.

کابرا یاری بە وەکازەکەی دەکرد و گوتی:« دەچی شەرابیش بخۆیەوە، ئەوەش گوناحێکی دیکەیە.

- ئاخ... بچمە جەهەنەمیش هەر دەچم، من لەم جیهانەدا بێجگە لەوە هیچ دڵخۆشی دیکەم نیە.تۆ کە وەکازەکەت درێژ بکەی من بیگرم، ئەوە خێرت کردوە. یارمەتی ..ئاغا هاریلاتوس ...یارمەتی. بێگومان خوا بەزەیی بە ئەفەندی داهات.چونکە لەو کاتەدا پیرە مێردێکی وردو لاواز و گۆسە لە کۆلانێ وەدەرکەوت. وادیار بوو لە کوچە باخەکان دەرەوەی شار دەهاتەوە.چونکە قەرتاڵەکەی پڕبو لە سەوزی. ئەفەندی باسکی هەڵێنا و هاواری کرد:

ئەی عەلباغا! عەلباغای نازەنین... تۆ پیاوێکی باش و موسوڵمان و ئیمانداری ڕاستە قینەی. هەتا چاو کار دەکا، بەرچاوم ئاگر و ئاوە، یاریدەم بکە بپەرمەوە.

پیرە مێردی شەریف بێ ئەوەی هیچ بێژێ دەستی ئەفەندی گرت و پەڕاندیەوە. پاشان خەریکبوو شتێکی پێ بڵێ، بەڵام پەشیمان بۆوە. قەرتاڵەی دەست دایەو لێی وەدوور کەوت. لە دڵی خۆیدا گوتی: «چی پێبڵێم؟ خودا ڕەحمان و ڕەحیم و قادرە. لەوانەیە گۆشت بەرازی لە زاری ئێمەدا بکاتە گۆشت گا، شەرابیش بکا بە ئاو. خودا چۆ بخوازێ هەر وادەکا... بڕۆ ئەفەندی لەعنەتی، بخۆ و بخۆرە، خودا کەریمە!»

کاتێک ئەفەندی بە هەناسە بڕکە گەیشتە ماڵی پاڵەوان میکێلیس، میوانەکانی دیکە هەموویان گەیشتبوونێ. کاریتوس بۆ هێنانی مەزەی شەراب لاکێکی لە متبەق و یەکی لە ژێر زەمینبوو. دەنگی لێکدانی پیاڵەی شەراب دەهات.بۆنی سرسیون بڵاو دەبۆوە. ئەفەندی گوتە تفنگی لێ نشبوون، بۆ ئەوەی لەخۆ نەچێ، ناچار پاڵی وە لاشیپانەی دەرکێ دا. لەو کاتەدا گوێی لە پەیامی پێغەمبەر بوو کە دەیگوت: «تۆ ئەی ئەفەندی بە تەرسە، دیسان دەچی گیانی خۆت بە پارووێک گۆشت بەراز دەفرۆشی؟ ئاخر تۆ بیر لە مەککە، لە پەیامی غەیبی، لە سەحراو بیابان، لە وشتران، لە کوندور و بخور، لە بەردی ڕەش کە پێم لە سەر دانا و چوومە ئاسمانان - بکەوە. بیر لە باپیرت بکەوە کە حەوت شەو ورزژان بێ ئاو ونان لە سەر منارە مابوەوە و لە بەر نەعرەتەی ئەو سەگ ترسیان ڕێکەوتبوو لە گەڵ ئەو دەیانلووراند، ئێستا ئەگەر توانیبات ببینی تەماشات دەکرد کە لە نێوە ڕاستی قاپێکی گەورەو قوڵی پڕ لە پلاو دانیشتوە.جۆمێکی شیری بە پێشدا دەڕوا. حۆرییەکی لەسەر ئەژنۆی داناوە هەموو شەوێ هەر کچی دەست لێ نەدراوە.لەسەر ئەژنۆکەی دیکەی کوڕێکی موو لێنەهاتوو دانیشتوە کە حەوت حۆری دەست لێ نەدراو دێنێ. ئەوانە هەرتکیان بۆ گۆڕینی ئیشتیا پێویستن... تۆ ئەی ئەفەندی بە تەرسە ! لە بیرت نەچێ لە بنە ماڵی ئەولیای خودای.ئێستاش لەو سەعاتەدا دەچی خۆت بخەیە جەهەندەمێ.بڕۆ دەرگای کۆڵان ئاواڵەیە!

ئەفەندی فەقیر بە ترسەوە دەنگی پێغەمبەری دەبیست و پەیتا پەیتا تەماشای دەرگای حەسار وسارداری دەکرد کە بۆنی سرسیونی لێدەهات. لە نێوان چوون و مانەوەدا لە شک دابوو.لە نەکاو مادام کاترینا لە حەسار هاتە دەر و دیتی و گوتی:

- ئەی ئەفەندی، تۆ هێشتا لێرەی؟ ئەگەر ناتەوێ تووشی دەردە سەرێ بی، خێرا بچۆ خوارێ.
- مادام کاترینا، لە خواری خواردن ئامادەیە؟
- بەڵێ، هەموو شت ئامادەیە، زوویە، بچۆ خوارێ.

ئەفەندی لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئەوە ئیرادەی خودایە. بەڵێ مادام کاترینا، خودا خۆی منی ناردوە، ناتوانم لە فەرمانی خودا بچمەدەرێ. دەنا تووشی گوناحی گەورە دەبم.ئێستا ئیتر ناتوانم لەگەڵ خودا دم بەدەمەی بکەم. خودایە ! خودای گەورە! من تەنیا شتێکم لە تۆ گەرەکە، ئەویش ئەوەیە منی ببەکەی و چارە ڕەش ڕێگا بدەی بە کەیفی خۆم گوناح بکەم و پاشان نیو سەعات پێش مردنم تۆبەی بکەم. یان نیو سەعات بەس نیە؟ بۆ چی، لەوەی پتر من هیچی تر لە تۆ ناوێ.» پاشان بازدێکی داو دەرگای پچوکی سارداری پاڵ پێوە ناو چوە ژوورێ.

* * *

پاڵەوان میکێلس لە بەرامبەر دەرگای هاتنە ژووری، لە نێو هەوری دوکەڵە سیغار، لە سەر چوار پایێک دانیشتبوو.سەرو رویەکی گرژ و نێو چاوان تاڵ. قامچیەکەشی لە ژوور سەری هەڵواسیبوو. چوار میوانەکەی لە دوو لاوە لە سەر نیوتەخت دانیشتبوون. لە لایەک باکێش و کایامبیس، لە لای دیکە میستیگری و بیرتولدو. قاپە چێشت لە سەر مێزی هەڵسیان لێ هەڵدەستا.شەرابی وەک خوێنی سوور لە پیاڵەی بلووردا دەدرەوشا.

باکێش گیتاری لە سەر ئەژنۆی دانابوو، گوێچکەی بە سیمەکانەوە نوساندبوو. کلیلەکانی بۆ لێدان ئامادە دەکرد.بیرتولدو خۆی دەشنێل وەرێنچا بوو دەیزوت و دەلەرزی.بەڵام لە ژێر پشتیوانی میستیگری بەکەیفبوو.کایامبیس هێدی و لەسەر خۆ دیخوارد و دەیخواردەوە، فیکریشی لە لای ژنەکەی بوو.

پاڵەوان میکێلس پیاڵەکانی بە دوای یەکدا پڕ دەکرد و دەیخواردەوە. دیار بوو چێژەی لێ ناکا و لە شەراب بێزارە. چونکە هەموو جارێ کە پیاڵەی وەلێوی دەکەوت، دەچرژا. بە لاّم بە زۆر ورگی پڕ دەکرد، تا شەیتانەکانی ناخی بخنکێنێ. کاتێ هەستی دەکرد کە شەیتان لە ناخیدا دەستی بە سەرپێزێوی کردوە، شەرابی دەخواردەوە. ئەو شەیتانانە بێجگە لە شەراب لە هیچ ناترسن. نە ژن، نە شەر و نە خودا ناتوانن بە سە ر ئەو شەیتانانەدا زاڵ بن. دەنگێکی وەحشیانەیان هەبوو، دەنگی وەک نەعرەتەی درندەی غەزریو. هێندێ جار دەرگای قەفەسەکانیان دەکرایەوە، باپیرە کانی هەورەڵیان، واتە بەبر و بەراز و گورگ و بە دوای ئەوانیشدا باپیرە تورکناویەکانی غارەکانی دەقیاتوس وەدەر دەکەوتن.

ماوەیەکبوو شەیتانێکی تازە چووبوە دەکلێشەی.ئەو شەیتانە نەیدە نەڕاندو بە سام نەبوو. بە پێچەوانە شاد و بە کەیفبوو. هەناسەی لە جیاتی بۆگەن ، بۆنی میسکی لێدەهات. بۆ هەورەڵێنجار پاڵەوان میکێلس ترسی رێنیشتبوو، بۆیە پەیتا پەیتا دەیخواردەوە.

کاتێک ئەفەندی دەرگای کردەوە، پاڵە وان سەری هەڵێنا. ئەفەندی بە ماتی و بە ترسەوە دەستی رێکدەخستن و لاقێکی دەبردە پێش تا لە پلیکانان بێتە خوارێ. بەڵام نەیدەوێرا.زمانی تێک دەهالاً. دەیویست بڵێ: پاڵەوان سلاّوا بەلاّم نەیدەتوانی و هەر منگە منگی بوو. پاڵەوان لە بەرامبەری خۆی کورسیەکی ئەوی پێ نیشاندا و گوتی:

- وەرە دانیشە.!

باکێش بێ ئەوەی گوێچکە لە سەر سیمەکان هەڵگرێ پرسی:

- پاڵە وان چ هەوایەکت پێخۆشە بۆت لێدەم.؟

میستیگری هەستا بوو نیوتەختەکانی پاش و پێش دەکرد تا جێگای پتر بکاتەوە، لاقەکانی دەهات ئاگر بگرن.

شەراب هێندێ کەس وا لێدەکا کە پێ بکەنن و گۆرانی بچڕن. هێندێ کەسیش دەگرێنێ و خەمباری دەکا. ئەو میستیگری بە وەبلاغە کاتێک شەرابی دەخواردەوە، تاقە ئاواتی ئەوە بوو کە سەمایە بکا هەڵدەپەری و سەرخۆشیەکەی دەردەکرد. یان بە واتەیەکی تر سەرخۆشیەکەی دەبوو

بە هەورەسێکی بێ جێ و بێ ئەدەبانە. دەیویست بالّی هەبایە. قانونەکانی لە ژێر پێدەناو سەدان سالّ لە ئاسمانی بێ بندا دەسوڕایەوە. بەلاّم حەیف ئەوەی بۆ نەدەکرا. ناچار دەستی دەکردەوە بە خواردنەوە.

پالەوان میکێلس ماوەیەک سەیری هەر پێنج دۆستەکانی خۆیکرد. ئەوڕۆ نە سەماو نە گۆرانی، نەدەنگی سازو ئاواز نەیاندەتوانی دلّی ئارام بکەن. لە ئەفەندی مۆر بۆوە. ئەفەندی ترساو گوتی:

ئەرباب ! داوا لە من مەکە قسەی ئۆزو بکەمو گوڵوان بکەم. لە پێشدا بترسێنە و ناچارم بکە بخۆم و بخۆمەوە تا هێندێ غیرەتم بێتەبەر. بەلاّم بیرتۆلدو کە ماوەیەکبوو خوارد بوویەوە و سەری گەرم ببوو، گوتی:

پالەوان دەتەوێ بۆ سەر گەرمیت چیرۆکێکی کۆنی ڤێنیزیت بۆ بگێڕمەوە؟ من ئەو داستانەم لە سەر شانۆ دیوە و لەو دەمەوە دلّم ڕاناوەستێ. ئاخ! ئەگەر بزانی چیرۆکی ئەو « دیزدێمۆنا » یە، شازادە خانمی ڤێنیزی کە بە ناهەق کوژرا، چۆن گەلێک جار بۆتە هۆی ئەوە کە خەم و خەفەت لە بیر بەرمەوە.

- کێت گوت؟

- گوتم «دیزدێمۆنا» شازادە خانمی ڤێنیزی.بۆچما تۆ ناوی ئەوت نەبیستوە؟ ئەوە هەمان شازادە خانمە کە پیاوێکی ناوداری بەربەری عاشقی بوو، بەلاّم ئەم ئەلبتە کاری ئێرەیی گەیاندە رادەیەک کە شازادە خانمی کوشت و دەسرەکەی ئەوی هەلگرت.

پالەوان دەستی درێژ کرد دەتگوت دەیەوێ زاری بەستێ، گوتی: «بیرتولدو، نامەوێ لە کن من باسی ژنان بکرێ.!

بیرتولدو لە شەرمان دوولا هاتەوە و چیرۆکی شازادە خانمی ڤێنیزی لە گەروویدا وشک بوو.

باکێش کە گیتاری بەدەستەوە لە حەوادا ڕاگرتبوو، پرسی:

- باشە ... چلێبدەم؟

پالەوان کە سەری بە دیوارەوە نابوو گوتی: «بۆ من فەرق ناکا، چت دەوێ لێدە!

کاپامبیس پیالەی خۆی پڕکرد و لێوەکانی سڕیەوە. مستیکری لە گیتارەکە ڕامابوو، لاکی ڕاستەی وەک بالّی داعبا لە حەوا ڕاگرتبوو کە سەما بکا. بەلاّم لەوە زیاتر هیچی بۆ نەکرا، چونکە لە پڕ خانو لەرزی. خانوەکان درزیانبدا. بیرتولدو بۆ ئەوەی نەکەوێ دەستی بەچەلەنگێک گرت. بەفرێ و هەنار و کالەک وەسەما کەوتن و بەر دەبوونەوە.

باکێش ڕاست بۆوە گوتی:

- بومە لەرزە... مستیکری دەستی بۆ دەرگا درێژ کرد. کاپامبیس لەو دەمەدا تەنها بیری لە ژنەکەی دەکردەوە. ئەفەندی کەوتە عەرزی و تێکچوو.دەنگی زیڕو هۆڕی خەلّک و ڕاکردن و گریان و هاواری ژنان لە دەرەوە دەبیسرا. مستیکری کەوتە گریان و گوتی:

- بۆ خاتری خوا دەرکەون... بچینە دەرێ! بەلاّم پالەوان میکێلس دەستی دا قامچی و نەڕاندی :

- شەرم ناکەن ؟

میستیگری وەغیرەت کەوت و گوتی:

- شەرمی چی پاڵەوان؟ ئەوە بوولەرزەیە، کیان لەبەر نیە بیکوژی!

لەو کاتەدا هەور گرماندی و سەرتا سەری کاندی وەلەرزە کەوت. زەنگۆڵەکانی کلیسای سن میناس لەخۆوە لێدران. بیرتولدو بە ترسەوە توز سەری لە بن شنێلەکەیدا شاردەوەو گوتی:

«یا سن میناس بەزەییت بەمن دابێ. ئاخر من و کۆنتت هاتراوینەوە!»

پاڵەوان شەقەی لە قامچی هێنا و هاواری کرد:

- کەس لە جێی خۆی نەجوڵێ! تەنیا ئەڵەندی راست کەنەوە و لە سەر چەلەنگێکی داینێن! بە چالاکی شنێلی لەسەر بیرتولدو هەڵداوەو گوتی: «بیرتولدو! ئەوە بومە لەرزەیە. شتێک نیە. کریت گیان لەبەرێکی زیندوە، دەجوڵێ، ئێوە دەبینن کە هەر لەو رۆژانەدا بە تەنیایی دەروا بەرە یونانەوە دەنووسێ.»

لە پڕ خولقی خۆشبوو، وەقسە کەوت. ئەو هێشتا منداڵ بوو ساڵێکیان بوومە لەرزەیەکی بە سام هات. نیوەی گوندەکەی ئەو ویرانبوو. ژن و پیاو سەریان سوڕ مابوو. هاواریان دەکرد، دەگریان و لە ژێر ویرانەی کاولەکاندا پان دەبوونەوە. تەنیا پاڵەوان سیفاکاسی باوکی هێدی و لەسەر خۆ، بە دەست وشان سەردەرانەی خانوەکەی راگرتبوو تا ژن و منداڵ و جوتە گا و مایئە شینکەکەی بچنە دەرێ. کاتێک هەموویان دەرچوو بوون، ئەو بە گورجی دەرپەڕیبوو، سەردەرانە هاتبوە خوارێ. لەو دەمەوە ئیتر پاڵەوان میکێلیس لە بوولەرزە نەدەترسا. بیری دەکردەوە کە پیاوی ئازا دەتوانێ لە بوولەرزەشدا خۆ نەجات بدا. پیاڵەکانی پڕکرد، هەموو خواردیانەوەو هێدی بوونەوە.

لەو سەرەوە دراوسێکان رژابوونە حەسارەکان و هاواریان دەکرد و قژیان دەرنیەوە. تەنانەت خانم «ئەرکانوردەولە»، ئەو کیژە ترشاو وبە فیزەش هاتبوە کۆلانێ. برا کەڕ ولاڵەکەی لە ئامێز گرتبوو. لە گەڵ ژنەکانی تر تێکەڵ ببوو، بۆ جارێکیش بێ بنە و بنەچەکەی خۆی لە بیر برد بۆوە. لەگەڵ ئەوان دەگریاو دەیقیژاند.

لە کاتی بومە لەرزەدا خەلیفە لە کلیسا وەعزی دەدەدا. لە سەرە تاوە قسەکانی بە ناوی خوا دەستپێکرد. پاشان لە مەسەلە لایداو دەستی لە ئاسمان هەڵگرت وبۆ کریت هاتە خوارێ. خەلیفە لە سەر میحرابی زێرکفتی خۆی راوەستا بوو، دەنگی بەرزی بۆ لای تاقی ئاسمان کە شکڵی عیسای پێوە دیار بوو، هەوراز دەچوو، لە هەمو کلیساش دەنگی دەداوە. مەسیحیەکاي خۆیان بە یەکترەوە دەنوساند و هەر وەک بە راستی دەنگی خودا لە ئاسمانەوە لە سەریانیدا، سەریان دادەنواند و دەلەرزین. پیرە مێرد گوتی: «رۆڵە خۆشە ویستەکانم! ئەوە رۆژی پارێزگاری گەورەیە و رۆژی موسیبەتی مەسیح وەبیرێک دەکەوێ. ترس و پارانەوە دەبێ بە سەر دڵی نیشاندارەکاندا زاڵبێ. تەنیا دەبێ بیر لەو خوێنە بکەنەوە کە بە سەر خاچدا ... بەلام خودا گوناحەکانم خۆشبێ. من واز لە موسیبەتی مەسیح دێنم و بیر لە وڵاتی کریت دەکەمەوە. پاشەر پاسکەکانی بولای تاقی کلیسا، بۆ ئەو شوێنەی کە عیسای مەسیح لە کەوای زێرین پێچر وەتەوەر نوور دەپرژیسی بەرز کردەوە و هاواری کرد:

ئەی ئەی خودای من. هەتا کەنگێ! بە راستی کە چەند پشت و چەند هەزار کریتی دەستیان بۆ ئاسمان هەڵهێناوە و هاواریان نەکردوە هەتا کەنگێ؟ ئاخر ئەی خودای من تا

کەنگێ؟ خودایە .ئێمە کە دارو بەرد نین، ئاخر ئێمەش گیان لەبەرین، گیانێکی تۆ پێت بەخشیوین.تا کەنگێ دەبێ خوێنی کریتیان بڕژێ.دەریا لە ڕۆخەکانی کریتەوە تا بوغازی داردانیل و قوستەنتەنیە بە خوێن سوورە. لەو کاتەدا کە پیرە مێرد سەری هەڵێنا بوو، تاوێک مات بوو، دەنگوت چاوەڕوانی وەڵامە، تەماشای تاڵی گلێسای دەکرد، کلیسا وەلەرزە کەوت.چلچراکان کەوتنە جوڵانە وەو زەنگولەکان لێدران.

لە هەموو لاوە بوو بەهەرا: بوولەرزە...بوولەرزە... ژن لە پلیکانان هاتنە خوار و خەڵک بە پاڵپەستە بۆ لای دەرگای چوونەدەری کلیسا هێرشیان برد. خەلیفە لە ترسان حەپەساو نەیتوانی بزوێ. هێشتا بە چاوی دەرپەڕیو تەماشای مەسیحی دەکرد. موورتزوفلوس غاریدایەو لە میحراب هێنایە خوارو بۆ لای دەرکی کلیسای برد. لەوێ بە سپایی بە شانیداداو دەیگوت:«ئەی باوکی پیرۆزا مەترسێ، هیچ نیە، بوومە لەرزەیەو ئێستا خەلیفە بە چاوی پڕ لە ئە سرینەوە بە نارە نار دەیگوت:« خوایە بم بەخشە ! ئەوە خەتای من بوو، لە جیاتی ئەوەی باسی تۆ بکەم باسی کریتم کرد»!

* * *

ئەوڕۆژە پاڵەوان پولیکسینگیس بە گەڕەکی تورکاندا تێدەپەڕی، چووبوو تا لەو سەعاتەدا کە خاچپەرستە تیمانداەکان خەریکی نوێژی مس بوون، دەورێک لێ بدا. بە ریشی تاشراو ڕۆژی چەوور کراو وعەتر لێدراو، کلاوی بە لاسەرەوە نابوو بە هەنگاوی نەرم و سوک و جیرەی پۆتینەکانی بە ڕێگادا دەڕۆی.بە تەواوی هەستی بە خۆشی دەکرد. وەتەسپێکی زینکراو، یا وە گایەک دەچوو کە چەرمەکەی هەر بریقەی بداو لە چیمەنێکی سەوزو قشڵاخدا بلەوەڕێ. دڵی، گورچیلەکانی، تەواوی ئازای بەدەنی وەک سەعات کاریان دەکرد. هەریەکەیان بێ ئەوەی کۆسپی کاری ئەویتریان بن، ئەرکی خۆیان بەجێ دەگەیاند. ئەوانە گشتیان کە بە ڕێکو پێکی لە کاردا بوون، گیان لە بەرێکیان پێک دە هێنا کە ناوی پولیکسینگیس بوو. بە ورتە ورت لە بەر خۆیەوە دەیگوت : «حەیف کە گەلجیەتی هەزار ساڵ ناخایەنێ. نەکا خودای مەزن لە ترسی ئەوەی ئێمە جێگای ئەو بگرینەوە، بە فێڵ وردە وردە چەکمان دەکا؟ داڵمان دە کەوێنێ، ئەژنۆمان سست دەکا، پشتمان دە چەمێنێ، ئاورمان بە چاو ولوتیدا دێنێتە خوارێ. مردن شتێک نیە بمترسێنێ.سوێند دەخۆم لە مردن ناترسێم.تەنیا دەمەوێ جارێک گوللەیەکم لە مێشکی بدەن و بمرم، بەڵام توانەوەی وردە وردە زۆر خەراپە. نا..نا.. من خۆم لە بەر ئەوە ڕاناگرم.»

هێشتا هەر ئەو قسانەی دەکرد کە سەرانسەری گەڕەکی تورکان هاتە لەرزین.دەرگاکان لە ڕێسمە چوون. دەنگی نەرمی‌ژنان و تەقەی کەوشانیان لە حەسا ری ماڵەکان دەبیسرا. (ڕۆشنە)ژنە زەلامە قولە رەشەکە گەیشتبوو مەیدانێ، کەشەفی لە دەستان کەوتە خوار و کولیچەکانی لە نێو تەرس و تۆزدا بڵاو بوونەوە.

پاڵەوان پولیکسینگیس بۆ ئەوەی خۆ ڕابگرێ لاقی لێک کردنەوەو دەستی بە دیواری گرت.چارە نوس وای هێنابوو دەبوایە ڕاست لەو کاتەدا لە نیزیک ماڵی نوری بەگ بێ.ئارەقەی بە سەروچاویدا هاتە خوار و گوتی: « بوومە لەرزە». پاڵەوان کەسێک بوو دەیتوانی لە بەرامبەر

هەموو نافاتێکی وەک نەخۆشی شەڕو ژندا خۆ ڕابگرێ، بەڵام چۆن دەیتوانی لە گەڵ بومە لەرزە بەر بەرەکانی بکا؟ چۆن دەیتوانی ببینێ و گوێی بگرێو دەگژی ڕاچێ.؟ ڕەنگی بەروانەوە نەما.دەنگی زیڕەو هاواری ژنان هێشتا هەردەهات.گونچکەی هەڵخستبوو ڕاوەستا.داخوا زەوی دەیویست زار لێک بکاتەوەو هەرچی گیان لە بەرە قوتی بدا، یا لەرزێنێکی ساکارو بێ مەترسیە.؟ وا دەهاتە بەر چاو کە تەواوی شاری کاندی بەترس و لەرزەوە چاوە ڕوانە. سەگەکانیش کە لە پێشدا وە قوڕە کەوتبوون، ئێستا کلکیان لە نێو گەڵی گرتبوو، ملیان ڕاکێشا بوو چاوە ڕوانبوون. هەوا ڕەنگێکی زەرد و پیسی گرتبوو، ڕووناکی بوولێڵ ببوو.لە ناخی عەرزەوە گرمەیەکی سەیر دەهات.ماڵەکان دووبارە لەرزین.منارەکان وەک داری ڕوو لە شەماڵ دە ڕاژان. ئەو دیوارەی پاڵەوان پاڵی پێدابوو تێک ترما. هەر لەو کاتەشدا لەو بەری کۆلان، لە ماڵی نوری بەگ شکانی پەنجەرەو قاپ و قاپاخی مسەتێ دەنگی دەهات. لە پڕ دەرگای گەورەی سەوز ڕەنگ کرایەوە.ئامینە خانم بە سەرو رووی ڕوت و پرچی ئالۆز و پێی پەتی، بە گریان وهاوار دەرپەڕی و لە نێوە ڕاستی کۆلانێ بێ هۆش وەعەرزی کەوت. کارە کەری ڕەش مەسیحی لە کاتێکا سەرپێی سوری خانمی بەدەستەوە بوو، بەدوایدا رابەدکرد.لە پەنا ئامینە خانمێ چوکی داداو بانگی کرد.بەڵام ئەو لە سەو بەردی کۆلانێ کەوتبوو، ڕەنگی سپی هەڵگەڕا بوو.

پاڵەوان چاوی زەق بوون و لە بەر خۆیەوە گوتی: «ئامینە خانم!». دەستی بە دیواری بەرداو لە خانمێ وەنیزیک کەوت. ڕوخساری زەرد هەڵگەڕاوی سوور هەڵگەڕان. لە مێژ بوو بە ئاوات بوو ئەو ژنە چەرکەسە وەحشیە ببینێ. ئێستا لە سایەی بومە لەرزەی پیرۆزەوە، ئەو ژنە بە سەرو رووی ئاواڵەو بە پای پەتی، واتە بەو جورەی پاڵەوان دەیویست لە بەر دەستانی بوو. بە ئاسەیەکی تەواو داهاتەوە سەر خانمێ، بەڵام کارەکەری ڕەش بە تووڕەیی خۆی بەسەر داداو گوتی:

– ئەوە خانمی نوری بەگە، نیزیکی نەبی! هەر لەو کاتەشدا هەوڵیدا کە بە دەسماڵێک سەرو ملی داپۆشێ.

پاڵەوان لە کاتێکا شوشە عەترێکی لە گیرفانی دەر دێنا کە هەمیشە بۆ بۆنخۆشی کۆلانان هەڵیدەگرت، گوتی: « بەد بەخت، بۆن بە عەترەوە نەکا دەمرێ.سەری شوشەی هەڵگرت ولە پێش لوتی خانمی چەرکەسی ڕاگرت.

زەوی ئارام ببۆوە.لە حەساران دەنگی هاوار و گریان نەدەهات. شاری کاندی وردە وردە هێدی دەبۆوە. سەگەکانیش غیرەتیان هاتبۆوە بەر و دەوەڕین.

خانم هەناسەیەکی هەڵکێشاو چاوی هەڵێنا.کەسێکی نەناسیاوی لە سەر سەری خۆی دیت. هاوارێکی کردو بە هەر تک دەستان دەموچاوی خۆی گرت. کارە کەری ڕەش دەنگی داو گوتی: «ئەگەر لە گیانی خۆت تێر نەبوری بڕۆ، ئێستا نوری بەگ دێت.

پاڵەوان پوولەکەبنگیس کە شەیدای چاوەکانی خانم ببوو، نەیدەتوانی گوێ بداتە هەڕەشەی کارەکەری ڕەش. ئەو چاوە گەورەو پرشنگدارە کە برووسکیان لێ دەبۆوە، کەم کەم دەکەوتنە ژێر تەئسیری پیاوەگە، خۆشەویست دەبوون و حاڵەتێکی نەرمی مەخمەریان بە سەر دادەهات.پیلوەکانی قورس دەبوون، چەرکەسی رووی کردە قەرەواشەکەی و گوتی:

– ئەمو کافرە کێیە؟

پاڵەوان وەڵامی دایەوە و گوتی: «من پاڵەوان پولیکبێنگبی بەندەی تۆم. ئەم شوشە عەترەش بە یادگار لە لای تۆ بێ.»

ئامینە خانم شوشە عەترەکەی پێداداو راست بۆوە و دوو پارە چاوەکانی بریقەیان دەدا. پاڵەوان هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی:

- ناوەحەت مەبە ، ئێستا دەڕۆم.

چەرکەسی بزەیەکی نەرمی هاتێ و گوتی : «دە ترسێی؟».

- من ... لە کێ بترسم ؟

- لە نوری بەگی !

- ئاخ .. خانمی جوان. لەم جیهانەدا بێجگە لە تۆ لە کەس ناترسێم. ئەگەر تۆ ئێستا بڵێی خۆت بکوژە، خۆم دەکوژم.بەڵام گورج لە قسەکەی پەشیمان بۆوە و بە فیزەوە گوتی : «ئەگەر خوایەک هەبێ ئەي ئامینە، ڕۆژێک تۆ هەر وەدەست دێنم.دنیا خۆ لێکدا تۆ هەر هی منی.

خانمی چەرکەسی وەهای بە توندی تەماشا کرد، دەتگوت بەر لەوەی کۆیلەیەک بگرێ، هەڵبدەسەنگێنێ.پاڵەوان بێ ئەوەی بیزوێ دەستی راستی خستە بەر پشتبێندی ئاوریشم و راوەستا.ژنی چەرکەسی لە کاتێکا سەرو رووی خۆی بە دەسماڵی بریقە دار دادەپۆشی گوتی:

«خودای من ، خودای ئاییتی من لە کافران بێزارە».

پاڵەوان لە وەڵامدا گوتی: «بەڵام خودای من ، خودای ئایینی من، ژنی چەرکەسی خۆش دەوێ و بە تواناشە».

پاڵەوان ئاوڕی دایەوە، دوو تورک لە سیلەی کۆڵان وەدەر کەوتن.دەرگا دەکرانەوە.کارەکەری رەش دەستی ئامینە خانمی گرت و هەردتکیان ڕاپان کردەوە ماڵ و دەرگای سەوز بە دەنگێکی بە سام داخرایەوە.

پاڵەوان ویستی رابکا، بەڵام لاتی لە دوو نەدەهات.لە بەر خۆیەوە گوتی: «لە دەست چووم ... نەمام ...دەڵێی قەت ژنم نەدیوە.لە ئامێزم نەگرتوە و ماچم نەکردوە... دەسوتێم.» بە پەرێشانی تەماشایەکی دەوروبەری خۆیکرد. وەیزانی کۆڵانەکان و ئێسانەکان و هەموو شت گۆڕاوە. کاتێ وەک پارچەیەکی رەنگاورنگ کە خانو ومنارەو قەڵاو شەپۆلیان لەسەر کێشابێ، لە ژێر پێ باتیدا شەپۆلی دەدا. بە سەر ئەو پارچە شەپۆلاویەدا دەڕۆیشت و بەلادادەهات.بە زەحمەت توانی ماڵەکەی خۆی بدۆزێتەوە. کاتێک گەیشتەوە ماڵێ، خوشکی بەو قەدوقەوارە زل و لەرزۆکەوە، خۆی دەئامێزی هاویشت. لە ترسان هاواری لێ هەستا. وایدەکرد کە ڕشەیەکی دڵدانەوە لە زاری براکەی ببیسێ. بەڵام ئەو خوشکی پاڵ پێوە ناو کڵاوەکەی فڕێدا لایەک. دەهات بخنکێ،دەتگو خوشکیداو گوتی :«لێم گەڕێ ، گورج چوە حەساری و گولێکی مێخەکی هێندی لێکردەوە و لە نێو قامکانیدا وردی کرد. مادام کریسانتی بە بیستنی ئەو قسانە زیڕاندی و سەری خۆی لە دیواریدا و گوتی:

- ئاخ ! زۆرژا قسەی ئاوا بەمن دەڵێی؟ بە من؟ بە منێکی لە بەر تۆ خۆم فیدا کردوە. من شوم نەکرد و منداڵم نەبوون، تا تۆ بە تەنیا بەجێ نەهێڵم و ئاگام لە تۆ بێ. ئاخر من چیم لە تۆ کردوە ئاوا لە گەڵ من دەبزوویەوە.کە وابوو دڵت بەحاڵی من ناسووتێ؟. ئاخر خۆشەویستم، من لەو

دنیایەدا بێجگە لەتۆ کەسیتر شک نابەم. دووبارە سەری لە دیواریداو قژەکانی خوێناوی بوون. لە پشتی ئەسرین و قژەکانی ورەنگی پەڕیوی، تەماشای براکەی دەکرد کە هێشتا هەر لە حەساری بوو. چاوەڕوانبوو کە برای بێتەوە ژوور و لە ئامێزی گرێ.بیلاوێنێتەوەو داوای لێبووردنی لێ بکاو پێی بڵێ کە خۆشی دەوێ و جگە لەو لەم دنیایە کەسیتر شک نابات.

بەڵام برا لەجێی خۆی نەدەبزوت وتەماشای دەوروەی دەکرد.کریسانتی کە بە هاوار و گریان چی بۆ نەکرا، بڕیاریدا خۆی بێهۆش کات.هاوارێکی کردو بێهۆش لە بەر دەرگا وەعەرزی کەوت. پاڵەوان بە بێحاڵی ئاوڕیداوە، داهاتەوە خوشکی هەڵگرت و بردی لەسەر تەخت درێژی کرد.بەڵام نەدەبزوت. چوو لە متبەقێ شوشەی سرکەی هێنا، هێندێکی دە لاچاێنگان هەڵسو، تۆزێکی بە کونە لوتی داکرد. سرکە بە ملو نێو مەمکانیدا هاتە خوار. کریسانتی لەبەر بۆنی سرکە خۆی پێ ڕانەگیراو چاوی هەڵێنا. دیتی براکەی بە پەرێشانی لە بان سەری ویستاوە.بەوە کەیف خۆش بوو. باسکە گەورەکانی لێک کردەوەو براکەی لە باوەش گرت.لە کاتێکا خۆی ڕێدەخست لە بەر خۆیەوە دەیگوت:

– ئاخ ژۆرژی من! لەو حاڵەدا کە دەگریاو پێدەکەنیو نەیدەویست بەری بدا، لێی دەپرسی:

– خۆشت دەوێم ژۆرژی من خۆشت دەوێم؟ ئاخورشەیەکی خۆشەویستیم پێ بێژە ! براکەی لێوە پێکداداروەکانی لێک کردەوەو گوتی: « دەتەوێ پیاڵە قاوەیێکت بۆ ساز کەم! قاوە وەخۆت دێنێتەوە.

مادام کریسانتی بە توندی دوگمەکانی ترازاند، دەهات بخنکێ. هاواریکرد: « تۆ وەڵامی پرسیاری من نادەیەوە؟ئاخ نەمام… ڕۆیشتم، دیسان دەهات بێهۆش بێتەوە. بەڵام براکەی دەستپێشخەری کرد وگوتی:

– بۆچی کریسانتی، من تۆم خۆش دەوێ.هەستە دانیشە. ژنەکە روخساری گەش بۆوە.دوگمەکانی داخستەوە، گورج ڕابوو بە چالاکی گەورە کچێک لە ژووریدا دەستی کرد بە هاتوچۆ.کلاوی لە سەر نا، خۆی جوانکرد، عەتری بەخۆدا و لە بنەوە چاوی بە براکەی دەکرد.لە تەماشای تێر نەدەبوو. بیری لەوە دەکردەوە کە : « ئەگەر من خوشکی ئەو نەدەبووم، پێکەوە چەند منداڵی جوانمان دروستدەکرد. » بەڵام لەو فیکرە شەرم گرتی و سوور هەڵگەڕاو لەبەر خۆیەوە گوتی:« خوایە ببەخشە ».

پاشان چەند کلۆ زوخاڵی هاویشتە نێو ئاگردان و خانوەکەی بخوورداونیشانەی خاچی کێشا.

* * *

لەو کاتەدا لە ماڵی پاڵەوان میکێلس مەجلیسی بەزم گەرم بوو. دوای نیوە ڕۆ (ڕینبو)سەری خوار کردەوە و بە کونی باکێشیساردارودا تەماشای ژوورەوەی دەکرد تا بزانێ گاڵتە چیەکانی باوکی لە چحاڵدان.

میستیکری چەکمەکانی دەرهێنا بوو، چونکە بەری پێی دەسووتانەوە.هێندی جار خۆی هەڵداویشت، سەری وەبەری میچی دەکەوتو خوێن بە لاملیدا دەهاتە خوارێ. بەڵام هەروا بە گەرمی کاری خۆی درێژە پێدەدا.

ئەفەندی غیرەتی هاتبوە بەر و سەری لێ رووت کردبوو. سەرە کەچەڵەکەی بریقەی دەدا. کاباميس بە سەریدا خوار ببۆوە. گەڵای کەنگری بە نێو چاوانەوە دەنوساند.چەند هێلکە لە دیزە دا مابوونەوە، بادکش بۆ خۆ رانان خەریکبوو بە تونێلکەوە بیانخوا. لە گەرووی مابوو چاوی لە کالان دەر دەپەڕین.بیرتولدی فەقیر لە قوژبنێکدا خۆی لە پشت گوزاندا شارد بۆوە.لاقە لاوازەکانی لێک بڵاو کردبوون و شنێلەکەی هەڵدابۆوە. قامکەکانی دەزاری دەناو دەیهێنانەوە دەرێ. جاروبار ناوڕێکی لە هاڤاڵەکانی دەدایەوەو سەرێکی دادەنواندو بە هەوای گۆرانی دەیگوت:

- کورینە ببەخشن ! ببورە پاڵەوانی نامدار !

رینیو لە دیتنی ئەو گاڵتە جیانە کە بۆ خۆشی باوکی ئاوا خۆیان رەزیل دەکرد کەیف خۆشبوو. لەو سەری ژێر زەمین بە چاو لە باوکی دەگەرا. پاڵەوان مات و بێدەنگ پاڵی وەدیواری دابوو. دەشوێنێکی نادیار رامابوو.شەراب کاری تێ نەکرد بوو.نە سەر خۆشبوو نەقسەی دەکرد.تەنیا جاروبار لێوی خوارەوەی ئاواژوو دەبۆوەو ددانەکانی دەر دەکەوتن. رینیو بزەی هاتێ و خۆشی لە باوکی هات و ئەخلاقی وەحشی و بێدەنگ و بە فیزی ئەوی خۆش گەرەک بوو.لە بەر خۆیەوە گوتی: «ئەگەر منیش پیاو بام هەر وام دەکرد. ئەگەر شوو بکەم دەبێ بە پیاوێکی ئاوا بێ.»

خۆر لە ئاسۆ دەهاتە دەر. گڕیت هاتبۆوە سەر خۆ. کاندی شادو قنز خۆی لە بەر تیشکی هەتاو هەڵخستبوو، زەرد هەڵگەرابوو.

سی‌تاق پردەبوو لە خەڵک.مێروولەکانیش پاش باران دەهاتنە دەرێ. ژن و پیاو بۆ گەڕان لە ماڵان وەدەردەکەوتن.گشتیان لە مەترسیەکی گەورە رزگار ببوون.ماوەیەکی کورت قەبر لە بەر لاقیان زاری لێک کرد بۆوە، بەڵام بە لوتفی خودا دووبارە وێک هاتبۆوەو زیندوو مابوونەوە.خاو رخیزان دەگەڕان و بە هەڵێنانی کڵاو سڵاویان لێک دەکردو بە گەرمی دەستی یەکتریان دەگوشی. ئەو شەوە ئەڤینێکی نائاسایی‌دانیشتوانی‌کاندی پێکەوە دەلکاند. هەموو بە خۆشەویستی تەماشای یەکتریان دەکرد. سەیری دەریایان دەکرد و دەتگوت قەت دەریایان نەدیوە.

لە خانوبەرەی کڵاو نەرەنگی پاشا پێنچەک لە سەری مەیدان گوڵی کرد بوو. خەڵکی کاندی دەوێستان و بۆنی عەتر و هەوای یاسەفایان هەڵدەمژت. ئاخرەکەی لە گەڕان ماندوو دەبوون. لە قاوەخانەی( لیئونیداس باپالاروس)دادەنیشتن. بە دەست لێکدان پێش خزمەتیان بانگ دەکرد. پێش خزمەت بە پێخاوسی رایان دەکرد و شەربەتی ئاڵوباڵو یا لیمۆنادی گازداریان دەهێنا. منداڵە تورک بادامی سەوز و پوستە و چەپکە گوڵیان دەفرۆشت. رۆشینە ،ژنە قولمرەشەکە بە مەمکی داچۆڕاو وملوانکەی‌کوژەکەی شین کولیچەکانی خۆی کە کاتی بولەرزەکە لە گەڵ پەپێ ریاڵ تێکەڵ ببوون و کۆی کردبوونەوە بە پێکەنین‌ونازەوە دەیگێڕان. خۆری روو بە رۆژئاوا ددانە پان و سپیەکانی و چارە بە مەکرەکانی دەدرەوشاند.

خەڵکی کاندی لەبەرە خۆوە دەیانگوت: لەو شانەو لەو بەهەشتە، ئەوەتا رۆشینەش بە کولیچە خۆشەکانیەوە.لە هەموو لاوە خەڵک دەگەیشتێ.سی‌تاق بە کراسی تازە دەرازاوە. تیشکێکی نەرم و بەنەوشی کە خۆر کاتی خۆزین بۆ پشت چیاکان بە جێی هێشتبوو، روخسارەکانی ئارامتر دەکرد.

کام پیاوی خەڵکی کاندی بوو کە ئێوارەی ئەو رۆژە بە لیباسی جێژنەوە نەهاتبێتە سی‌تاق. کام

ژنی گاندی بوو کە بە کار هاتبابوو لە قاوەخانەی [لیونیداس باباڵاروس ]دانەنیشتبا و بادامی نەخواردبا و قسەی قۆزی نەکردبایە و باوەشێنی ڕانەوەشاند بایە. (چس‌گورک)لە گەڵ(وانگلیو)ی دەزگیرانی لە ڕێگا گەیشتنێ.کریسانتی لە نێوە ڕاستیاندا بە سەری شانەکراو وڕوومەتی سوورو سپیاو کراو وەک لاو بە ڕێگادا دەڕۆی. خەم و خەفەتی لێ دیار نەبوو. ماوەیەک گریا بوو، لە خۆ چووبوو، بەڵام ئێستا هاتبۆوە سەر خۆ لە گەڵ خوشکە زاو زاوای دوارۆژی هاتبوونە گەڕانێ. خێـەی لە وانگلیوی دەکردو لە خۆشیان بزەی دەهاتێ و لە دڵدا دەیگوت: «من لەو باشترو جوانترم. لانی کەم شتێک لە مندا هەیە کە سەرنجی پیاو ڕادەکێشێ. بەڵام ئەو بەد بەختە لە نێـسک و پێـست بەدەر چیتر نیە. چس‌گورک لە لەشی ئەم تەشـەدا گزشتێک نادۆزێتەوە کە تیژی بکا. بەڵام من مێردم بۆ چیە؟ برام هەیەو پێویستم بە هیچ نیە!»

پاترۆس مودیری قوتابخانەی سەرەتایی بە ڕوومەتی پڕ لە ئاوڵە بە سپایی بەوێدا تێ پەڕی. ئەو بۆ فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵان ڕەوشتێکی تازەی لە گەڵ خۆی هێنابوە گاندی. گوێچکەی منداڵی دەنێر دوو لاداری پچرک دەنار ئەوەندەی ڕێک دەکوشی تا خوێنی لێدەهات. ئانیتای کچی کاتی شوکردنی بوو بەڵام ئاغای مودیر نەیدەهێشت لە ماڵێ وەدەر کەوێ.بە هیچ جۆر ئامادە نەبوولە پارەی زاوا ڕشەیەک ببیسێ.دەیگوت: «من ناموێ ئەو پیسایانە بۆ ماڵی خۆم ڕێگا بدەم.» لە حەسارێ کەڵە شێری نەبوو.کاتێک پشیلەی مێ دەچوە سەربانی و بە میاو میاوی عاشقانە کتکەکانی دراوسێی لە خۆ کۆ دەکردەوە، پاترۆس لە دینەدەرەدەچوو. وەسەر بانی دەکەوت وبە بەردان پشیلەکانی ڕاو دەنا دەیگوت: «لەعنەت لە جنسی ژن، ئەوە کە تۆوی ئەهەدیەت لە کۆمەڵدا دەچێنێ.»

پاترۆس لە سێتاق ڕانەوەستا. بەڵام چاوی دەگێڕان کە یەکێ لە شاگردەکانی خۆی لە گەڕاندا ببینێ. دەیگوت: یەکیان دەگیرخا بە داری گۆزینگوێچکەکانی هەڵدەکەنێ. چس‌گورگ دیتی و بە ترس و لەرزەوە بۆ ڕێز لێگرتن کڵاوی بۆ هەڵێنا.

سەروکەللەی مرکتوورومارسیلی‌خێزانیشی‌دەرکەوت. دوکتور بە کەیف بوو، کڵاوێکی ڕەنگاورەنگی لە پاریس کڕیبوو. لە سەری نابوو. دەستەوانەی ڕەش و وەکازێک بە دەستەوە. بەڵام ژنە فەتیرەکەی بۆ ئەوەی سەرنجی خەڵک لە سەر جلە ناحەزەکانی لابدا، سوورو سپیاوێکی توندی کردبوو.ژنەکان کە دەیانبینی نێوچاوانیان لێ تێک دەنار ڕوویان لێ وەردەگێڕاو دەیانگوت:

- ئەم سەروسەکوتە چیە؟ ژنەتیوسەماکەری نەواوە.! ئەو کارە چیە دوکتور کردوویەتی؟ بۆ لە وڵاتی خۆمان کچێکی نەدەهێنا.؟

لەو ساڵەدا دوحاجی‌لەکلەک هاتبوونە گاندی ولە سەرمنارەیەکی جوانی‌کلیسایەکی قەدیمی بێزانتی هێلانەیان کردبوو.لەو کاتەدا کە دوکتور لە گەڵ ژنەکەی بەوێدا تێ دەپەڕین، ئەوانیش لە چۆمەکەی ئەوبەری زالم کێو دەگەڕانەوە. ئەوانە باڵندەی پیرۆز بوون، هەموو ساڵێ لە پایزدا هێلانەی خۆیان لە ژێر تاقی منارە بەجێ دەهێشت و بەرەو مەککە بۆ لای خوارێ دەفڕین تا ببن بە حاجی و بەهارانیش بۆ لای نیشتمانی‌خۆیان بگەڕێنەوە.ئێستا هەر تکیان لە پەنا یەکتر بە زکی تێر لاقیان بە بەر زکیەوە نووساند بوو، هێندی هێندی بە سەر سێ تاقدا دەفڕین. ئەوان تەنانەت

چاریشیان لەو خەڵکە گێژو زاریبس وچەلە سرۆیە تەدەکرد کە لە ژێر باڵی ئەواندا دەخولانەوە.

دەریا تاریک دەبوو. دورگەی (دیا) لە رۆخی دەریاوە نە دەبینرا. شنە بایەکی وشک هەڵیکرد و قژە بادراوی ژنانی سەبروکە دەبزاوت. گشتیان باوەشێنەکانیان وێکنا.پۆلێک ماسیگری (ماڵتی)بە لیدانی سەنتوری تایبەتی خۆیان بەوێدا تێپەرین. مەلەوانەکانی گوارە لەگوێ، سنگی پانی تاوبردوویان ئاواڵە کردبوو، لە کاتێکا بەدەنگی گڕ گورانیان دەگوت، بێ ئەوەی سەرنج بدەنە ژنەکانی کاندی راست بۆ لەنگەر گا رۆیشتن کە لەوێ ژنەکانی ماڵتی لە تێو تۆڕی ماسیگرتن و قەرتاڵەی تایبەتی ماسیدا چاوە روانیان بوون

کورە لاو بە جاریک غیرەتیان هاتبوە بەر وبە تاریکی دەستیان لە دەستی کچان دەدا. لە کاتێکا رووسەتیان سوور هەڵگەرابوو، بە تاسەوە تەماشایان دەکردن. لایەک چاو لایەکیش دەریا، لە سەرەوەش ئاسمانێکی مەخمەری کە ئەستێرەی شەو، واتە زوەرە بە هەزار نازو نیو ناز سەمای دەکرد.

* * *

لەو کاتەدا کە ژن وپیاوی کاندی لە سێ'تاق کۆ ببوونەوە، تراساکی وهاڤاڵەکانی بۆ گوڵستان دەچوون. گوڵستان باخێکی پان وبەرین و بەجێ ماو بوو لەولای شاری کاندی.پەبوو لە داری هەلھیرە کێویلکە و درک ودالْ.تراساکی تەنافێکی لە پشتی خۆ بەستبوو.مانیولوس ماستراپاسی شیشێکی پچوک وئاندریکوس گراسوگتورگیس داردەستێک ونیکولای کوری میستیگریش لیتفیتەی هێنابوو. نیکولاێ گوتی:« ئەگەر باوکی هات من فیتو لێدەدەم ، هەمووتان رابکەن.

ئاندریکوس پرسی: « پێت وایە (گوڵستان) لە بەر دەرگا بێ؟» کیژی ئاغا پارسکەواس ناوی گوڵستان نەبوو، بەلاّم منداڵاّن ئەم ناوەیان لێ نا بوو. چونکە کیژێک بوو جوانچاک و شۆخ و شەنگ و هەمیشە پێدەکەنی.

تراساکی گوتی: «ئەو رۆژەکانی بەکشەمۆ چەند تیتۆڵی رەنگاورنگ لە قژەکانی دەبەستێ ولە بەر دەرگا رادەوەستێ. نیکولاتۆ فیتفیتەکەت بدە بەمن، تا ئەگەر قەرار بێ بە سەری دابدەین، من ئاگادارتان بکەم.» غاریدا بەزۆر فیتفیتەکەی لە نیکۆلاهەستاند و گوتی: «تۆ تەنافەکە بگرە. سەردەستە منم، وانیە؟ کەوابو فیتفیتە دەبێ بە من بێ. یاڵاّ با بڕۆین.!»

هەتا پتر دەچوونە پێش ماڵەکان پچوکتر و کەمتر دەبوون.لەو گەرەکە تەریکە فەقیر نشینە، تێکەلاوی تورک و ئەرمەنی دەژیان. خەڵکی ئەو گەرەکە یا لە ئاشی گەورەدا قاوەیان دەکوتا، یا حەمباڵی و فەعلەییان دەکرد.

ئەو چوار کەسە کاتێک لە گوڵستان نیزیک بوونەوە هەنگاویان شل کرد و بە بن دیواریدا لێی چوونە پێش. تراساکی لە پێشەوە دەرۆی. لە پڕ راوەستا.گوڵستان خۆی رازاندبۆوە. ئەواری سوور لە قژە زەردەکانی بەستبوو، شۆخ لە بەر دەرگا وێستابوو. بنێشتی دەجوو.تراساکی رووبکردە هاڤاڵەکانی و بە سپایی گوتی:

- منالینە وریا بن کچەکە لێرەیە.هەمووتان دەبێ پێکەوە دەست بەکار بن. من فیتو لێدەدەم و خۆی بە سەرداددەم.کەس لەم دەورو بەرانە دیار نیە. دەبێ هەل لە دەست نەدەین.

برێکی دیکە چوونە پێش. گوڵستان شۆخ و شەنگ لە بەردەمیان ڕاوەستا بوو. سەیری دوو پشیلانی دەکرد کە بە میاو میاو سواری یەکتر دەبوون. چوار کچ رفێن پشوویان لە سنگیدا حەپس کرد و خۆیان بە دیوارەوە نووساند. تراساکی تەماشای ئەو سەروسەری کزلانی کرد، پالداریش دیار نەبوو. فیتفیتەی بە لێواتەوە ناو تیپی توراندو خۆی پێنادا. ئەواتی دیکەش بە دوای ئەودا. تراساکی ونیکولا هەریەکە رانێکیان گرت.ئاندریکوس شانیگرت و مانولیوس دەستی بەزاری گرت تا هاوار نەکا. هەموویان کیژەکەیان گرتبوو نەیاندەزانی‌چی‌لێبکەن.تراساکی‌گوتی : «بۆ باخی.توندی بگرن لە دەستماندەرنەچێ».

بە زەحمەت گەیشتنە دەرگا ویرانەکەی باخی. هێندێکی دیکەش چوونە پێش. بەلام چونکە سەبانتراتی ئەم باوە درێژە پێ بدەن، کیژەکەیان لە سەر گژو گیا بەرەلا کرد. پاشان هەر چوار دەوریاندا بوو تەماشایان دەکرد. گرێی ئەوارە سوورەکە کرابۆوە. پرچە زێرینەکانی بە سەر شانیدا بلاو ببوون. داوێنی کراسەکەی هەلکشا بوو، رانی وەدەر کەوتبوون. لە ژێر سرخمەوە دلی لێی دەدا.کیژەکە لەپێشدا ترسابوو. پاشان کە ناسیبوونی دەستیکردبوو بە هاواروچەنگە پرچە. بەلام لە سەر گیا درێژیان کردبوو، بە چاوی نیوە بەستراو و نیگای شەیتانانە تەماشای دەکردن.

نیکولا کە بە وردی تەماشای گوڵستانی دەکرد و نەیدەزانی چبکا، گوتی: «باشە ئێستا دەتانەوێ چی لێ بکەن؟

مانولیوس پێشنیاری کرد: تفی دەرووی کەین!

تێکرا کچەکەیان تفباران کرد. بەلام ئەو کارە کوڵی دانەمرکاندن. دلیان سارد بۆوە، نارەحەت بوون. دەبوایە بۆ ئازاردانی رێگای دیکە بدۆزنەوە، بەلام چ رێگایەک؟

ئاندریکوس داردەستەکەی هەلسوراند و گوتی با لێی دەین. تێکرا خۆیان بە سەر دادا و دەگیانی بەر بوون.نیکولای بەقەوەت وەبەر پێلاقانیدا، ئەمجار کیژەکە ترساو دەستیکرد بە مزندن و هاوار.

تراساکی پێشنیاری کرد : تا دەخینکێ وەبەر پێلاقانی دەین. مانولیوس لە کاتێکا ئامرازی ئەشکنجەی خۆی نیشان دەدا گوتی:

– ئەدی شیشە چکۆلەی من لە کوێیە؟

نۆرەی ئەویش دێ. جارێ با وەبەر پێلاقانی دەین. هەر چواریان کەوتنە سەری ولە سەر پشت و زگ و پەراسوانی هەلدەپەڕین. لە نێو گیادا دەیان گەوزاند. هەموو جارێ کە راست دەبۆوە لە بەر دەستیان رایکا، دەیانگرت و لە عەرزیاندەداو دەیانکوتا.

ئارەقەیان کردبوو. پاش ئەوەی لە تفباران و لێدانی ماندوو بوون، ئیتر نەیاندەزانی چبکەن، دەستیان راگرت. لایان وابوو کە گرتن و لە عەرزیدانی بەس دەبێ.چەند مانگ بوو نەخشەی رفاندنی ئەو کیژەیان کێشا بوو.ئێستاش کە دەیان بینی لە بەر دەستیان وەعەرزی کەوتووە، چێژەیان لەو کارە نەدەکرد. هەموویان بە سەریدا خوار ببوونەوە و بە قین و بێزاری تەماشایان دەکرد.تراساکی گوتی: «خۆزیا چە قزیەکمان هێنا بایەو بە چەقۆ لێماندابا‌و تەماشای ئەو خوێنەمان کردبا کە لە بەری دەڕژێشت. نیکولا گوتی:

«دەلێن چی من قەپالێکی توندی پێداکەم، پارەوە گۆشتێکی تەروتازەی لێ بپچرم؟»

تراساکی لە خۆشیان هاواری کرد و گوتی: «بەڵێ دەبێ وابکەین.هەمورومان پێکەوە.

مانولیوس گوتی: نا بە نۆرە هەر کەس بۆ خۆی.

تراساکی پێی چەقاند: نا... هەموو پێکەوە.

ترس بەسەر کیژەکەدا زاڵبوو. بۆ رزگاری خۆی چنگە پرچەی دەکرد و هاواری دەکرد. تاندریکوس گوتی:

لە پێشدا دەبێ دەست و لاقی ببەستین، دەنا لەدەستمان رادەکا.نیکۆلا ئەنافەکەی کردەوە و مانولیوس شیشەکەی هێنا دەرو دەستیان کرد بە دەست و لاق بەستنی. لە پڕ دەنگێکی توند و بە سام لە لای دەرگای هاتەژووری باخ بەرز بووەو یەکێک گوتی: «ئەی سەرسەری دە بەرەڵا...!

هەموو ئاوڕیانداوە. ئاغا پاراسکەواس نیوە روت دەستە گەسکێک بەدەستەوە لە بەر دەرگای باخ راوەستا بوو. ئەو رۆژی پێشوو ئەوەندەی سەرو ریش تاشیبوون، هیلاک ببوو. بڕیاری دابوو رۆژی یەکشەمۆ بشۆێ و بحەسێتەوە. لە شیرین خەو دابوو لە پڕ گوێی لە هاوار و زیری کچەکەی بوو. بێ ئەوەی لیباسی دەبەر کا هەر بە دەرپێوە دەستیدابوە گەسکی و غاریدابوە کۆلانێ.

کاتێک گەیشتێ ئەوەندەی لە توانایدا هەبوو نەڕاندبو گەسکی راوەشاند و گوتی:

- ئەی سەرسەری دەبەرەڵا.! بەڵام لە پڕ راوەستا. لە نێو منداڵەکاندا کوری پاڵەوان میکلیس ناسیبوو. لە بەر خۆیەوە گوتبووی: «ها... پاراسکەواسی فەقیر! وریا بە، کێشەی بۆ خۆت ساز نەکەی!»

بێ ئەوەی هەنگاوێک بچێتە پێش بە گەسک راوەشاندن هەرەشەی لێکردبوون.تراساکی دەستەی کۆ کردبۆوەو گوتبووی:

منداڵینە با بڕۆین.. وەدوام کەون.!

پاشان بانگی پاراسکەواسی کرد و گوتی: «هۆی ئاغا پاراسکەواس! بە دەرگای باخیوەلاچوو، تا نیمەتێدە پەڕین. گەسکەکەش فڕێدە عەرزی.!

سەرتاشی (سیری) بە قسەی کرد و گوتی: « زۆر باشە..»!

تراساکی فیتەی کرد و گوتی: «منداڵینە بۆ پێشەوە. ئەو کابرایە خەڵکی سیرایە مەترسێن.!

چوار لاوی رێگر بە سەر بەرزی بە پێش ئاغا پاراسکەواس دا تێپەڕین. تراساکی بە قینەوە چاوێکی لە کیژەکەی کرد کە لە عەرزی هەڵدەستاوە و کراسی دەتەکاند گوتی:

- جارێکی دیکە بە چەقۆوە دێمەوە.!

## ٤

خوا کارەکانی باش ڕێکخستبوو.لە حەوتوودا شەش ڕۆژ بۆ بەڕێچوونی ژیان، ڕۆژێکیش وەکە ڕۆژی حەوتەم بۆ بیرکردنەوە لە خوا وخواردن و حەسانەوە.لە ڕۆژی دووشەممەوە ژیان هاتبۆوە سەر دۆخی جاران. خەڵکی کاندی کە ڕۆژی پێش پاک و ئیماندار بوون و ڕۆژی یەکشەممەیان بە نوێژ و تاعەت ڕابوارد بوو، ئێستا خوداو پوولەرزەیان لە بیر بردبۆوەو بە شێلگیری خەریکی کارو کاسبی خۆیان بوون.

خۆر سەری لە ئاسۆ هێنا دەری.دەروازەوانەکان سێ دەروازەی شاریان کردنەوە.جوتیاران بە هێستری بە بارەوە هاتنە ژوورێ. دەروازەی لەنگەرگاش کرایەوە.حەمباڵو لۆتکەوان و سەوداگەر بەو دەرگایەدا هاتنە ژوور.هەراو چەقەی خەڵک لەو مەیدانە دەنگی دەداوە.لە مەیدانی شاریش هەرا و هوریا خەڵکی کەر دەکرد.ماوەیەک بوو ئاسنگەر خەریکی کاری خۆیان بوون. جارچی شاریە تێو کۆڵانانا دەگەراو بە دەنگێکی وەک زەنگوڵە هەرای دەکرد کە لە لەسایحانەی ئیسماعیلیە گرێلەکەیەک کوژراوەتەوە گۆشتەکەی وەک ڕەحەتەلقومە. پەلەی بکەن و بیگەنێ دەنا نامێنێ.

لە شەقامی گەورە، پێلاو دروو دوکانەکانیان دەکردەوە. وەستا کار لەسەر کورسی بەرز دانیشتن و بە شفرەی تیژ خەریکی چەرم بڕین بوون.هەرلەو کاتەشدا کرێکار و شاگرد لە دەرەوەی دوکانەکان بە ئامرازی جۆیان خەریکی کار دەبوون. ئەوانە هەمیشە بۆڕابواردن سەریان داوێشتە سەر ئەقورستانێک و یا ئەحەمەلێک کە بەوێدا تێپەڕیبایە.ئازاریان دەدا.

لە پێشدا پاڵەوان (ستیفانیس) پەیدا بوو. دەشەلی و خۆی هارێشتبوە سەر دار دەستەکەی هەمەیشان داببوە کە شەوی پێشتر پاچێنی پاڵەوان (پاکرمی) لە سپراوە گەیوەتێ. هاتبوو سەری بدا و هەواڵی بزانن و پاشا پرسیار بکاو بزانێ کە داخوا لە بارەی پێرەلکانی کریتەوە بە یونان چ وتووێژێک لە گۆڕێدایە؟

ئەنجومەنی نەجاتی کریت کە شەو وڕۆژ جگە لە ئازادی کریت فیکری دیکەی نەبوو، لە سپرا دامەزرا بوو.ئەم ئەنجومەنە پارەی کۆ دەکردەوەو چەکو تەقەمەنی دەکڕی و چارەڕوانی دەرفەت بوو.پاڵەوان ستیفانیس بە شەلە شەل دەهاتە لای دۆستەکەی کە لە ئامێزی بگرێ و بیباتە مەیخانەو لەوێ لە ڕووداوەکانی جیهان ئاگادار بێ.

یەکی لە پێلاو دروەکان ئەوانیتری ئاگادار کرد.هەموو سەریان هەڵێنا، بەڵام کورج سەریان داخستەوەو سەرەحەنیرون چون دەیانزانی ئەو گورگەی دەریا پەلامار بدەنکە پێش دوو ڕۆژ یەک لەوانی باش کوتا بوو. چونکە پێی پێکەنیبوو. پاڵەوان بە سەریدا نەڕاندبووی:

ئەی سەر سەری بەڕەڵا. گاڵتە بەمن دەکەی؟ هیچ دەزانی ئەو لاقەی من لە کوێ

سەقەتبوەکەنگێ و بۆ چی تووشی ئەو رۆژەبووەتەی کەری ئەحمەق.کەوابوو بپرسە تا بزانی! بە داران وەریگەڕابوبە.وەستاکەی بۆ پاراستنی شاگردەکەی لە جێگای خۆ نەبزوتبوو.بە پێچەوانە گوتبووی: « هەقتە پاڵەوان ستیفانیس! تۆ لە ڕاستیدا (میائولیس)ی[1] کریتی! لێی دە.

کاتێک پاڵەوان ستیفانیس لە پێش چاوان ونبوو، یەکێک لە وەستاکاران گوتی : « کوڕینە ئەو پارووەی هەوڵێ قوە گەروو گیر بوو. بۆ ددانیش زیانی هەبوو.» لە پڕ (هاریلاتوس)ی کورتە باڵا بە سمێڵی بە خەنەو هەڵگەڕاوە و دەست بە وەکازەوە دەرکەوت. خێچ و خوار بەرێگاوە دەچوو. وەکازی باریکی لە پیادەرۆ دەداو کاتێک بە پێش دوکانی پێڵاو درواندا تێ دەپەری، وەستاکان دەست لە سەر سینگ رادەبوون و سەریان بۆ دادەنواند.

خەڵکی کاندی لە دڵی خۆیاندا لە ئاست هاریلاتوس هەستیان بە ترس و ڕێز دەکرد. منداڵ بە ترسەوە تەماشایان دەکرد. دەتگوت هاریلاتوس ئینسان نیە، بەڵکو شتێکی نێوان ئینسان و شەیتانە. یان دەتگوت گیان لە بەرێکە لە نێو ئەفسانەی پەریان هاتۆتە دەر. جنوکێکە ئاڵتون لە ژێرخاکدا دەشارێتەوە و بە سەرهێزێکی نەناسراودا فەرمان دەدا. چاوی پیس بوو. ئەگەرماوەیەکی زۆر تەماشای کەسێکی کردبا،کابرا ڕەنگی بە ڕوانەوە نەدەما. دەتگوت ماریێ‌یەوەداوە... ڕۆژێک کاتی تێپەڕ بوون بە باخی ئەرکانۆلدەولەدا، چاو لە دار لیمۆیەک دەکا کە گوڵی کرد بوو.لە پڕ گەڵای دارەکە ڕێنک دێن و سیس دەبن. پێڵاو دروەکان مات و بێدەنگ سەریان بەرداوە تا ئەو تێ پەڕی.

یەک لە وەستاکان گوتی: «کوڕینە وادیارە ئەم ڕۆ خەرابی دەست پێکردوە.لە گەڵ کەس گاڵتەمان بۆ ساز نابێ. ئەدی ئەفەندی و باریانیس بە کویدا تێپەڕیون و بزر بوون؟

کاتێک مووی دێو هەڵپرووزێنن، دێو خێرا ئامادە دەبێ. کابرایەک لە دوورەوە دەرکەوت، بە هەڵکەوت باریابانیس بوو. کەوشدرو لە خۆشیان بۆ دیتنی پشتیان ڕاست کردەوە. باریابانیس گۆزەیەکی مەفرەقی بەدەستی ڕاستەوەو لەرتاڵەیەکی پڕ لە سەهۆڵی بە دەستی چەپەوە لە گۆشەی مەیدانێ دەرکەوت. بە دەنگی بەرز هاواری شەربەتی دەکرد.

هەموو دەیانویست بۆ لاسا کردنەوەی ئەو وەک سەگ بوەڕن و وەک کەر بزەڕێنن. پاشان بڕیاریاندا کە توێلکە لیمۆی پێدادەن وگاڵتەی پێ بکەن. یەکێک لە وان بڵێ:« هۆی زۆن! بڵێ بزانم ئەو منداڵانە هەموویان لە منن؟ ڕاستیەکەی بڵێ. چونکە من دەمرم.» پاشان یەکی دیکە لەو پەڕەوە وەڵام بداتەوە: «بەڵام باریابانیس ئەدی ئەگەر نەمردی چی؟» ئەو دەم تێکڕا لە قاقای پێکەنین بدەن.

وەستا کارێک ڕابوو بە دەنگی بەرز گوتی :« کوڕینە گوێ بدەنێ. چونە ئەورۆ کارێکی دیکە بکەین؟ کاتێک باریابانیس بە پێش ئێمەدا تێدەپەڕێ، هەموو وا نیشان بدەین کە نایناسین.لە جێی خۆمان نەبزووین. هیچ نەڵێین. ئەو شێت دەبێ، کەیفێکی حسابی دەکەین. لە گەڵن؟»

---

١- میائولیس Miaoulis دەریاداری نەترس و ئازای یونانی کە فەرمانەدەی هێزەکانی شۆرشی یونانی بە دەستەوە بوو لە شەڕەکانی ئازادی و سەربەخۆییدا. (وەرگێڕی ف)

- له گه‌ڵێن... بارپابانیس هه‌روه‌گ هاواری ده‌گرد، نیزیکتر ده‌بۆوه و ته‌ماشای دوکانه‌کانی ده‌کرد.تاریک رێستا و چاره روان مابه‌وه.: خودایه ! بانی چی؟ بۆ که‌س سه‌ر به‌رزق ناکا ته‌ماشای بکه‌ن؟ بۆ که‌س زار لیک ناکاته‌وه گاڵته‌ی پێ بکات؟ بانی وای لیهاتوه که تیده‌په‌رێ و که‌س فه‌رقی پێ ناکا که ئه‌و سه‌گه یا که‌ره یا بارپاباتیسه؟ ئاخ! کورینه ده شتیک بڵێن، من بارپابانیسم، ناتوانم، ئه‌دی کوا ئه‌و تونلکه لیمزیانه‌ی ده‌تانهاویشت؟ بێده‌نگی زاڵبوو. هه‌موویان مات، سه‌ریان به سه‌ر کاری خۆدا بمردابۆوه. بارپابانیس ترسی رێنیشت. چاوه‌کانی ماڵیه‌وه‌و وایده‌زانی خه‌ون ده‌بینێ.گۆزه‌و قه‌رتاڵه‌ی داناو هاواریکرد:

- کورینه بۆ خاتری خوا! قسه‌م له‌گه‌ڵ بکه‌ن. ئێوه خه‌ریکن شێتم ده‌که‌ن، ئه‌و به‌زمه چیه سازتان کردوه؟ کوا تونلکه لیمزکان له کوێن؟

که‌س چاوی لێ نه‌کرد و که‌س ده‌نگی له‌به‌ر نه‌هاته ده‌ر.بارپابانیس ده‌ستی کرد به پارانه‌وه‌و گوتی:

- کورینه ره‌حمم پێ بکه‌ن! من ئه‌وه‌تا لێره‌م. ئێوه نام بینن؟ من که هێشتا نه‌مردووم. لانی که‌م شتیکم پێ بلێن تا دڵنیا بم که نه‌مردووم.

هیچ خه‌به‌رێک نه‌بوو.که‌س له جێی خۆی نه‌ده‌بزوت. بارپابانیس تووشی ترسیکی توند بوو. به ورته ورت گوتی: ؛ بیگومان سیحر کراوه. مه‌رگ بیره‌دا تیپه‌ریوه. نازانم پیلاو درور مردون یا من نه‌ماوم.ئه‌ی هاوار له‌فریام که‌ون.!»

گۆزه‌و قه‌رتاڵه‌ی هه‌ڵگرت و رایکرد. ئه‌وده‌م ده‌ستیانکرد به پیکه‌نین. وه‌ستا کار له سه‌ر چوار پایه هاتنه خوار و ده‌ستیان به دڵیانه‌وه گرتبوو، هاواریان ده‌کرد: « بۆ پیشه‌وه بارپابانیس بۆ پیشه‌وه! شه‌قامی گه‌وره له‌به‌ر پیکه‌نین وه‌له‌رزه که‌وتبوو.

* * *

توسقوفی گه‌وره گوێی له ده‌نگی قاقای پیکه‌نین بوو، هه‌ستاو له سه‌ر جێگا دانیشت. سه‌رمای بوو. مجێوری کلیسا هاتبوو بیشێلێ‌و به‌ده‌نی به ئاره‌ق داماڵێ. توسقوف پرسی:

- ئه‌م هه‌راو هوریایه چیه؟ هه‌ر ده‌ڵێی هه‌ور ده‌گرمێنێ. نه‌کا دیسان بووه له‌رزه هاتبێ؟

مورتزوفلوس به رووگرژی گوتی: « پایه به‌رز لام وایه پیلاو درون دیسان گاڵته به رێبوارێکی فه‌قیر ده‌که‌ن. ئه‌وانه بۆچی شه‌رم نایانگرێ؟ ئێستا که وه‌ختی گه‌مه‌و گاڵته نیه. ده‌بینی پایه به‌رز؟ ئه‌و شه‌یتانانه کاری ئیمه‌یان وه‌دوا خست.»

توسقوف باسی ولاتی روس و شاری کێفی ده‌کرد که چه‌ند ساڵ له‌و شاره‌دا راهیبی عیباده‌تخانه بوو. هه‌روه‌ها باسی به‌فرو گومه‌زی ته‌لایی و کلیسا عیباده‌تخانه‌یه‌کی ژێر زه‌مینی پڕ له (پیرۆز)ه‌کانی ده‌کرد و ده‌یگوت:

- مورتزوفلوس! تا ئه‌وده‌مه‌ی رووسیا هه‌یه مه‌ترسێ. کۆمه‌ڵی ئورتودوکس هه‌ر زیندو ده‌بێ حکومه‌ت ده‌کا.ئێستا مه‌سیح په‌نای بۆ رووسیا بردوه .رۆژێک به‌و چاوانه دیتم چله‌ی زستان بوو کاتی رۆژئاوا مه‌سیح لیباسیکی له چه‌رمی گای له‌به‌ردابوو، چه‌کمه‌ی درێژی له پێ کردبوو. یه‌ک یه‌ک له ده‌رگای ماڵه‌کانی ده‌دا. به‌لام که‌س ده‌رگای لێ نه‌ده‌کرده‌وه. من له پشت په‌نجه‌ره‌وه

دەمبینی، چومە خواری دەرگام لێ کردەوە. تا گەیشتمێ هاوارم کرد ئەی خودای من! بەلام ئەو ونببوو.

مجنور نیشانەی خاچی کێشا و نالاندی و گوتی : «بەلام من قەت نەمدیوە.»

ئوستوف لە وەلامدا گوتی : «تۆش ئەگەر بچیە روسیا دەیبینی. پاشان رووی لە دیوار کردو خەوی لێ کەوت.

ئەو رۆژە بەیانی پاشاش بە رووگرژی لەخەو هەستا بوو.سێ رۆژ بوو کەیفی سازنەبوو، لە پڕ هەستی کرد کە پیر بوە.بەو شەرتە کە رۆژی شەممەی رابردوو لە سێ تاق کاتێک لە خانوی کلاو فەرەنگی خۆی خەریک بوو تەنەنەی دەکێشاو گوێی دابوە دەنگی دەهۆڵ و زورنا، لە نێو یونانیەکاندا چاوی بە ژنێکی جوانی پرچ درێژی لێو گۆشتن کەوتبوو، بە جارێک عاشقی ببوو. رووی کردبوە سولەیمان قولە رەشی خولام و پرسیبووی:«ئەو ژنە یونانیە سور پۆشە کێیە لەوێ راوەستاوە!»

- کەیفت پێ هاتوە ئەرباب؟ ئەو خەڵکی کاندی نیە.خەڵکی (کروسونا) گوندێکی دووری چیایە. یەک شەممەی رابردوو شووی بە کاپامیسی چەرچی کردوە. کاپامیس دەناسی کە دەنگێکی خۆشی هەیە، هێندێ شت لە بارەی ئەوەوە بیستوە، لەو ژنە گەڕێ.

- ناچــن رادبارە ژنێکی نەجیبە!

- بەڵێ ... ژنێکی نەجیب و زۆریش نەجیبە. مێردەکەی خەڵکی ئیسفاکیایە.

پاشا سەرە کەچەڵەکەی راوەشاندبوو، لە بەر خۆیەوە گوتبووی: «نەجیب.نەجیب ! بەڵێ نەجیبە، چونکە من پیر بووم. برایەوە . بۆ کەسێکی نە توانێ زاڵم بێ ژیان بە کاری چی دێت؟ هەر کەسی ویستی نەتوانێ بیکوژێ، هەر ژنێکی خۆشی ویست نە توانێ دەئامێزی گرێ، ژیان فایدەی چیە؟ ئاخر من چ پاشایێکم، مردو شۆڕ بباتەوە. کوا ئەو دەمانەی کە جەلادی خۆم دەنارده گوندەکانی یونانی نشین لای ئەو بوک وزاوایانەی کە شاییان دەکرد؟ سێوێک بۆ کیژەکە لە دەسرەیەکداو فیشەکێک بۆ کورەکە لە دەسرەیەکی دیکەدا. ئەوان دەبوایە لەو دوانە یەکێک هەڵبژێرن. بەلام کێ غیرەتی هەبوو کە فیشەک هەڵبژێرێ.؟ ناچار سێویان هەڵدەبژارد. هەر ئەو شەوە بوک بە چاوی بە ئەسرین و بە جلی جوانی بوکێنیەوە لە کاتێکدا نازیشی دەکرد، لە ڕێگاوە دەگەیشتێ و لە سەر ئەژنۆیانم دادەنیشت. بەلام حەیف کە ئێستا پیر بووم...»

لەو کاتەدا پاشا رووی کردە خولامی رەش و بە چاو لێداگرتن پرسی:

- تۆ دەڵێی چی سولەیمان؟

- ئەرباب هەر وابزانە نەت دیوە. ئێمە ئێستا لە کریت دەژین. لەوانەیە توڕشی دەردە سەری بین.بۆ هەناسە هەڵدەکێشی، دەتەوێ ژنە هەرمەنیەکەت بۆ بێنم.!

ماروسیا... ژنێکی هەرمەنی بوو لە کاندی هەموو کەس دەیناسی. تەنانەت گۆرانیشیان بۆ هەڵبەست بوو. مێردەکەی هەرمەنیەکی مل ئەستوری چوار شانە بوو. دوکانی لە نزیک لەنگەرگا بوو. تەواوی رۆژ قاوەی لە ئاونگدا دەکوتا.هەموو گەرەکی بە عەتری قاوە بۆندار کرد بوو. ئەوەندەی قاوە کوتا بوو باسکی بەقەد رانی لێ هاتبوو. دەیتوانی بە مستێک دیوار برووخێنێ. ماروسیا ژنێک بوو وردیلە، قولە خرە، دمو چاوێکی ناحەز، سمێڵێکی ئەستورو داکەوتو. کاتێک

بە ڕێگادا دەڕۆی، بە ڕاست و چەپدا بەلادا دەهات. بۆنی تووندی مایینی بەڤاڵی لێدەهات. ئەو بۆنە کاتی شەو هەرزەکاری لە دوورەوە بۆ لای ماڵی ئەو ڕادەکێشا. ماروسیا لە بەر دەرگا ڕادەوەستا، دوگمەکانی تا نیوەی سوخمەی دەکردەوە. کولمەی تۆکن و خەتێکی سمۆری بە سەر لێوانیدا هاتبوو کە هەمیشە چەندلۆپە ئارەقەیان لە سەر بوو. بە چاوی خومار و بزە لە سەر لێوان چاوە ڕوانی دەکێشا. کاتێک شەو دادەهات و مێردەکەی لە بەر هیلاکی دەنووست، ماروسیا دەست بە کار دەبوو. ماچ و مووچی بە خەروار دەفرۆشت. کابرای مێردی بە ژووری پچوکی پەنای پرخەی دەهات. ماروسیا دەرگای ژوورەکەی دەکردەوە، چونکە پێی خۆشبوو کاتێک لە گەڵ بێگانەی تورک و مەسیحی و جولەکە و ئەرمەنی وەک لام ئەلفلا لێک دەهاڵا، مێردەکەی لە پەنا خۆ هەست پێ بکاو لە ترسان بلەرزێ.

هەموو جارێ کە پاشا خەمگین دەبوو، یا سەدری ئەعزەم سەرکۆنەی دەکرد،سولەیمانی قولەڕەشی بەدوای مارسیادادەنارد.

سولەیمان جارێکی دیکەش پرسیبووی: «دەتەوێ ئەو ژنە هەرمەنیەت بۆ بێنم؟»

پاشا بە تووڕەیێ تفێکی لە عەرزی کردبوو، گوتبووی من ژنم ناوێ! یا ئەو چندانە برلێن و وێن بن لێ‌یان بیزارم. شێست ساڵ کاتی خۆم لەگەڵ ئەوانە بە فیڕۆ دا. بۆیە هەناسەم هەڵکێشا کە پیر بووم، دەوڵەتی وەساتیش پیر بوو. ئیتر هیچمان ترخێکی ئەوتۆمان نەماوە. گوتت ئەو ژنە ناوی چیە؟

- کاروفالیا

- مژدوو شۆڕ ببیا. سولەیمان دلم زۆر تەنگە. ئەو شۆ باربابانیسی شەرەبەت فرۆش بێتە ئێرە، بە ئەفەندیش بێژە بلا بێت. پێویستم بە هێندێ کەمەر پێکەنین هەیە.

پاشا قەنەنەکەی وەرگێڕا بوو، سوروتوەکەی لە سەر بەردێک خاڵی کردبوو. پاشان بە سرتە و لە ژێر لێوانەوە کە خولامی ڕەش نەیبیسێ، گوتبووی: مەزنەتی و شۆڕ بوونەوە. خوا لە گوناحانم خۆشبێ، لام وایە وەسمانی بەرەو فەوتان دەڕوا!»

پاشان بە دەنگی بەرز گوتبووی: «هۆی سولەیمان! قەنەنەکەم بۆ تێکەو بەندەنگیش بە!»

سوارێک بە ڕیشێکی تۆپەڵەی ڕەش و پیچمێکی وەحشی‌یەوە لە کاتێکدا پێنچەکەی هێنابوە سەر برۆیان دەرکەوت. قامچیەکی لە مایەنەکەی داو وەک تیر لە وێ تێپەڕی و لە دەروازەی لازارە وە بەرەوچۆمی ڕکێفی لێدا.

پاشا بە تووڕەیی پرسی :

- سولەیمان ئەو کافرە کێیە کە وا ڕادەبڕێ؟ وادیارە زۆر بە خۆی دەنازێ. پێشتر لە کوێ دیومە خولامی ڕەش چاوی دەسوار بڕیبوو کە پاش تێپەڕ بوون لە دەروازەی شار لە دەوروبەری بورج و قەڵاکان ڕمبازی دەکرد.

پاشا قەنەنەکەی ڕاوەشا ندوگوتی :« هۆشت لە کوێیە سولەیمان لە گەڵ تۆ قسان دەکەم! »

- پرسیت ئەو سوارە کێیە؟ بۆ پارەکەت لە بیر نیە! لە بیرتە کە نووی بەگی هاویشتبوە سەر بانی. تۆ بانگت کردە کۆشکی خۆت، بەلام بۆ پینە کردنی کارەکەی خۆی تەنانەت لێبوشی لێک نەکردەوە؟ بە لام لە کاتی ڕۆیشتندا ئەردەی پلیکانی گرت و بە کاوە خۆ هەڵیکەند.

- ئاخ زانیم! پاڵەوان میکێلسە . ئەوەی گوت و تاوێک بێدەنگ بوو. پاشان گوتی :

- گوێ بگرە سولەیمان ! ڕۆژێک تۆ دەبێ لەم سێ تاقە و لە پێش چاوی هەموو کەس بە تورک و یونانیەوە دەست و پەلەپەی لەگەڵ نەرم بکەی و پشتی لە عەرزی بدەی. تەنیا لەم ڕێگایەوە دەگرێ لە شەڕی ئەو نەجاتمان بێ. تێگەیشتی !

خولامی ڕەش تەماشای دەریای دەکرد سپیلکەی چاوی زەرد هەڵگەڕا بوون و خەتێکی سووریان کەوتبۆیە. وەڵامی نەداوە.

پاشا ئیشارەی کرد دەهۆڵو زوڕنا بێدەنگ بوو هەستا کە بڕوا. جارێکی دیکەش ڕووی کردە قولە ڕەش و گوتی :

- ئەی ڕەشی لەعنەتی، بزانە ئەگەر تۆش لەو کافرە بترسی، ئیتر حسابمان پاکە، پاشان بێدەنگ بوو. لەو سێ ڕۆژەدا تەنیا بیری لەو ژنە سوور پۆشەو لە دەوڵەتی وەسمانی کرد بۆوە.

ئەوێ ڕۆژێ بەیانی بە شێواوی لە خەو ڕاپەڕی. خەونێکی ئاڵۆزی دیبوو. لە خەویدا دوو جانەوەری دڕندە، واتە پاڵەوان میکێلس و سولەیمانی قولە ڕەش، لە نێوە ڕاستی مەیدانێ تێک بەر ببوون.هەر دووکیان سەر تا پێ ڕووت بوون. لەشیان چەور کردبوو، هەریەکەی بیورێکی بە دەستەوە بوو. گشت خەڵکی کاندی لە دەوریان کۆ ببۆوە. خاچپەرستەکان لە لای هەتاو وتورکەکان لە لای نیسێ ڕاوەستا بوون. تەماشایان دەکرەو کەس لێوی نەدەبزوت. هەموویان بێدەنگ و بێڕەنگ چاویان لە مەیدان بڕیبوو. پاشا لە بن خێوەتێکی ڕەنگ سوور دانیشتبوو. لاقی هاویشتبوە سەر لاقی و دڵی وەک گەڵای دار دەلەرزی.چونکە بە خەیاڵی خۆی لە ناخی دەروونیەوە دەنگێکی دەبیست کە دەیگوت : « ئەگەر پاڵەوان میکێلس پشتی حەریف لە عەرزی بدا ،وەسمانی کاری تەواوە. ئەگەر خولامی ڕەشیش پاڵەوان لە عەرزی بدا، خاچپەرستی پێچراوەتەوە. »

هەرتک دەیان نەڕاند و بێ ئەمان شەڕیان دەکرد. زەوی لە ژێر قاچیاندا دەلەرزی. قولکەکان پڕ لە خوێن دەبوون. تەواوی شار وەلەرزە کەوتبوو. ڕۆژ ئاوابوو تورک و مەسیحی لە تاریکایدا ونبون. پاشا بێجگە لەو دوو دڕندە خوێنخۆرە کە دەیان نەڕاند ، لە عەرزی دەگەوزین و هەڵدەستانەوە و گۆشتی لەشیان بە تەوران لەت لەت دەبوو، هیچی دیکەی نە دەبینی. پاشا وەلەرزە کەوت و لە بەر خۆیەوە گوتی :«ئەلا ئەلا، ئەوە خەون دەبینم! هەر ئێستا هاوار دەکەم تا لە خەو ڕاپەڕم. نامەوێ کۆتایی ئەو شەڕە ببینم!» وەخەبەر هات. ئێستا بە گرژو مۆنی لە سەر دۆشەگی ئەستووری خۆی دانیشتبوو فیکری هاوارێکی دەکردەوە.دەستی لێکدانو سولەیمان هاتە ژووری پێی گوت: «بچو پاڵەوان میکێلس بێنە ئێرە! »

خۆشی نەیدەزانی بۆ چی پاڵەوان میکێلسی بانگ دەکا.فیکری کردەوە : «کاتێک بێتە ئێرە دەیبینم.لەوانەیە قسەی لەزاری خۆی گەورەتر بە من بڵێ. ئەوەدەم تووڕە دەبم و بڕیاری پێویست دەدەم. لەم وڵاتەدا پاشا منم. من ئیجازە نادەم کاتێک دانیشتوم و گوێم داوەتە موسیقا، ئەو کافرە بە سواری ئەسپ بە بەر چاوی مندا تێ پەڕێ. »

خولامی ڕەش سەری خوراند و گوتی :

- پاڵەوان میکێلس ئەرباب ؟ بەڵام بیستومە ئەو ئێستا لە ساردخانەی خۆی لە گەڵ گاڵتە چیەکی خەریکی بەزم و شەراب خواردنەوەیە.

- شەراب دەخواتەوە ؟ شەراب خواردنەوە کە بیانو نیە. پێی بڵێ گیرنەیێ بێتە ئیرە. خولامی رەش نەیدەویست بچێ. دەنگی نەرم کردەوەو گوتی: «ئەرباب تۆ دەتەوێ ولات توشی شەرو کوشتار بکەی؟ چما ئەمرت لە قوستەنتەنیەوە بۆ هاتوە؟»

پاشا هەرتک دەستی بە لاسەریەوە گرت ویە نارەحەتیەکی ئەواو گوتی: «بۆچی ئەوەی بە من دەڵێی؟»

- لە بەر ئەوەی ئەگەر پاڵەوان میکێلس جوابی کردم و گوتی نایەم، تۆ ئەوەدەم چدەکەی؟ ناچار سەرباز دەنێری. ئەویش وەک هەموو جارێ دم و لوتیان دەشکێنێ. ئەو کابرایەکی رەشۆکی نیە، بە تایبەت ئەگەر ئارەقی خواردبێتەوە. ئەو بومە لەرزەیە. لە بیرتە پارەکە سەر خۆشبوو، دەیویست بە زۆر دەرگای لەنگەرگا بشکێنێ؟ تۆ ئەگەر بە دزیش بیکوژی، گریت یەک پارچە دەبێتە ئاگر، کە وابوو باشترە ئەرباب وازی لێ بێنی.

- لەوە گەرێم چونکە ملهورە، لەویتر گەرێم چونکە نەجیبە. کەوابو من چ پاشایێکم؟ پاشا ماوەیەکی زۆر لایەنی لە بارو ئالەباری مەسەلەکەی هەڵسەنگاند ولە بەر خۆیەوە گوتی: «ئەگەر ئەم دورگە لەعنەتیە ئاگر بگرێ،دیسان لە رۆژ هەڵاتەوە پاشای تازە بە لەشکر و تۆپ و تفەنگەوە دەگاتە ئیرە. ئوروپاییەکانیش خۆ تێهەڵدەقوتێنن، مردو شۆر بیانبا! عەیبی کار هەر ئەوە نیە، بەڵکو خۆشم دەکەومە گێرەو کێشەوە.. مناخرەکەی بە تورەیی دەستێکی بە سمێلی داهێناو گوتی: «کەوابوو برۆ قاوەیەکی سەر بە لەیاخ بێنەو لەننەکەشم بۆ تازە کەوە ، رەشی ناجسن!..

خولامی رەش گوتی : « ئەدی پاڵەوان میکێلس پاشا ؟

وازی لێ بێنە مردوو شۆر ببیا !!

* * *

لەو سەعاتەدا کە پاشا باسی پاڵەوان میکێلسی دەکرد، ئەو دەبروانیە تیشکی هەتاو کەلە کولانەی ساردارەوە هاتبوە ژوورێ. میزەرەکەی بەر بزوە سەر شانی ونێو چاوانی تاوبردوی کە شەبەقی خۆر لێی دابوو بریقەی دەدا. ریش و سمێڵ و قژەکانیشی هەر بریقەیان دەهات.چاوە خرو رەشەکانی راست دەپەنجەرەی سارداو بریبوو.تەواوی شەو چاوی لێک نەنابوون. سەیری دەکرد، گوێی دەدایە، دەیخواردەوە، جاروبار کاتێک دڵی هەڵدەچوو بە توندی بە سەریدا دەیگوڕاندکە هێدی بێتەوە. لە بەر خۆیەوە دەیگوت : « بۆچی وام لێهاتوە؟ ئەو هەموو شەرابەی دە ورگم دەکەم، فایدەی چیە؟ لە لایەک دەچێتە خوار و لە لایەکی تر دێتەوە دەر..!» سەر خۆشی نەدەبوو.شەراب کاری تێ نەدەکرد.لەم بارەوە هەستی بە غەریبی دەکرد.جاروبار راست دەبۆوە بێ ئەوەی بلەرزێ بە ژێر زەمینەدا دەهاتو دەچوو، دیسان لە جێگای خۆی دادەنیشتەوە، رقی لەو کەسانە هەڵدەستا کە بە لادا دەکەوتن و وەک سەر خۆش دەدران و دەرشانەوە و لیبا.سیان پیس دەکرد، یا وەک منالان دەگریان. رووی کردە بیرتولدو گوتی:

- گوتت ئەو ژنە ناوی چبوو ؟

- دیزدێمونا..پاڵەوان دیزدێمونا.ئەو شازادە خانمە لە گەڵای گوڵ ناسکتر بوو. راستی کە سروشتی ئادەمیزاد چیە؟پرچەکانی وەک تاجی مەلەکە لە دەوری سەری دەهالاند، خاڵێکی

جوانیشی لە سەر کولمەی بوو...

بیرتولد سەبارەت بە زولف و خاڵی سەر گۆنای هیچی نەدەزانی، هەر خۆشی گەرەک بوو کە ئاوایان باس بکا.

- باشە ... درێژەی پێ بدە !

بە کورتی پاڵەوان ، ئەو شازادە خانمە بوو بە ئەڤینداری بەرپەرێکی پیر کە لاقی ناحەزی هەبوون، بەڵام پیاو هەق بڵێ مرۆڤێکی رەشیدو ئازا بوو. تۆ پێت وایە ئەو کارەساتە چۆن رووبدا؟ زۆر سادە ! تەنیا شەوێک ئەو کۆنە سەربازە ، چیرۆکی ژیانی خۆی بە درێژی بۆ شازادە خانم گێرابۆوە. لەو هەموو بەڵاو موسیبەتەی کە بە سەری هاتبوو، شازادە خانم ئەوەندە خەمبارو نارەحەت بوو کە بگریانەوە خۆی دەئامێزێ هاویشت و گوتی: « رەشی من نارەحەت مەبە، خەفەت مەخۆ، من دەتلاوێنمەوە و بزەت دێنمەوە سەر لێوان.» بیرتولد راوەستا و پیاڵەکەی تا سەر لێوان پڕ کرد و هەناسەیەکی هەڵکێشا.

پاڵەوان میکێلس گوتی : « دەی .. درێژەی پێدە »

بیرتولدو سەری هەڵگراند تا رووداوەکەی بێتەوە یادو گوتی: « پاڵەوان ببورە. زەینم پەرێشانە.. پاشان کارەساتێکی سەیر قەوما. ئەوان ئیتر لە ڤێنیز نین. بە سەفەر چوونە قیبرس. لام وایە بوونە ژن و مێرد. لێرەدا ئەفسەرێکی سپی پێست بە سەر شانی تەلاێیەوە دێتە مەیدان. پاشان ...ئاخ.. لە بیرم چۆتەوە لەم نێوەدا دەسرەیەکیش هەبوو...»

- دەسرە ؟ .. وادیارە قسان دەپەرێنی..

- نا..نا ، پاڵەوانی بەرێز، نا.. من درۆنە ناکەم.. دەسرەیەک.. بەڵێ دەسرەیەکی بە راستی. بەڵام دەبێ ئەو دەسرەیە ژاراوی بووبێ یا جادوو. من راست نازانم، ئاخرەکەی کابرای بەرپەر لە تێرەییان شێت دەبێ. شەوێک...بۆ لە بیرم نیە.. بەڵێ شەوێک دەسرەی لەسەر زاری دزدەمۆنا دادەنێ و ئیدی...

لێرەدا بیرتولدو دەستی کرد بە گریان، دەسرەی خۆی دەرهێنا تا چاوە بە ئەسرینەکانی پێ بسرێتەوە و هاواری کرد و گوتی:

- ئیدی ئەوی خنکاند.

چوار مەستەکان کە گرێچکەیان بۆ بیستنی چیرۆک شل کردبوو، لە قاقای پێکەنینیاندا. پاڵەوان تێکچوو، هاواری کرد: بێدەنگ.! پاشان رووی کردە بیرتولدو وگوتی:

- خەتای تۆ نیە. خەتا لەمنە کە واسۆناڵ پێچم کردووی. سەری لووسی وەدیواری داو چاوی لە سەر یەک دانان و لە دڵی خۆیدا گوتی: « ئەو بەرپەرە هەڵی بوو، چەندە کارێکی باشی کردوە لەو کاتەدا گاڵتە چیەکان چارە رەشی دزدەمۆنا یان لە بیر بردبۆوە. میستیگری گوتی:

- مەگری بیرتولدو چکۆڵەکەم، مەگری. ئەوانە چیرۆکن، لە کاتێکدا ئێمە مرۆڤی بە راستین و هەبین. باکێش ! تۆش پەلچەیەک لێدە، بەری پێم بۆ سەما وەخرو کەوتوە.

گیتاریش دەتگوت سەر خۆشە.زەنگۆڵەی بە خۆوە هەڵاوەسیبوو، سەری هاویشتبوە سەر ئەژنۆکانی باکێش. وەک ژنێکی بەراستی و تازە بووکێک هەڵدەبەزی. کاپاسیس بە بیستنی ئاوازی هەناسەی هەڵدەکێشا. ئەویش لە بەر شەرابی سەری لووسی هاویشتە سەر دەستەکانی و

دەستی کرد بە گۆرانی « ئەمان ئەمان !»

ئەفەندیش بە سەری کەچەلی و بە ورگی هەڵمساوی بە شەراب و گۆشت بەراز، بە هەوای ئەو چەپڵەی لێدەدا. هێندێ جار لە پڕ رادەبوو شانی میستیگری دەگرت و خولێکی دەدا. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: « مردو شور خەم و خەفەت بەریٚ! مردوو شۆر پاکی و عیبادەت بەریٚ. »

میستیگری لە بەری دەپاڕاوە و دەیگوت:« وەرە ئەفەندی ببە خاچپەرست، تا بە سواری بەرازی بچیە بەهەشتیٚ. »

ئەفەندی تورە دەبوو یگوت: «ناکوریتە، من ناتوانم ببمە خاچپەرست. من تورک هاتومە دنیاو بە تورکیش دەمرم. »

هێلکەکانیان هەمور بە توێلکەوە خوارد بوو. پاشان پاڵەوان میکێلس بە مستیٚ دیزەیەکی شکاندو لەتکە سواڵەتەکانی بەسەردا بەشکردن. بیرتولدو بەشی خۆی وەرگرت و لە ترسان چوو لە سەر چەلەنگێک دانیشت، گریتیەکان لەتکە سواڵەتیان بە دان دەشکاند و دەیالجوت. دەیانکردەوە بە قوڕ و پاشان بە پێکەنینەوە قوتیان دەدا. بیرتولدو بە سەریاندا خوار ببۆوە و بە سەر سامیەوە سەیری دەکردن. ئاخرەکەی تێگەیشت کە سێ جورە ئادەمیزاد هەن. ئەوانەی هێلکەی پاکراو دەخۆن، ئەوانەی هێلکە بە توێکڵەوە دەخۆن، ئەوانەی هێلکە بە توێکڵەوە دەخۆن، سواڵەتیش دەخۆن، ئەوانە ی دوایی پێیان ئێژن گریتی...!

بیرتولدو لە دەرگای ساردار رامابوو، لە بەر خۆیەوە دەیگوت: « ئاخ ، ئاخ، ئەی کۆنت ماتراوێنو بۆ هاتوویە ئێرە؟!» لای بەیانی هەموو کەوتبوون. هێندێ پرخەیان دەهات. هێندێ دەیان ناڵاندو دەیانویست بپرشێنەوە. بیرتولدو رشابۆوە سوک ببوو لە ئاو دەگەڕا. زارو سەروچاوی شوشت و خۆی لە شنێلەکەی وەر پێچا، وەک داعبایەکی پەڕو باڵی تەڕ بووبێ لە قوژبنێک مات بوو، خەوی لێکەوت. تەنیا پاڵەوان میکێلس هەروا قیت ونستا بوو. تا گەرووی شەرابی خوارد بۆوە، بەلاٚم بە زەینێکی روونا‌ک. هەروەک بە رۆژوو بیٚ، لە پشتی پەنجەرەوە بە چاوی زەق تەماشای هەلاٚتی خۆری دەکرد.

کاتێک شەبەقی بەیانی لە سارداری دا و بەرماوی خواردن و شەرابی رژاو ورشانەوەی دەرخست، پاڵەوان رووی وەرگێڕا و تەماشای پێنج کەلاکی‌کەوتووی کرد، دەتگوت بۆ جاری ئاخرە دەیانبینیٚ. لە بەرتوورەیی و لە بێزاریان دڵی‌تێکچوو، گوێچکەی هەڵخست. ژنەکەی لە حەساریٚ ئاوی لە چاڵاویٚ هەڵدەکێشا. کەڵە شێرەکانی ئەم دەورو بەرە دەیانخوێند. هەلاٚو بگری ئادەمیزاد و ولاٚخان دەهات. دەریای خرۆشان لە دوورەوە دەیئەراٚند. ماینەکەی لە حەساریٚ دەیحیلاند. دەنگی حیلەی ماینەکەی وەک ئاوی روونی کانیاو لە حەوا دەلەرزیەوە. پاڵەوان هەستی کرد کە دڵی سووکتر بوو. لە بەر خۆیەوە گوتی:« ئیتر من بێجگە لە رەفیقایەتی ئەسپان چێژە لە هیچ شتێکی تر ناکەم.ئاخ ..خۆزیا دانیشتوانی دورگەی کریت تەنیا جانەوەری درندەوگورگ و بەرازدەبوون. بەراستی ئادەمیزادی رەزیل و بێمانان.هەموویان وەک بیجبیجە خانمۆان »

لە جیٚ هەستا، خۆی لەبەریەک کێشاوە و تەقەی لە ئێسکانی هێنا . پاشان نوکە لاقێکی گەیاندە دزستەکانی. شەرابی پێدا کردن و بە سەریاندا گوڕاندی و گوتی:« راپن. رابن و کار بکەن..»

ئەو بەزم و خواردنەوە لە تەواوی ئەو شەو ورۆژەداو شەوی دوایش درێژەی هەبوو. جاروبار کاتێک یەک لە ئارەقخۆرەکان خۆی ڕانەدەگرت، پاڵەوان قامچیەکەی هەڵدە سوڕاند. کاریتوس هەمیشە لە هاتووچۆی هێنانی خواردنی تازەدابوو. ئەفەندی و بیرتولدو لێکدا لێکدا لە پێش یەکتریان دادەناو پێیان سەیر بوو کە لە شارێکدا دەژین ویەکتریان نەناسیوە.

بیرتولدو لە گەڵ لێدانی سێتار بە ئەفەندی گوت: «لێدانی سێتارت فێر دەکەم تا خەم و خەفەتت نەمێنێ و بتوانی بە تەنیا بە کوڵانەکاندا تێ پەڕی.»

ئەفەندی گوتی: «بیرتولدوی خۆشەویست. منیش فێرت دەکەم کە چۆن خۆت لە بەر ئاگر ڕابگری..»

ئیتر جەنابی کۆنت لە نێو کریتیەکاندا خۆی بە بێگانە نەدەزانی. تەنانەت خۆشیشی دەویستن و هەر ماچ بوو بەسەررویدا دەباری. تەنیا لە پاڵەوان میکێلس دەترسا. ئەو (زانتی)یە دڵتەرە کاتێک دەیویست گاڵتە بکا، گەرووی دەگیراو یەک وشەی بۆ نەدەهات. جارێک رووی کردە باکێش و گوتی:

- ئاغای باکێش! تۆ هیچ دەزانی‌کە ئێمە لە ڕاستیدا ئینسان نین، بەڵکو هونەرمەندین. هونەرمەند، جۆرەمەلائیکەتێکە بەلام مەلائیکەی تەواو نا، بەڵکو وەک فرشتە دەچین. بۆ ئەوەی باشت تێ بگەیێنم دەڵێم هەوەڵ حەیواناتن. وەک کەر وەیستر وپاشان ئادەمیزادن، دوایەش بەرزتر لە ئادەمیزاد هونەرمەندن، هەورازتریش‌لە وان مەلائیکەتن. ئێمە ئاغای باکێش هونەرمەندین.

- باشە .. پاشان؟

- باشە ..ئیتر لە بیرت نەچێ کاتێک مردی گیتارەکەشت لە گەڵ خۆت بێنە. منیش کاتێک مردم سێتار لە گەڵ خۆم دێنم. ئاخ باکێشی خۆشەویست، چ دەبوو ئەگەر پێکەوە مردباین؟ هیچ دەزانی کە فرشتەکانیش چەنگ و سێتار لێدەدەن. ئەو دەم دەچینە دەرکی بەهەشت و بۆ سەروکی‌هونەرمەندەکان کە خەڵکی هەرەمە چونکە دە موسیقا ناگەن بە زمانی رەمەکی خۆیان پێی ئێژن (خوا) سازو ئاوازێکی حیسابی بە ڕێوە دەبەین. من گۆرانی بێ‌بزێوە دەڵێم و تۆش بە چەنگ هەوای دڵتەر لێدەدەی. تا سەری سەرۆکیان دەرکەوێ و ئێمەش بەرێتە ریزی سازو چنگ لێدەرانی خۆی.

باکێش پێکەنی و گوتی:« ئەو قسانە چیە دەیانکەی؟ چما مرۆ بێ دەست و قامک دەتوانێ چەنگ و سێتار لێ بدا؟ تۆ دەزانی کە دەست و قامکی مرۆڤ لە ژێر خاک چی‌یان بە سەر دێ.؟

کۆنت لەو کاتەدا کە خۆی دە شنێل وەر دەپێچا گوتی:

- بێدەنگ بە بێچارە! لە ئاخافتنی تۆ موو لە بەدەنم ڕاست دەبنەوە. تۆ پێت وایە ئەو دەستانەی چەنگیش لێدەدەن لە ژێر خاک...؟

- بەڵێ پیرە مێردی مەمانی.. بەڵێ ئەوانیش دەرزن.

میستیگری کە پیاڵەکانی پڕ دەکرد، هاواری کرد:

- کەوابوو گورینە تا ئەو کاتەی دەست و گەورومان هەیە بخۆینەوە. ڕاستی باکێش، ژنەکان چۆن؟ گرم ئەوانیش دەخوا؟

- بەڵێ .. ئەوانیش ...

– ئەگەر وەک ڕۆژیش جوان بن ؟
– بەڵێ .. پاڵەوان میکێلس بیرو ڕای تۆ چیە؟
پاڵەوان تووڕە بوو، نێو چاوانی تێک نا و گوتی:
– باکێش تۆ چەپڵەی لێدە و تۆش میستبگری سەمایە بکە. ئێوە دوو کەس زمانتان نیە
– بە چاوان ..پاڵەوان . میستبگری ڕابوو، دەتگوت هەر ئەوەی لە خوا دەویست. باکێش چەنگی لە سەر ئەژنۆ یان دانا. کاپامبیس دەستی بە چاوانگرت و بەم چەشنە سەماو گۆرانی دەست پێکرا. ڕۆژ بە خێرایی تێدەپەڕی. ژیان بە تەواوی مانا لەو سارداوەدا کۆ ببۆوەو دنیا هیچی دیکە نەبوو. نیوەڕۆ تێپەڕی، خۆر ئاوا بوو شەو داهات.شەمەکان لە نێوەڕاست و لە سەر چەلەنگەکان هەڵکران. کاتێک بەیانی بەردا، میوانەکان بێحاڵ و بێ سەروزمان لە سەر عەرزی کەوتبوون. پەڵەی شەراب و چەوری کەوتبوە سەر کراسەکانیان. ڕەنگیان زەرد هەڵگەڕابوو، دەروودیواریان پیس کردبوو. سەرو قژو هەناسەیان بۆگەنی لێدەهات.

پاڵەوان میکێلس تیت و قنج لە بان سەریان ڕاوەستا بوو. لەگەڵ کازیوەی بەیانی ڕووی لێ وەرگێڕابوون تا نەیانبینێ. بیری لە هیچ نەدەکردەوە. دوێشەو وڕێژبوو هەستی دەکرد کە کەوتۆتە هەڵدێرێکی بێبن. بەرە بەیان ڕۆژی سێ شەمۆ چاوێکی گەرم کرد. هەرتاوێک بەڵام هەر لەو تاوەدا شەیتان خۆی گەیاندیکە تووشی خەیاڵی بکات. لە پێشدا پێی وابوو چۆتە نێو پەڵە هەورێکی بەهاری تێکەڵ بە هەواو شەوغێکی فێنک. لە بەر ئەوەی لە گەماو شەراب و خەم و خەفەتان هەراسان ببوو، خۆی بە دەم هەستێکی خۆش و فێنک دادا. پەڵە هەور کەم کەم شکڵی گۆڕا.گەورە بوو، هاتە سەر شکڵی دمۆچاو کە لێوی هەوەس بزوێنی ژنێک خۆی دەنواند. پاشان دوو چاوی بریقەداری وەحشی وەدیار کەوتن. بەدوای ئەودا دوو لاکی جوانی لە خەنە گیراو ودوو دەستی سپی لە تاریکی هاتنە دەر. لێوەکان بزووتن، دەنگێکی شوشەیی گوێ لێ بوو دەیگوت:
– پاڵەوان میکێلس ...پاڵەوان میکێلس.!

پاڵەوان بە پەشۆکاوی لە خەو ڕاپەڕی. مێزەکەی بە پیاڵەو پۆشقاپ و مزم و کیسە تووتنەوە ئاواڕوو کردەوە. پێنج میوانی نوستو چاویان هەڵێنا. ئێستا تیشکی خۆر ژێر زەمینی ڕووناک دەکرد. کاتێک سەیریان کرد دیتیان پاڵەوان خەریکە قامچی لە بزماری دیوار دەکاتەوە و پەلاماریان دەدا. پاڵەوان وەک شێتان هاواری دەکرد :
– بۆ دەرەوە...بۆ دەرەوە ...لێرە وەدەر کەون، دەستی درێژ کرد و دەرگای سارداوی کردەوە.

کاپامبیس لە پێش هەموانەدا بە بازدێک لە دەرگای پچووک دەرکەوت و ڕایکرد بۆ دەرگای دەرەوە. هێشتا سێ شەمۆ بوو، ئەو زۆر نەجاتی بوو، بێگومان لەو سەعاتەدا کارولیا هێشتا لە خەودابوو. کاپامبیس دوولاکی هەبوو، دواتیشی قەرز کرد و بەرەو لەنگەرگا کوتای. چوارەکانیتر بە دوای یەکدا بە لاکەلاک لە ژێر زەمین دەهاتنە دەر. دمو چاویان لە بەر ڕووناکی ڕۆژ بە ڕەنگی سەوزی دەنواند ودەقولەوە چووبوو. بە سوس و شەراب و ڕشانەوە پیس ببوون.هێشتا مەست و خەواڵو بوون، تەماشای حەسارو چاڵاو ودەرگای حەساریان دەکرد و خۆیان پێ ڕانەدەگیرا. میستبگری بەسەروچاوی گرژ وسمێڵی شۆڕ و جلی شپرێو،لە پێش هەموانەدا دەڕۆیشت.پشتێندەکەی کرابۆوە، دەیویست توندی کاتەوە. بەڵام لە دەستانی بەر دەبۆوەو بە عەرزیدا دەکشا و لە لاکی

پاکێتی دەهالا کە پەدوای ئەودا چەنگ لە سەر شان دەرژیشت. هێندێ دوورتر ئەفەندی دەهات. بەن دێخونەکەی پساپور، بەدەستێک دەرپێکەی گرتبوو، بە دەستەکێ دیکەشی بە توورەیی و مرج و مۆنی بە هاشاڵەکانی دەگوت راوەستن... بۆ کوێ دەچن ؟پاڵەوان میکێلس گاڵتە دەکا.تۆزێ بوێستن، دەبینن بانگمان دەکاتەوە سێ شەمۆ،چوار شەمۆ، پێنج شەمۆ،هەینی، شەمۆ، یەکشەمۆ، هێشتا شەش رۆژ وەخت ماوە.

نەخێر، ئەفەندی نەی دەتوانی ئەم وەزعە قبولێ بکا.ئەوە بێ ئینسانی بوو، راست لەو دەمەدا کە تازە دەهات تێر بخۆن، وەدەریان بنێن. گرناج تەنیا کاتێک تامی هەیە کە مرۆڤ هەتا ملان تێدا نوقم بێ. کاتێک لێی تێر بێ و لە بەری بپژرێ و کەم کەم هەست بە پەشیمانی بکا. گرناج دەبێ کێوێک بێ لە گۆشت بەراز. گۆلێکی شەراب بێ مەلەی تێدا بکەی و نوقم بی تێیدا. دەنا چەند پیاڵە شەراب و چەند پارووە گۆشت و مەزە نابێتە گرناج.

بە قامکان ئەو رۆژانەی دەژمارد کە مابوون.دوو بارە حسابی دەکردن.: و سێ شەمۆ ، چوار شەمۆ ، پێنج شەمۆ.. واتە ئەو هەموو رۆژانە لە کیس چوون.! حەیفو سەت داخ! نا.. پاڵەوان میکێلس نا شتی وا نابێ، ئەو کارەمان لە گەڵ مەکە و دوو بارە بانگمان کەوە! »

وەبزانی یەکێک بە ناو بانگی دەکاو دەستێکی وەپشتێ دەکەوێ. ئەوە دەبێ پاڵەوان میکێلس بێ. لە خۆشیان رووی وەرگێڕا ،بەڵام بیرتولدو بوو دەگریا و باسکی رادەکێشا.

میستیگری گەیشتبووە دەرگای کالسکە رێ. پشتێندەکەی هێشتا بە سەر زەویدا دەکشا.قاچ و باسکی زۆر قورس ببوون.پێی وابوو کە ئەستورتر بوون وئیتر ناتوانێ کەلکیان لێ وەر بگرێ.بانگی کرد :

– کورینە من دەڕۆم و بە ژنەکەم دەڵێم کە دەست و لاقانم باش داماڵێ. هەر چۆنێک بوو شانسمان هێنا کە دەرکەوتین.!

بیرتولدو ناڵاندی،وگوتی:« بۆ کوێ دەچی میستیگری؟ بۆ تەنیا بەجێم دێڵی؟ راوەستە. میستیگری باسکی بیرتولدوی گرت و گوتی: « دەوەرە پچکۆڵەی من! »

بیرتولدو پشتێندی میستیگری گرت کە لە عەرزی دەخشا و بە پارانەوە گوتی:

– من باڵتۆی خۆم بەجی هێشتوە. دەکرێ بچی بۆم بێنیەوە؟ میستیگری وای نواند کە نەیبیستوە. خۆر لە کولاناتی دابوو.دەنگی باربایانیسی کە بۆ فرۆشتنی شتەکانی هەرای دەکرد، لە گەڵ هەرای گوندیەکانو ئەی داری وشک» و هێستریان بە باری قورسەوە وەبەر قامچیان دابوو دەبیسرا.لە نانەواخانەی تولوپاناس، راست لە پێش زاری تەندوورێ، دوو کەشەلی پڕ لە کولیچەی کولجی‌یان دانابوو، هەڵمیان لێ هەڵدەستا. بیرتولدو تەماشایەکی کولیچەکانی کرد و راوەستا. میستیگری دەستی دەگیرفانی سوخمەی راکرد، پارەی وردی هێنا دەر و کولیچەیەکی کڕی و بە دەستەکەی گوت: تۆ بیخۆ من ئیشتیام نیە.

لەو کاتەدا ئەفەندی کە نێوچاوانی بە دیووی کەنگرێ بریندار ببوو، وەک دزان خۆی دەمزگەوت دەخزاند، تا لە سزاداتی دایکی بە دوور بێ. پاکێتیش کە چەنگەکەی لە سەر شانی دانابوو، بە وەنگی پەریو وهەناسە برکە دەچۆوە ماڵێ. خێزان وکچەکانی بە پێشوازیەوە هاتن، باسکیان گرت و لە سەر تەخت درێژیان کرد. لەشیان بە رۆن چرا داماڵی و هەڵمیان دەبەر گێڕا تا

لە نەساخی بە دوور بێ. دەلەرزی، تەواوی لینفەکانیان پێدادا.پاشان نەنە (تیزا)ی دراوسێیان هات، ئیستیکانی لێ گرت. لەم بەینەدا پاڵەوان میکێلس ماینەکەی زین کردبوو، خەنجەری دەسک رەشی دەبەر پشتێ چەقاند بوو، ژنەکەی هاتە حەساریّ تا لێی بپرسێ، بۆ کوێ دەچێ و تکای لێ بکات بەزەیێ بە منداڵەکانیدابێ. بەڵام کە چاوی بە ئێوچاوانی‌گرژی مێردەکەی کەوت، زمانی‌گیرا. پاڵەوان ئاوڕی دایەوە و بە دە نگێکی توند و تووڕە گوتی:« چت دەوێ؟»
- دەتەوێ قاوەت بۆ ساز کەم؟
- دەچم لە مەیخانە قاوە دەخۆمەوە، تۆ بچۆوە ماڵێ.
مادام کاترینا بە شێواوی چۆوە ژوورێ. رینیو ئاگری کردبۆوە چێشتی لێدەنا. دایکی گوتی: « خەریکە بڕوا. ماینی زین کردوە، پێم وایە دەچێتە گەرەکی تورکان و لەوێ سەر خۆش دەبێ و سەرسەریەتی دەکا. ئەو پیاوە دڕندەیە...دڕندەیەکی بە راستی و هیچی لەگەڵ ناکرێ.»
رینیو پێکەنی و بە فیز و ئافەرینەوە گوتی:«دیسان بە سواری دەچێتە قاوەخانەی تورکان!» ئێستا ماین لە دەروازەی دەچوە دەرێ. دەنگی ناڵەکانی دەهات. کە گەیشتە کۆڵانێ حیلاندی. دایک نیشانی خاچی کێشاو لە بەر خۆیەوە گوتی:
- خوا ئاگادارت بێ!
رینیو بە پێکەنینەوە گوتی: « نەت بینی ئەو ئەحمەقانە چۆن رایان دەکرد. من لە پشتێ پەنجەرەوە تەماشام دەکردن. بە دوای یەکدا دەر دەپەڕین ، وەسەریەک دەگەڕان و دەیان ناڵاند. هەموویان پیس و پۆخڵ بوون. دەتگوت مشکی نێو هیزەی رۆنێن. تەنیا باوکم سەر خۆش نەبوو. ئەو خەمناک دەهاتە بەر چاو. قامچیەکەی لە حەوا هەڵدەسوڕاند. دایە تۆ بۆچی هەناسان هەڵدەکێشی؟ دەتویست مێردەکەت وەک پیرتولدو یا پاکیش بایە؟ دایە دڵنیا بە کە تۆ بەختت هەیە.»
- دەکرێ مرۆڤ هەم ئاقڵ بێ و هەم باوکێکی باش بۆ خاو وخێزانی. هەم سەر سەریش نەبێ.
رینیو لە قسەکانی لێوی دەکرۆژت ،گوتی:
- دیارە دەکرێ. بەڵام من نە باوکی باشم خۆش دەوێ، نە چاوەش. من پاڵەوانم خۆش دەوێ.

* * *

پاڵەوان پولیکسینگیس بە پێش کانی (ئیغومنە)دا تێدەپەری و عەلیاغاش کە قەرتاڵەیەکی قورس و گەورەی لە سەر شانی بوو، بەدوایدە دەهات.پاڵەوان دەچوە ماڵی وانگلیوی خوشکەزای تا دیاری بووکێی بداتێ. دوو رۆژ بوو پاڵەوانی ئێمە ئیتر ئەوەی پێشوو نەبوو. دە تگوت بوولەرزە مێشکی لەقاندوە. تەواوی رۆژ بێ خەو خواردن و خواردنەوە بە کۆڵانانا رایدەگرد. تەنیا سیغاری دەکێشاو جارویاریش وەک گامێشێکی نەخۆش پشوی دەدا. لە نێو شاردا دەهات و دەچوو. بەڵام لەو گەڕانەدا بێ ئەوەی جارێکیش بە هەڵە بچێ، رێگای دەکەوتەوە پێش خانوە سەوزی گۆرین. لەوێ رادەوەستا. ئەندازەی بەرزی دیوارەکانی دەگرت. هەڵدەستا سە پەنجەی پێ، دەتگوت دەیەوی خۆی بۆ فڕین ئامادە بکا. پاشان دوور دەکەوتەوە، دەگەڕایەوە، دیسان دەگەڕایەوە.
بۆ ئەوەی کەس شکی نەکا، دەچوە دوکانی کابرای تورک، شتێکی دەکڕی. ئەو لە

(سێخوشکان) دەترسا. لە پێشدا لە خۆی دەپرسی کە ئەو هەموو شتەی بۆ کڕیوە. پاشان وەبیری هاتەوە کە وانگلیوی خوشکەزای بەو زووانە مێردی دەکا. هەرچی کڕیبووی خستبە قەرتاڵێکەوەو هاویشتبە سەر شانی عەلیاغاو لە گەڵ ئەو پیرە کورتە بالآیە بۆ گەرەکی پاڵەوان میکێلس کە ماڵی وانگلیویش لەوێ بوو کەوتە ڕێ. کاتێ لە کانی ئیدومنە تێ پەڕی تووشی پاڵەوان میکێلس بوو کە بە سواری دەهات. چاوی لە ژێر ڕیشووی پێچەکەی دا شاردرا بوونەوە و قامچی بەدەستەوە بوو.

پاڵەوان پولیکسینگیس واقی وڕما و ڕاوەستا. ئەو دەیزانی کە لە بەیانی یەکشەمۆوە هەوتووی ئارەقخواردنەوە لە ماڵی پاڵەوان میکێلس دەست پێکراوەو تازە ئەوڕۆش سێ شەمۆیە. داخوا ئەو میوانەکانی زووتر لە کاتی خۆی وەدەر ناوە؟ بەو جۆرەی ئەو دەڕوا دەچێ خۆی دەزاری گورگ باوێ. دەیەوی بە تووڕەکردنی پیرە تورکان لە قاوەخانەی تورکان کەیفێ بکا. سەری ڕاوەشاند و لە بەر خۆیەوە گوتی: « ئەو پیاوە ڕۆژێک تاوانی‌کەللە کەری خۆی بەگران دەداتەوە وکاندی یەکێک لە کۆڵەکەکانی مەسیحیەتی لە کیس دەچێ. » بەلأم کێ دەتوانێ زات بکا بیشکێنێ؟ نە خوداو نە شەیتان.خودا خۆشی لەو کەسە دەترسێ کە لە مردن ناترسێ! »

پاڵەوان میکێلس نیزیک بۆوە، کە چاوی بە پاڵەوان پولیکسینگیس کەوت، ڕکێفی لێدا. نەیدەویست بیدوێنێ. ئەو بێ مێشکە بە پێکەنین وگاڵتەو بەو ژیانی پڕلە عەیش و نۆش دەمارەکانی ئەوی ورد کرد بوو. ئەو لەو کەسانە بووکەبەیانی لە خەو ڕادەبن و قیتو لێدەدەن و گۆرانی دەڵێن. پاڵەوان میکێلس لەو کارانە بێزار بوو. هەموو جارێ کە کریت دەشێوا، ئەم دوانە دەستی یەکەتیان دەدا دەستی یەک. هەموو جارێ کە خاچپەرستەکان ڕادەپەڕین، ئەوان دەبوونە دوو دۆستی گیانی. چونکە هەر تک پاڵەوان و پێشڕەو بوون. بەر پرسی هەزاران کەسیان بە ستۆوە بوو. بەلام کاتێ ناخۆشیەکان تەواو دەبوون، ئەوان یەکتریان نەدەناسی. پاڵەوان پولیکسینگیس دەیگوت:« کابرا ورچە ،من ئەو جۆرە پیاوانەم خۆش گەرەک نیە» بەڵێ، کاتێ پاڵەوان میکێلس چاوی بە پاڵەوان پولیکسینگیس کەوت، ماینی وەغار خست تا نەیدوێنێ.

پاڵەوان پولیکسینگیس لە توندوتیژی هاوکاری خۆی ناڕەحەت بوو. لەوە ترسا تەکا هاوڕێکەی خەریکی پیلانێک بێ کە ناکامی بۆ دنیای خاچپەرستی زیانی هەبێ. وەسەر خۆی نەهێناو چوە پێش و بۆ ئەوەی ڕێی لێ بگرێ، باسکەکانی لێک بلأو کرد و گوتی:

– پاڵەوان میکێلس وا بەو بەیانیە بۆ کوێ دەچی؟

پاڵەوان میکێلس لە کاتێکا ئاگری لە چاوی دەبۆوە. بە بۆڵە بۆڵ گوتی:« لە سەر ڕێگای من لاچوو ، دەنا ماینەکەم وەبەر پێت دەدا. »

بەلأم پاڵەوان پولیکسینگیس هەروا بێدەنگ بە باسکی ئاواڵەوە لە نێوە ڕاستی کۆلأنێ ڕاوەستاو گوتی:

– برام بە عبسات سوێند دەدەم هێزی باسکی خۆت بە فیرۆ مەدە. تۆ یەکێ لە کۆڵەکەی مەسیحیەتی. کریت لەسەر تۆ حیساب دەکا. تۆ هەقت نیە بۆ ژیانی خۆت تەکلیف دیاری بکەی. ئەوە مافی کریتە.لەوانەیە بەو زووانە کریت پێویستی بە تۆ هەبێ.

پاڵەوان میکێلس هەرگیز بە قەد ئەو دەمە لەو پیاوە بێزار نەبوو. شەوی پێشوو کە

مبستیگری توانیبووی تاوێک لە ساردخانە بچێتە دەرو سەرێکی مالی خۆی بداتەوە، لە زۆر بلێی مادام کراسوگئورگیس لە شەیتانی تازەی پالەوان پولیکسینگیس لە گەرەکی تورکان ئاگادار ببوو. کاتێ گەڕابۆوە بۆ سارداو، حکایەتەکەی بۆ پالەوان میکێلس گێڕابۆوە. پالەوان هەرچەندکە ویستبووی وەسەر خۆی نەهێنێ، بەلام خەنجەرێکی‌وە دلی کەوتبوو .ئیتر خۆی پێ ڕانەدەگیرا. لە سەر سواری داهاتەوە و لە ڕقان لێوی سپی هەلگەڕا بوون.گوتی :

– تۆ بچو خەریکی ژنە بەفالەکان بە. لە منیش گەڕێ ئەگەر ویستم با بچمە قاوەخانەی تورکان و کێشە ساز بکەم.

پالەوان پولیکسینگیس لەو قسانە تێنگچوو، ڕەنگی سور هەلگەڕاو گوتی:

– لە کاتی ئاشتیدا خەریکی ژنان دەبم، لە کاتی شەڕیشدا پیاوان دەکوژم. بە لای منەوە پیاوەتی هەر ئەوەیە. پاشان ڕووی کردە عەلیاغاو گوتی:« تۆ بڕۆ خەریکی کاری خۆت بە.ئەو قەرتالەش بەرە مالی وانگلیو. خۆشی هەنگاوێک چوە پێش، دەستی بە سینگی گەرمی ماینەکەوە ناو هەوای زاری تۆزێ نەرم کرد و گوتی:

– پالەوان میکێلس بەر خودایەت سوێندەدەم، پێم بێژە من چیم لەگەل تۆ کردوە، ئاوا بە نارەحەتی چاوم لێ دەکەی؟ چاو لێکردنەکەت ئەوەندە دەم‌پێە شێنێ هەر دەلێی تورکم.

پالەوان میکێلس جارێکی‌تر ڕووی وەرگێڕاو بە گرژو مۆنی گوتی:

– گوتم لادە، دەنا ماینەکەم پێت لێدەنێ .

پالەوان پولیکسینگیس دووبار پێی داگرت و گوتی:« من چم لە تۆ کردوە، بۆ ڕووت لە من وەردەگێڕی؟ »

بۆ جاری سێیەم پالەوان میکێلس گوتی: « لاچوو، دەنا ماینەکەم بە سەرت دا بازد دەدا. »

– کەس ناتوانێ لە گەل ئەخلاقی سەگانەی تۆ ڕێک کەوێ.مرۆڤ نازانێ لە گەل تۆ بلێ چی.؟

پالەوان میکێلس ڕقی هەستاو ڕکێفی لە مایێ داو گوتی:« ئێمە هەر ئەوەین کە هەین، پالەوان خانم! »

ماین دەرپەری بۆ پێشەوەو نیزیک بوو پالەوان پولیکسینگیس وەبەر خۆ بدا. پالەوان سەری سمێلی بە زاری گرت و لە بەر خۆیەوە گوتی:« ئەگەر خاچپەرست و پێشڕەو نە دەبوی، دەمزانی چیم لە گەل دەکردی.! بڕۆ ئەی شەیتانی هەوسار پساو.» بۆ ئە هێشتنی شوێنەواری ئەم تووشبوونە ناحەزە، سێ تفی لە عەرزی کردو پاشان بۆ لای مالی خوشکە زای کەوتە ڕێ.

* * *

وانگلیو لە پشت دەزگای جۆلایی دانیشت بووخەریکی چنین بوو. دەیویست‌لە پارچەیەکی کەتانی دەربێی‌یەک بۆ مێردەکەی و کراس خەوێک بۆ خۆی بچنێ. لە بەر تووڕەیی و نارەحەتی بە دەستی لەرزۆکەوە دەزووی لە مەکۆی دەهالاند. بە تالوکە بوو. چونکە ڕۆژی گوێستنەوەی وەنیزیک دەکەوت. لە دنیای خەیالدا مێردەکەی دەبینی کە وەک جانەوەرێکی توکناوی و ڕەش و قوڕاوی خۆی داوێتە سەر و ئەویش لە ترسان وەک گلۆلە خۆی خڕ کردۆتەوە. مێردکردن بۆ ئەو جانەوەرێکی بێزراو بوو. مێردەکەی بەو چاویلکەی پێنس وبە دەنگی وەک قەشەو بەو نەرمی‌و

میهرەبانی دڵرفێنی، لە بەر چاوی ئەو گیان لە بەرێکی تاسک نارنجی بوو. داخوا هەر بۆیە لە دایک ببوو کە شو بە ناقۆڵایەکی ئاوا بکات؟ داخوا ئەو هەموو ساڵە خواردبووی و خوارد بوویەوە تا ڕۆژێک ببێتە ژنی کابرایەکی ئاوا؟ داخوا بۆ ئەو مەمکی خڕ کردبوون و سمتی ئەستور کردبوو؟ پاڵەوان پولیکسینگیسی خاڵی هەمیشە پێی دەگوت:« وانگلیو مێردی پێ بکە. مێرد وەک لێفەی توک وایە، ئینسان دەپارێزێ.» بەڵام ئەو دەیویست بە ئەهرەتەیەک حەوت ئاسمانان بقەڵێشێ و بە سەرخۆدا بنەڕێنێ و بڵێ:

- ئامەوێ... من ئامەوێ! چەند ساڵبوو خەونی بە لاوێکی جوانچاکەوە دەبینی کە شنێلێکی ماهوتی بە سەر شانی داداوە، لاوێکی شەڕوان و یاری شەراب و ژن و خەنجەرە و بێ حیساب خەرج دەکات. ڕاست وەک (دیاماندیسی) برای. بۆچما چەند جار کە لە بن پەیکەری پیرۆز چرای هەڵدەکرد، لە بەر ( سن نیکولا) کە جیاز دەدا بە کچی هەتیو، و لە (سنفانوریوس)کە ئیلهام بەخشی لاوانە ئە پاڕابۆوە تا مێردێکی ڕاست وەک براکەی بە نسیب بکا؟ مێردێکی وەک براکەی. نەک مرۆڤێکی وەک خاڵی ناقۆلاو زاو شڕ! نەک وەک پاڵەوان میکێلس کە بۆنی گوگردی لێ دێ و لە سەر ڕێگا، هەموو کەس، تەنانەت سەگیش لێی دەترسێن. ئەو مێردێکی ئاوات بوو وەک دیاماندیسی برای جوان و باڵا بەرز وسینگ پان ڕیتمو. ئەگەر وانەبا، هەزار کەرەت باشتر بوو بێمێرد بایەو لە پەنا براکەی ژیا باو پیر بوبایە. براکەشی قەت ژنی نەدەهێنا چونکە ژن جوانیی‌قەدوباڵای‌نەدەهێشت.هەرتک پێکەوەدەمردن، هەرتکیان پێکەوە دە قەبری دەنانو لە سەرگڵکۆیەکەیان دوونەمامی ئیتر ومێیان دە چەقاند و ڕەگ و ڕیشەیان لە ژێر زەوی تێکەڵ دەبوون.

بەڵام پاڵەوان پولیکسینگیسی خاڵی دەیویست هەر چۆنێک بێ شو بە چسگورگی برای پاڵەوان میکێلس بکا. لەو بارەوە دەیگوت:« تۆ دەچیە ماڵێکی بنە ماڵەو ڕەسەن. یەکێک دەبێ ئاگای لێت بێ».

چونکە دیاماندیسی برای تەواوی باخی زەیتون و ترێی کە بە میرات بۆی بە جێ مابوو فرۆشتبووی و قووتی دابوو. ئێستا بۆ جیازی خوشکی بێنجگە لەو خانوە پچوکەی تێیدا دەژیان هیچی دیکەی نەمابوو. تا چەند مانگی تر بێگومان ئەویشی لێدەداو ئاوێکی ساردی لە سەر دەخواردەوە. ئەو دەم چدەکرا ؟

وانگلیو هەروا کە جزڵێی دەکرد، لە بەر خۆیەوە دەیگوت :« هەموو خەتای خاڵمە. ئەو بەزمی ساز کردوە ومنی مەجبور کردوە کە بێژم بەڵێ. ئەگەر خوا داد پەروەرە.ئەوا تۆڵەی لێ دەکاتەوە. ئەگەر داد پەروەریش ئیە، ئەوا ئاهی قەیرە کچ وەک کارەبا دەگرێ، ئەویش دەگرێ و دەیسوتێنێ...»

پاڵەوان پولیکسینگیس پالی بە دەرگاوە ناو هاتە ژوورێ. بانگی عەلباغای کرد کە لە دەرێ بە کزڵەوە ڕاوەستا بوو. هاتە ژوور و کزڵی لە عەرزی دانا. لە کاتێکا بە پێکە نینەوە مەجیدیەکی دە بەری دەستی دەنا گوتی:

- عەلباغا ئیتر تۆ برۆ، ئیشەڵا بۆ داوەتێ .....

کابرای تورک هەر لە هەوا قۆزتیەوە و توند لە دەستی گرت و دەتگوت داعبایەو دەترسێ

بفرێ، پاشان داهاتەوە کە دەستی پاڵەوان ماچ بکا، بەلام پاڵەوان بە پێکە نینەوە دەستی کێشاوەو گوتی:

– چەدەکەی عەلیاغا، خۆ من خەلیفەو ئیمام نیم. چوە حەساریٰ. سەگی ماڵەکە لە قوژبنێک وەرکەوتبوو، هەستاو بۆنی پێوە کرد و کابرای تاسی و دیسان وەر کەوتەوە.

پاڵەوان پولیکسینگیس لە دەرگای ئاواڵەی ژوورەکەوە دەزگای جۆلاێی دیت کە هەر وەک پاپۆڕی چەکدار و یا وەک جانەوەری رام و بێ ئازاو بە دەست و پێ بە زنجیرو رابەلْ و بۆوە خۆی نیشاندداوە.

وانگلیو ئاوری داوە خاڵی بینی، تەواوی توانای خۆی لە بزەیەکی رواڵەتیدا کۆ کردەوە کە بۆ بە خێر هێنان تەحویلی بدا، بەلاّم لە لیچ و لێو و چەنەگەی بێزاری دەباری. کچەتیو هەروا دەموچاوێکی زەردەڵەی هەبوو، رووگرژو کەم دوێ بوو. دیار بوو خەفەتێکی نهێنی لە ئاخیدا کزبۆتەوە و چەند ساڵیوو هەر چی دەیانکرد نەدەهاتەوە سەر خۆ. وردە وردە بەرەو توانەوە دەچوو. رەنگی زەردو سنگی بلْ دەبوو. بە دوای پاڵەواندا عەلیاغا بە قەرتاڵەوە هاتە ژووریٰ. وانگلیو تێگەیشت، ویرای سەیرکردنی قەرتاڵەکە گوتی:

– خاڵە ژۆرژ منت خەجاڵەت کرد.! بەلام لەگەڵ دیتنی شتومەکی ئاشپەزخانە تۆزێ گەش بۆوە. پاڵەوان گوتی:

ئینسان لە ژیانی خۆیدا پتر لە جار ێک شووناکا. کەواتبوو لەچەری بەزیادتەبیٰ. وادیارە وانگلیوی خۆشەویستم، لەو جیهانەداله مێرد کردن خۆشتر نیە.» وانگلیو گوتی : « وادیارە . پاشان بێدەنگ بوو..»

پاڵەوان لە سەر تەختی دانیشت. کڵاوەکەی کە بە ئارەقە تەڕ ببو، لە سەر لێوی پەنجەرەی دانا. وانگلیو تەژنۆی داوان ودەستیکرد بە قەرتاڵە بەتاڵکردن. ژوورەکە پڕ برر لە قاپ و قاچاغیمسو کەشەفەو مەسینە، شتیتر. لە کاتێکا بە سەریاندا خوار ببۆوەو تەماشای دەکردن، کەم کەم رەنگی دەهاتەوە بەر وگەرم دەبۆوە. ئاخرەکەی بە سەری زمانی گوتی:

– زۆر سوپاس خاڵە. تۆ لە جێی باوکمی. خوا بتپارێزیٰ.

– وانگلیوا تۆ ئەو قسەت هەر سەر زارەکی کرد. ئاخر رۆڵە ی من تۆ بەو زوانە دەبی بە بوک. بەلاّم دەبینم هەر ئێستا تینت هەستیٰ و بگری. تۆزێ سەرت هەڵێنە با بتبینم.. یالاٰ کچم، پێبکەنە، بقیژێنە تا بێیەوە سەر خۆ. تازە بووک کاتی جلی بوکێنی لەبەر دەکەن، گۆرانی دەڵێن و خانوو وەلەرزە دەخەن. تەواوی گەڕەک دەجولێنن. دەڵێی بوولەرزە هاتوە.وەک من لە بوکیٰ دەگەم دەبیٰ وابیٰ. بەلاّم تۆدەڵێی‌کفنی خۆت دەدرووی.

وانگلیو لە پرلە جێ رابوو. قسەکانی خاڵی نارەحەتی کردبوو. دەسگیرانەکەی وەبیر هاتەوە. داخوا دەبوایە بۆ ئەو دم وچاوە گۆرانی بڵێ کە دەتگوت بنێشتی جاوراوە.؟ زاری تاڵْ بوو. ویستی زار بکاتەوەو هەرچی‌دە دڵیدایە هە لیڕێژێ. ئاخر بڵێ چی؟ تازە ئیتر کار لەکار ترازاوە. لە بەر خۆیەوە بیری کردەوە کە:«ئەگەر بەختەوەری بۆ هاوار دەکەی؟ ئەگەر بەختەوەر نی، کەس دەفریات ناکەویٰ. کەوابوو باشترە هەر بێدەنگ بی...»

پاڵەوان پولیکسینگیس لە خەم و بێدەنگی خوشکەزای سەری دەر نەدەکرد. رۆژی شایی وە

تیزیک دەکەوت. لە رۆژی جێژنی پاکدا مارە دەکرا. کاتی ئەوە هاتبوو کە راست و رەوان ئاکۆکی خۆی لەگەڵ وانگلیو چارە سەر بکا. پاڵەوان باش هەستی بەوە دەکرد کە لەو رۆژەوە بە دەسگیران کراوە، ئەو کیژە بە خەراب چاوی لیندەکا ولە تەماشای هەر سەرکۆنە دەباری. لەگەڵ ئەوەش چەند هەوڵی دابوو تا توانیبووی چس‌گورگ بۆ هاوسەری ئەو رازی بکا. تەنانەت رۆژێک پێنج سکە تاڵتونی بیست پۆندی لە سندوق دەرهێنا بوو، دابووی بە چس‌گورگ و گوتبووی:

- جەنابی مامۆستا اوەرە ئەو سەت پۆندە وەک جیازی خوشکەزاکەم وەرگرە، بەلام نابێ هیچ کەس بزانێ. نە پاڵەوان میکێلس ونە خوشکم و نە دەسگیرانت. بەو هۆیەوە ئەوە خوشکەزاکەم بە جیازەوە دا بەتۆ. لەم ڕێگایەوە توانیبووی چس‌گورگ رازی بکا. ئێستا خوشکەزای نازی دەکرد و لە داخان لێوی دەکرۆتن. وەهای نێو چاوان تێک نابوو. دەتگوت بە تۆزی تاڵاویان بە زاری داکردووە،رەنگە ویستبی بیدەن بە شازادەیەک.

وانگلیو فنجانێک قاوە و لیوانێک ئاوی سارد و پیاڵەیەک مورەبیای ئاڵوباڵوی لە سەر کەشەفێک داناو لە مێتەق هاتەدەر و لە پێش خاڵی دانا. پاڵەوان پولیکسینگیس گوتی:

بێژە بزانم ، دیاماندیس هێشتا نەهاتۆتەوە ماڵێ؟ ئەو کورە ئارەقخۆرە دیسان شەوانە دەردەکەوێ؟

وانگلیو بە فیزێکی تایبەتیەوە لە وەلامدا گوتی: « ئەو گەنجە جوانچاکە هەقی خۆیەتی. »

- هەقیەتی! کام هەق ؟ بەلام تۆ لە بیر خۆت مەبەوە کە هەر ئەو کورە تۆی ماڵوێران کردوە.

- ئەو منی ماڵوێران کردوە ؟ بەلام ئەگەر ئەو نەبایە، من تا ئێستا خۆم کوشتبوو. من چ لەو ژیانە دەکەم. خاڵە چت لێ وەشێرم. من ئەگەر ئەو تۆقە لەعنەتیەی تۆ لە ملت کردووم. قەبوڵی دەکەم و بە قسەت دەکەم، تەنیا بەو هیوایەیە کە دوای شووکردنیش لە برام جیا نابمەوە. ئەگەر وانەبێ مردوو شۆر ......

پاڵەوان لیوانی ئاوەکەی بە زاریەوە نا، تینی خۆی خواردەوە و ماوەیەک خۆی بە مورەبیا خواردنەوە خەریک کرد، تا دەست درێژ نەکا، پرچەکانی بگرێ و سەری لە دیواری بدا.ئاخرەکەی لە کاتێکا لە داخان سمێڵی دەکرۆت، گوتی:

- شەرم ناکەی ! ئەو برای تۆیە، خۆ قاسقی تۆ نیە ، لێی گەرێ با بۆ خۆی ژن بێنێ و خاو وخێزانێک دروست بکا، مەیخانە گەڕان لە بیر بەرێتەوە.

وانگلیو لە سەر کورسی رابوو، لە قینان روومەتی سوور هەڵگەڕا بوو، قیژاندی و گوتی:

- من نامەوێ گوێم لەو قسانە بێ بیبڕەوە ئیتر.

پاڵەوان پولیکسینگیس حەپەسا... پاشان گوتی:

- چت لێهاتوە وانگلیو ؟ واتە تۆ براکەت لە مێردت خۆشتر دەوێ. بە راستی شەرمە. بزانە من ئەو هەموو زەحمەتەم بۆ کێ کێشاوە...

وانگلیو دانی دەچیرەوە بردو گوتی: « خاڵە ژۆرژ ! تۆ منت بە پارەو نانێک فرۆشتوە. »

ئیتر پاڵەوان دەرهەڵ بوو، بە توندی هاواری کرد :

- بە پارەو نانێک ؟ تۆ پێت وایە پارەو نانێک شتێکی کەمە شازادە خانم ؟ تۆ پێت وایە بەم وەزعە خۆشبەختی ؟ لەعنەت لە شەیتان! ئاخر خوازبێنی کەرانی تۆ دڵ بە چی خۆش کەن ؟ بە

جوانیت، بە شۆخ و شەنگیت، بە ماڵ و سەروەتت ، بە چیت ؟ ٣٥ ساڵ لە تەمەنت تێ پەڕیوە. چرچ و وشک بووی، پێستت وەچەرم دەچێ و سمێڵت هاتوە. ئەو برا بەرەڵایەت داروندارى بۆ خواردووی، کۆنە حەسیری بۆ راخستووی. کێ دڵ دەدا بە چارە رەشی وەکی تۆ ؟ئێستا خوا چەسگورگی گرتوە ویۆتە داخوازت، هێشتا قسەش دەکەی ؟

وانگلیو دەستی بە دم وچاوی گرت و لە پرمەی گریانیدا. پاڵەوان سگی پێ سووتا، چۆن توانیویە ئەو قسە ناحەزانەی پێ بڵێ؟ ئێستا دەبوایە چبکا؟ ئەو کیژە فەقیرە چۆن دڵبداتەوە ؟ دەستی هاویشتە سەر قژە خەفەتاویەکانی و گوتی:

- هێندی بەوە وانگلیوا مەگری، بە لوتفی خوا هەموو شت چاک دەبێ.ئەو پیاوە کوڕێکی باشە. تۆی خۆش دەوێ. دەبینی کوڵمەکانت پڕ دەبنەوە. رەنگو رووت ئاویان تێ دەگەڕێ. دووبارە وەگیان دێیەوە. جگە لەوانە منداڵیشت دەبێ.

وانگلیو کە بە نارەحەتی ئەسرینی دەسڕینەوە گوتی: « ئاخ..ئاخ ...منداڵەکانی چەسگورگ...!

- ئەوان تەنیا منداڵی چەسگورگ نابن. خوێنی تۆش دە رەگیاندا دەبێ. لەوانەیە وەبرات بچن. وانگلیو لەرزی، خوێن بە سینگە چرچەکەیدا کەوتە رێ و گوتی:

- بیبڕەوە ئیتر....

پاڵەوان رابوو کە خوشکە زای بلاوێنێتەوە. بەڵام دەستی راگرت و گوتی:

- وانگلیو ! رۆژێکی دیکە لەو بارەوە قسان دەکەین. من دەڕۆم. نامەوێ تووشی براکەت بم .هیچ پێم خۆش نیە بیبینم. کڵاوەکەی بە لاری لە سەر ناو نامادەی بزوتن بوو، دەرگا کرایەوە.دیاماندیس برای وانگلیو بە نێو چاوانێکی گرژ ومۆن، لە کاتێکا چڵە ریحانێکی سیسی لە پشت گوێچکەی دانابوو، سیغارێکیش لە پشت گوێچکەی دیکەی، کڵاوی لبادی هاویشتبوە سەر شانی لە دەرگا وەژوور کەوت.هەر چاوی بە خاڵی کەوت نێو چاوانی تێکناو گوتی:

- ئەو کابرایە دیسان بۆ دەلاڵی هاتوە، با بڕوا جەهەندەم بێ.کڵاوەکەی داکێشا، بەلادادەهات، هاتە ژوور و لە قاپێکی مس هەڵدنگوت. دەستیکرد بە جنێوان.

پاڵەوان رووی لێ وەرگێڕا. چونکە نەیدەتوانی بە بێ تووڕەیی و بێزاری تەماشای بکا.بە تەوسەوە گوتی:

- مرۆڤی راستە قینە شەراب دەخۆنەوە، بەڵام سەر خۆش نابن. لە من فێر بە! پیاوی پیاو وەدوای ژنان دەکەون، بەڵام نابنە دەلقەگ. ئەوەش لە من فێر بە.

دیاماندیس لە خاڵی بێزار بوو. دەیزانی چبکا جارێکی بسوتێنێ. بە شەیتانی لە قاقای پێکەنینی دا.زمانی دەگیرا ، بەڵام توانی بە منگە منگ بڵێ:

- مرۆڤی راستە قینە شەراب دەخۆنەوە و سەر خۆش نابن، ئەوە راستە. بەڵام پاشان ناچن دەلیڤەو دۆشەگدا بنوون، بەڵکوو ماینەکەیان زین دەکەن و رمبازی دەکەن . دەڕۆن، بەڵام ناچنە کن ژنان، دەچنە قاوەخانەی تورکان، لای تورکی دەپیر. لە پاڵەوان میکێلس فێر بە ..!

پاڵەوانی ئەنگاوت، تا ناخی دڵی سوتاندی. بەڵام باش ئاگادار بوو کە لاوی سەر خۆش هەقیەتی. لە کاتێکا بۆلای دەری دەچوو، گوتی :

- بێ تەربیەت، ئەو دمە پیسەت لابە. بە بێ شەرمی جیازی خوشکت بە ئارەق دەدەیو

سەعات و زنجیری ئاڵتونی پێ دەکری. بەو قەدو قەلافەتەوە نازانی سەعات چەندە. تۆ بە کاری چی دێی خوێری ؟

دیاماندیس قیژاندی، ویستی بەسەر کەشەف و ئافتاوەی مس‌دا تامبازی خالی بێ. بەلام لاقی خلیسکاو توند وەعەرزی کەوت. پاڵەوان بە گاڵتەو لاتاو قاقا پێکەنی‌و لە کاتی دەرچووندا گوتی:

وانگلیو تۆ زۆر شانازی بەو برایەت دەکەی !

بەڵێ خاڵە ... من دەتوانم شانازی پێوە بکەم و تا هەم هەر شانازی پێوە دەکەم. پاشان بە سپایی دیاماندیسی راست کردەوەو بردی لە سەر تەخت درێژی کردو بە نەرمی و خەمخۆری دەیلاواندەوە !

* * *

نیوەرۆ تراساکی پەشێو و پەرێشان لە مەدرەسە هاتەوە.لە کاتێکا کلاوی سووری کە خوشکی بۆی چنیبوو، بۆ هەوا هەڵداویشت و دەیگرتەوە،هاواری کرد:

– دایە..دایە! ماینی باوکم بەسەر سەنگ فەرشی شەقامدا دەڕۆیشت و ئاگری دەپرژاند.من لە شەقامی گەورەدیتم. دواوی دوکاندار هاتبوونەدەرو تەماشایان دەکرد. یەک لەوان گوتی : «پاڵەوان دەچێتە گەڕەکی تورکان . »

یەکی دیکە گوتی : « لە گەڕەکی تورکان دەگەرێتەوە »

من لە سەر رێگا راوەستام. کلاوم هەڵگرت و سلاوم لێ کرد، بەلام ئەو منی نەدیت .دەزانی لە سمی ماینەکەی ئاگر هەڵدەستا؟ دەوەرە بزانە...

دایک لەو هەموو تاریف و سەرسوڕمانی کوڕەکەی ترسی لێ نیشت و گوتی :

– ئاغا پاراسکەواس هاتبوو شکایەتی دەکرد. وەک بزانم دوێنێ لە گەڵ هاڤالانت چوون کیژەکەی ئەوتان رفاندوە. تۆ شەرم ناکەی ؟ تراساکی لە قاقای پێکەنینی دا. دایکی دووبارەی کردەوەو گوتی :

– بۆ چی ئەوەتان کردوە ؟

کوڕ شانی هەڵتەکاندو گوتی:وەهەروا ، لە خۆوە. ئەمڕۆ دەمانویست ئەو بەلایە بەسەر چگورگ بێنین. بریار وابوو لە پشت دەرگای گلاس خۆ وەشارین و بە کەمەند بیگرین.دەڵێن ئەسپی وەحشی بە کەمەند دەگرن. ئەو خۆی بە ئێمەی دەگوت‌کە ئێمە راوچی بووین و ئەویش ئەسپی وەحشی.

دایک هاواری کرد و گوتی :

– هەی سەر سەری بەرەلا..! ئاخر ئەو پیاوە قەقیرو نیماندارە چی لە ئێوە کردوە؟ بۆ چی دەتانەوێ بیکوژن ؟

– نا دایە خۆشمان دەوێ تەنیا گاڵتە دەکەین. کەمەندەکەی ناکێشین. تەنیا دەمانویست بیترسێنین و بزانین چەندکا؟

تەنافێکی تایبەتی لە خۆی کردەوەو لە پەنا عەمباری ئاوێ لە جێگای خۆی داناوە. پاشان

مستی کردە گریێ و وەک باوکی برای تێکنان و گوتی :« لەوەدەم دا هاڤاڵە خوینیەکانم هەڵاتن، زۆریش بوون، بەڵام دەترسان. ئەی ئاکا.. جارێکی دیکە ژمارەیەکی کەمتر لە گەڵ خۆم دەبەم ولە نێو منداڵە باشەکان هەڵیان دەبژێرم. لە وانەیە خۆشم بە تەنیایی پێمبکرێ.

لەدەرگاپاندا. عەلیاغا بوو هاتە ژوور و گوتی:« مادام وا ئەفەندی دیسان شێت بوە و کەوتۆتە گەردکی یونانیان و ئێستا دێتە ئێرەو دەرگای لێ مەکەوە.»

هێشتا عەلیاغا قسەکانی تەواو نەکرد بوو، ئەفەندی بە قوورە قووڕ خۆی دەحەساریێ هاویشت. کاترینا کە دیتی بەزەیی پێدا هات. بەد بەختە ئەوەندە گریابوو چاوی سوور ببوون. جلەکانی شڕو هەڵدراو، دەربیجاوەکەی دیار بوونە دەتاسراوە. مێزەری داکەند بوو، سەرە کەچەڵەکەی ئەرسی ئێبهەڵسوو بوو، بزگەنی دەهات. لە نێوەراستی حەساریێ چۆکی دادان و بە ناڵینەوە گوتی:« من گوناحم کردوە. بەڵێ گوناحم کردوە. گۆشتی بەرازم خواردوە. شەرابم خواردۆتەوە، کوفرم کردوە. ئەی خەڵکینە لێم خۆش بن، تا خوداش بمبەخشێ! ئەی مادام کاترینا! ئەگەر رۆژێک خودا لە تۆی پرسی، پێی بێژە کە پاڵەوان میکێلس بە زۆری گۆشت بەراز و شەرابیدەرخواردی من داوە.

لە سەر چۆکان بۆلای کاترینا دەچوو دەستی ماچکاو دەیگوت :

– خانم رەحمم پێ بکە. من کەوتوومە نێو کۆڵانان تا ریسوایی خۆم بە هەموان رابگەیێنم. ئێستا لە تۆوە دەست پێدەکەم. پاشان دەچمە بەر دەرکی پاشا و هاوار دەکەم. دوایە لە گەرەکی تورکان دەچمە بەر هەموو ماڵێک، تا هەموو کەس سەری روت و بێ تۆکم ببینێ و لە کردەوە پیسەکانم ئاگاداربێ و تفم دەرووی بکا. بەڵام بەر لەهەموو کەس بروا بە تۆ دەکەم. کاتێک خودا لە تۆی پرسی، بڵێ پاڵەوان میکێلس بە تۆبزی گۆشت بەراز وشەرابی دەرخوارد داوە.»

تراساکی پێدەکەنی و تەماشای دەکرد. بە دزی تەنافەکەی هەڵگرتبو، گرێی دەدا. رینیو لە ئاشپەزخانە هاتە دەر کە چاوی بە ئەفەندی کەوت ئەویش وەک براکەی پێکەنی. کاترینا هەستیکرد کە چاوی پڕلە ئەسرین بوە، بە ئاهێکیدڵسۆزانەگوتی:

– هەستە ئەفەندی هەستە، هەرچی تۆ گوتت وادەکەم. لای خودا شاهیدیت بۆ دەدەم و پێیدەڵێم کە بەر دوو چاوانە دیتوومە پاڵەوان میکێلس بە زۆری گۆشت بەراز و شەرابی دەرخوارد داوە.

ئەفەندی دەمچاوی گەش بۆوە و گوتی:« سوپاس خاتوونی من ! ئێستا تکات لێ دەکەم تفێکم دە رووی کە !»

– نا ئەفەندی..نا .. من کاری وا ناکەم. هەستە بە سلامەت برۆ.

– تفێکم لێ نەکەی ناڕۆم! پاشان رووی کردە عەلیاغاو گوتی :

– پاش کاترینا نۆرەی تۆیە عەلیاغای موسڵمان و ئیماندار! پاشان نۆرەی گشت خەڵکی کاندیە. ئەو کاتەی لە مزگەوت دەهاتە دەر، باپیرم لە قەبر دەهاتە دەر و تفێکی دەرووی کردم. تۆش کاترینا بۆ خاتری ئەو خوایە تفێکم دەرووی کە.

کاترینا رووی لێ وەرگێراو گوتی: من ناتوانم ... هەستە .برۆ بە سلامەتی ...

ئەفەندی ناڵاندی و گوتی «کەوابوو من ناڕۆم. سوێند بە ئیمانم ناڕۆم تا تفم دەرووی نەکەی.»

کاترینا نارەحەت بوو لە کاتێکا بۆ لای ئاشپەزخانە دەچوو گوتی:
– ئەفەندی من کارێک دەکەم کە خۆم پێم خۆش بێ نەک ئەوەی تۆ گەرەکتە .
ئەفەندی سەری لە بەردەکانی حەساری دەداو هاواری دەکرد: «من شەو لە سەر ئەو بەردانە دەنوم و نارۆم. ئەوەی‌گوت و نالاندی.ولە نیوەراستی حەساری وەک سەگ دەستی بە لورە لور کرد، تراساکی خوشکی تێگەیاند و هات لە پەنا براکەی لە پشت سەری ئەفەندی راوەستا. لەو کاتەدا کە ئەفەندی بە مستان لە سەرو سینگی خۆی دەداو دەیلوراند، تراساکی تەماشایەکی ئاشپەزخانەی کرد وتەنافی لە دەوری سەری هەڵسوڕاند و هاویشتی. ملی تورکەی چوە دە گرێی تەنافەکە. رینیو سەری تەنافی گرت و دەیانکێشا.
ئەفەندی وە هاوار کەوت و دم وچاوی شین هەڵگەڕا و دەهات بخنکێ. عەلیاغا هاواری کرد منداڵینە بۆ خاتری خوا بەری دەن ، دەخنکێ. کاترینا گوێی لە هاواری بوو هاتە دەر و تەنافی لە دەستی منداڵان هێنا دەرێ و پاڵێکی پێوە ناو گوتی: بڕۆ بەد بەخت.. بۆ خاتری خوا بڕۆ ...ئەفەندی وەدەرناو درگای لەسەر پێوە دا.
تراساکی و رینیو داپان لە قاقای پێکەنین. تراساکی گوتی:
– دایە دیتت ؟ ئەسپەکان ئاوا دە گرن! پاشان چوو تەنافەکەی لە تیزیک عەمباری ناوێ هەلاوەسی و گوتی:
– ئێستا ئیتر گومانم نیە کە چس‌گورگ ناتوانێ لە دەستمان دەربچێ ...
* * *
پاڵەوان میکێلس بە سواری ماینێ و قامچی بە دەست چوارناڵ بەرەو گەرەکی تورکان دەیکرتا. شەرابی زۆر فیکری تێک نەدابوو. هێزێکی هەدانەدەر لە باسک ودەست و جومگەو قامکەکانیدا کۆ ببۆوەو هاتبوو بتەقێ. نەیدەزانی ئەم هێزە چۆن بەکار بێنێ. ماینی وەها تاو دابوو. رێبوارەکانی باش لێک نەدەکردەوە. خانوەکان چکۆڵە دەهاتنە بەر چاوی. کۆڵانەکان تەنگتریان دەنواند. دەنگی سمی ماینەکە ( سێ لوعبەتانی) راپەڕاند. هەرسێک لە پشت کەمێنگایان بۆ دیدەوانی دانیشتن .ئەوان پاڵەوان میکێلس یان ناسیەوە . بەلام لە بەر شوقی هەتاو دمو چاویان باش بۆ دیاری نەدەکرا، تا لە دیتنی دمو چاوی پەی بە نهێنیەکانی دڵیشی بەرن.
ئاگلائە گوتی :« دیسان ئەو بەرازە بەم تیوە رۆیە بۆوا کەوتۆتە رێ؟ بێگومان سەرخۆشە.»
تالیا گوتی:« ئەگەر لە من دەپرسی کارەساتێک قەوماوە. وەزع باش نیە. گونە تفنگی وە پتە پت کەوتن ، دەتگوت دەبەوێ لە رێگای باوە شتێک تێ بگات!» پاشان گوتی:
– من نازانم ئەو پاڵەوان پولیکسینگیسە لە پێوە لە دەورو بەری گەرەکی ئێمە لە چی دەسوورێتەوە؟ من لە رۆژی بولەرزەدا لەم دەورو بەرە دیتم. راست لەو کاتەدا کە ئامینە خانم لە ماڵ دەرپەری و خوی بێهۆش کرد. ئەو بە پەنا خانوی ئێوەی بەگدا تێپەری. ئەگەرێم بڵێن کە ئەوەدوانە بۆ بەکتردیتن پێشتر نەخشەیان کێشاوە پێم سەیر نابێ..ئەوەدەم پاڵەوان لە سەر سەری خانم دانیشتبوو وەهۆشی دەهێناوە. بەو رۆژەوە هەر وەک هەنگوین مێش هەنگوین بۆ لای خۆ

رادەکێشێ، ئەم گەرەکەش ئاوا پاڵەوان پولیکسینگیس بۆ لای خۆ رادەکێشێ. تاوێک لەم دەورووبەرەدورناکەوێتەوە.

گۆیا ئێستاش نۆرەی پاڵەوان بەرازە......

خوشکی دیکە گوتی: « کە وابوو ئەشێ بڕوا بکەین کە ئەو دێڵە سەگە بۆنی مسک بڵاو دەکاتەوە، تا ئەو دوو گۆڵە سەگە لە ماڵی خۆیان بۆنی بکەن. خوشکینە وەرن چاو لەو دەرگا سەوزە وەر نەگێڕین. »

فروسینی گوتی:« خوشکێ بێدەنگ بەو گوێ رابگرە. ئەسپی نوریش دەحیلێنێ. بزانە چۆن مایینی دەوێ.! سڵاوی گەرمی ئەسپەکە کە لە بۆنی گەرمی مایینەکە گەرم داهاتبوو دەبیسرا. تالیا وەک مریشک قرتە قرتێکی کرد وگوتی:

- بەڵام ئەوە ئامینەیە کە بانگ دەکات.

بە جارێک بێدەنگ بوو، دەتگوت دەنگی‌گیراوە. دوو خوشکەکان هاواریان کرد. مایینەکە لە بە بە فاڵیان بەدەنگی‌حیلەی ئەسپەکە هەڵدەستا سەر پاشوان و دەسووڕا. دەتگوت سەما دەکا.

سێ لوعبەتان هاواریان کرد:

- دەڵێی پاڵەوان میکێلس دەچێ خۆ بە گوشت بدا !

بەڵام‌پاڵەوان میکێلس ئەنگەی مایینی لە نێو رانیدا رێک دەگوشی و لغاوی بەزاری دادەداوە. رایگرت و پاشان رکێفێکی توندی لێدا. حەیوان لە ژێر سامی خاوەنەکەی سەری بەرداوەو ملی رێگای گرت. پاڵەوان مستێکی لە سەری مایینەکەیداو بە توندی گوتی:« قاحبەی لەعنەتی ! » بە قەراخ دەریادا تێپەڕی و جڵەوی مایینەکەی شلکرد تا بە کەیفی خۆی بۆلای بورج و قەڵای شار بڕوا . سینگی پڕ ببوو لە هەوا، تاوێک گەڕا تاپشوێکی بێتەوە بەرو دڵی بکرێتەوە. پاشان لەسەر تەپۆڵکەیەکی پڕ لە گیا راوەستا. لە وێوە تەماشای دەریای شینی بە جۆش و خرۆشی دەکرد کە لە بەرامبەر خۆودا دەدرەوشا و تا چاو هەتەری دەکرد بەرەو سەروو ،روو بە یونان پان رابوو.هەناسێکی هەڵکێشاوگوتی :

- ئاخ خودایە من ئەوانە گشت لە تۆ دەزانم نەک لە عەبدان.! رکێفی لە مایینێ داو بزووت. هەموو جارێ کە یونانی فەقیری وەبیر دەهاتەوە. لە دەست خوا هەراسان دەبوو. کۆڵێک کوفرو بێزاری لە زاری دەهاتە دەر. ئەو سکاڵای نەدەبردە بەر خودا ،لە گەڵی بە شەر دەهات.داوای بەزەیی و دڵسۆزی لە خوا نەدەکرد، بەڵکو ئاقڵ و مەنتقی لێ دەویست.

هەورێکی پچوکی پڕ لە ڕێژنە، هەروەک مەشکەیەکی رەش لە لای سەرەوە سەری هەڵدا. تا دەهات پان دەبۆوەو ئاسمانی دادەگرت. خۆر نێو چاوانی تێکنا. شنەبایەکی گەرم و شەدار لە لای دەریاوە لە دەموچاوی مێچ و مۆنی پاڵەوانی دەدا. دووبارە رووی کردە ئاسمان ودانی دە چیرەوە بردو گوتی:

- نا.. خوایە .. نا من ناتوانم لە تۆ عاجز بم. چونکە بێفایدەیە. من لە ئادەمیزادانی تورەم. رکێفی لە مایینێ داو چوارتاڵ لە شەقامی گەورە تێپەڕی کە مەسیحیەکان لە هەموو لاوە بۆ تەماشا کردنی رایان دەکرد. لە دەروازەی کانە گەیشتە قاوەخانەی گەورەی تورکان. مل ئەستووری تورک گشتیان لەوێ کۆ دەبوونەوە. لە سەردەمی شۆرشەکانی کریت دا کۆ بوونەوەی راوێژی گەورە

گەورانی هەر لەو قاوەخانەیە پێک دەهات. کاتێکی فەرمانی قەتڵ عامیان دەدا، لە کاتێکا تورک خەنجەریان بە ددانان دەگرت، هەر لەو قاوەخانە دەهاتنە دەر. ئێوارەی ڕۆژەکانی هاوین کە گەرمای هەتاو کەم دەبۆوە و بۆنی خۆڵ هەڵدەستا، لاوانی تورک لە قاوەخانە دادەنیشتن و گۆرانی «ئەمان ئەمان» یان دە چڕی. لە زستانا باشترین حکایەتخوانی شار دەهاتنە وێ و سەری خەڵکیان گەرم دەکرد. هەرلەوێش بوو کە بانگ دەر دەهات تەماشای کوڕە جوانەکانی دەکرد و بە سەر سوڕ مانەوە گوێی بۆ گۆرانیەکانیان ڕادەگرت. ئەوێ قاوەخانە نەبوو. بەهەشتی محەممەد بوو. هیچ شتێک نەبوو کە لەوێ گیر نەکەوێ.هەم تەمباکۆی باش بۆ قەلیان و هەم شنەبای فێنکی پەخەکانا!

نیوە ڕۆژاپدا بوو، ڕیش سپیەکانی تورک نانیان خوارد بوو، لە سەر حەسیری قاوەخانە دانیشتبوون و داوای قەلیانیان کرد بوو. بە دڵی خۆش وچاوی خەواڵو قاوەی خۆیان هەڵدە قوڕاند. دنیا بە کەیفی ئەوانبوو. چەند پشت لەمەو بەر باپیرەکانیان گریت یان لە نێو خۆدا بەشکرد بوو. گۆشتی گریت، واتە باخاتی پڕ بەرەکەتی ڕەزو زەیتون و زەوییە بە پیتەکان وەبەر ئەوان کەوتبوو. ئەوی دیکەش، واتە ئێسک و پلوسکەکانی بەشی یونانیەکان بوو. خاچپەرستەکان جار جار ڕادەپرین، بەلام کاتێک لەشکری تازە تەنەفس لە ئاسیای بچوکەوە دەگەیشتن و پەلاماریان دەدان، ئەزم و هێمنایەتی دادەمەزراوە! ژنە تورکەکان جوان بوون. هەمو کەس دەیتوانی بە گوێرەی توانای نێو ناخنی کیسەی خۆی وەدەستیان بێنێ. کوڕە تورکەکانیش جوان بوون، کاتێک خواردنی باشیان دەخوارد، ئاویان تێدەگەڕا و گۆشتیان سپی و تورت دەبوو. پێغەمبەرەکەشیان پیاوێکی دڵتەڕ و خۆش سروشت بوو. تورکێکی ئازاو جوامێر بوو. ئەویش زەوق و سەلیقەی تورکانی هەبوو. ئەوانی مەجبور نەدەکرد کە ئەهلی عیبادەت و دیندار بن. هەر وەها پالی پێوە نەدەنان کە خاچ بکێشن. هەمیشە شوشە عەترێک و شانەو ئاوێنەی لە گیرفانیدا بوو. بە خۆشیەوە ئەو بۆ ئیماندارەکانی خۆی خودا نەبوو، ئەویش ئادەمیزادێک بوو وەک ئەوانیتر. مردن بۆ ئیماندارەکانی ئەو ڕزین و گەنین نەبوو، بەڵکو دەرگایەک بوو کە بۆ باخێکی گەورەو هەمیشە بەهار دەکرایەوە.

نوری بە ـ بە ڕیشی تاشراو وسمێڵی قەیتانی کە ئەوەندەی ڕەش کردبوو هەر بریقەی دەهات، وەک شێری مەست لە قاوەخانە وەژوور کەوت. بە مرچ و مۆنی سلاوی بە ڕاستەو چەپەی خۆی کرد و چوو لە بنە بانی قاوەخانە لە سەر مێزێک دانیشت. لەو شەوەوە کە ئەسپەکەی لە پەنا ئەهرستان سەرسمی دابوو، لەو شەوەوە کە باوکی بە گراسی دڕاو ولەشی بە خوێنەوە لە قەبری هاتبوە دەر، نووری خەو و خۆراکی لێ هەڵگیرا بوو. نە خواردنی پێکەوتبوو، نە چێژەی لە هاونشینی کەس دەکرد. خوێنی باوکی هاواری تۆڵەی کرد بوو.کوڕو براو برازای قاتڵی باوکی هێشتا هەر لە گوندی خۆیان زیندوو بوون. زەو وزوویان دەکرد و ڕایان دەبوارد. بێ شەرم دەبوون . هەر ئەوە نەبوو کە یەکێ لەوان لە گوندی خۆی کەری بردبوە مزگەوت ؟ تا کەی دەیتوانی لە ئاست ئەو هەموو سوکایەتیە سەر شۆڕ بکا؟. تاکەی دەبوایە لێ بگەڕێ کە باوکی لە نێو مردواندا سەر گەردان بێ. ؟ ئەگەر پیاو بوو کاتی ئەوە هاتبوو کە بڕیارێک بداو کارێک بکا.

نوری بانگی قاوەچی کرد و گوتی:« حوسێن قەلیانێکم بۆ تێکە و مەهێڵە کەس لێرە وەنیزیک کەوێ. »

هەور دەیگرماند. هەموو تەماشای دەرەوەیان دەکرد.ئاسمان بروسکی رەنگ زەردی لێ هەڵدەستا و هەواش وەک هەریر دابەری، جیڕەی دەهات.یەک لە ریش سپیەکان گوتی:
- ئەوە دەنگی گەرمایە.
یەکی تر گوتی : « باران دەبارێ و بۆ مەزرایە باش دەبێ. »
سێ یەمیان لە گەڵ ئەوە کە بۆ لای دەرگا دەچوو تا تەماشای ئاسمانێ بکا، گوتی:
- بۆ باخاتی زەیتونیش باشە. دار بادامیش بەری چاک دێنێ. کابرا هێشتا دە ستی بە بەر چاوەکانیەوە نەگرتبوو، پاشەو پاش گەڕابەوە. پاڵەوان میکێلس بە سواری لە بەر دەرکی قاوەخانە شین ببوو. داهاتەوە دیتی تورک ئاسودە دانیشتوون و خەوالو وسەر خۆش قەلیان دەکێشن. خوێن بەری چاوی گرت، رکێفی لە مابێنێ دا، حەیوان پاڵەکانی راوەشاندو رەببەوە، دوابە راست وەژوور کەوت. هەوەڵجار ئەبوو کە ئەوە دەکرا، ئەو شارەزای کاوەگەوجەکانی خاوەنەکەی بوو. لەگەڵ چو ژووری قاوەخانە چەند چوار پایەی شکاند، مێزێکی پچوکی وەرگێڕا و چەند فنجانی قاوەی شکاند ئاخرەکەی چوو لە پێش قاوەچی راوەستا.
قاوەچی نەڕاندی. تورک دەستیان لە قەلیان کێشان هەڵگرت و راست بوونەوە. ئەوانەی هەرە ئازایان بە تورەیێ دەستیان بۆ پشتێندی سوور برد تا خەنجەران هەڵکێشن. پیرە پیاو دەستیان خستە پێش و هاواریان کرد :
- پاڵەوان میکێلس بچۆ دەرێ و بە خۆڕایی شەر ساز مەکە !
بەلأم پاڵەوان هێدی و تورە قامچی لە حەوا راوەشاند و هاواری کرد:
- هەمووتان بۆ دەرەوە، دەمەوێ بە تەنیا لێرە قاوە بخۆمەوە.
بانگ دەر ئیتر خۆی پێ رانەگیرا. لە سەر سەکۆ خۆی فرێدا خوار وبە تووڕەیی گوتی:
- نا.. پاڵەوان میکێلس نا! ئەمجارە ناتوانی هیچ غەڵەتێک بکەی. ئیتر ناتوانی هەر کاتێ ویستت گاڵتەمان پێ بکەی! ئەمرۆ ئیتر چارە رەشی وەک تۆ بە زیندوویی لێرە ناچیە دەرێ. تێگەیشتی ؟
تورکێکی مل ئەستور و شەڕ لاتان دڵی بە بانگ دەری پیر سوتا و هەڵیکێشا خەنجەر ، سواری پەلامار دا. پاڵەوان داهاتەوە جومگەی دەستی گرت و وێکی گوشی. خەنجەر لە دەستی کەوتە خوارێ. پاڵەوان خەنجەرەکەی هەڵگرتەوە و دوو بارە قامچی راوەشاند وئەڕاندی:
- گوتم وەدەر کەون! یالاّ بۆ دەرەوە !
پیرە مێرد کە نەیاندەزانی چ بکەن، دەستیان کرد بە ئەلأ ئەلأ. داخوا بنێرنە کن پاشا کە عەسکەر بنێرێ یا لەو رووداوە چاو بپۆشن ، با کوشتار ساز نەبێ.؟
نوری بەگ لە جێی خۆی نە بزوتبوو. سەری بەرداببۆوە نێرگەلەی خۆی دەکێشا. بە سیلەی چاو تەماشای دەکرد. جار جار بەر چاوی وەها تاریک دەبوو کە بێجگە لە سینگی ئارەقاوی مابنەکەو چەکمەی پاڵەوان میکێلس هیچی تری نە دەبینی. لە دەرەوە هەوەڵین دڵۆپی درشتی باران دایدابوبە. هەورێک توند گرماندی و شوشەکانی قاوەخانە لەرزین.
بانگ دەر هاواری کرد:« تۆ شەرەفی محمد لێ گەرێن با ئەو کابرا رەزیلەی ورد و خاش بکەم. »

دوو سێ پیرە پیاو باسکی کابرایان گرت و بە ڕاکێش ڕاکێش دووریان خستەوە. نووری بەگ پتر سەری بەر داوە. لە سەر یەک مژی لە قەلیانەکەی دەدا و دووکەڵ لە کونە تفنگکانی دەهاتە دەری. لە بەر خۆیەوە بیری دەکردەوە کە:

- ڕاست وەختی خۆیەتی .یا ئێستاو یا هەر گیز. من بەڵێنیم داوە بە باوکم. هەر چاوەڕوانی بیانوو بووم، ئەوەش بیانوو. ئەوەتا برای قاتڵی باوکم لێرە ڕاوەستاوە. باوکم ناردوویەتە لای من. کەوابوو نووری بۆ ڕاوەستاوی ، لێدە !»

پەیتا پەیتا دڵی هێدی دەکردەوە، دەیشێواندودەیترساندو هانیدەدا. ئاخری دەبوایە کارێکی بکا.دیسان فیکری کردەوە.: رابە لێخە ! ڕەنگە بترسێی؟ دەستەکانی دەلەرزین ودەبسرتاند. سەری هەڵێنا ، لەگەڵ پاڵەوان میکێلس نیگایان تێک هەڵەنگوت. بە سپایی لوولەی قەلیانەکەی لە دەوری شوشەکەی هاڵاند و بە حاڵێکی ماتدوویی نێرگەلەی هەڵگرت و لە پاڵەوان میکێلس وەنیزیک کەوت. جلەوی ماینەکەی گرت و ڕووی کردە قاوەچی کە لە پشت پێشخوانەکە خۆی شارد بۆوە. گوتی:« وسێن، قاوێک بۆ پاڵەوان میکێلسی چێکە ! ئەمڕۆ میوانی منە. پاشان بە ئیشارەی دەست . تورکەکانی دوور خستەوە کە لە دەوری ماینەکە هاڵا بوون. پاڵەوان میکێلس گوتی:

- نووری من دەمەوێ بە تەنیا قاوە بخۆمەوە. نامەوی کەس لەگەڵ من لێرە بێ. زوو قاوەخانە بەتاڵ کەن.

نووری بەگ لە کاتێکا دەیویست دەنگی دابنوێنێ، گوتی:

- لە گەڵ ئەوەش پاڵەوان تۆ دەتوانی دڵم خۆش کەی. من داوای شتێکی گەورەم لە تۆ نەکردوە. تکای من ڕەت مەکەوە.، دڵم مەشکێنە. پێنچی نووری کرایەوە کەوتە سەر شاتانی، ڕایوەشاند بۆنی عەتری بە ولات دا بلاو بۆوە. لە پڕ کونە تفنگی پاڵەوان میکێلس وە پتە پت کەوتن.ڕەگی ملی هەستان، بۆنی عەتر وەک خەنجەر بە دڵیدا چوو خوار زەینی پەرێشان بوو..

دیمەنی شەوو ئارەق و کەبابی کەوروپیکەنینی پشت پەنجەرەو تەقە تەقی پلیکان و چاو یکەوتنی لەشی نەرم ونۆڵ و نووری، هاتنەوە بەرچاو، لە نێوچاوانی گرژی جریقە هەستا. پاژنی بە نووریەوە نا و ماینی بۆ پێشەوە لێ خوری ، کەمی مابوو نووری وەبەردا. جارێکی تر بە توڕەیی هاواری کرد:

- بۆ دەرەوە ... بۆدەوەوە ...لێرە وەدەر کەون...

نووری بەگ پێچەکەی لە سەری هاڵاند ولێوەکانی وەها گەست خوێنیان لێ دەرپەڕی. تورکەکان هەستا بوون و لە دەوری نووری کۆ ببوونەوە. دوو سێ کەسی چەقۆکێش لە پشت دەرگا چاوە ڕوان بوون. دووسێ پیرە پیاوی تورک کە لەوانیتر ئاقڵتر بوون، خۆیان گەیاند بوە دەرگا و ڕایان دەکرد. قاوە خانە دەهات بەتاڵ دەبوو.

نووری هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. لە سەر خۆ بە تورکەکانی گوت:

- ئێوە بڕۆن. ئەو کابرایە سەر خۆشە.باشترە گوێی نەدەینێ. من دەمێنمەوە. ئەو ناتوانێ بە کەیفی خۆی بکا. ئابڕووی ئێمە هاتۆتە گۆڕێ.

تورک نەدەبزووتن . سەلیماغا کە تا ئەو دەم بێدەنگ بوو، نێرگەلەی دەکێشا ڕابوو. ئەو لەو

پیاوە بەڕێزانە بوو کە لە نێو تورکی عوسمانیدا هەڵدەکەون. مرۆڤێکی بە ساڵاچوو،ساردو گەرمی زەمانەی چێشتبوو. لە بنە ماڵەیەکی ڕەسەن بوو. هێشتا جوانی لاوەتی پاراستبوو.ڕووی کردە تورکەکان و بە دەنگێکی ئارام گوتی:

بچنە دەرێ. ئێستا وەختی ئەوە نیە وڵات خوێناوی بکرێ. ئەو سەعاتە دەگاتێ. بە ئایاتی قورعانیێدەزانم کە ئەم ڕۆژە نیزیکە.ئەم یونانیە تاوانی بێ شەرمی خۆی بە گران دەداتەوە. تەنانەت دەبینم کە سەری لە دەرگای ماڵی پاشا لە بزمار دراوە. لە سەر خۆ بن.! وەرن با برۆین! خۆی وەپێش هەموان کەوت و بە هەنگاوی سەبرو ڕێک و پێک کەوتە ڕێ. ئێستا قاوەخانە بە تاڵ ببوو.

پاڵەوان میکێلس سمێڵی بادان و بزەیەکێ هاتێو چاوێکی هێمنانەی لە نوری کرد. دەدانە بەرازەکەی وەدەر کەوت. بۆ تارێک هەستی بە خۆشی کرد. پاشان ئاوڕێکی وە لای قاوەچی داوەو گوتی:

– هۆی وسێن ، کەتری وەسە نێ و قاوەیەکی تاڵم بۆ چێکە!

ئاخرەکەی بوو بە باو باران. تا دەهات ئاسمان تەری دەبوو. شاری کاندیش دەتگوت بۆ لای ئاسمان هەڵدەکشێ، کەمی مابوو بگەنە یەک. کوڵانەکان ببوونە چەم و ڕووبار. هەموو شت لە تاریکاییدا نوقم ببوو. جارو بار بروسکە بە سەر منارەکاندا دەهاتە خوار. لەو خوارە، لە شەقامی گەورە، سەروچاوی گرژی پاڵەوان میکێلس کە بۆ ماڵی خۆی دەگەڕاوە، بە نۆرە گەش دەبووەو تاریک دەبوو. لە سینگی پان و سپی ماینەکەی ئاو دەهاتە خوارێ. بەلام ئەوە هەر ڕێژنەیەکی توند بو، پتر لە نیو سەعاتی نە خایاند. زوو لە لای کریتستانەوە بایەک هەڵیکرد و هەورەکان لێک بلاو بوون. ئاسمانی شین وەدەر کەوت. تیشکی نەرمی هەتاو شاری باران گرتووی گزر کردەوە.پیادە ڕێگان خاوێن بوونەوە. پاساری لە سەر گوێ سوانان دەستیان بە جریوە جریو کرد. تەواوی شاری کاندی کە حەمامی کرد بوو دەدرەوشاو گیانی تازەی هاتبۆوە بەر. بۆنی لاولاوی باران ڕێکەوتوو لە گەڵ بۆنی ڕیحانە لە باخەکانەوە دەهات.

پاڵەوان میکێلس دەرگای حەساری کردەوە. لە کاتێکا ژنەکەی مات و بێدەنگ جڵەوی ماینەکەی گرتبوو ، لە پلیکانەکان چوە سەر و خەنجەری لە بەرامبەر پەیکەری میکائیلی مەلائیکە لە عەرزی دانا. لە بەر تووڕەیی و تارەقەو باران هەڵمی لێ هەڵدەستا. کاترینا جلی خاوێنی بۆ هێنا. پاڵەوان لیباسەکانی گۆڕی و لە سەر جێ ڕاکشا. چاوەکانی لە سەر یەکداناو لە پڕ خەونێکی شیرین و خۆشی بەسەر داهات.

خەڵکی کاندی تورک و خاچپەرست هەر سەر لە ئێوارێ لە ماڵەکانیان کۆ ببوونەوە. پیاوەکان بە یەواشی قسەیان دەکرد و ژنەکان بێدەنگ و مات لە قوژبنێک دانیشتبوون و گوێیان دەدایە،، هەناسەیان هەڵدە کێشا. کەوابوو کریتی فەقیر قەت هێمن نابێتەوە.؟ داخوا دانیشتوەکانی دەبوایە دیسان تووشی کوشت و کوشتارو ئاوارەیی و دەربەدەری بن؟ ئاخر ژن و منداڵ و شرەو بڕەی خۆیان بۆ کوێ بەرن.؟ ئەو مە سیحیانەی لەوانیتر ئاقڵتر بوون، واتە کارو کاسبی و بازرگانیان هەبوو، یا خاوەنی باخ و باخات بوون، لە سەرخۆشیو شەڕلاتانی پاڵەوان میکێلس بێزاریان دەردەبڕی. ئەوانەی ئازاتر بوون لەم سوکایەتیەی بە تورکان کرا بوو، کە یەف خۆش و شاد بوون.

لەو لاوە تورکەکان هێندێ لە مزگەوت و هێندێک لە ماڵی نووری بەگ کۆ ببوونەوە. دەیان گوڕاند و جنێویان دەداو هاواری تۆڵەیان دەکرد. بەلام تۆڵەی چۆن ؟ بانگدەرهەستی هەموانی دەهاروژاند. بەلام ئەوانەی ئاقڵتر بوون خەڵکیان هێدی دەکردەوە.

نووری بەگ بێدەنگ چوبوە دەفیکر ولە قوژبنێک دانیشتبوو. پاش ئەوەی کە هەموویان لە کوشتن و سەر بڕینی خەیالی دوژمن ماندوو بوون، سێ کەسیان لە زۆر زانەکانی قەوم هەڵبژارد و دایان نا کە بەیانی بچنە کن پاشا و قسەی لەگەڵ بکەن داوای لێ بکەن تا دەسەلات بە

مەسیحیەکان نیشان بدا. ئاخر ئەوە پاشایە یا هەڵوایە؟ ئەوە چەند ساڵە خاچپەرستێکی لە دار نەداوە. کەسی لە دارێ نە بەستوە. لە ئەنجاما کافر چێ بوون. هەر بۆیەشە پاڵەوان میکێلسی شێت بە سواری ئەسپ دێتە مزگەوت و بە قامچی تورکان وەدەر دەنێ. پاشا دەبێ بێ ترس هێندێکان لە دار بداو ئەشکنجەیان بکا، تا بزانن زەبت و رەبتێک هەیە. پاشای شێت و بێ دەسەڵات لە جیاتی ئەوە موداراپان لەگەڵ دەکا و باسی داد پەروەری دەکا. لە گەڵ خەلیفەی ئورتودوکس تەختە یاری دەکا. لە سەر خواردنەوەی ئارەق و باقلاوە رێک دەکەون. تا ئەم رووداوانەی بە کەیفیان نیە دایپۆشن.

رۆژی دوایی سێ کەس لە وانی زۆر زان کە هێشتا راسپاردەی توندو تیژی خەڵک لە گوێچکەیاندا دەزرینگاوە. بەیانی زوو بۆ ماڵی پاشا وەرێ کەوتن. بانگدەر بە چاوی شین و تەلاڵەتی لەڕو لاوازی وەک کەڵە شێر لە نێوە راستێ دەڕۆیشت. سەلیماغا لە لای راست و نوری بەکیش بە حاڵێکی پەرێشان وئبگەرانەوە لە لای چەپە دەڕۆی . هەر یەکە ئەوەیان دوو پات دەکردەوە کە دەیانویست بە پاشای بڵێن و بیریان لەوە دەکردەوە کە چی پێ بڵێن؟ سەلیماغا هەموو ساڵێ بەرو بوی داهاتی ساڵانەی دە گەیشتە هەزاران کیلە گەنم و رۆن زەیتون وبادام و کشمیش و دانە وێڵە. جا بۆیە لایەنگری ئاشتی و هێمنایەتی بوو. بانگدەر قورعانێکی بە سینگی خۆیەوە نابوو، ئەو کتێبە پیرۆزە جەرگی دەسوتاند. نوری بەگ سەری بەرداوە و نەیدەزانی بڵێ چی و چی دەویست. ئەو شەوە دیسان باوکی هاتبوە خەوی و شڕۆڵ و قوڕاوی بوو. پێش ئەوەی لە بەر چاوی ونبێ خەنجەرە بە نرخ و دەسک رەشەکەی لە بن سەرینی نوری داناوو. نوری کاتێک وەخەبەرهاتبوو، سەرینەکەی هەڵێنا بوو، تا خەنجەر دەست بداتێ، بەڵام ج خەنجەر لەوێ نەبوو. بە دڵی شکاو فیکری کردبۆوە : «دیارە پیرە مێرد باوەڕ بە من ناکاو خەنجەرەکەی بردۆتەوە. بێگومان لەوە دەترسێ کە من شایانی ئەوە نەبم.»

پاشا وەک تورکان لە سەر نیو تەختی خۆی دانیشتبوو، بە مرج و مۆنی و نیو چاوانیگرژ، چاوەدوانی نوێنەران بوو. بوو. دیسان گیرو گرفتێک هاتۆتەپێش و سەگ و پشیلە دەیانەوێ بە گژ یەکدا بچن. وەک دەڵێن کافرەکان ئازادیان دەوێ، با بچن خۆیان هەڵاوەسن. مسوڵمانیش دەیانەوێ تەواوی خاچپەرستەکان بکوژن، ئەوانیش با برۆن و جەهەندەم بن. تۆ ئەی کافری لەعین بزانە کە کۆیلەتی شتێکی باشە، تۆش ئەی ئاغایان بزانن کە رەعیەت باشن. کشت و کاڵ دەکەن، بازرگانی دەکەن، خەرج و باج دەدەن. کە وابوو مریشکی هێلکە زێڕ بۆ دەبێ بکوژرێتەوە!؟

خولامی رەش هاتە ژوور و گوتی: «میرم ئەوە دێن .!»

پاشا وەک گایەک کەوتە پشودان و گوتی: «بڵێ بێنە ژوور.!»

هەموویان یەک لە دوای یەک وەژوور کەوتن. پاش سلاوو سەردانواندن مات و بێدەنگ لە سەرنیو ئەخت دانیشتن.

پاشا بە ئاهەنگێکی ماندوانە گوتی: «گوێم لە ئێوەیە .. قسە بکەن...»

لە پێشدا بانگدەر وەقسە هات. زارێکی پێوە بوو وەک کاڵەی لە بەر یەکچوو، لوتێکی تیژ وەک لمۆزی سەگ، کابرایەکی رەقەڵەی شلو شەویق، روومەتی تێک قوپاو، ریشێکی کورتی خورمایی و دەنک دەنک مووی سپی. خاڵێکی تۆکناوی لە نێوان بڕۆیان، دەتگوت سێ چاوی

هەبە. دستی پێکردو لێی نە دەبریەوە. تا پترگوێ یاندەدا بەقسەکانی،زیاتر گەرم دادەهات و کەفی دە پرژاند. قورعانی لە باخەڵی هێنا دەرو لە کاتێکا سەری بۆ دەلەقاند، دەستیکرد بە قورعان خوێندن.

پاشا نارەحەت بوو، قەنەنەکەی هەڵێناو گوتی:«حاجی ئەفەندی مێشکی سەرت بردم، قسەکەت بکە با بزانم دەڵێی چی؟ من خەڵکی ئاسیای بچوکم، زەینم کوڵە. لە وشەیەکدا بیبرەوە بزانم چت گەرەکە؟»

- دەمەوێ کوشتار بکەی !

پاشا هەناسێکی هەڵکێشا وڕووی کردە سەلیماغاو گوتی:

- تۆ دەڵێی چی سەلیماغا، تۆش کوشتارت گەرەکە؟

پیرە مێرد گوتی: «نە خێر پاشا ئەفەندی...من کوشتارم ناوێ.من هێمنایەتیم گەرەکە.ئەو ساڵ ساڵێکی پڕ بەرەکەتە.باران لە بەهارێدا زۆر باریوە. مەزرا بەرهەمیان زۆرە. باخاتی زەیتون لکیان داهاتوە. ئەو ساڵ رۆن زەیتونێکی‌زۆرمان‌دەبێ. سوپاس بۆ خوا کەوابوو هێمنایەتی باشە پاشا ئەفەندم. کریت جانەوەرێکی درندەیە، نابێ بیبزێوی، دەنا خەڵک هەڵدەدڕێ.! بۆ چما شێتێک چوو بێتە قارەخانەی تورکان چدەبێ؟ ئەو مەست بوە، بە قازانجی ئێمەیە چاوی لێ بپۆشین. ئەگەر ئێمەش وەک ئەو بکەین، ئەو هەویرە ئاو زۆر هەڵدەگرێ. قین ویوغزمەترسیدارن، پاشا ئەفەندم. تۆ بۆ ئەو کافرە کە ناوی پاڵەوان میکێلسە، خەت و نیشان بکێشە. نۆرەی ئەویش دێ. تۆ لەم وڵاتە پاشای و تیفت دەبڕێ، چەندی بتەوێ دەتوانی لە ملیان بدەی. پاشان رووی بۆ لای بانگبێژ وەرگێڕاو گوتی:

- ئەوە بیرو باوەڕی من بوو حاجی ئەفەندم. بمبورە کە لە گەڵ تۆ هاودەنگ نیم. تۆ باخی میوەت نیە، ناتوانی تێ بگەی کە چەندە زیان بە مەزرای خەڵک دەگا. لە من بپرسەو لە باخات و مەزراکان، داخوا ئەوان شۆڕشیان گەرەکە؟ نەخێر ئەوان نایانەوێ.

بانگ بێژ گوڕاندی و دەستی بە قورعانێ داداو گوتی:

- من نە لە باخەکان دەپرسم نە لە مەزراو ئینسانەکان، من تەنیا لەخوا دەپرسم. خەریک بوو قورعان لێک کاتەوەو فاڵ بگرێتەوە، بەلام پاشا بە دەستێکی فەرماندەرانە دەستی راگرتو لە کاتێکا باوێشکی دە هاتێ گوتی:

- قورعان هەر ئەوە دەڵێ کە لە فیکری خوێنەردایە. تۆکوشتارت دەوێ کە وابوو قورعانیش لێک بکەیەوە باسی کوشتار دەکا. ئەگەر سەلیماغاش لێکی بکاتەوە، قسەیەکی دیکە لە خوا دەبینێتەوە کە باسی هێمنایەتی و ئاشتی دەکا. کەوابوو بیبرنەوە.! پاشان لە نوری بەگی پرسی:

- بیرورای تۆ چیە نوری بەگ ؟ کوشتار یا هێمنایەتی؟ قورعان چ بە تۆ دەڵێ ؟

نوری دوو سێ جار دەستی بە بەلەکی توکناوی خۆیدا هێنا و لە وەلام دەگەڕا. ماوەیەکی پێچوو تا بیرورا دەر بڕێ. بەلام ئەو ئاشتی نەدەویست. ماوەیەک بوو وەسمانی بە سەبرو مودارا ڕاببوارد بوو. یونانیەکان ژیانێکی ئاسودەیان هەبوو. لەو کاتەوە کە پەلامارنەدرا بوون قەڵەو ببوون. لە لایەکی دیکەوە نوری بەگ کوشتاریشی نەدەویست. پێی خۆش نەبوو خوێن برژێ. حاجی ئەفەندیش نەبوو کە قورعان بخوێنێ و گەرم دابێ. پاشا کە لە چاوەروانی دا مابۆوە،

جارێکی دیکەش گوتی:« باشە نوری بەگ چبوو؟ من پرسیارم لە تۆ کرد. ئاشتی و هێمنایەتیت دەوێ، یا کوشتار؟»

نوری بەگ کە دیسان دەیویست ڕێگای بیر کردنەوەی هەبێ،گوتی:« پاشا ئەفەندم، ڕێگایەکی راستمان لە بەر نیە »

- بۆچی کوڕم، بۆچی. هێشتا ڕێگای ڕاست هەیە. بەڵام ئێمە لێمان لاداوە و نایدۆزینەوە. تۆ بێژە بزانم دۆزیوتەتەوە؟

- بەڵێ پاشا ئەفەندم لام وایە دیتومەتەوە.

- دەستخۆش. کە وابوو بێژەو بمانهێنەوە سەر ڕێی ڕاست.

- نە ئاشتی و هێمنایەتی، نە کوشتار. تاوانبار ئەشێ بە سزای کردەوەی خۆی بگات.

- بە بیرو ڕای تۆ پاڵەوان میکێلس تاوانبارە ؟ بیرو ڕات لە بارەی ئەو چۆنە ؟

- پاشا ئەفەندم لە من گەرێ، با ئەوەی لە دڵم دایە دەری نەبڕم. تۆ پاشای، ئەگەر تۆ دەست تێوەردەی کرێت چەک هەڵدەگرێ. دیسان خوێن دەڕژێ. لێ گەڕێن با من بە تەنیایی ژاری دەوڵەتی وەسمانی بڕێژم. بەو زوانە تێ دەگەی کە تاوانبار کێ بوە! تۆ ئەو دەکوژی ؟

- بەڵێ من دەیکوژم و کەسیش نازانێ قاتڵ کێیە. بڕوا بە من بکە.

بانگ دەر لەجێ دەرپەڕی و گوتی:« تاوانبارێک نیە وهەزار کەسن، دەبێ هەموویان سزا بدرێن. مانای ئاشتیش هەرئەوەیە. یونانی بە جوڕێکی دیکە لە قسە تێ ناگەن. ئەگەر دەتەوێ بێدەنگیان بکەی، سەریان ببڕە.»

زەینی سەلیماغا جارێکی دیکەش پڕبوو لە باخ و باخات. هەستاو دەستی کرد بە دادو بێداد. بەڵام دەنگی بانگبێژ وەک زەنگوڵە دەنگی دەدایەوە. بوو بە هەراو کێشەیەک ئەو سەری دیار نەبێ. بە گژ یەکداچوون. نوری بەگ کەوتە نێوانیان لێکیان بکاتەوە. پاشا لە سەر تەخت خۆی کزکردەوە. ئەو کرێتیانە گێژیان کردبوو. هەم هەقیان بوو، هەم ناهەق بوون . بەڵام ئەم دم بەدمەیە ڕێگای نەدەدا بیر بکاتەوە و هەق و ناهەق لێک جیا کاتەوە. شەوێ خەراپ نوستبوو. زۆریشی خوارد بوو، خوارد بوویەوە، ئێستا خەوی دەهات. بە پەلە بوو کە بەرێیان بکا.سەرێکی ڕاوەشاند تا خەوی لێ بڕەوێ و هاواری کرد:

- شەرم ناکەن؟ لە بیرتان چۆتەوە، بە گیانی ئاخیر ئێوە پیاو ماقوڵی ئەو شارەن. شەڕلاتانی بەسە. نوری بەگ هەق بە تۆ دەدەم‌ئەم ڕێگایەی تۆ پێشنیارت کردوە لە هەموان ئاقڵانە ترە. هەرچی‌خوا لەدڵتی تێ وابکە. من‌دەسەڵاتی‌تەواوم دابەتۆ!

سەلیماغا مێزەرەکەی لە سەر عەرز هەڵگرتەوەو ڕووی کردە نوری بەگ و بە ئاهەنگی پارانەوە گوتی:

- منیش لە سەر بیرورای توم . بەڵام بە نەرمی بجوڵێوە. بە پارێزتاوانبارێکوژە و یونانیان مەهاڕوژێنە. هێندی ولەسەر خۆبە.

بانگ بێژ گوتی:« من قسەی خۆم ناخۆمەوە، لە مزگەوت قسە دەکەم وتورکان دەهاڕوژێنم.»

پاشا لە پڕ ئاگری گرت. مستی کردە گرێ و هاواری کرد :

- ئەهای حاجی! بزانە لە شاری کاندی من بەرپرسیارم، من بە سەر یاسا ڕادەگەم. بە ریشی

موبارەکی پێغەمبەر وەک سەگی هار دەبێت دە لمبۆزی دەکەم تا دەخنکێ.لە بیرمەبەوە کە من بەبێ فەرمانی قوستەنتەنیە لەت فەرمانی کوشتار نادەم. پاشان بە گڕژیو ناڕەحەتی هەستا. گوڕچیلەی ژانیان دەکرد. بە باوێشکەوە گوتی:

- یالا بڕۆن بە دوای کاری خۆتاندا. من کارم هەیە. نوری بەگ تۆ چت‌گوت وابکە. ئاقڵانە بجولێنەوە. دەبێ ئاقڵ و بەهەستبی. چونکە ئێمە لەگەڵ یۆنانیان سەروکارمان هەیە. لەعنەت لەو قەومە. ئەگەر ئەو مەلعونانە لە قاچی ئێمە نەهاڵا بان، ئێستا وەسمانی هەموو دنیای خوارد بوو. دەستی لێکدان، خولامی ڕەش وەژوور کەوت . پێی گوت:

- ئەو ئاغایانە ڕێنوێنی بکە با بڕۆن !

* * *

لەو سەعاتەدا کە تورک بۆ بڕیاردان کۆ ببوونەوە، سێ کەس لە پیاوماقولانی یونانی‌بۆ لای بارەگای خەلیفەی ئورتودوکس کەوتبوونەڕێ. هەرسێ گران دەڕۆیشتن.پاییزی بار قورسیان وە بیر دەهێناوە کە بە زەحمەتی زۆر و بەجەری سەقیل و بە یارمەتی بای نەبێ وەکار ناکەوێ. ئەم سێ کەسە بریتی بوون لەحاجی ساواس و پاڵەوان تەلیاس و ماوروەیسی پیر کە ئەمەی ئاخریان پێ‌یان دەگوت« جەعلی تەلایی.» ئەوەی هەوەڵیان مرۆڤێک بوو لاڵە پەتەو ڕەنگ پەڕیوە. ڕیشکی کورتی ماشو برنجی، کە بە دووکەڵی سیغاری زەرد ببوو. دەمێکی درێژ و قەلاافەتێکی خێچ و خواری هەبوو. بە جحێڵی ناردبوویانە ئینگلستان تا دوکتوری بخوێنێ. بەلام لەوێ شێت ببوو. زەوقی چووبوە سەر شتی کۆنەو ئەنتیک . هەرچی هەیبوو دەیدا بەکرێکارو فەعلە، ڕۆخە بەچێ مارەکانی دەریاو ئەشکەوتەکانی چیای تیدادە پشکنی، بەو هیوایە کە شتی ئەنتیکەو قەدیمی بدۆزێتەوە. لە ژێر زەوی دەست و لاقی شکاوی مەڕ مەڕ و نووسراوەو خەتی سەبر و گۆزەڵە شکاوی دێنانە دەرو هەمووی‌دەبردنە بارەگای خەلیفەو ژوورێکی گەورەی بەو شتانە پڕ کردبوو. بەلام جونکە جێ نەمابوو، ئەوجار هەرچی دەیدیتەوە لە حەساری کلیسا کۆی دەکردنەوە. خاچپەرستەکان سکالایان دەکرد و دەیانگوت :« ئەم شەیتانە هەوسار پساوانە کە هەموویان ڕووت و قووتن، ژن و کیژەکانمان کە بۆ نوێژی مس دەچن، لارێ دەکەن ،

خەڵک بە باوکی‌حاجی ساواسیان گوتبوو کە کوڕەکەی نە نێرێتە فەرەنگستان، چونکە مێشکی تێکدەچێ. بەلام ئەو گوێی‌نەدابوە قسەی کەس. تا کوڕەکەی بە قوڵنگەوە گەڕابۆوەو دەستی کردبوو بە کۆڵینەوەی عەرز. ئەویش چ‌کۆڵینەوەیەک؟ زەوی هەڵدەکەندو دەیداوە، بەڵکوو مالۆسکی ئالتوون بە نۆ بیوەڵە وە بدۆزێتەوە. بەلام بە قەولی منالان دەستی بە..... هەرچی هەیبوو دەیدا بە پاڵەوکرێکار. ئێستاڕووت وقوت مابۆوە وبە چلی شڕ و بە کەوشی پینە کراو دەگەڕا.وای لێهاتبوکە بە ڕێگا دادەڕۆیشت، لە بەر خۆیەوە قسەی دەکرد. ئاخرەکەی وای لێهات کە بەردی بە خەڵک دادەهدا، لەگەڵ ئەوەش خەلیفە چاوە دێری دەکرد. لە کلیسا لە پەنا مێمبەری خۆی حوجرەیەکی دابوویە. ڕۆژەکانی یەکشەمۆ، هەوەڵجار تانی منفەڕکی دەدا بەو.

کاتێک وەزعی کریت ئاڵۆز دەبوو، خاچپەرستەکان دەیانارده کن خەلیفە یا پاشا، لە جیاتی ئەوان قسە بکا. یان کاتێک پاییزی شەڕی ئوروپاییەکان لە لەنگەرگا دەوێستان، دیسان دەبوایە

ئەو بچیّ لە گەڵ فەرەنگیان بدویّ. زۆری دەگوت، بەڵام کەس لە قسەکانی تیّ نەدەگەیی و لە شکدابوون کە داخوا مێشکی تیکچوە، یا بەزمانی بیگانە دەدوێ.

پاڵەوان ئەلیاسیش پیرە مێردێک بوو لە پاشماوەکانی شۆرشی ۱۸۲۱. دەتگوت بورجی کۆنە کەلەسەر چیا دروست کراوە. بەلاّم قەڵشی تیکەوتوە وگیای لێ شینبوە. دەرک و پەنجەرەی نەماوەو قوبەکانیشی خەرا بوون. لەشیکی وەک ئیسکلیتیشکاو، کورتە باڵا، گوللە هەموو لەشی داپێژ داپێژ کرد بوو. دەنگێکی گڕو توندی هەبوو . سلاّوی ئاسایی لە خەلک کردبا، بەدەنی دەلەرزی. یەکێ لە پاشاکانی تورک چاوی راستەی بە چەنگاڵی دەرهێنا بوو. بەو بۆنەوە ئەنجومەنی میللی ئاتیێن چاوێکی شوشەی بۆ نارد بوو. ئەوە هەروەڵێن چاوی شوشە بوو گەیشتبوە کریت. پاڵەوان ئەلیاس، خۆشی لە کەسێک نەهاتبا، بە چاوی شووشە تەماشای دەکرد. بەلاّم لە جێژنە رەسمیەکاندا ئەو چاوەی دەردەهێنا و بە چاوە ساخەکەی دەچوە لای پاشا یان خەلیفە، تا بە قسەی خۆی شۆرشی ساڵی ۱۸۲۱ وەبیر خاتەوە.

ئەو رۆژەش پاڵەوان ئەلیاس بە چاوێک دەچوە لای خەلیفە. لە کاتێکا قورس و بەرێز خۆی داوێشتە سەر کۆچانی، لە نێوە راستی دوو ریش سپیەکەی تر دەرویشت.

سێیەمیان ماوورودیسی پیر، نازناوی «جەعلی تەلاّیی»، کابرایەک بوو، لەچەر و پیس و ناجسن و سوتخۆر. تەواوی ساڵ تێری نەدەخوارد و لە زستاندا لە بەر رووتی و بێ بەرگی دەلەرزی.هەر بۆ ئەوەی کە پاشە کەوتی بکا.گەلێک بیوەژن و هەتیوی قەرزداری لە ساجی عەلی دانابوون. هەمیشە سکەی ئاڵتوونی کۆ دەکردنەوە. کۆمەلێک باخ و دارستان و خانووی شار و گوند و لۆتکە و پاپۆری وەسەریەک نابوون. کاتێک لێیان دە پرسی بۆچی ناخۆی؟ لە وەلاّم دا دەیگوت:

– ئەی بابە، چ هەیە، چ بخۆم ؟ من خۆم هیچم نیە، هەرچی هەیە ماڵی میللەتە و من نابێ دەستی لیبدەم.

پێش یازدە ساڵ لە سەرەتای شۆرشی۱۸۷۸، رۆژێکیان ماوورودیس بە کاغەزێکی تەمر لێدراو هاتە لای خەلیفە و وتی:

– باوکی پیرۆز، پایە بەرزا ئەم نامەیە وەرگرە. من بە گوێرەی ئەم نووسراوەیە تەواوی ماڵو سامانی خۆم بە شارداری کاندی بەخشیوە. تۆ هەموی بکە نەغدو بە پارەی ئەو چەک بکرە !

خەلیفە لە کاتێکا ئەسرینی لە چاوان گەرابوو پرسی:

– ئەدی بۆخۆت چۆن دەژی ؟

– خەمی من مەخۆ باوکی پیرۆز ، من سواڵ دەکەم.

خەلیفە پێشنیاری کرد کە مانگانەیەکی بدرێتیّ، بەلاّم پیرەمێرد دیسان بەزمەکەی گۆرینی دەست پێکردەوە . نەیدەخوارد و نەیدەخواردەوە، لیباسی لە بەر نەدەکرد. پارەی بە سوتی زۆر بە قەرز دەدا. هەتیو وبیوە ژنی ماڵوێران دەکردن، تا لەم ریگایەوە سەرووەت کۆ بکاتەوە. لە بەر ئەوەی پیر ببوو ، لاتێکی لە سەر لێوی گڵکۆ بوو، هەرچی هەیبوو دای بە شارداری کاندی. پیر ببوو، بەلاّم هێشتا فیکری کاری دەکردو سلاّمەتبوو. کاتێ گیروگرفتێک دەهاتە پێش ، خاچپەرستەکان بۆ پاریزگاری بەرژەوەندی خۆیان ئەو یان هەڵدەبژارد.

خەلیفە لە سەر دۆشەگی نەرم دانیشتبوو، چاوە ڕوانی ئەوانبوو. کتێبی ئینجیلی لە بەرگێکی ڕێزکفت دا لە بەر دەمی‌دانابوو.

لە بانسەری سێ ڕەسمی گەورە هەڵاوەسرا بوون. ڕەسمی ئوسقوفی‌گەورەی قوستەنتەنیە لە لای ڕاستی، لە لای چەپی ڕەسمی قەیسەری رووس و لە نێوە راستیش ڕەسمی سینت سۆفی. تیشکی هەتاو لە پشت شوشە پەنجەرەی ڕەنگینەوە هاتبوە ژوور و دیواری بەرامبەری عابی و بنەوش کرد بوو. ئەم دیوارە بە ڕەسمی قەشەکانی زیندو ومردو، بە ریشی سپی وەک بەفرو ڕەش‌ویە کلاوی بڵند و زنجیری ئاڵتون وجەواهیراتی بە نرخ و وەکازی ئوسقوفی، داپۆشرا بوو. هێندێ لەوان بە ئاشکرا بێ فیزو پیاو چاک بوون. ئەوەندەش تورکاوی بوون، وەبەرانی نەپراوەوە دەچوون. ئەوان بە سام و هەیبەتەوە وەکازی ئوسقوفی‌یان وەک چۆماخێک بە دەستەوە گرتبوو. لە نێوە ڕاستیاندا ،ڕەسمی‌خەلیفە خۆی لە سەردەمی‌گەنجیەتیدا، کاتێ لە شاری‌کێف نایبی ئوسقوف بوە، هەڵاوەسرا بوو. چ قەڵافەتێکی پیاوانە وبە شەوکەتو هەیکەلێکی بە هێزا کونە لوتی ئەوەندە فش‌و ئاواڵە بوون، دەتگوت دەیەوێ بە هەناسەیەک دنیا هەڵمژێ. لاوێکی وەها ڕەشیدی لێ پەیدا ببوو، دەیتوانی پێشەوایەکی بە توانا، یا پێغەمبەرێک، یا ژنبازێکی بە کاری لێ بێتە دەر. بەڵام مەسیح توانیبووی فریوی بدا و وتەی شیرین وەک هەنگوینی بە گوێچکەیدا بخوێنێ و لەو ڕێگایەی کە سروشت و سیفاتی بوو، لاری بکا و بۆ بەوزترین پلەی کلیسا ڕێنوێنی بکا.

خەلیفە لەبەر خۆیەوە دەیگوت:« حەیف کە پیر و وەک گیا سیس بووم. ئێستا لەو دەمە نیزیک دەبمەوە کە بە دەستی خاڵی نەشێ بچمە بەر دەرگای مردن. چەندە خەلیفەی کریتی هەن بە ڕاوەشاندنی ئەو ئامرازانەی پێی شەهید بوون، وەک خەنجەر و تەور وتەنافی دار و ئامرازی شکنجە دەچنە پێش بارەگای بەرز. بەڵام من دەستم خاڵی دەبێ! خوایە ئەم شانازیەش بدە بەمن کە لە ڕێگای‌تۆو لە ڕێگای کیژە فەقیری تۆ « کریت» دا شەهید بم .»

مورتزوفلوس بە سەر دانواندن هاتە ژوور و گوتی :

– باوکی رو حانی ، ریش‌سپی قەوم لێرەن و چاوە ڕوانن.

– بلێ بێنە ژوور. تۆش ئەوکەشەفە زێوە گەورە بۆ شت هێنان بۆ ئەوان ئامادە بکە. ئەوان مرۆڤی دە بەرێزن.

مورتزوفلوس لە بەر دەرگای ژوورەکە بە چاوە ڕوانی ڕاوەستا بوو. خەلیفە تەماشای کرد و گوتی:

– ها! مورتزوفلوس، بۆ ڕاوەستاوی، شتێکی دیکەت گەرەکە ؟

مورتزوفلوس جارێکی تر سەری دانواند و گوتی:« باوکی روحانی ! داخوا بۆ ئەو کارەی کردوومە لێم خۆش دەبی ؟ »

خەلیفە بزەیەکی هاتێ و گوی :

خەمێ مەخۆ مورتزوفلوس، مەسیح تۆ دەبەخشێ. بڕوای پێ بکە. ئەو بەخشندەو میهرەبانە

– ئاخر من گوناحێکی گەورە م کردوە ....

– ڕەحم و دڵسۆزی ئەو گەورە ترە ... بڕۆ ... دڵنیا بە.

سێ ریش سپی هاتنە ژوورو دەستی خەلیفەیان ماچکرد و لەسەر نیو تەخت دانیشتن.

تەسبیحەکانیان هێنا دەر چاوەڕوان مان تا لە پێشدا پیرە مێرد دایگیرسێنێ. خەلیفە کە لە پەنجەرەی پچوکی ژوورەکەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد گوتی:

– رۆڵەکانی من ئەوەتا بەهار داهاتوە و چەندە رۆژێکی خۆش و هەتاوە. بەهارە و مانگی حەزیرەتی سێ ژوورژە. باشە ...ماروەدیسی خۆشەویست ! ئەو ساڵ وەزعی مەزراگان چۆنە ؟

– لە سایەی خواوە وەزعی مەزراگان فرە خاسە ..

پاڵەوان ئەلیاس گوتی:« وەزعی مەزراگان باشە. بەڵام وەزعی ئینسانەکان باش نیە. من دیارە گردەوەی پاڵەوانان ئافەرین لێ دەکەم، بەو مەرجەی قازانجی هەبێ. ئەگەر وانەبێ، شێتی و کەللە رەقیە.»

حاجی ساواس هەڵبدایەو گوتی: « قەدیسەکان گوتوویانە ...

بەڵام پاڵەوان ئەلیاس بە تورەیی باسکی درێژ کرد و قسەکەی بڕی و گوتی:« رۆڵە تۆ لە قەدیسان گەڕێ، ئەوان مردون و رۆیشتوون. ئێستا پێویستە باسی زیندوان بکەین. تۆ، باوکی روحانی لەو بارەوە بیروڕات چیە ؟»

خەلیفە گوتی:

– من لە شیرین کاری تازەی پاڵەوان میکێلس ئاگادار بووم. حەیفە پیاوێکی ئاوا ئازا ، شەراب بیفەوتێنێ.

پاڵەوان ئەلیاس قسەی خەلیفەی راست کردەوە و گوتی :

– واتە ئەو هەمووومان دەفەوتێنێ، بەڵێ . سەری گشتمان بە فەتەرات دەدا. باوکی روحانی، پێویستە هەتا زوە پێشی ئەو پیاوە بگیرێ .. دەنا..

حاجی ساواس گوتی:« بۆ خاتری خوا شۆرش مەکەن. هێشتا لە کریت دا زۆر کار هەن دەبێ بکرێن.هێشتا زەویەکانی کریت پڕن لە شتی قەدیمی و عەنتیکە. خەزێنەی زێری تێدا شاردراونەوە.: وەکە پەیکەر، نوسراوە، کۆشکی پاشایان، کە دەبێ لە ناخی زەوی بێنەدەرێ! ئەگەر شۆرش بکرێ، ئەو زەویانە چۆن دە کۆڵرێنەوە؟ کەوابوو ...

پاڵەوان ئەلیاس بە توندی بەسەریدا گوڕاندی و گوتی:

– گوتم باسی قەدیسان مەکە! هەرچی کۆن و قەدیمە مردوو شۆڕ بیباتەوە. با بڕۆن و بۆر بن! تۆ ماوروودیسی خۆشە ویست قسە بکە. من فیکرم تووزێ پەرێشانە. بەڵام تۆ زەینت باشە....

چەعلی‌تەلایی لە خۆشیان بزەیەکی هاتێ‌و گوتی: « بە ئیجازەی ئێوە باوکی روحانی ....»

خەلیفە گوتی:

چێ دیکەت وەبیر هاتەوە کە پێدەکەنی ؟ تۆ فیکرێکی قوڵ و بڵاوت هەیە و ئەو فیکرەش لە پێناوی خێر و بەرژەوەندی مەسیحیەت دا بەکار دێنی.

ماوروودیسی پیر گوتی: « کەم بێژین و خاس بێژین . تۆ باوکی روحانی هەر ئێستا رابە و بچۆ لای پاشا. ئەو پیاوێکی سادەیە. بێجگە لە ئاسودەیی خۆی لە فیکری هیچی تردانیە. مرۆڤێکی تەواو رۆژ هەڵاتیە. لە کێشەو هەراو سەر یێشە بێزارە. هەرراست و درۆیەکی خوا لە دڵت دەنێ بۆی باسکەو چاوی پێ بنووسێنە. پێی بڵێ کە لێمان بووری، پاڵەوان میکێلس مەست بوە، ئێمە رادەکەین کە جارێکیدیکە کاری وا نەکا. بێجگە لەوە دیاریەکیشی وەک پێشکێش

بۆیەرە. وەک قوتوە سیغارێکی جوان، یا دەنکە کارەبایەکی گەورە، بۆ سەرە قەننە. ئوسقوف نشبنی ئێوە سەدان جەواهیر وشتی بە نرخی هەیەکە بۆ رازێ خۆی بەکار دێن. پاشا سەگێکە دەبێ بیلارێنیەوە. ئیسکی بخە پێش تا ماوەیەک بیکروسێنەوەو نەوەڕێ. لەو ماوەیەشدا شەرکەری ناوداری ئێمەپاڵەوان ئەلیاس دەچێ لە گەڵ پاڵەوان میکێلس قسە دەکا. هیوادارم خوا رەحم بکا.» پاڵەوان ئەلیاسی پیر سەرە پڕ لە شوێنە برینەکەی هەڵگراند و گوتی :

- لە دەرگا دانی پیاوی گەر حەوسەلەی دەوێ. ئەو کابرایە گوێ ناداتە قسەی کەس. هەرچی پێی بێژن وەک بە دیوار گوترا بێ وایە. لە گەڵ ئەوەش من دەیدوێنم. من پیرە پیاوم و شۆرشی ۱۸۲۱-م دیوە. لەوانەیە بە قسەی من بکا. هەر چۆنێک بێ باوکی روحانی پێم وایە راوێژکەری تۆ هەقی بێ. نوێژەکەت بکەو وەکازی ئوسقوفیت بە دەستەوە گرە و بچۆ کن پاشا. بەلام زوو بجوڵێوە تا برین چڵکی نەکردوە عیلاجی بکە.

کمشەفی زێو بە قاوەو کو لیچەی قەندی و مورەبباوە گەیشتن. ریش سپی تاوێک مات بوون. بۆنی دارە لیمۆی گوڵکردوو لە پەنجەرەوە دەهاتە ژوور. مێش هەنگوینێک هاتە ژوور ولە سەر سەری زەلامەکان سوڕاوە کە زانی گوڵ نین ، لێی داروێشت.

سێ ریش سپی قاوەیان هەڵدەقوڕاند و بە ئیشتیا ملچەیان لە زاری دەهێنا. کاری دەوڵەتی تەواو ببوو، ئێستا کاری راستە قینەی خۆیان دیتبۆوە و قاوەی‌سەر بە شیرو کولیچەی قەندی لەوەختی خۆیدا هاتبوو. حاجی ساواس بە ئیجازەی خەلیفە سیغارێکی هەڵبەست و ئەوانی دیکە ش‌لاسایان کردەوە. هەموو چاویان نیوە نوقاو بوو. دووکەڵی سیغاریان وەک مارپێچ دەچوە سەر وێنەی ئوسقوف و قەیسەر و سینت سوفی دادەگرت .

خەلیفە مجری بەر دەستی خۆی کردەوەو گوتی :

- رۆڵەکانم ! من دەمەوێ رەسمێکی سەیر بە ئێوە نیشان بدەم. بەلام نارەحەت مەبن. ئێوە کە مورتزوفلوس دەناسن؟ ئەو رەسمە ئەو کێشاویە. ئەو لە خوا دەترسێ، بەلام پیاوێکی دڵپاکە و خەیاڵێکی قەوی هەیە. ئەو هێندێ شت دەبینێ کە ئێمە نایبینین. ئەوەش لەبەر ئەوە نیە کە هێندێ شت وجودیان نیە بەڵکوو لە بەرئەوەیە کە خودا چاوی ئێمەی بەستوە. وەک ئەو ئەسپانەی کە ئاویان پێ هەڵدەکێشن و چاویان دەبەستن کە تەنیا پێش لاقی خۆیان ببیان. کێ چوزانی کە خودا بۆ چاوی بێ‌مێشکانی نەبەستوە.؟ لە مجری‌یەکەیدا دەستی بەگەران کرد‌شتێکی لە پەڕیەکی سپی هێنا دەر ودای بە ریش سپیەکان . پاڵەوان ئەلیاس رەسمەکەی وەرگرت‌ە لە سەر ئەژنۆی خۆی دانا و بە چاوێک ئەماشای کردو گوتی:

- ئەوە رەسمی لە چوار میخەدانی عیسایە. بەلام چاوی من باش نابینێ. سەری ئەوی گرد تا باشتر بیبینێ. ماوروەیسیش تەماشای کرد و هاوارێکی کرد و گوتی:« خوا لێم خۆش بێ، یا چاوەکانی منیش نا بینن و یا ئەو .... حاجی ساواس کە چاویلکەیەکی زەڕە بینی لە گیرفانی هێنا دەر و بە وردی تەماشای رەسمەکەی کرد و هاواری کرد :

- بە بە ! چەندە باشە ! چخەیاڵێکی سەیرا دەستت ئەرزێ مورتزوفلوس بە راستی لە چوار میخەدانی راستە قینە ئەوەیە. بڕوا بکەن ئەگەر من قەشە بام، ئەو رەسمەم لە میحرابی کلیسا هەڵدەواسی.»

خەلیفە بزەیەکی تاڵی هاتەسەر لێوان و سەری راوەشاند. ماورودیسی پیر گوتی:

- بەلام خودای من، ئەوە کە رەسمی لە چوار میخەدانی عیسا نیە، بەڵکوو ژنێکە فانوسقەیەکی جوان و دەمانچەیەکی زێوی پێیە!.

خەلیفە کە قین بەری ئەوکی گرتبوو گوتی :

- بەڵێ، ئەوە رەسمی کریتە ، دوبرگەی کریت ! دەبینن کە خاچەکەیان لە ئێسکی کەللەسەری مرۆڤێک داوە. لەسەرەوەی رەسم عاسمانێکە بە هەوری رەش داپۆشراوە. لەخوارەوەی رەسمەکەلە لای چەپ بروسکێک هاتوەکە دێر رووشن دەکا.

منارەی زەنگوڵەکان وئاشی پای پەنا ئەو گومبەزەی عیبادەتخانە و دیوارەکانی و قەلاو بورجەکانی تەماشا بکەن. ئەوە عیبادەتخانەی ئارکادی یە.کریت - پش بەو دەسماڵە رەشەی کە لە سەری هالاندوە، لە خاچەکە بزمار کوت کراوە و خوێنی بە سەررۆڵە پاشماوەکانی دا دەرژێ. لە هەموو لاوە دوو پاڵەوانی‌کلاو بە سەروێستاون، یەکیان پیرەو یەک‌گەنجە

ماورودیسی پیر گوتی:« نەوارێک لە زاری هاتۆتە دەر و نووسراوەیەکی تێدایە دەڵێی‌و هاوار دەکا... »

پاڵەوان ئەلیاس پرسی: « دەڵێ چی ؟. داهاتەوە بەلام خەتەکەی بۆی لێک نە دەکرایەوە. حاجی ساواس چاویلکەی زەرەبینی خۆی دەرهێناو ئاوای خوێندەوە :

خەلیفە ئاوای وەرگێراوە :« خوای من، خوای من، بۆ چی منت بەرەڵا کرد ؟»

هەموویان تا ماوەیەک بێدەنگ بوون. هەرچواریان سەریان بە سەر ئەو رەسمەداگرتبوو تەماشایان دەکرد کە شێوەیەکی تازەی خاچ کێشانی نیشان دەدا. هەناسەیان هەڵدەکێشا. ئاخرەکەی ماورودیسی پیر وەدەنگ هات و پرسی:

- بەلام باوکی روحانی ئەوە نابێتە گوناح کە لە جیاتی مەسیح کریت لە سەر خاچ نیشان بدەن؟

خەلیفە گوتی : « بۆچی... بۆ چی.. بەلام ..... »

- بەلامی چی .؟

خەلیفە بە منگە منگ گوتی : « بەلام زەحمەتەکەی دێنێ ... »

بەراستی مورتزوفلوس چەند باش نەقاشی کرد بوو. چەندەرەنج و ئازار کەوتبوە سەر دەموچاوی. روومەتی لاواز و چاوە رەشەکانی پڕ لە ئەسرین بوون. وادەهاتە بەر چاو لە لێوە ناسک و نیوە ئاواڵەکەی کە لە بەر ئێش و ئازار کز ببۆوە، ئاخ و ناڵین دەباری. لاقی روت و خوێناوی بریقەیان دەهات ودوو لنگە چەکمە یەکیان زەردو ئەوی تریان سپی کەوتبوونە بەر پێی خاچەکە. پاڵەوان ئەلیاس لە پڕ وەک بریارێکی کوتو پڕی دابێ، بە جولانەوەیەکی خێرا کلاوەکەی لە سەری هەڵگرت، رەسمەکەی گرت و بۆ لای لێوەکانی برد و هەر لەو کاتەشدا سینگی پانی دەهاژا. ماورودیس چاوە روانبوو، چونکە خۆی پێ رانەگیرا رەسمەکەی لە دەستی شەرِوانی پیر رفاند. بە روومەتی خۆیەوە ناو لە کاتێکا زۆر زۆر دەگریاماچیکرد. حا جی ساواس چاوەکانی سڕیەوە، لە پەنجەرە وەنیزیک کەوت و تەماشای دەرەوەی کرد کە دارلیمۆیەکی گوڵکردوو دەهینرا.

خەلیفە رەسمەکەی گرت و نیشانی خاچی کێشا و لە کاتێکا دەقە خوێناویەکانی کریتی ماچ

دەکرد گوتی :
- ئیمە لە بەرامبەر شەهیدبوونی کریت دا سەری مەزنەتی دادەنوێنین و سوژدەی بۆ دەبەین.
پاشان هەرچواریان خۆیان پێ ڕانەگیراو دەستیان کردبە گریان. لە پێشداخەلیفە ژیر بۆوە، ڕەسمەکەی لە پەڕۆی سپی وەر پیچاوەو لە مجریدا شاردیەوە. پاشان هەموو هێزی خۆی کۆکردەوە، هەستاو گوتی:
- ئێستا ئیتر بڕۆن . دوعای بە خێری من لە گەڵتان بێ,و خوداش بەرەکەت خۆی لە ئێوە نەگێڕێتەوە.
پاڵەوان ئەلیاس گوتی :« باوکی روحانی لە پێشدا پێویستە خۆمان بجوڵێنین. ئەوەی بزانە ئەگەر عەبد خۆی نەجوڵێ، خوداش بەرەکەتی بە سەردا نابارێنێ.
- زۆر ڕاستە، ئافەرین پاڵەوان ئەلیاسی خۆشەویست امنیش ئێستا دەچمە کن پاشا. خوا بکا بە کەیف بێ.
ریشسپیەکان دەستی سپێ و قەڵەوی خەلیفەیان ماچکرد. پاڵەوان ئەلیاس دەستی داچۆماخەکەی کە لە هاتنە ژوورەدا لە بەر دەرگای دانابوو، وەدەر کەوت. ئەوانی دیکەش بە دوایدا.پاشان تا چاوی بە دەست و قاچی مەڕ مەڕ و سەری براو ونوسراوەکە کەوت، سەرێکی لەقاند ولە بەر خۆیەوە بە تووڕەیی گوتی:« عە تتیکە ... عەتتیکە ...»
حاجی ساواس داهاتەوە و دەستی کرد بە خوێندنەوەی ئەم نەخشانە کە لە بەردی هەڵکەنرا بوون. پاڵەوان ئەلیاس بە هاوڕێی پیری خۆی گوت :« لێگەڕێ با بڕۆین. لە دنیادا ٧٧ جۆر دین هەن. منیش ئێستا دەچمە لای پاڵەوان میکێلس، تۆش دۆستی تورکی وەک سەلیماغات هەیە، بڕۆ بیاندۆزەوە و بۆ خاتری خوا کارێکی وابکەن کە شۆڕشی بێ وەخت سەر هەڵنەدا. کریت بەشی خۆی بە هەڵدەداچوو، ئیتر بەسە.
باربایانیس لە پێش بارەگای نوسقوف نشین چاوە ڕوانی ئەوان بوو. ئەو قەرتاڵەی کە سەهۆڵی لە نێو کادا تێدا ڕاگرتبوو، لە گەڵ گۆزەی‌مەفرەقی پڕلە شەربەتی‌خەرنوبی شامی لەوێ دانابوو. جاروبار ئەگەر کەسێک بەوێدا ڕادەبرد، بۆ نیشاندانی کاڵای خۆی هاواری دەکرد :
- ئای شەربەت ! وەرن شەربەتی سارد، شەربەتی گوڵاوم هەیە. دوو بارە پێدەنگ دەبۆوە.
باربایانیس پیرێکی کورتە باڵابوو، حەوت مانگی لە دایک ببوو. سەرێکی خڕوچکۆڵەو چاوی چوک و ورد هەمیشە لە کاسیلکەدادەسوڕانەوە. ملی دەتگوت ملی لەگلەگبە درێژ و چرچ ببوو. دەنگێکی تیژ و ناخۆش، گوێچکەی خەڵکی کەر دەکرد. تورک و مەسیحی هەموو بە شێتیان دەزانی. چونکە لە هیچیان نەدەترسا. هەرچی لە دلیدا بوو بێ باک دەیگوت. هەمیشە جنێوی دەدا وبەئاشکرا لەعنەتی لە عیسا و محەمەدو سوڵتانی وەسمانی دەکرد. چەند ساڵ پێش لە ڕۆژی جێژنی پاکدا باربایانیس لە پێش مستەفا پاشای زۆردار و خوێنخۆری کریت ڕادەوەستێ و شەربەتێکی پڕ لە سەهۆڵی بۆ تێدەکا. لە پڕ بە سەریدا دێ و بۆ ئەومەسیحیانەی لە ئارکادی کوژرا بوون دەست بە گریانو هاوار دەکا. پاشان هەروەک ئاگریان پێوە نابێ دەست دەکا بە سەماو هەڵپەڕین.پاشاو دەست و پێوەندی لە بن سێبەرێ تەنتەی دەکێشن و تەماشای ئەو دیمەنە دەکەن. خەڵک لێی کۆ دەبنەوە و دەوری دەدەن. باربایانیس تا دێ گەرمتر و دێنتر دەبێ. لە پڕ دادێتەوە

عەرزو شوڵکێک هەڵدەگرێتەوەو بە خەیاڵی خۆی دەست دەکا بە شیر وەشاندن. دوای ئەوە لە پڕ دەست دەکا بە گۆرانی گوتن. کەم کەم لە پاشا وەنیزیک دەکەوێ و چاوی لێ تیج و خوار دەکا و گۆیا دەیەوێ بیترسێنێ. بە گۆرانی دەڵێ :

– ئەی شیر وەشێنی جوانی من، ئەوە تۆی کە دەبێ سەری هەموو تورکان بپەڕێنی. مەسیحی و تورک هەموو ناڕەحەت دەبن. چاوە نوارن کە پاشا کارێکی بەسەر بێنێ. بەڵام پاشا لە قاقای پێکەنین دەداو دەست دەکا بە چەپڵە لێدان. تەماشا کردنی ئەو پیرە قوڵەو ڕزیوە بۆ پاشا ئەوەندە سەیر بوو کە بە شوڵک هەڕەشە لە تورکان دەکا. بانگی کرد و گوتی:«ئافەرین پاڵەوان باربایانیس، ئافەرین! وەرە نێرە بزانم. ئیتر بەسە. وەرە پێشتر. تۆ مێشکت کارناکاو خۆشم دەوێی.هەر ئێستا شیرێکی ڕاستیت بە خەڵات دەدەمێ. میداڵێکی گەورەو تورسیشت وە سینگی دەخەم. ئەوە میداڵی دەستی حەزرەتی فاتیمەیە کە نیشانی پێغەمبەرە. ئەوەش بزانە هەموو ساڵێ ڕۆژی جێژنی پاک ئیجازەت هەیە شیری لە خۆت ببەستی و میداڵ لە سینگت بدەی، لە شاری کاندی لە دەروازەی(کانە) تا دەروازەی(لازارە)، لەو لاشەوە لە دەروازەی (تازە) تا دەروازەی(لەنگەر:ا) وەک پاشایەکی بە ڕاستی بسوڕێیەوە. دەتوانی لەم ڕۆژەدا هەرچی بەسەر زارت دادێ بیڵێی و کێنت دەرێ جنێوی پێ بدەی.و لەعنەتی لێ بکەی. تۆ دینی و دینهیچیان لە سەر نیە. باربایانیسی مەلعون ئەمڕۆ دڵی تێمەت خۆشکرد و چەند ساڵبوو ئەوەندە کەیفم نەکردبوو.»

لەو ڕۆژەوە ئیتر باربانیس ئازاتر بوو. تورک بە بالوڵی قسە خۆشیان دەزانی. هەر بۆیەش‌هەرچی‌گوتبای لێیان نەدەگرت. و بە قسەکانی خۆش دەبوون. بەو شێوە باربایانیس ببوە تاقە پیاوی ئازادی کاندی. کاتێک دەهات هەرایەک ساز بێ، بەر لە هەموو کەس باربایانیس دەیزانی. لە قاوەخانەی تورکان دەگەڕاو ئەوەی مەسیحی نەیاندەوێرا دەریببڕن، ئەو لە هاویندا بە هەرای شەربەت و لە زستاندا بە هەرای شیرینی دەری دەبڕی و لەو ڕێگایەوە تۆڵەی دنیای مەسیحیەتی دەکردەوە. هێندێ جار کە لە تامی دەبردە دەر چەند چەپۆکی وێ دەکەوتن و یا تونلکە لیمۆ و تەماتەی ڕزیوی پێ دادەدرا. بەڵام باربایانیس سەروچاوی خاوێن دەکردەوە و دوو بارە زمانی دەکەوتەوە کار.

ئەو لە شەوی پێشووە بۆنی باروتی کردبوو. کاتێک بەیانی دیتبووی کە سێ کەس لە ریش سپیەکانی قەوم بە ڕوو گرژی چوو بوونە کن خەلیفە لە بەر دەرگا وێستا بوو چاوەڕوانی دەکرد بزانێ چیاسە. جێژنی پاک وەنیزیک دەکەوت. ئەو بەو زوانە شیری لە پشتێ دەبەست ومیداڵی تەنەکەی بە خۆوە هەڵداوەسی و دەچوە سێتاق تا لەو سەعاتەدا کە پاشاو داروودەستەی بۆ بیئینێ مرسیقای نیزامیکز دەبوونەوە، کوڵیدڵی خۆیان پێ بڕێژێ.. تا دڵی ...ڕعبەتە فەقیرانە ئێنک کاتەوە کە ئاواتیان بوو ئەوەی لە دڵیان دایە دەری ببڕن، بەڵا، بیرکردنەوەی ئەو کارە لەشی دەلەرزاندن.

تا چاوی بە دوو کەس لە ڕیش سپیەکان کەوت کە لە ماڵی خەلیفە دێنە دەر، قەرتاڵەو گۆزەڵەی شەربەتی هەڵگرت ولێیان وەنیزیک کەوت و گوتی :

سڵاو لە ئێوە کەیخودای قەوم! ڕاوەستن تا شەربەتێکتان بدەمێ و هەناوتان فێنک کەمەوە.

ئەم ڕۆ هەوای گەرم کردوە.

پاڵەوان ئەلیاس گوتی :« لێمان گەڕێ بارباپانیس، شەریەتی تۆمان ناوێ .»

- ها پاڵەوا ئەلیاس لێم تووڕە مەبە. هەوەڵەن من لە تۆ ناترسێم. بێجگە لەوە تۆ دەزانی من پیاوێکی دینم، نە لە پاشا دە ترسێم و نە لە سولتان. ئێوە زاناگانی قەوم و پاڵەوانەگان هەمووتان دەرپێ پیس دەکەن، بەلام بارباپانیس شیرو فەرمانی هەیە وکە للەیەکی بێ مێشک و هیچ ناترسێ. هەرچی دەیەوێ دەری دەبڕێ.

جەعلی تەلایی هەوای دەنگی دانواند وگوتی :

- بارباپانیس بە قازاخچی تۆیە کە زارت بەستی هێشتا وەختی ئەو قسانە نەهاتوە. بارباپانیس دەنگی نەوی کرد و گوتی :

- کەوابوو کەنگێ وەختی دێ ؟ دەمەوێ ئەوەی بزانم .

پاڵەوان ئەلیاس بە هەڕەشە چۆماخی ڕاوەشاند، بارباپانیس شەکانی کۆ کردەوەو ڕایکرد.

* * *

خەلیفە زنجیرێکی لە گەڵ مەدالیکی ئالتونی میناکاری چەندرەنگی دەملیکردکە لە لایک عەبای لەچوارمیخەدراوولایەکی دیکەشەوە بە نەخشی ڕاپەڕین نەخشا بوو. قوتوە سیفارێکی قەدیمی زێو کاری سەنعەتکارانی بە ناوبانگی(ژانینا)ی خستە گیرفانی کە خەلیفەی ژانیتا بە دیاری بۆ هێنابوو. وەکازی ئوسقوفی بەدەستەوە گرت و لە گەڵ جاش قەشەیەک بە پێیان بۆ لای ماڵی پاشا کەوتە ڕێ.

پاشا لەو کاتەدا لە سەر دۆشەگی نەرم لە سەر گازی پشتێ ڕاکشا بوو، خەوی لێکەوتبوو. لە خەویدا ئەوا لە باخەکانی وڵاتی خۆی(بروسە) دەسوڕێتەوە. دارەکانی پڕ لە گوڵو میوە، لقەکانیان وەک باسکی هەشت پای بەحری لە بان سەری ئەو بڵاو کردۆتەوە. قەتنەی دەکیشا بە ڕێگاوەر خۆی لە بەهەشتی بەرین هەست پێدەکرد و هەموو کاتێ چاوەڕوانی ئەوە بوو کە وا پێغەمبەر دێ و بەخێر ها تی دەکات. بەلام کاتێ لە قوژبنی باخ بایداوە، چاوی بە داروەبتوونێکی خوارو خێچ و بێ گەڵا کە ت کە بروسکە لێی داوە خواری کردوە وسەر لقەکانی میوەی سەیریان پێوەیە کە جگە لە تفەنگ . خەنجەر و فیشەک و دەسماڵی ڕەش شتێکی ترنەبوو. پاشا لە ترسان هاواری کرد و فیکری کردەوە کە ئەوە چدارزەیتوونێکی لەعنەتیە لە جیاتی زەیتون چەکی پێوە بوە.! هەرلە ڕێگای خۆی گەڕایەوە تا باخی پڕ گوڵ و میوە ببۆزێتەوە. بەلام ئەو باخە ئیتر نەما بوو. لە جێگای ئەو بێجگە لە بەردەلانێکی وشک و بێ ئاو وگیا هیچی تر نەدەبینرا. لە پشت هەموو بەردێک لولەی تفەنگ و دەمانچە سیرەیان گرتبوو. پاشا لە پڕ هاواری کرد:

- کریت...کریت لە خەو ڕاپەڕی. لەو کاتەدا سولەیمانی قولەڕەشدەرگای کردەوە گوتی:

- پاشا ئەفەندم، خەلیفەی گەورەی یونانیان هاتوە ، ئەوەتا لە پلیکانان سەر دەکەوێ. پاشا ئارەقەی ساردی لە لاچاینگان پاک کردەوەو گوتی:

- سولەیمان خەونێکی ناخۆشم دیوە، دەڵێی چی بەو مەشکە پڕ لە شۆربایە بڵێم ئێستا بڕوا گۆڕی گوم کا؟ پاشان ناوێک بیری کردەوە و گوتی :

- نا .. سولەیمان ، بەڵێ با بێتە ژوور. ئەو کافرانە دەستیان لە لێکدانەوەی خەوندا هەیە.ئەو دەزانێ خەونی من لێک داتەوە. بیهێنە ژوورێ. خەلیفە وەژوور کەوت. هەرتک پێشەوا چاک و خۆشیەکی گەرمیان کرد.ئێستا دوو کەسی گرنگی کریتی، یەک تورک و یەک مەسیحی چاویان پێک دەکەوت. هەرتک وەک دووپاشا لە وڵاتێکی هاو سنور بوون. گەرەکی تورک و مەسیحی وەک خاچ و مانگی یەکشەوە تێکەڵ ببوون. هێندێ جار نێوانیان خۆش بوو، هێندێ جاریش قین و دوژمنایەتی دە گەیشتە پێک وەڕین و یەکتر گەستن.

هەرتکیان لە سەرتەخت لە پەنا یەکتر دانیشتن. پاشا قەنتەی خۆی داگیرساند و خەلیفەش تەسبیحی مەرجانی دەنک رەشی لە گیرفان هێنا دەرو دەستی بە گێڕان کرد و بیری لەوە دەکردەوە لە کوێوە دەست پێ بکات. لەو پەنجەرەوە کە بەرەو رووی ئەوان کرابۆوە، لە لای چەپەوە بەندیخانەی شار ولە لای راستەش هەمان پیرە چناری گوزین دیار بوو. ئەگەر کەمێک بۆ پێشەوە خوار دەبوونەوە، کانی بە ناوبانگی ونیزی بە شێرە مەڕ مەڕە کانیەوە دەبینران. بایەکی نەرمی دەهات.

دوای ئەوەی کە پاشا باوێشکێکی هاتێ گوتی:

- خەلیفە ئەفەندم، ئەوە هەوای خۆشی بەهارێ هاتەوە. ئەلاّ ئەلاّ تەمەن چەند بە خێرایی تێ دەپەڕێ. ئەم دنیایە دەسوڕێ و ئێمەش لەگەڵ ئەو. زستان دێ خەڵک دەڵێن لە سەرمان مردین، هێشتا سکالاّیان تەواو نەبوە، هاوین دادێ. ئەو جار دەڵێن لە گەرمان خنکاین.تا چاو لێک دەنێی دەنگی گرمەی هەور دەبیسرێ و باران دایدەداتێ. ئەو دەم هەموو دەبێ بارانی دەبەر کەین. ئاخر ئایینی تۆ لە بارەی خیلقەتەوە دەڵێ چی؟

پاشا بێ ئەوەی رێگا بدا کە خەلیفە جواب بداتەوە خەونەکەی وەبیر هاتەوە کە وەک خۆرە هەناوی دەخواردەوە. دووبارە گوتی: « راستی خەلیفە ئەفەندم تۆ بڕوات بە خەون هەیە.؟ سەرچاوەی خەون چیە و کێ ئەو خەونانە بۆ ئێمە دەنێرێ؟»

خەلیفە لە وەلاّمدا گوتی: « ئەم خەونانە هێندێکیان خوا دەیاننێرێ و هێندێکیش شەیتان »

- تۆ دەتوانی خەونەکانی خوا دەیاننێرێ، لەگەڵ هی شەیتان لێک جیا کەیەوە ؟

- پاشا ئەفەندم وادیارە خەونت دیوە. من شەقڵی ئەو خەونە لەسەر چاوەکانت دەبینم.

- بەڵێ خەونم دیوە. هەر بۆیەش لە تۆم پرسی بڕوات بە خەون هەیە یان نا ؟

- وەخێر گەڕێ پاشا ئەفەندم. بیگێڕەوە بزانم چت دیوە.؟

- تۆ دەزانی خەون لێکدەیەوە ؟

- هێندێ جار خوا لە دڵم دەنێ و ئەودەم دەتوانم خەون لێک دەمەوە. باشە. چخەونێکت دیوە!

پاشا هەناسێکی هەڵکێشا و باسی خەونەکەی کرد و بە تایبەت بۆ ئەوەی تەشەی کافران بترسێنێ هێندێ شاخ و باڵیشی پێوە نا و گوتی :« سەری بڕاویش بە لکی دار زەیتونەکانەوە هەلاوەسرا بوو.»

خەلیفە سەری وەک سەری شێری بەرداب‌ۆوە. هەوڵیدەدا کە ئەو خاڵە بدۆزێتەوە کە دەیویست لەگەڵ پاشا باسی بکا. پاشا بەنیگەرانی پرسی:

داخوا خەونی من خەونی شەیتانیە ؟

خەلیفە لە وەلأمدا گوتی: « سوێند بە زاتی خوا خەونی شەیتانی نیە. بەلأم نازانم پاشا ئەفەندم چۆنت بۆ لێک دەمەوە کە نارەحەت نەبی.

- من نارەحەت نابم . کە وابوو تۆ نازانی کە موسولمانی بەراستی قەت نارەحەت نابی.؟ موسولمانی بە راستی دەزانی هەرچی لەم دنیایە روویدا ، ئەلەمی لێدراوەو کەس ناتوانی بیگۆڕی. وای دابنێ کە سولتان فەرمان بداو سەری منی بوێ. دیارە من خەمبار دەبم. بەلأم دلم نایێشێ، چونکە قەزاو قەدەر وایە. بۆ چما من دەتوانم فەرمانی خوا بگۆڕم؟ کە وابوو خەلیفە ئەفەندم، هەرچی دەیزانی بە بێ ترس بیلێ، بەلأم درۆ مەکە. من دەمەوێ راستی ببیسم.

خەلیفە ماوەیەکی درێژ ڕیکری خۆی کۆکردەوەو ئاخرەکەی گوتی :

- ئەو باخەی تۆ لەخەوت دیوە دلی ئینسانە. بەلێ پاشا ئەفەندم دلێ تۆ باخێکە . کاتێ شەو ئەو باخە دەکرێتەوە و تۆ بۆ گەران و رابواردن دەچیە ناوی. ئەوەی تۆ لە خەوت دیوە. وەلأمێکە بە سروشت و سیفاتی تۆ. واتە تۆ دەتەوێ لە ئاشتی و خۆشیدا بژی. بە ئارامی لەبن داری پڕ لە گول و میوەی نیشتمانی خۆت دا(بروسە) بسووڕێیەوەو کەیفێ بکەی. دلی تۆ باخێکە، بەلأم قەزاو قەدەر وایهێنا بوو ببی بە پاشا و بتنێرن بۆ کریت...

پاشا هەناسەیەکی هەلکێشاو گوتی:

- سەیرە خەلیفە ئەفەندم. زۆر سەیرە! باوەڕ بکە ئەوەی تۆ گوتت راست وایە. هەر دەلێی تۆ لە دلی من دابووی.. باشە درێژەی بدە بزانم....

- مەتلەب رووناکە پاشا ئەفەندم. بۆ تێگەیشتنی رێگای دوور پێویست نیە. ئەودار زەیتوونەی بە پارە چەکەوە هاتۆتە خەوت، هەر ئەم ولأتەی کریتە. تۆ چوویە بن ئەو داری بروسکە لێدراو ونارەحەت بووی. لێرەدایە کە چارە نووسی تۆ دەست بە گۆڕان دەکا. بەلأم حەیف کە وەخەبەر هاتووی، پاشماوەی رووداوەکانت نەدیوە. رەنگە هەر لەو دەمەوە خوا بڕیاری دابێ کە لە دانانی چارە نووسی خۆت دا ئازاد بی و ئەوەی دلت دەیخوازێ ئەنجامی بدەی.. بە راستی حەیف کە وەخەبەر هاتووی! پاشای دلپاک گوتی:

- ئاخ خەلیفە ئەفەندم، بە راستی ئەوەی تۆ دەیبێژی ئەگەر وابایە، ئێستا تورک و مەسیحی وەک دوو برا پێکەوە دەژیان. یونانیەکان کاریان دەکرد وتورکیش دەیانخواردو هەمووشیان بە خۆشی دەژیان.

خەلیفە کە ئێستا سەر هەودای مەبەستەکەی خۆی دیتبۆوە، گوتی :

- ئەو مەسەلەیە لە دەستی تۆ دایە. تۆی کە دەتوانی لە دورگەی ئێمەدا برایەتی دابمەزرێنی . خودا تۆی دەخەو کردوە تا ئەوەت تێ بگەیێنێ. خودا زۆر جار بە هۆی خەونەوە لەگەل عەبدی خۆی دەدوێ .

- خەلیفە ئەفەندم ! پترى روونی بکەوە من باش تێ نەگەیشتم ....

- ئەشێ بزانی کە نێوانی تورک و مەسیحیان لە کاندی وا خەریکە تێک دەچێ. وادیارە سوارێک بە مەستی وەنێو ئاوەخانەی تورکان کەوتوە.

لە پڕ بروسکێک لە چاوی پاشا دەر پەڕی و گوتی:« پێت وایە ئەوە کارێکی پچوکە : ئەو کافرە ئابڕووی دەولەتی وەسمانی بردوە.»

خەلیفە دەنگی خۆی نەرم کردو گوتی:
پاشانەفەندم، ئابرووی دەوڵەتی عوسمانی، ئەمسوڵتانە بە دەسەڵاتە هەروابە هاسانی ناچێ. جاری با لە باسی سەرخۆشیک گەڕێین. ناتەوێ لە بارەی خەونەکەت روونت بکەمەوە. کەوابوو گوێ بدەیە: من لام وایە خودا لەو سەعاتەدا لیکدانەوەی خەونی تۆ لە دڵی من دەنێ و دەتوانم بە درێژی بۆت روون کەمەوە. لە گەڵ ئەوەش ئەگەر ناتەوێ گوێ بدەیەی .....
پاشا دەستی لە سەر ئەژنۆی خەلیفەی دانار بە ئاهەنگی پارانەوە گوتی :
بە ناوی خوا زۆر حەز دەکەم قسە بکەی. تکا دە کەم... خەلیفە گوتی :
- حەوت عاسمان قەڵشیون، خوا هاتۆتە خوار و هاتۆتە خەونت تا ئەو رێگای پێویستە نیشانت بدا.
- کام رێگا ؟
- ئەو رێگەیەی خۆت بتەوێ هەڵبژێری. دوو رێگا هەنە. رێگایەکی سەوز و یەکی سوور. من ئەو دوو رێگایە بە روونی لە خەوتی تۆدا دەبینم. هەردکیان لە بەر پێی تۆدا گراونەوە. ئێستا کامیانت بە کەیفێ‌یە دەتوانی هەڵیان بژێری .
پاشا بە جۆرێکی رەخنە گرانە گوتی :
- نا.. نەک ئەو رێگایەی خۆم گەرەکمە، بەڵکوو ئەو رێگەیەی کە خودا بۆی هەڵبژاردووم.
- لە پێشدا گوتم ، دوور نیە کە خوا وای دانابێ کە تۆ لە هەڵبژاردنی یەکێکیان سەر پشک بی. تۆ دەتوانی رێگای سوور هەڵبژێری و دەست بکەی بە سەر بڕین و لە داردانی خەڵک ،کریت ئاگر تێ بەر دەی. دەشتوانی رێگای سەوز هەڵبژێری و ئەو دەم ژیان وەک هەنگوین و شیری لێ دێت. تورک و مەسیحی یەکتر لە ئامێز دەگرنەوە. دنیاش بە چاکە یاسی تۆ دەکا. ئێستا کامەت دەوێ هەڵبیژێرە !
بە دوای ئەو قسانەدا، خەلیفە بێ ئەوەی بێڵێ پاشا فیکر بکاتەوە، قوتوو سیغاری گران قیمەتی لە گیرفانی هێنا دەر و زۆر بە ڕیزەوە گوتی:
- پاشا ئەفەندم تۆ پیاوێکی بە سەلیقەی، قەدری شتی باش دەزانی. ئەم قوتوو سیغارە کاری (ژانینا)یە. کارێکی فرە بەرزو زەریف و دەستکردی وەستای هونەرمەندە. لە لایەکی نەخشی هەڵۆیەکی دووسەرە و لە لایەکی تر نەخشی مانگی یەکشەوەیە. ئەوەش بە مانای برایەتی نێوان تورک و مەسیحیانە. ماوەیەک بوو چونکە ئاگاداری ئارەزووی دڵی تۆ بووم، دەمویست ئەم قوتووت بە دیاری پێشکێش بکەم. ئێستا ئەوە دەرفەت هاتوە .
ئەوەی گوت و قوتوو سیغاری لە پێش پاشا دانا. پاشا بە چاوی دەستخۆشانەوە تەماشای دیاری خەلیفەی کرد و گوتی :
- بە ناوی خوا ئێوەی یونانی رەگەزی ئەهەدین. دەتوانن بە هەنگوین یا بە سرکە مێش بگرن... خوار بۆوە و نوکی پەنجەی بە سەری قوتوو سیغارەکەدا هێنا و زۆر بە سپایی گوتی:
- ئاخ خەلیفە ئەفەندم ! ئەگەر بزانی ئەم قوتوو سیغارە رۆژی چەندە خۆش و کامرانی وەبیر من دێنێتەوە. ژنی هەرەولی من خوا لە تەبەرەداروحی شادکا، کیژێکی خەڵکی (ژانینا)

بوو.لەجوانیشدا« فروسینی» بوو.(فرۆسینی(١)) یەکێ لەنەجیب زادەکانی یونانی بوو، خەڵکی (ئیپیر).لە جوانی و بە هۆشیدا بە ناو بانگ بوو. ساڵی١٨٠١ بە فەرمانی عەلی پاشا لە گۆلی«ژانینا»دا خنکاندیان« ( وەرگێڕی فەرانسەیی).
پاشا لێرەدا هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی :
- بە راستی خەلیفە ئەفەندم ئەمە چ رازێکە.ئەم مردن و ژیان و ئەڤینە چ مەتەڵۆکەیێکن ؟بەڵام تۆ ناتوانی تێ بگەی، چونکە قەت لە خۆشی و لەزەتی ژن ئاگادار نەبووی .
هەر تک بێدەنگ بوون. خەلیفە لەگەڵ ئەوە کە تەسبیحی دەگێڕان، لە پەنجەرەوە تەماشای پیرە دار چناری دەکرد کە گەڵاکانی لە رەنگی ئاسمانی ئاڵی تۆزخ دەلەرانەوە. ئاخریەکەی زاری لێک کردەوە تا باسەکە بکێشێتە بابەتی تۆزختر. پاش ئەوەی کە تەماشای مەزرای دووری سەرزەوزی دەکرد گوتی:
- پاشا ئەفەندم ، ئەم ساڵ بەروبوی مەزراکان فرە خاس دەبن. پاشا فیکری خۆی لە بیرەوەری هەوەسبازی رابردوو هەتڵە کرد و هاتەوە کاندی لای خەلیفەو هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:
- بەڵێ خەلیفە ئەفەندم بەرو بووی گەنم و جۆش چاک دەبن.
خەلیفە رابوو ...پاشاس هەستاو دەستی خۆی بۆ درێژ کرد و گوتی:
- بە سلامەت خەلیفە ئەفەندم. من و تۆ هەر تگ بڕوامان بە خودا هەیە. کارەکانی بە باشی رێکو پێک کراون .ئێمە کریتمان لە نێو خۆمان دابەشکردوە. تۆ ئاگاداری لایەک بەو منیش ئاگاداری لایەک. تۆ خاچپەرستان داپاچەومنیش تورکان
پاشا تاوێک ماتبوو. قسەی ئاخری هەبوو بیکا، بەڵام بە سەر زمانیدا نەهات. کۆخەیەکی کرد. سەری خوراند و لە ئاخریدا گوتی:« بە سلامەت خەلیفە ئەفەندم . ئەگەر لەو رۆژانە داهەواڵی کوشتنێکت بە گوێ گەیشت، وەسەرخۆمەهێنە.»
خەلیفە بە نیگایەکی نیگەرانەوە سەیری تورکی پیرو فێڵەزانی کرد و گوتی :
- کوشتن ؟ پاشا ئەفەندم کوشتن..؟ پەنا بۆ خوا ..!
- ئەی .. مرۆڤچوزانێ ! تورکێک مەست بێ و یەکێک لەو لۆتیانەی ئێوە پەلامار بدا و بیکوژێ. لەوانەیە هەموو شت روو بدا. شێتی زۆریش پەیدا دەبن. بەڵام تۆ خەلیفە ئەفەندم وەسەر خۆت مەهێنە. کاتێک یونانیەکی مەست بە سواری وەژوور قاوەخانەی تورکان کەوت و ئابڕووی هەموانی برد، ئێمە چاومان لێ نوقاند.؟ کە وابوو تۆش خەلیفە ئەفەندم چاوت بنوقێنە. ئەوە بە قازانجی تۆیە.
خەلیفە نارەحەتبوو. بەڵام وای نیشاندا کە تێ نەگەیشتوە. گوتی :
بەستراوەتەوە بە ویست و ئیرادەی خوا کە بە سەر هەمو و سو ڵتان و پاشایاندا فەرمانڕەوایە.

---

١-Kyra Frossini ژنێکی جوان بوو لە بنەماڵەی پیاو کاتۆلەکانی یونان و خەڵکی ئیپیر کە لە جوانیو ژیریدا ناوبانگی هەبوو. ساڵی ١٨٠١ بە فەرمانی عەلی پاشای تورک لە گۆلی (ژانینا)دا سەریان بە گۆمدا کرد. (وەرگێڕی فەرانسەوی).

پاشای پیر لە کاتێکا لێوەکانی وەک لێوی بزن بە بزەی شەیتانی لێک دەکردەوە، لێی زیاد کرد و گوتی :

– بەسەر خەلیفەکا نیشدا. پێش ئەوە کار بکێشێتە دمە تەقەی یاریکتر. هەرتک پیاوی گرنگی گاندی لێک جیا بوونەوە.

* * *

رۆژەکان خێرا بەدوای یەکدا تێدەپەڕین .مانگی ئەپریل دەهات نیوە دەبوو. دارەکان بە گوڵ و یا بە میوەی سەوزی کە تازەسەریان وەدەر دەنان دادەپۆشران . گاندی لە بەر شۆقی هەتاوی بەهاری وەک گوللە خۆی خڕ دەکردەوە. لە نێو چوار دیواری شاردا پیاوەکان بە دوو دەستە دابەش کرا بوون وهەر دەستەش خودایێکی هەبوو . خودا گەل و پیاو گەل، بێ ئەوەی سەرنج بدەنە دەریای ئارام کە بۆنی خۆخی گەیشتووی لێ دەهات و یا سەرنج بدەنە خۆر کە هەموو بەیانیان وەک گوڵە بەڕۆژە و یا وەک ئەستێرەکانی شەولە ئاسمان دە پشکوت، خە نجەریان دە سوون، تا دە گیانی یەکتر بەر بن.

پاڵەوان میکێلس خەمبارو گژ، لە دوکانەکەی دەستی بە کار کردبۆوە. هە وەڵچار بوو کە حەرتووی شەرا بخۆری شەش مانگەی جارێک کوڵ و کۆی دانەمرکاند بوو. بە پێچەوانە خۆی بە تووڕەتر و ناثارامتر دە بینی. ئیتر قومە شەرابێکی نەدەخواردەوە. لە سەر سفرەش پارووە نانێکی دەخوارد راست دەبۆ وە . چەند رۆژ بوو لە ماڵێ کەس دەنگی لێ نەبیستبوو.

خەوێشی نەدەهات. لە سەر دۆشەگ دادەنیشت و سیغاری دەکێشا. بە تاریکی بە پەنجەرەوە تەماشای دەرەوەی دەکرد. لە ترسی ئەوەی نەوەک خەوی لێ بکەوێ و دیسان خەونی بێ شەرمانە ببینێ، چاوی لێک نەدەنان .لە راستیدا ئەو لە خەونێک دەترسا. خەونێکی شەیتانی‌کە هەموو شەوێک بە سەریدا دەهاتو ریسوای دەکرد. بە داخەوە نەشەراب دەیتوانی ئەم شەیتانە لە خۆدا نوقم بکا نە شەرم.پاڵەوان میکێلس لە کاتێکا تەماشای پەنجەرەی دەکرد، لە بەر خۆیەوە دەیگوت «تەنیا خوێن دەتوانی ئەم شەیتانە نوقم بکا. تەنیا خوێن... تەنیا خوێن !»

نووری بەگیش خەوی لێ نەدەکەوت. خەفەتی وی هەر ئەوە نەبوو کە بە لێنی خۆی بەرێتە سەر و ئەو سوکایەتیەی بە تورکان کراوە بیشواتەوە ودو تۆلەی باوکی بستێنێتەوە. ئەو خەفەتی ژنەکەشی هەبوو لەو رۆژەوە کە پاڵەوان میکێلس چووبوە ماڵیان، ئیتر ئامینە خانم نووری تخون ژووری خۆی نەدەکرد، هەموو جارێ لاقی دەعەرزی دەکوتاو دەیگوت:

– پاڵەوان میکێلس جنێوی بە تۆ داوە. منیش وەک ژنێکی بە غیرەتی چەرکەسی کە ئابڕوی خۆی خۆش دەوێ، جنێوت پێدەدەم.

نووری بەگ بۆ ئەوەی دڵی خۆی بداتەوە و بێتەوە سەر خۆ، چووبوە خانو بەرەی کوێستانی و لەوێ خەریکی رێکو پێک کردنی کاروباری خۆی بوو. هەوا وردە وردە گەرم دەبوو. بڕیار وابوو بەم زوانە خانەکەی بێنێتە ئەوێ و وەک هەموو ساڵێ‌هاوینەکەی لە باخە کوێستانیەکەی رابوێرن، خوا گەورەیە، بەڵکوو ئەم باخ و دیمەنە دڵی ئامینە خانم نەرم بکەن و ئەمجارەش لەگەڵی ئاشت بێتەوە. نووری دەیویست وەستایەک بێنێ و دەرک و پەنجەرەکان رەنگ بکا و لە نێو دارەکان

کەپر ساز بکا. لە ئیزمیرەوە بولبول و لە ئەسکەندەریەوە توتی پچوکی دەهێنان تا ئامینە خانم پێ‌یان بخافڵێ و لە بەر خۆیەوە دەیگوت:« ئەگەر دڵی بەردیش بێ نەرم دەبێ »

لەو ماوەیەدا ئامینە خانم لە پشتی تەردەی شانشینی خانوەکەی کە دەیڕوانیە سەر شەقام، لە سەر دۆشەگی توکی قوو درێژ دەبوو، بنێشتی دەجوو، تەماشای ڕێبواری تورک و مەسیحی دەکرد و هیچ کامیش بۆ ئەو فەرقیان نەبوو ، چونکە هەر چی بێ هەموو پیاو بوون. ئەو بە دایانی پیری دەگوت :

ماریا ، تورک و مەسیحی و جولەکەو چینی بۆ من فەرقی نیە. لە لای من تەنیا دوو جورە پیاو هەن. پیر و گەنج، ریش سپی و ریش رەش. بەلاّم من ریش رەشەکانم پتر خۆش دەوێ.

هەموو ڕۆژێ کاتی ڕۆژ ئاوا بوونکە کوڵانەکان تاریکدەبوون، پیاوێکی یونانی، کڵاوێکی جوان لە سەر و چەکمەیەکی شاز لە پێدا، لەبەر شانشینی خانووی ئامینە دەهات و دەچوو، تەماشای سەرەوەی دەکرد. ڕۆژێک ئامینە خانم لە قەرەواشی رەشی خۆی پرسی:

ئەو یونانیە کێ‌یە؟ هەردەڵێی لە جێیەک دیتومە، رەنگە لە خەودا بێ.!

دایانی لە رەلاّم دا گوتی:« ئەوە هەمان پیاوە ڕۆژی هاتنی بولەرزە کە تۆ بێهۆش ببووی، وەهۆشی هێنایەوە . ئەوە پاڵەوان پولیکسینگیسی بە ناو بانگە .

- پێم وایە پیاوێکی خەراپ نیە و زۆر قەویش دێتە بەر چاو. زۆر خوێن شیرینە و چەکمەکانیشی جیرەیان دێ. گوێ بدەیە بزانە فەقیرە هەناسەی چۆن هەڵدەکێشێ.!

ئامینە پێدەکەنی، بنێشتی دەجوو ، شەربەتی دەخواردەوە. هەرلەو کاتەشدا لە پشتی کر کرە دارەکانی ژوورەکەیدا خۆی دەشاردەوە. لە حەسرەتی گەیشتن بە پیاودا دەسوتا .بە چاوی خومارەوە بزەی دەهاتێ و لە بەر خۆیەوە بیری دەکردەوە: ئەوەی پێم خۆش بێ دەیکەم. ئەگەر بمەوێ دەتوانم ئەو پیاوە بێنمە سەر دۆشەگی خۆم، یان لێی گەرێم وەک سەگ لە کوڵاندا بێ و بچێ. دەمەوێ بزانم من ژنم یا ژن نیم؟»

شەوێکیان کوڵان چۆل بوو، پاڵەوان پولیکسینگیس لە پێش هەیوانی تەردەدار راوەستا. شۆقی مانگ وەکتاڤگە بلاّو دەبۆوە. لاولاو و یاسەمەن هەوایان بۆنخۆشدەکرد. لە باخی نوری بەگدا بولبول وەک ئەڤینداریکیدڵ بریندار دەیخوێند. لەو لاوە دەریاش هەناسەی هەڵدەکێشاو سینگی خۆی بە دیواری بورج و قەلاّی شار دادەدا.

ئامینە لە گەرمان خەوی لێ نەدەکەوت. کراسی خەوی داکەندو سەری بە سەر کوڵان داگرت. لە بەر روناکی مانگەشەو چاوی بە پیاوێک کەوت کە هیلاک و شەکەت پاڵی وە چوار چێوەی دەرگا داوە. خێرا ناسی و پێکەنی، رووی کردە دایانەکەی لە ئوژێنێک مات ببوو خەو دەیبردەوە. بە پێکەنینەوە گوتی :

- فەقیرە ! ماریا وەرە تەماشای کە. دەڵێی لە خۆ چوە. دەمویست بچمە خواری خزمەتی بکەم. ئەویش کاتی بولەرزە خزمەتی منی کردبوو. تۆ دەڵێی چی ماریا ؟ خۆ تووری لێرە نیە.

ماریا چاوە خەواڵوەکانی هەڵێنا و گوتی ! « کیژم ئامینە ! ئەو کارە گوناحێکی گەورەیە ».

ئامینە قسەکەی بری و گوتی :

- بۆ تۆ کە مەسیحی رەنگە وابێ، بەلام بۆ من نا ! من موسڵمانم و خوایەکی دیکەم هەیەو

لە ئایینێکی دیکە پێڕەوی دەکەم.تۆ دەتوانی گۆشتی بەراز بخۆی و بۆت گوناح نەبێ، بەڵام ناتوانی پیاوێک بکەزی. لە ئایینی ئێمەدا پێچەوانەیە، واتە گۆشتی بەراز حەرامە، بەڵام پیاو بێگانە نیە. هەستە بڕۆ بیهێنە ئێرە.

دایان نوزەیەکی ناهومێدی لێهات و گوتی « وای ئامینە.. رۆڵەکەم !..»

- لە پێشدا بچو بزانە خوڵامە رەشی بەرِدەرگا نوستوە ؟

- بەڵێ نوستوە و گوێم لە پرخەی بوو.

- سەگەکەش بەستراوەتەوە؟ وەرە، مەترسێ، گرنگ نیە .خودا ژنو پیاوی هەر بۆ ئەو کارە دروست کردون... بێجگە لەوەش چ مانگە شەوێکی جوانەو چەندەش گەرمایە! یاسەمەن پشکوتوە، بولبول شێت بوە پێم گوتی بڕۆ ئەو پیاوە بێنە. من زۆرم بیر کردۆتەوە کە ژن رەنگە لە زستاندا خۆی بێ رابگیرێ، بەڵام لە هاوینا دژوارە. سەگەکە بەستراوەتەوە یان نا ؟

ماریا کە زۆر زۆر دە گریا گوتی : « بەڵێ خانم بەستراوەتەوە »

ئامینە دیسان سەری خوار کردەوە، پاڵەوانی دی کە راوەستاوە و چاوی بڕیوەتە پەنجەرەی وەتاخەکە. فیکری کردەوە:« لە نوری بێزارم، پاڵەوان میکێلس باش بوو، بەڵام کوا دەستم دەیگاتێ؟ ئەوەش خەراب نیە و بە کار دێ.» ئامینە شانەو ئاوێنەی هەڵگرت وگوریج پرچەکانی داهێنا وعەتری لە بنهەنگڵی دا و بە تووڕەییدایانی بۆ پێشەوە پاڵپێوە نا و گوتی:

-دە بڕۆ یالاّ .. بڕۆ ....

دایان هەرتک دەستی بە سەری گرتبوو، لە پلیکانان چوە خوارێ. ئامینە عەترەکەی دە شوشەدا مابوو، بە سینگ و مەمکی داکرد و پاشان هەستا و چرای لە پشت دەرگا دانا و بە نارە نار گوتی:«من ئەویدیکەم دەویست ، بەڵام ئەوەش زەبر و بە فیز و خۆراگرە، هەر چۆنێک بێ خەراب نیە» گوێچکەی هەڵخست، دەرگای کالسکە رۆ بە سپایی کرایەوە. سەگ چەند جاروەڕی. دەنگی لاقان لە حەسارو پاشان لە پلیکانانبیسرا. ئامینەپالی وە بالێفانداهوو،خەریکبوو کراسی خەویکاتە بەر. بەڵام پەشیوان بۆوە و لێگەڕا تا مانگەشەو سینگومەمکە رووتەکانی بە نووری خۆیبشواتەوە. دەنگی جیڕەی چەکمان لە دالاّن دەبیسرا. بۆنی تیژ هەوای داگرت و ئامینە لوتی وە پتەپت کەوت. دروسێ جار وەک مار زمانی بە لێوانی داهێنا ، پاشان بە چاوە روانی مابوو، چاوی لەسەر یەکدانان.

ئێستا پاڵەوان پولیکسینگیس لە بەردەرگای وەتاخەکە راوەستا بوو. ئامینە بە نێو برژانگە درێژەکانیدا تەماشای دەکرد. ئەویش هەروەک چاوی رەشکەو پێشکان بکا، دڵیدەلەرزی و دەستی بە نێو چاوانی دادەهێنا. چەرکەسی لە بەر شۆقی مانگەشەو خۆی بزاوتو باسکەکانی لێک ئاواڵە کردو خۆی لە بەریەک کێشاوە. لە پڕهەروەک نیشانەیەک بێ لە نێویاندا، کابرا چوە پێش و چرا کوژایەوە.

* * *

مانگی ئەپریل دەهات تەواو دەبوو. خاچپەرست دەچوون بە ترس و لەرزەوە ئاهەنگی حەوتووی پیرۆز بگێرن. لە هەموو دنیای مەسیحیەت دا هیچ میللەتێک لەو ساڵەدا بە قەدرایی خەڵکی کریت، وا بە قوڵی و دڵسۆزی هەستی بە دەردو ژانی مەسیح نەکردبوو. کریت ومەسیح لەدڵی هەموانئدا تێکەڵ ببوون. چونکە دەردی هەرتکیان یەکبوو. جوولەکە عیسایان چوار میخە کێشابوو، تورکیش کریت. خاچپەرستەکان کە لە بەو بێ خەبەری و رۆژوو گرتن وئازار و ئەشکنجەی خودای خۆیان هاروژابوون، هەستیان دەکرد کە قین و توورەیی لە سەر دڵیان دەبێتە گرێ.

بە چاوی قین و دوژمنایەتی تەماشای تورکانیان دەکردو بە زەحمەت دەیانتوانی لە کوشتنی چەند جولەکەی مەگەرو سەراقکە لە دەوروبەری لەنگەرگا دوکانیان هەبوو چاو بپۆشن. لە شەوەکانی بە ترسی حەوتووی پیرۆزدا، سەر لە ئێوارەوە دەچوونەوە دە ژووریْ و دەرگایان لە سەر خۆ گاڵە دەدا.

لەم ساڵەدا هەوا لە هەموو ساڵیْ خەفەتر بوو. تورک هێشتا ئەیانتوانیبوو ئەو سوکایەتیەی پاڵەوان میکێلس پێی کرد بوون، بیشۆنەوە. کاتی شەو کە مەسیحی لە کلیسای (سنت میناس) خەریکی نوێژ و دوعا بوون، تورک بە گۆرانی ( ئەمان ئەمان بە پێش کلیسادا تیْ دەپەرین و جنێویان دەدان .

سەعات بە سەعات مەسیحی چاوەروان بوون کە کەنگیْ لۆتی تورک زەبری خۆیان دەوەشێنن. هەموو رۆژیْ بە تەما بوون کە ئەو کوانە بکات ودەرپێ، بەڵام کوان رۆژ بە رۆژ پتر دەئاوسا و لە تێوەوە دە گەنی.

بەو جورە بەشێک لە حەوتووی پیرۆز بە نیگەراتی وترس و بێ خەوی تێپەری. شەوەکان خۆش، بەڵام تاریک و خەفەتبار بوون.

وەنەوشە لە حەساران پشکوتبوون. بە زوویی لە رۆژی هەینی پیرۆزدا، گەورە کچ گوڵی یاس و سورە گوڵی بەهاریان دەچنی ، تا لە تویژی شێواندا لە بن خاچیان داینێن. مەسیحی دوای رۆژئاوا دەرکی دوکانەکانیان دادەخست و دەچوونەوە دە ژووریْ. بە باقلەی کولاْو وسەلاْد و کەنگر و ماسی دووکەلاْوی و زەیتون و شوربای کولجی بەربانگیان دەکردەوە. لە چاوەروانی کارەسات دا لە حەساری دا دەهاتن و دەچوون.کاتێک دەنگی نەرم و خەفەتباری زەنگوڵەی کلیسای سن میناس بەم شەوە هێدیە دەبیسرا، مەسیحی نیشانەی خاچیان دەکێشا، دەرگایان دەکردەوەو لە ترس و لەرزەوە لە بە بێدەنگی دەچوونە کۆڵانە تەنگ و تاریکەکانی کاندی و نیگەران بوون کە ئەم شەوە چ کارەساتێک دەقەومیْ.چۆن خودا جارێکی دیکەش لە دەست ئادەمیزادان رەنج دەکێشیْ.

هەرچەندی حەوتووی موسیبەتی مەسیح لە تەواو بوون وەنیزیک دەکەوت، کریتیەکان سەرگێژتر دەبوون. ئاخریەکەی رۆژی پێنجشەمۆی پیرۆز کاتێک خەلیفەو قەشە مانولی و جاش قەشەکانی کلیسا بە دەنگی پڕ لە سۆز و ناڵەوە دەستیان کرد بە خوێندنی دوازدە سورەتی ئینجیل و روونیان کردەوە کە چۆن یەهودا خەیانەتی بە مەسیح کرد و چۆن ئەوەدەم خەڵک هەریان کرد و بە سەر زەویدا رایانکێشا،نیماندارا وە گریان کەوتن. هەموو خەڵکی کریت بە شاڵواری هەڵمساو وبە

هەناسە بڕگە بە دوای مەسیح دا غاریان دەدا و لە دەست(قیافا)(١)شکایەتیان دە بردە لای (پونس‌پیلات)(٢) هەروەک ( عومەر و ریونی) لە دەست مستەفا پاشا شکایەتیان دەبردە لای سولتان.!

هەموو بە پێ سەیری گوێیاندا شەش‌سوورەتی هەوەڵی ئینجیل ، پاشان لە پڕ وەک ئەوەی کە بە یەکجاری تووڕە بووبن، هێرشیان بۆ حەساری کلیسا برد و بە سەر داوەڵێکیاندادا کە لە سەر شکڵی بەهودا لە پەڕۆوپاڵ سازیان کرد بوو. هێندێ بە خەنجەر و هێندێکیش بە مۆم تیێ بەر بوون لەت و پەتیان کرد، ئاگریان تێ بەرداو لە کاتێکا منالْ بە هاوار وداد لە دەوری هەڵدەپەڕین، کوڵ و کۆیان دامرکا. دووبارە بۆ گەڕانەوە بۆ کلیسا ،تا پاشماوەی ئینجیل گوێ بدەنێ.

تراساکی‌لەگەڵ منالانی‌دیکە لە دەوری داوەڵی‌خاین کە وردە وردە دەسووتاو پووچ دەبۆوە هەڵدەپەڕی و هاواریا ندەکرد. کاتێک‌بەهودا وەک خوڵە مێشی لێهات، کوڕی پاڵەوان میکێلس هاڤاڵەکانی لە دەوری خۆ کۆ کردەوە. پێشتر پێکەوە نەخشەیان کێشا بوو. هەربەکە شوشە نەوتێکیان لە دایکیان دزیبوو، هێندێ کۆنەپەڕۆشیان هێنا بوو. گشتیان بەو شتانەوە روویان کردە گەڕەکی جولەکان. تراساکی لە گەڵ هاوکلاسێکی خۆی کە منالە جولەکە بوو بە ناوی (لوی) لە پێش هەمواندا دەڕۆیشتن. لوی لە گەڵ منالە یونانیەکان ببوە دۆست و لە خۆیان دەزانی. ئەو ئەیدەویست وەک جوو لەگەڵی ببزوونەوە.هەموو جارێ کە بڕیار دەبوو بەلایەک بەسەر هاودینەکانی بێنن، ئەو لە پێش هەمواندا دەبوو.

ماڵەکان لە تاریکیدا نوستبوون. کۆڵانەکان چۆڵ بوون. منالْ غاریان دەداو لە راکردندا نەوت لە بوتڵەکان رژابوو، بۆنی نەوت کۆلانی پڕ کردبوو. زۆری پێ نەچوو، دەنگی شەپۆلی دەریا کە وەبەردان دەکەوت، دەبیسرا.شەپۆل بە تووڕەیی و بە بەرزی دەهاتن، دەتگوت دەیانەوێ دیواری قەلاکانی ڤێنیزی لە بن هەڵکەنن.

لە گەڕەکی جولەکان نیزیک بوونەوە. منالْ لە دەوری تراساکی کۆ بوونەوە. هەموویان حەوت کەس بوون. سەردەستە شقارتەی دا بە هەموان.ئەوانیش پەڕۆیان ئامادە کرد کە بەنەوتی بکەن. سێ کەس دانرا بوون کە خانوەکانی لای راست ئاگر تێ بەردەن. سێ کەسیش خانوەکانی لای چەپ. تراساکی فێری کردن کە چۆن پەڕۆی ئاگر تێ بەردراو لە بن دەرگاکان دابنێن و ئەگەر پەنجەرەی ئاواڵەش هەبێ، بیخەنە ژوورێ. خۆشی لە کاتێکا پەڕۆی بە نەوت دەکرد گوتی:
«خۆشم ماڵی مالم ئاگر دەدەم. ئەقبرە دۆستی باوکیشمە و مرۆڤێکی خاسە.»
ماڵەکان نەوی و بێ دیمەن بوون. هێندێ لە قوڕو هێندێکیش بە تەنەکەو حەسیردروست کرابوون. ماڵی مالم نەختێ گەورە تر و پەنجەرەیەکی بەرەو کۆلان و هەیوانێکی داریش هەبوو.

---

*١ - قازی جولەکە، کە عیسای مەحکوم کرد و خوارییەکانی ئەشکنجە کرد.وەڵێن خۆشی دە تاوانبار بوونی عیسا دوو دڵبوو.*

*٢ - حاکمی ئەلەستین کە وازی لە بڕیارگەیشتنی مەسەلەی عیسا هێنا و دای بە قازیەکانی جولەکە. ساڵی ٣٩ی زایینی مرد.*

مالمی جولەکان کاهرایە کی پیری کورتە بالای رەنگ پەرپەرو پشت کوپ بوو. ریشێکی تەنکی سووری ماش و برنجی هەبوو. مووی سەری وەک دوو قەیتان هزند بزوەو بە دوولای رووومەتیدا بەربدابوونەوە. تاوەختێکی لە مەخمەلی بنەوش لە سەردەنا و بە تەنیا لە مالە ویرانەکەی خۆی دەژیا. چەند سالیبوو خێزانی مرد بوو، منالەکانی بلاو ببوون، سەگەکەی تۆپیبوو، بولبولەکەی فڕیبوو، زۆریشی هەولدابوو کە بیگرێتەوە، بەلام پشیلەیەک زووتر لەو گەیشتبوویەو خوارد بووی.ئێستا بە تەنیا بێ کەس مابۆوە.

ئەو شەوە پیرە مێرد خەوی لێ نەدەکەوت. چرای هەلکرد بوو تەوراتی لە پێش خۆ دانابوو، بە دەنگێکی باریک و یەک هەوا، کتێبی وەسیەتەکانی قەدیمی دەخوێندەوە. راستیکە رەگەزی ئەو چ ئازاروکوێرەوەری نەدیتبوو.؟ چ قوربانی نەدابوو؟

ئێستاش ئەوە چەند سەد سالە کە هەموو سالێ لە تەواوی کلیساکان لەو رۆژەی بەهاریدا مەسیح لە چوار میخە دەدەن وبێزاری و لەعنەت لە رەگەزی جولەکە دەکەن.

مالم چاوە ماندوەکانیلە سەرکتێب هەلێنا و لە پشت پەنجەرەوە تەماشای دووری کرد. هەناسەیەکی هەلکێشا و لە بەر خۆیەوە فیکری کردەوە :« لەو سەعاتەدا خاچپەرستەکان لە کلیسای سنمیناس یەهودا دەسووتێنن...» وای هاتە بەر چاو کە دەنگی هەراو راکردنی منالان دێ. بەلام ئەوەندە چووبوە دە فیکرەوە کە زەینی نەدایە. دوو بارە لە دەریایمتالای کتێبی ئاسمانی ووەسیەتە قەدیمیەکانیدا نوقم بوو.

حەوت مندالێ لە نێوان دوو دەستە خانوودا دابەشببوون. پەرۆی بەئاگریان بە غار بەسەر دیوارەکەندا فرێ دەدا. بە ترس و لەرز رایان دەکرد. پەرۆیەکە دەگرژاوە و بێجگە لە دووکەلێ هیچی دیکە دیارنەبوو. تراساکی ئاورێ داوە گڕی ئاورێ نە دیت.دەستیکرد بە جنێوان وگوتی: « برێن خۆتان لە دار بدەن خوێرینە. ئێوە ئاگرێکیشتان پێ ناگرێتەوە. ئێستا دەزانن کە من چدەکەم.! هەموویان لە پێش مالی مالم کۆ بوونەوە تا لەو فێر بن. تراساکی گوتی:

– هەر کەس نەوتی هەیە ، بیدا بەمن !

مانولیوس ماستراپیس و ئاندریکوس کراسوگئورگیس بوتلە نەوە چلەکانی خۆیان دایە. تراساکی ئەوانی وەرگرت.هێندێ نەوتی بە دەرگای مالکە وەر کرد، دوو پارچە پەرۆی نەوتاوی لە بن دەرگا دانا. پاشان شەمچەیەکی لە گیرفان دەر هێنا و ئاگری تێ بەردا. تراساکی پەرۆیەکی دیکەی بە نەوت کرد و ئاگری تێ بەردا و بە پەنجەرەدا هاویشتیە ژوور.

لوی هاواری کرد: « مندالینە راکەن. بچین لە کانی خۆمان بشۆینەوە، تا بۆنی نەوتمان لێ نەیە دەنا دەمان ناسن. » دایان لە قاقای پێکەنین و لە کۆلانە تاریکەکاندا ونبوون.

تراساکی دەیویست لەوێ بێنێ، تا ئاگرەکەی خۆشتر بکاومالی جولەکە بکاتە خۆلەمێش. لەبەرخۆیەوە دەیگوت:« سەیرە مرۆڤ بە سووتاندنی مالی جوولەکە بە پەرۆ کەیفێ بکا. ئەگەر مرۆ بخوازێ وەبەر رەحمەتی عیسای مەسیح بکەوی، دەبێ جولەکان بە زیندوویی بسووتێنی.!» کەمێکی دیکەش چوە پێش تا ئەو نەوتەی ماوەتەوە بە ئاگری دابکا. بەلام هاوارێکی بەسام لە پەنجەرەی ئارالەی مالی مالم هەستا. مالمی پیر هاتە سەر هەیوانەکەو هاواری دەکرد:

– ئاگر..ئاگر. یارمەتی ! تراساکی خۆی بە دیوارەوە نوساند کە دیار نەبێ. مالم خوار بۆوە

دیتی دەرگای ماڵەکەی دەسوتێ. لە ئەژنۆی خۆی دەدار هاواری دەکرد: « خەڵکینە یارمەتی ! هاوار..! »

بەڵام خانوی دراوسێکان هەموو لە تاریکی دابوون. کەس نەهاتە دەرێ. مالم بە پەلە هاتە خوار و دەرگای گڕ گرتووی کردەوەو غا ریدا کۆلانێ. قەلبرە هیچی پێ نەدەکرا. لە جیاتی ئەوەی بچێ لە دەرگای جیرانان بدا، بە تاساوی تەماشای ئاگری دەکرد.تراساکی بەزەیی پێداهات. لەوێ وەدەرکەوت و لە دەرگای ماڵەکانی دەدار هاواری دەکرد : ئاگر...ئاگر..پاشان

هاتەوە کن مالم و گوتی :

بابە گەورە من لە کلیسا دەگەڕامەوە، گوێم لە دەنگی هاوار بوو. مەگریٚ! ئەوەتا دراوسێکان بە هاوارتەوە هاتون.!

لە راستیشدا دەرگا دەکرانەوە. جولەکە لە رۆشنایی مانگە شەودا بە کراس و کلاوی شەو، خەواڵو وترساو دەر دەپەڕین. کە دیتیان خانوی مالم دەسوتێ، سەتڵ بە دەست ئاویان دێنا ئاگرەکە بکوژێننەوە. تراساکی لە گەڵ جیرانان ئاوی دەکێشا، تەڕو هیلاک ببوو. کاتێک ئاگر کوژایەوە تراساکی دەستی مالی گرت وگوتی:

شەو بە خێر بابە گەورە. ئێستا ئیتر ئارام بنوو، ئاگر کوژاوەتەوە. مالم دەستی بە سەرو قژی منداڵەکە داهێناو گوتی:

- دایک و باوکت ئەشێ شانازیت پێوە بکەن. تۆ منت نەجات دا. من دەتوانم لە جیاتیان چیت بدەمێ؟ پیاوێکی فەقیرم، هیچم نیە.تاوێک بیری کردەوەو پاشان گوتی: « بۆ چی بۆ چی راوەستە.. شتێکم هەیە . »

لەقوژبنی حەسارەکە پنجە سوورە گوڵێکی لێ بوو، گوڵێکی سپی جوانیپێوە بوو لە بەر شوقی مانگەشەوێدەدرەوشا ، پیرە مێرد لێی کردەوە و دای بە کورەکەو گوتی:

- وەرە رۆڵە ! ئەو گوڵە وەرگرە. ئەم شۆ کاری خێری تۆ بۆنی عەتری ئەم گوڵەی لێ دێت.!

* * *

بەیانی ئەو رۆژە هەینی پیرۆز بوو زەنگوڵەکان لە بەرە بەیانیەوە بە ئاهەنگێکیخەمناکترلەجاران وەدەنگ دەهاتن. رەسمیمەسیح لە نێوە راستی کلیسا دانرا بوو، دەرگاکان خرا بوونە سەر پشت. دە دوازدە ژنی گەنج ئەژنۆیان دادا بوو تەماشای پەیکەری مەسیحیان دەکرد کە لە نێو وەنەوشەو سورگوڵ وگوڵی لیمۆ درێژ کرا بوو. دەتگوت مەسیح کوڕی خۆیان بوە بە دڵێکی خەمبارەوە بۆی دە گریانونەسرینیان هەڵدەوەراند. ئەو کوڕە باشە کە جێی شانازی کاندی بوو، بە دەستی تورکان کوژرا بوو. ئەو رۆژە باربابانیس چوە کلیسا. داهاتەوە و لاقە خوێناویەکانی مەسیحی ماچ کرد. مستێک کوندرو ئەسپەندەری هەڵگرت، تا ئەگەر ئەخۆش بوو دووکەڵیان پێ بکا. هەروا کە مات راوەستا بوو، بە سەبرەوە تەماشای پەیکەری کرد و سەری راوەشاند و گوتی: « لەعنەت لە تورکان! پیاو کوژی دەزاڵم »

باربابانیس چوە حەسارو هورتزوفلوسیدیت کە لە بەر رۆژووگرتن و بیخەوی کزو لاوازبوە. پیتوکوس،کایامبیس،باکێنش و ئاغا پاراسکە دەوریاندا بوو، هورتزوفلوس قسەی دەکردو

ئەوانی‌دیکەش گوێیان بۆ شل کرد بوو دەیگوت:

« دوێنێ پاشا کەروێشکێکی بە دیاری بۆ خەلیفەی نارد بوو. بەلآم خەلیفە بە دلشکاوی کەروێشکەکەی نارد بۆوەو گوتبووی: من لەو دیاریانەم گەرەک نیە. ئێمە بە رۆژووین، جولەکە مەسیحیان کوشتوە و ئێمە تازیەمانە.

ئاغا پاراسکەواس گوتی: « نەدەبوایە دیاریەکە بنێرێتەوە، چونکە ئەوە سوکایەتیە . »

کاپامبس گوتی : « پاشا نەدەبوایە کەروێشکی بۆ بنێرێ، چونکە ئەوە سوکایەتیە. بۆچما ئەو سەگە نەیدەزانی کە ئەم حەوتوە، حەوتووی پیرۆزە؟ »

دیمیتروس هەناسەیەکی هەلکێشا و گوتی:« ئەو کارە کارێکی باش نەبوە . ئێستا وەختی ئەوە نیە لەگەلْ پاشا مل بە ملە بکرێ. لە سەر ئەو باوەرەم چیرۆکی ئێمەو ئەوان، چیرۆکی بەردو گوزەیە. »

باکێش دەیویست بیروڕادەربڕێ، بەلاّم باربابانیس خۆی خستە نێوان ولە کاتێکا چاوەکانی دەسڕیەوە، بەدەنگی بەرز گوتی:

- کورینە هەوالێکی خراپم بیستوە. نازانم زانیوتانە یان نا ؟

- هەوالی چی باربانیاس؟

- پالەوان مانولی - یان کوشتوە

- کام پالەوان مانولی؟

- مەبەستم عیسایە ، کورینە عیسای مەسیح. تورک کوشتویانە . باربابانیس چاوی پڕ بوون لە فرمێسک . باکێش و کاپامبس بە حەپەساوی تێک رامان. بەلێ مەسیحیش پالەوانێک بوو وەک پالەوان ئەلیاس و پالەوان کوراکاس و یا وەک داسکالویانیس کە بۆ ئازادی شەرێ دەکرد. ئەویش چەکمەی لە پێ دەکردو شالواری هەلمساوی دەپێ دەکرد و وەک کریتیان پێنچی رەشی لە سەری دەبەست.

هەموو ئاوریان داوە. خەلیفەیان بینی بە کاوە خۆ لە پلیکانان دێتە خوار. دەتگوت خاچ بە شانی دەکێشێ. هەموو دڕیاندا، تا بتوانێ تێپەرێ. ئەوندە سەروسەکوتێکی بە سامی هەبوو! رەنگی پەڕیبوو، ریشی سپی دەلەرزی.

پاراسکە واس بە سپایی گوتی :

- ئەوە بۆ چی وای لێهاتوە.؟ جاران سەرو رویەکی نەجیب وخۆشەویستی هەبوو. دەلێی ژاری سەرلێوانە. چ دەردیەکیەتی؟

باکێش گوتی:«دەیانەوێ لە چوارمیخەی بدەن. تۆ ناتوانی تێ بگەی ئاغ، بیبورە! لە بیرم چووبوو کە تۆ خەلکی (سیرای).

خەلیفە تێ پەری. پەردەیەکی رەشی ئەستور کلاوی ئوسقوفی داپۆ شیبوو. چوە ژووری کلیسا. لەو چەند رۆژی دواییدا خەلیفە زۆر گۆڕا بوو. چاوەکانی کە لە حالی ئاساییدا را ئارام بوون، ئێستا بروسکیان دەدا. بێگومان ئەو لە بەر رۆژوو گرتن و یا بە تایبەت لەبەر ژانی مەسیح بوو کە هەموو سالێ بە دلْ هەستی پێدەکرد. ئەو نەیدەتوانی زولم و زۆر دەدەر بەرێ. نەیدەتوانی ببینێ کە دەستەیەکی ناپەکار و بێ دین و ئیمان و بێ قانون، زولم لە بێگوناحان بکەن.

نەیدەتوانی ببینێ کە تاجێکی‌دڕکیان لە سەری کریت ناوە و ئەو بەدبەختەش لە ژێر نیزەی تورکاندا ڕەنج دەکێشێ.

خەلیفە بە سەرۆکایەتی دەستەیەک کە بۆ بەڕێوە بردنی هەیتی پیرۆز کەوتبوونە ڕێ، وەکازی هەڵدەسوڕاند و وەک نیزە دەیبزاوت و لە کاتێکا بە تووڕەیی‌دەپروانیە عەسکەری تورک‌کە لەگەڵ دەستە دەڕۆیشتن بە نارە نار دەیگوت: « تاکەی؟

ئاخر تا کەی ...؟ سەر بازی تورک بۆ ڕێز لێنان تفەنگەکانی خۆیان سەرەو ژێر ڕاگرتبوو، دیسان خە لیفە دەیگوت :

- ئاخ ئەی کریت ! کەنگێ ڕاپەڕینی پڕ لە شانازی تۆ دەبینین ؟ بۆچما ماوەیەکی زۆرو نیە کە تۆ لە چوار مێخە دراوی؟

خەڵک بە دەنگی لەرزۆک و تیوە ئاشکرا شینی مردویان دەگێڕا. ژنەکان دەگریان.پیاوەکان بێدەنگ و ئارام شەمەکانیان بە دەستەوە گرتبوو. خەلیفەش کە وەکازەکەی لە بەردەکانی شەقامی کاندی دەدا، جگە لە کریت بیری لە هیچی تر نەدەکردەوە. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: مەسیح خودایەو دەتوانێ زیندو بێتەوە. بەڵام کریت جگە لە بستێک خاک و هێندێ ئادەمیزاد چیدیکەیە..؟

خەڵک لە شەقامی گەورە تێپەڕین و لە مەیدانی شار ڕاوەستان. خەلیفەش لە کاتێکا دەستی ڕاستەی خـوی بەرز دەکرد و ڕۆژ هەڵات و ڕۆژ ئاوا و خوارو وسەرووی شاری پیرۆز دەکرد. دەریا لە دوورەوە دیار بوو، شۆتی دەدا. دوو دوڕگەی پچوکی پەنا کاندی لە بەر شەبەقی مانگەشەو لە دەریادا مەلەیان دەکرد. لە بەرامبەر ئەوانیش گوندی گولان(دوزامان)بە چرای کزەڵۆکەوە کە لە چۆلی تروسکەی دەهات ، دەبینرا.

گولەکانیش لەو شەوەدا ڕێو ڕەسمی نوێژی شێوانی هەینی پیرۆزیان بە ڕێوە دەبرد. مەسیحی ئەوان لە سەر دۆشەگی گەڵای دار لیمۆ ئەستەرەن نوستبوو. ئەو مەسیحێکی کاغەزی بوو کە پێشتر قەشەیەکی سەت ساڵەی گول کێشابووی. ڕەسم کێش مەسیحیشی وەک خۆی گول کێشابوو. واتە لوت و قامکەکانی خورە لێی دابوو. لێوی خوارەوەی ڕزیبوو. خەلیفە ئەودەم تورە بیوو، قەشەی ڕەسم کێشی بانگ کردبوو، پێی گوتبوو :

. قەشەی لەعنەتی ، نیشاندانی مەسیح بەو سەرو شکڵە ، گوناحێکی گەورەیە. بۆ چما تۆ لە خوا ناترسی ؟

قەشەی ڕەسم کێش‌کە لێوی نەبوون لە وەڵامدا گوتبووی: « باوکی ڕوحانی، مەسیح بێجگە لەم ڕێگایە چۆن دەیتوانی ئەڤینی‌خۆی بدا بە خەڵک؟ جگە لەم هۆیە کە تووشی ئازارو ناڕەحەتی بێ، بەچیتردەیتوانی موحیبەتی خۆی بەوان سابیت بکا ؟

گولیش لەم شەوەدا خودای ئەخۆشیان کە لە سەر گەڵای لیمۆ ونەستەرن ڕاکشا بوو، بە کوڵانەکاندا دەیانگێڕا. کاتێک لەو لای شار، واتە لە سێ تاق، تووشی دەستەی نیسانە ساخەکان بوون، بە ڕەسمی سڵاو چرا پچوکەکانیان بۆڕاوەشاندن.

پاڵەوان میکێلس لە حەرتووی پیرۆزدا نەچوە کلیسا. ئەو نوێژ و ڕۆژووی دەگرت، بەڵام لە قەشەکان بێزار بوو. ئەوەندە دەوێستا تا کلیسا لە عەبا بەشان و مێزەر بە سەران چۆل دەبوو،

پاشان دەچوە ژووری ، شەمی هەڵدەکرد. بەم جورە هەموو پێنجشەمۆ پیرۆزەکان قەشە لە کلیسا با یان تا، دەچوو نوێژی دەکرد.، نیشانی خاچی دەکێشا، زاری لێک دەکردەوەو گۆشت و خوێنی مەسیحی لە مەلاشوویدا هەست پێدەکرد کە وەک کرمێک بۆ نێو ریخۆڵەو هەناوی دەچوونە خواریێ. بەلاّم ئەم ساڵە پاڵەوان میکێلس بۆ هەوەڵین جار لە ژیانیدا، رۆژی پێنج شەمۆی پیرۆزلە جیاتی بچێتە کلیساو نوێژی بکا، بەیانی زوو لێی سواری ماینێ بوو، رکێف کوت بە دەشت و سەحرادا، تا گەیشتە خانووی کۆنستانتێی نوری بەگی. توزێک لەوێ راوەستا، بەلاّم هەر لەو رێگایەوە گەرایەوەو رووی دەلای دەریا کردو چوو بحەسێتەوە. بە پەرێشانی دەیگوت:« تا ئەو شەیتانە لە ئاخی مندا بێ، من نوێژ ناکەم!»

لە تەواوی ساڵدا هیچ رۆژێک وەک رۆژی شەمۆی پیرۆز درێژ نیە. ئێوارەی ئەو رۆژە بە سەت تازو نیو ناز دێو بە لەنجە و لارەوە دێتە پێش و رادەوەستێ. هەنگاوێک بۆ پێشەوە داوێ و دوو هەنگاو دەکشێتەوە، ئاخری هەرناگاتێ. ئەوانەی بە رۆژوو بوون کاتێ بەلای ئەو تەندورانەدا تێدەپەرین کە خواردنی بە تام و چێژ یان تێدا بوو، لاقیان لە دوا نەدەهات. کابان وەخۆ دەکەوتن و ماڵیان دەرازاندەوە. ئاگردان هەڵکرا بوون و حەسارەکان گەسک درابوون و ئاو پرژێن کرابوون. دلەکان بۆ هەموان ئاوالە کرابوونەوە. هەموو چاوە روانبوون رۆژ ئاوا بێ و شەوی پیرەرەکەتی راپەرینی مەسیح بە سە ر شاردا بێ.

مادام کراسو گئورگیس، جاروبار دەستێکی بە بەر چاویەوە دەگرت و تەماشای رۆژی دەکرد، لە بەر بۆنی مریشکی نێو دیزە و عەتری کولیچەکانی ئادریوس لە تەندووی نانکەر هێنا بوونیەوە، بێحاڵ ببوو، لە بەر خۆیەوە دەیگوت :« ئەو خۆرە لەعنەتیەش راست ئەمرۆ جەتەی گرتوە و نایەوێ بجزوێ !»

مادام پێنلوب لە بەیانی پێنج شەمۆی پیرۆزەوە هێلکەی رەنگ کردبوون . ئەو شاژنی بە دەسەلاّتی متبەقی خۆی بوو. بە جەرگ و دلّی بەرخ شۆرباوی پاسکالی لێ دەنا. ئاغا دیمیتروسی مێردی بە فەرمانی ئەو کەشەفی مس و دیزە یە دەستەوە لە نێوان ماڵ و نانکەردا لە هاتو چۆ دابوو. ژنەکەی پێی دەگوت :« گیانەکەم ئاغا دیمیتروس ! برۆ بارەکەلاّ ! ئەو شۆ مەسیح زیندوو دەبێتەوە. ئەوەش مانای ئەوەیە لاوی جوانکیلەم کە ئەمشۆ نیشتیای تۆم هەیە. تێدەگەی؟ هیوادارم ئەو هەموو گۆشت و کولیچە، قەیماخە بە خۆرایی نەچێ !»

ئاخرەکەی خوا دوعای مادام کراسو گئورگیسی قەبوڵ کرد و رۆژ ئاوا بوو. شەو لە گەڵ بۆنی شۆرباوی پیرۆزی پاسکاڵ شاری داپۆشی. گەرەکی یونانیان پر بوو لە هاوار و خۆشی. ژنەکان دەستیان کرد بە خۆ جوانکردن. تەنانەت وانگلیوش جلی تازەی کردبوە بەر و خۆی رازاندبۆوە. لە حەساریّ چاوەروانی براکەی بوو. داخوا براکەی دەهات لەگەڵ خۆیدا بیباتە کلیسا؟ ئەوە ئاخرجار بوو کە ئەم دوانە دە یانتوانی پێکەوە بچنە کلیسا. چونکە ساڵی داهاتوو دەبوایە چس‌گورگیش لە گەڵیان بێ.

لەو شەوەدا دوو کەس لە تەواوی شاردا بە پێچەوانەی داب و شوێن بیریان لە خودا نەدەکردەوە. لە شەوی پیرۆزدا یەک لەم دوانە چەرکە سی جوانی لە ئامێزگرتبوو، ئەوی دیکەش لەسەردۆشەگ دانیشتبووسیغارلەسەرسیغاردووکەلی بەبادەکرد.

بەلام خەیاڵی وەک سەگی هار لە کۆڵانە تەنگ و تاریکەکانی شاردا دەسوڕاوە و لە پێش دەرگایەکی سەوز رادەوەستا و دەوەڕی.. یەک خەریکی ماچ و مرچ و رابواردن بوو، ئەوی دیکەش لوورە لووری بوو. هەر لەو کاتەشدا خاچپەرستەکان لە کلیسا کۆ ببوونەوە و شەمی تازەیان بە دەستەوە گرتبوو، دەخەلیفە ڕامابوون. خەلیفە کەوای جێژنی کردبوە بەرو ئینجیلی بەرگ زێوینی‌لێک کرد بۆوە. لاقی لە سەر مێمبەرێک بوو کە بە گوڵی ئەستەرەن رازابۆوە. سەری گەیشتبوە بن دار لیمۆیەک کە گوڵی کردبوو. شنە بای شەوانە دەرچاوی شادی هەموانی دەلاواندەوە. ئەودەمە پڕ بوو لە شکۆ و جەلال، هەموو هەستیان پێدەکرد هەموشیان ئەوەیان دەزانی کە موجیزەیەک نیزیکە. موجیزەیەکی ئارام ودڵنیا، وەکۆترێک کەلە تاریکی شەودا هەڵنیشێ. کاتێک هاواری :« مەسیح لە نێو مردوان راست بۆتەوە» لە خەڵک هەستا وگڕی پیرۆزی شەمەکان بەرز بۆوە، هەموو خاچپەرستەکان لە گەڵ خودی مەسیح لە یەک دەمدا بۆ ژیان گەڕانەوە . پاڵەوانەکان دەمانچە زێوەکانیان تە قاند و مورتزوفلوس کە لە خۆشیان شێت ببوو، بە جارێک هەوسێ زەنگوڵەی (سن‌میناس) و (ئازادی) و (مەرگ)ی وەدەنگ هێنان. ئەو بەو زەنگولانە بەو شارەی کە تۆ قی کزیلەتی تورکانی لە ملدابوو ، رادەگەیاند کە پاڵەوان ماتولی واتە (کریت) نە مردەو نامرێ و رۆژێک ئازاد دەبێ.

دوای راستبوونەوەی مەسیح خەلیفە قینی نیشتەوەو کەم کەم هاتەوە سەرخۆ . لە بەیانیدا بە جاش قەشەیەکدا هێندێ باقلاوەو قەرتالێک هێلکەی رەنگ کراو و چەند دانە کولیچەی بۆ پاشا نارد. شاری کاندی هەر وەک گیان لە بەرێک و وەک ئیماندارێکی مەسیحی کە لە کلیسا گەڕابێتەوە و شادو بەکەیف لە بەر هەتاو پاڵی دابێتەوە، لە رۆخی دەریای بە کەفدا دەدرەوشا.

باربایانیس شیری خۆی لە پشتێ بەستبوو، میداڵی تەنەکەی بە سینگیەوە هەڵاوەسیبوو، تەوێ رۆژێ وەک حەسانەوە بە نێو شاردا دەگەڕا و شەربەتی نەدە فرۆشت. تورک و مەسیحی کە تووشی دەبوون، لە گەڵ یەک سەریشیان بۆ دادەنواند. ئەویش بە فیزو لوت بەرزی پاشایەکی بە راستی وەلامی دەدانە وە. لاوێکی خەڵکی بنغازی بە کرێ گرتبوو، بە زوخاڵ دەمو چاوی رەشکردبوو، بۆ لاسا کردنەوە وەک خولامی رەش لە پشت سەری دەرۆیشت.

هاریلاتوسی قولە خڕە بە سمێڵی بادراو لە قایتونی خۆیدا دەچوە سەردان .کلاوێکی حەسیری تازەی لە سەر نابوو کە تازە لە ئاتینەوە بۆیان نارد بوو. لە کاتێکا چەنەگەی هاویشتبوە سەر دەسکی وەکازەکەی کە سەری بە شکڵی شێر دروست کرابوو، بە قین و تووڕەیی شەیتانانەوە تەماشای خەڵکی دەکرد. چونکە ئەو نەیدەتوانی لە گوناحی ئاسایی خەڵک خۆش بێ.

مەسیحی کە گشتیان جلٰ جێژنیان کردبوە بەر، لە رۆژئاوادا لە سێ تاق کۆ ببوونەوە. بای دەهات و ئەیتانی ئاوریشمی پرچی کچەکانی دە لەراندەوە . لە سەرووی شار دەریا بەرەنگی گوڵ پان ڕابوو. لە لای خوارەوە دەشت و مەزرا سەوز دەچوون. چیاکان رەنگی ئاریەریان بەسەر کشا بوو. دارزەیتوونی زێوین دەدرەوشان. ئاسمانی شین سێبەری ئارام و جوانی خستبوە سەر خەڵکی کاندی کە بە نیازی هەوا خۆری و خۆ نیشاندان و هەزمی خواردن هاتبوونە دەرێ. کەم کەم تاریکی باڵی دەکێشا و ئەستێرەی زوهرە شادو سەرکەوتوو، هەروەک مەسیحی زیندو بۆوە، لە بان سەری هەموانەوە لە تاقی ئاسمانێ خۆی نیشاندا.

سی‌شەمۆی جێژنی پاک پاڵەوان پولیکسینگیس بە شادی و زەوقی لاوێکی بیست ساڵە، لقەگوڵێکی سووری لە باخی ئامینە خانم چنیبوو، خستبوویە پشت گوێچکەی و بە هەنگاوی نەرم و گورج و گۆڵ، لە دەروازەی کاندی هاتەدەر. چەندە گۆڕا بوو. چەندە گەنج ببۆوە، چەند رۆژ بوو سێبڵ و بن هەنگڵی بۆنی عەتری لێدەهات. هەر ئەوێ رۆژێ بەیانی کاتێک خوشکی دیتبووی کە براکەی قەرتاڵێکی پڕلە خواردەمەنی و بوتڵی شەرابی داوە بە عەلیاغا بیباتەوە ماڵێ، لێی پرسیبوو: « ها.‌.ژۆرژدیسان جێژن و میوانداریت هەیە؟ » پاڵە وان لە وەڵامدا گوتبووی:

- خوشکێ تۆ دەڵێی چی ؟دەبێ تاڵوکەی بکەین، مردن کەس ئەمان ئادات ...

لە نیزیک دەروازەی کانە لە بن دارە گێوژێک دوو کەس لە هاورێکانی چاوە رواتی بوون. یەکیان پاڵەوان ستیفانیس بوو کە خۆی هاویشتبوە سەر گۆچانی بە گرێ. ئەوی دیکە پیاوێک بوو بە چلی ئوروپایی و دم و چاوێکی کز و رەنگ پەریو، ریشێکی کورت و خورمایی و چاوی عابی. پاڵەوان دەستی بۆ درێژ کردن و گوتی :

- گوریتە سڵاو .پاڵەوان ستیفانیس! تۆ دەزانی کە ئەم رۆ رۆژی زیندووبوونەوەی مەسیحە ! تۆش ئەی زانای زەمانە، ئەی ئیدۆمنە ، بروا بکە لە دەستی تۆ کەم کەم هەراسان دەبم. ئاخر ماوەیەک دەست لەو کتێبە لەعنە تیانە هەڵگرە، تاوێک وەرە دەر، خۆت وەبەر هەتاوی دە و تەماشای خۆربکە.! تۆ پێت وایە ئەم بازارەی ژیان چەندە دەخایێنێ؟ کەوابوو تۆش بجووڵێ، هێندێ پێبکەنە، مەسیح زیندوو بۆتەوە، تۆش زیندوو بەوە.

ئیدۆمنە گوتی:« پاڵەوان ستیفانیس نامەیەکی تۆی داوە بەمن »

- گوتم جارێ با بڕۆین. دوایە باسی ئەو مەسەلانە دەکەین. مەسیح زیندو بۆتەوە، یالاّ کورینە! هەموویان کەوتنە رێ. نیزیک نیوەرۆ بوو لە بورج و دیواری شار وەدوور دەکەوتن. لە لای راستیان دەریا بە تورەیی و بە توندی خۆی بە رۆخەکانی کریت دادەدا و دە کشایەوە.لە لای چەپەیان دنیایەکی خۆشەویستتر هەبوو. سەوزایی زەرد هەڵگەراو بۆنی عەتریان لێ دەهات. جاشە کەرێک لە نێوگیادا خۆی دەگەوزاند. زاری لێک دەکردەوە و تەماشای ئاسمانی دەکرد. دەتگوت پێدەکەنێ. ‌ اڵە وان پولیکسینگیس لە پڕ راوەستاو لە قاقای پێکەنینی دا. هاورێکانی پرسیان :

- ها.. پاڵەوان بە چی پێدەکەنی ؟.. چ قەوماوە ؟

- کورینە ئەو دیمەنە شتێکی سەیرو وە بیر دینێتەوە. ئەو کاتی منداڵ بووم و دەچوومە قوتابخانە، رۆژێک مامۆستاکەمان ئاغا( پاترویولس) لێی پرسیم :« پولیکسینگیس! بڵێ بزانم کەر چیە ؟» من لەوە لاّم دا گوتم :

- مامۆستا .. کەر کەرێشکی سەت ساڵەیە .ئێستا بە راستی تەماشا کەن، وە کەرێشکی سەت ساڵە ناچێ.؟

دووبارە کەوتنەوەرێ ولە رێگادا پێدەکەنین. پاڵەوان ستیفانیس بە شەلە شەل دەرۆی ، پاڵەوان پولیکسینگیس باسکی ئاغا ئیدۆمنەی گرتبوو تا نەکەوێ..لە ولستیدا کابرای زانا رانەهاتبوو بە سەربەرداندا بڕوا. لە هەموو هەنگاوێک هەڵدەخلیسکا.

پاڵەوان پێی گوت : غیرەتت بێ، ئاواڵ زاوا، ئەوە گەیشتین.

پاڵەوان ستیفانیس گوتی : « ئاواڵ زاوا یانی چی ؟»

– ئاخر خوشکەزام دووسەی مێردی دەکا. زاواش دۆستی نیزیکتر لە ئیدومنەی نیە. ئەم درانە لە پەنا یەکتر دادەنیشن، وەها لەکتێبیاندا نوقم دەبن، وەک مشکی نێو پێستە پەنیری دەست دەکەن بە خواردن. ئیشەڵابۆ شایی خۆت ئاغا ئیدومنە.

بەلام ئاغا ئیدومنە بێ ئەوەی زمانی بگەرێ ، سەری راوەشاند. ئارەقێکی ساردی بە سەروچاویدا هاتە خوار. ئیدومنە لە بنە ماڵێکی رەسەن بوو. باوکی کە لە پیاو ماقوڵەکانی قەدیمی شار ومرۆڤێکی باشبوو، حەوزێکی ئاو هەڵدێری لە پێش ماڵەکەی دروستکرد بوو، تا رێبوارە تینوەکان ئاوی لێ بخۆنەوە. دراوسیکان گۆزەکانی لێ پڕ کەن. حەوزەکەشی بە ئاوی کورەکە (ئیدومنە) کرد بوو. بێجگە لەوە پەلجەرەیەکی بە دیوی کۆلانێدا دە دیواری خانوەکەی کرد بوو، سەعاتێکی گەورەی دیواری تێگرتبوو، تا خەڵکی کاندی لە کات و سەعات ئاگادار بن. بەلام بۆ خۆی ئەگەر ویستبای بزانێ سەعات چەندە، لە ماڵێ دەچوە دەر و لە کۆلانێ تەماشای سەعاتەکەی دەکرد. مامۆستای جۆر بە جۆری بۆ کورەکەی راگرتبوو. هەموو رۆژێ بەیانی قەشەیەکی کاتولیک دەهات زمانی بێگانەی پێ دەگوت. مامیشی زمانی عیبری فێر دەکرد. پیاو ماقوڵی پیر بە دۆستەکانی دەگوت : « رۆژێک دێ ئەو کورەی من کریت ئازاد دەکا. بەینی خۆمان بێ لە سەر ئەو باوەڕەم بۆ ئازادی کریت تفەنگ پێویست نیە، بەڵکوو مێشک پێویستە.

پیرە مێرد مرد و کەللەی کورەکەی پڕ بوو لە زانست و جەوهەر. دراوسێکان بە سەر سوڕ مانەوە دەیانگوت :

– کابرا حەوت زمان دەزانێ. لە سەر هەست بوون کەنگێ لەم حەوت زمانە، زمانی دەگەرێ. کورەکە هیچ قسەی نەدەکرد. کەم کەم ماخولیا ببوو. ماڵەکەی بەرەو وێرانی دەچوو.لە ماڵێ نە دەهاتە دەر. تەواوی رۆژ سەری بەسەر کتێب دادەگرت و دەیخوێندەوە، یان قەڵەمی دەست دەدایەو دەینووسی. لاپەرە کاغەزی لە وشەی نامەویا نێو کتێبان رەش دەکردەوە، پاشان دەینوشتاندەوە، دە پاکەتێکی دەنا، سەری پاکەتەکەی لاک و مۆر دەکرد. کۆنە مۆرێکی کە لە باوکی بۆ بەجێ مابوو، پێیەوە دەنا و ئەو کۆنە مۆرە وێنەی «مینرۆ(١)»ی نیشان دەدا کە لەسەر گلکۆیەک داهاتۆتەوەو کلاوخودێکی لەسەرەو نێزەیەکیش بەدەستەوە. دایانی پیری دەنارد کەنامەکان بخاتە پۆست. ئیدومنە لە و نامانە دا بە وشەو زاراوەی خەفەتبار لە بارەی دەردو رەنجی کریت بۆ قەیسەری رووسی دەنووسی و هانی دەدا تا چەک و چۆڵی شەر بۆ ئازاد کردنی نیشتمانەکەی لە دەستی تورکان بنێرێ.هەر لەو کاتەشدا گوزرانی کریتی بۆ رووسە قژ زەردەکان دەنووسی. هەروەها بۆ سەر کۆماری فەرانسەی دەنووسی و رک و راست پێی دەگوت : شەرمت بێ ئەی فەرانسە ، ئەی دایکی مافی مرۆڤ. تۆکە بە شۆرشی مەزنی خۆت، دنیای نوێت رووناک کرد و لە بەندت رزگار کرد. شەرمت بێ کە ئێستا رێگا دەدەی کۆیلەتی بە سەر کریت دا حوکمڕەوا بێ.!» هەر وەها نامەی بۆ مەلەکە ڤیکتوریا، مەلەکەی ئینگلستان دە نووسی و داوای لێ دەکرد تا

---

(١) Minerve لە مێتۆلۆژی یونانیدا کچی ژوپیتێرو خودای عیلم و هونەرو سەنعەتە. بە «ئاتنا» یا «پالاس»یش ناویان بردووە. «وەرگێر»

پاپۆڕەکانی شەڕ بنێری. لە بەرامبەر ئەوەدا، ئیددومنە هەوڵی دەدا تا لەنگەرگای (سۆدا) بدرێ بە ئینگلستان. ئەو دەیزانی لەنگەرگای بە ناوبانگی سۆدا هۆی تەواو ئەو بەد بەختیانەیە. گشت دەوڵەتە گەورەکانی دنیا چاویان تێ بڕیوە. بەڵام بۆ ئەوەی هیچیان دەستی بە سەر دانەگرن. ڕێگایان داوە کریت لە چنگ سوڵتانی تورکدا دیل بمێنێتەوە. ئەگەر ئەو لەنگەرگای لەعنەتی نەهایە دەمێک بوو کریت بۆ ئامێزی دایکی نیشتمان، بۆ یۆنان دەگەڕایەوە.

چەند ساڵ پێش ڕۆژی ۲۵ی مارس کە ڕۆژی جێژنی میللی بوو، ئاغا ئیدومنە بە کڵاوی بڵندی ڕەسمی چو بوە کلیسا و لەو کاتەدا کە دوای لێ بوونەوەی قورعان خوێندن قەشە لە میمبەرهاتبوە خوارێ، ئەو چوو بوە سە میمبەر و باسکی هەڵێنا بوو گوتبووی :

– برایانی من گوێ بدەنێ ! خودا لە دڵی منی ناوە و دەزانم کە نیشتمانی خۆم چۆن ئازاد بکەم. ئێستا داواتان لێ دەکەم کە هەموو کەس ژن و پیاو گەورەو پچوک ئامادە بن. هەر کەس بچێ بەردێک بخاتە ئێو لەنگەرگای (سۆدا) تا ئاوەکانی ڕۆخی لەنگەرگا پڕ بێ لە بەرد و ببێ بە زەویەکی وشک و بەردە لان، تا زلهێزەکانی جیهان لە سەر ئەو لەنگەرگایە کێشە نەکەن. دەنا هەر گیز ڕووی ئازادی نا بینین. بۆ پێشەوە.. برایان بۆ پێشەوە. هەموتان نیشانەی خاچ بکێشن. هەریەکە بەردێک هەڵگرن و وەدوای من کەون.

مورتزۆفلوس چوبوە سەر میمبەر و بە زمانی خۆش هێنابوویە خوار و گەڕاندبوویەوە ماڵی خۆی. دوای ئەو ڕۆژە ئیدومنە کەوتبوە ماخولیایی و ئیتر نەیدەویست هیچ کەس ببینێ و دەیگوت وەختی دیتنی کەسم نیە. چونکە ڕۆژ بە ڕۆژ پترنامە بۆ دنیای دەرەوە دەنوسێ. ئێستا نامە ی بۆ سەر کۆماری ئەمریکا دەنووسی. نەخشەیەکیشی لەگەڵ نامەکە بۆ دەنارد، تا شوێنی کریت و گرنگی ستراتێژی ئەو دوورگەیە نیشان بدا. بۆی دەنووسی کە بە هەر قیمەتێک بێ کریت لە چنگ تورکان بێنێتە دەر. دەینووسی: « تاخ ! ئەی بێشکەی فرانکلین و واشنگتون، ئەی وڵاتی ئازادی! ئێستا کریت دەستە زنجیر کراوەکانی لەو سەری دنیاوە بۆ لای تۆ درێژ کردوە، هاوار دەکاو دەڵێ : بە هاوارمەوە وەرە ! »

ئاغا ئیدومنە کات تەمەنی خۆی بە نووسینی نامەو بە چاوەڕوانی وەرگرتنەوەی وە لام ڕادەبوارد. جارو بار دەچوە حەسارو لە (دوکسینا)ی پیری دەپرسی:« نامەو شتی بۆ نەهاتوە؟» بەڵام نامەو شت نەبوو. دوو بارە لە پلیکانان سەر دەکەوتەوەو کاغەزی دیکەی سپی هەڵدەگرت و دیسان دەستی دەکردەوە لە نووسین. لە بەر ئەوە بۆ دیتنی هیچ کەس نە کاتی هەبوو نە دەیویست کەس ببینێ. لە گەڵ ئەوەش هەموو ڕۆژی شەمۆیان لە ڕۆژ ئاوادا چس گورگی تاقە دۆستی دە ها تەلای، دەرگا دەکرایەوە وچس گورگ بە پشتی کوڕ و لاقی قوراویەوە وەژووردەکەوت و لە کاتێکا خەریکی خاوێنکردنەوەی چاویلکەکانی دەبوو، دوکسینای کارە کەر بە بۆڵە بۆڵ دەیگوت : « ئێستا دیسان بە شەردێن ک پاشان دەچوو کەشەفێک قاوە و کولیچەی ئامادە دەکرد و دەیهێنا. ئیدومنە کیسە توتنی بارکی دەکردەوە، هەر تکیان ماوەیەک بێدەنگ دەبوون. و سیغاریان دەکێشا. لە بیری ئەوەدا دەبوون کە ئەم شۆ باس و دمەتە قەیان لە کوێوە دەست پێ بکەن و لە بارەی چیەوە بدوێن. پاشان ئیدومنە کتێبی نجوم، یان فیقە، یان مەعانی و بەیان، یا مێژووی شۆرشی یونان، نووسینی ( تریکوپیس)ی لێک دەکردەوە. هەرتکیان حەزیان لە کتێبی

تازە چاپکراوی ئینگلیسی دەکرد کە بیرو باوەری گشتی ئالۆز کردبوو، سابیتی دەکرد کە ئادەمیزاد لە رەگەزی مەیمونە. چس گورگ بە سەرسوڕ مانەوە گوێی دەدایە. پاشان هەرتکیان توورە دەبوون و دەستیان بە باس و دمبەدمە دەکرد. دوکسیناى پیر لە کونی قفڵەوە تەماشای دەکرد تا بزانێ وای لێ نەهاتوە بچێ لێکیان کاتەوە.

بەم پێیە چس گورگ تاقە دۆستی بە ئەمەگی بوو کە هەموو رۆژێ شەمزیان دەچوە چاو پێکەوتنی. لە لایەکی دیکەوە ئیدومنەش جاروبار رێگای دەدا پاڵەوان پولیکسینگیس، دۆستی سەردەمی منداڵی لە پلیکانە رزیوەکانی ژوورەکەی سەر کەوێ و بچێتە ژوورە پڕ لە تەپ و تۆز و پڕ لە کتێب و نەخشە. ئەوان دراوسێ بوون. کاتێک منداڵ بوون پێکەوە یاریان دەکردتا ئەو رۆژەی کە کورە نەجیبزادەکەیان دابوە دەست قەشەی کاتولیک و ماڵی جولەکان.

کاتێک پاڵەوان پولیکسینگیس بەو کڵاوی زەلام و سمێڵی بادراوی دەهاتە ژوور، وەتاغی خەفەتاوی ئیدومنە پڕ دەبوو لە شادی و پێکەنین. ئیدومنە تەماشای دۆستی خۆی دەکرد و لەوە سەری سوڕدەما کە ئەو هەموو گوێ نەدان و روو خۆشی و نەزانی و نەخوێندەواری لە کەسێک دا کۆ بۆتەوە!

هێندێ جار پاڵەوان مەجبوری دەکرد پێکەوە بچنە سێ تاق بۆ گەرانێ. بەڵام هەمیشە لەوێ خەڵک زۆر بوو. هەرتک پێیان باشتر بوو بۆ لای دەریا بڕۆن. ئەو رۆژە چونکە هەوا زۆر خۆش و بەهاری بوو، پاڵە وان پولیکسینگیس نامەیەکی بە پاڵەوان ستیفانیس دا بۆ ئیدومنە نارد بو و، تێیدا نووسیبوو: «دۆستی گەورەی من ئیدومنە! تکات لێدەکەم لە گەڵ پاڵەوان ستیفانیس دۆستی ئاوداری ئێمە تەشریف بێنە و کارێکی پێویست ها تۆتە پێش و دەبێ چاومان بە یەکتر بکەوێ. کارێکی گەلێک پێویستە. مەسەلەی مان و نەمان لە گۆڕێدایە!»

ئاغا ئیدومنە هەراسان ببوو. بە دوای پاڵەوان ستیفانیس دا کەتبوە رێ و لەو کاتەوە گەیشتبوونە بن دارە گێوژ، بە نیگەرانی تەواو پرسیبووی:

- بە راستی مەسەلەی مان و نەمان لە گۆڕێ دایە؟ پاڵەوان پولیکسینگیس کە گەیشتبوە لایان، قامکی لە سەر زاری دانابوو گوتبووی: بێدەنگ بە پاشان دەزانی!

هەر سێکیان لە درێژایی رۆخی دەریا بە کوێرە رێ و بەردەلاندا رۆیشتبوون. مەیدانێکی پان و بەرین کە خەندەکی بە دەورەدا کێشرا بوو، دەرکەوتبوو. خاچی رەش وداری سەروکە سەریان لە دیوارهێنابوە دەدەبینران. ئیدومنە ترسا وگوتی:

- ئەوە چیە، دەچینە قەبرستان؟

پاڵەوان دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

ئەدی دەترسیت بچینە کوێ؟ بۆ چما مرۆڤ لەو رۆژەوە دێتە سەر دنیا هەر بەرە و قەبرستان ناچێ؟ پاشان باسکی گرتبوو گوتبووی مەترسێ ئیدومنە.

(کولیوا) ی گۆڕکەن کە کەوڵێکی هەتاو سوتێنراوی لە بەردا بوو، بە سەری رووت و چاوی خێلی لە بەر دەرگای قەبرستان ڕاوەستا بوو دەستی کرد بوە پەردەی چاوی. کابرا وەک شاوە لەڕ ولاواز بوو. بەڵام دموچاوێکی ناقۆلای هەبوو. بروای نە بە خودا هەبوو نە بە شەیتان. چونکە لە کۆنەوە کاری ئەو گۆڕ هەڵکەندن بوو. لەرزین و بۆگەنبوونی مردوان شارەزا بوو. لە زۆر نهێنییەکان

ئاگادار بوو. بە چاوی خێل، بە بێ ترس و هومێد ولەبەر چاوگرتن تەماشای مەسەلەکانی‌ژیانی دەکرد. ئەگەر مردوویەکیان بە جلی تازەوە دە قەبری دەنا،شەوێ قەبرەکەی دەداوە ولیباسەکەی لە بەرداەکەند وبە بەری تەنگ یا یافرەوان دەیبرد .ژن و منداڵیشی بۆ ژن ومنداڵی خۆی رووت دەکردنەوە.ئەم کارە هیچ هەستێکی تێداتەدەبزواند. لە سەر ئەوکارەشەوە کە دزی لە قەبران دەکرد، قەت نەبوو تووشی ئازارێک بێ و یا لەسەرمان هاواری بێ. بە پێچەوانەی ئەو، ژنەکەی کە ژنێکی دڵپاک بوو، دەیگوت مۆتە دێتە گیانی بۆ بە وازەرد هەڵگەڕاوەو تووشی نەخۆشی سیل بوە. بەو جورە کە وەزع دەچوە پێش، زۆری پێ نەدەچوو کولیوا دەبوایە قەبری ژنەکەشی هەڵکەنێ. چەندرۆژ بوو ژنی کولیوا خوێنی لە سنگی دەهات و دیار بوو کە بەرەو نەمان دەڕوا. کەم کەم ئێسکانی وەدەردەکەوتن. بۆچی وای لێهاتبوو.؟ ئەکە باشی دەخوارد. هەمیشە کولیەو هەڵوای متفەرکی بە نسیب دەبوو. لە سایەی سەری مردوان جلی رەنگاو رنگی زۆریشی وەگیر دەکەوت. میراتگری تەواوی ئەو پارچە سپیانە بوو کە وەک کفن دەمردوان وەردەپێچرا. بەڵام وادیاو بوو ئەو ئەحمەقە مۆتەی دەبینی و ئەو مۆتانە خوێنیان دەمژی..

کولیوا بە زەردە خەنەی تایبەتی خۆی سەیری مردو وزیندوانی دەکرد. بەڵام ئەو زیندوە وشکانە خۆشیان نەدەویست. هێندێک بێزیان لێ دەبۆوە چونکە دەستی‌لە مردوان‌دەدا. هێندیکیش‌کاتێ لە شەقام تووشی دەبورن‌خۆیان‌لێ‌دەدا. چونکەئەو مردووی وە بیر دەهێنانەوە. بەڵام کولیوا ئەوانی پێ پێکەنین بوو. بە ریشی هەموان پێدەکەنی. لە دڵی خۆیدا دەیگوت :

« قەی ناکا. کەوڵ ئاخری هەر ڕێی دەکەوێتە دەباغ خانە. بیانەوێ و نەیانەوێ، ئاخرەکەی هەردەکەونە بەردەستی من.

کولیوا دۆستێکی بە ئەمەگی هەبوو، ئەویش لە مردن نەدەترسا. ئەویش ئاگای لە هێندێ نهێنیان هەبوو. ئەم دۆستەی پاڵەوان پولیکسینگیس بوو. پاڵەوان مرۆڤێکی دەستو دڵ ئاواڵەو خۆش گوزەران و دڵپاک بوو. هەموو جاری کە ئێشتیای لێ دەبوو، چەند بوتڵ شەرابی هەڵدەگرت لە گەڵ هێندێ خواردەمەنی، بانگی کولیوای دەکرد پێکەوە دەچوونە ژێر زەمین و دادەنیشتن و دوو بە دوو گیلاسی خۆیان لێدەدا.

کاتێک کولیوا پاڵەوان پولیکسینیس بینی کە لە گەڵ دۆستەکانی دێت، ئامێزی بۆ ئاواڵە کردەوە و گوتی:

- تاڵوکەی بکەن ! ئەگەر خوا نەکا مردوێک بۆ ناشتن بێنن، کەیفەکەمان لێ تێک دەچێ! باکیش ماوەیەکە بە کەمانچەوە لە خوارێ چاوەروانە.

ئاغا ئیدومنە بێ ئەوەی غیرەتی چونە ژووری دەرگای قەبرستانی هەبێ گوتی: « دەچینە کوێ؟ »

کولیوا لە وەڵامدا گوتی : « مە ترسێ ئاغا ئیدومنە، دەچینە شەری مردن. بۆ هەموو جار نۆرەی ئەو بێ، با جارێکیش دەور دەوری ئێمە بێ. »

هەموویان بە نێو خاچی دار وچرانەوتی هەڵکراودا، بە سەر قەبراندا دەرۆیشتن و پێیان لە پنجە گیای بۆنخۆش‌دەنا. کولیوا وەک خاوەن ماڵ وە پێش کەوتبوو کە رێگایان نیشان بدا. لە پڕ سەری کابرایەک لە قەبرێکی خاڵی دەرکەوت. ئیدومنە لە ترسان قیژاندی. کولیوا ئاوڕی داوە و بە پێکەنینەوە گوتی:

مەترسە ئاغا ئیدومنە . ئەوە باکێشە .

باکێش هەر لە پێشەوە سەرخۆشبوو. قەرتاڵەی شەراب و خواردەمەنی لە قەبردا چاو پێکەوتبوو، بە تاسەوە چاوە روانی کێشا بوو، کەم کەم تاقەتی بەسەر چوبوو، لە قەبری هاتبوە دەر و لقە گوڵێکی زەردی خست بوە پشت گوێ و گەڕابۆوە نێو قەبر و لە سەر تیلە بەردێکی قەبر راکشا بوو، چاوی لە سەر یەک دانابوو خۆی مراند بوو. بە قسەی خۆی مەشقی مردنی دەکرد. بەلام جارجاریش زیندوو دەبۆوە و ئیستکانێکی پێدا دەکرد و دیسان دەکردەوە. تا هەستی پێکرد کە دەنگە دەنگ دێ و دەنگی لاتانیشی بیست.

کولیوا راوەستا . پاڵەوانی بردە قەراخێک و گوتی: « ئەرباب لام وایە هاتنی باکێش پێویست نەبوو. هەر لە ئێستاوە پێت دەڵێم کە ئەو هەتیوەتووشی دەردە سەرێمان دەکا. چونکە هاتنی دەنگی موسیقا لە قەبرستان کارێکی رەوا نیە. قەبرستان بۆ خواردن و وەخواردن جێگایەکی باشە. خواردن و وەخواردن هەراوێکری لەگەڵ نیە. بەلاَم کەمانچەی لەعنەتی...

پاڵەوان پولیکسینگیس گوتی :

– ئاخ کولیوا ! من ئەو رۆژانە فرە خۆشحاڵم. پێم خۆشە گوێم لە دەنگی کەمانچە بێ.چەندرۆ ژێکە دنیا بۆ من زۆر تەنگ بوە. چاوە خێلەکانی گێژ هەڵکەن پڕ بوون لە شەیتانی و گوتی :

بێگومان ژن لە گۆڕێ دایە. ئەی شەیتان. چاویشت دە قوڵەوە چوون، حاشا نەکەی ها..!

ئێستا باکێش بە تەواوی لە قەبر هاتبوە دەر و بە منگە منگ گوتی :

– ئەرباب سلاَو ! خۆزیا من مەرگ خۆی بام . ئەو دەم وەرە بزانە چۆن خزمەتی ئەو خەڵکەی قەبر و هەژارم دەکرد! گوڵێکم دەخستە پشت گوێچکەم ومێزێکم لە ژێرزەمین دەرازاندەوە و پڕم دەکردلە ئارەق و شەراب وخواردنیجۆر بەجور

وەک ئەو مەرگە لەعنەتیەم نەدەکرد کە کرم و داعبایان دە گیانی خەڵکی بەردەم.

لەو کاتەدا کە پاڵەوان لە چوونە خوار بۆ نێو قەبر یارمەتی ئیدومنەی ترساوی دەدا، باکێش دەستی درێژ کرد تا دەستی پاڵەوان ستیفاتیس بگرێ. ئیدومنەی قەقیر لە دڵی خۆیدا دەیگوت: لەو قەبرستانە کاری چیە ؟ ئەوە چ قەبرێکە مێزی شەراب و خواردنی لێ دانراوە ! لەو ماوەیەدا کە کاتی بە فیرۆ چوو بوو، دەیتوانی نامەی دووردرێژ بۆ قەیسەر بنووسێ. لەوانە بوو قەیسەر بە چاوی بە تەسرینەوە خەمگین بێ و بڕیار بدا کە وەلاَمی بدرێتەوە.....

کولیوا بە سەریدا گوڕاندی :

– پالاَ ئاغا ئیدومنە ! تۆزێ بجزوو. دەمانەوێ مەرگ ببینین ! هەرچواریان لە سەر بەردێکی قەبر دانیشتن. سەری بوتڵەکانیان کردەوە وخواردنیان پان ڕاکرد و باکێش کەمانچەی گرتە دەست و دەنگی تارەکان بەرز بۆوە. کولیوا بۆلای

باکێش خوار بۆوە و گوتی:

– ئاغا باد.کێش بۆ خاتری خودا سەبری لێدە ! ئێرە قەبرستانە، مەیخانە نیە. خوا نەکا بیوەژنێک یا دایکێک بگاتێ، ئەوددم چدەکەین ... تێدەگەێ ؟

ستیفاتیسە شەلە تارێک بێکار نەبوو. لە سەر یەک ئیستکانی خاڵی دەکردو مریشکی

سورکراوەی لێ بەش دەکردن و بە خۆشی مردووەکان،مردووی خۆی و بێگانە، بە خۆشی باوکی ئەو قاچاخچیە بە ناوبانگە، بە خۆشیە دایکی کە هێلکەو کاهوی دەفرۆشت، بە خۆشی تەواوی ئەو مەلەوانانەی کە لە دەریادا نوقم بوون، بە خۆشی پاپوری (عەیار) کە چوە بن دەریاو نوقم بوو، دەیخواردەوە . پاشان کە گەرووی لە پێکەنین پڕ ببوو، بە سلامەتی هەموو دنیای دەخواردەوە. دوای هەموان (سوماسی) ئانکەری برازای وەبیر هاتەوە کە سالێ رابردوو لە کاتی کارنەوالدا سەرمای ببوو، هەر بەو نەخۆشیەش مرد بوو. لاوی فە قیریان رووت کرد بۆوە و سواری عارەبەیان کرد بوو، بە روالەت لە چوار میخەیان دابوو. قەلەمونێکی مردوویان لە سەر سینگی دانابوو و گۆیا قەلەمون جەرگی دەخوا... ئەو گەمانە هەموویان خە تای چس‌گورکی ئەحمەق بوون. بەم هۆیەوە ویستبووی نازانم کام قارەمانی قەدیمی بە بۆنەی یەکشەمۆی رەمەزانەوە نیشان بدا. ئەوێ رۆژێ سەرمایێکی لەعنەتی سەیر بوو. سوماسی فەقیر نەخۆش بوو، پاش سێ رۆژ پشتی تێکرد بوو.

- بە خۆشی سوماسی گەمەچی کە برازای خۆم بوو، بە خۆشی خۆمان.

هەموویان بە خۆشی ئیستکانەکانیان لێک دان. شەراب بە خوڕە خوڕ بە ئەوکی فرەواندا دەچوە خوار. ئیدومنە ترسا بوو. لە دلی خۆیدا بیری دەکردەوە : « من لە کوێم .. منیان کێشاوەتە لاتی شێران. »

ئاغا ئیدومنە لە هەوەڵەوە تەنیا لێوی تەڕ دەکرد. بەلام وردە وردە زمانی گەرم داهات و چاوی روون بورتەوە و روومەتی سوور هەلگەڕان.

کولیوا بە پارانەوە گوتی :« ئاغا ئیدومنە تۆ ئەو خوایە وەرە پیاوەتی بکە و زارت باش لێک بکەوە، تا من بزانم تۆ بەراستی حەوت زمانت هەیە؟ »

-باکێش کە گەرم داهاتبوو، بە زوق کەمانچەی لێدەدا. کولیوا تورە بوو، باسکی گرت و گوتی:

- کوری باش، گوتم سەبرتر ! دەتەوێ قسەم بۆ ساز کەی ؟ چما چاوەکانت باش نابینن؟ ئێرە قەبرستانە کاقە دانــەیک نیە. ستیفانیس لە کاتێکا ئیستکانەکەی پڕکرد بوو گوتی :

- کورینە کاتی مالاوایی هاتوە، بخۆینەوە !

ئێستا ئیتر ئیدومنە باش پێی دادەکرد. دەیویست باسێکی گەرم دامەزرێنێ. رووی کردە پالەوان پولیکــینگیس و گوتی :

- ژووژی من ! بلێ بزانم تۆ بروات بە قیامەت و بە ئەبەدی گیان هەیە ؟

بەلام پالەوان بە چاوی نیوە تاوالە بزەی دەهاتێ و لەرادە بەدەر شادو بەکەیف و رووخۆش بوو فەرمایشی ئیدومنەی نەبیست. کولیوا گوتی: « ئاغا ئیدومنە وازی لێ بێنە، ئەو ئێستا لە ئاسمانی حەوتەم دا دەسووڕێتەوە. »

باکێش لە پڕ خۆی کردە شەڕێکی قسەکان و گوتی :

- ئاغا پروفیسور من ئامادەم وەلامت بدەمەوە. بۆ تێگەیشتنی ئەو رازە تهێنیە لە پێشدا دەبێ سەر خۆش بی، ئێستا تۆ سەر خۆشی یان نا ؟

- بەلێ ...مەستی مەستم .

- کەوابوو گوێ بدەیە : باکێش کەمانچەی لە سەر ئەژنۆی دانا و گوتی :

– ئەو کەمانچەیە دەبینی؟ باش تەماشای یەک یەکی پارچەکانی بکە.ئەوە سیمەکانی‌کەمانچەن. ئەوە سەرپۆشی کاسەیە. ئەوە بەدەنیەتی، ئەوە دەسکیەتی ئەوە جێگای دوگمەکانە . ئەوەش ئەو دوگمانەن کە سیمەکانی پێ توند و شل دەکەن. ئەوەش ئارشەی کەمانچەیە لە گەڵ زەنگوڵەکانی ...

– باشە ... مەقسود ؟

– مەبەستم ئەوەیە کە تۆ بزانی بەدەنی ئینسانیش بە لاق و دەست و باسک و سەو وریخۆڵە و نێو سکەوە راست وەک ئەو کەمانچەیە. ئەوەی گوت و دەستیکردەیە لێدان. لە پێشدا ئاهەنگی توندوجلقی لێدا، پاشان ئاوازی نەرم وهەست بزوێن. پاشان رایگرت و گوتی : روحی ئادەمیزاد یانی ئەوە ... واتە موسیقا !

پاڵەوان ستیفانیس هاتە پێشتر. لەگەڵ ئەوەی زاری دەبزوت، بە وردی گوێی هەڵخست بوو. کولیوا بە پێکەنینەوە دەستی بە سمێڵی داهێنا.

ئیدومنە گوتی : « باشە لەم قسانە چت دەستگیر بوو؟»

– ئاخ .. دیارە هێشتا تێنەگەیشتووی، دەڵێی مەستیشم! هێندێکی دیکە شەراب بخۆوە تا من کەیفێ بکەم . ئە و دەم زەینت باشتر دەکرێتەوە. جامێکی پڕ کرد و ئیدومنەی مەجبور کرد کە پێی داکا. پاشان گوتی :

– ئێستا گوێ بدەیە ! ئەگەر من ئەو کەمانچە بشکێنم و هەزار لەتی بکەم، دیسان پێی لێدەدرێ ؟ ئاوازی موسیقای ئەو چی بەسەر دێ؟ داخوا بە بێ کەمانچە موسیقا لێ دەدرێ ؟ تەماشای ئیدومنەی کرد کە واقی ورمابوو. هەر وەها تەماشای کولیوا کە بە زۆر دەیویست پێشی پێکەنینی خۆی بگرێ و ستیفانیس کە باڵە مریشکی بە ئیشتیا دەکروسیەوە، پاشان دووبارە پرسی

– نا ! داخوا بێ کەمانچە دەتوانی موسیقا لێدەی ؟ روحی بێ لاق وبێ باسک و بێ نێو سک و ریخۆڵەو بێ سەر وجودی هەیە ؟ ئەگەر دیسان تێ نەگەیشتووی، پێویست نیە خۆت زەحمەت بدەی. ئەسڵەن واز لەو باسە بێنین.

کولیوا کەوتە نێوان و گوتی:

– باشە ئاغای باکێتس ! کێ ئەو کەمانچەیە لێدەدا! ؟ من دەمەوێ ئەوەی بزانم.ئارشەکە بە دەست کێیە؟ کێ یە کە ئارشەکە بە سەر سگ و ریخۆڵەو لەشی ئێمەدا دێنێ و ئەوان وەئاوەئاو دەخا.؟ لێرەیە کە دەمەوێ وەلامی راستم بدەیەوە. تۆ ئاغا ئیدومنە لەو بارەوە چۆن بیر دەکەیەوە؟ دەڵێن تۆ حەوت زمانت هەیە، یەکیان دەربێنە و قسە بکە بزانم کێیە ئەو کەمانچە لێدەدا ؟

ئیدومنە بە روو گرژی گوتی : « خودا ...»

گۆر هەڵکەن تفێکی لە عەرزی کرد و گوتی :« ئەو باکێتسە خرە زۆر بڵێ یە »

لەو کاتەدا کە ئەوانی دیکە باسی روح و مردن و مانەوەیان دەکرد، پاڵەوان پولیکسنگیس لە عاسمانی حەوتەم دەسوڕاوە و بە خۆی دەگوت : « نا.. شتی وا نابێ.. ئەو زۆر جوانە.. زۆری پێ ناچێ.. هیچ دەزانی ؟ ئەو لەو سەری دنیا، لە نێو وەحشی‌یان لە بەر تۆ لە دایک بوە. بە شیری ماین گەورەیان کرد و ئێستا وەک پەنجەی خۆر جوان بوە. دیسان هەر بۆ راهواردنی تۆ بوە کە هاتۆتە کاندی و لە مانگە شە ودا لە سەر تیو تەختی نەرم خەوتوە و پێندەکەنێ و دە قیژێنێ وگاز

دەگریٚ ... ئاخ ئامینە.. » پالەوان لە قەبری خۆیدا پێدەکەنی، جارویار وای خەیاڵ دەکرد کە هێشتا لەشی نەرم و تۆلی چەرکسی لە ئامێز دایە .

خۆر دەهات ئاوا دەبوو. ئیتر خواردەمەنیش لە قەرتاڵەدا نەمابوو. هەموویان گەلێک سەر خۆش بوون. ئیدوەنە چەپڵەی لێدەدا و بە دەنگی گڕ و ناخۆشی بەستەی رەمەکی قەدیمی دەگوت کە لە بیری مابوون. قەیسەری روس و پاشاکانی دیکەی لە بیر برد بوونەوە. نامەکانی لە بیر برد بۆوە کە سەرتا خوار رەشی دەکردنەوە. تەنیا گۆرانی دەگوت.

لە پڕ لە ژوور سەری ئەوان و لە لای قەبرستانەوە دەنگی گریان و رۆرۆ هەستا. کیژۆڵەیەک بوو هاواری دەکرد :

- بابە ! بابە .. بە نێو قەبراندا رایدەکرد و دەهات. کولیوا گوێی هەڵخست، راست بۆوە، گوتی : « ئەوە دەنگی (لینو)ی کچمە » سەری لە قەبری هێنا دار و دیتی بە راستی لینۆیە کە بە غار دێ.

- چیە ؟ .. کیژم .. چیە بۆ دەگری ..؟

- بابە .. بابە دایکم ئەوە دەمرێ.

- دەڵێی چی ؟ .. بێژە بزانم چ بوە ؟

کچ خۆی بە عەرزی داداو قژی سەری دەرنیەوە و هاواری کرد:... دایکم مرد ..دایکم

کولیوت پیاڵەی شەرابی پڕ کرد و بە سەریەوە نا. دەستێکی بە سمێڵی داهێنا و لە قەبر هاتە دەر و قوڵنگی هەڵگرت و تفی کردە دەستی و دەستی کرد بە گۆڕ هەڵکەندن. بە کیژەکەی گوت :

- تۆ برۆ ... من ئێستا دێمەوە ..!

# ٦

ماڵ و منداڵ و کەس و کاری پاڵەوان میکێلس لە چوار گوندی( پێتروکفالو ، سن ژان، کروسونا وسوورە کەرێز ) دەژیان.بەرە بەیانی زوو بۆ بەشداری لە شایی ژن گواستنەوەی چس گورگی برا چکۆلەی پاڵەوان میکێلس بەرە و شاری کاندی کەوتنە رێ. هەموویان دەبوایە لە پێشدا بچنە گوندی پێتروکفالو ناوەندی ئەسلی بنە ماڵە کە پاڵەوان سیفاکاس پیرە مێردی سەت ساڵەی باوکی پاڵەوان میکێلس لەوێ دەژیا. لە وێوە بە سەر پەرشتی بابە گەورە بۆ لای شار وەرێ کەون. هێندێ سواری هێستر و هێندێکیش بە سواری ئەسپ کە لە جیاتی زین جلی گوڵداری بە ریشوویان لێ کرد بوون، کەوتبوونە رێ. بۆ دیاری بوکێ و شایی لە بەرخ و کودەڵە بەرازی سورکراوە و ، بگرە تا پەنیر و هێزەی شەراب و رۆن زەیتون و کوپە هەنگوین رکیسە کشمیش و ئاڵقە هەڵجیر وبادامیان لە گەڵ خۆ هێنا بوو.

سیفاکاسی پیر کە کراسی ماهوتی تازەی کردبوە بەر و چەکمەێ رەش لە پێدا، دارێکی درێژی نوک تیژ بە دەستەوە و مێزەرێکی رەش لەسەر، بە بالأی بەرزو چوارشانە کە دەرگای پڕکردبوو، وەدەرکەوت. ریشێکی درێژ سینگی داپۆشیبوو، چاوی دەقولەوە چووی لە ژێر برۆ ئەستورەکانی دە ترووسکان. دوو باسکی ئەستووری ریشکی ، وەک دوو لقە دار زەیتونی کۆن لە قۆلی گوشادی کراسی سپی هاتبوونە دەر. پیرە مێرد چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد، کۆلان پڕبوو لە کوڕ ونەوەو نەتیژەی ئەو. شاد و کەیفخۆش باسکی لێک کردنەوە و رووی تێکردن و هاواری کرد :

– رۆڵەکانم ! هەزار جار خۆش هاتن ...ئێوە دەشتێکی پڕ لە گوڵ و گوڵزارن .

لەو کۆمەڵە نادەمیزادە کە هەموو لە پشتی ئەو کەوتبوونەوە هورا هەستاو تێکڕا لە وەلأم دا هاواریان کرد:

– سلأو لە تۆ ئەی پیر ! ولأتی تۆ شادو بەختەوەر بێ .

دوو کەس لە نەوەکانی هاتنە پێش و ماینی باپیریان هێنا، یەک جلەوی گرتبوو یە کیش رکێف . ماینەکەیان بردە پەنا عەمباری ناوێ، تا پیرە مێرد بتوانێ بە هاسانی سوار بێ. بەلأم یە پێکەتینەوە لاوەکانی دوور خستەوە و گوتی :

– ئێوە پێتان وایە من پیرە مێردم؟ نابی کەس رکێفم بگرێ. پاشان دەستی گەیاندە یالی ماین و پێی دە رکێفێ نا و وەسەرزینی کەوت. جارێکی دیکەش هەوار هورای شادی لە کۆمەڵ هەستا و دەیانگوت :

– ئەی پیر هەر شاد و سلأمەت بی ! هورا دارین هەزار ساڵ بژی .!

پیرە مێرد کە مێزەرەکەی توند دەکرد، بە فیزەوە گوتی :ە نا ! رۆڵەکانم ... هەزار ساڵ زۆرە

. پینج سەت ساڵ بەسە.» ئەو یازدە کوڕ و چوار کچی لێ کەوتبوونەوە . هەموویان شێری بە راستی بوون. تەنیا کوڕی پاشە بەرە بوو کە بۆ هیچ نەدەبوو. منداڵێکی لاواز و مردولە بوو دەتگوت مارمێلکەیە. ..خودایە چۆن ئەو پلە گزشتە لە پشتی ئەو پەیدا ببوو.؟ زۆر جار لەژنەکەی دەپرسی :« ئەو کوڕە چی لێ پەیدا دەبێ.؟ بۆ شوان نابی چونکە تواناى دزینی نیە .بۆ جوتیاریش نابێ، چونکە هێزی ئامور داگرتنی نیە. بۆ مەلەوانیش نابێ چونکە هەوای دەریا دەیگرێ. ...ئەدی بۆ چی دەبێ؟!»

پیرێژن کە ئەو کوڕە پاشەرۆکەی خۆش دەو یست، پێشنیاری کرد بیبێتە قەشە . پیرە مێرد گوتی :

قەشە یان ماموستا. لە گوندی قەشەمان هەیە، بە لاّم ماموستامان نیە . باشترە ببێ بە ماموستا.

پەم پێیە کوڕەکەیان ناردە کاندی کە بخوێنێ. کوڕی پاڵەوان سیفاکاس بوو بە چس‌کوڕگ . ئەودەم پیرە مێرد هەستی کرد کە سووکتر بوە. کەمێک شەرمی دەکرد کە بڵێ کوڕی ویە.لە حەساری ماڵەکەی هێشتا دە لاوی ئەڕە شێر مابوونەوە. شانازی پێدەکردن و دەیگوت :

– کاتێک ئەو کوڕانەی من تان دەخۆن، تەواوی ماڵ دەلەرزێ. ئەوانەی بێگانەن دەپرسن : داخوا بوولەرزە هاتوە.؟ پێیان دەڵێن ، نا.، کوڕەکانی پاڵەوان سیفاکاسن نان دەخۆن!.

تا رۆژێک مەرگ هات لە بەر دەرگای ماڵێ راوەستا و تەماشای حەساری پان و بەرینی کرد. کوڕەکان زۆر بوون و زۆریش رەشید بوون. مەرگ بەشی خۆی ویست. هێندێکی لە شەڕێدا کوشت و هێندێکیشی ناپیاوانە لە جێ و باندا هەڵو ێژارد. لە گەڵ ئەوەش هێشتا ئەوەندە مابوونەوە کە چەندی سیفاکاسی پیر ویستبای ئەوەو ئەتیژانی بدەنێ. خوا هەمان سلاّمەت کا. ئێـتا سیفاکاسی پیر سەت ئەوەندە بوو. ئەو سەت کوڕەش دەیئە سەت ئەوەندە و دوورگەی کریت پڕ دەکەن. لەوانە هەرچەندی مردبان یا کوژرابان ، دیسان بەشی هەوپرتوشی‌شوڕشیان هەرلێ دەمایەوە. کەوابوو ئەو دەیتوانی بە ئاسر دەبێ بمرێ. پیرە مێرد دەستی هەڵێنار گوتی :

– رۆڵەکانم ! شوکری خوا دەکەم. با بچین بۆ پاشەرۆک بوک بگوێزینەوە. خۆشی بە سە رۆکایەتی ئەو دەستە گەورەیە کەوتە رێ. دوو کەس لە کوڕە گەورەکانی، واتە مانوساکاس جوتیاری بە توانای گوندی سێژان و فانووریوس رێنگر و مەرداری بە ناو بانگ دوو هەنگاو دواترلە راست وچەپی دەرۆیشتن. ئەم دوانەش پیربوون، بەلاّم‌هێشتا بە هێز ودڵتەربون

فانووریوس شوانێک بوو توندو تۆڵ. وەحشی سەرتا پێی لەشی بۆنی پەنیر و تەگەی لێ دەهات.تەواوی کوێستانی خستبوە بەر دەستی خۆی. کاتی لە تەنیایی و چۆلی کوێستان نارەحەت دەبوو، بۆ دەشتێ دادەکشا و دەهاتەوە پیتروکفالو. لەوێ گای حاجی نیکۆلی کە لەدار زەیتون بەسترا بۆوە بەرێدەدا و لە گەڵی بە شەر دەهات و بەو کارە ئارام دەبۆوە. لەم جیهانەدا بێجگە لە سپینای ژنی لە کەسیتر نەدەترسا. سپینا پلەگزشتێکی زەردی هەڵساو بوو بە دوو چاوی عابیەوە، ئامکت لێدابا وەعەرزی دەکەوت. بەلاّم فانووریوس هەرچاوی بەوی کەوتبا دەلەرزی. کاتێ لە چیا دەهاتەوە تا وایی تا چەند رۆژ لای ژنەکەی بێ و منداڵێک چێ بکا، مەجبوور بوو بە عەدەبتر بێ. دەیویست شەراب بخواتەوە، بەلاّم نەیدەخواردەوە. دەیویست جنێو بدار قسەی

سوک بکا، نەیدەکرد. تەنانەت خۆی لە تف فڕێدانیش دەپاراست. بەڵام لە گەڵکوو سپێنا دەچوو دەنووست، ئەو سەری لە پەنجەرە دەهێنا دەر و هەروەڵ ڕێبوارێکی دیبایە، پشت ملی دەگرت وهەڵیدەکێشا و بە پەنجەرەدا دەیبردە ژوور و لە پشت مێزی خۆی دادەنا. ئەوەدەم بەسپایی هەرتک دەستیان دەکرد بە شەراب خواردنەوە ئەگەر کەسێکی دیکەش بە بەر پەنجەرەدا هاتبا. قانوریوس ئەویشی هەڵدەکێشا. بۆ ئەوەی کە سپێنا وەخەبەر نەیە، ئیستکانی شەرابیان ئاوا لێک دەدا کەدەنگی نەیە. کاتێک هەموو سەرخۆش دەبوون، قانوریوس پشت ملی میوانەکانی دەگرت و لە کۆڵان دایدەنان. پاشان دەچوە سگ ژنەکەی کە تا ئێستا حەوت منداڵی بۆ هێنابوو.

هەورێک لە تەپ و تۆز هەستاو بەری ڕۆژی گرت. سیفاکاسی پیر جاروبارئاوڕی دەدایەوە و تەماشای دەستەی دە کرد. بە دوای مانوساکاس و قانوریوس دا کۆمەڵێکی دیکەش دەهاتن، هەر چەند لەو بنەماڵەی بوون، بەڵام فەرقیان هەبوو. کوڕی وان بوون کە ژنیان هێنا بوو، ئەوەیان بوون کە هێشتا ڕەبەن بوون. کە لچی وا هەبوون کە ڕیشیان نە هاتبوو، بەڵام دەم چاویان بە مندارە مووی زەرد و یا سووردا پۆشرا بوو. ئەوانە نەتیژەی پیرە مێرد بوون. بەدوای ئەواندا ژن دەهاتن کە دایم قسەیان دەکرد و قرتە قرتیان بوو.

پیرە مێرد دووبارە تەماشای دەستەی دەکرد و پاشان سەری بۆ لای شاری کاندی وەردەگێڕاوبەک قسەی نەدەکرد. ساخ و کەیفخۆش بوو، ماوەیەک بوو ڕشە لە مێشکی دا تێکەڵ دەبوون. ئەگەر کرێیەک لە دڵیدا هەبایە، جگە لە خوا لەگەڵ کەسیتر باسی نەدەکرد. لە ڕاستیدا سەبارەت بە هێندێ مەسەلەی گرێ پوچکە لە عەزاب دابوو. بۆ یێکەم جار سیفاکاس مردنی وەبیر هاتبۆوە. ئەو ڕۆژەی کە دەبوایە بچێتە خزمەت خوا وەنیزیک دەکەوت.پاڵەوانی پیر لەو فیکرە دەلەرزی. ئەو خودای وەک چیایەکی تاریک و لێڵ دەهاتە خەیاڵ کە ئاوێکی زۆری هەبوو، ئەویش تینووی ئەو ئاوە بوو. دڕندەی زۆر لەوێ بوون و ئەو لێیان دەترسا.شەڕێکی لە شەڕەکانی سەر دەمی شۆڕشی وەبیر دەهێناوە کە بە تەنیا لە زاڵم کێو نیزیک دەبۆوە و لە دەرەوەی شاری کاندی تورک لە مەتەریزاندا بوون. داهاتبۆوە بە بەواشی لە کاتێکا خەنجەری بە ددانان گرتبوو، دەچۆ پێش.دەنگی پچە پچی سەربازانی دەبیست کە بە سرتە قسەیان دەکرد. ئاگری سووری سیغارەکانی دەبینی و دەنگی ڕێک کەوتنی چەکەکانی دەبیست. دەلەرزی، بەڵام دەچوە پێش. ئێستا هەرچەندی لە مردن وەنیزیک دەکەوت، خودای وەک ئەو کێوە دەهاتە بەر چاو.

وانگلیو لە حەمامێ گەڕابۆوە و ڕیشیو بە شانەی ئێسکی فیلی پرچەکانی بە شانە دەکرد. بۆ ئەوەی زەردی کولمەکانی لابچێ، سووراوی دە ڕومەتی دابوو. هێندێ سپاوێشی دە کەپۆی دابوو تا چووکتر بێتە بەر چاو.بووک بە بێدەنگی لە بەر ئاوێنە دانیشتبوو. مادام پینلوپ و مادام کراسو گئورگیس کە هێندێ مەست ببوون و کەیفیان خۆش بوو، خەریکی ئامادە کردنی جێژیانی بووکێ بوون و بە ئارە ئار گۆرانیان دەگوت.

لە خوارەوە لە ئاشپەزخانە دوو کابانی خۆشەویست، مادام کاترینا و کریسانتی خوشکی پاڵەوان پولیکسینگیس نان و شێویان ئامادە دەکرد. عەلیاغاش بە کەشەف و بۆشقاب و کێرد و چەنگاڵ و کەچکەوە کە لە دراوسێ بە ئەمانەتیان وەرگرتبوو، لە هاتو چۆ دابوو.

دیاماندیس کە لزتیانە کڵاوی لە سەر نابوو،هاتەژوور. بە مرچ و مۆنی سڵاوێکی کرد و

چاونکی به مالی شپرزه و بلأودا گێرا. لێوەکانی گەست و بە توورەیی زنجیری سەعاتەکەی راوەشاند. ئەو بەزمە بە کەیفی وی نەبوو. ئەو لەگەڵ خوشکی بێ ئەوەی حەوجێ بە مێردی بێ ژیانێکی خۆشی رادەبوارد. ئیدی چ پێویست بووکە چس‌گورگی لەعنەتی بەو چاویلکە گەورانەوە بێتە مەیدان و ببێتە سەرە کەر. بە هەنگاوی قورس و بە تەژمار لە پلیکانان چوە سەر.
مادام کراسوگئورگیس دەست بەجێ تێی گەیشت و بە سپایی پێی گوت:
لاو ! تۆزێ راوەستە، دەبینی بوک چی لێ دێ. ؟
کراسوگئورگیس باش دەیزانی کە تەنیا بۆ پێزێ سەعاتی کڕیوە، دەنا تێی ناگا. هاڤاڵەکانی چاروبار سەریان داوێشتە سەرو لێیان دە پرسی: « راستی دیاماندیس سەعات چەندە؟ ئەو توورە دەبوو، سەعاتەکەی لە گیرفانی دینا دەر و لە بەر چاوی رادەگرت و دەیگوت : « خۆت بزانە سەعات چەندە خۆ کوێر نی ؟. »
مادام کراسو گئورگیس کە لە نەشەی شەراب وەغیرەت کەوتبوو بەناز و عیشوە لێی پرسی:
- ئاغا دیاماندیس سەعات چەندە ؟
دیاماندیس کە لە توورەییان دە کوڵی، لە وەڵامدا گوتی: « ببەخشە، سەعاتەکەم نوستوە کار ناکا .!»
تاچاوی بە خوشکی کەوت کە دەیرازێننەوە، وەها لێوەکانی گەست کەم مابوو خوێنیان لێ دەر پەڕێ . لە دڵی خۆیدا گوتی: «خەریکن قوربانی دەرازێننەوە ...» پاشان رووی وەرگێرا و لە پلیکانان چوە خوارێ. بەڵام وانگلیو قورسایی چاولێکردنی براکەی لە سەر بەدەنی خۆی هەست پێکرد. تاوێ داوە. تا چاوی پێکەوت، چاوی پڕبوون لە ئاو.
مادام پینلوب گوتی:« کاتێکی بوکێ دەرازێننەوە ، پیاو هەقیان نیە وە ژوور کەون. »
دیاماندیس تۆکێکی لە سمێڵی هەڵکەند و هاویشتیە سەر چێ و بانەکە و لە کاتێکا بە تووڕەیی وەک گا هەناسەی هەڵدەکێشا و دەیویست لە پلیکانان بچێتە خوار، گوتی « هیوادارم بەختەوەر بێ !»

* * *

کاتی رۆژئاوا حیلەی ئەسپان و دەنگی لاقیان دەبیسرا. زۆری نە خایاند ئەو کۆڵانە تەنگە پڕ بوو لە سوار. سیفاکاسی پیر و هاو سەفەرەکانی گەیشتنێ. دەرکاچوار تاق کرانەوە. بۆنی نارەقەی پیاوان و پەنیر وگۆشتی سوورەوە کراو ماڵی پڕکرد. بابەگەورە وانگلیوی داردەمکانەی وەک ئیسک و پیستی لە ئامێز گرت و ماچی کرد. بە دوای ئەودا تەواوی خێزانی بنەماڵە بە سەر بوکێ وەر بوون و بە نارەقەی رنگا و ئاوی زاریان بووکیان تەرکرد. کەمی مابوو بەو هەناسانە کە بۆ تەگەیان لێ دەهات بیخنکێنن. ریش و سمێڵی زوور رووەتی بوکێیان سووتاند و خوێنی تێ‌گەڕا بوو. وای لێ هات بە ناچاری بچێتەوە وەتاغی سەرێ و سوور وسپیاوەکەی تازە کاتەوە.
لە ژووری دانیشتن بۆ هەموو میواتانجێگا نەبوو. هێندێ لە ژنەکان لە وەتاغ وهێندێکیش لە ئاشپەزخانە بەستەی دیاریەکانیان دە کردنەوە. زۆر لە پیاوەکان چوونە حەسار و لە بەر هەڵاو بگر ماڵەکە دەلەرزی.

پاڵەوان پولیکسینگیس کە دەهات و دەچوو. سڵاوی لە میوانان دەکرد، گوتی :
- منداڵینە چ باسە ؟ مەیکەنە هەرا، هاوار مەکەن، ئێرە گوند نیە، شارە !
مانوساکاس گوتی: « کەس هەرا ناکا پاڵەوان ، ئەوان قسان دەکەن !»
چس‌گورگ و ئیدومنەی ئاوالْ زاوا توانیبوویان خۆیان لە شەڕی سڵاو و بە خێر هێنان وماچ وموچ بدزنەوە وچووبوون لە قوژبنێک کز هەڵاتبوون قسەیان دەکرد. چس‌گورگ بە گەرمی باسی داب و شرینی ژن گوێستنەوەی زەمانی قەدیمی دەکرد کە هێشتا لە نێو خەڵکدا باو بوو. ڕەگەزی یونانی ڕەگەزێکی ئەبەدیە. چس‌گورگ لەبەر ئەوە شاد نەبوو کە ژن دێنێ، کەیف خۆشی لەوەدابوو کە بە دابی کۆن ژن دەگوێزێتەوە. ئیدومنەش بۆی باس دەکرد کە تازە ئاخرین نامەی کاریگەری خۆی بۆ مەلەکەی ئینگلستان نووسیوە و بێگومان وەڵامێکی باش وەر دەگرێتەوە. دەیگوت : «هاوڕێ ! هیوادارم ژنهێنانی تۆ بۆ هەموومان بەختەوەری بە دواوە بێ.»
پاڵەوان میکێلس بە ڕوویێکی گرژ هاتە ژوور و کڵاوی لە سەری هەڵگرت و دەستی باوکی ماچ کردو براو برازاکانی لە حەساریدا بڵاو ببوون، دەستی هەموانی کوشی. بێ ئەوەی لوتی دە لای پاڵەوان پولیکسینگیس بێچووله پەناسیفاکاسی باوکی لەسەر نیو تەختێک دانیشت .سیفاکاسی پیر سەری بۆ لای ئەو خوار کرد و گوتی :
- میکێلس بووک هێندێ لاوازە !
- بۆ زاوا باشە لێی دێ !
پیرە مێرد سەری ڕاوەشاند و بزەیەکی هاتێ و گوتی : « ئەو نانە بەو دزیە،..»
قەشە مانولی بەو عەباو گیر فانی زەلامەوە ، جاش قەشە بە سمێلی وەک مووی بەرازی و مورتزوفلوس بە مجری زنوەوە پەیدا بوون. خەڵک لە بەریان هەستا. بووک لە پلیکان هاتەخوار. ئیلومنە چوە پێش و دەستی گرت.
مورتزوفلوس مجری پڕکرد لە پۆلوی ئاگر و دوعای ڕێو ڕەسمی بووکێ دەست پێکرا. وانگلیو سەری بەرداببۆوە. ئەو قەومی وەحشی هەموویان بە سەر ورووی توکناوی و ڕیش و سمێلی نەتاشراو دەوروبانی داببوو تەماشایان دەکرد. ئەو ژنە بەو لەشی لاوازو ڕەقەڵە دەبوو بە ئەندامێکی‌ئەو بنەماڵە و خوێنی لە گەڵ خوێنی ئەوان تێکەڵ دەبوو. داخوا ئەم پێوە لکانە ئاکامێکی دەبوو.؟ ئەفرادی ئەم تایفەیە هەموویان شوان و جوتیار بوون و شارەزاییان لەم کارانەدا هەبوو. واتە دەیانزانی کام مەر وبەران و یا گاو مانگا هەڵبژێرن کە بەرخ وگوێلەکەی ساخ و باشیان لێ پاشە گەوت بێ و ئاژەڵی پێ زیادبکا. ژنەکانیش لە کاری مامر و کەڵەشێر و کەروێشک شارەزا بوون، بە نیگەرانی تەماشای بوکێیان دەکرد. یەک دەیگوت :
- بووک زۆر لاوازە، هەر مەمکی نیە، شیریشی نابێ. یەکیتر دەیگوت : مەترسێ،شیر پەیدا دەکا، لە بیرت نیە پارەکە بزنەکەی من چۆن بوو؟ حەیوان هەر ئێسک و پێست بوو. تەنانەت گوانی هەر دیار نەبوون. لەگەڵ ئەوەش کاتێ ئاوس بوو، کاریلەی دی، ئەگەر بڵێم هەموو جارێ بوتلێکی شیر دەدا، باوەڕ ناکەی.... سێیەمیان دەیگوت :
خەمێ مەخۆن، پان و بۆردەبێ‌وجێگای منداڵیشی دەبێتەوە. کچ دوای‌مێرد کردن پان و پۆر دەبێ.

ژنەکان سرت و خورتیان بوو. قەشە مانولی دوعای دەکرد.، تەشریفات تەواو ببوو. کاتێک ئاواڵ زاوا تاجی بوکو زاوای پێک گۆڕیەوە، بە جارێکی ژن بە سەریان وەر بوون و ئاواتیان بۆ دەخواستن کە پێکەوە پیر بن ومندالی جوانیان لێ پاشەکەوت بێ. پاشان چوونە سەرسفرەو مەلاشو کەوتنە کار. چسگورگ ئیتر هیچی وە بیر نەدەهاتەوە. تەمێکی تایبەتی هۆش و بیری داپۆشیبوو. وای لێهاتبوو بێجگە لە دەو چاو ودەنگ هیچی دیکەی لێک نەدەکردەوە .دەیبینی کە وا باوکی لە سەر نیو تەختێک دانیشتوە. کودەڵە بەرازێکی سورکراوەی لە سەر رانی داناوە. پاڵەوان میکێلس لە لای راستەو پاڵەوان پولیکسینگیس لە لا چەپەی داتیشتوون. دیاماندیسی ژن برای بێ ئەوەی سلاو لە کەس بکا هاتە ژوور. شەو کلاوی تا سەر بڕۆیان هێنابوە خوار. چوو لە ئاشپەز خانە دەستیکرد بە خواردنەوەو جنێو دان. پاڵەوان پولیکسینگیس رابوو بەدوایدا، خۆی گەیاندێ. پاش ئاوێک دەنگی هەرا هەرار شکانی قاپ و قاچاخان بەرز بۆوە .

پاڵەوان میکێلس لە ڕقان دانی لێک دەدان. ئەویش دەیویست لێی راست بێتەوە، لە کاتێکا لە تورەییان دەکولی لە جێی خۆی نەبزوت. ڕینیوی کچی شەربەتێکی ئاڵوباڵوی زۆر فێنکی بۆ هێنا، پاڵەوان شەربەتی خواردەوە، تۆزێ هاتەوە سەر خۆ. پاشان بە خۆشەویستی تەماشای کچە جوانەکەی کرد و سەروروی گرژ و رق هەستاوی تەختێ هێندێ بۆوە. لە دلی خۆیدا گوتی : ئەو کیژەی لە جێگایەک دیوە، دەبێ کیژی کێ بێ؟ چەندە باش خزمەت دەکا ئاو وشەراب و خواردن و سیغاری بۆ دێنێ، بێ ئەوەی داوای لێ بکا. چاوێکی لە ژنەکەي کرد کە کەبابی لە میوانان بەشدەکرد، ڕینیوی پێ نیشاندا و پرسی :

– ئەم کیژە خۆشەویستە کێیە ؟ وابزانم لە جێگایەک دیتومە، بەلام نازانم لە کوێ ؟

مادام کاترینا هەناسێکی هەڵکێشا و گوتی:« ئەوە کیژی خۆتە ».پاڵەوان میکێلس سەری بەرداوە و بێدەنگ بوو .

پاڵەوان پولیکسینگیس بە تورەیی لە ئاشپەزخانە گەڕاوە. هەموو چاویان تێبڕیبوو. توانی خۆی ئارامتر نیشان بدا . بزەیەکی هاتێ و گوتی :« دیاماندیس سەر خۆشە و داوای لێ بووردن دەکا .!»

پاشان چوولە نیزیک پاڵەوانمیکێلسدانیشت .دەتگوتدەیەوێ دلێ ئەو رابکێشێ.و وابکاکە پاڵەوان ئاکاری ناحەزی خوارزای لە بیر بەرێتەوە.پاڵەوان بەراز لە تورەییان گونە لوتی لێ فش بوون. برادەرەکەی بۆنی عەتری لێ دەهات. پاڵەوان میکێلس لێی دوور کەوت. بەلام پاڵەوان پولیکسینگیس دەیویست هەر چۆ نێک بێ رامی بکات. ئەو باش دەیزانی کە وا دەمێکە پاڵەوان میکێلس خۆی لێ لادەدا، بەلام نەیدەزانی بۆ چی.؟ چی کردوە ؟ شەرابێکی زۆری خواردە وە و گرێی دلی بۆ کردەوە و گوتی:

– پاڵەوان میکێلس بۆ چی لە من لالوتی ؟ من چم کردوە ؟

– پولیکسینگیس ، باش نیە مرۆڤ باسی هەموو شتێک بکا ...

پاڵەوان پولیکسینگیس دووبارە پرسی :

– دەمەوێ بزانم چم لە تۆ کردوە ؟

لە وەلام دا گوتی : « تۆ،بۆنی تورکت لێ دێ ...»»

پاڵەوان پولیکسینگیس سوور هەڵگەڕا، گوتی : « بۆچما تۆش بۆنت کردوە؟»

لە پڕ پاڵەوان میکێلس دە چاوەکانی پولیکسینگیس راما و حاڵەتێکی بەسەرداهات، دەتگوت دیق دەکاو دەیەوێ بخنکێ. دەستی درێژ کرد و خەریکبوو کورسیەکەی لە پەنای بوو بیشکێنێ. لە بن لێوانەوە گوتی:

- بەڵێ بۆنم کردوە ... پاش تاوێک بێدەنگی گوتی:

- تۆ شەرم ناکەی ؟... ئەویش لە گەڵ تورکێک..؟

پاڵەوان پولیکسینگیس ویستی دڵنیای بکا، گوتی: « ئەو بەو زوانە دەبێتە مەسیحی ...»

پاڵەوان میکێلس وەها راپەڕی ماڵەکەی لەرزاند. لە کاتێکا بۆ لای حەساریێ دەچوو تا هەوای تازە هەڵمژێ، گوتی:

باشتر بوو تۆ بیای بە تورک و نیعمەت لە شەری خۆت ئاسودە کرد با.

بەیان نیزیک دەبۆوە. گوندییەکان هێشتا دەیانخوارد و دەیانخواردەوە. ئەوانەی کە سەر خۆشتر بوون، دەستیان کرد بە گۆرانی. یەک لەوان توزەڵەی لە خورجینێ هێنا دەر و دەستی کرد بە لێدان. ئەوانیتر لە حەساریێ هەڵدەپەڕین. بوک و زاوا مات و بێدەنگ لە سەر نیو تەختێک دانیشتبوون هیچیان وازیان نەبوو بچنە ژووری بە گوڵ ئامادە کراو. سیفاکاسی پیر چاوی لە سەر یەک دانابوون. نە نوستبوو، گوێی دابوە گۆرانی و پێکەنینی منداڵان و نەوەکانی. وەک پیرە چنارێکی کۆن ساڵی لەژێر باران کە هەست بکا ئاو بە رەگ و ریشە و لقەکانیدا دەگەڕێ، شاد و کەیف خۆشبوو.

پاڵەوان میکێلس بە چاوی لێڵ و خەوالوو، بە مادام کاترینای گوت:

- با بڕۆینەوە ...!

* * *

بەیانی بەردا هەتاو شەبەقی خۆی بە سەر حەساری پڕ لە ئێسکی کروساوە ولەتکە نان وریش و سمێڵی دێوە خەولێ کەوتوەکاندا بڵاو کردەوە. ئەوێ رۆژی چوارشەمۆی پاک بوو.دوکان وبازار دەکرانەوە. وەستا کار بەرسینگەی خۆیان دەبەست.شەبەقی رۆژ دارە زەیتون و دەشت و سەحرای دەلاواندەوە و لە سەر خانوبەرەی کونستانیی نوری بەگ رادەوەستاو بە پەنجەرە تازە رەنگ کراوەکان پێدەکەنی. یاسەمەن گوڵی کرد بوو. چوار داعبای ئەفێن یان لە ئەسکەندەریەوە هێنا بوو، دوویان سەوز و دوانیشیان عابی گەردن زەردبوون. بێجگە لەوە ،نوری برایی ساز لێدەری بانگ کرد بوو کە رۆژەکانی هەینی بێ و ساز لێدا وگۆرانی بچرێ تا ئامینە دڵی تەنگ نەبێ. پازدە رۆژ بوو نوری بەگ نەچوبۆوە کاندی، هەر وەک باڵندەیەکی ئەڤیندار خەریکی دروست کردنی هێلانەیەک بوو کە هاوسەری خۆشە ویستی بێنێ و هاوینێ تێیدا وەحەسێن. لە ئەڤینی ئەودا سووتا بوو. دوو رۆژ بوو خەبەری دابویە کە ئیتر لە دووری ئەو خۆڕاناگرێ و دەبەوێ بە پەلە بێتە لای. بەڵام ئامینە عوزری هێنا بۆوە کە سگی پڕە وناتوانێ کەس بێتەلای. هەروەها گوتبووی:

- ماڵ هەمیشە داخراوە. تەنیا ئێواران حەمیدە مەلا دێو دەرمانی ژنانەی بۆ دێنێ. تۆ ئەگەر منت خۆش گەرەکە، دوای منداڵبوونم وەرەوە.

وادیار بوو ئەو خەمەی بەس نەبوو کە بە ناعیلاجی پازدە رۆژ لە خۆشەویستەکەی دوور بێ، خەمی دیکەی هاتبوە سەر کە : پاشا رۆژی پێشتر بە هێزی خولامی قولەرەشدا خەبەری دابویەکە بە جێ گەیاندنی بەڵێنەکەی زۆر وەدرەنگی کەوتوە. گوتبووی:« سوکایەتی بێ تۆڵە ماوەتەوە. لۆتیەکان زمانیان بۆ سکالاً درێژ کردوە. ئەو کارەی بریار وابوو بیکەی زوو ئەنجامی بدا.»

ئێستا زوو زوو باوکیشی دەهاتە خەوی ، قسەی لەگەڵ نەدەکرد. تەنیا بە پێی پەتی و بە جلی شڕو دڕاو، بە پەناپدا رادەبرد ئاوری وێ نەدەدا. بە هەڵکەوت ئەوێ رۆژێ بەیانی خاوخێزانی لەعنەتی قاتلی باوکی کە لە شایی دەگەڕانەوە بە پێش خانوبەرەی کوێستانیی ئەودا تێدەپەرین. نوری بەگ دەرگای توند داخست وبە دڵێکی پڕ لە کینەوە چوە وەتاغی سەرێ و لە پشت پەردەی پەنجەرەکان خۆی حاشاردا و تەماشای بابە گەورەی سەد ساڵەو توخم و تۆرەمەی دەکرد کە وەک لەشکر لە پشت سەری بە ریز وێستابوون.

مانوساکاس کاتێ گەیشتە بەر دەرکی نوری، ئەسپی ڕاگرت و دەمانچەیەکی تەقاند و هاواری کرد:

هۆی نوری بەگ ! ئەوە بە سلامەتی تۆیە

بەلام نوری لە پشتی پەنجەرە لێوی خۆی دەگەستو جوابی نەدەداوە. مانوساکاس رووی کردە کەس وکاری خۆی و گوتی:

- ئەو سەگە شکایەتی لە من کردوە کە کەرێکم بردۆتە مزگەوت تا نوێژێ بکا، دوو سبەی لە رۆژی جێژندا ئەگەر مالوسێکم نەبرد مانوساکاس نەبم .بوکنی چی دایان لە قاقای پێکەنین و لە هەورێکی تەپو تۆزدا بزر بوون.

تووری چاوەکانی پڕ بوون لە خوێن. لە پلیکانان هاتە خوار، جامێکی پڕ کرد لە شەراب و هاتە دەر تا لە بەر دەرگا بیخواتەوە و قینی بنیشێتەوە. بەلام لە ونش ڕانەوەستا،لە پێش خانوەکەی ئەو زەوی لە بەر سمی ئەسپ و ئێستری ئەو کاروانە لەعنەتیە قەڵشی تێکەوتبوو. چوە پێشەو لە نێوەڕاستی جادە راوەستا. بەولایەدا کە دوژمنەکان لە تەپ و تۆزدا ون ببوون. رووی کردە خۆر و لەوێ جامە ٔ ی خوار کردوە و چەند دڵۆ پە شەرابی رشت و لە بەر خۆیەوە گوتی:« خوێنی من وەک ئەو شەرابە برێژێتە سەو زەوی ئەگەر کارێکی ئێستا بریارم لە سەرداوە ئەنجامی نەدەم .»

سەری پاشەو شکێن کرد و جامەکەی بە سەریەوە ناو چۆری لێ بری. پاشان گەڕایەوە ماڵ و دەمانچەکانی لە دیواری کردەوەو فیشەکی تێنان و بۆ تاقیکردنەوە دووفیشەکی لە حەوا تەقاند. پاشان خەنجەری درێژ و دوو دمی لە کالانێ هێنا دەر ولە باسکی تاقیکردەوە، وەک گوێزانی سەرتاش تیژ بوو. تەواوی رۆژ لە حەسارێ دەهات و دەچوو. جارو بار دەچوە کۆلان و تەماشای شوێنی ئەسپ و ئێسترانی دەکرد، دووبارە بە توورەیی دەهاتەوە ژوورێ. شەو بە سەرداهات. کەروێشکێکی کوشتەوەو بە ئێشتیای خۆی لێی نا. تا توانی خواردی. پاشان باخەڵێک گوڵی یاسەمەنی لێکردەوە. هاوێشتیە نێو لێفەو دۆشەگ و لێی نوست. وردە وردە خەوی بەسەرداهات و خەوی لێکەوت. بۆ هەوەڵجار خەوێکی خۆشی کرد و باوکیشی نەهاتە خەوی. بەیانی زوو سوک و بە کەیف لەجێ هاتە دەر، فیتوی لێدەدا. کەڵە شێریش لە حەسارێ وەخەبەر هاتبوون. هەموویان وەسەر کۆی پشکەلان پەریبوون و بە چیکڵدانی هەڵمساو سلاویان لە رۆژێ دەکرد. ئاسمان

بروسکی دەداو لە گەڵای داران دڵۆپەی نوور دەرژان. حەوز و فوارەی حەساریٚ وەک مریشکی هێلکە کردوو قرتە قرتی بوو. ئەسپەکەیان کە تازە لە تەویلە دەر کێشا بوو، وەک چاوی بە ماین کەوتبێ دەیحیلاند و گەرم داهاتبوو. بە نۆکەرەکەی گوت : بە ئاوی شیرەوتین ئەسپەکەی بشوا و خوشی ستڵێکی ئاو بۆ هێنا. ئاخورەکەی پر کرد لە تفاق و چۆوە حەساریٚ.(کارتونیس) پیرە سەگەکەی وەک تولە سەگێکی پچوک بە کلکە سووتە لە بەو لاقانیدا دەوەرِی و دە تلایەوە. نوری چۆوە ژوور و بە چێشتکەرە پیرەی گوت : هێندیٚ خواردەمەنی و بوتڵێک ئارەق ئامادە بکە. بەلام دەبیٚ زۆر زوو پێش ئەوەی خۆر رەبێک بلیندبیٚحازر بن چونکە دەبەویٚ سەفەربکا. پیرێژن پرسی:دەچیەکاندی دەتەویٚ خانم بێنیبەوە ؟

نوری جوابی نەداوەو چوە وەتاغی سەریٚ. سمێلی بە خەنە رەنگ کرد، قۆزترین جلی کردە بەر، عەتری دە خۆداو دەمانچەی لە خۆ بەست. خەنجەری دەبەر پشتیٚ راکرد، هاتەوە حەسار و لە بەر دەرکیٚ راوەستا. ئێستا ئەویش هەر بریقەی دەهات.

پیرە تورکێک تورەکە بە شانیەوە بەوێدا تێدەپەری. ئەوە مستەفا بابا بوو کە گیاو گوڵی دوکتوری و دەرمانی لە چیا کۆ دەکردەوەو دە یکردنە مەڵحەم و برینی پیٚ دەرمان دەکردن. ئەو تەنانەت زەردوویی و بای سووریشی دەرمان دەکرد. بە گوندەکانی تورک و یونانیاندا دەگەرِا هاواری دەکرد :

– ئەی حەکیم باشی، دەرمانی باش ،تەمەنی درێژ! هەر کەسەش بە گوێزەی دەرد و نە خۆشی، دەرمانی دەدایە. ئەو کابرایەکی دڵپاک بوو، ئەوەندی بۆی کرابا نەخۆشی تیمار دەکردن و هیچیشی نەدەستاند. بە نان و ئاو دەژیا. کە چاوی بە نوری کەوت راوەستاو بە جورێکی سەیر تێی راما، نوري بەگ پشت ملی سەگەکەي گرتبوو تا ئامبازی نەبیٚ. گوتی:

– چیە مستەفا بابا بۆ را تەماشام دەکەی؟

پیرە مێرد سەري دانواند و بە ئافەرینەوە گوتی: « نووری بەگ ئەمرۆ زۆرجوان بووی!» بە دەنگێکی سەیریش لێی زیادکرد:

– لەوە جوانتر نابی !

نوری قاقا پێکەنی . پیرە مێرد دیسان گوتی :« نوری بەگ پیٚ مەکەنە، مرۆڤ رادە و سنوورێکی هەیە.تێپەر بوون لەو سنورە گوناحە »

– یانی گوناحە کە مرۆڤ زۆر باش و زۆر جوان و زۆر پاک بیٚ؟

پیر هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی : بەڵیٚ گوناحە !

بۆ چی مستەفا بابا، بۆچی من تێناگەم ؟

– کورِم من خۆشم تێناگەم، نازانم ..ئەوە یاسای خوایە . لە بیرت نەچیٚ نوری بەگ! پیرە مێرد دەستێکی بۆ سینگ و لێو وتێو چاوانی برد و گوتی: ئیشەلاٚ بە خۆشی نوری بە گ ...چەند هەنگاوێک رۆی، راوەستا. نوری لە بنەوە چاوێکی لێکرد و بۆەی هاتیٚ و گوتی :

چیە مستەفا بابا، شتێکت گەرەکە ؟ ئەگەر برسیتە بچۆ ژووری تا سفرەت بۆ راخەن.نانت بۆ دانێن .

– ببوورە نوری بەگ، برسی نیم ... تەنیا ..

- تەنیا چی ؟ روونتر قسە بکە .. مستەفا بابا ..!
- دەمویست تەنیا شتێکت پێ بڵێم، بەڵام دە ترسم پێم پێ بکەنی .
- تۆ مرۆڤێکی پیرۆزی، من بەتۆ پێناکەنم ، قسەکەت بکە .
هێندێ دووکەڵ لە دەو چاوت بدە . لیباسی ئاسایی ڕۆژانەت لەبەرکە ئەگەر هەتە چەکمەی پینە کراو دەپێکە .دەمانچەی زێویش لەولا دابنێ، هێندە خۆت جوان مەکە.
نوری دای لە قاقای پێکەنین .دەو چاوی باریک و خۆشەویستی پیرە تورک تێک چرژان . بە پشتی کوڕ دوور کەوتەوەو لە بەر خۆیەوە گوتی : « بۆ خاتری خوا پێمەکەنە نوری بەگ !
دوو ژنی جوانی مەسیحی بە سواری گوێدرێژێ بە وێدا تێدەپەڕین. لەو کاتەدا نوری لە بەردەرگا قاقا پێدەکەنی. ژنەکان بە تاسەوە چاویان لێکرد، پاشان سەریان بەرداوەو ڕێگایان درێژە پێدا .کاتی دوور کەوتنەوە یەکیان گوتی:
- ئەو سەگە چەند جوان بوو !
ئەوی دیکە هەناسێکی هەڵکێشا وگوتی:«تاریفی‌تۆیەو بزۆکەوانیەتەوە بۆئەو بەدبەختی دێنێ.» ئەوی تریان گوتی :« لەشی ئەو سەگە کەلاکێکی باش دەبێ !» پاشان هەر دووکیان بێدەنگ بوون .
نوری بەگی سەر خۆش لە فیز و لوت بەرزی چووە ژوورێ. ئەسپەکەی لە حەساریێ هەر بریقەی دەهات. کلفەتی پیر خەریکبوو خورجێنی پڕ لە خواردەمەنی و ئارەقی لە پاشتەرکی دەبەست. نووری چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد، خانوو لە بەر تازەیی و خۆشی دەدرەوشا. داربادام و زەیتون و هەنار بەریان گرتبوو، دارهەنجیرەکەڵای سەوزی پان واکرد بوو. چوار توتی پچکۆلە لە قەفەسی خۆیاندا دنوکیان لێک دەدا. هەوا ساف و ئارام بوو.
نوری تاوێک وەشک‌کەوت .دەیویست بچێتە کوێ؟ ئەو هەموو نیعمەتی خودای بۆ بە جێ دەهێشت .؟ ئەو هەموو سەروەت و سامانە بۆ بەجێ دێڵێ؟ خانوی گوێستانی ئەو بەهەشتێک بوو، لەوێ لە هیچی کەم نەبوو. بەو زوانە ژنەکەشی دڵی نەرم دەبوو، ئاشت دەبوونەوە. دەهاتەوە حەساریش جارێکی دیکە پڕ دەبۆوە لە پێکەنینی وەک مرواری. هەنارەکان گەورە دەبوون. هەنجیر وەک هەنگوین شیرین دەبوون. توتیەکان هێلکەی وەک فندقیان دەکرد. جوجکەی زەرد و سەوزیان هەڵدێنا.
هەناسێکی هەڵکێشا. قەرەواشی پیر تەماشای خودانی خۆیکرد. ئەو نوری بەگی گەورە کرد بوو.نوری ڕۆژ بە ڕۆژ لە ئامێزی ئەودا هەڵیدابوو.گەورە ببوو.ئەو قەت مێردی نەکرد بوو، لەم بارەوە پەشیمانیش نە ببۆوە . نوری بۆ ئەو هەم مێرد بوو، هەم کوڕ بوو، هەم خودان بوو. نووری تاقە خۆشی ئەو بوو.بەڵام ئەوێ ڕۆژێ بەیانی هەستی بە نیگەرانیەک کرد بوو. جارێکی دیکەش لێی پرسی : « خودان بۆ کوێ دەچی ؟»
نوری ئاوری لێ داوەو گوتی : « دایە ئەو ڕۆ چت لێقەوماوە، هەر وا دەپرسی ؟ »
پێی دەرکێفێ ناو سوار بوو. پیرێژن دەستە چرچەکانی بە سینگی ئەسپەکەی داهێنا و لە کاتێکا دەلەرزی بە ئەسپایی گوتی - دەچیە کوێ ئەرباب .؟ نوری لە وەلام دا گوتی : ئاگات لە ماڵێ بێ . ڕکێفی لە ئەسپی‌دا ...پیرێژن کە لە نێو لق و پۆپی دارە کان دا لە پێش چاوی بزر

دەبوو گوتی :

- خوا بتپارێزێ ڕۆڵە ! لین ئەوکی گرتبوو، ویستی خۆی دڵخۆشی بداتەوە، بە دەنگی بەرز گوتی :

- ئاخ ... ئەو ئاوی حەیاتی خواردۆتەوە.. هیچی بەسەر نایە.!...دەرگای داخست

* * *

مانوساکاس دوای تێپەڕاندنی ڕۆژەکانی جەژنی پاک، چوو بۆوە هۆڵی مەڕەکانی لە بناری چیای سلتا. وردە وردە هەوا گەرم داهاتبوو، دەبوایە مەڕەکان ببڕنەوە. بازاڕێکی خۆش لە چیاکان دانرابوو، شوانەکان برینگیان دەست دابوویە و مەڕیان دەبڕیەوە و گەمەیان دەکرد. هەموو ژنەکانیان لەگەڵ خۆ هێنا بوو تا بۆ شوشتنی خوریەکان ئاوێ بکێشن.

کوڕو شوانەکانی مانوساکاس قولکەییکیان هەلکەندبوو، بەرخێکیان گرفت بوو، و گۆشتەکەیان دەکەوڵی بەرخەکە خستبوو نێو قولکە و خۆڵەمێشی گەرمیان بەسەردا کردبوو، چاوە ڕوان بوون ببێتە کەباب و بەو هیوایە لە دەوری قولکە هەلتوتەکابوون.

مانوساکاس سەری بەرانێکی خستبوە نێو ڕانی و بە برینک خوریەچەوور بە پشتەکەی هەڵدەپاچی. بیست مەری براوە و بیستی نەبراوە لەم لاولای ئەو راوەستا بوون. هێندی خوری لەبەر دەمی ئەو کۆ کرابوونەوە، بۆنێکی توندیان لێ دەهات. مانوساکاس بە کەیف بوو، نارەناری بوو گۆرانی دەگوت. شنە بایەکی فێنک لە چیاوە دەهات. سالێکی خۆش بوو، مەڕو ماڵات زەو زوری باشیان هەبوو. لە نیزیک هۆڵ لە ئاورگێکی بەردیدا، دوو کوڕی گەورەی ئەو تئودوریس و باناکوس، لە تەشتی مسی گەورەدا، پەنیریان دەکرد.

سوپاس بۆ خودا، لەو خوارانە، لە گوندی سێ ژان مەزراو باغات لەو ساڵەدا بەرو بوبەکی باشیان هەبوو. ماینەکەشی جوانوبەکی مێی دەبوو.

مانو ساکاس ئاوێک دەستی لە مەر برینەوە هەڵگرت. سەیرێکی دەشت و مەزاری کردو گوتی :

- زەوی ڕاست وەک کەروێشکی مێ وایە و هەروا دەزێ و دەزێ و هیچ کاری دیکە ناکات. ولاخەکانیش دەزێن، دارەکانیش دەزێن و ژنەکانیش... هۆی کریستینا! باشبوو ئیستیکانە ئارەقێکت دابامێ تا گەرووم تەر کەم...!

کریستینای ژنی لە ژووری ئاگری خۆش دەکرد، هەر چەند هێشتا ساخ و بە خۆوە بوو، بەلام نیتر سکی نەدەکردن و منداڵی نەدەبوون. لەبەرئەوە خوای لۆمە دەکرد و دەیگوت :

- ئەم کارخانەیە نەدەبوایە تا تەمەنی حەفتا ساڵی لە کار بکەوێ. دەبوایە هەموو ژن بتوانن لانی کەم بە دوو دەستە منداڵ دڵی خۆیان بحەسێننەوە. دوو دەستە منداڵ یانی بیست کوڕو چوار کچ... ئەو ڕۆژە هەرەلین نەوەیان هاتە سەر دنیا، هەستیان بە نەساخیەک کردبایە. خاچیان کێشابا و مردبان.. هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی :

- ئاخ خودای من، ئەگەر ئەو ڕۆژەی دنیات دروست دەکرد، من لە لات بام، تۆم لە هێندی نهێنی ژنان ئاگادار دەکرد، کە تەنیا ئێمە دەیزانین. لەو کاتەدا دەنگی مێردەکەی بیست کە

بانگی دەکا. لە وەلامدا گوتی:
- بە چاوان مانوساکاس. ناتەوێ شتێکی لەگەڵ بخۆی؟ جەرگی بەرخیم بۆ ساز کردووی .
- کەوابە، ئەویش بێنە!
لەو کاتەدا کە مانوساکاس خەریکی خواردن و خواردنەوە و تەماشای مەزرا بوو، دەنگی سمی ئەسپێکی بیست کە چوار ناڵ دێ و بەرد لە بەر پێیانی دەردەپەڕن و دەنگیان دێ. مانوساکاس گوتی:
- لەعنەت لە شەیتان: دەبێ کێ بێ بە سواری لەم چیایە بێتە سەر؟ بە زاری پڕەوە راست بۆوە تا بە سەردیواری ئاغەڵدا تەماشای بکا. دەستی بە بەر چاویەوە گرت بەڵام لە بەر تیشکی رۆژی بێجگە لە ئەسپێکی رەش کە بەردی لە بەر پێیان دەردەپەڕین، هیچی دیکەی بۆ روون نەبۆوە. لەبەر خۆیەوە گوتی: بە هەڵە نەچوویم نووری بەگی سەگە!
لە جێ راست بۆوە و بۆلای دەرگا رۆیشت و لە دڵی خۆیدا گوتی: «بێگومان وەدوای من کەوتووە».
مانوساکاس چوە نێو ئاغەڵ خورجینێک بە دیوارەوە هەڵواسرابوو، دەستی دایەو لەو کاتەدا کە ژنەکەی خەریکی ئاگر خۆشکردن بوو، نەی دەدیت، خەنجەریکی لە خورجین هێنا دەرو دەبەر پشتی چەقاند. پاشان دەستی دا گۆچانی شوانی کە لە دار بەروو دا هاتبوو، لەبەر دەرگا چاوە رووان راوەستا. ئێستا سوار لە دار بەروە گەورە و بە لق و پۆ پەکە تێ پەڕیبوو ئەو جارە مانوساکاس دم و چاوی بزرکاو سمێلی رەنگ کراوی نووری باش دەدیت. مێزەرێکی سپی لەسەرو دەمانچە زیوەکەی لەبەر شەبەقی رۆژ دەدرەوشا. لەبەر خۆیەوە گوتی:«ئەو سەگە وەدوای من کەوتوە، بێ تا حالی بکەم». هەر لەوێوە بانگی کرد:
- هۆی کریستیانا. سفرەی داخە، میوانمان هات.
دەنگی ژنەکەی جوریکی سەیر بیست کە دەی پرسی:
- میوان کێیە؟
- شەیتان! گوتم سفرە راخە!
لە پێش دەرگا دوور کەوتەوە و بۆلای سوار رۆیشت. نووری دیتی و دەستی بۆ راوەشاند و بە دەنگێکی وەک گاڵتە گوتی:
- سڵاو پاڵەوان مانوساکاس!
- سڵاو پاڵەوان نووری بەگ! وا بە پەلە بۆ کوێ؟
- بۆ ئاغەڵی پاڵەوان مانوساکاس. تۆ دەیناسی؟ ددانی سپی دەچوون و گۆشتی ژێر چەنەی دەلەرزی.
مانوساکاس لە کاتێکا چاوی سوور هەڵگەرا بوون توانی خۆ رابگرێ. هەولیدا کە پێبکەنێ. بەڵام تەنیا لێوی سەرەوە کراوە و ددانی وەدەر کەوتن و گوتی:
- کێیە کە باسی قارەمانەتی ئەوی نەبیستبێ؟ گۆیا هەر لەو دوو سێ رۆژی رابردوودا بوو کە توانیبووی کەرێک لە کۆڵ کا و بیباتە مزگەوت و تا نوێژی بکات».
- بەلێ، قەلە رەشێک ئەو خەبەرەی بۆ من هێنا بوو، ئێستا هاتووم تا ئەو پشتە بە قەوەتە

ببینم که توانیبوایە کەرێک هەڵبگری.
- نووری بەگ تۆ ئەوەی لە مێشکت بەرە دەر. قەت ناتوانی پشتی من ببینی.مانوساکاس هیچ کاتێ پشتی خۆی بە کەس نیشان نادا.
- ئەگەر مەجبووری بکەن چی؟ ئەو دەم لام وایە قوونیشی نیشان دەدا!
پاش ئەو قسانە نووری بەگ پێکەنی و سەرە قامچیەکی گەیاندە گوێچکەی ئەسپەکەی. ئەسپ دەرپەری و لەمانوساکاس وەنیزیک کەوت.
مانوساکاس لە جیٚی خۆی نەبزووت. خوێن لە رەگەکانی دەجوولاوە. دیسان خۆی راگرت. نووری بەگ هاتبوە ماڵی ئەو، دەبوایە لە سەر خۆ بێ و سەبر بگرێ. بە بێ ئەوە کە بچێتە پێش، مستەکانی کردە گرێ، بەڵام نەیتوانی پێشی زمانی خۆی بگرێ. بە دەنگی گیراو گوتی:
- لە بیرت نەچێ نووری بەگ، تا ئێستا نەبوە، سەگێک من بگرێ و هار نەبێ.
کابرای تورک لە ولامدا گوتی:
- منیش داعبایەکی درندەم، بەڵام باسی خۆ ناکەم و دەم ناکەمەوە.
مانوساکاس باسکەکانی لێک کردەوە و گوتی:
- باشە، کەوابوو چی؟ بۆ هاتوویە ئێرە و چت دەوێ؟
نووری بەگ بێ ئەوە قسە بکا، سمێڵەکانی خۆی گەست، مانوساکاس بێدەنگ بوو. لە سەر بەردێک راوەستا بوو، تەماشای وی دەکرد. بەڵام دڵی هەر دووکیان وەهای لێ دەدا، خەریکبوون دەرپەرن. ئاخرەکەی نووری بەگ وەدەنگ هات. نەرم و لەسەر خۆ دەستی پێکرد. دەتگوت هەموو وشەکانی خۆی هەڵدەسەنگێنێ، گوتی:
- مانوساکاس تۆ سووکایەتیەکی گەورەت بە ئێمە کردوە. ئەویش تاوانی هەیە.
- من ئەوەی ویستوومە کردوومە. ئێستا تۆڵە ئەستێنی گەورە کێیە، با بێ تا تاوانی بدەمەوە.
- ئەو تۆڵە هەستێنە ئەوەتا لێرەیە.
- ئەتۆی؟
- بەڵێ منم. هەر ئەو دەوڵەتی عوسمانی کە تۆ سووکایەتیت پێ کردووە، منی ناردووە. باوکم کە بە دەستی تایفەی تۆ کوژراوە، منی ناردوە. بەڵێ، مانوساکاس، من لەگەڵ تۆ حیسابی زۆرم هەیە دەبێ پاکیان بکەم. هەر دوێنێ بوو کە براکەت بە سواری وەنێو قاوەخانەی تورکان کەوت و ریش سپیەکانی وەدەرنا. کاندی هاواریەتی و دادی گەرەکە. من ناتوانم لە پاڵەوان میکێلس بدەم، چونکە ئەو برای هاوپەیمانی منە. ناچار ئەشێ لە تۆ بدەم.
مانوساکاس لە پشتەوە دەستی بۆ خەنجەرەکەی برد و گوتی:
- وەرە با لێرە دوور کەوینەوە، نابێ خێزانم گوێی لە قسەکانمان بێ، کورەکانم کە وا لە عەمباری‌خەریکی ماست و پەنیرن، نابێ بزانن.
نووری لە ئەسپ دابەزی. لە پیاوەتی بەدوور بوو، دوژمن پیادەو ئەو سوار بێ. جڵەوی ئەسپەکەی گرت و گوتی:
- بابڕۆین!

هەر دووکیان کەوتنە ڕێ و ئەسپەکە بە دوایان‌دا و لە نیگەرانیان دەی حیلاند و بەرد لە بەر پێ‌یانی حلۆر دەبوونەوە.

ڕۆژ لەسەر چیای وشک و رووتەن لە جوولەدا بوو. کوڕو شوانی مانوساکاس برخی برژاویان لە بن خۆڵەمێش هێنا بوە دەر و لە دەوری ئەو خواردنە خۆشە هێندێ وەک تورکان چوار مێردەکی و هێندی لە سەر سک ڕاکشا بوون و شەویلاکیان لێ وەکار خستبوو. تومقمەی شەراب بە قوڵتە قوڵت زار بە زار دەگەڕا. لەسەر چیا باڵدارێک نەدەفڕی و گیان لەبەر نەدەجوڵاوە. مەڕەکان کە بە برانەوە سووکبار ببوون، لە بەر گەرمایە چوو بوونە بەر سێبەری دار وەرکەوتبوون، زمانیان دەرکێشابوو، لە تەنیشت ئەوان سەگەکانی مێگەل لە سێبەردا وەر کەوتبوون و بە سەر سوورمانەوە سەیری مەڕەکانیان دەکرد کە برابوونەوە. ڕەنگە وایان زانیبێ کە ئەو مەڕانە گروێ بوون.

مانوساکاس و نووری بەگ لە نیزیک دار بەرویەکی گەورە ڕاوەستان و تەماشایەکی ئەولا و لای دارەکەیان کرد و هەر دوو گوتیان:

- ئێرە جێگایەکی خەراپ نیەو پان و بەرینی تەواوە، نووری بەگ کەمێک خوارتر ئەسپەکەی بەستەوە تا زۆرانی ئەوان نەبینێ. لەو کاتەدا مانوساکاس مەیدانەکەی لە ورتکە بەرد و چرووچیلکە خاوێن کردەوە. نووری بەگ گەڕاوە و کارەکەی وی پەسند کرد و گوتی:

- کارێکی فرە خاست کردوە. ئێستا جێگا تەواوە.

مانوساکاس وتەکەی دوو پات کردەوە و گوتی:

- بەڵێ، جێگا بەش دەکا. ئەگەر بمانەوێ دەتوانین لەم مەیدانە هەم جێژن بکەین، هەم تا مردن بەشەڕێین. تۆ چ ئێژی پاڵەوان نووری؟

نووری بە کاوە خۆ گوتی:

- من پێم باشە تا مردن شەر بکەین. بەڵێ، مانوساکاس، شەرافەت وا هەڵدەگرێ کە تا گیانمان لەبەر دایە شەر بکەین.

- هەر دوو لادەکرێن.

- من وام پێ باشە تا مردن بەشەڕێین.

- چۆنت گەرەکە. ئەوەی گوت، پشتێندی توند کردو باسکی هەڵماڵین.

نووریش پێچەکەی سەری توند بەست و دەمانچەکانی لەخۆ کردەوە، یەکیان بە لقە دارێکەوە هەڵاوەسی و یەکیشی بە دەستەوە گرت. مانوساکاس تەماشای دەکرد و گوتی:

- ئەوی دیکەش هەر هەڵاوەسە. ئەو دەمانچەی تۆم خۆش دەوێ. ئەگەر تۆم کوشت، بە یادگار هەڵیان دەگرم.

نووری دەمانچەی هێنا بوە سەر پێ. مانوساکاس بێ جووڵە ڕاوەستا بوو. نووری گوتی:

- مانوساکاس، دوێنێ کاتێک لەگەڵ خاوخێزانت بە پێش خانووبەرەی مندا رادەبەردی، دەمانچەیەکت بە حەواوە ناو بۆ ئەوەی من نارەحەت بم، هاوارت کرد:

«بەسلامەتی تۆ نووری بەگ. زۆر باشە مانوساکاس، من قسەی تۆ دەسەلمێنم و مردن دەبێ یەک لە ئێمە هەڵبژێری!

ئەوەی گوت، دەمانچەیەکی بەسەر مانوساکاس‌دا هەڵتۆقاند. پاشان دەمانچەکەی برد لە کن

ئەوی‌تر هەڵی‌تاوەسی. پاشان هەر دووکیان ئامادەی شەر لەبەرامبەر یەک راوەستان. لاقیان لەبەر یەک بردبوو، مزرەیان لێک دەکرد.

هێشتا بۆ بە گۆ یەکدا چوون تەوان گەرم دانەهاتبوون. بە دوای وتەو وشەی ناحەز و توندو دزیودا دەگەران کە هاتیان بدا و توورەیان بکا و بۆ یەکتر کوشتن بیان هاروژێنێ.

مانوساکاس تفێکی لە نووری کرد و گوتی:

- تف لە ریشی پێغەمبەرەکەت.

نووری نەراندی و گوتی:

- تف لە ریشی عیسا بێژوەکەت.

پاشان خودای یەکتریان هێنا گۆرێ تا خوێنیان وەجوش بێ، دوایە مریەم و ئیمامەکان و سوڵتان و پیرۆزەکانی یونانیان بە جنێو شوشتەوە. بەلاَم ئەوانە هیچیان توورەی نەکردن. ئاخرەکەی مانوساکاس بژەیەکی گەمەی هاتێ و گوتی:

- بیستوومە پاڵەوان میکێلس، پشتێندی تۆی گرتوە و هەڵی سووراندووی و هاویشتوویەتیە سەربانی. منیش دەمەوێ وات لێ بکەم.

ئەوەی گوت و خۆ بە نووری دادا. بەلاَم نووری خۆی کلا کردو نەکەوتە بەردەستی. کشاوە و هەڵی کێشا خەنجەر و چاوی پر لە خوێن ببوو.

- کافرا

- سەگ!

نووری بە خەنجەری رووتەوە پەلاماریدا، بەلاَم مانوساکاس گورج خۆی لاداو کەم مابوو نووری وەعەرزی کەوێ. مانوساکاس بەرانپەکی ئەو تۆی لە ورگی نووریدا، نیزیک بوو لە خۆ بچێ. بەلاَم نووری هەموو هێزی خۆی بۆ بەربەرەکانی کۆ کردەوە ولە کاتێکا مانوساکاس هێشتا راست نە ببۆوە، خەنجەرێکی دە خاڵیگەی راکرد. خەنجەرەکەی دەرهێناوە، خوێن فلقەی کردو هەموو سەرو سینگی بە خوێن بوو. لە خۆشیان هاواری کردو خەنجەرە خوێناویەکەی لستەوە. مانوساکاس بە لارە لار خۆی گەیاندە دارەکەو گوتی:

- ئەی سەگ، ئاخرەکەی کاری خۆت کرد!.

- ئێستا بێ حیسابین. بە کاوە خۆ وەک شێر لێی وەنیزیک کەوت. کوتە تفنگی لەبەر بۆنی خوێن و گۆشتی تازە براو وە پتە پت کەوتبوون.مانوساکاس کە هەستی دەکرد، توانای ئامێنی و ئیتر ناتوانی دوژمن پەلامار بدا، بە سپایی گوتی:

- وەرە پێشتر، نیزیک‌تر بەوە وەرە پێش.

نووری بە بیستنی دەنگی لەرزۆک و خرپفی دوژمن کەیفی دەکرد. وردە وردە لێی دەچوە پێش و خەنجەرەکەی هەڵدەسووراند. کاتێک تەواو لێی وەنیزیک کەوت نەراندی و گوتی:

- کافر، ئێستا خەنجەرێکیشت لە سەر دڵی دەدەم، بە تۆڵەی ئەو سووکایەتیەی کە پاڵەوان میکێلسی برات بە دەوڵەتی عوسمانی کردوە!

ئێستا تەواو نیزیک ببۆوە و خەنجەری بەرەو سنگی مانوساکاس راگرتبوو. لە پر ئامبازی بوو، حەکەری داهێنایە. بەلاَم مانوساکاس توانی جارێکی دیکەش خۆلابدا، خەنجەری نووری وەدارە

بەروو کەوت و لە نیوەراستەدا شکا. مانوساکاس هەموو هیزی خۆی کۆ کردەوەو خەنجەریکی دەنیو لینگی نووری هەلکرد. نووری وەک گا هۆراندی. بەلام توانی خەنجەرەکە لە دەستی مانوساکاس بینیتە دەرو بە لووزە لوور لەسەر دلی رۆ کرد و گوتی:

- ئەوەش بۆ دەولەتی عوسمانی!

مانوساکاس لە بن دار بەروە گەورەکە وە عەرزی کەوت. دەست بە جی کریستینای ژنی و کورەکانی و ئاغەل و مەرەکان و مەرپیتە وەکەی دە هاتە بەر چاوی و پەردەیەک بەری چاوەکانی گرت و ئیتر هیچی نەدەدیت. وە عەرزی کەوت و دم و چاوی چوە دەخوینی.

نووریش لە پەنا ئەو کەوتبوو، خوین لە نیو گەلی دەهاتە خوار و لە پەناسەری کرژاوەکە کۆ بۆوە. ژانیکی توند و بی رەوای بە سکی دادەهات. باتۆ بریندارەکانی بە دەستی گرتبوو، دەی نالاند. تەماشایەکی ئەولاو لای خۆی کرد. رۆژ دەهات ئاوا دەبوو. دەنگی زەنگولەی حەیواتان لە چیا دەنگی دەداوە. با هەلیکردبۆیە.

نووری دەی نالاند و هەولی دەدا راست ببیتەوە بە نووزە نوزە دەیگوت:

- خوایە، خوایە، یارمەتیم بدە تا بتوانم خۆم بگەیەنمە ئەسپەکەم. دەستی بە دارەکە گرت و دەمانچەکەی لە لقی دار کردەوە و دە بەرپشتی‌را کرد. داهاتەوە گۆچانی مانوساکاسی هەلگرت و خۆی هاویشتە سەر. چاویکی لە حەریفی کەوتوو کرد کە لە گیانەلادا بوو. ویستی پیلاقیکی پیدادا، بەلام لەبەر ژانی سکی نەیتوانی. تفیکی لی کرد و لەبەر خۆیەوە گوتی:

- سویندم خوارد بوو کە بتکوژم و کوشتمی. بەلام کافر تۆش منت کوشت!

دەستی چەپی بردە نیو رانی و هەناسەیەکی هەلکیشا و گوتی:

- لامەسەب، بیدین. خۆزیا ئەو خەنجەرەت لە دلی من‌دابا.

مانوساکاس چاویکی کە رەنگی خوینی گرتبوو، لیکی کردەوە. لیوەکانی شین هەلگەرابوون بزووتن، دەتگوت دەیانەوی وەدەنگ بین، بەلام بی‌فایدە بوو. هەر وەک نیوە ناوالە بوون، بۆ هەمیشە لە جوولە کەوتن.

نووری بە دەستیکی گوندینی خۆی گرتبوو بە دەستەکەی دیکەی خۆی هاویشتبوە سەر گۆچان و لە بەر ژان دەی نالاند. هەرچۆنیک بی خۆی گەیاندە بن ئەو دارەکە ئەسپەکەی لی بەستبۆوە. ئەسپ نالەی خاوەنەکەی بیست و ئاوری داوە. سەری بۆ راوەشاند. نووری لە دلی خۆی‌دا دەیگوت:

- ئەگەر بتوانم سواریم و بگەمەوە، مستەفا بابا حەکیم باشی چاکە و عیلاجم دەکا.

خوین بە دوای ئەودا خەتیکی سووری کیشا بوو. کاتیک گەیشتە ئەسپەکەی، رۆژ تەواو چووبوە خواری. ئەسپ ملی راکیشا و سەرو پرچی خاوەنەکەی بۆن کرد پاشان هەر وەک شتیکی زانی بیت،حیلاندی، دەتگوت داوای یارمەتی دەکا.

نووری هەولی دا کە لاقیکی بگەیەنیتە رکیفی، بەلام نەی‌توانی، کەوتە خوارو تیزیک بوو لە خۆ بچی. لاقی ئەسپەکەی لە ئامیز گرت. ئەسپ ئاوری داوە، تەماشای کرد و تی گەیشت. چۆکی داوان و راوەستا. نووری خۆی بە سەردا هیناو دەستی دەملی کرد. ئەسپەکە راست بۆوە و نووری گەیشتە سەر زینی. ددانی دەچیرەوە بردن تا هاوار نەکات. سکی هەموو برین بوو. نەیتوانی

لاقانی لیک بکاتەوە، یەک لا سوار بوو. دەنگی ئەسپی‌دا : «برز هاورێ برز... بەلام سەبر برز» دەستی بە یالی گرت. رۆژ ئاوا بوو، ئەسپ سەبرو بە کاوە خۆ لە چیا دەهاتە خوارو چاویشی لەبەر پێ‌یان دەکرد کە سەر سم نەداو دەبەردان هەلْ نەنگوێ.

رۆژ لە پشتی چیاکان بزر دەبوو. رەنگێکی وەک خوێن سووری هەبوو. چەند ژن بۆ دیتنی مێردەکانیان بەرەو، چیا دەچوون. نووری بە سەری بەرز و ددانی تێکراو بە لایان‌دا تێ‌پەری. بەلام خوێن بە زین و بەرسکی ئەسپ‌دا دەهاتە خوارو رچەی رێگای نووری بەسەر بەردەکان دا نیشان دەدا.

هەوا فرە فێنک بوو، گەرما کەوتبوو، زەوی فێنک ببوو. دوو سێ ئەستێرەی گەورە لە ئاسمان دەرکەوتبوون. لە بناری چیا لە خانوبەکی بچوک‌دا چرا دایسا. ئاوازێکی نەرم و خۆش دەبیسرا. دایکێک لانکی منالەکەی رادەژاند. نووری چاوی لە سەر یەک دانابوو، هیچی نەدەدیت. بەلام دەنگی هەزاران گیان لەبەری دەبیست کە لە بەر فێنکی هەوا لە بن گیا هاتبوونە دەر، توند بە یالی ئەسپەکەوە نووسابوو، بۆ کوێی دەبا، بلا بروا. ئەسپەکە دەیزانی بۆ کوێ دەچی. نووری بروای پێ هەبوو.

ئەسپ لە پێش دەرگای خانووی کلاو فەرەنگی راوەستا. نووری چاوی هەلێنا و هاواری کرد. نۆکەر غاریان دا لە ئامێزیان کرد. پیرەدایان دۆشەکیکی نەرمی راخست و نووریان لە سەر درێژ کرد. لێفەو دۆشەک خوێناوی بوون. نووری بە دەست ئیشارەی کرد و بە بۆلە بۆلْ گوتی:

– مستەفا بابا... مستەفا بابا... و دووبارە بەسەر سەرین‌دا کەوت.

کاتێک مستەفابابا بە غار بە هەناسە برکە بە هەگبەبەکی پر لە دەرمانی گیایی و هەتوان و مەلحەمی دەسکردی خۆی لە خانوبەرەی نووری بەگ وەژوور کەوت، شەو درنگ ببو. نووری رووت کردەوە. نۆکەر چراو شەم‌یان هێنا. مستەفا بابا تەماشایەکی کردو سەری راوەشاند.

نووری لە خۆ چووبوو. پیرە مێرد گوڵاوی لە بەر کەپوو راگرت و لاچاینگی بە گوڵاو دامالی. نووری چاوی هەلێنا و بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی:

– من چاک دەبمەوە... عیلاجم دەکرێ؟

مستەفا بابا گوتی:

– تۆ لەبەر دەستی خودا دای... ئەو دەبێ چاکت کاتەوە.

نووری بە ترسەوە پرسی:

– کەسی‌تر ناتوانێ؟... ئادەمیزاد ناتوانن چاکم کەنەوە؟ تۆ خۆت ناتوانی؟

– نووری بەگ برینەکە لە جێگایەکی خەراپەو کاری کردوە.

نووری هەناسێکی هەلکێشا و گوتی:

– هەر بەوە جەرگم براوە... لەعنەت لەو دەمە کە تووشی هاتم.

مستەفا بابا گوتی:

– جنێو مەدە. خودا خۆی رێگای خەلجەرەکەی دیاری کردوە.

نووری بە ئاهەنگێکی سەر کزنەوە نالاندی و بە نیگەرانی تەماشای پیرە مێردی کرد و گوتی:

– بۆچی؟ بۆچی؟... بۆچی؟

پیرە مێرد وەڵامی نەداوە. ئەو دەیزانی بۆچی. هەر ئەو ڕۆژە بەیانی کاتێک نووری لەبەر دەرگای خۆی دیبوو کە وەک ڕۆژ دەدەرەوشا. هەستی کردبوو. گوتی:

- ئەگەر دەتەوێ چاک بیەوە، بێدەنگ بە. هیچ مەپرسەو هیچ مەڵێ.

ئارەقیان هێنا، برینەکەی بە ئارەق شوشتەوە و پێچای و خوێنەکەی ڕاوەستا. پاشان هێندێ گیای دەرمانی لە هەگبە هێنا دەرو دای بە دایان کە بیکوڵێنی تا نووری بیخواتەوە و بتوانێ بخەوێ.

نۆکەرەکانی لە ژووریَ وەدەرنا. هەگبەی دووبارە کردەوە. شوشەی بچووک و توندی پڕ لە ڕۆن و هەتوانی جۆر بە جۆری هێنادەر، پیرە دایان دەگریاو تەماشای دەکرد و پرسی:

- مستەفا بابا، برینی بەگ زۆرە؟ داخوا چاک دەبێتەوە؟

- تازە ژیان بە کاری ئەو نایە.

- بۆچی وا ئیژی، مستەفا بابا؟

تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کردو بە سپایی گوتی:

- تازە ئەو پیاوەتی پێ ناکرێ.

پیرێژن زیقاندی و دم و چاوی لە نێو دەستەکانی‌دا شاردەوە.

* * *

بەیانی ئەو ڕۆژە کاتێک ڕۆژ دەهات ئاوا بێ، پاڵەوان میکێلس لە پێش دوکانی خۆی ڕاوەستا بوو، دەیڕوانیە لای لەنگەرگا کە لەوێ لۆتکەکانیان بار و بە تاڵ دەکرد. دەریا دەکوڵی و سوور هەڵگەرابوو. پاڵەوان میکێلس تەماشای دەکرد، بەڵام هیچی نەدەبینی.

چەند ڕۆژ بوو فرە کز ببوو. هەمیشە تامی زاری تاڵ بوو. کاتێک تورک بە پێش دوکانەکەی‌دا تێ دەپەڕین، خێسەیان لێ دەکرد. زۆر لە دزستە مەسیحیەکانی بۆ ئەوە ناچار نەبن قسەی لەگەڵ بکەن، لە ڕاست دوکانی ئەو لایان دەدا. هەموو ئەویان بە خاوەن هێزێکی پڕ لە نهێنی دەزانی، دەتگوت تورشی مردوو یا شەیتان دەبن، غیرەتی ئەوەیان نەبوو خۆی لێ بدەن.

پاڵەوان میکێلس کە تووتنی هێنا دەرو خەریک بوو سیغارێک هەڵبەستێ، چوونکە نە شەراب و نە گەڕانی بە سواری، هیچیان ئارامیان نەدەکرد. سیغارێکی پێ کرد، یەک دوو قومی لێدان و بە توورەیی‌تفی لە عەرز کرد. دووکەڵ زاری تاڵتر دەکرد. سیغارەکەی فڕێ‌دا، بە پێ پانی کردەوە و لە بەر خۆیەوە گوتی: «دەبرۆ تۆش ون بە». ویستی بچێتەوە دوکان و لە قوژبنێکی تاریک چاوەڕوانی کاتی ڕۆیشتن بێ، لە پڕ تشودۆریسی کوڕە گەورەی مانوساکاس بە هەناسە بڕکە و لە ئارەقە و تۆز و غوباردا نوقم ببوو، خۆی بە ژوورا کردو لە پێش مامی ڕاوەستا. زمانی نەگیرابوو، بەڵام لەبەر هیلاکی و پەشێوکاوی قسەی پێ نەدەکرا.

پاڵەوان میکێلس باسکی گرت و ڕایوەشاند و گوتی:

- چیە؟ قسە بکە! لەپڕ مانوساکاسی برای هاتەوە بیر.

- مامە گیان... باوکمیان... کوشت!

- کێ؟

- نووری.

پاڵەوان میکێلس بە تووڕەیی باسکی برازای بەردا، قامکێکی بە ددانی گەست و خوێنی گەرمی هاتە سەر لێوان.

- کەی؟ لە کوێ؟ پشوویەک بدەو قسە بکە!

تنودۆریس تۆزێ هاتەوە سەر خۆ، لە کاتێکدا دەگریاو جنێوی دەدا و دەیگێڕاوە کە چۆن نیوەڕۆ باوکیان لە بن دار بەڕوێکی گەورە، لە نێو گۆمی خوێن‌دا دۆزیوەتەوە. کە بە دوو زەبرە خەنجەر یەک لە خاڵیگە و ئەوی‌تریان لە سەر دڵی کوژراوە. دوو ژن یەکیان پای هاتزی‌گۆرگیس و ئەوی دیکەش بووکەکەی کە لای ڕۆژ ئاوا بۆ چیا هاتوون، نووری بە گیان دیوە کە بە ڕەنگی بزرکاوی وەک مردوان بە سەر ئەسپدا هاتوە و لە چیاوە، چۆتەوە خوار و خوێن بە دوای ئەودا بە سەر بەردان‌دا ڕژاوە.

پاڵەوان میکێلس ماوەیەک مات بوو، دەعەرزی ڕاما و گوێچکەی بۆ قسەکانی برازاکەی هەڵخستبوو. کاتێک ئەوانەی هاتنە بەر چاو، سەری هەڵێنا و شانی برازاکەی گرت و ڕایوەشاند و گوتی: «تیتر بێدەنگ بە! خۆ تۆ ژن نی وا دەگری. هێشتا دەروازەکانی شار دانەخراون. تۆ دەتوانی بچیەوە گوندی. پێیان بڵێ ئەی نێژن، تا بۆ خۆم دێم!»

کاتێک پاڵەوان میکێلس بە تەنیا مایەوە، چوە ژووری دوکان و «کادتوسی» ناردەوە ماڵێ. نەی دەویست ئەو ببینێ. کورسیەکەی لەسەری دانیشتبوو، دەستی دایەو وەهای لە عەرزی‌دا کە وردو خاش بوو. پاشان بە سەر ناڵقەی تەنافەکان‌دا کەوت. سەری گرتە نێو دەستەکانی. دوکان لە بەر چاوی ون بوو. کاتدی دیار نەبوو، دار بەڕوێکی ڕەشی پڕ لە لق و پۆپ لە دڵی‌دا شین بوو. مانوساکاسی برای لە بن ئەو دارەدا کەوتبوو. ئەو نەمردبوو، لە جیاتی خوێن، شەراب لە لەشی دەچۆڕاوە و چەپڵەی لێ‌دەداو سروودی نیشتمانپەروەرانەی دەخوێندەوە.

پاڵەوان میکێلس سەری ڕاوەشاند، ڕاست بۆوە و بڕیارێکی کوتو پڕی‌دا دوکانەکەی داخست ، کلیلی لە بەرپشتی ناو بۆ ئەوە تووشی کەس نەبێ، بە کۆڵانێکی تەنگ و تاریک‌دا، بە گەڕەکی یونانیان دا تێ پەڕی و چوە گەڕەکی تورکان. «سێ خوشک» هێشتا لە پشت پەنجەرە خۆیان مات کردبوو. پاڵەوان میکێلس لەبەردەرگای خانووی دەرگا سەوز ڕاوەستا، نیگایەکی هەڵۆیانەی لەدیواری بەرزو شانشینی و پەنجەرەکان کرد. بەڵام گورج ڕووی وەرگێڕا و وەها لەو کارەی خۆی پەشیوان بۆوە، دەتگوت گوناحێکی گەورەی کردوە. ئەو شەوە، ژن و شانشینی پەنجەرە دار گرنگی چی‌یان بۆ ئەو هەبوو؟

بیری ئەو وەک هەڵۆیەک بوو کە بە تۆزی نووری بەگەوە نووساوە و چنگاڵی لە مێشک و چاوی ئەو بردۆتە خوارێ.

تووشی سەر خۆشی و پەشۆکاویەکی نائینسانی بوو. لە پڕ بیری ئازاد بوو، بەرز بۆوە، ئەوجار تەرمێکی دیکەی هاتە بەرچاو کە تەرمی ئادەمیزاد بوو، پشووی نەدەهات و بۆنی ئارەقەی مردووی لێ دەهات. پاڵەوان میکێلس جارێکی‌تر کەوتە ڕێ، چاوی دەزووڕانەوە و لە ڕێگادا لە بەر خۆیەوە دەیگوت: مانوساکاسی براکەم... مانوساکاسی برام!...

* * *

شەو داهات، ئاسمان پڕ بوو لە ئەستێرە و مانگێکی لەڕ و لاوازیش لەولاتر دەرکەوت. لە گوندی «سنژان» دەرگای ماڵەکان داخرا بوون، چراکان یەک لە دوای یەک دەکوژانەوە و گوند دەکەوتە تاریکی. تەنیا ماڵی مانوساکاس رووناک و کرابۆوە. تەرمی خاوەن ماڵ کە بە شەراب شۆرابوو، لە کفن وەرگیرا بوو، لە نێوەراستی ماڵ درێژ کرابوو. خاچێکی لە مێویان لەسەرلێوان دانابوو، وەسێکی عیساشیان خستبوە نێو دەستەکانی.

دوو شەمی گەورە، یەک لە ژێر لاقانی و ئەوی‌تر لە بان سەری دایمسا. چاوەکانی مانوساکاس کە وەک شووشەیان لێ‌هاتبوو، تەواو کرابوونەوە. چوونکە ئەو کاتەی هێشتا گەرم بوون، کەس نەبووە وێکیان بنێ. لە بەیانیەوە خزم و کەس و کارو دۆستی مانوساکاس دەهاتن و دەرۆیشتن. هەر لە بەیانیەوە موسیقای پرسەو پەژارەی خەمناکی لێ دەدراو ئەم جیتابەتەی رادەگەیاند. مەسیحیەکانی دیهاتی دەوروبەر دەهاتن تا بۆ ئاخر جار ماڵئاوایی لە مانوساکاس بکەن و ماچی بکەن.

کریستینای ژنی خۆی بەسەر جەنازە دادەداو دەگریا و لە سینگی خۆی دەدا. ژنەکانی دراوسێ هەموو روویان کردبۆوە ئەوێ. بێوە ژن ودایک و کیژی هەتیو بوون کە مردن زۆر جار داخداری کردبوون و ئێستا برینیان تازە دەبۆوە و دەکولاوە. هەموو پرچە هۆنراوەکانیان کردبۆوە و لە گەڵ ژنی مانوساکاس شینیان دەگێرا و لە خۆیان دەدا.

باوکی پیری بنەماڵە، پاڵەوان سیفاکاس دەتگوت دەچێتە شەر، خۆی لە چەکاندا شەتەک دابوو.بە دەمانچەی عەنتیکە و خەنجەری دەسک سپی و تفەنگی لوولە پڕەوە کە یادگاری باوکی بوون، هاتە گوندی، لە بەر دەرگای ماڵێ راوەستا و لە تەرمی کورەکەی وەنیزیک کەوت و دەستەکانی خستە نێو دەستی خۆی و گوتی:

– خێری تێدایە مانوساکاس، بەڵام تۆ هێندێکت تالووکە کرد، چوونکە نۆرەی من بوو. سەفەر بە خێر. لە قەولی منەوە سلاوی ئەو دنیا بکەیەنە و بە دانشتوەکانی بڵێ کە بەو زوانە منیش دێم.

پاشان ماوەیەک لە نێو دەرگا لە سەر عەرزی دانیشت و تەماشای کورەکەی کرد. ئاخرەکەی هەستاو مات و هێندێ بە چاوی وشکەوە، بۆ گوندەکەی خۆی گەرایەوە.

شین و گریان دەهات کەم دەبۆوە. هیلاکی دڵەکانی ئارام دەکرد و کاتی شەو خزم و دۆست بلاوەیان کرد و چوونەوە ماڵی خۆیان. ئەوان زیندوو بوون و دەبوایە بەیانی وەدوای کاری خۆیان بکەون. رەنج و خەفەتی خەڵک بۆ ئێمە هەمیشە بێگانەیە و تەنانەت دەتوانین بڵێین کە بەوە شاد دەبین ئەگەر بەدبەختی بەخەی دراوسێمان بگرێ و لە ئێمە تێ‌پەرێ. بەم چەشنە پێنجگە لە سێ دۆستی بە ئەمەگی کەسی دیکە لەوێ نەمایەوە. یەکیان «فانوریوسی» برای کەشوان بوو. دووەم «ستراتیس» پیاوێکی بە قەلافەتی سی و پێنج ساڵە، کەڵەگەت، ریشێکی رەشی پڕو نێو چاوانێکی پان. ئەو دۆستێکی گەلێک باش بوو. ئەو خەڵکی «کیسامۆ» بوو. پێش پێنج ساڵ چوو بوە بازاری «کرۆستالێنا» تەزاو تەدەر داوی بۆ دانا بۆوە، کیژێکی جوانی خەڵکی «سنژان»ی هێنابوە سەرڕێنگا. ئەو کیژە لەوێ سەمای دەکرد ستراتیس کیژەکەی‌خۆش ویست بوو لەوی مارەی کردبوو. مانوساکاس لە کلیسا کلاوی بوکی لە سەر نابوو. دوای ئۆزمانگ کوڕێکیان بوو، دیسان مانوساکاس ناوی لێ نابوو، بەو کارە ببوونە خزم.سێهەمیان «پاتاسموس»ی دەف زەن بوو،

پیاوێکی ساکارو روناکبیر و قەڵبزۆکە بوو. لە تەمەنی پیری باوکی‌دا هاتبوە دنیا. باوکی نۆکوڕی دیکەی هەبوون. لەبەر ئەوەی تینی دەبەردا نەمابوو «پاتاسموس»، منالێکی رواڵەتی نەبوو. لەگەڵ ئەوەش لە هۆش و ژیری بێ بەش نەبوو. لە بەر ئەوە کە ئەو رۆژەی وەسکی دایکی کەوتبوو، خودا تووڕە ببوو، لە ساز کردنی ئاهەنگ و گۆرانی بێ بزیوە و شەرە جنێو هاوتای نەبوو. دەچوە هەر مەجلیسێک بە گوێرەی هەوای ئەو مەجلیسە گۆرانی دەگوت. لە لایەکی دیکەوە ریست و دڵخوازی خەڵکی باش دەناسی، کاتێک لە کۆڕی سەماو زەماوەندا لەسەر کورسی دادەنیشت و تاری لەسەر ئەژنۆی دادەنا، بەر لەوە کە دەست بە گۆرانی بکا، تەماشای یەکە یەکی دانیشتوانی دەکرد. ژن و پیاو لێی دەترسان. لەبەر ئەوە کە سەڵت و رەبەن بوو، بێ خەم و خەیاڵ لە هەموو جێژن و شایی و زەماوەندێک‌دا بەشدار دەبوو. هەر کەسە هەوڵی دەدا، لە لای خۆی دابنێ و مەرایی بۆ بکا، تا تووشی لاتاو پلاری ئەو نەبێ بەوەبلێبوت» و پاڵەوان زەرگەتەش ناویان دەبرد.

رۆژی پێش بۆ جێژنی ناو لێنان سێهەمین کوڕی «ستراتیس» هاتبوە گوندی «سێژان» و لە رێگا تووشی مەیتی مانوساکاس ببوو. مانوساکاس باشترین دۆستی ئەو بوو. کە پێکەوە دەبوون، دەیتوانی کووپێک شەراب خاڵی بکەن و بە مێگەڵ مەڕ بخۆن. مانوساکاس خۆشی دەویست و قەتی قسە پێ نەگوتبوو. هەر سێ رۆژ پێش کارەساتی کەر بردنی مزگەوتی کردبوە شیعر و ریکی خستبوو کە چۆن کەر لە مزگەوت چوکی داداوە و چۆنە سوژدە. چۆن کەرەکانی گوندی سەریان لەو کارەساتە سوڕمابوو، هەموو چوو بوونە لای ئیمامی مزگەوت و چووبوونە سەر دینی ئەو. ئەو داستانێکی واقیعی بە کەیفی خۆی رازاند بۆوە و لق و پۆپی لێ نابوون. هاتبوو تا لە جێژنی ناو لێناتی کوڕی «ستراتیس»دا، بۆ مانوساکاسیان بخوێنێتەوە. دەی زانی کە مانوساکاس بە بیستنی شیعرەکانی ئەو کەیف خۆش دەبێ. بەڵام ئێستا...

داهاتەوە، چاوێکی لە مەیتەکە کرد و هەناسێکی هەڵکێشا و لەبەر خۆیەوە گوتی:

– ئادەمیزاد یانی ئەوە... بلقێکە.. هەڵدەسێ و هەڵدەسێ و پاشان لە پڕ دەتەقێ و دەچێتە جەهەندەم. واتە مەبەستم ئەوەیە دەچێتە بەهەشت!... دیارە وشەی ئاخری گورج راست کردەوە. چوونکە شەرمی دەکرد لە بەرامبەر تەرمی دۆستەکەی‌دا هێشتا سارد نەبۆوە، قسەی قێزو بکا.

ستراتیس بێدەنگ سەری بەرداوە. دە سەرەیەکی بە دەستەوە بوو رای دەوەشاند و مێشی لە دم و لووتی مانوساکاس دەرددەکرد. فانوریوس هەستا و شانی کریستینای گرت و لە سەر مەیتەکەی راست کردەوە، پاشان ژنەکانی دیکە کە دەگریان راستی کردنەوە و گوتی:

– ئیتر بەسە، قوربەسەر نیە. بچن نەختێ بحەسێنەوە! ئێمە سێ پیاو لای مەیتەکە دەبین.

ژنەکان دەستیان کرد بە شین و گریان و دەیانگوت مردوو بەجێ ناهێڵین. بەڵام شوان بەو دەستە ئەستوورانە هەمووی کۆ کردنەوە و دەژوورێکی دیکەی کردن و دەرگای لەسەر داخستن. پاشان هاتەوە لە پەنا جەنازە دانیشت.

ماوەیەکی زۆر هەر سێک دۆستی گیانی مانوساکاس بێدەنگ چاویان بڕیبوە مەیتەکە و بەڵام هەر یەکەش بیریان لە شتێکی‌تر دەکردەوە. «ستراتیس» لە فیکری ژنەکەی‌دا بوو و بیری لە ئێستره چەموشەکەی دەکردەوە کە تازە کڕیبووی و لووشکی داوێشت و پێش چەند رۆژ کەمی مابوو کوڕەکەی بکوژێ. «پاتاسموس» بیری لە دانانی شیعرو ئارازێکی خەفەتبار دەکردەوە و

خەریک بوو راست و درز تێک بخا کە چۆن مانوساکاسی لە گەڵ حەوت تورک لە مەیدانێکی سەر داپۆشراو بە مەفرەق دا بەرەنگار بوە، شەشی لێ کوشتوون و حەوتەکەیان خەنجەرێکی لە سەر دڵی داوەو کوشتوویە. «ڤانوریوس» برسی بوو، بیری لە کەلباسی بەراز دەکردەوە کە لە ژێرخانی خانووی براکەی هەڵاوەسرابوون بیری لە کوپە شەراب دەکردەوە کە لە قوژبنێکدا بەرچاو دەکەوت، نانی گەنم کە کریستینا رۆژی پێش کردبووی و هێشتا هەر بۆنی دەهات.ڤانوریوس ئاوی لە زاری دەهات و لە کاتێکا چاوی بریبوە تەرمی براکەی، هەر لەوە دەگەڕا کە باسی سوسبۆن و ئارەق بکا.

سەعات نیوە شەوی راگەیاند. گزە بایەک لە شیمالەوە دەهات و گەڵای دارە لیموکانی رادەژاند. هەر سێک لە بەر گزە با هەستیان بە فێنکی دەکرد. ناڵەی کوندێک کە هێلانەی لە ژێر گوێ سوانەی خانوەکەی کردبوو، لە ماتی شەودا دەبیسرا. چوار پێگەلی ئەم دەوروبەرە کە بۆنی تەرمی مردوویان کردبوو، دەیان لووراند.

ڤانوریوس هەستی کرد کە لە برسان زگی پێچان دەدا. زۆر برسی بوو. کاتێک بۆ باسی سوسبۆن هەلی بۆ هەڵنەکەوت، گوتوپڕ دەری بڕی:

- کوڕینە دەڵێن چی؟ ئەوا چەند ئالقە سوسیونم دیون لەو بەر میچە هەڵاوەسراون، کوپە شەرابێکیش پێ دەزانم. لە گەڵ مێن کە بە سلامەتی روحی مردوو پیالەیەک پێدا کەین؟

پاتاسموسیش کە لە برسان قوڕەی لە زگی دەهات، دەستێکی بە زگی داهێناو گوتی:

- بۆچی‌نا؟ تەنیا مردوون کە ناخۆنەوە. برۆ ڤانوریوس، برۆ ژێر عەرز و خوا چاکەت بۆ بکا. ستراتیس تۆ دەڵێ‌ی چی؟

ستراتیس گوتی :شەرمە. لە پێش مردوو ئەو کارە بکەین.

پاتاسموس گوتی :

- کوڕە ئەوەی ناوێ، زوو دەیخۆین و تەواوی دەکەین. ئێمە خۆ هەر دەبێ تا بەیانی لە کن ئەو مەیتە دانیشین. با هێزێکمان بێتەوە بەر. ئەم خواردن و خواردنەوە بە خێری مردووەکەیە. برۆ ڤانوریوس، برۆژێر عەرز.

ڤانوریوس پێشتر مومێکی بن سەری مەیتەکەی هەڵگرتبوو. کەوتبوە رێ، کاتێک گەرایەوە، ئالقەیەکی سوسیون و دۆلکە ئارەقێک و سێ شوشە ئاوی خواردنەوەی لەگەڵ خۆ هێنا بوو.

پاتاسموس باسکی لێ هەڵماڵی، دوو سێ پارچە سوسیونی بڕی و چوە حەساری، ئاگری کردەوە و دەستی کرد بە برژاندنیان. بۆنێکی خۆش بە حەساری‌دا بلاو بوە.

کاتێک سوسیونە برژاوەکانی لەسەر گەڵای لیمۆ دەهێناوە ژوورێ، گوتی :

- بۆخاتری خوا، دەرگا داخەن با ژنەکان بۆنیان بۆ نەچێ.

لەو کاتەدا ڤانوریوس پیاڵەکانی پڕ کردبوو، ستراتیس-یش نردەنانێکی لە قەرتاڵەی نانی هێنا بوە دەرێ.

هەر سێک پیاڵەکانیان هەڵێنا. ستراتیس گوتی :

- کوڕینە، بە سلامەتی گیانی مردوو.

پاتاسموس گوتی :

- وە بە سڵامەتی خۆمانیش.
فانوریوس گوتی:
- پێی داکەن و مەترسێن، شوکری خوا کە کوپە نیوەی ئارەقە. ئاخ مانوساکاس، براکەم، بەخێرچی.
خواردیانەوە و تەقەیان لە سوسبونەکانیش هێنا. فانوریوس، چەقۆی شوانی هێنا دەرو نانەکەی کردە سێ بەش.
تازە ئێشتیایان دەکراوە. سوسبونەکانی دیکەشیان برژاند. فانوریوس چۆوە ژێر هەرزی، پەنیر بەرزێتەوە. کوپە ئارەقی لە سەر ئەژنۆیان دانابوو دەپیالەکانی دەکرد. پاتاسموس پێشنیاری کرد:
- بخۆینەوە بە سڵامەتی بیوە ژنەکەی، من تەنیا زگم بەو دەسوتێ، فەقیرە. من شیعرێک بۆ ئەو هەر دەخوێنمەوە.
- بەسڵامەتی!
هەموو پێیان داکرد. ستراتیس گوتی:
- بە سڵامەتی پاڵەوان میکێلس! تەنیا ئەوە کە تۆڵەی برای دەستێنێتەوە، بە سڵامەتی ئەو.
فانوریوس گوتی:
- وەرن بە سڵامەتی گشت ئەو کەسانە بخۆینەوە کە دەیان ناسین. بە زیندوو و مردووەوە!
هەر سێکیان بە نۆرە بە سڵامەتی دۆست و خزم و دراوسێکان خواردیانەوە. پاشان قارەمانە گەورەکانی کریتیان وەبیر هاتەوە، بە سڵامەتی گیانی «کوراکاس» «هاتزیمهالیس»، «کریاریس»و «واسکالۆیانیس» خواردیانەوە.
پاشان نۆرەی قارەمانای شۆرشی ۱۸۲۱ هات. وەک «کلوکتورۆنیس»، «کارائیس کاکیس»، «میاتولیس» و «ئودیسە ئاس ئاندرو تسوس»، کوپە دەهات بەتاڵ دەبوو.
پاتاسموس کە کۆلکە خوێندەوارییەکی هەبوو، پێشنیاری کرد:
- کورینە با بە سڵامەتی یونانی قەدیم بخۆینەوە.
فانوریوس گوتی: لەو قسانە!
- باشە، کەوابە با گۆرانیش بڵێین!
ستراتیس دژ وەستا و گوتی:
- بۆخاتری خوا بەسە... شەرمێ بکەن!
- کورە دەی... سەیر دەڵێین و ئارە ئارێ دەکەین. کەس نازانێ... کەس... خۆشی لە کاتێکا بە خەیاڵ سازی لێ دەدا، دەستی بە گۆرانی کرد:
«تۆ هەموو شتێکت لە بیر بردەوە.
بەڵام دەبێ ئەو بەرە بەیانەت وەبیر بێتەوە»
دوو کەسەکەی تر بەندی دووهەمی شیعرەکەیان لەگەڵ دەگوتەوە!
«بەڵام دەبێ ئەو بەرە بەیانەت وەبیر بێتەوە».
پاتاسموس درێژەی پێدا:
«کەتۆم ماچ دەکرد و تۆش دەتگوت: شەوە دەبێ بنووین...»

ستراتیس دەستی بە زاریەوە ناو گوتی:
- ئەوە شیعرەت بۆ بیوە ژن هۆندۆتەوە؟ تۆ لە خوا ناترسی؟
گۆرانیکی مەزهەبی نازانی کە لە جیاتی ئەوانە بیڵێی؟
- گۆرانی تازەیەت گەرەکە؟... بە چاوان!
رووی کردە لای مەیتەکەو نیشانەی خاچی لە سنگی کێشا و دەستی پێکرد:
-«دەمێ ئاخرین دیدار گەیوەتێ...»
هێشتا ئەو بەندەی تەواو نەکردبوو، دووکەسەکەی‌تر دەستیان کرد بە شین و گریان و خۆیان بە سەر مەیتەکەدا داو بە گریانەوە ماچیان دەکرد. ڤانوریوس بە سەر مەیتەکەدا کەوتبوو، دەگریا و دەیگوت:
- برام... برای خۆشەویستم!...
ماڵ پڕ بوو لە شین و گریان و رۆرۆ. دەرگایەک کرایەوە و ژنێک کە دەسماڵی بە سەردادابوو، سەری وەدەرنا، بەڵام پاتاسموس بە دەست راوەشانێک گێڕایەوە.
پاش ئەوە کە هەر سێک تێر گریان لە بەرامبەر مەیتەکە راوەستان و تەماشایان دەکرد. گریانەکە بە قازاغیان بوو، هەر سێک بەو ئارەق و سوسیون و گریانە، تینیان هاتبووە بەر. ڤانوریوس لە کاتیکا مەیتەکەی نیشان دەدا، تفی دەکردە دەستی و دەیگوت:
- کورینە دەڵێن چی؟ ئامادەن بە سەر مەیتەکەدا باز دەین؟
ستراتیس و پاتاسموس گوتیان:
- بۆچی‌نا؟
هەر سێک خۆیان هەڵکرد و دەلنکە پاتۆڵیان هەڵدەوە تا وەبەر پێ‌یان نەکەوێ. دار مەیتەکەیان بردە پێش دەرگای حەساری تا مەیدان بۆ باز دان خالّی بێ. ڤانوریوس گوتی:
- من برای ئەوم... پێشتر باز دەدەم.
چوە دەرکی کۆلانێ و هەر تک دەستی لێک دان و بازی‌دا. بازدانەکەی ئەوەندە توند بوو کە سەری وەبەر میچی کەوت، بەڵام خۆی هەستی پێ نەکرد. لە نێوەراستی ژوورەکە راوەستا و خۆی هەڵسەند و گوتی:
- من بازم دا. ئێستا نۆرەی تۆیە ستراتیس.
ستراتیس بش لەشی باریک و بەرزی سوراند و بێ ئەوەی قاچی وەکۆسپێک بکەوێ، بازیدا و لەودیوی مەیتە کە پەنجەی پێی گەیاندە عەرزی و گوتی:
ئێستا نۆرەی تۆیە پاتاسموس.
بەڵام پاتاسموس ترس هەڵی گرت. چاوێکی لە تەختەکە کردو لە دڵی خۆیدا گوتی:
ئەم تەختە بەرزە دەبێ لە کوێ دروست کرابێ؟ لەو کاتەدا کە دەلەرزی، گوتی:
- من باز نادەم.
ڤانوریوس بە هێواشی گوتی:
- شەرم ناکەی، پاڵەوان پاتاسموس؟ تۆ کریتی یا کریتی نی؟. یالاّ باز دە.
- گوتم باز نادەم، من چەتک زەن نیم.

- بەدبەخت کە وابوو تۆ ڕێز لە مردوو ناگری! ئەوە سوکایەتی سرفە.
دۆستایەتی تۆ لەگەڵ مانوساکاس هەر ئەوە بوو؟ یاڵا با بزانم. بشمری دەبێ بازدەی.
پاتاسموس، سەرە کەچەلەکەی هەڵکراند و دۆستایەتی مانوساکاسی وەبیر هاتەوە و فرە تێکچوو گوتی:
- زۆر باشە.. باز دەدەم. بۆ ئەوەی غیرەت وەبەر خۆ بنێ، دەستی کرد بە هوب، هوب و بەسەر تەرمەکەدا خۆی هەڵاویشت. بەلاّم قاچی وەتەختەکە کەوت و تابوت وەرگەرا و بەسەر مردووەکەدا کەوت.
ڤانوریوس گوتی:
- ئابرووی ئیمەت برد، خۆڵت وەسەر، برۆ فەنا بە. شەقێنکی لێدا و ناوەبە حەساری و گوتی:
- ستراتیس وەرە یارمەتی بدە.
بە هەر تکیان تەرمە کەیان ڕاست کردەوە و لە کفنیان وەرپێچا و خستیانەوە نێو تابوت و ڕەسمی مەسیح‌یان لەسەر دەستی کێشا. ڤانوریوس سەرو ریشی مانوساکاسی دەست پێدا هێناو گوتی: «قەی ناکا براکەم. خۆ لەشت نەیێشا، تۆ مردووی، هەست پێ ناکەی!»
داهاتەوە، شەربە ئارەقی هەڵگرت و بە زاریەوە نا. جارێکی‌تر لە دەوری مردووەکە دانیشتن و سەیریان دەکرد. وردە وردە بەلادا هاتن و خەویان لێ کەوت.

* * *

ڕۆژی دوایی پێش نیوەڕۆ، پاڵەوان میکێلس لە حەساری مالی مانوساکاس لە ماینی خۆی دابەزی. کراسێکی ڕەش و مێزەرێکی ڕەشی لەسەر بوو. چەکمەکانیشی ڕەش بوون. ئەو ژنانەی کە بە شین و گریان دەوریان دابوو، لای دان و چوە ژوورێ. داهاتەوە، مردووەکەی ماچ کرد. پاشان ئاوڕێک راوەستا و تەماشای کرد. دراوسێ‌کان لە مەزرایە ریحان و گوڵە زەردە و پنگیان هێنا بوو لە سەر تەرمەکەیان دانا بوو.
پاڵەوان میکێلس بە مات و بێدەنگی تەماشای براکەی دەکرد. ئەویش بە چاوی کراوە سەیری پاڵەوان میکێلسی دەکرد. کریستینا و کورو کچەکانی و ڤانوریوس و ستراتیس و پاتاسموس و دراوسێ‌کان دەوری تابوتیان دابوو، سەیری ئەو دوو برایەیان دەکرد، دەتگوت بە زمانی بێ زمانی لەگەڵ یەک قسە دەکەن.
پاڵەوان میکێلس هەر وەک لەم ئاخافتنە نهێنی‌یە تێر بوو بێ، چوە متبەق، پاشان چوە ژووری مالەکە و لە تەویلە دەستی بە پشتی ماین و مانگاکان داهێنا. پاشان چوە هۆدەی خەوی براکەی، سەیرێکی تەختی خەو و شتومەک و پەیکەرە پیرۆزەکانی کرد و لە پەنجەرەوە تەماشای خانوە نەوی‌یەکانی گوندی و کلیسای بچووکی نێو گوندی سن‌ژان و دوورتر سەیری بناری چیای کرد کە بارکی لەوێ دەژیا. پاڵەوان میکێلس هەرچی شتێکی براکەی بوو، وەبیری دەهاتەوە و لە مێشکی خۆی‌دا کۆی دەکردەوە. تەماشای شتەکانی ئەوی دەکرد و دەستی لێ دەدان و لە بەر خۆیەوە دەیگوت: «دڵنیا بە مانوساکاس... دڵنیا بە.»
ئەشە هات. تابووتەکەیان هەڵێنا، ژنەکان خۆیان پێوە هەڵاوەسی نەیان دەهێشت بیبەن.

کریستینا کەوت و لەخۆ چوو. لەو کاتەدا کە خەریک بوون بە گولاو وەهۆشی بێننەوە، تەرمەکەیان لە ماڵێ بردە دەر و ڕێگای قەبرستانی سەوزو خۆشیان گرتە پێش.

پیاوی چەکدار و ژن بە دەسماڵی ڕەشەوە لە «پتروکفالۆ» و گوندەکانی دەوروبەرەوە هاتبوون تا بۆ ئاخرین جار لە حاست کۆڵەکەی تیک شکاوی «سن‌ژان» سەری ڕێز دانوێنن. ڕۆژی ناشتنی ئاقە تورکێکیش لەو دەورو بەرە دیار نەبوو. ژن دەگریان و بێ ماندوو بوون بە مردوویان هەلاّ دەگوت. سیفاکاسی پیر کە خۆی هاویشتبوە سەرگۆڕەکانی، هەوەڵ کەس بوو کە لە دوای تەرمی کوڕەکەی دەرۆیشت و چاوەکان وشک بوون. ئیتر مردن بۆ ئەو ڕازێکی پێوە نە بوو.

ئەو دەیزانی بێفایدەیە خۆی بە گریان بچوک بکاتەوە. لەو کارە قازانجێکی وەگیر ناکەوێ. دەی زانی کە ئەجەل نوکەری و فەرمانبەری پاشای ئاسمانانە و دەبێ خەرجی خودا لە خەڵک بستێنێ. کەوا بوو بێدەنگ و بێ گریان بە دوای مەیتەکەدا دەڕۆی و بە نووکی کوچانی لە بەر دەکانی‌دەدا. لە پێش قەبرەکە ڕاوەستا.

قەشە زۆر بە گورجی دۆعاو تەلقینی مردووی دادا. پاشان پاسکەکانی درێژ کردو مردووەکە تەبەروک کرد. دەتگوت حوکمی لێ دەکا کە لە بەر یەک هەڵوەشێ و بچێتەوە ئەو شوێنەی کە لێ‌یەوە هاتوە و ببێتە ئاو و خاک.

مستێکی خۆڵ هەڵگرت و بە قەبرەکەی داکرت. تابووتەکەیان بۆ نێو قەبر خلۆر کردەوە. خەڵکەکە هەر یەکەی مستە خۆڵێکیان بە قەبرەکە وەرکرد. دەتگوت مردوو بەردە باران دەکەن.

پاڵەوان میکێلس هەنگاوی هاویشت و لە سەر لێوی قەبرەکە ڕاوەستا. لە کاتێکا کە چاوی لە بەر فرمێسکی دەزووڕانەوە، بە دەنگێکی قایم گوتی:

- بە سلامەتی مانوساکاسی برام. برۆ بە سلامەتی و ئەوەی پێت ئێژم باشی لە گوێ بگرە. نەکەی بێ‌یە خەوی من و سکالا بکەی و تووڕەم بکەی. تۆ مەترسێ، من تەکلیفی خۆم دەزانم.

تاوێک بیری کردەوە، تەیزانی چی دێ بێژێ، قسەکانی دووپات کردەوە:

من تەکلیفی خۆ دەزانم، تۆ مەترسێ، تەنیا لە سەرخۆ بە. لە پڕ دڵی پڕ بوو، ناڵاندی و گوتی:

- خوا حافیز مانوساکاس! بەر لە تەواو بوونی ڕێ و شوێن، قەبرستانی بەجێ هێشت بۆ ماڵی ڕەحمەتیەکەی گەڕایەوە. لەو کاتەدا کە دەیویست ڕکێف لە ماینەکەی بدا، تێودوریس کوڕە گەورەی مانوساکاس بەغار هات و جڵەوی ماینەکەی گرت و گوتی:

- مامە گیان، من لە ژێر دەسەڵاتی تۆ دام.

پاڵەوان میکێلس چاوێکی لێ کرد. کوڕە لاو گوتی:

- مەبەستم ئەوەیە کە بۆ تۆڵە ئەستاندنەوەی بابم ئامادەم.

- چەند ساڵی؟

- حەڤدە ساڵ.

- کە وابوو وەدوای کاری خۆت کەوە.

ئەوەی گوت و ڕکێفی لە ماینی‌دا و ڕێگای کاندی گرتە بەر.

# ٧

مانگی ئەپریل بە یادی موسیبەتەکانی مەسیح و بە خۆشی و ترسی ئادەمیزادەکان تێ پەری.
هاو دەمەکانی هەتاو ریکەوتووی مانگی مای: سەوزی و گیلاس و فەریکە گەنم و قوزە و ترش و شیرین پێ دەگەیشتن.

گەرمای توند دەست پێ دەکرا. تورک و مەسیحی ئارەقەیان دەکرد، خۆیان باوەشین دەکرد، نووری بەگ هەروا لە جێدا دەینالاند. داخی مانوساکاس دلّی پالەوان میکلیسی داگرتبوو. شاری کاندی پەشێو و شیواو سەبرووکە دەی نەپراند. ریش سپیەکانی مەسیحی لە مالّی خەلیفە کۆبوونەوە تا لە بارەی دوارۆژی یونانیەکان بریار بدەن. بەگ و حاجیەکانیش دەچوونە بارگای پاشا، تا لە بارەی چەشنی قەتلعامیمەسیحیەکان وتوویژ بکەن. کریت جارێکی دیکەش لە سەرلێواری هەلّدێران راوەستابوو.

رۆژی ٢٩ی مانگی مای، تاریک و روونی بەیانی زەنگوڵەکانی کلیسا بە دەنگی خەفەتبار، وەدەنگ هاتن. مەسیحیەکان بە سەر لێ شێواوی لە جێ دەرپەرین. دەیانزانی ئەو رۆژە ، بۆ دوا رۆژی مەسیحیەت چی بە دواوەیە. لە نێوەراستی کلیسا کەشەفێکی گەورەی پر لە هەلّوا دەبینرا. لە لای راست و، چەپی کەشەفەکە، دوو مۆمی گەورە کە سەریان بە دووگەلّ رەش کرابوو، دەبینران. لەسەر هەلّواکە بە خاکە قەند، بە پیتی گەورە، بە بادام و دارچینی وردکراو نووسیبوویان: «کونستانتین پالئولوک»(١)

مەسیحیەکان لە دەورو بەری کەشەفیهەلّوا کۆ ببوونەوەو گوێیان بۆ مەرسیەکان هەلّخستبوو. پیاو ماقولّەکانیکاندی بە دەنگی خەفەتباری زەنگوڵەوە، چوو بوونە کلیسا. سێ ریش سپی گەورەک، پالّەوان ئەلیاس، حاجی ساواس و جەعلی تەلایی ئامادە بوون. پالەوان پولیکسینگیس، ستیفانیسی کەمیوان، کازاپاکیسی حەکیم باشی، ئاغاهاری لاتوسە تولّە و ئیدومنە وئاغا ئەریستۆتلیسی دەرمانفرۆش، هاتبوون بە دوای ئەوانەوە رەشایی وەک، دیمیتری پیتسوکولوس و کراسوگورگیس و ماستراپاس کاپاییس و باکێش و میستیگری و برتولو ئاغا پاراسکەواسی سەرتاش، راوەستا بوون. لە پشت سەری ئەوانەش مەسیحیەکانی شاری کاندی کۆ ببوونەوە.

پالّەوان میکلیس-یش ئامادە بوو، بەلاّم نەچوو بوە ژووری کلیسا، بە کراسی رەش و دلێکی پر لە خەم و خەفەت لە پێش کلیسا راوەستا بوو.

لەو رۆژەوە کە براکەیان ناشتبوو، هیچ قسەی نەکرد بوو. خوێن لە دەمارەکانیدا دەکولّی و لە

---

(١) دوا ئیمپراتووری بیزانس بوو کە سالّی ١٤٠٣ لە *Constantin Paleolgue* دیناعی قسطنطیەدا لە بەرامبەر پەلاماری تورەکاندا کوژرا.

زەینی خۆیدا هەزار تەختەی دەکێشا. ئیتر نووری سەگ تووشی تەڵە بکا و تۆڵەی برای بە ناهەق کوژراوی لێ وەستێنێ. ئیتر نووری بە برای هاوڕێیان نەدەزانی. خوێن ببوو ئاو، ئەو ئاڵقەی ئەوانی پێکەوە وەسڵ کردبوو، پچڕابوو. لەگەڵ ئەوەش کە زانیبووی نوری بریندارەو لە کۆشکی کلاو قەرەنگی خۆیدا لە گەڵ مردن دەستە و یەخەیە. عەلی ئاغای نارد، تا خەبەرێک بزانێ. لە نۆکەرانی پرسیار بکا، ئاگاداری پتر وەدەست بێنێ. بزانێ داخوا نووری لە چ‌ێدایە؟ برینەکانی بەراستی جێگای ترسن؟ هەر ئەوێ ڕۆژێ عەلی ئاغا گەڕایەوە و خەبەری تازەی هێنا و گوتی:

– ڕاستە ئەو بەدبەختە بریندارە.

– دەزانی کوێی بریندارە؟

– باتووی بریندارن. وادیارە براکەت دەرفەتی هێناوە کە خەنجەرێکی دەنێو لنگان بکا. مستەفا پاپاو برینەکانی برژاندۆتەوە و مەڵحەمی تێداون. بەڵام ئەو بەدبەختە دەناڵێنێ و حالی شپرزەیە. من خۆم لە بەر دەرگاوە گوێم لە ناڵەو هاواری دەبوو.

پاڵەوان میکێلس برۆی تێک نان. مادام کە نووری نەخۆش بوو ئەی دەتوانی دەستی لێ بدا. دەبوایە چاوەڕوانی بێ، هەتا چاک دەبێتەوە. بەڵام تاکەی؟ پاڵەوان میکێلس بەتالووکە بوو.

ئەو تەواوی شەو لەو خەیاڵەدا بوو، بەیانی بە دەنگی زەنگوڵە وەخەبەر هاتبوو، گوتبووی: «با بچینە کلیسا، وەک دەڵێن چس گورگ دەیەوێ، وەعزان دایدا، پێم وایە ئەو جاریش ئابڕوومان دەبا!».

بە حاڵێکی شپرزە جلی کردە بەرو بەرەو کلیسا کەوتە ڕێ. لەبەر ئەوەی کە نەیدەویست کەس ببینێ و سڵاو لەکەس بکا، ڕیشووی شەدەکەی بە سەر دەم و چاویدا بەردابۆوە و لە بەر خۆیەوە دەیگوت: «ئاخر ئەو بەستەزمانە و کزۆلکە خوێندەوارە، لە کوێ دەزانێ گەرماوێ قوستەنتەنیە چۆن بوو و پاڵەوانی و کوشت و کوشتار مانای چییە؟».

هەر بەو جۆرە کە پالی وەپەنجەرە دابوو، کەشەفی گەورەی پڕ لە هەلۆای نێوەڕاستی کلیسا و خەلکی دەوروبەری و خەلیفەشی دەدیت کە لە هەموان کەلەکەتتر بوو، سەر تاپێ جلی ڕەشی کرد بوو بەرو تۆزێکی ڕەشی لە دەوری کلاوەکەی هالاند بوو. کلیسا وەقەبرێکی سەرداپۆشراو دەچوو کە ڕووناک بوەو ناڵە ناڵی خەلک لەوێدا، دەنگ دەداتەوە و مەیتێکی گەورەش لە گۆڕێ دانراوە.

لە پڕ دەنگی ناڵەی خەلک برا. خەلیفە بۆلای چس گورگ ڕووی وەرگێڕا و ئیشارەیەکی کرد. پاڵەوان میکێلس نێو چاوانی بە ئارەقەی سڕیەوە و چاوە خڕەکانی لێک کردەوە. براکەی دیت کە بۆ نێزیک تەختی خەلیفە سەرکەوت و چەند پەرە کاغەزی لە گیرفانی هێنا دەر. پاڵەوان میکێلس دڵی گوشراو چاوی دەزاری براکەی بڕی.

مامۆستا دەستی کرد بە قسە. لە پێش دا منگە منگی کرد و پاشان کۆخە گرتی و دەلەرزی و دەنگی نەدەبیسرا. پاشان وردە وردە دەنگی کرایەوە: قوللەو بورجەکانی قوستەنتەنیە خۆیان هەڵکێشا و زەنگوڵەکانی کلیسای سێنت سۆفی کەوتنە ناڵەو هاوار کردن. ئەو کاتە ئەو پەلامارە ئاخر شەرە دەست پێکرا... خەندەکەکان وەها لێوالێوی خوێن بوون کە گوێلەکە دەیتوانی مەلەی تێدا بکا. لە پڕ ئیمپراتور کوستانتین بە لەشی بە خوێنەوە، لە کاتێکا کە بە پەردەیەکی بخووررو

کەندور داپۆشرا بوو، لە نێوە راستی کەشەفی هەڵوا دیار کەوت.
پاڵەوان میکێلس چاوە بە فرمێسکەکانی سڕیەوە. بە سەر سوڕمانەوە تەماشای براکەی دەکرد. پێی سەیر بوو کە چس‌گورک ئەو هەموو تین و توانایەی لە کوێوە هێناوە؟
ئەم خێلە شاڵوار تەنگە، ئەو پشت کوڕە، ئەو هەموو گیان و حاڵەی لە کوێوە پەیدا کردوە؟
کاتێ چس‌گورک رووی کردە پەیکەری مریەمی‌پاکیزە و دەستی بۆ درێژ کرد و هاواری کردو گوتی:
- مەگەری ئەی مریەمی پاک، مەگەری، ئاخرەکەی رۆژێک قوستەنتەنیە دەستێنینەوە!
خەلیفە ئامێزی لێک کردەوە و چس گورگ کەوتە ئامێزی و هەرتک دەستیان کرد بە گریان. خەڵک لە دەوری ئەوان پاڵەوپەستەیان بوو، دەگریان.
ماموستا پاڵی وە میحرابی خەلیفەی دا، چاویلکەکانی سڕیەوە و رووی کردە خەڵک تا بزانێ دوانگلیوەی خێزانی بۆ بیستنی وتاری ئەو هاتوە یان نا. بەلاّم وانگلیو نەهاتبوو، چس گورک تەق کەوتە سەر کورسیەکەی. کاتێ نوێژی مس تەواو بوو، پاڵەوان میکێلس خۆی گەیاندە براکەی و گوتی:
- باش بوو ئابرووی ئێمەت نەبرد!
چس گورک هێشتاسەر گەرمی وتارەکەی خۆی بو لە خەیاڵی‌دا، تورک هێشتا پەلاماریان دەهێناو قوستەنتەنیەیان ویران دەکرد. ئاوڕی داوە و چاوی لە براکەی کرد. دیار بوو قسەی براکەی نەبیستبوو. پرسی:
- میکێلس چت گوت؟
میکێلس گوتی: هیچ!
هەر دووکیان چەند هەنگاوێک پێکەوە رۆیشتن. ماموستا ماندوو ببو. بە یەواشی و بە بێ دڵخۆشی بەرەو ماڵێ کەوتە رێ. پاڵەوان میکێلس لە بنەوە تەماشای دەکرد. بەراستی لەو رۆژەوە ژنی هێناوە، چەندە کزتر بوە. پشتی دەرپەڕیوە و لاقی خوارو خێچ‌تر بوون.
پاڵەوان میکێلس بە دەنگێکی نەرم پرسی:
- وەزعی ماڵەوەت چۆنە؟
چس گورک لە پێشدا وەلاّمی نەداوە. لە پڕ قوستەنتەنیەی لە بیر چۆوە و ئاگری پیرۆزی هەناوی کوژایەوە و پاش تاوێک لە وەلاّمی برای‌دا گوتی:
- میکێلس، ئەوە ژیان نیە کە من هەمە.
- بۆچی؟ چما چت لێ دەکەن؟
- هیچ تەنیا هەموو کرومانن. لەگەڵ من ناپەیڤن و کە پشتم تێ کردن، لە قاقای پێکەنین دەدەن.
- ئاخر تۆ گەورەی ماڵی خۆت نی؟ تۆ چ پیاوێکی؟ ئەو هەتیوە دەرکە!
- ئەگەر ئەوی دەرکەم، ژنەکەشم دەڕوا.
هەر تکیان بێدەتگ بوون. گەیشتبوونە بەر دەرگای ماڵی چس گورک. پاڵەوان میکێلس راوەستا و پرسی:

- ئێستا هەر تک لەماڵەوەن؟

- بەڵێ، تاوێک لێک جیا نابینەوە. چوونکە هەتیو نەهاتبوە کلیسا، خێزانیشم نەهاتبوو. تۆ ئەو خوایە میکێلس ئەوەش بوو بە ژیان؟

چس گورک لە خەفەتان دەنگی دەر نەدەهات. پاڵەوان سگی پێ سووتاو گوتی:

- گوێ بگرە ئاغا ماموستا. من ئێستا دێمە ژوورو هەر تکیان لە ماڵی وەدەردەنێم.

ماموستا سڵ بوو گوتی:

- بۆ خاتری خوا نەکەی ئەو کارە مەکە، تۆزێ بوێستە و منیش سەبر دەکەم، با بزانم..

- چ بزانی؟

چس گورک لە کاتێکا رووی وەر دەگێرا گوتی:

- بابزانم چۆن دەبێ...

ئەوەی گوت و چوە پشت دەرگا و بە چەکوچ لە دەرگای‌دا.

پاڵەوان میکێلس سەری سوور ما و پرسی:

- چۆن؟ تۆ کلیلت نیە؟

- نا... ئەوان کلیلم نادەنێ. من دەبێ لە دەرگا بدەم، تا بێن دەرگام لێ بکەنەوە.

پاڵەوان میکێلس بە تووڕەیی چەکوچەکەی لێ ئەستاندو هاویشتیە کۆڵانێ و لە کاتێکا بە توندی بۆ لای لەنگەرگا دەچوو گوتی:

- دەمەوێ لە بەیانیەوە، تۆ کلیلت هەبێ!

* * *

پاڵەوان پولیکسینگیس لە دوکانی پاڵەوان میکێلس چاوە روانی هاتنەوەی ئەو بوو. پاش نوێژی بیر زیندوو کەرەوەی مس، هەر لە جێ هاتبوە دوکانی پاڵەوان میکێلس تا قسەی لەگەڵ بکا. ئەوەی دەیویست لەگەڵی باس بکا، دەربڕینی فرە دژوار بوو. هەر بۆیەش لەسەر کورسیش حەجمینی نەبوو. جار جار رادەبوو. لە دوکان‌دا دەهات و دەچوو. پاشان بە مرچ و مزنی‌دادەنیشتەوە. وکاریتوس‌ەی نارد، پیالێک قاوەی بۆ بێنێ. سیگاری پێ دەکردو پاش تاوێک دەیکوژاندەوە. ئەوەی دەیویست لەگەڵ پاڵەوان میکێلس باسی بکا، چەند جار لەبەر خۆیەوە دوو پاتەی دەکردەوە. لەخۆی دەپرسی کە چۆن و لە کوێوە دەست پێ بکا تا پاڵەوان تووڕە نەکات. ئەو پاڵەوان میکێلسی خۆش دەویست و رێزی لێ دەناو نەی دەویست دۆستایەتی ئەو لە کیس بدا. بە پێچەوانە هەوڵی دەدا تا بناخەی ئەو دۆستایەتیە پتەوتر بکا. هەر بۆیەش هاتبوو کە ئەمرۆ قسەی لەگەڵ بکا. تەنانەت بەندێکی رەشبشی لە دەوری تەقبلەکەی هالاندبوو تا نیشان بدا کە لە مەرگی مانۆساکاس‌دا تازیەدارە. بە کوڕەکەی شاگرد دوکانی گوت:

- کارتیوس- تا ماڵی مامت بچوو، بزانە رەنگە لە ماڵێ بێ. پێی پێژە کەقسەکەی تەواو نەکردبوو کە پاڵەوان میکێلس گەیشتەوە بەر دەرگای دوکانەکەی. سەبارەت بە گیراتی قوستەنتەنیە و قسە ئاگرینەکانی چس گورکی برای، رووترش و تووڕە بوو. بە تایبەت پتر لەوە تووڕە بوو کە کلیلیان نەدابوو بە براکەی، بچێتەوە ماڵی خۆی. کە چاوی بە میوانی بانگ نەکراو

کەوت پتر تێکچوو، بەڵام نارەزایی خۆی لە هاتنی ئەو شاردەوە و گوتی:
- سلاو پاڵەوان پولیکسینکیس.
- سلاو پاڵەوان میکێلس.
پاڵەوان میکێلس، کلاو پێچەکەی لە سەر هەڵگرت و سرخمە چنراوەکەی داکەند و دانیشت. پاشان لە سەر مێزەکە دەفتەرێکی هەڵگرت و دەستی کرد بە باوەشێنی خۆی، بەڵام بێدەنگ بوو. پاڵەوان پولیکسینکیس کە لەو بێدەنگیە نارەحەت ببوو گوتی:
- چەندە گەرمایە!
ئەوی تر هەروا بێدەنگ بوو، قوتوە سیغارەکەی هێنا دەرو بە گرژی و هیلاکیەکی ئەوتۆ کە دەتگوت ئەت دوایی نایە، دەستی کرد بە سیغار هەڵبەستن. پاڵەوان پولیکسینکیس تونچکە سیغاری خۆی فڕێدا، کۆخەیەکی کردو کورسیەکەی تۆزێ بردە نیزیک و گوتی:
- پاڵەوان میکێلس، من هاتووم لەگەڵ تۆ قسان بکەم.
- بلێ... گوێت دەدەمێ.
- پاڵەوان میکێلس بە ناوی دۆستایەتی کۆنی خۆمان سوێندت دەدەم کە گوێ بۆ قسەکان رابگرە و لە سەر خۆ بە. بۆ ئەوە کە باش لێم تێ بگەی، پێویستە لەسەرەتاوە من دەست پێ بکەم.
- گوتم، گوێت دەدەمێ.
من پێشتریش هەولم دەدا کە لەو بارەوە چەند قسەیەکت لەگەڵ بکەم، بەڵام هەموو جارێ توورە دەبووی و نەت دەهێشت قسەکانم تەواو بکەم بەڵام هاوڕێ، ئێستا ئیتر پێویستە کە گوێ بۆ قسەکانم رادێری. کەوا بوو پشووت لە سەرخۆ بێ و گوێ بدەیە.
- من گوتم گوێت دەدەمێ. کەوا بوو، درێژەی مەدەیە و شێرو رێوی مەهێنەوە و راستەو راست چت گەرەکە بیژە و قەراخیشی مەکێشە.
لەو کاتەدا کارینوس لەسەر ئالقەیەکی بەرزی تەنافەکانی پاپۆر دانیشتبوو گوێی دەدایە. بۆ ئەوە کە ئەو کورە قسەکانی نەبیسێ، پاڵەوان پولیکسینکیس رووی تێ کرد و گوتی:
- رۆڵە کارینوس، دابچوو قوتوە توونتنێک و بەستە سیغارێکم بۆ بکرە.
کارینووس بە بێ وازی لەسەر تەناف هاتە خوارو بە دوای توونتن و سیغار کەوت. پاڵەوان پولکسینگیس بۆ سەرەتای قسە گوتی:بەلێ... پاڵەوان میکێلس من هاتووم تا لە بارەی... بەڵام قسەکەی تەوان نەکردو بێدەنگ بوو.
پاڵەوان میکێلس گوتی: دەبیژە ئیتر بیژە!
- تا لەبارەی ئامینەوە قسەت لەگەڵ بکەم.
پاڵەوان میکێلس لەسەر کورسیەکەی هەستا و چوە بەر دەرگای دوکانێ و چاوێکی لە لای لەنگەرگا کرد و بەڵام هیچی نەدیت. تەنیا پەڵە هەورێکی رەش لە ئاسمان دەبینرا کە جاروبار بریسکەیەکی دەدا. پاشان دووکەڵێکی رەشی هاتە بەرچاو. دەتگوت شاری گاندی دەسووتێ. گەراوە و بە چاوی داگیرساو لە توورەیی لە سەر کورسی دانیشت. دەنگێکی گڕ بە قین لە گەرووی هاتە دەرو گوتی:

- پاڵەوان پولیکـــــنگیس، تۆ باش دەزانی من قـــەی سووک و بیٚ ئەدەبانەم پیٚ خۆش نیە. قـــەی ژنان کاری تۆیە و نەک کاری من. چوونکە هاتوویە دوکانی من، بیٚ ئەدەبی دەبیٚ دەرت بکەم، بەلاٚم ئەو باسە بگۆڕە!
- گویٚ بدەیە پاڵەوان میکێلس. ئەوەی گەرکمە پێت بێژم، بیٚ‌ئەدەبی نیە. لە خۆوە تووڕە مەبە. ڕاوەستە قـــەکانم تەواو بکەم. ئامینە دەبەوی بێتە سەر دینی مەسیح.
پاڵەوان میکێلس بە تووڕەیی دەنکە بادامێکی سەر مێزی هەڵگرت و لە دەستی‌دا شکاندی و گوتی:
بێگومان ئەگەر تۆ کاتولیک بای، ئەویش دەبوو بە کاتولیک، تۆ یەهودی بای، دەبوو بە یەهودی.. کەوا بوو دەتەویٚ سووکایەتی بە ئاینی مەسیح بکەی.
پاڵەوان پولیکـــــنکیس قینی خۆی خواردەوە و گوتی:
- ئەو دەبێتە مەسیحی و منیش مارەی دەکەم.
- تۆ دەتەویٚ بیهێنی؟
بە تووڕەیی بەرگی دەفتەرەکەی دڕی ولەت و پەتیکرد و پاشان بە ئاهەنگێکی شەیتانانە تفێکی لە عەرزی کرد وگوتی:
- بەبە... بەراستی پیرۆز بابێت لیٚ دەکەم.
پاڵەوان پولیکـــــنگیس هەستی کرد کە سەری دەماسیٚ، پیچ و کلاٚوەکەی هەڵگرت و پێچانیەوە ولە سەر ئەژنۆی خۆی داناو بە مۆڕی تەماشایەکی پاڵەوان میکێلسی کرد. کە ڕەنگی سەوزو سوور هەڵدەگەرا. لە دڵی خۆی‌دا گوتی: «ئەی بەرازی لەعنەتی دڵپشت یتزقی، قـــەی منت پیٚ خۆش بیٚ یا ناخۆش، دەبیٚ تا ئاخر گویٚ بدەیەی».
پاڵەوان میکێلس بۆ ئەوەی میوانەکەی تیٚ بگەیەنیٚ کە ئەشیٚ بڕوا و ئیتر قـــەی لە تەکا ناکات، ڕاست بۆوە، بەلاٚم ئەوی‌تر نەبزووت و گوتی:
بەڵیٚ، پاڵەوان میکێلس،من هاتووم تکات لیٚ بکەم کە بێی و ببی بە شاهیدی مارە کردنی ئێمە.
پاڵەوان میـکێلس دەستێکی بە ڕیشی خۆی داهێناو گوتی:
- من! من بیٚ ئیحترامی بەو ڕیشە ناکەم، بۆ ئەو کارە بچوو ئەفەندی پەینەی بەرە. ئەو بۆ ئەم ئیشە لەبارە.
پاڵەوان پولیکـــــینگیس لە جێی خۆی ڕابوو. ئیتر نەیتوانی بە سەر قینی خۆدا زاڵ بیٚ. کلاٚوەکەی لە لا سەری دانا و کورسیەکەی بەردەمی توند ڕاتەکاند و گوتی:
- هۆی پاڵەوان میکێلس، تۆ ئیتر خەریکی قاچت لە بەڕەی خۆت پتر ڕادەکێشی!، ڕاستە تۆ پیاوی، بەلاٚم ئێمەش پیاوین. ئەگەر تۆ شەرت کردوون، ئێمەش شەرمان کردوە. ئەگەر تۆ بە سواری وەنێو قاوەخانەی تورکان دەکەوی، ئێمەش بە سواری وەنێو ماڵیان دەکەوین. ئەگەر تۆ هەناسەکێش دەکوژی، ئێمەش هەناسەکێش دەکوژین. ئەوەی کە تۆ قەت بزەت نایەتە سەر لێوان، مانای نیە کە مرۆڤێکی مەترسی‌داری. ئەوەش کە من هەمیشە پێدەکەنم، مانای نیە کە بۆ گاڵتە دەبم، کاتێک من لەگەڵ تۆ باسی ژنێک دەکەم کە دەمەویٚ بیهێنم، تۆ دەبیٚ بە ئەدەب بی و

ئاگات لە زاری خۆت بێ.

پاڵەوان پولیکسینگیس بێدەنگ بوو. بەڵام لە بەر تووڕەی کەنی هەڵدەخراند. پاڵەوان میکێلس هەموو شتێکی بە سووری دەدیت، چاوی لە چاوی بریبوو گوێی بۆ قسەکانی راگرتبوو. لە جیاتی ئەوەی تووڕەتر بێ، دەهاتەوە سەرخۆ.

تا ئەو کاتە پاڵەوان پولیکسینگیس لە ئاخافتنەدا دوو دڵ بوو، قسەکانی بۆنی ترس و پارانەوەیان لێدەهات، تا ئەو دەمەی کورسیەکەی لێ نزیک دەکردەوە و بە هاوڕێ و برا ناوی دەبرد و کلاوەکەی کە تەنۆلی وەشی لێ دروو بوو، بۆ سەرنج راکێشانی ئەو نیشانی دەدا. پاڵەوان میکێلس دەیویست پشت ملی بگرێ و لە دوکان وەدەری نێ و بە بێژوو مێباز و بەدئەخلاقی ناوبەرێ. بەڵام ئێستا کە پاڵەوان پولیکسنگیس پیاوانە بە توندی لەگەڵی دەدوا، خۆشەویستیەکە زیندوو دەبۆوە. بیرەوەریە کۆنەکانی دەهاتنەوە بیری. دووبارە پولیکسینگیس دەدی کە بە سواری خۆی بە لەشکری تورکان دا دەدا و قەت ئاوڕی لە پشت سەری نەدەدایەوە.

... دیارە ئەم دوو پیاوە لە هیچ بارێکەوە، ڕێک نەدەچوون. بەڵام ئەو ئافەرینی لە پولیکسینگیس کردبوو. بە دڵ بیوە دۆست و برادەری. ڕۆژێک پولیکسینگیس پێی گوتبوو بە پێکەنینەوە، تۆ دەتەوێ بە ئاخ و داخ کریت ئازاد بکەی، بەڵام من دەمەوێ بە گۆرانی ئەم کارە بکەم». کاتێک شەر تەواو دەبوو. ئەم دووە لێک جیا دەبوونەوە. پاڵەوان میکێلس هەمیشە دووری لێ دەکرد. بە مێ باز و ئەحمەق و سەرسەری ناودەبرد. بەڵام ئێستا کە پولیکسینگیس پیاوانە لە بەرامبەری‌دا ڕێستا بوو، وەڵامی دەداوە، بیرەوەریەکانی سەردەمی شەری وەبیر هاتەوە و هەستی دۆستایەتی کۆنی لە مێشکی‌دا زیندوو دەبۆوە. دەستی درێژ کرد و بە دوو قامکان سرخمەی چنراوی پولیکسینگیسی گرت و گوتی:

– پاڵەوان پولیکسینگیس! تۆ مرۆڤێکی ڕەشیدی و من ئەوە باش دەزانم. بەڵام لێرە برۆ، نامەوێ لەگەڵ تۆ کلاومان تێک هاڵێ.

ئەوی‌تر گوتی: «منیش نامەوێ پاڵەوان میکێلس، بەڵام تۆ هێندێ جار کافرم دەکەی.»

پاڵەوان میکێلس لە کاتێکا سرخمەی پولیکسینگیسی گرتبوو، سەبر سەبر بۆ لای دەرگا دەیکێشا، دووپاتەی کردەوە:

– گوتم برۆ!

پاڵەوان پولیکسینگیس کە بەرەبەرەکانی دەکرد گوتی:

– کەوا بوو تۆ من لە دووکانەکەت دەردەکەی؟ بەڵام من قسەیەکی دیکەشم هەیە، تا ئەوەت پێ نەڵێم، ناڕۆم.

– زوویە بێژە.

– من لە لای ئامینەوە هاتووم. ئامینە خۆی منی نارد تا تکات لێ بکەم، ببی بە شاهیدی مارە کردنمان.

پاڵەوان میکێلس گوتی: ئامینە خۆی... قسەکەی خواردەوە. چونکە لەو ناوە بێزار بوو. ئەو جار چنگی هاویشتە سرخمەی پاڵەوان پولیکسینگیس و بە دەنگێکی توند گوتی:

– باشە، بەسە، واز بێنە، ئیتر باسی ئەو قسەیە مەکە.

هەر تکیان لە دەرکی دوکان بوون. پولیکسینگیس دەستێکی بۆ ئاسمان درێژ کرد کە لەبەر گەرمای هەتاو هەلگەرا بوو گوتی:

– با وابێ پاڵەوان میکیلس، رۆژێک دێ لەم کردەوەی خۆت پەشیوان دەبیەوە.

* * *

هەر ئەو رۆژەکاتی رۆژ پەڕ کە خەلکی کاندی لە پشتی دەرگا داخراوەکانیان خەریکی نان خواردنی شەو بوون، ژنێکی تەڵەر بە هەنگاوی ئەژماردە، لە کاتێکا چەتری هەڵدابوو لە دەرگای سەوزی ماڵی نووری دەدا. کارەکەری رەش گورج دەرگای لێ کردەوە. «سێ لورعیەتان» کە لە پشت پۆسە خۆیان گرتبوو، گوتیان: «گۆیا ئامینە هێشتا نەخۆشەو ئەوەتا حەمیدە مەلا دەچی ئاگای لێ بێ».

لەو کاتەدا، کارەکەری رەشی مەسیحی کە لە خۆشیان وەسەما کەوتبوو، لە حەساری وەپێش میوان کەوتبوو، رێنوێنی دەکرد. زیندەوار لە باخی دانەبوو. دەرکەوانی رەش لە باڵەخانەی کلاو ئەرەنگی لە بن سەری ئاغاکەی‌دا مابۆوە. فانووسی سوور و سەوزی ماڵێش کوژابۆوە. هەوا تاریک بوو. باخی پڕ لە گوڵ بۆنی عەتری لێ دەهات و کارەکەری رەشیش لە خۆشیان سەمای دەکرد. چوونکە نووری راستەقینەی ئیمان، خانمەکەی ئەوی روون کرد بۆوە، ئامینە دەبوو بە مەسیحی و رۆژێک دەچوە بەهەشت. ئەگەر خوای رەحیم و میهرەبان لە رێگای لوتف و خۆشەویستی‌یەوە، چاوی لێک نابان و وەسەر خۆی نەهێنابایە، ئەویش لە پەنا خانمەکەی‌دا، لە دەرگای ئاڵتوونی بەهەشت دەچوە ژوورو دەیتوانی، سەدان ساڵ خزمەتی بکا.

ئەو خانمەی کە تازە هاتبوە ژوور، چەترو رووپوشەکەی لابرد و هاویشتیە سەر نێو تەخت. سەرو کەللەی پاڵەوان پولیکسینگیس وەدەر کەوت. کارکەری رەش گوتی:

– پاڵەوان، خانمی من لە وەتاغی سەرێ چاوەروانی تۆیە، دەیەوێ قسەت لەگەڵ بکا و لە پێکەنین خەنیت بکا. پاشان بە حالەتێکی سەیر تەماشای پاڵەوانی کرد. پاڵەوان پولیکسینگیس ئەو شەوە لە سەر حاڵ نەبوو، رۆژەکانی پێشتر کاتێک چادرە و رووپوشی فرێ دەدا، دەستی دەکرد بە سەما و پێکەنین. بێجگە لەوە هەمو جارێ، دەسماڵێکی ئاوریشم، یا جووتە پێلاوێکی سەر پێ‌یان، یافوتو شیرنی و باقلاوەی لەگەڵ خۆی دەهێنا، بەلام ئەم شەو دەست بەتاڵ و مات و گرژ بوو. لە جیاتی ئەوەی وەک جاران بۆلای ئامینە باڵ بگرێ و سێ پلیکانان بکاتە یەک و بچێتە سەر، بە کاوەخۆ دەفیکرەوە چوو وەسەر دەکەوت. بۆنی عەتر رێگای ژووری مەعشوقەی پێ‌نیشاندا. ئامینە دەنگی پێ‌یانی ناسی. ئەو ژنە جوان و نیوەرووتە لە پێش پەنجەرەی کە بە سەر باخ‌دا، دەکراوە و لەوێوە هەوایەکی فێنکی هەڵدەمژی، لە سەر نیو تەختێک راکشابوو، چاوەروان بوو.

ئەو شەوە ئەویش بە کەیف نەبوو، لەو کاتەدا جارێک هەناسەی هەڵدەکێشا جارێک پێدەکەنی، ئەویش ئەوە بوو کە داخوا پاڵەوان میکیلس، ئەو بەرازە بە سامە چی وەلام دەداتەوە. فیکرێکی دیکەش وەپێکەنینی دەخست، ئەویش چارەرەشی نووری بەگ بوو. هەر ئەوێ رۆژێ بەیانی مستەفا بابا بە دلێکی پڕ لە داخو حەسرەتەوە هاتبوە لای ئەو، هەموو شتێکی بۆ باس

کردبوو. گوتبووی: «ئەو ئیتر نابێتەوە پیاو و دیارە ڕیش و سمێلی دەبێ، تەنانەت مووی لە ڕیشی دەمێنن، بەڵام ئیتر قەت پیاو نابێ. قوورەسەرە سەقەت بوە. ئەو تا ئێستا نووری بوو، لەمەو بەدوا نوورییەیە!»

ئامینە خۆ پێڕانەگیرا بوو دەستی کرد بوو بە پێکەنین و گوتبووی:

- مستەفا بابا، ڕەنگە وردە وردە مووەکانیشی بوەرێنی و دەنگی وەک دەنگی ژنان ناسک بێ و پاش چەند ساڵ مەمکیشی بێن!

- ڕەنگە، بەڵێ وێ دەچێ، بەڵام نابێ بە ژن.

ئامینە گوتبووی: «و نەقیرە نووری بەگ! حەیف نیە ئەو پیاوە ڕەشیدە، ئەو شێرەی عوسمانی بێ بە ژن؟ بەم حاڵە ئەو نە پیاو دەبێ و نە ژن. ناتوانێ ژنان زک پڕکا، منداڵیشی نابێ، واتە دەبێتە نێستر!» جارێک دیکەش لە قاقای پێکەنینی دا.

مستەفا بابا بە سەرسوڕمانەوە تەماشای کرد بوو، خورجینی هەڵگرتبوو، ڕۆیبوو، لە کاتی تێ پەڕ بوون بە نێو باخیدا، بۆ دووری لە چاوەزار، سەد جار تفی لە سینگی خۆی کرد بوو.

ئێستا پاڵەوان پولیکسینگیس لە بەرامبەر ئامینەی ڕاوەستا بوو. ئامینە باسکی لێک کردنەوە و بن هەنگڵی تەڕو بۆنخۆشی وەدەر خست و گوتی:

- بەخێر هاتی پاڵەوانی من، ئەستێرەی شەوی تاریکی من، بەخێر هاتی مێردی من! ئەو شۆ بە بێ حەجمینی چاوەڕوانت بووم. وەرە، خەبەرێکی خۆشم پێیە بۆ تۆ. خەبەرێکی ئەوتۆ کە لەبەر پێکەنین دەتکوژێ.

پولیکسینگیس لەو کاتەدا کە لەکن ئامینە درێژ دەبوو، گوتی:

منیش خەبەرێکم بۆ تۆ پێیە!

دەستی لە تەدی ئامینە وەرهێناو بە هەناسەی درێژ و قوڵ بۆنی بە سینگی ڕوونی ئامینە وە دەکرد. هەستی دەکرد کە ئەو لەشە گەرم و بۆنخۆشەی لە نێو باسکەکانیدا، دەتوێتەوە و دەبێتە هەڵم و دەچێتە نێو لەشی ئەو.

لە پڕ تەواوی خەم و خەیاڵی لە بیر بردەوە و دنیا بە جارێک لە بەر چاوانی وون دەبوو. بەڵام پولیکسینگیس تووڕس و قەبە بوو. ئامینە لە ژێر قورسایی لەشیدا دەهات بخنکێ. بە خۆشی و بەڵام بە پەواشی سەری لە سەر ڕوومەتی خۆی لاداو گوتی:

- تۆ لە پێشدا خەبەرەکەم پێ بێژە. کاتێک هاتیە ژوور تێک چوو بووی. بۆ چما ئەو خواهیشتی ئێمەی ڕەت کردەوە؟

پولیکسینگیس لە ئامینەی جیا بۆوە و دنیا دووبارە بەو هەموو سەرنێشەوە هاتەوە بەرچاوی. گوتی:

- بەڵێ... ئەو خواهیشتی ئێمەی ڕەت کردەوە.

- لەعنەت لە زاتی. بۆچی؟ چی گوت؟

- هیچی نەگوت. کابرا خۆی گرژ کردبوو، پیاو لێی دەترسا. ئەوەندە پەشۆکابوو، بەرگی دەفتەرەکەی دڕ بەدڕ کرد. سرخمەی منی گرتبوو، دەیویست لە دوکانیم وەدەرینێ. بەڵام منیش تووڕە بووم، هەرچی بەسەر زمانم داهات پێم گوت و بێ ئەوە کە بە هەندی بگرم ئوسکوتم کرد.

ئامینە قاچە چکۆڵەو بەخەنەکانی لە دیواریدا و بە دەنگی بەرز گوتی:
- نا، پولیکسینگیس ئەوە بەس نیە! قەت ئەوەندە بەس نیە. تۆ دەبوایە بیکوژی.
بەدەنی پاڵەوان پولیکسینگیس لەرزی و گوتی:
- ئەوی بکوژم؟
- بەڵێ، بەڵێ. تۆ ئەشێ بیکوژی، دەنا پیاو نی. تەنیا ژن وەڵامی سووکایەتی و جنێو بە قسە دەدەنەوە. وەڵامی پیاوان کوشتنە.
- من پاڵەوان میکێلس بکوژم؟
- ئەو نەخوایە نە جانەوەری درندەیە کە لێی بترسی. بەراستی دەبێ شەرم بکەی!
ئامینە یەخەی کراسی خەوی گرت و دایدڕی. سینگی سپی و سۆل و نەرمی کەوتە بەر شۆقی چرا و ئارەقی نێو مەمکانی هاتە خوار و بە نارە نار گوتی:
- دەمەوێ ئەو کابرایە وەک ئەو کراسەم دابدڕم و دەستی کرد بە گریان.
پاڵەوان پولیکسینگیس کە حەپەسابوو، ویستی لە ئامێزی بگرێ و بیلاوێنێتەوە. بەڵام ئامینە پاڵی پێوەنا و لە خۆی وەدوور خست. چوو لە قوژبنێک خۆی مەلاس داو ئیتر نەدەگریا. پێکەنینێکی تاڵ دایگرت و بە قینەوە مستی لە دیواری دەدا و گوتی:
- پولیکسینگیس! لەو رۆژەوە کە دیتم پاڵەوان میکێلس بە دوو قامکان تیسکانی ئارەقی شکاند، نووریم لەبەر چاو کەوت. چونکە نووری نەیتوانی ئەو کارە بکا. تۆش ئاگات لە خۆت بێ، ئەو پیاوەی من لە ئامێز دەگرێ، ئەشێ لە دنیادا تاک بێ.
- من نامەوێ ئەو بکوژم!
- تۆ ناتوانی ئەو بکوژی!
پاڵەوان پولیکسینگیس قاچی لە عەرزیداو دووپاتی کردەوە:
- نامەوێ بیکوژم.
بارێکی وەحشیانەی بەسەر سەرو سەکوتیدا هاتبوو. هەر تک چاوی وەک خەنجەری تیژ دەچاوی ئامینەی بریبوو.
کاتێک ئامینە پاڵەوانی بە توورەیی دی، کەیف خۆش بوو. بۆنی توندی پیاوەتی لە لەشی داگیرساوی پاڵەوان پولکسینگیس دەهات. کونە لووتی ئامینەی وەلەرزین کەوتن و باسکی لێک کردنەوە و گوتی:
- پاڵەوانی من، پیاوی ئازای من، لاق لە عەرزی بدە، توورە بە، هاوار بکە، لەو کاتەدا تۆم خۆش دەوێ!
پاڵەوان پولیکسنگیس بە تەواوی کەوتە نێو مەمکەکانی ئامینەوە. کاتێکی بە چاوی شلەقاو مووی تەری ئارەقاوی و بە پشوو سواری، راست بۆوە، دەتگوت لە قوولایی تۆقیا نووسێنگی لێڵ و تاریک هاتۆتە دەرێ.
ئامینە کە هێدی ببۆوە و رانە تووکاویەکانی پاڵەوانی دادەماڵی، وەک کۆتر دەی گماند و دەیگوت:
- ئەوینی من، مێردی من، قارەمانی من...

پاڵەوان پشت لە دیوار واکشا بوو، بە چاوی خومارو کەیفێکی لە رادە بەدەر لە تەماشای جوانی ئەو ژنەدا نوقم ببوو. هەرای نێو شار، واتە سەگ وەرو گزرانی دووری ئەوینداران شەو گەری دەبیست و لە پشت پرژانگە کانیەوە، تەماشای ئامینەی دەکرد کە خەریکی ران داماڵینی ئەو بوو. لە بەر خۆیەوە دەیگوت:

- «بەڵێ، لە دنیا دا هیچ شتێکی لە ژن باشتر نیە! هیچ شتێک!».لە کاتێکا مەعشوقەی توند لە ئامێزی گرتبوو، لە جامی پێکەبشتنی سەرخۆش ببوو، کەیف خۆش بوو کە بە پیاو دروست کراوە، بە وەش شاد بوو کە ئامینە ژنە و خودا بەو سنگ و زاوو زک و بە ژن و بالایە دروستی کردوە. پزەیەکی هاتێ و باسکە توند و خۆش تراشی مەعشوقەکەی داماڵی و گوتی:

- ئامینە نارەحەت مەبە. شاهیدێکی دیکە پەیدا دەکەین و باشتریش دەبێ. تەنیا تۆ پێویستە ئەوانەی لە بارەی ئایینی خۆمانەوە فێرم کردووی، لە بیریان نەکەی. قەشە هەندێ شت لێ دەپرسێ، تۆ ئەشێ وەڵامی بدەیەوە.

خانمی تورک بە پێکەنینەوە گوتی:

- مەترسێ پچکۆلانەکەم، من ئەو شتانەم هەموو لە بەرە. دەبێژی نا، بپرسە تا بزانی.

پاڵەوانیش پێکەنی و گوتی:

- باشە، ئەوا من قەشە مانۆلی-م تۆش خانمی تورکی و هاتووی بێیە سەر دینی ئێمە. جیددی بەو فیکرت کۆ بکەوە. من پرسیارت لێ دەکەم و تۆش وەڵام دەدەیەوە.

- زۆر باشە. من گوێت دەدەمێ بەڵام رێگا بدە هەر دەستت پێدا بێنم. تەیدی چییە من تۆ بلاوێنمەوە؟

- نا، قەی ناکا. تۆ بلاوێنەوە. تەنیا ئەوەی لێت دەپرسم، گوێ بدەیە:

- داخوا بروات بە خودا هەیە؟

- بەڵێ، بروام بە خودا هەیەو لە بەرامبەر گەورەیی ئەودا، کرنوش دەبەم.

- داخوا خودا تاق و تەنیایە؟

- ئاخ... لەو بارەدا، زەینم تۆزێ مەخشوشە. خودا، هەم یەکێکە و هەم سێیان. باوک و کور و روح القدس. باوک پیرەمێردێکی ریش سپی و زەلامەیە کە لاقەکانی لەسەر پەلە هەورێک داناوە. کور روومەتەکانی وەک سوورە گوڵ وانە. جوانەو قوزە. سمێلی وەک سمێلی تۆ خورمایین و خەتێکی بە نێو قژەکانیدا هاتوە. بەڵام کلاوی لە سەر نیە. تزبێکی بەدەستەوەیە.

- ئەو تۆپ نیە، ئامینە، کچم، ئەو دنیایە.

- فەرقی نیە، هەر تکیان بەکن. لەسەریان کوترێک لە فرین دایە و لەو کوترانەیە کە لە هەوا سەر مەقولات دەدەن.

- ئاخ... ئامین، چەند جار پێت بلێم ئەوەی تۆ دەیلێی، کۆتر نیە، ئەو روح‌القدسە.

- بەڵام لە ولاتی ئێمە بەوانە دێژن کۆتر.

- زۆر باشە، درێژەی پێ بدە!

- خودا بە ئاشکرا سێن، بەڵام سێ نین یەکە. بیوورە، پولیکسیتگیس، من ئەم نوختەیە باش نازانم.

– راستیت دەوێ، ئامینە، منیش سەرم لێ دەرناچێ، بەڵام ئەوە گرنگ نیە، ئەسڵ باوەڕە. تۆش باوەڕت هەیە.

– بەڵێ... باوەڕم هەیە.. چەند جاری دوو پاتە کەمەوە کە هەمە.

– باشە درێژەی پێ بدە... مەسیح چی‌یە؟

– مەسیح کوڕی خودایە. من گوتم ئەو جوان و قۆزە. لە ئاسمانەوە هاتۆتە سەر زەوی و بۆ ڕزگاری ئادەمیزادان خۆی فیدا کرد. بەڵام ئادەمیزاد چی‌یان بە سەر هێنا. لە چوار مێخدیان‌دا. بۆ ڕۆژی سێ‌یەم زیندوو بۆوە و دووبارە چۆوە ئاسمانان. ئەوەی دەیڵێم ڕاستە؟

– زۆر باشە. بە ڕاستی ئامینەی خۆشەویستم، تۆ ئێستا ئەوەندە تەواو بووی، دەتوانی ببی بە خەلیفە. هێندی قاچەکانم بخورێنە.. باشە.. کەواتو ئەو دووبارە زیندوو بۆوە، بەڵێ؟

– ئەوەم جارێک گوت، هۆشت لە کوێ‌یە؟ بەڵێ.. ئەو زیندوو بۆوە.

هەر ئاوا بە بێ تەناف و نەردیوان، ڕاست وەک ئاکرۆباتێک چۆوە ئاسمان.

بەڵام پولیکسینگیس لێرەش مەسەلەیەک‌هەیە کە باشی تێ ناگەم....

– مەسەلەی چی؟ بێژە تا لە بۆت ڕوون کەمەوە.

– مەسیح خودا بوو، وانیە؟ کەوا بوو چۆن دەکرێ لە چوار مێخەی بدەن و بمرێ؟

هێشتا تۆ دێژی مردنی ئەو سێ ڕۆژی خایاندوە، بەڵام من لام وایە ئەو ماوەیە فرە زۆرە. کەوا بوو لەو سێ ڕۆژەدا خودایەک نەبوو؟

– بۆچی، باوک و روح‌القدس هەبوون.

– بەڵام‌تۆ گوتت ئەوانە هەر سێک یەکن. یانی هەر سێک پێکەوە لە چوارمێخە دراون و پێکەوەش مردوون. دنیا سێ ڕۆژ بێ‌خودا ماوەتەوە. تۆ لەو بارەیەوە چۆن بیر دەکەیەوە.

پاڵەوان سەری خوراند و گوتی:

– لەعنەت لە شەیتان، ئامینە، بڕوا بکە، منیش سەری لێ دەرناکەم، بەڵام ڕاوەستە، بەیانی لە قەشەی دەپرسم و وەڵامت لێ دەگێڕمەوە.

ئامینە قاقا پێکەنی و گوتی:

– باشە، باوکی پیرۆز، پولیکسینگیس، داخوا پرسیاری دیکەشت هەیە؟

بەڵام پاڵەوان چاوی سیس و خومار بوون. لەو حاڵەدا گوتی:

– من ئەم شەو فرە کارم کردوە و گێژم. چۆنە داستانی قەشە وەلا بنێن و لەسەر دۆشەک لێ‌ی درێژ بین؟ چراکە بکوژێنمەوە؟

– ڕاستی لەمنت نەپرسی، چ خەبەرێکی خۆشم بۆ تۆیێ‌یە؟ لە بیرت چوو لێم بپرسی؟

– ئاخ ئەی ژنی لەعنەتی، کاتێک سنگی ڕووت و سپی تۆ دەبینم کە دەڵێی بەیان بەر دەبێ، ئیتر چۆن دەتەوێ شتم لە بیر بێنی؟

ئامینە لە کاتێکا لە پێکەنین شین دەبۆوە، سەری بردە بن گوێچکەی پاڵەوان و سرتەیەکی کرد. پاڵەوان چاوەکانی لێک کردەوە و هاواری کرد:

– لەعنەت لە شەیتان، ئاخ کابرا فەقیرە!

بە قووڵی هەستی بە چارەڕەشی نووری بەگ کرد. گوێی لە دەنگی پێکەنینی ئامینە بوو، دڵی

دەکوشرا. ئامینە هەستا، چراکەی کوژاندەوە. بەلاّم پالّەوان هێشتا دانیشت بوو، پالّی وەدیواری دا بوو، لە تاریکی ڕامابوو، بیری لە پڕوپووچی دنیا دەکردەوە.

* * *

پاش تەواو بوونی نوێژی بیرهەلگیرسیبینەری مس، ئاغا ئیدومنە ڕێگای مالّە ویران بووەکەی خۆی گرتە پێش. لە کاتێکدا فیکری دوور لە کاتدی لە ژێر عاسمانەکانی دیکە و لە زەمانەکانی دیکە، لە نێوان ئوروپا و ئاسیا،واتە لە قوستەنتەنیە دەسووڕاوە. مانگی مای بوو. لە خەوی خۆشی بەیان دابوو. شاری قوستەنتەنیە دەگیرا. تاریک و ڕوونی بەیانی، ئیمپراتور کونستانتین بە سواری ئەسپ لە پێش دەروازەی «ڕۆمی» شەڕی دەکرد. کافر دەوروەیان‌دابوو. ئیمپراتور هاواری دەکرد: «داخوا موسلمانێکی مەسیحی نی‌یە کە سەرم لە سەر زەوی هەلگرێتەوە؟ چاوەکانی ئاغا ئیدومنە لە بەر ئەسرین ڕەشکەو پێشکەیان دەکرد. ون بوو، بە کوێرە کوێرە بە کوّلاّنان‌دا دەسووڕاوە، تا خۆی لە لەنگەرگا دیتەوە. کاتێک چاوی بە دەریا کەوت، پاشە و پاش گەرایەوە.

ئاغا ئیدومنە ئەوڕ ڕۆژیّ جلی ڕەشی لە بەر کردبوو. قەیتانێکی ڕەشی لە کلاوەکەی دروو بوو، تیتولێکی ڕەشی پانتریشی بە نیشانەی تازیەداری لە باسکی بەستبوو. کاتیّ گەیشتەوە بەر دەرگای خۆیان، نیزیک نیوەڕۆ بوو. چوە ژوورو دانیشت. «دوکسانیا»ی بانگ کردو گوتی نە ئێوارە و نە نیوەڕۆ هیچ ناخوا. پێی گوت:

– من ئەوڕۆ بە ڕۆژوو دەبم. کاغەز و قەلّەمی هەلگرت، هەناسێکی هەلّکێشا و بە پیتی درشت و هەرەکەبی سوور دەستی کرد بە نووسین. پاشاگەلی قوستەنتەنیەش بە جەوهەری سوور دەیان نووسی. لەو ڕۆژەدا «کنستانتین پالئولوک»یش بە جەوهەری سوور بۆ ڤیکتوریای مەلەکەی ئینگلستان ئاوای نووسی:«دۆت مامی خۆشەویستم ڤیکتۆریا، ئەمرۆ ڕاست ٤٣٦ سال لە شەهید بوونم ڕادەبریّ. ئێستا کە لە ژێر خاک‌دا نووستووم، چاوەڕوانم کە پاتشاکاتی‌جیهانی مەسیحی‌تۆڵەی من بستێننەوە. ڤیکتۆریای خۆشەویستم، ئاخر من تاکەی ئەشیّ ڕاوەستم؟ تاکەی؟»

ئاغا ئیدومنە زۆر زۆو دەستی کرد بە گریان، دوو دلوّپ فرمێسک بە سەر نامەکەدا ڕژان و جەوهەری سووریان بلاّو کردەوە. ناچار پەڕێکی دیکەی دەست دایە، بە دەستێک خەریکی نووسین بوو، بە دەستەکەی‌تر، دەسرەیەکی بچووکی بە چاوانەوە گرت، تا فرمێسکەکانی بسڕێتەوە و ئەهێڵی کاغەزەکە تەر بیّ. پەیتا پەیتا دەینووسی و چاوەکانی پاک دەکردەوە و لە برسان دەمرد، بەلاّم ئازایانە بەر بەرەکانی دەکرد. ئەو تازیەدار بوو، سوێندی خواردبوو کە تەواوی ڕۆژ هیچ نەخواو نەخواتەوە و سیغار نەکێشیّ.

لای ئێواری «چس گورگی» دۆستی هاتەلای مامۆستاش ڕۆژێکی خەراپی بردبوە سەر دلّی پڕ بوو دەهات بتەقیّ. کاتێک لە پالّەوان میکێلس جیا ببۆوە، چووبۆوە مالیّ و ژنەکەی و ژن برا‌کەی دیبوو کە قیت و قۆز و بە کەیف لە حەساری دانیشتوون و خەریکی خواردنەوەی شیرو قاوەن و ئاتقیان لە بیسکویتەکانی جێژن بریوە. چس گورک سلاّوی کرد بوو. بەلاّم ئەوان لە جیاتی وەلاّم‌دانەوە، لی‌ی مۆڕ ببوونەوە. دەبوایە ژنەکەی هەستی و پیالە قاوەیەکی بۆ بێنیّ. تا

بحەسێتەوە، بەلاّم لە جێی خۆی نەبزووتبوو. براکەی چاوی لە خوشکی کردبوو. چاوێکی لێ داگرتبوو، هەر تک پێکەنی بوون.

چس گورک چووبوە ژوورێک و دەرگای لە سەرخۆ داخستبوو، نەخێر... ئەوە زیان نەبوو. نەیدەتوانی درێژەی هەبێ. ئەو رۆژە باش ئەو وتارە قارەمانیەی لە کلیسا دابووی، خۆی لە هەموو کاتێک بە هێزتر هەست پێ دەکرد. ئیمپراتور کونستانتین پیاوانە شەری کردبوو، ئەویش دەبوایە دەرسی لەو وەربگرێ. بۆچما ئەویش پیاونە بوو؟ دەبوایە خۆی بسەپێنێ. ئەو هەتیوە خوێزیە لە ماڵەکەی وەدەرینێ، خۆی ببێتە ئاغای ماڵەکەی خۆی. لەبەر خۆیەوە دەیگوت:

«ئەو ماڵە قوستەنتەنیەی منە. ئەوە کورە کافرێکی پەلاماردەرە و من ئیمپراتور کونستانتینم. ئەو شاری منی گەمارۆ داوە، دەیەوێ بە زۆر لێم بستێنێ. بەلاّم من بەرگری دەکەم... نەخێر، نەخێر ناهێلّم بمکوژێ، بەڵکوو من ئەوی دەکوژم!»

بەلاّم لەگەڵکوو [ رستەی] «من ئەوی دەکوژم» لە زاری دەرپەری، ترس هەڵی گرت و لە ترسی ئەوە نەکا گوێیان لە قسەکانی بوو بێ، تەماشای دەوروو بەری خۆی کرد. لە پەنجەرەوە سەری خوار کردەوە و تەماشای حەساری کرد. وانگلینوی دیت کە سەری بردۆتە بن گوێچکەی براکەی و قسەی پێ دەڵێ و هەرتک قاقا پێ دەکەنن. دیار بوو هەتیو خەوی دێ. باوێشکی دێنێ و بە چاوی خەوالوو، پێپەتی و بە جلی نارێکی کراسی خەو گوێ دەداتە قسەکانی خوشکی.

چس گورک بەری چاوەکانی تاریک بوو. لە پێش پەنجەرە لاچوو تا نەیان بینێ. لەسەر چاوان بە سەر تەرەوێلەدا کەوت. لە کاتێکدا کە لێوەکانی دەگەست: «من چ پیاوێکم، ئێستا دەچم تەمبێیان دەکەم!» ئەوەی گوت و لە ترسی ئەوە نەکا بڕیارەکەی بگۆڕێ خێرا رابوو لە قالدرمەکان چوە خوارو چوە حەساری. لە کاتێکا لە تووڕەیی یان چەنەگەی دەلەرزی، گوڕاندی:

- کڕ بن، ئەوە بە چی پێدەکەنن؟

ژنەکەی ناوری داوە، تەماشایەکی کردو دەستی بە زاریەوە گرت، تا پێشی پێکەنینەکەی بگرێ. براکەشی ئاوری داوە و خێنسەیەکی کرد و باوێشکی هاتێ و بە هەوایەکی بێ حاڵ گوتی:

- یانی چی ئاغا ماموستا، بۆچما پێکەنین قەدەخەیە؟

ماموستا لەوەلامدا گوتی:

- تۆ پاڵەوان پەمۆ، لێرە ماف و دەسەلاتت نیە، خاوەن دەسەلاتی ئەو ماڵە منم. ئاچی بە عەرزدادا و هێزێکی هاتە بەرو گوتی:

- کلیلی ماڵەکەشم دەوێتەوە و کلیل ئەشێ لە لای خاوەن ماڵ بێ.

«دیاماندیس» گوتی:

- ئەو قسە قۆزانە چن دەیانکەی؟ بێ ئەوە کە گوێ بداتە چس گورک، لە سەر تەخت لێی راکشا. زەلامی لەشی حەساری داگرتبوو. پاشان ئاوری لە خوشکی داوە و بە قامک ماموستای نیشان دا کە بە رەنگی بزرکاو لە پشت سەری راوەستابوو. گوتی:

- تۆ ئەو خوایە، تەماشای سەرو سەکوتی کە راست دەڵێی مێش گووی کردوە و دنیای پێ پیس کردوە.

وانگلیو ئیتر خۆی پێ ڕانەگیرا و هەرچەندە دەستی بە زاری گرتبوو، لە قاقای پێکەنینی‌دا.

چس گورک کە ئاگای لە خۆ نەمابوو، خۆی بە سەر ژنەکەی‌دا دا کە بێدەنگی بکاو نەڕاندی:

- سەلیتەی بێ‌شەرم تۆش؟

براکەی وای زانی کە لە خوشکی دەدا، لە سەر کورسی ڕاست بۆوە و قیژاندی و گوتی:

- ئاغا موعەلیم دەست ڕاگرە دەنا خۆت دەزانی! بە چاوی سووروو هەڵساو مستی لە چس گورک ڕاست کردەوە. مامۆستا داهاتەوە و لە بەر پشوو سواری و بۆنی شەراب و توتنی ژن برای دەهات بخنکێ. دیاماندیس هەر وا کە مستی ڕادەوەشاند و بە قیژە قیژ گوتی:

- برۆ وون بە، دەنا ئیستاوردوخاشت دەکەم چاو بەو دم و لووتەوە ئاغا موعەلیم کلیلیشی دەوێ... برۆ قەلە ڕەشە، برۆ خۆت لە دارێ بدە، دەنا بە شەق وەدەرت دەنێم. یەخە کەوای چس گورکی گرت و ڕایوەشاند و چەند جار بە دیواری دادا. لەو کاتەدا وانگلیو بە شانەی ئیسکی فیلی بروکینی، قژەکانی دادێنا کە لە خۆ پێدادانی مێردەکەی ئالۆز ببوون. لە پەنەوە تەماشای مەیدانی دەکرد و گوێی دەدایە و پێ‌دەکەنی. بە چاوی ئافەرین و دەستخۆشانە تەماشای قەدوباڵا و سنگی پان و باسکی بەهێزی براکەی دەکرد و بە چاوی سووکو گاڵتەوە، خنسەی لە مێردە تۆریوەکەی دەکرد.

چس گورک یەخەی لە چنگ ژن براکەی نەجات داو ڕای کرد بۆلای دەرکێ، بەلام پێش ئەوەی وەدەرکەوێ، ئاوری داوە و بە ژنەکەی گوت: «ئەوە نەبوو بە ژیان، ئەشێ کۆتایی پێ بینین.»

دیاماندیس کە وەک گا دەهاژا، گوتی:

- بەلێ، ئەشی کۆتایی پێ بدەی. لە بەر ئەوە کە ئیوارە و بەیان و نیوەرۆ سەرو سەکوتی نگریست دەبینم.. دڵم تێک دەچێ. ئەو ماڵە ئەوەندە گەورە نیە کە جێگای هەرتکمان ببێتەوە... پاشان ڕووی کردە خوشکی و گوتی:

- وانگلیو لە هەرتکمان یەکمان هەڵبژێرە. چس‌گورک پشووی نەدەهات و چاوەڕوانی بڕیاری ژنەکەی بوو. وانگلیو ئیترلە ئاوریشمێکی سەوزی دەزاری گرتبو، بە ئالۆزکە نەبوو کە وەلام بداتەوە. پاشان قژەکانی کۆ کردەوە و بە ئیتزلە سەوزەکە پێچانی. سەری ڕاوەشاند و خەرمانی پرچەکانی پشتیان داپۆشی و گوتی:

- من بە هیچ قیمەتێک لە برام جیا نابمەوە!

چس گورک کە بۆ چوونە دەر قاچی هەڵدەبڕی گوتی:

- ئەدی من چی؟

وانگلیو شانی ڕاوەشاند. دیاماندیس بزەیەکی هاتێ و لە سەر تەختەکە ڕاکشاوە و گوتی:

- بەدبەخت! تێ‌ناگەی، ئەوەتا دەرت دەکا. برۆ سەروسیپاڵت کۆ بکەوە، ئاغا موعەلیم.

چس گورک کەی دەرگای کردبۆوە؟ چۆن گەیشتبوە سەر شەقام؟ بۆچی خانوەکانی کاندی لە دەوری ئەو سەمایان دەکرد؟ داخوا بوومەلەرزە هاتبوو یان ئەو سەرگێژەی گرتبوو؟ ئەوانەی هیچیان نەدەزانی. تەنیا ئەوەندەی دەزانی کە لە کۆلانان ڕای کردبوو. دوو کەس لە قوتابیەکانی مەدرەسە، تراساکی و کوری کراسۆکتورکیس وەدوای کەوتبوون.

ترساکی گوتبووی:
- کابرا دەچێ لە سەر ئەو بورجەوە خۆ فڕێ داتە خوار. با بچین سەیری بکەین. ڕۆژی پێشوو ترساکی بیستبووی کە دایکی بە پاڵەوان میکێلس دەلێ:« وەزعی ماڵی براکەت باشە نیە. دەنگی کێشە و هەرایان دەگاتە ئێرە. وەک لێی بدەن وایە.»
پاڵەوان میکێلس لە وەڵامدا گوتبووی: «باشترە بچێ لەسەر بورجێ خۆ فڕێ داتە خوارێ».
ترساکی کە دیتبووی چس گورک بۆلای لەنگەرگا ڕادەکا. دەستی هاڤاڵەکەی گرتبوو. بە دوای ئاغا موعەلیمدا ڕای کێشا بوو. جارێکی‌تر گوتی:
- بێگومان دەیەوێ لەسەر بورجێ خۆ فڕێ بداتە خوار، با بچین سەیری بکەین.
بەڵام دیەنی دەریا چس گورکی هێناوە سەرخۆ. لە بن بورج و دیوارەکان دەستی کرد بە هاتووچۆ. پاشان لەسەر بەردێک دانیشت و ماوەیەکی زۆر سەیری دەریای دەکرد. ئەو دوو کورە خۆیان ڕانەگرت و گوتیان:
«ئەمڕۆ خۆی ناکوژێ. بە خۆڕایی کاتمان بەزایە چوو» بێجگە لەوە، نیوەڕۆ هەرتکیان برسی بوون. ناچار بۆ ماڵێ گەڕانەوە.
کاتێک چس گورک لەسەر ئەو بەردە هەستا، ڕۆژ دەهات، ئاوا دەبوو. قینی نیشتبۆوە، چاوی وشک ببوونەوە و دڵی حەسابۆوە. لەو ماوەیەدا کە ئارام و هێدی بەرەو ڕووی دەریا دانیشتبوو، بیری لە هیچ شتێ نەکرد بۆوە. بەڵام خوێن لە سنگی و لە هەناویدا، وردە وردە دەکوڵی. دەهات بڕیاریدا .دیارە خوێنی، نەک فیکری- چ بڕیارێک؟ چس گورک خۆشی هێشتا نەیدەزانی، بەڵام دڵنیا بوو کە بڕیارێکی داوە. هەر بۆیەش کاتێ لەسەر بەردەکە هاتە خوار، هەستی بە ئارامیەک دەکرد و بە ئارە ئارە دەیگوت: «هەموو شت باش دەبێ، خاوەن ماڵ هەر خۆمم!».چوە نێو کۆڵانە تەنگەکانی لەنگەرگا، لە گەرەکی جولەکان و ماڵتیان تێپەڕی. گەیشتەوە گەڕەکی خۆیان و لە پێش ماڵی ئیدومنە ڕاوەستا. سەری هەڵێنا، پەنجەرەی دۆستەکەی ڕوناک بوو. لە بەر خۆیەوە گوتی: «لەوانەیە هێشتا هەر خەریکی نامە نووسین بێ بۆ پاشایان. حەیفە چۆن کات بە خۆڕایی زایە دەکا! چۆنە بچمە سەرو هەندێ گاڵتە و گەپ بکەین. تا هەم بیرورای خۆم هەندێ بگۆڕێ و هەمیش ئەو تۆزێ دڵی بکرێتەوە».
لە دەرگای‌دا. «دوکسانیا» دەرگای کردەوە و بە دیتنی ئەو خۆشحاڵ بوو، گوتی:
- ئاغای من لە بەیانیەوە تا ئێستا پاروە نانێکی نەخواردوە. تۆ ئەوخودایە وەرە پاروەنانێکی دەرخواردە. ویستی خوا بوو کە تۆ هاتی!
ئاغا ئیدومنەش بە هاتنی چس‌گورک شاد بوو. لە نووسینی نامەکە ببۆوە، ناونیشانی سەر پاکەتی نووسیبوو. لاک و مۆری لێدابوو. بەیانی پۆست بۆ لەندەن دەچوو. لە کاتێکدا نامەی لاک‌و مۆر کراوی بە هاوڕێکەی نیشان دەدا، بە فیزەوە گوتی:
- خەڵکی وا هەن کە بە تفەنگ شەڕ دەکەن. بەڵام ئێمە دوو کەس و حاجی ساواس بە بیرو ئاقڵ شەڕ دەکەین. ئاخرەکەش هەر ئێمەین کریت ئازاد دەکەین.
موعەلیم سەری ڕاوەشاند. ئەو نەیدەتوانی باوەڕ بکا کە کریت بە نامەنووسین و کزکردنەوەی مەرمەری عەنتیکە ئازاد دەبێ. بە گرژی و بە هیلاکی و برسیەتی کەوتە سەر کورسیە کۆنێکی

دەستەدارو هەناسێکی هەڵکێشا و گوتی:
- ئەدی خۆمان ئیدۆمنە؟ کێ ئێمە رزگار دەکا؟
- کێ؟ کریتی خۆشەویست. کاتێ ئێمە کریتمان رزگار کرد، ئەویش ئێمە رزگار دەکا. رێگای بەختەوەری تاک و رزگاری هەر ئەوەیە و هیچی‌تر. تۆ پێت وایە کاتێ ئێمە بۆ رزگاری کریت خەبات دەکەین، چ دەکەین؟ بۆ رزگاری روحی خۆمان خەبات دەکەین.
بەڵام مامۆستا هەروا سەری رادەوەشاند. چاوێلکەکەی کە لەبەر هەوای شەداری دەریا تەمی کەوتبوە سەر، خەریک بوو پاکی دەکردەوە. ئیدومنە بە تووڕەیی ڕابوو، گوتی:
- باوەڕ ناکەی؟ پێت وایە رێگای دیکە هەیە؟ تۆ تازە ژنت هێناوە و هۆشت لەسەر خۆ نیە. بەڵام کاتێ کوڵ و کفی ژن هێنانت دامرکا، لە گەڵ من هاوبیر دەبی. ئەوەی بزانە کە بەختەوەری تاکی بۆ من و تۆ نیە، ئێمە کاتێ دەتوانین بەختەوەر بین کە بۆ بەختەوەری گشتی خەبات بکەین.
ئیدومنە بێدەنگ بوو. کیسە تووتنی خۆی دەست دایە کە سیغارێک هەڵبەستێ. بەڵام وەبیری هاتەوە کە تازیە دارە و ئەو رۆژە بە رۆژوو بوو. کیسە تووتنەکەی لەولای داناو لە دڵدا شاد بوو کە بۆ کۆمەڵ فیداکاری کردوە. سەری کە پێش وەخت رووت ببۆوە، بەرز کردەوە و بە فیزێکی تایبەتی گوتی:
- بەڵێ خۆشەویستم، ئەوەیە ئەم رازەی کە لەم «کاندی»یە، کەس ئاگاداری نیە. تەنیا رەنگە حاجی ساواس بیزانێ و تۆش پاشان لێی ئاگادار دەبێ. جارێکی‌تر بێدەنگ بوو. بەڵام دڵی هەروا لێواولێو لە فیز بوو. ئەو رۆژە دەرفەتی هێنا بوو کە ئەو رازە لەگەڵ دۆستی خۆی باس بکا. چەند ساڵ بوو، ئەو رازەی لە دڵی دامابۆوەو ئازاری دەدا. دەنگی بەرز کردەوە:
- تۆ پێت وایە من بۆچی نامە بۆ پاشای دەنووسم؟ پێت وایە بۆچی بە تەنیا لەم خانوە وێرانەدا، وەک کەسێکی دەقەبریان نابێ دەژیم؟ هاوار دەکەم؟
بەڵێ... بەڵێ، منیان زیندەبەگۆر کردوە. واتە نەک من، بەڵکوو، کریت!
ئەو کریتە کە هاوار دەکا. بەڵام کریت زاری نیە، من زاری ئەوم. تۆ لە بەر ئەوە کە بیرو باوەڕت نیە، پێت وایە من بە خۆرایی هاوار دەکەم و کەسیش دەنگی من نابیسێ. من لەوەڵامی تۆدا دێژم کە دەنگ قەت ون نابێ و ئاخرەکەی خەڵک دەی‌بیسن. بەر لەوە گوێچکە بوو بێ، دەنگ هەبوو. ئەوەندە هاوار کراوە، تا گوێچکە پەیدا بوە. بەڵێ، خۆشەویستم، تەواوی پاشایان و گەورە گەورانی جیهان کە من نامەیان بۆ دەنووسم، رۆژێک دەنگی من دەبیسن. ئەگەر خۆشیان نەبیسن، کوڕو نەوەکانیان دەی‌بیسن. ئەگەر ئەوانیش نەی‌بیسن، خوا دەنگی من دەبیسێ. هەر بەو دەلیلەیە کە خوا هەیە. تۆ باوەڕت چی‌یە؟ هەیە تا دەنگ ببیسێ؟ پێ مەکەنە ئاغا مرعەلیم، پێ مەکەنە... بەڵێ... من دەزانم کە هەموو من بە دین دەزانن، پاشملە لەگەڵ یەک سرتو خورت‌تانە و دەڵێن: «خوێندەواری فایدەی چیە!» قەی ناکا... هەرچی دەیانەوێ با بێژن. ئەوان هیچ شتێک لە خواو لە کریت و لە ئەرکی مرۆڤ تێ‌ناگەن. ئاخری رۆژێک خوا لەو ئاسمانە دەنگی من دەبیسێ و لە سەرووی ئاسمانان سەر بەردەداتەوە کریت دەبینێ و تەریق دەبێتەوە لەوەی کە چەند ساڵە لە کۆیلەتی‌دا رایگرتوە. ئەو دەم لە من کە ئیدومنە-م داوای لێ بووردن دەکا. زەنگوڵەکانی کلیسای سن‌میناس وەک رۆژی جەژنی پاک دەنگ دەدەنەوە و مەسیحیەکان دەرژێنە

سەر شەقامان و هاواری شادی و خۆشی بەرز دەبێتەوە.

کزلاتەکان پر دەبن لە لقی گوڵی نەستەرەن و ژن و پیاو بۆلای لەنگەرگا، بە پەلە دەکەونە رێ، تا چاویان بەشازادەی گەنجی یونان بکەوێ کە لە پاپۆر دادەبەزێ. هەموو یەکتر لە ئامێز دەگرن و هاوار دەکەن کە: «کریت زیندوو بۆتەوەو لە راستی‌دا رۆژی زیندو بوونەوەی کریت داهاتووە».

ئیدۆمنە چاوە بە فرمێسکەکانی پاک کردەوە، بەڵام تۆزێ سووکتر ببوو. مامۆستا بیری لە شتێکی‌تر دەکردەوە و هەڵاری ئاگری دزستەکەی، گەرمی نەدەکردەوە. بەڵام وەدەنگ هات و گوتی:

- بەڵام ئیدۆمنە هەژارەکەی من. تا ئەوڕۆژە لەسەر گڵکۆی ئێمە پێنک شین دەبێ ئێمە زیندوو بوونەوەی کریت نابینین و بە کوێڵەتی دەمرین. ئیدۆمنە، بۆیەکی هاتێ و بە دڵسۆزی سەیرێکی دزستەکەی کرد و گوتی:

-کەوابوو تۆ هێشتا هیچ تێ نەگەیشتووی. من بۆ ئەوەی هەست بە ئازادی بکەم، پێویست ناکا ئازادی ببینم یا دەستی لێ بدەم. من لە نێو جەرگەی کۆیلەتیش‌دا ئازادم. من چەند سەدە پێش ئەوە کە ئازاد بم، تامی ئازادی دەچێژم و بە ئازادی دەمرم. چونکە لە هەموو تەمەنم‌دا بۆ ئازادی تێ کۆشاوم.

مامۆستاکە لە فیکری ژنەکەی و ژنبرا بێکارەکەو کلیلەکەدا بوو کە نەیان دەدایە گوتی:

- من هیچی لێ تێ ناگەم.

برادەرەکەی گوتی:

- بێگومان رۆژێک تێ دەگەی تۆ ئێستا لە کاروباری ژیانی بێ نرخی خۆت‌دا گرفتاری، هەر ئەوانەن کە روحی مرۆڤ تێک دەشکێنن. روحی ئادەمیزاد وەک شێر وایە. کاروباری بێ نرخی ژیان، کێچن و لە لەشی شێر هاڵاون. بەڵام ئاخرەکەی شێر رۆژێک خۆی لە چنگ ئەو کێچانە رزگار دەکا.

ئیدۆمنە ئەوەی گوت و لە خۆشی ئەو بەراوردەی کرد بووی، قاقا پێکەنی، دوکسانیا لە دەرگا خۆی نیشان‌دا ئیدۆمنە کە پشتی لە دەرگا بوو، ئەی دەیت. پیرێژن بە ئیشارە مامۆستای تێگەیاند کە بچێ نان بخوا. مامۆستا لە خوای دەویست، لە بەیانیەوە هیچی نەخواردبوو. لەوکاتەدا کە رادەبوو گوتی:

- ورچی برسی سەمایە ناکا. تۆ قسەی ئەڵەو قەڵەو دەکەی و منیش لە خەمی ورگم‌دام. لە بەیانیەوە هیچم نەخواردوە و شەوی رابردووش لەبەر نووسین هەر بەخەبەر بووم. ئیدۆمنە گوتی:

- منیش هیچم نەخواردوە. بۆچما چ دەبێ؟ خواردنیش یەک لەو کێچانەیە کە گوتم.

ئاغا موعەلیم بە پێکەنینەوە گوتی:

- رەنگە وابێ بەڵام ئەگەر ئەو کێچانە نەبن، جەنابی شێر سەقەت دەبێ.

ئیدۆمنە دەستی لێک‌دان و پیرێژن وەژوور کەوت:

- دایەخانم، ئاغا موعەلیم دەڵێ برسیەتی. هەرچی هەمانە لە کەشەنێک‌دا بیهێنە!

دوکسانیا گوتی: بەچاوان. بە پەلە وەدوای راپەراندنی کارەکەی کەوت. ئاغاموعەلیم گوتی:

- دەبێ پێکەوە نان بخۆین. چونکە ئەگەر تۆ لەگەڵ من نان نەخۆی، منیش ناخۆم. ڕاستە کە تۆ لەبەرامبەر ڕۆژو گرتن‌دا، خۆت ڕادەگری. بەلاّم دەبێ نیشانی بدەی کە لەبەرامبەر خواردنیش‌دا، خۆڕاگری. چونکە من لام وایە کە برسیەتی و بێ بەشی و چلە گرتنیش وەک کێنج وان،

هەرتک دۆست پێدەکەنین. هەرتک بە ئاخافتنی‌گاڵتەو گەپ و پێکەنین و باسکردنی بیروڕای گەورە، داخی دڵیان دەڕشت. کەشەفی پڕ لە خواردن گەیشتێ. ڕوومەتی چرچ و لووچی دووکسانیا لە خۆشیان بریقەی دەهات.

ئیلزمنە بیری کردەوە کە ئەگەر لە خواردن‌دا کەمێک یاریدەی دۆستەکەی بدا، بڕیاری خۆی نەشکاندوە. هەرتک بە ئیشارە ملیان دەبەر خواردن نا. هێندێ شەرابی کۆن لە بنی کۆیەکەدا مابوو، ئەویشیان پێدا کردو دەیان گوت:

- بەسەلاّمەتی ئازادی خۆمان!

ئێستا تەواو شەو داهاتبوو. ئاغا موعەلیم لە فیکری ئەوەدا کەدەبێ زوو بچێتەوە ماڵێ.دەلەرزی.دۆستەکەی لێی پرسی :

- لە ژیانی تازەت ڕازی؟ ژیان لەگەڵ ژن هاسانە؟

مامۆستا لە پەنجەرە وەنیزیک کەوت و گوتی :

- ئیتر درنگ بوە. دەبێ بڕۆم! .

چل ڕۆژ لە ژن هێنانی چس گورک و لە مردنی مانوساکاس تێ پەڕی بوو. لەو گوندە سەر سەوزو خۆشە، تئودۆریس کوڕە گەورەی مانوساکاس نەی دەتوانی مەرگی بابی لە بیر بەرێتەوە. پاڵەوان میکێلس مامی سوورکایەتی پێ کردبوو. ئەو هێشتا تئودۆریس بە مێرمنداڵ دەزانی کە نەیدەتوانی خەنجەر هەڵکێشی و تورکێک بکوژێ. لی‌ی پرسی بوو: «چەند ساڵی؟»

«حەڤدە ساڵ»- کەوابوو خەریکی کارەکانی خۆت بە!» واتە لای پاڵەوان میکێلس حەڤدە ساڵ فرە کەم بوو. بەلاّم تئودۆریس پیاوێکی تەواو بوو. دەیتوانی لەگەڵ گاجوت بچێتە بەر ئێری و زەوی بکێلێ. دەیتوانی ژنێک وەسەر پشت گێرێ زگی پڕکا. دەیتوانی لەگەڵ حوسنی برازای نووری بەگ، کە لاوێکی بەهێز و کەلەگای گوندی «پتروکفالۆ» بوو، زۆرەوانی بگرێ و لە عەرزی بداو گێردی دەگەرووی ڕاپکا.

«چەند ساڵی؟» «حەڤدەساڵ»- کەوا بوو خەریکی کارەکانی خۆت بە!» ئەو ڕۆژە تئودۆریس بە کریستینای دایکی کە بە ڕەشپۆشی دەچوە سەر گڵکۆی مێردەکەی گوت:

- دایە، مامم سوورکایەتی پێ کردم.

دایکی لە وەلاّمدا گوتی :

- ڕاستە تئودۆریس، تۆ هێشتا زۆر گەنجی، ئەو کارەی بە مامت بسپێرە، ئەو تۆڵەی ئێمە دەکاتەوە.

- گەنگی دایە! گەنگی! سەی چلەی باوکمە و ئێمە بێ ئەوەی لە بیری ئەو دابین، دەخۆین و دەخۆینەوە. بۆچما ئەو قەت نایەتە خەوت؟ لە لای تۆ گازندە ناکا؟ هەموو شەوێ دێتە خەوی من و سەر کۆنەم دەکا.

لاو توند پێچی لەسەر هالاند و لە دوورەوە تەماشای گوندی «پترۆکفالۆ»ی کرد کە لەسەر سەوز و ئاوەدان لە بناری چیا دەدرەوشا و هەتاو لێی دابوو، لەم گوندە ئاغای تورک و رەعیەتی مەسیحی دەژیان. پێستی تنودوریس لەبەر هەتاوێ وەک مسی تواوە وەیٚ لیٚهاتبوو. لەشێکی زل و خاراوی هەبوو، بەلام پیس بوو. چەند دەنکە مووی رەشی لە روومەتی دەبینرا. هەر لە ئێستاوە سنگی تووکن بوو. لەگەلٚ مەروبەرانی بابی، لە چیا دەژیا و کەمتر دەهاتەوە گوندی. سالی رابردوو لە تەنیایی جارز ببوو، رۆژەکانی یەکشەمۆ دەهاتەوە گوندی تا بۆ تەماشا کردنی ژنان بچێتە کلیسا. ... ئاوی تیٚ دەگەرا. بەلام لە رۆژی کوشتنی باوکی، ئیتر نەچوو بۆوە ئاغەلی مەر و لە گوندی مابۆوە. لە جیاتی خۆی کونستاندیسی برا چوکەی بۆ ئاگاداری مەر ناردبوە چیا. ئێستا چەکمەی باوکی و سوخمەی گولٚ چنی ئەوی دەبەر دەکرد و مێزەرەی ئەوی لەسەر دەبەست. دارەدەستی ئەویشی دەست دابوویەو بیٚ ئەوە بە کەس بلیٚ، بە سبابەکی گرژ و لە بیرا چوو، لە نێوان داربەروە گەورەکەی گوندی سن ژان و ئاوایی پترو کفالو، هاتوو چۆی دەکرد.

ئەو رۆژە دارەدەستی هەلگرت و گوتی: «دایە من دەرۆم».

- بۆ کویٚ دەچی، کورم؟

- دەچمە پترۆکفالو. خۆت نەتگوت بۆ هەلوای سبەینیٚ، پێویستیت بە چەند هەناران هەیە؟ زۆر باشە، من دەچم هەنارت بۆ دێنم. بابە گەورەم هەناری هەیە.

دەسکی رەشی خەنجەری باوکی کە هێشتا هەر خویناوی بوو، لە لای پشتێندی هاتبوە دەر. ئەو رۆژە کە تەرمی باوکی لەبن دار بەروەکە، کەوتبوو، ئەو خەنجەرە خویناویەکەی لە دەستی وشک بووی باوکی هێنابوە دەریٚ. دایکی ویستبووی بیشواتەوە. بەلام تنودوریس گوتبووی: «دایە خوێن بە ئاوی ناشۆرێتەوە، خوێن تەنی بە خوێن بشۆرێتەوە». خەنجەرەکەی هەروا بە خویناوی لەبەر پشتی چەقاند بوو. لەو رۆژەوە دای نەدەنا. شەوانە دەبن سەری دەنا. دایکی پێی دەگوت: «کورم، ئەو خەنجەرە لەخۆت وەدوور خە. چونکە تا شەوان لەبن سەرتی بنیٚ، باوکت دێتە خەوت و لەخەودا ئازارت دەدا.» کور لە وەلامدا دەیگوت: «دایە هەر ئەوەم دەویٚ. دەمەویٚ باوکم بێتە خەوم و ئازارم بدا.» پاشان نشانەی خاچی دەکێشاو خەنجەرەکەی لەبن سەری دەنا.

تنودوریس کەوتە ریٚ و لە رێگا بەدار دەستەکەی بەردی بۆ ئەم لاولا دەپەراند دایکی کە دیتی کورەکەی وەک شەرانیەک لە چیا دەچێتە خوار، بانگی کرد و گوتی:

- ئاگات لە خۆت بیٚ تنودوریس، وریابە. بە دۆعای خێری من بی، رۆلە. بەلام کور نەدیبوو. کەروێشکێک لەبن گوێنی دەرپەری. تنودوریس پلارێکی رێهالاند و وەسەریەکی گێرا. قاچەکانی گرت و سەری لە بەردیدا و گوتی:

- ئەو کەروێشکە بۆ بابە گەورەم بە دیاری دەبەم. ئەو گۆشت کەروێشکی پیٚ خۆشە. شوکر هێشتا ددانەکانی هەموو ساخن و دەتوانیٚ بخوات شادر بە پێکەنینەوە. فیتووی لیٚدەدا و کەروێشک نیشانەی خۆشبەختیە. ئێشەلا حوسێنی دەگیر دەخەم و سەری دەهارم. بەلام حوسێن کەروێشک نیە، لە پێشدا زۆرەوانی دەگرین. ئەو مەلعوونە گەلێک بەهێزو بەقەوەتە.

تنودوریس دوو رۆژ پێش لەسەر خەرمان چوو بووە لای برازای نووری و پیٚی گوتبوو:

- هۆی حوسێن، دوو سبەی چلەی باوکمە. بانی رۆژەکەی مامی تۆ باوکی منی کوشتوە.

حوسێن بە زارە خوارەکەی گوتی :
- بە جەهەندەم، کوشتوویانە.
تێودوریس، شین هەڵگەرا بوو، لە ڤینان دەلەرزی. لەوێ نەی دەتوانی هیچ بە حوسێن بڵێ. حوسێن گوتبووی :
- چیبە کافری مەلعون. بۆ چاوان دەگێری؟ چت لە گیانی من گەرەکە؟ ئازانی کارم هەبەو خەرمان بە شەنە دەکەم؟ ئەگەر پیاوی وەرە زۆرەوانی بگرین.
- باشە بزانە چۆنت لە عەرزی دەدەم.
- تۆ پشتی من لە عەرزی دەدەی بەدبەخت؟ کەی؟ لە کوێ؟
- هەر لەو شوێنەی کە باوکم لێی کوژراوە. لە بن دار بەرزۆ گەورەکە. دوو سبەی بەیانی تا کەس نەمان بینێ.
- بە خەنجەرەوە؟
- بەڵێ بە خەنجەرەوە.
هەر تک لێک جیا ببوونەوە. حوسێن دووبارە خەریکی کاری خۆی ببۆوە و تێودوریسیش چوو بۆوە ماڵێ. لە بەر دەرگا چۆکی دادابوو، خەنجەری هێنابووە دەرێ. تا تیژی بکا. بەڵام لە ترسی ئەوەی، ئەوەک خوێنەکەی لێ پاک بێتەوە دەکالاتی نابۆوە. پاشان هەستا بوو، بۆلای ئەو دار بەرووەی کە تەرمی باوکی لێ کەوتبوو، کەوتبوە رێ و لە بن دار بەروو دانیشتبوو.
بەڵێ، کە دەچوە نێو گوندی پترۆکفالۆ، کیژێکی گەنجی دیت کە هاتبوو ئاو لە چالاو هەڵکێشێ. کیژەکە کە چاوی بە تێودوریس کەوت، لە شەرمان سوور هەڵگەڕا. دەیویست گۆزەی هەڵگرێ و بگەرێتەوە. بەڵام کە دیتی لە دوور تێودوریس چاوی تێ بریوە، راوەستاو چاوەروان بوو. کیژێکی ساخ و سلامەت و لە کەیف خۆشیان دەدرەوشا. لەشێکی تەرو لەباری هەبوو. چاوی کاڵ و شەبتانی و برۆی راکشاو، وەک شیر بریقەیان دەهات. وە کارمامزێک دەچوو کە لە دوور گوێ لە تەقەی تفەنگ بوو بێ و بە چاوی زەق و قوت و سڵ بۆن بە هەواوە بکا.
تێودوریس لە دوور دیتی و ئەویش سوور هەڵگەرا. لەبەر خۆیەوە گوتی: «ئەورۆ بۆم دێ. ئەویش فرۆساکی!».
دلی لە سنگیدا لێی دەدا. چاوێکی لە دەوروبەری خۆی کرد، کەسی لێ نەبوو. کیژە جحیلەکان، گۆزەیان پر کرد بوو، رۆیشتبوون. لە جێ خەرمانان جوتیاران گیزەیان دەکردو خەرمانیان هەڵدەاویشت. لە دنیادا، تەنیا «فرۆساکی» بوو کە رۆژ تا جێکی نووری لە سەر نابوو.
تێودوریس لە پێش چالاوێ راوەستا. لە بەر شلەژان قاچی دەلەرزین. بە دەنگێکی لەرزۆک، سڵاوی کردو چاوی بەردانەوە. بەلەکی جوانی کیژەکە لەبەر هەتاو دەدرەوشان. کچەکە بە نیگایەکی بە مەکرانە و ئازایانە تەماشای کردو گوتی :
- پاڵەوان تێودوریس، بەو کەروێشکەوە، بۆ کوێ دەچی؟ ئێستا ئیتر لەگەڵ کەروێشکان شەر دەکەی؟
لاو لەوەلاّمدا گوتی :
- نەخێر. شەڕم لەگەڵ تورکانە، تەنیا بۆ مەشق کردن کەروێشکان دەکوژم. تاوێکی کورت،

هەرتک چاویان تێک بڕیبوو. کوڕەکە ترساو چاوی وەرگێڕا. کیژەکە گۆزەی داناو سەبری دەوروبەری خۆیانی کرد، داعباش دیار نەبوو بە لاوەکەی گوت:

- تینووت نیە، تئودۆریس؟

- بۆچی! فرۆساکی، تینوومە، بەڵام کێ ئاوێ دەدا بە هەتیوێکی وەک من؟ کیژەکە گەردن و گۆنچکەی سوور هەڵگەران و چاوی دەعەرزی بڕی. تئودۆریس دەنگی نەرمتر کرد و گوتی:

- سبەی چلەی باوکمە. تۆ ئامادەی بێیە ماڵی ئێمە و بۆ هەڵوا لێنان یارمەتی دایکم بدەی. کچەکانی گوندی هەموو دێن.

فرۆساکی گوتی:

- ئەگەر دایکم رێگا بدا دێم. پاشان گوتی: «رێگاش نەدا هەر دێم. چونکە تۆ بانگم دەکەی. ئێمە لە پاڵەوان تئودۆریس بەدەر کەسمان نیە، وانیە؟ کەوا بوو ناشێ دڵی بشکێنین.

ئەوەی گوت و بۆ ئەوە حەز کردنی خۆی شاردبێتەوە، دەستی کرد بە پێکەنینی بە گاڵتە. هەر لەو کاتەش‌دا خەریک بوو بە چاوان بیخوا. زۆر شەوان بە بیری تئودۆریسەوە تا بەیانی بەخەبەر دەبوو. هەمیشە ئاواتی ئەوە بوو خۆزیا توانیبای، خۆی فیدای ئەو لاوە کردبا. دەیویست خۆی بە سەر داداو بە چنگ و نینۆک روومەتی بڕنێ.

تئودۆریس چەتەی وەسەردار دەستەکەی دابوو، تەماشای زەوی دەکرد. بیری لەوە دەکردەوە کە سبەی مل دەبەر ملی حوسێنی دەنێ رووی کردە کیژەکە و گوتی:

- فرۆساکی پێم بڵێ بزانم، ئەگەر بەڵایەکم بەسەر بێ، تۆ نارەحەت دەبی؟

فرەساکی بە ترسەوە پرسی:

- بۆچی تئودۆریس؟ بیر لە چی دەکەیەوە؟

- هیچم لێ مەپرسە فرۆساکی، تەنیا وەڵام بدەوە. ئەگەر بەڵایەکم بەسەر بێ تۆ نارەحەت دەبی؟

ئیتر کچە جوان خۆی پێ رانەگیرا و لە کاتێکا ئاوی لە چاوان گەرابوو گوتی:

- تئودۆریس لەم دنیایە بێجگە لەتۆ کەسی ترم نیە.

لاو لە خۆشیان هاواری‌کرد: کەوابوو، دەتوانی دڵنیا بی کە هیچ زیانێکم پێ ناگا.

دوو کیژی کەنج بە گۆزەوە دەگەیشتنە ئەوێ. فرۆساکی گورج چاوەکانی سڕیەوە، گۆزەی هاویشتە سەر شانی و وای نیشان دا کە تەماشای لایەکی‌تر دەکا. بەڵام نەیدەتوانی پێشی دڵە کوتەی بگرێ. تئودۆریس بە فیتو لێدان دوور کەوتەوە. کەروێشکی کوژراو بە باسکیەوە رادەژاند.

بەیانی ئەورۆژە، یەکشەمۆ، کاتێک نوێژی مسی بیرەوەری مانوساکاسی تەواو بوو، قەشە گریگۆری هاتە حەساری کلیسا. شوانێکی گەنج لە پەنا ئەو کەشەفێکی گەورەی پڕ لە هەڵوای بەدەستەوە بوو کە سەرەکەی بە خاکە قەند و بادام و دەنکە هەنار داپۆشرابوو. بە دارچین ناوی *مانوساکاسی لەسەر نووسرا بوو.* گوندی‌یەکان یەک یەک بە پێش قەشەدا رادەبردن و مستێک هەڵوایان هەڵدەگرت و لەبەر خۆیانەوە دەیانگوت: «خوا بی‌بەخشێ» پاشان زاریان پڕدەکرد و خەریکی خواردن دەبوون. سمیلیان بە خاکە قەند و دارچین دەبوو، لەبەر خۆوە دەیانگوت:

دەبەراستی چەند زوو چل رۆژ تێ پەری. کات چەند زوو تێ دەپەرێ! بەلام ئەوە کات نیە تێ دەپەرێ، ئەوە ئێمەین پیر دەبین!» پاشان جارێکی دیکەش باسی ئەخلاقی باشی مانوساکاس-یان دەکرد.

کاتریێنوی پیر، دایکی دەشتەوانی گوندی دەیگوت: شەوی پێشوو مانوساکاس لە نێو کۆلانەکانی گوندی دیوە کە سەرگەردان دەسووراوە. تەنانەت دەیگوت لە ترسان سەگەکە دەیویست بوەرێ، بەلام نەیتوانی زاری پێکەوە نێتەوە. پیاوێکی پیر نیشانەی خاچی کێشاو گوتی:

- فەقیر مانوساکاس! ئەوە بێگومان تارمایی ئەو بوە. بەد بەختە ئەگەر گۆڕرا هێشتا زۆر بە گوڕ بوو. دیارە باش ماوە و نایەوێ بمرێ.

یەکی دیکە گوتی: «دەبەوێ تۆلەی بستێنێتەوە. ئەدی ئەو پالەوان میکێلسە ئەو ٤٠ رۆژە چ غەلەتێکی کردوە؟

لەو کاتەدا کە هەموو گەرمیان کردبوو، کوکلیوس دەشتەوانی گوندی لە کاتێکا کە شەبپوری خۆی بەدەستەوە بوو، دەلەرزی و زمانی گێشا بوو گەیشتە حەساری کلیسا. قەشە لە هەلوا دابەشکردن ببۆوە. شوانەکە ئەوژنوی داداپوون گەشەفی دەلستەوە.

قەشە لە دەشتەوان وەنیزیک کەوت و خەلکەکە دەورەیان دان. قەشە پرسی:

- ها کوکلیوس، هەدادەو قسە بکە. دیسان خەراپ رووی داوە؟ خوا بۆ خۆی رەحمەمان پێ بکا.

- تەرمی حوسێنی برازای نووری بەگیان دیوەتەوە.

- لەکوێ؟

- لەبن دار بەروە گەورەکە.

- کێ کوشتویە؟

- خوا خۆی دەزانێ. گوندی «پتروکفالو» شلەژاوە. هەموو دەرگایان داخستوون. مەسیحیەکان تفەنگەکانیان پڕ دەکەن. تورکەکان تەرمەکەیان لە مزگەوت داناوە و سلاوی لێ دەکەن هەموو چەک دارن. تفەنگ و دەمانچە بە حەواوە دەنێن. هەرەشەیان کردوە کە دەچن گوندی سنژان ئاگر تێ بەردەدەن.

- ئەوە خەتای ئێمە نیە.

- وادیارە خەلکی سنژان و خێزانی مانوساکاس کوشتوویانە. تورکەکان وەک بارمتە، تێودوریس-یان دەوێ.

قەشە گوتی:

گورج یەکێک بچێ خێزانی مانوساکاس ئاگادار بکا. بە تێودوریسیش بلێ: زوو خۆ بکەبێنیتە چیا و خۆی بشارێتەوە.

لەو ماوەیەدا تێودوریس تفەنگ و دوو دەمانچەی زێوی باوکی، هەلگرتبوو، خورجێنی پڕ کردبوو لە خواردەمەنی، مجری باوکی کردبۆوە، ئالای یونانی لێ هێنابوە دەر و لە خۆی هالاندبوو، بێ ئەوە پێ رابگا دەستە خزمەتکارەکانی بشوانەوە، وەچیا کەوتبوو. تێودوریس کاتێک گەیشتە هۆلی مەرەکان تاوێک راوەستا و چەند راسپاردەی بە «کونستاندیس»ی برا چووکەی گوت و

گوتی بچێ بە دایکی بڵێ کە تێودۆریس ساخ و سەلیمە. وێڕانە گەیشتوە کە پێش ڕۆیشتن بێ سڵاوی لێ بکا. سەلکە پەنیرێکی گەورەی دەخوارچێن تاو بۆ بەرزترین لوتکەی چیای «سلنا» کەوتەڕێ. لەوێ لەگەڵ چەند شوانان بوو ئاشنا کە چەند جار مەڕیان لێ دزی بوو. پێکەوە بوونە دۆست. تێودۆریس بڕیاری دابوو کە بچێ لە ئاغەڵی مەڕی ئەوان دا خۆ بشارێتەوە. گوتبووی: «ئەگەر تورک سەربازی وە دوا بخەن، شەڕیان لەگەڵ دەکەم. دەستەیەک پارتیزان کۆ دەکەمەوە و دەست بە شەڕی چیا دەکەم و بانگی «یۆی یەکێتی» بەرز دەکەمەوە.

درەنگانێک پاش نیوەڕۆ، دوو تورکی چەکدار لە بەردەرگای ماڵی بیوە ژنی مانوساکاس، ڕاوەستان و لە دەرگیان‌دا. کەس جوابی نەداوە. دیسان لێیان‌دا، هەر جواب نەبوو. کەس نەهات دەرگا بکاتەوە. تورکێکی پیر بەوێ دا تێ دەپەڕی. چوو بوو لە چیا داران بکا. سڵاوی لەو دوو چەکدارە کرد و گوتی:

– لە تێودۆریس دەگەڕێن؟ ئەو ڕای کردوە بۆ چیا.

یەک لە پیاوەکان گوتی:

– برایە پیر. قسەی خۆڕایی مەکە. تۆ خۆت بینیت؟

– سوێند بە محەممەد ئەو کافرەم بەو دوو چاوانە دیت. بێژوو وەک ئەسب وەچیا دەکەوت. کە دیتم ترسام، خۆم مات کرد. کە سەرم هەڵێنا، ئیتر دیار نەبوو. ئەو دوواتە دەستیان کرد بە جنێودان و پاش ئەوەی دوو چەقوویان لە دەرگای ماڵەکەدا، ملی ڕێیان گرت و ڕۆیشتن. لە گەڕانەوەدا، لە دۆڵێک‌دا کە ئەو دوو گوندانە لێک جیا دەکاتەوە، تووشی کاترینو، پیرەدایکی دەشتەوان گوندی بوون کەتارمایی مانوساکاسی دیبوو. پیرێژن هەمبانەیەکی پڕ کرد بوو لە گیا و گوڵ و بۆ ماڵێ دەگەڕاوە، تا چێشتێک بۆ کوڕەکەی لێ نێ. هەرتک تورک غاریان دایەو سەریان بڕی. پاشان چەقۆکانیان بە گەڵای خەردەل خاوێن کردەوە. سەیرێکی پیرێژنیان کرد کە دەخوێنێ دەگەوزێ و قاقا پێدەکەنین.

* * *

لە ئاوایی‌یەکانی دەوروبەر هەرایەکی سەیر ساز بوو. تورک و مەسیحی پێک وەر بوون. پیاو کوشتن دەست پێکرا بوو. هەموو ڕۆژێ یا کەلاکی مەسیحیەکیان لە کۆڵانێ دەدیتەوە، سەری بڕابوو، یا تەرمی تورکێکیان دەدیتەوە کە لە باخ و یا لە چالاوی‌دا وشک ببوو. دەنگ و باسی مەترسی دار لە هەموو لایەکەوە وەک پریشکی ئاگر بڵاو دەبوونەوە و گوندەکانی دەسووتاند. ئاگر کاندی-شی گرتبۆوە.

ڕۆژێک نیوەڕۆ سلێمان، خولامی قولەڕەشی پاشا مەست بوو، یا تورکان سەرخۆشیان کرد و بە گژ گەڕەکی یونانیەکانیان‌دا کرد و پێیان گوت:

– سلێمان، هەرچی پێت دەکرێ، وابکە پاڵەوان میکێلس دەگیرخەی. ئەگەر پیاوی ئەوی بکوژە، خولامی ڕەش ئەو شیرەی کە پاشا ڕۆژی جەژن بە خەلاتی دابوویە، هەڵیکێشا و ئەڕاندن ڕووی کردە گەڕەکی یونانیەکان. مەسیحیەکان کە گوێیان لە نەڕەتەی ئەو بوو. منداڵەکانیان دەژووری کردەوەو دەرگایان داخست. ژن لە کاتێکا دەرگایان دادەخست، دەیان قیژاند: «وای

رەش هاتە.. رەش هات.»

کاتی نیوەرز بوو، مەسیحی بۆ نانخواردن دەچوونەوە ماڵێ. ئەوانەی تووشی قولەرەشی سەرخۆش دەبوون، رایان دەکردو گەیشتبانە هەر ماڵێک، لە دەرگایان دەداو خۆیان دەخستە ژوور، تێکرا دەیانگوت: «کریتی فەقیرا جارێکی دیکەش خوێنی دەرژێ».

هێندی دەترسان‌و ئاخ و داخیان بوو. هێندێکیش بە تووڕەیی لە ژێر عەرز خەریکی خاوێن کردنەوەی چەکە ژەنگاوییەکانیان بوون.

قولەرەشی مەست لە پێش کانی ئیلومنە راوەستا. ئارەق و گەرمای نیوەرۆ گەرمی داهێنا بوو. ئارەقەی لە سەرو ئەستۆو نێو رانان دەچۆراوە. داهاتەوە و سەری وەبەر فوارەی ئاوێدا تا فێنک بێتەوە. لەگەڵ ئاو بەخۆدا کردن، وەک گای دەهاژا. سەرانسەری ئەو گەرەکە لە ترسان دەلەرزی. لەو کاتەدا کە لنگی لە بەر یەک بردبوون و سەری دانواند بوو. لە نێو لاقانیدا چاوی بە پاڵەوان میکێلس کەوت کە لەو لاوە دێ. هەڵێ کێشا شیری و هاواری کرد و پەلاماریدا.

پاڵەوان میکێلس چاوی بە قولەرەش کەوت و راوەستا. بە خەیاڵی داهات کە بگەڕێتەوە. بەڵام شەرمی کرد. لە لای راستەی ئەو دەرگایەک کرایەوە و خاتون کراسوگئورگیس بە قژی شێواوی هاتە دەرو گوتی:

– بۆخاتری خوا پاڵەوان میکێلس. تۆ لێرە چ دەکەی؟ زوو وەرە ژوور. بەڵام پاڵەوان دەسرەی لە گیرفانی هێنا دەرو لە مەچەکی بەست. دەرگای بەرامبەریش کرایەوە. خاتو پێنلوپ لە پشت دەرکە راوەستا بوو گوێ دەدایە. کەمێک وەغیرەت کەوت و سەری بردە دەرو هاواری کرد:

– جیران هۆی جیران.. وەرە ژوور.

دەنگی لاقەزلەکانی قولەرەش دەبیسرا. زۆری لەگەڵ پاڵەوان میکێلس نێوان نەمابوو. دەرگی ماڵی پاڵەوانیش کرایەوە. خاتوکاترینا دەربەربەدەر و بەغار خۆی گەیاندە مێردەکەی و بە ناڵینەوە گوتی:

– میکێلس.. هۆی میکێلس، بەزەییت بە منداڵەکانت دابێ!

چاوی بە رەشی لەندەهۆر کەوت کە لە بەرامبەر مێردەکەی راوەستا بوو. دوانی بریقەیان دەهات و پێدەکەنی و چاوی دەکالانیدا دەسووران. شیری راوەشاندو پەلاماریدا و گوتی:

– چۆنی پاڵەوانی کافر.. ئێستا تەوات دەکەم.

ژنی پاڵەوان میکێلس ویستی خۆی باوێتە پێش و خۆ بکا بە مەتاڵی بەلای مێردەکەی. بەڵام راست لەو کاتەدا پاڵەوان مستێکی توندی لە ورگی قولەرەش دا نەراندی و وەعەرزی کەوت. لەشی پانایی کۆڵانی داگرتبوو.

پاڵەوان داهاتەوە، شیری لە دەستی دەرهێناو لە سەر لەشی دانا. رووی کردە ژنەکەی و گوتی:

– جێگای تۆ لە ماڵێیە، بچۆوە ژوورێ. هەرتکیان چوونەوە ژوور.

ژنەکەی لە وەتاغی سەرێ کراسێکی تازەی هێنا. پاڵەوان ئارەقەی کردبوو. کراسی گۆڕی، فێنک بۆوە، چاوێکی لە شیری تیژی قولەرەشی کرد و بزەیەکی هاتێ و گوتی:

– ژنەکە، ئەو شیرە بدە بە تراساکی، بەکاری میدادتاشینی دێ!

هەر ئەو شەوە لە گەرەکی «گولستان» دوو کوری گەنجی بانگدەری تورک، بیرتولدریی هەژاریان دەگیر خستبوو، پاش کوتابوویان و کلاوە حەسیرەکەیان لێ دڕاندبوو و ویستبوویان بالتۆکەشی لێ بسێنن، بەلاّم بیرتولدو، وەها توند هاواری کردبوو کە تورکەکان ناچار رایان کردبوو. شەوی دوایی بەیانی بانگدەریان دیتەوە، کە رووت و قووت لە دارچناریان بەستبوو، لە سەرمان رەش و شین هەڵگەرابوو، دەڵێن ئەو بەدبەختەیان وەها رووت کردبوو، تەنیا ریش و بەرگەدەی پێوە مابوو. بێجگە لەوە، بە شاڵی سەری، زاریان توند بەستبوو تا نەتوانێ هاوار بکا.

کاتێ لە داریان کردەوە و مشت و ماڵیان کرد و هاتەوە سەرخۆ، گوتی:

دوو مەسیحی یەکێ شەلّ و یەکێ بە سمێڵ، نیوە شەو لە ماڵیان هێناوەتە دەرو رووتیان کردوتەوە و هەر بەو تەنافەی کە تاوانبارانی پێ هەڵدەواسن، لە دار چناریان بەستوە. لە پێش دا ویستوویانە ریشی ببرن، بەلاّم مقەستیان پێ نەبووە، تفیان دە سەرو رووی کردوە و بۆ لای لەنگەرگا هەلاتوون.

کاتێ پاشا قسەکانی بانگدەری بیست، حوکمی کرد تا هەموو شەلی کاندی بگرن و بیانخەنە بەندیخانەوە. تەنیا پالەوان ستیفاتیسی‌شەلّ ما کە نەیانتوانی دەگیری خەن‌پاشان ئەمری کرد کە ئازاریان بدەن و رۆن گەرچەکیان تێبکەن تا وەزمان بێن و راستی بێژن. بەلاّم شەلەکان بە ئازایەتی دمیان هەلنەپچرا. پاش سێ رۆژان، پاشا لە ئازاردانیان ماندوو بوو، هەمووی ئازاد کردن.

سلیمانی قولەرەشیان گرتبوو. کاتێ پاشا لە شکانی بێ ئابڕوانەی ئەو ئاگادار بوو، بە دار دەستێ خۆی چەند داری لە سەرو سەکوتی دابوو، گوتبووی:

- رەشی مەلعونی پیس، تۆ ئابڕووی حکومەتی ئیمەت بردا هێشتا دەبویست زۆر قسەی دیکەی پێ بڵێ، بەلاّم لە تووڕەییان زمانی نەگەڕا بوو. وەک سەگ دەوەڕی و ئاوی بەلالغاوان‌دا دەهاتە خوار. ئاخرەکەی قولە رەشی دەچالاوێ هاویشت زنجیری ئاسنی دەلاق و دەستان کرد.

دوو سێ رۆژێ پێ چوو، بایەکی گەرم کە لە ئەفریقاوە دەهات، هەلیکرد. تۆزێکی نەرم و گەرم دەباری و دووکەڵی لێ هەڵدەستا. کاتی نیوەرۆ ئەوسەگانەی لە بەرتیسێ وەرکەوتبوون، دەهاژان. زەلاّم لە هۆش دەچوون تەنگەنەفەس دەبوون. هەندێکیش لە دەرکانی خۆیان دانیشتبوون و بە باوەشێنی حەسیر، خۆیان باوەشێن دەکرد و شەربەتی فێنکیان دەخواردەوە. «باپاپانیس» کە بازاری گەرم بوو، بە کوڵانە گەرمەکانیدا دەگەڕا و شەربەتی پڕ لە سەهۆڵی بە خەڵک دەفرۆشت. ئەو پیرە مێردە نەلە گەرمای هاوین دەترسا و نە لە سەهۆڵبەندانی زستانێ. تەنیا قازانج بوو لە زستان گەرمی دەکردەوەو لە هاوینێ فێنک. هەوا سارد بایەو گەرم بایە پلەی گەرمای بەدەنی ئەو هەر وەک یەک وابوو. لە هاوینی چاکەتی خوری دانە دەکەند و لە زستانی بالتوی نەدەکردە بەر.

لە مەزرایە شووتی گەیشتبوون و دەتەقێن. هەموو رۆژێ بەیانی بێستانچی باریان دەکرد و لە مەیدانی شار، لە بن دار چناری گەورە و یان لە سێ تاق وەسەریەکیان دەنان. شووتی و گندۆرەی زەردە و سەوز و کولەکە، وەک کێو هەڵدەدرانەوە. نۆ بەرەی هەنار و ترێ و هەنجیر هاتبوە بازارێ. زەوی بەرو بووی دەدا و میوە فرۆش پێ رانەدەگەیشتن کە بیفرۆشن. فرۆشیاری تورک و مەسیحی لە پێش خەرمانی شووتیەکیان هاواریان دەکرد و گەرووی خۆیان دەدڕاند. ئەوەندەی پێیان کرابا، لە گۆترە و یا بە کێشان دەیان فرۆشت. هەرچی مابایەوە، وەبەر قەتیران دەکەوت. لە

نیواریدا سەوزی و میوە کە مابوەوە، فرۆشیار هاواریان دەکردو دەستیان لێک دەدان:
- بەلاش.. بەلاش.. ئەو دەم پیرە مێردو منداڵی فەقیر کە لە دەوروبەر دەسووڕانەوە، تێ وەردەهاتن و هەرچەندی بۆیان چوویا، بە باخەڵ و ئامیزە دەیانبرد.
پاش رۆژئاوا کاندی باشتر پشووی دەداو بە گاوە خۆ لە تاریکایی دا نوقم دەبوو. خەڵک حەسارو ماڵەکانیان ئاو پرژێن دەکردو هەر شەوە لە ماڵێک کۆ دەبوونەوە و رایان دەبوارد. ئەوێ رۆژێ بەکشەمۆ لە حەساری ماڵی بای «کراسۆگنورگیس» کۆ ببوونەوە. خاتوون لە دایکبوونی «ئاندریکوس» کورە گەورەی جێژن دەگرت، کە لە رفاندنی کچی ئاغا «پاراسکەواسی» سەرتاشدا، لەگەڵ تراساکی هاوکاری کردبوو. بای «کراسوگنورگیس» شانازی بە کورەکەی دەکرد کە لە تووڕە بووندا، قاپ و دەوری دەشکاندن و لە «یاسەمینی» قەرەواشیشی دەدا. ئەو شەوە بە شانازی لە دایکبوونی کورەکەی، ژنەکانی دراوسێی بە هەڵوای خۆکرد بانگ کردبوو. ژنەکان لەگەڵ هەڵوا خواردن و پێ هەلاّ گوتن، دۆعایان دەکرد کە خودا تەمەنی «ئاندریکوس» درێژ بکا. ئەو لاوە ئەگەر لە چیایە، ببێتە پاڵەوان وئەگەر لە شارە، ببێتە تاجرێکی دەوڵەمەند. خاتو «ماستراپاس» بە پێکەنینەوەوە لێی زیاد کرد و گوتی:
«کچی ئاغا (پاراسکەواس) سەرتاش بخوازێ و ئەو حەسارە پر بکا لە کوڕو کچ»!
لەو کاتەدا کە گشتیان خەریکی هەڵوا خواردن بوون و گاڵتەیان دەکرد، مادام «پینلوب» بە دەنگی بزرکاو چاوی هەڵمساو، هەر بەو کراسە شرو چڵکنەی کە لە ماڵێ دەبەری دەکرد، وەژوور کەوت. بەر لەوەی لەگەڵ ژنەکان چاک و خۆشی بکا، دەستی کرد بە گریان. ژنەکان راست بوونەوە، دایان نا. خاتو «کراسوگنورگیس» شەربەتی ئاڵوباڵووی بۆ هێنا تا بێتەوە سەرخۆ. بەلاّم لەگەڵ شەربەت خواردنەوەش هەر دەگریا. لێیان پرسی:
- چ بوو، بۆچی دەگری؟
لەگەڵ خواردنەوەی قومی ئاخری شەربەت، بە گریانەوە گوتی:
- دیمیتروس..... دیمیتروس- وای.. خوایە.. قەوماوە!... نەخۆشە؟
- .... رۆیشتوە
- رۆیشتوە ؟..... بۆ کوێ ؟
- چەترەکەی رەست راوەتێ و رۆیشتوە
- ئاخر بۆ کوێ ؟
- دیسان وەچیا کەوتوە ...
- بۆ چی ؟ چی بەسەر هاتوە ؟
- هیچ ... چاریار لەسەری دەدا... چەتری هەڵدەگرێو دەڕوا. ئەوە تازە نیە.تا نیستا چەند جار ئەو کارەی کردوە.دوا جار کەچەتری دەستدابەو رۆیشت کاتی شۆرشی ساڵی ١٨٧٨ بوو.
بای کریسانتی خوشکی پاڵەوان پولیکبنگیس لەکاتێکابە هەرتک دەست لەئەژنۆی خۆی دەدا ،هاواری کرد کە ..
- ئەی وای... هاوسێ خۆشەویستەکانم، ئەوە نیشانەی خەراپە، بڕوا بە قسەی من بکەن بێگومان شۆرش بەرپا دەبێ. من ئەو دەستانەم لەبارمتە دادەنێم کە شۆرش بەرپا نەبێ.

- تۆ ئەو خوایە واز لەم قسانە بێنە ، شەیتان گوێی لێ دەبێ.

- گوتم هەر تک دەستم لەبارمتە دادەنێم کە شۆڕش هەڵئەگیرسێ. مشکی سەحرا چۆن بۆنی بولەرزە دەکا، ئاغا دیمیترۆسیش ئاوا بۆنی شۆڕش دەکات. دەزانن کە چەترەکەشی هەڵگرتوە.

بای پێناوب دوو بارە دەستی کردەوە بە گریان و گوتی :

- بەبێ پارەش ڕۆیشتوە... کێ چێشتی بۆ لێ دەنێ، کێ جێگای بۆ چاک دەکا؟ ئەو تەنیا چەترەکەی بردوە، بە چەتر چی پێدەکرێ؟ ڕەنگە ئەمجارەش هەر وەک جاران بە شاڵواری دڕاو بێتەوە لای من.

بای کراسز گێورگیس گوتی :« هێندە مەگری بای پێنلوب، لەجیاتی تۆ ئەوا من لەدەست ئەو مێردە بەرازەی خۆم شێت دەبم.»

بەڵام بای پێنلوب بە هیچ شتێ ئۆقرەی نەدەگرت.لەگەڵکو بۆ گریان زاری لێک دەکردەوە،بای کراسزگێورگیس دەوریەک هەڵواو دەنکە بادامی لە پێش دادەنا. پاشان بۆ ئەوەی باسەکە بگۆڕێ ڕووی کردە بای کاترینا و پرسی:

- هاوسێ خەبەری پاڵەوان میکێلس چیە؟ دەمێکە نایبینم.

خێزانی پاڵەوان میکێلس گوتی :« شوکر باشە.بەیانی لە ماڵێ دەردەکەوێ و شەو درەنگانێک دەگەڕێتەوە.»

- بەو حاڵە چۆن دەبینی ؟

بێ ئەوەی کەس تێی بگات، هەناسەیەکی هەڵکێشا و بێدەنگ بوو.

لەراستیدا پاڵەوان میکلس حاڵی باشبوو. بەڵام هەدای نەدەدا. وە شێرێکی نێو، تەفەسێ دەچوو.سوار دەبوو لە مەزرا رمبازی دەکرد. لە پردی (پێندوێ)دەپەڕیەوە دەوری خانوی نوری بەگی دەدا. کاتێ‌دڵە کوتەی دەگرت، بە نێو دارستانی‌شمشاد و زەیتوندا تەماشای دەکرد و بە خۆی دەگوت:« ڕاوەستە...ڕاوەستە .. پەلە مەکە با بێیەوە سەر خۆ..» پاشان دەگەڕابەوە بۆ شار. هەموو ڕۆژێ ئێواران کە تاریک دادەهات عەلیاغا بە تۆزاوی لە ماڵی نوری بەگی دەهاتەوەو خەبەری تازەی بۆ دەهێنا: ( ئەمڕۆ کابرا ویستی لە جێ ڕابێ و بڕوا. بەڵام ژانی ئەوەندە زۆر بوو نەیتوانی ڕابێ، کەوتەوە. ئەمڕۆ هەستاوپاسکی نۆکەرە ڕەشەکەی گرت‌وهەتا حەسارێ ڕۆیشت. من لە پشت کانی لە پەنایەک ڕاوەستا بووم، تەماشام دەکرد. سوێند دەخۆم نوری ئەوەندە گۆڕوە هەر ڕەنگی بە ڕوانەوە نەماوە. من نەمدەناسیەوە ..ئەو ڕوومەتی سوور و سمێڵی بە خەنە ،چی‌یان بەسەر هات؟ بەد بەختە هەموو لەشی دافەتاوە... ئەمڕۆ بەبێ بارمەتی نۆکەری چوە حەسارێ‌و لە بەر دەرگا ڕاوەستا.چاوی بەمن کەوت چوومە پێش سڵاوی لێبکەم، دەستی ڕاوەشاند کە بڕۆم..... ئەمڕۆ بە کۆمەگی نۆکەرەکەی سواری ئەسپ بوو کەمێک سوڕاوە ،نۆکەریش بەدوایدا ڕایدەکرد تا ئەگەر هیلاک بوو نەهێڵێ بکەوێ.... ئاخ پاڵەوان خۆزیا ئەسپەکەیت بدیبایە. چەندە بە گاوە خۆ بەرێنگا دادەڕنی. دەتگوت دەیزانی چ باسە.)

پاش ماوەیەک شەوێکیان عەلیاغا بە هەناسە بڕکە لە ماڵی پاڵەوان میکلس وەژوور کەوت. پاڵەوان دانیشتبوو چاوەڕوانی ئەو بوو.پیرە مێرد گوتی :

- حاڵی باشە.ئەمڕۆ کاتێ مستەفا بابا هات نوری پێی گوت : ئیتر کارت بەمن نەماوە،

کارەکان بە دەست خودان. شەویش سواری ئەسپی خۆی بوو چوە گەڕانێ. نۆکەری لە گەڵ نەبوو.

- حاڵی چۆنە ؟ یانی وەک پێشوو سوورو سپیە ؟توانای جارانی هاتۆتەوە بەر ؟

- نا پاڵەوان ... سەرو رووی هێشتا تەواو نیە، ڕەنگی زەردە. قسان ناکاو خواردن ناخوا. داپاتی پیری ئەوانەی پێگوتم.

هیچیش ناخواتەوە، خەویشی نیە. تەنیا هەناسە هەڵدەکێشێ و خەمبارە.ڕۆژی پێشوو کاتێک قەرەواشەکەی لێی پرسیبوو : ئامینە خانم کەنگێ دێتەوە خانوی هاوینێ، نارەحەت ببوو. کەمی مابوو لە خۆ بچێ. دەستی بە دیواری گرتبوو کە نەکەوێ. بێ ئەوەی هیچ بێژێ بە چاوی زەق تەماشای داپانی کردبوو.

- بەسە عەلیاغا زۆری لەسەر دەرزی . دەبڕۆ ونبە. بەڵام عەلیاغا نەدەڕۆی، دە پەیوست درێژەی پێیدا. لە شک دابوو،

پاڵەوان گوتی : چیە.. دیسان دەکۆخی و سەرت دەخورێنی، قسەت پێ ماوە؟

عەلیاغا دەنگی باریک کردەوەو گوتی : وادیارە پاڵەوان!

- دە بیڵێ و مەترسێ، بۆ ئەو قسەش پارەت دەدەمێ.

- بەد بەختە لەوانەیە سەقەت بووبێ.

- یانی چی سەقەت بو؟

- یانی ئیتر پیاو نیە ... ئامینە خانیش ئەوەی زانیبوەتەوە .

- زۆر باشە .. رابە برۆ ...

پیرە مێرد رایکرد بۆ لای دەرگاو لە تەنافێکی هەڵەنگوت و کەوتە عەرزی. راست بۆوەو وەدەر کەوت.

پاڵەوان میکلیس بە بیستنی ئەو قسە راما و لە کاتێکا لە ژووری دوکانەکەی دەهات و دەچوو، بە بۆڵە بۆڵ گوتی :

- نا...نا.. شتی وا نابێ.. من باوەڕ ناکەم .نەیدەتوانی باوەر بکا کە پیاوێک تووشی بەدبەختی ئاوا بێ. لەکاتێکا سمێڵەکانی دەجاوی،پەیتا پەیتا دەیگوت : نا..نا.. شتی وا نابێ، ئەگەر ئەوە راست بێ، من ناتوانم لە پیاوی سەقەت تۆڵە بستێنمەوە، ئەو تۆڵەیە بەکاری هیچ نایە. مردن لە بەرامبەر دەردی ئاوادا هیچە . لە پڕ بڕیاریدا و گوتی : ئەشێ خۆم بچم بزانم. چەند رۆژ ویستا و بیری کردەوە: دەبێ مۆڵەتی بدەم کە چاک بێتەوە ، برینەکەی تەواو سارێژ بێ و توانای جارانی بێتەوە بەر. ئاخرەکەی رۆژێکی یەکشەمۆ سواری ماینی خۆی بوو، بەرەو بردی(پندوی) کەوتە رێ.دروێنە کرابوون، دارمێوەکان لە ژێرهێشو،ترێیاندا چەمابوون. ئاسمان لە گەرمان گڕی دەگرت. پاڵەوان لە بەر خۆیەوە دە یگوت: دروێنە..ترێچنین ...ئاخ ...دایکی ئەنیر ...دایکی بێکەس .. دیسان دروێنە ، ترێ چنین ... شەر. مەبەستی لە دایک کریت بوو کە هەموو جارێ بە دڵسۆزی باسی دەکرد. ئەو کریتی وەک گیان لە بەرێکی زیندوو کە بگری و بناڵێنێ خۆشی دەویست. بۆ ئەو کریت تەنیا ئاخ و زەوی و دار بەروو نەبوو، بەڵکو لە دایکوبابی زۆر پێکهاتبوو کە هەمیشە زیندوو بوون و زیندوون. رۆژانی یەکشەمۆ لە کلیسا کۆ دەبنەوە، یاخی دەبن، ئالایەکی گەورە لە قەبری دێننە دەرو بۆ شەر وەچیادەکەون. .هەر ئەو دایکانەی کە

مردوون و دەستی ناپاکانی.سالەهای ساڵە بە قژی رەش و پاماشو برنجی و با سپی سەر بە سەر ئەو ئالایە دادەگرن و وشەی ئەبەدی (ئازادی یا مەرگی) لە سەر دەنەخشێنن .

پاڵەوان چاوی پر بوون لە ئەسرین و کاتێ بە تەنیا دەبوو بیری لە کریت دەکردەوە، شەرمی بە گریان نەبوو، لە بەر خۆیەوە دەیگوت :( دایکی فەقیر...دایکی هەژار و بێکەس و کار.)ئێستا پاڵەوان بە سەر پردی (پێدوی)دا دەپەڕیەوە. کاتێک بە نێو دار زەیتوندا چاوی بە خانووی کلاو لەرەنگی نوری بەگی کەوت، رۆژ لە سەرسوێ بوو دەهات ئاوا بێ، رکێفی لێداولە حەساری دەرگا ئاواڵە وەژوور کەوت لە ئەسپ دابەزی،سەیرێکی دەوروبەری کرد. بە راستی ساڵ چەند بە خێرایی تێپەڕیبوون، هەر لەم شوێنەو لەم حەسارەو لە بن ئەم دارە زەیتوونە، رۆژێک لە گەڵ نوری بەگ بەرەو رووی یەکتر دانیشتبوون، خوێنی هەر تکیان هاتبوە جۆش، دەیانویست یەکتر بکوژن، یان پەیمانی برایەتی ببەستن. بە باشیان زانیبوو ببنە برا.ئێستا دوای ئەو هەموو ساڵانە هەر لەو حەسارە بەدوای یەکدا دەگەران کە یەکتر بکوژن. بۆچما خوا لەوە پەژیوان ببوەوە کە کردبوونی بە هاو پەیمان؟

نۆکەری نوری کە پاڵەوانی ناسیبوو هاتبو پێشوازی بکاو گوتبووی :

. پاڵەوان بەخێر هاتی

. بەگ لە کوێیە :

. لە سەرێیە

. بچو بێژە وا من لێرەم و گەورەکەمە ببینم

ئەسپی نوری بەگی بۆنی ماینی کردبوو سەری لە تەویلەی هێنابوە دەرو دەیحیلاند، ماینەکە ئاورێکی لێ دابۆوە، بەڵام چونکە ئاوس بوو، گوێی نەدا بویە.

نۆکەر گەڕایەوە گوتی: ( بەگ گوتوویە بە خێر هاتنت بکەم و تکات لێدەکا کە تۆزێ بوێستی تا خۆی کۆ دەکاتەوەو پێشوازیت دەکا.) رێگا دەدەی زینی لێ بکەمەوە :

. نا ...پاڵەوان لە حەسارێ چوە دەر ولە کانی وە نیزیک کەوت، دیتی جامێکی مس بە دارێکەوە هەڵاوەسراوە، دەستی دایەو ئاوی خواردەوە. لە دەوری ئەو جامەی کە رۆژێک لە گەڵ نوری بەگ خوێنی حزیان تێدا تێکەڵ کرد بوو، بە زمانی تورکی نووسرا بوو:(ئەی رێبوار کاتێ بەو جامەی ئاو دەخۆیەوە سەرت هەڵبێنە، چونکە مریشک کە ئاو دەخواتەوە سەری هەڵدێنێو سوپاسی خوا دەکات).

نۆکەر ئەو جارەش هاتەوە گوتی : «پاڵەوان تەشریف بێنە، بەگ چاوە روانتە.» پاڵەوان میکلس سەرو شەدەی توند کرد ودەسکی خەنجەری وەبن لای پشتێندی دا کە دیار نەبێ، سمێڵی بادان و وەژوور کەوت. نوری بەگ لە قوژنی تاریک لە سەر نیر تەختێک دانیشتبوو جلی کردبوە بەر و خۆی وەک زاوا رازاندبۆوە . ئەو دەیزانی کە میوانی بۆچی هاتوە سەریدا. پێی شەرم بوو کە بە رەنگو رووی زەردو تێک چرژاو بێتە لای.سووراوی دەروومەتی دابوو. چاوی ڕێشتبوون تا بە شادو روو خۆشی بیبینێ. ئەویش خەنجەری دەسک رەشی.لە بەر پشتێ چەقاند بوو.

نوری بەگ دەستی بۆ لای میوان درێژ کرد و گوتی : سلاو پاڵەوان میکێلس .

بەلام ئەو دەستی لە بەر پشتێ نەهێنا دەرو نەیدەویست دەست بدا بە کەسێک کە برای

کوشتوه. نوری دەستی کێشایەوە و بە گرژی پاڵی وەدیواری دا. پاڵەوان هەروا کە راوەستا بوو دەیویست لە تاریکیدا وەزعی نوری هەڵسەنگێنێ. بزانێ تینی دەبەردا ماوە تا قسەی لەگەڵدا بکا یان نا. نوری گوتی:
- ها..پاڵەوان میکلس بە تاڵوکەی ؟ بۆ داناتیشی؟تۆ کە زەحمەتت کێشاوە تا ئێرە هاتووی.
پاڵەوان میکلس گوتی :
- نوری بەگ تۆ بۆچی رانابی؟ چما ناتوانی؟ ئەو کارە پچوکەی من بۆی هاتووم لە سەر نیوتەخت جێبەجێ نابێ.
- دەزانم..پێویست ناکا پێم بڵێی، خۆم دەزانم.بەڵام هەموو کارێک کاتی خۆی هەیە.ئێستا پەلە مەکە، دانیشە قاوەیەک وەخۆین، سیغارێک بکێشین‌و دوو قسەی خۆش بکەین. پاشان تۆ چۆنت گەرەکە وادەکەین.
دەنگی نوری ئارام و بەڵام پڕ لە داخو دەرد بوو. پاڵەوان میکلس لە بەرامبەر خانە خۆیێ دانیشت و گوتی :
- زۆر باشە نوری بەگ، ئێستا کە تۆ پێداەگری منیش تاڵوکەی ناکەم. ملی راکێشا تا لە تاریکاییدا سەروچاوی نوری ببینێ. بەڵام لە قوژبنی تاریکدا پتر نەدیو دەبوو. پاڵەوان میکلس گوتی :
- نوری بەگ وەک بیستوومە توند بریندار بووی.
- حاڵم زۆر باشە، وەک جاران، من ئێستا هاتوومەوە سەر خۆ وەدەتوانم خۆ لە بەر هەموو زەبرێکدا رابگرم.
- بەم خەبەرە کەیفخۆش بووم.
پاشان بێدەنگ بوو. قاوەیان هێنا، هەرتک بێدەنگ سەریان بەردابۆوە سیغاریان دەکێشا. نوری لە بەر خۆ بیری‌دەکردەوە: (بێگومان هاتوە لە تۆڵەی خوێنی براکەی بمکوژێ. پێڵاوی لەسەر چاوان. وەک ئەجەل رەش‌پۆشیشە.دیسان دەڵێم پێڵاوی لە سەر چاوان. تازە ئیتر ژیانی من بۆ چی باشە؟ ئێستا ژیانی من شەرم و شوورەییە.)
پاشان بە دەنگی بەرز گوتی : بە خێر هاتی پاڵەوان میکلس. چەند رۆژ بوو چاوەروانی تۆ بووم.
پاڵەوان میکلس گوتی :
- نوری قاوەت دامێ خواردمەوە، سیغارم کێشا، ئێستا ئیتر قسەمان نەماوە، رابە.
- نوری گوتی : بە چاوان بە قسەت دەکەم. تەواوی هێزی خۆی کۆ کردەوە تا بتوانێ راست بێتەوە.ژانێکی توند دایگرت. لێوی خۆی دەگەست. بەڵام وایدەکرد لێی دیار نەبێ. نوری بەگ بە لەنگی لەنگ بڵاو لە کاتێکدا تۆزێک دەشەلی وەپێش کەوت. بۆ بەر دەرگا ئیتر هەمرو باڵای بە تەواوی دیار بوو. پاڵەوان میکلس لە بەر روناکی دیتی و سڵ بوو. ئەو نوری بەگی بە هێز و مل ئەستور چی لێهات؟ ئەو پیاوەی روومەتی وەک مانگی چاردە بوو، ئەو کەسەی بە شیری وەسمانی ناوی دەرکردبوو چی لێهاتوە ؟ ئەودتا روومەتی داتەپیون، لێوەکانی وەها چرچ بوون دەڵێی هەمیشە دەگری. هەر چەندە خۆی رازاندۆتەوە و سوراوی کردوە، بەڵام هەر دیارە. پاڵەوان

میکێلس لە توانای نووری تێگەیشت. بزەی تێکشان لەدڵدا گوتی:(من لە گەڵ سەقەت و پەککەوتەی ئاوا بەرەنگار نابم.) پاشان بە دەنگی بەرز گوتی :

. نووری وادیارە تۆ هێشتا ساخ نەبوویەوە ..نا..؟

. پێت وایە ڕەنگم بزرکاوەو داماوم ؟ نا.. یالاّ وەپێش کەوە بچینە مەیدانێ، دەزانی لە گەڵ کێ بەرەو روو بووی. خۆشی بە لینگی لێک بڵاو و بە تۆزێ شەلین وەپێشکەوت. لە نێوەراستی حەسارێ ئاوری داوە دیتی پاڵەوان میکلس بە دوایدا نایە ولەبەر دەرگا ڕاوەستاوە تەماشای دەکا.

. نووری لەرزی و لە دڵدا گوتی: کافری لەعنەتی تێگەیشتوە، پەلێ تێگەیشتوە. هەر بۆیەش دەکشێتەوە. ویستی بەرزتر قسە بکا. بەلاّم نەیتوانی. ئاخرەکەی بە دەنگێکی خەمبارەوە گوتی :

. پاڵەوان میکلس ماوەیەکی زۆر چاوەروانت بووم. لەم دنیایەدا یونانی یا موسڵمان چاوەروانی کەس نەبووم. لەو ماوەیەدا تەنیا چاوەروانی تۆ بووم. ئێستا کە هاتووی، دەتەوێ بڕۆی ؟

پاڵەوان میکلس بێدەنگ بوو. هەر چەندی کات دەگوزەرا پتر دڵی ناسک دەبوو، دەگوشرا. نووری دیسان گوتی :

. ها.. پاڵەوان بۆچی وا تەماشام دەکەی ؟ راستە کە نەخۆشی رومەتەکانی دەقولْ خستووم، بەلاّم هێشتا تاووتینم ماوە. گوێ مەدە قسەی خەڵکی، بزانە کە هێشتا تینی جارانم هەر ماوە. وەرە وەدوام کەوە.

پاڵەوان میکلس لە جێی خۆی نەبزووت.

. دەتەوێ سواری ئەسپی بم، دەتەوێ دەمانچە باوێنم و پێت نیشانبدەم کە چ ئەنگێوەیێکم؟ ئەنگوستیلەیەکم بۆ داکە بزانە چۆن گوللە بە نێو ئاڵقەکەیدا تێدەپەڕێنم. با بچینە مەیدانێ لەوێ دەردەکەوێ کێ پیاوە.

ئەوەی گوت و کڵاوی لاردانا و پاڵەوانانە دەستی دە کەلەکەی نا و چاوەروان راوەستا. بەلاّم ئارەقەیێکی ساردی بە ناوچاوانەوە بوو، پشتی ژانی دەکرد. پاڵەوان میکلس چاوێکی لێکرد و بە دەنگێکی سەبروکە گوتی :

. نووری بەگ مەیکە بە هەرا. خۆت هیلاک مەکە. با بچینەوە ژوورێ. نووری تێکچوو، لە پڕ دڵۆپە فرمێسکێکی بە سەر روومەتاندا هاتە خوار و رووی وەرگێرا تا دەردی خۆی بشارێتەوە. لە بەر خۆیەوە گوتی : «زگی بە من سووتا. ئەیهاوار..وام لێهاتوە خەڵک بەزەیی پێم دابێ.»

پاڵەوان میکلس جارێکی دیکەش گوتی :

. نووری بەگ بچینەوە ژوور، هەڵیدەگرین بۆ جارێکی تر. نووری ئیتر خۆی نە شاردەوە. چاوە بە ئەسرینەکانی بۆ لای میوانی وەرگێڕاو ئەوەی نۆکەران سەرنج نەدەن، بە ئەسپایی گوتی :

. باشە پاڵەوان میکلس تۆ هاتبووی بمکوژی، ئەدی بۆ نامکوژی؟ میوان گوتی : گوتم با بچینەوە ژوورێ. نووری بەگ با بچینەوە پێکەوە رێک کەوین. پتر چوە پێش و باسکی نووری گرت. هەستی کرد هەموو لەشی دەلەرزێ. نووری هیچ بەربەرەکانێکی نەکردو وەدوای کەوتو بە سکالا دەیگوت :

. لە بیرت نەچێ کە تۆ برای هاوپەیمانی منی. هەر لێرە بوو، لەو خانوە دوور کەوتوە بوو کە خوێنی خۆمان تێکەڵ کرد. ئێستا تەنیا تکایێکم لە تۆ هەیە، ئەویش ئەوەیە کە بمکوژی. من تەنیا

ئەوەم لە تۆ دەوێ و هیچیتر.

پاڵەوان میکلس لە وەڵامدا گوتی :( نوری دڵت لە من نەیێشێ با بۆ ڕۆژێکی دیکە بێت.)

نوری هەر لەو شوێنە دانیشت و گوتی : کەوابوو تۆ بەزەییت بە مندا هات، زگت بە من سوتا ؟

پاڵەوان میکێلس بێدەنگبوو. نەیدەتوانی لە ئاست ئەم وەزعە داخدارە خۆی ڕابگرێ. جگە لە ڕۆشتن چیتری نەدەویست ئیتر ئەو لەم ماڵە تورکە کارو حیسابێکی نەمابوو کە لە گەڵ ئەو بەدبەختە پاکی بکا. چونکە لە بەرامبەر ئەم وەزعەدا مەرگیش هیچ نەبوو. خۆر بەرەو ئاوابوون دەچوو. لە جێ ڕابوو گوتی :

. نوری بەگ ماڵئاوا، من دەڕۆم .

نوری وەڵامی نەدایەوە. لەو قوژبنە دەویژینگا. جاروبار هەموو لەشی دەلەرزی. پاڵەوان جارێکی دیکەش گوتی:

. نوری بەگ خوا حافیز ... من دەڕۆم.

ئەمجارە دەنگی نوری بەگ وەک لە دوورەوە بێت بە وشکی و ناهومێدی گوتی :

. هەقتە پاڵەوان میکێلس هەقی تۆیە.برۆ بە سلامەتی . پاڵەوان میکلس هەروا کە ڕەق ڕاوەستا بوو تەماشای خانە خوێی دەکرد. بیری لە جوانچاکی و ئازایەتی و جوامێری ئەو دەکردەوە.بیری لەو پریشکە ئاگرانە دەکردەوە کە لە ژێر سمی ئەسپی‌نوری دەردەپەرین. ئەو دەنگە وشک و دوورە دەتگوت لە دنیایەکی دیکەوە دێت، جارێکی دیکەش هاتە گوێی . دەیگوت:

. پاڵەوان میکێلس ئەگەر پێت وایە من هەمیشە پیاو بووم و ئازا بووم، وەرە دەستم بدەیەو جا برۆ بە سلامەت .

پاڵەوان دەستی لەرزۆکی ئەوی گرت و سەبروکە گوشی تا ناڕەحەتی نەکردبێ و گوتی :

. خوا حافیز نوری بەگ ... بە هیوای دیتنەوە

. باشترە بیژین بە سلامەت پاڵەوان، کێ چوزانێ .. لە وانەیە لە مەبەستی من تێ بگەی .

. بەڵێ تێگەیشتم. لە پر هەستی کرد کە قین و خەفەت ئەوکی گرتوە. نوری بەگ کە لە پەنامتێبلە کە بوە گلۆڵە دیسان تاوێک نەبزوت. دەنگی سمی ماینەکەی دەبیسرا. پاشان ئیتر هیچ دەنگێک نەهات. ڕۆژ کە خەریکی ئاوابوون بوو. تاوێک شەبەقی لە پەنجەرەوە هاویشتە ژوورەکەی و قەرشێکی زێرین‌لە دیواری نەخشی بەست. پاشان ئاوابوو ژوورەکەی لە تاریکیدا بە جێ هێشت. نوری سەبروکە لە سەر نیو تەختەکە هەستا و سەرو دەموچاوی بە سابونێ شوشت. جلەکانی گۆڕی ،شوشێکی پچوکی ئاوی ئوستوخودیسی بە سەری خۆ داکرد و ماوەیەک سەری بە شانە کرد. پاشان چوە تەویلە، دەستی بە سەرو یاڵی ئەسپەکەی داهێنا. ئەسپەکەی وەکەیف هاتبوو، لیوزی بە سەری خاوەنەکەیدا دەگێڕا و لە خۆشیاندەیحیلاند. نوری بە چاوی بە ئەسرینەوە دەیگوت : خوا حافیز ڕۆڵەکەم ...خوا حافیز.

هەرتک لێک جیا بوونەوە. نوری لە پلیکانی ژوورەکەی سەر کەوت. پەرە کاغەزێکی هەڵگرت و ئاوای نووسی:« وەسیەتی من ئەوە بێ کە پاش مردنم ئەسپەکەم لە سەر گڵکۆم سەر ببڕن» مۆری خۆی بە کاغەزەکەوە نا.

پاشان لە نێوە ڕاستی ژوورەکەدا، لەسەر ئەو فەرشە کۆنەی کە باوکی ڕۆژێ پێنج جار بۆ نوێژێ چۆکی لە سەر دادەدا، دانیشت ولە پەنجەرەوە جارێکی تر تەماشای عاسمانی پڕ ئەستێرەی کرد.

بایەکی توند هەڵیکردبویە، چوار پێیەکە لە حەساری دەوەری. دەنگی گاریچی دەهات گۆرانی دەگوت و بە زمانی هەلادەگوت

نوری نامینەی هاتەوە بیر، چاوی لە سەر یەک دانان و هەناسەیەکی هەڵکێشا و لە بەر خۆیەوە گوتی : (خوا حافیز ئەی دنیای دەغەڵ خوا حافیز.) پاشان خەنجەری هەڵکێشاو دەستی بەرز کردەوەو بە هەموو هێزو تواناى کە لە بەریدا مابوو، لە سەر دڵی خۆیدا .

پاشا وەلامی دایەوە : جنایەت بێ و نەبێ، ویستی رەحمەتیەکەیە. خوا دەزانێ جەرگم لەو کارەساتە ژان دەکا. بەلام چی بکەم، خۆی وای ویستوە. ویستوویەتی ئەسپەکەی لەگەڵ خۆی بەرێ.منیش لە جێگای ئەو بام هەر وام دەکرد. ئێستا کێ ئەو غیرەتەی هەیە کە چەقۆ دەربێنێ و سەری ببرێ. ؟

تێکڕا وەلەرزە کەوتن. هەموویان بە دڵی بریندارەوە سەیری ئەسپەکەیان دەکرد. خۆ ئەوە بونانی نەبوو تا بیکوژن. گرێلەکەو مەریش نەبوو بیکەنە قوربانی و گۆشتەکەی بخۆن. ئەوە زینەت و خشڵی دنیای خاکی و شانازی شاری کاندی بوو. پسپۆرە ئەسپ ناسەکان لە ˚کرمە، و :رتیمنۆ) وە بۆ تەماشا کردنی دەهاتن. کێ غیرەتی هەبوو چەقۆ لە ملی ئەو ئەسپە بدا.

پاشا توورە بوو. وەک گا دەفی دەدان. چاوێکی لە یەک یەکی تورکەکان کرد و گوتی:

. لە ئێوەم پرسی،کێ غیرەتی ئەوەی هەیە ئەو ئەسپە سەر ببرێ. ؟

گشتیان دەلەرزین و بە دڵێکی خەمبارەوە لە هەیکەلی ئەسپەکە رامابوون کە لە بەر شەبەقی هەتاو وەک شەپۆلی مەخمەر دەیتراند.

کەس نەبزووت. ئەسپەکە لە سەر گڵکۆ کەوتبوو، بۆنی پێوە دەکرد، دەیحیلاند و ڕاست وەک ئادەمیزاد دەینالاند.بە راستیش حیلە نەبوو، نالەبوو.پاشا ڕوویکردە خولامی قولە ڕەش و گوتی:

. وەرە سولەیمان وەرە سەری ببڕە.

خولامی قولە ڕەش خەنجەری هەڵکێشا و هەنگاوێک چوە پێش. شەقاوێکی دیکەشی هاوێشت. ئەسپ چاوی بە خولام کەوت، راچەنی، بێ ئەوەی بجوڵێ سەري هەڵێنا و تەماشای کرد قولە ڕەش کشایەوە. پاشا کە نیزیک بوو بگری فەرمانیدا:

. ئازابە سولەیمانی مەلعون. چاوان بنوقێنە و خۆی بە سەر دادە. هەموو چاویان بریبوە قولە ڕەش. کابرایەک کە چاوی پڕ لە ئەسرین بوو، ئەڕاندی و گوتی :

. بە گۆڕی بابکم سوێند، ئەگەرقولە ڕەش ئەم ئەسپە بکوژێ، منیش دەیکوژم. خولامی ڕەش خەنجەری لە هەوا راتەکاندو کەمێکی دیکەش چوە پێشێ. بۆ ئەوەی غیرەت وەبەر خۆ بێنێ، ئەسپەکەی دا بە ر جنێوان.بەلام باسک دەلەرزی، ئەسپ سەری بەرداوە بۆنی بە خۆڵەکەوە دەکرد. جارێکی تر دەستیکرد بە حیلە و گریان. خولامی ڕەش باسکی بەر بوونەوە و بە دەنگێکی گیراو گوتی :(نا ..پاشا ئەفەندم نا...ئەوە بە من ناکرێ .

خەڵک هاواری کرد : ئافەرین ..سولەیمان .. ئافەرین ...دڵەکان ئارام بوونەوە ...خولام جارێکی دیکەش گوتی :

. من ناتوانم . چەقۆ کێشە تورکەکان هاواریان کرد :

. پاشا ئەفەندی ئەگەر باوەڕت بە خوا هەیە، ئەو ئەسپەی بۆ خۆت بەرەو ئەجانی بدە.

پاشا لە کاتێکا بە چاوی تیژەبی و تەماعەوە دەیرواتیە ئەسپەکە گوتی :

. من لە مردوو دەترسێم. هەنگاوێک چوە پێش، دەستی درێژ کرد کە ئەسپەکە بلاوێنێتەوە، بەلام ئەسپ ڕەویەوە، دەستیکرد بە لوشک هاوێشتن. لە دەوری گڵکۆی خاوەنەکەی دەسوڕاوە و لوشکی داوێشت. نەیدەهێشت کەس لێی وە نیزیک کەوێ. پاشا گوتی :

. با بڕۆین. ئەسپەکە تەنیا بە خەفەتی خۆیەوە بەجێ بێلین. دیارە ئەویش گیانێکی هەیە.

ئاخرەکەی برسیەتی رامی دەکات. باشترە نۆکەری نوری لە لای بەجێ بێنی، ئالیکی بداتێ، ئەگەر رام بوو بۆ منی بێنی. ئەوەی گوت و شادو سەر خۆش لە گەڵ گەورە پیاوانی تورک بۆ شار گەرایەوە. لە رێگا بیری دەکردەوە :( خوا گەریمە ..پاشای خۆش دەوێن..) خۆزیا ئەو ئەسپەم وەگیر کەوتبایە، ران و رکێفم لێ توند کردبان و دەورانی گەنجایەتیم تازە کردبایەوە. ئەگەر لە نێوان ژنەکانی گاندی و ئەم ئەسپەدا بمکەنە سەر پشک، ئەسپەکە هەڵدەبژێرم. ئەی خودای گەورەو بە گەردم ، ئەوە تۆی نوری بەگت گوشت وئەسپەکەت دابەمن.

تەماشایەکی قەبرستانی کرد، ئەسپ هێشتا دەیناڵاند و لە سەر گۆڕی خاوەنەکەی درێژ ببوو. هەمویان گەیشتنە خەندەکی قەدیمی شار کە ئێستا گرابوە بێستان و سەوزیخانە.خۆری سەر گەلی ئاوابوون، پەیکەری شێری لە بەردی تاشراوی سەر بورجگەلی ڤینیزی رووناک دەکرد. دەستە کولارەیەک کە ورگیان لە پەین و پیسایی تاخنی بوو لە گەشتی رۆژانەیان دەگەرانەوەو دەچوونەوە سەر دیوارەکانی قەلا کە بەرەو ویرانی دەچوون. شاری گاندی لە بێدەنگی رۆژئاوادا دەیناڵاند و هاواری دەکرد، دەریای شینیش لە پشت ئەوەوە توند شەپۆلی دەدا.

پاشا راوەستا . تورکەکانی لە دەوری خۆی کۆ کردەوە. رووی تێکردن و گوتی :

. ئاغایان . چاکو خەراپ گوێ بدەنە قسەکانم. ئێستا چارە نووسی کریت بە موویەکی بەندە .من لە بارەگای خودا سوێند دەخۆم کە نوری خۆی کوشتوە. کەوابوو مردنی ئەو بۆ هاروژانی تورکان مەکەنە کراسی عوسمان، جارێکی تر ئاژاوە مەنێنەوە. سوێند بە محمد، خوێن لە لوتی یەک کەس بێ، نەک هەر کافران، بەڵکو موسڵمانانیش لە چنارە گەورە هەڵداوەسم. کەوابوو بەد بەختینە وریای خۆتان بن و دەست نەبزێون.

پاشان رووی کردە خولامی قولە رەش و گوتی : ( سولەیمان با بڕۆین ). لە کاتێکا وە هەناسە برکە کەوتبوو بێکەم کەسبوو گەیشتەوە نێو شار. بانگبێژ سەری راوەشاند و ئەوانیتر بێ ئەوەی وەدەوگ بێن، لە بنەوە سەیری یەکتریان دەکرد. هەموو لە بەر خۆیانەوە دەیانگوت : ئەم پاشایە کابرایەکی بودەڵەیە، هەر دەڵێی لە تۆرەمەی یونانیانە. ئەوە لێرە چدەکا. بە ئێمە دەڵێ نابێ خوێن لە لوتی هیچ کەس بێ. بەڵام نیمرۆ بە بێ هێلکە دروست دەکرێ؟

بانگبێژ بەر لەوەی لە دەروازە تێپەرێ، مێزەری خوێناوی لە باخەڵی هێنادەرو وەک ئالا بەسەرداوێکیەوە کردو هاواری کرد:

. مردن بۆ کافران ...با بڕۆین و سەری هەمان ببڕین. خۆی بە سەرۆکایەتی دەستەی چەقۆکێشان کەوتە رێ.

لە خوارەوەی خەندەک دوو پیرە مێردی فەلە ئاویان لە چاڵاو هەڵدەکێشا و بێستانیان ئاو دەدا. بانگبێژ هاواری کرد:

. وەرن ..ئەوەتا دوو کافر لێرەن ...کوڕینە بۆ پێشەوە.دوو تورک هەڵیان کێشا خەنجەران و رایان کردنێ. بانگبێژ هاواری کرد: خوا دەستان بگرێ ... کوڕینە بۆ پێشەوە.

دوو چەقۆ کێش بە کوچەباخی قەراغ خەندەکێدا بە نێو بێستان و لاسکە گوڵە بەڕۆژاندا خۆیان گەباندە سەر چاڵاوێ. هەر تک پیرە مێردیان گرت و خشت سەریان بڕین. بانگبێژ هاواری دەکرد و دەیگوت :

ـ کوڕینە وریا بێ خوێن لە لوتیان نەیە. قاقا پێدەکەنی. سەری ئەم دوو هەژارە کەوتە نێو چالاوێ. بانگیزۆ دەینەڕاندو داردەستی هەڵدەسوڕندو دەیگوت : کوڕینە بۆ پێشەوە. بای دەریا لە مێژەری خوێناوی دەداو هەڵیدەمساند. هەوا دەهات تاریک دەبوو. دەروازەوان دەهاتن دەروازەکانی شار دابخەن. بانگیزۆ هەنگاوی توند کردن، چەقۆ کێش بەدوایدا وەپەلە کەوتن و بە لورە لور گەیشتنەوە نێو شار.

مەسیحیەکان لە دوور دەنگی ئەوانیان دەبیست و بە تالوکە دەرگای دوکانیان دادەخست و بەرەو ماڵ رایان دەکرد تا خۆیان وەشێرن. بانگیزۆ لە نیزیک دەروازەی کان لە پێش قاوەخانەی تورکان راوەستا. ئالای هەڵدەسوراندو دەیگوت :

ـ ئەلا..ئەلا مردن بۆ کافران. بەلام سەلیم بەگی پیر و چەند پیاو ماقوڵی دیکەی تورک بردیانە ژووری قاوەخانەو قاوەیان بۆ کری تا هێدی کەنەوە. پاشان ناردیان ئەفەندی‌یان هێنا. دەستیکرد بە حکایەتی شەهرزاد کە باسی ژن و لاوی جوانچاکو هەنگوین و گوێزی تێدا بوو.

دووسێ رۆژی پێچوو. مەسیحیەکان لەوە دەترسان کە تورک بە رۆژ دەروازەکانی شار داخەن وهەموویان بگرن. مەسیحی کەم و تورک زۆر بوون، دەیانتوانی بە جارێک قەلاچۆیان بکەن.

رۆژی سێیەم هەواڵێکی ناخۆشتر بلاو بۆوە. تورک بە نیوە شەو چوونە کلیسای (ئانکاراتوس و ئاگاتانگلوس) قەشەی جوامێری ئەو کلیسایەیان سەر بڕیوەقەشەی چارە رەش لەهەیوانی کلیسادا خەوتبوو، تازە لە ‹ترابسانوس›گەرا بۆوە و لەوێ بناخەی کلیسایەکی تازەی دارشتبوو. سەبارەت بە خواردن و خواردنەوەی باش لە شیرین خەوێکی خەست و قوڵدا بوو. تورک بێ ئەوەی وەخەبەری بێنن، سەری خشت دەبڕن. بەلام بەد بەختی قەت بەتەنیا نایە. چونکە رۆژی چوار شەمۆلە گوندی ‹زارۆ›یەکێ لە گوندە ئاوەدان و قەوغاکانی تورکان، تەشەیەکی ئامۆزای ‹ ئا گاتانکوس› کوژراو لە دێری بەناوبانگی ‹ ورزندیسی› لە بناری چیای (ئیدا) هاتبوە خوارو بابە عەلباغای خوێنمژی گوندی‌کوشتبوو کە دوو مەسیحی بۆ ئاو هەڵکێشان‌و ئاودانی سەوزیخانە دە عارەبانەی خستبوون و کوشتبوونی.

پیاو کوشتن تا دەهات زیاتر دەبوو. ئاگری شەر گوند بە گوندی دوورگەی کریتی دادەگرت. ئەو تورکانەی لە گوندی یونانیەکان دەژیان، ترسیان رێنیشتبوو. کەلوپەلی خۆیان کۆ دەکردەوەو پەنایان بۆ شار دەبرد. لەو لاشەوە مەسیحیەئاقڵەکان خاو وخێزان و شڕەو بڕەی خۆیان کۆ دەکردەوەو بەرەو چیا شاریان بەجێ دەهێشت.

پاشا سەری لێ شێوا بوو. هەوەڵجار بوو لە سەر دەمی پاشایەتی خۆیدا لە دوورگەی کریت ترشی‌ئەم هەرایە دەبوو. ئەو بۆ ئەم جورە کێشانە دروست نەکرابوو. ئەو رۆژهەلاتیەکی دڵپاک بوو.لە ‹پروسە› لە دایک ببوو. ئاسایش و خەوو خواردنی خۆش دەویست. ئاخر ئەو کریتیانە بۆچی بە گژ یەکدا هاتوون؟ ئەویش راست لەو حانەدا کە دەیویست ئەو ئەسپە ناودارە بە خاوەن بکات. دەیویست لە جیاتی ئالیک قەندی پداتێ. بە مست ئاوی بدا، ئاوام بێ و لە گەڕانی دەوروبەری ‹سێ تاق›دا لە عەرزی نەدا. بەلام داخی گران ئەو کریتیە لەعنەتیانە کاتێکی خەراب شۆرشیان دەست پێکردوە. پاشا سەری لێ شێوا بوو. بە غار دەچوە کن خەلیفەو بە پارانەوە داوای لێدەکرد و دەیگوت :

ئاخافتنەکانی بە نرخ دەبوون و بە بیرو رایێژ دەبزرووتەوە. هاوکارەکانی تەنانەت ئەوانەی تەمەنیشیان لەو زیاتر بوو، لە شەریشدا بەشداریان کرد بوو. لە قسەی دەر نەدەچوون ، ریزیان لێ دەگرت. کاتێ پاشا سەربازی وەدوا خستن، کێشەکە قوڵتر بوو. بیست کەس لە لاوان بە بانگاوازی تئودوریسەوە هاتن. ئەو پێی گوتن :

. برایان ، دەوڵەتی وەسمانی دەیەوێ خوێنمان بمژێ. ئێوە دەزانن چقەوماوە ؟ تورک ومەسیحی جارێکی دیکەش تێک بەربوون. بڵێسەی ئاگر لە گوندی ئێمە هەڵبوە و کاندیشی سوتاندوە. ئاگر لە کاندی یەوە دەگاتە « رتیمنۆ» و « کانە» و هەموو کریت دەگرێتەوە. فریو مەخۆن. پێتان وانەبێ‌کە ئەو تورکە سەگانە تەنیا وەدوای تاقە کەسێکی پیاو کوژکەوتوون. ئەوان ئەگەر ئەو پیاو کوژەش بگرن چەک دانانێن. چونکە لە گەڵ هەموو نەلەکان شەڕیانە.باو وباپیرمان ئەوەیان دەزانی ،هەر بۆیەش هەمیشە ئالاّی ئازادیان بە دوای خۆدا دەکێشا.ئێستا نۆرەی ئێمەیە. من بەر لەوەی لە ماڵێ وەدەر کەوم، مجری باوکم کردەوە، ئالاّیەکی تێدا بوو هێنام . بۆی بەکێتی . ئێستا وشەکانی سەر ئەم ئالاّیە بخوێننەوە : « ئازادی یا مەرگ» تئودوریس دوای ئەم وتانە ئالاّی قەدکراوی یونانی لێک کردەوە.

پاشایان لە رووداوەکان ئاگادار کرد. فرە تێکچوو. هەستا چوە کن خەلیفەی. پێی وابوو ئەو نیمامەی کافران هیچ تێ ناگاو چوو بو هەموو شتی بۆ روون کاتەوە. لە رێگا لە تووڕەییان کەم مابوو بخنکێ. وەک زانە سەری کارەکانی کریتی کەم بووبێ، بەیانی خەبەرێکی ناخۆشی دیکەشیان بۆ هێنا. نۆکەری نوری کە بە قسەی پاشا لە سەر گڵکۆی نوری بە جێ ما بوو بە غار هات گوتی : ( پاشا ئەفەندی ئەسپی نوری بەگی لە سەر گۆری خاوەنەکەی گیانی دەرچوو.

. چۆن .. بۆ ئالیک و ئاوت نەداوەتێ ؟

. پاشا ئەفەندی هەموو شتێکم دەدایە، بەلاّم نەیدەخوارد. خۆی دەیویست بمرێ و مرد.

خۆر تەواو خۆی هەڵکێشا بوو. بانگبێژ لە باسی نوێژ و تاعەت و خودا ئاسیدا حەشری دەکرد. خەلیفە کە لەسەر نیو تەختێکی درێژ دانیشتبوو، لە گەڵ حاجی ساواسی بلیمەتی زەمانە خەریکی باس و خواس بوو. تەسبیحی کارەبای دە دەستی وەردەدا. ساڵە خۆشەکانی هەرەتی لاوێتی وەبیر دەهاتەوە. بیری لە سەردەمێک دەکردەوە کە لە ‹کیف›ئەشە بووو بەسەر شوێنە پیرۆزەکانی ئەو شارە راگەیشتوە. کەللە سەری وەک شێری پڕ بوو لە بیرەوەرییەکانی رووسیا. ئەم وڵاتە لە بەر چاوی ئەو رەحمەتێکی خودایی بوو. گەنم و ڕۆنی گەرەو ماسی پیشاو وخاویار لەم وڵاتە زۆر و مشە بوو. ئەو گومەزە ئاڵتونانەی کلیسا و ئەو پەیکەرە زێڕانەو ئەو ئەڵماس ویاقوت و زمروتانە کە لە بەرگی ئینجیل لە کار گرا بوون.

. ئاخ حاجی ساواس. تا ئەورۆژەی رووسیا هەبێ، من ترسم نیە.دەبینی رۆژێک رووسیا زار لێک دەکاتەوەو وەسمانی هەڵدەلوشێ. ئەو رۆژە کریت رەنگی ئازادی دەبینێ و ئەوەش تالە هومێدی ئێمەیە. )

بەلام حاجی ساواس سەیری نوختەیەکی دووری دەکرد و بیری لە شوێنێکی تر دەکردەوە. لە نیزیک ‹سنت ئیرن›ڕێگە سەعاتێک دوور لە کاندی مەزرایەک هەبوو سەردەمێک مڵکی باوکی بوو. داخوا هەر هەستی رابردوو بو، یا لە خوێندنەوەی کۆنە کتێباتەوە گەیشتبوە ئەو خەیاڵە پێی

وابوو لە ژێر ئەو مەزرایە شارێکی وێرانبووی زۆر کۆن گۆڕ کراوە.

حاجی ساواس ئەو کوپ و گۆزەپانەی دەپشکنێ کە سیلاو سازی کرد بوون شتێکی بریقەدار لە نێو قوڕاوێدا دەبینێتەوەو هەڵی‌دەگرێتەوە، ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتون. خاوێنی کردبۆوەو هێنا بووی بە خەلیفەی نیشان بدا. لە نقیمی ئەنگوستیلەکە نەخشی ژنێکی سنگ رووت و تەورێکی دوو دم بە دەستەوە هەڵکەنرا بوو. پیاوێکی قەدبارێکی لە شێوەی خەڵکی کریتی لە پێش ژنەکە خۆی بادەدار سەمای دەکرد. لە بانسەریان مانگێکی یەک شەوەی وەک داس دەبینرا.

حاجی ساواس ئەنگوستیلەکەی دا بە خەلیفەو گوتی:

- باوکی روحانی بۆ خاتری خوا ئەو ئەنگوستیلەی بشارەوە با کەس نەزانێ شتێ ئاوا هەیە. لەوانەیە لەو شوێنە چەند خەزێنەو شتی عەنتیکە لە ژێر زەویدا هەبن. بەڵام ئێمە وەک کۆیلە وابن. ئەگەر ئەوانە لە ژێر زەوی دەر بێنین، حکومەتی وەسمانی لێمان دەستێنێ. باشترە راوەستین تا دوورگەی کریت ئازاد دەبێ. ئەو دەم یونانی دیکە ئەو شارە قەدیمەی لە ژێر زەوی دێننە دەرێ و هەموو شانازیە شارەوەکان بە خاوەن دەبن.

خە لیفە گوێی بۆ قسەکانی شل کرد بوو، سەری بۆ دەلەقاند. وتەکانی راست و باشبوون، بەڵام ئەو بیری لە هەزار جێگای دیکە دەکردەوە کە بەرپرسی پاراستنیان بوو. ئەوەی پێ گرنگ نەبوو کە پێش هەزار ساڵ چ لە بن زەویدا ماوەتەوە؟ بۆیە گوێی دەدایەو سەری بۆ دەلەقاند و هەموو وتەکانی دە هێناوە سەر کریت کە زیندوو بوو، بەڵام لە گەڵ روسیا لەشێکی بریندارى هەبوو.

حاجی ساواس تێی گەیشت و پێ نارەحەت بوو گوتی:

- پایە بەرز چاوە روانی ئازادی لە روسیا دەکات، بەلام میللەت لە تفەنگ و منیش لەو ئەنگوستیلەیە چاوە روانی دەکەم کە تۆ گاڵتەی پێ دەکەی.

مورتزوفلوس دەرگای کردەوەو گوتی :

- باوکی روحانی، پاشا هاتوە ..حاجی ساواس بە پێکەنینەوە راببوو، گوتی :

- کریتیەکان ئەو تورکە فەقیرەیان گێژ کردوە. دەستی خەلیفەی ماچ کرد وبە دەرگایەکی نهێنیدا وەدەر کەوت.

راستبوو کە پاشا قینی لەو کریتیە شەیتانیانە هەبوو، هەر کە هاتە ژوور گوتی :

- خەلیفە ئەفەندم ، من نازانم چیسە؟ وادیارە کریتیەکان راپەڕیون و ئازادی دەخوازن... ئازادی چی ؟ من تێناگەم.کاتێ تۆ باوەرت بە خوا هەیەو گوێ دەدەیە فەرمانەکانی ئەو، هەرچی ئەمرت پێدەکا دەیسەلمێنی. ئیتر بۆچی دەبێ سکاڵا بکەی کە بووی بە کۆیلە؟ داخوا لە خودا یاخی دەبی؟ داخوا داوای ئازادی دەکەی؟ تا... باشە . کە وابوو ئەوە لە بارەی نایبی خوداش لە سەر زەوی راستە، واتە سولتان. کە وابوو ئەو کریتیانە چیبان گەرەکە، بۆچی خۆ تووشی کێشەو ژانە سەر دەکەن؟

خەلیفە لە وەلامدا گوتی :

. پاشا ئەفەندم . کاتێک تۆ گوێ بدەیە خودایەک کە بڕوات پێ هەیە، ئەوە قسەی تۆ راستە، بەلام ئەگەر بڕوات بە خوداکە نەبێ ، چی؟ کریتی باوەڕیان بە سولتانی تۆ نیە. هەر بۆیەش

گزیلەن و دەیانەوێ ئازاد بن.
پاشا سەری خستە نێوان هەردووک دەستی و نەیدەتوانی تێبگات. توند دەرگای پێوەداو وەدەر کەوت. تەماشای دەریای دەکرد تا بزانێ پاپۆرە سەرباز هەڵگرەکانی وەستانی دیارن یان نا...لە بەر خۆیەوە دەیگوت :«تەنیا ئەوان وەزعەکە روون دەکەنەوە و نەزم و هێمنی سەقامگرتوو دەکەن.» دەستی لێکدان و سولەیمانی قولە رەش هاتە ژوورێ.
. سولەیمانی لەعنەتی ، دڵم گیراوە، برۆ باریاپانیس بدۆزەوەو بیهێنە، تا توزێ پێبکەنین.
هەوا :دەهات تاریک دەبوو. دەنگی کاسبکاران کە دوکانیان دادەخست و دایک زارۆکیان بانگ دەکردنەوە دەبیسرا. پاوک بۆ ماڵێ دەگەڕانەوەو دەرگا دادەخران. لات و سەر سەری تورک، پێخواس و سەر پەتی بە گەڕەکی مەسیحیەکاندا دەرژیشتن و لەعنەتیان لە عیسای مەسیح دەکرد و تفیان داوێشتە ماڵە مەسیحیەکان. هەموو شەوێ پێنج شەش چەقۆکێشی تورک لە قاوەخانەی تورکانەوە بەرەو ماڵێ پاڵەوان میکلیس دەکەوتنە رێ بۆ ئەوەی دەرگای ماڵەکەی بشکێنن. پێیان وابوو نوری ئەو کوشتویەتی. چونکە دیبوویان کە بەسواری چۆتە خانوی کلاو قەرەنگی نوری بەگ و هەر دوای گەرانەوەی ئەویش تەرمی بێگیانی نوری بەگ لە ماڵێ دا کەوتوە. کە وابوو بێگومان ئەو کوشتویە. هەموویان بە سەرخۆشی دەکەوتنە رێ تا دەرگا بشکێنن. بەڵام کە نیزیک دەبوونەوە. دەهاتنەوە سەرخۆ و ترسیان رێ دەکەوت. دەوەستان و تا هێزیان هەبوو جنێویان دەدا و کوڵی دڵیان دەرشت و بۆ قاوە خانە دەگەڕانەوە.
پاڵەوان میکلس شەوانە بە دوو دەمانچەی پڕەوە لە پشت دەرگا کێشکی دەکێشا. هەموو شەوێ منداڵەکانی لە ماڵێ وەدەر دەنا. یای کاترینا هەموو شەوێ منداڵە بەر مەمکانەکەی لە ئامێز دەگرت و لە گەڵ تراساکی و ریتیو هەر شەوە لە ماڵە دراوسیەک رۆژی دەکردەوە . پاڵەوان میکلس بە تەنیا لە ماڵێ دەمایەوە. پاش چەند رۆژ بە تراساکی گوت:
. تۆ لە گەڵ من بمێنەوە. ئاخرەکەی تۆ دەبێ رابێی، ئێستا ئیتر باب و کور پێکەوە لە پشت دەرگا رادەوەستان.
خولامی قولە رەش توانی باریاپانیس لە ماڵی خۆی بدۆزێتەوە. پیرەمێردی وردیلە لە حەسارێ ئاگری کردبۆوە و خەریک بوو گەقە شامی دەبرژاند. بە قولە رەشی گوت :
. سولەیمان راوەستە تا من شیر و کەلوپەلی خۆم هەڵگرم. چوە ژوورێ، شیری لە خۆ بەست و میدالی تەنەکەی خستە ملی. ویستی کەوشان دەپێکا، بەڵام لە بەر تەمبەڵی پەژیوان بۆوە گوتی:« کێ دەتوانێ قەیتانی پێڵاوەکانم گرێ بدا » لە کاتێکا سمێڵی بادەدان لە ماڵێ هاتە دەر ولە سولەیمانی پرسی:
. لەعنەتی ، ئەم پاشایە چی لە گیانی من دەوێ؟ دەڵێی چی شوشە شەریەتێک لە گەڵ خۆم بێنم، رەنگە بە کار بێ.
. بیهێنە ...پاشاش نەیخواتەوە ، من دەیخۆمەوە.
باریاپانیس گەڕایەوە و بوتڵە شەربەتی هەڵگرت وکەوتنە رێ. پاشا هێشتا لەپێش پەنجەرە دانیشتبوو لەعنەتی لە چارە نووسی خۆی دەکرد کە وا خستوویەتە ئەم دوورگە شەیتانیە. دەیگوت :« ئەی قەزاو قەدەری لەعنەتی، تۆ منت لە سەر تەختی پاشایی داناوە یا لە بەر تیری

باربایانیسیش دەبێتە تەوەی من.
پاشا دەستی دا وەکاز و هاواری کرد ؛
. برۆ ون بە ..کافری لەعنەتی ...
بەر لەوەی وەکازی پاشای وە پشتیٚ کەویٚ، باربانیس دەرپەری. لە پلیکانان هاتە خوار وبە پای پەتی بە کۆلانانددا رایدەکرد. دووبارە شیرە درێژەکەی دە لاقی هالاو کەوتە عەرزی. کاتیٚ گەیشتەوە مالیٚ، لە بەر دەرگاراوەستا ونشانەی خاچی کێشا و لە بەر خۆیەوە دەیگوت: ماشەلا، باربانیسی لەعنەتی، تۆ ئەو هەموو شێتی و غیرەتەت لە کویٚ هێناوە.؟
پاشا ئەو شەوە خەوی لیٚ تێکچوو. خەونی خەراپی دەدیت.خەونی پر لە نێری و رەز و شیشە کەباب، لەعنەت لەو کافرانە ، چۆن دەزانن تانەو توانج لێبدەن. بەیانی زوو لە خەو رابوو. سەری گەرەکی تورکانیدا. لە دەرگایانی دەدا و دەچوە قاوەخانەکان، لە دەرگی مزگەوتیٚ رادەوەستا و بە خەلکی دەگوت ؛
. هێندی بن دۆستەکانم. دلۆپە خوێنێک نەرێژن. دەنا گشتمان تێدا دەچین. سەردەمێک بزنێک هەبوو ...چیرۆکی نێری و گەلامێوی بۆ تورکان دەگێرایەوە. پاشا دەچوە مالی ئەو یونانیانەش کە رایان کرد بوو. تورک لە دێهاتەوە هاتبوون و داگیریان کرد بوون. دەرک و پەنجەرەو میز و کورسیان دەشکاندن ودەیان سوتاندن. بە وانیشی دەگوت:
. لە چی دەگەرێن . بگەرێنەوە بۆ گوندەکانی خۆتان، کافران مەکوژن. ئەوەی بزانن بە محمد سوێند، هەر خەراپەیەکی بکەن، ئاکامی بۆ خۆتان دەگەرێتەوە. دوو بارە ئەقلی بزن و مێوی دەگێرایەوە. پاشان مالەو مالیدەکرد، بیرو مێشکی وەک شیشەی کەباب بە دەوری ئاگردا دەسورا و جزە جزی لیٚ دەهات.
پاش چەند رۆژێک وا دیار بوو تورک هێندی بوونەوە. پالەوان میکێلس لە سەر دۆشەک درێژ بوو خەوی لیٚ کەوت و خەونێکی سەیری دیت : خەلک لە دەوری شار لە مەیدانێک کۆ ببوونەوە. چاوەش بە دەهۆلٚ و زورنا سرودی میللی‌یان لێدەدا، گۆرانیان دەگوت، بەلام کەسیش دەنگی نەدەبیست. لاوێکی بە خۆوەی کریتی کەشەبێک لە سەر دەستی ئارەقی لە پێش راگرتن. وردە وردە کە ئارەقیان دەخواردەوە، گوێچکەیان دەکرایەوەو سرودی میللی لە حەوا دەنگی دەدایەوە.
پالەوان میکێلس لەو کاتەدا کە چاوی دەکردنەوە لە بەر خۆیەوە گوتی:«من نازانم ئەوە مانای چیە، کاتیٚ یەکیٚ لە خەو دایە، گیانی بۆ کەیف دەسورێتەوە .گیانی مرۆ لە ئەسلدا دێنە، کاتی خەون شێتتریش دەبیٚ.»
پاش ماوەیەک ، کاتیٚ لە چیاکان پەلامار دەست پێکرا، پالەوان میکێلس تازە لە خەونەکە تێگەیشتبوو.
ئەویٚ رۆژی یەکشەمۆ بوو، پالەوان میکێلس لە مالیٚ دەر نەچو بوو. خێزانی لە گەلٚ ڕێنیوی کچی و منداڵە شیر خۆرەکەی هێشتا لە کلیسا بوون. تراساکی لە مالی کراسوگیورگیس یاری دەکرد. پالەوان تەنیا مابۆوەو ئەم دنیایەی پیٚ خۆشبوو. لە مالێدا دەهاتو دەچوو، سەری خواردەمەنی و ئازوقەی دەدا. کەمو کوری نەبوو. دەچوە ژێر عەرز، پر بوو لە کوپە شەراب و رۆن زەیتون و زەیتون. هەنار و بەهیٚ و پیواز بە شریتەوە کرا بوون. لە وەتاغیٚ لێفەو دۆشەگ و

پێنخەف لە سەر یەک دانرا بوون. پاڵەوان میکێلس بە خۆشیەوە دەیگوت : « ئەگەر من وەچیا کەوم وتورک بێن ماڵەکەم تالان بکەن، زۆریان وەگیر دەکەوێ و شەرمەزار نابم. » ئەو لە باوکی بیستبوو کە ساڵی ١٨٢١ کاتێ فەلەکانی گوندی رایان دەکرد هەرچی بۆیان دەر چوو با، دەیانبرد. بابە گەورەی نەیهێشتبوو کورەکەی، واتە باوکی پاڵەوان میکێلس دەست لە نێو ماڵی خۆی بدا. گوتبووی :، نامەوێ لای تورکان ئابروم بچێ. دەمەوێ تورک بزانن کە ماڵی من چەندە پڕ لە بەرەکەتە. پاڵەوان میکێلس بە دووپاتە کردنەوەی ئەو قسانە هێدی دەبۆوە. لە ژوورەکەی خۆی لە بن پەیکەر وچەک و رەسمەکانی دانیشت ودەستی کرد بە سیغار کێشان. مژی لە سیغار دەداو مێشکی پڕ دەبوو لە بیری ئەو شەرانەی کە نەکرابوون و ئەم وتانەی کە نە گوترا بوون. خەڵک و گوندو چیای دەهاتنەوە بیر و شاری کاندی بە شەقام و قاوەخانەی تورکان و کلیساو مزگەوتەوە دەهاتە بەر چاوی. شار سوتا بوو. گیانی پاڵەوان میکلس سوارێک بوو بەو ریش و مێزەر و چەکمەوە، راست وەخۆی دەچوو. ئەوە خۆی بوو کە شاری ئاگر تێ بەردابوو. دەرگای دەشکاندن، منارەی دە روخاندن، ماڵی تورکانی پەلامار دەدا. بە بن گڕی سەوزدا تێ دەپەری، لە حەسارێک رەت دەبوو دەچوە نێو باخێک. فانۆسێک بە شوشەی سەوزو سوورەوە هەڵاوەسرا بوو. فانۆسی شکاندو هەموو شت چوە دە تاریکیەوە. کونە تفنکی پڕ بوون لە بۆنی میسک و عەتر. کوچە باخێکی بۆنخۆش لە بەرپێیانی کرایەوە و چوە نێوی...لەو سەری کوچە باخ دوو لاتی پچوک و جوان دەدرەوشان ...

پاڵەوان میکێلس نەراندی. دەستی دا خەنجەرێکی پچووک کە بە رەسمیکەوە هەڵاوەسرا بوو دەستی دایەو دەرانی خۆی راکرد. خوێن فیچقەی کرد، ماوەیەک خوێنی لێهات و بەمە کوڵی دڵی دامرکا. پاشان برینەکەی پێچا و لێی درێژ بوو. خێزانی و کیژەکەی لە کلیسا گەرابوونەوە لە ژووری خوارێ قسەیان دەکرد. پاڵەوان چاوی لەسەر یەک دانان و کوێی داپوونێ. دایک لە کاتێکا ئاگری هەڵدەکرد گوتی :

ـ تراساکی هێشتا نەهاتۆتەوە .

رینیو پێکەنی و گوتی :

ـ پەرۆشت نەبێ ئەو ئێستا نوێژی مس دەکا.

لە راستیشدا هەموو رۆژێ یەکشەمۆیان تراساکی و دەستە براکانی لە تەویلەی کراسۆگئورگیس نوێژی مس ـ یان دەکرد. لە گەڵ کلیسای رەسمی رکەبەریان بوو. بەیانی زوو لە پێش کلیسای سن میناس و یا لە دەوروبەری دەسورانەوە. ئەگەر هاو قوتابیەکی خۆیان دیتبا کە دەسرەی خاوێنی بە دەستەوەیەو ورتە پارەی تێدایە دەیەوێ بچێتە کلیسا شەم بیبکا، دەیانگرت و بە زۆری و یا بە خۆشی دەیانبردە تەویلەو دەیانگوت :« ئێمە کلیسای تایبەتی خۆمان هەیە. شەرم ناکەی دەچیە کلیسای خەڵکی؟ پاشان کەری کراسوگئورگیس ـ یان لە قوژبنێکی تەویلەی دەبەستەوە تا پتر جێگا بێتەوە. یەک لەوان لە پێش تەویلە رادەوەستا و وردە پوڵەکانی کۆ دەکردەوەوبە هەرکام لەئیماندارەکان لە جیاتی شەم دەنکە شقارتەیەکی دەدانێ. نیکولاً کە لە هەموان بە سامتر بوو، کڵاو خودێکی کاغەزی لەسەر دەناو روو پۆشێکی کاغەزی بە چاوان دادەدا و لە سەر کورتانی کەرەکە دادەنیشت و نە دەبزوت. جاروبار دەینالاند و بە رواڵەت لاسای

خەلیفەی دەکردەوە. تراساکی لە ئێوە راستی تەویلە رادەوەستا و ئینجیلی دەخوێند. ئیجیلەکەشی کتێبی روبینسون کروزوئە بوو. ئاتدریکوس نەخشی نایبی قەشەی یاری دەکرد.

مەنقەڵێکی لە ماڵی خۆیان دەهێناو پڕی دەکرد لە خەڵوز و ئەسپەندەرو گیای بۆنخۆشی پێوەر دەکرد و هەڵم و دووکەڵەکەی بۆ کەر و ئاخوری کەرو دیندارەکانی دەنارد. ئەوانەی کە دەمار گرژتر بوون دەکەوتنە عەوز و دەست و ئەژنۆی خۆیان بە تەرس و شیاکە دەکرد. لە سەرەتای نوێژ تەنیا تراساکی ویردو دوعای دەخوێند. پاشان ئەوانی دیکەش گەرم دادەهاتن و هەرچی بەسەر زاریان داهاتبایە دەیانگوت. هێندێ« ئەمان ئەمانی» تورکیان دەگوت. هێندێ گۆرانی جۆر بە جۆریان لە گەڵ دوعای « مەسیح زیندو بۆتەوە» تێکەڵ دەکرد. یان ئەو گۆرانیەی لە مەکتەب فێری ببوون: [ لە سەر ئەو چیایە کلیسای بە شەوکەت هەیە] دەیانگوت . تەویلە لە بەر هەراو هوریا دەلەرزی. کەر دەیزەڕاند و سەمای دەکرد. کراسوگتورگیس کە رۆژی شەمۆیان گێلاسێک ئارەقی زیاتر لێنەدا، وەخەبەر دەهات. دەستی دەدا دار و بۆیان دەچوە خوارێ. ئیتر خەلیفەو قەشەو نایب قەشە وەک لەشکری شکاو بە دەرگاو بە شورەی باخیدا هەڵدەهاتن. لە دەرەوەش هەرایان ساز دەکرد و دەتگوت ئەوەش بەشێکە لە ئایینی نوێژی مس. دوایە بە هەناسە بڕکە دەچوونەوە. تراساکی بە هاڤاڵەکانی دەگوت:

- یەکشەمۆی داهاتوو هەر کەس نەیە چەنەی دەشکێنم . بەو تێخوڕینە توندە نوێژی مس کۆتایی پێدەهات.

پاڵەوان میکێلس لە پەنجەرەی پچوکی خۆیەوە ئەو هەرایەی دەبیست. کە گوێی لە دەنگی کورەکەی بوو دەیگوت :« چەنەی دەشکێنم» بزەی هاتێ و بە نارە نار لە بەر خۆیەوە گوتی : ئافەرین تراساکی . من تۆم ئاوا دەوێ. دەمەوێ لە پێشدا لە دزستەکانت بدەی، تا دەستت بە لێدان فێر بێ. پاشان لە دوژمنە کانی تورک و مەسیحی و تەنانەت فەرەنگیش بدەی. هێندێ جار ئەگەر ترسای لە خۆشت بدەی. بەڵێ، من راست کوری ئاوام گەرەکە. لە بوونی کوری ئەوتۆ دایە کە دووبارە زیندوو دەبمەوە.

لێرەدا پاڵەوان میکێلس پیرە قەشەی غاری ( کێوی پەیژە تەلایی) لە رۆخەکانی دەریای لیبی وە بیر هاتەوە کە قەبرێکی بۆ خۆی هەڵکەند بوو. لە کێلەکەی نووسیبوو: « بڕۆ ئەی مەرگ، من لە تۆ ناترسێم» قەشە لە مردن نەدەترسا چونکە بڕوای بە خودا هەبوو. پاڵەوان میکێلیش لە مەرگ نەدەترسا، چونکە باوەری بە کورەکەی هەبوو.

هەولێدا لە جێ هەستێ. بەڵام برینەکەی دەزورواوە. پاڵی وەدیواریدا، تەماشایەکی چەک و پەیکەرەکانی کرد. دووبارە سیغارێکی داگیرساند. ئەو هەرگیز بۆ خوێندنەوە کتێبێکی لێک نەکرد بۆوە. خوێندن و دەرسی بە دڵ نەبوو. لە خوێندەواران بێزار بوو. کاتێ شورش کتێبی دەدراند و فیشەکی تێوەردەپێچان. تەماشای چس‌گورگی برای و حاجی ساواس و ئاغا ئیدۆمنەی دەکرد و کەڵلەی وشکی بە بێزاری رادەوەشاند. لە دڵی خۆیدا بە تراساکی کوری دەگوت :« رۆڵە بزانە، ئەوە بەرهەمی دەرس خوێندنە چاویلکەو دوولینگی تەنگ و پشتی کور. دەنگی تفەنگیش ببیسن، تورشی قوڵنج و ژانە زگ دەبن. خوا نەکا تۆ ببیە خوێندەوار تراساکی. خوێندەواری نەخۆشیەکی پیسە. وابکە تورشی ئەو نەخۆشیە نەبی »

هەروا کە لەم خەیالانەدا بوو لە دەرگایاندا و دەنگی گریان و هاوار هەستا. ماریورای پیرێژن بوو کە چس‌گورگی برای لە گوندی هێنابووی خزمەتیان بکا. پاڵەوان سەری لە پەنجەرەی هێنا دەری پیرێژنی بینی لە حەساریٔ دەگری و پرچی خۆی دەڕنێتەوە. بە توندی نەڕاندی و گوتی :

ـ ماریوریا ئەو هاوارەت لە چیە؟ وەرە سەریٔ بزانم .

پیرێژن بە هانکە هانک وەسەر کەوت. دەگریاو دەیگوت و کەس لێی تێنەدەگەیشت. لێوەکانی دەلەرزین. پاڵەوان بە سەریدا قیژاندی‌و گوتی :

ـ بۆ دەلەرزی ؟ ئەو هەرایەت لە چی‌یە؟ بیژە بزانم . باسی «دیاماندیس»ت کرد، چی بە سەر هاتوە ؟

پیرێژن بە گریانەوە گوتی : « مردوە .. بەیانی بە مردوویی لە جێدا دیتومانە. وشک هەلاتوە. وانگلیو هەروا لە خۆی دەداو دەگری. گولاوی پێدا دەکا. بەلام فایدەی نیە. کورەکە دەرمانداو کراوە.

ـ بە چی دەزانی دەرمانداو کراوە؟ کێ ئەوەی بە تۆ گوت؟

ـ سەرو چاوی شین هەڵگەڕاوە.

ـ باشە برۆ خەریکی کارەکانت بە . پاڵەوان راببوو، برینەکەی خارێن کردەوە، پێچای، ئیتر ژانی نەدەکرد. کاتێ دەرگای کردەوە کە بڕوا بە ژنەکەی گوت:« نامەوێ لە ماڵە من شین و گابۆر ساز بێ. »

ماڵی برای پاڵەوان میکێلس لە ئاخری کۆلانێ لە نیزیک کانی ئیدۆمنە بوو. دەرگای ماڵێ کرا بزوە، پاڵەوان وەژوور کەوت. دەنگی شین و گریانی وانگلیو لە ژووری سەرەوە دەهات. چس‌گورک لە خوارێ لە قوژبنێک خۆی مەلاس دابوو دەلەرزی و دانی لێک دەدان.

پاڵەوان میکێلس لە پێش‌براکەی راوەستا. ماموستا سەری هەڵبری براکەی دیت، دوو بارە سەری بەردایەوە و پتر خۆی مەلاس دا. پاڵەوان میکێلس گوتی :

ـ ماموستا ، سەرت هەڵبرەو تەماشام کە.

چس‌گورک سەری هەڵێنا. چاوە ترساوەکانی لە پشت چاویلکەوە دەتروکاند. پاڵەوان بە سپایی لێی پرسی:

ـ تۆ کوشتوتە ؟.. تۆ ؟

ـ بەڵێ .. من ....

ـ تۆ ...ئەگەر پەکی دیکە کوشتبای، خەنجەری بە کار دەهێنا. بەلام تۆ بە ناپیاویت کوشتوە . دەرمانداوت کردوە .

ـ چبکەم ...لەوە زیاتر بۆم هەڵ نەدە گیرا . گەیشتبوە ئێسکانم.

ـ تۆ لە خوای نەترسای ؟ لە من نەترسای ؟ دەبوایە بە خەنجەر بیکوژی.

ـ ئاخر نەم دەتوانی ...

ـ من لۆمەت ناکەم بۆ چیت کوشتوە، لۆمەت دەکەم بۆچی ژنانەت کوشتوە؟ بیر لە راکردن نەکەیەوە .

ماموستا دوو پاتەی کردەوە کە نەم دەتوانی و چبدبکەم لە دەست نەدەهات. ئەو لە من بە

هێزتر بوو.

- ژنەکەت ئەوەی زانیوە؟

- لەوانەیە ..ڕاست نازانم ..ڕەنگە زانیبی . بەڵام ئەو من نادوێنێ. کاتێ دەمەوێ بچمە وەتاغی سەرێ، لە سەرڕا خۆم پێدادەدا. ناچار هەر لێرە لە سەر ئەم نیو تەختە دەمێنمەوەو چاوە ڕوان دەبم .

- چاوەڕوانی چی .؟

- هیچ ... هەروا چاوە ڕوان دەمێنمەوە .

پاڵەوان میکلس چوە حەسارێ. شین و گریانی وانگلیو نە دەبڕایەوە. گەڕایەوە بۆ کن ماموستاو پرسی:

- چاوە ڕوانی چی دەمێنیەوە ؟

چس‌گورک کە هاروژا بوو گوتی: چاوە ڕوانی هەرچی بێتە پێش. ئیتر لە هیچ ناترسێم.

- لەوانەیە ژنەکەت ڕاستی بلێ.

- هەرچی دە یەوێ با بیلێ. من ئەوەی دەمویست کردم، ئێستا نۆرەی ئەوە.

- ڕاستەوە بە ، خۆت کەر مەکە. ئەگەر ژنەکەت ڕاستی لێ گوتی، تۆش ڕاستی بێژە ئەگەر حەپسی ئەبەدیشت بدەنێ. ئەگەر ئەو نەیگوت، تۆش بێدەنگ بەو هیچ مەڵێ. وامەکە مردوو کار بکاتە سەرت و نارەحەتت بکا. تێگە یشتی ؟ مرۆی بە ڕاستی لە کاتی پێویست دا دەبێ دوژمنی بکوژێ و باشیشی بکوژێ. ڕاست بەوە و بوێستە.

پاڵەوان براکەی ڕاست کردەوە، رایوەشاند و گوتی :

- برۆ بچین خەریکی کفن و دفنی بین .

بۆ بەیانی کە هاتن مەیتی بەرن، کەس مەیتی نە دەبینی. چونکە تەواو بە گوڵ داپۆشرا بوو. وانگلیو گوڵەکانی حەساری هەموو هەڵکەند بوو، ژنەکانی دراوسێش بە نامیزگوڵ و ریحانەیان هێنا بوو. خێزانی دوکتوری فەرانسەییش کە کاتێ ڕەحمەتی بە پێش پەنجەرەی ماڵیاندا دەڕۆیشت بە چاوی کرپار سەیری دەکرد، گوڵەکانی باغچەی خۆی هەموو هێنا بوون و بە سەری دادا بوو. تەنیا پاڵەوان پولیکسینگیسی خالی، ناوێک گوڵەکانی لادا، دمو چاوی ماساوی دەر خست و دووبارە داپۆشیەوە. چاوێکی لە چس‌گورک کرد و نێو چاوانی تێکنا. کاتی وانگلیو چاوی بە قەشەی کەوت کە دێتە ژوورێ، لە پلیکانان هاتە خوار و خۆی بەسەر مەیتی برای دادا. پرچەکانی بلاو کرد و مەیتەکەی پێ شاردەوە. باسکی بلاو کرد بوون و نەیدەهێشت کەس تخونی مەیتی بکەوێ. نە دەگریا، بەسەر مەیتی براکەیدا کەوتبوو نەدەبزوت. دەتگوت خەوی لێ کەوتوە. ناچار مەیتەکەیان لە بەر دەستی هێنا دەرێ. ڕاست بۆوە مقەستێکی هێنا ، پرچەکانی لە بنەوە بڕی، دوو ڕستەی لێ هۆندنەوەو لە دەستی مردووی هالاند. چاوی لە مەیتەکە بڕیبوو بێدەنگ حەپەسا بوو. لە بەر دەرگا ڕاوەستاو دەستی بۆ مەیتەکە ڕاداشت. پاشان هاتەوە ژوور، هەموو جل و بەرگی براکەی لە حەسارێ کۆ کردەوە و ئاگری تێ بەردان. خۆشی ماڵی هەڵوژارد هات لە حەسارێ دانیشت و سەیری سوتانی جلەکانی دەکرد.

دوای ناشتنی مەیتەکە پاڵەوان پولیکسینگیسی خالی لە پەنا وانگلیو دانیشت و دەستی

خستە نێو دەستەکانی و لێی پرسی: داخوا دەزانی کێ براکەتی دەرماندار کردوە؟ داخوا شکی لە کەس هەیە ؟ وانگلیو بێ ئەوەی وەڵام بداتەوە چاوی دە چاوی خاڵی دەبڕی و سەری رادەوەشاند و لێوی خۆی دەگەست.

چس‌گورک ئەو شەوە لەماڵی خۆی نەنوست، دەترسا. لە ماڵی براکەشی نەنوست. لەوێش دەترسا. ناچار چوە ماڵی ئیدۆمنەی برادەری کە روو بەرووی ماڵەکەیان بوو. هەرتکیان باسی مردن و ئەبەدی بوونی روحیان دامەزراند. کاتێ هیلاک بوون خەویان لێ کەوت.

سێ رۆژی بێچوو وانگلیو بە رواڵەت نە چس‌گورکی دەبینی و نە دەنگی دەبیست. کابرا وەک سێبەرێک بە ئێو ماڵدا دەهات و دەچوو. وانگلیو لێی دەترسا. لە ژووری براکەی‌دا دەمایەوەو دەرگای لەسەرخۆ دادەخست. ئەو چرایەی هەڵدەکرد کە لە بن سەری مردوان هەڵیدەکەن. لیوانێک ئاوی ساردی لە کن خۆی دادەنا، تا ئەگەر گیانی دیاماندیس تینو بوو، ئاوی بداتێ. ئەو وایدەزانی کە گیانی براکەی لە سەر خانو لەفرین دایەو هەر وەک پەپولەیەک لە سەر قژە ئاڵۆز و دەستە چرچەکانی دەنیشێ. لە خۆشی ئەم هەستە دەلەرزی و بێجگە لەوە خۆشیەکی دیکەی نە دەویست.

تا سێ رۆژان لاڵ ببوو. بە چاوی وشک و بە مۆزی سەیری خەڵکی دەکرد. بەتەنگ ئەوەشەوە نەبوو کە جلی تازیە بکاتە بەر. بای کیسانتی پوری هاتە لای، تا بیبا بۆ قەراخ دەریا و لای واهوو گۆڕینی ئاووهەوا تۆزی وەزعی دەگۆڕێ. بەڵام وانگلیو گوێی نەدایە، چوە ژووری برایەکەی و دەرگای لە سەر خۆ داخست. تەنانەت نەدەچوە سەر گۆڕی برایەکەشی و دەعاشی نەدەکرد. ئارام و بە ئیرادە بوو. بەردەوام سندوقی جەبازە نگریسەکانی دەپشکنی، بە پلیکاناندا دەچوە سەرو دەهاتەوە خوارێ. ماڵەکەی رێکو پێک دەکرد و ئامادە دەبوو. دەتگوت خەیاڵی سەفەری هەیە. ئێوارەی سێ رۆژە بە ماریورای پیری گوت :

. مێزەکە برازێنەوە. سفرە سپیە چنراوەکە رابخەو پۆشقاپە تازەکان و کێرد و چەنگاڵە جوانەکان دابنێ. بە ئەربابەکەت بێژە دەمەوێ ئەم شۆ لە گەڵ ئەو نان بخۆم. چراش هەڵ مەکە، تەنیا ئەو دوو مۆمانە پێ بکە کە لە بان سەری مردوو هەڵمان کردبوو.

کاتێ چس‌گورک ئەوەی زانی، لەرزی و بە تایبەت لە وە ترسا کە دوو شەمی بان سەری مردوویان پێکرد بوو. چس‌گورک لە سەر کورسی خۆی دانیشت و بێ ئەوە کە غیرەتی سەر بەرز کردنی هەبێ و تەماشای ژنەکەی بکە. وانگلیوش رەنگ بزرکاو وبێدەنگ وەک داری وشک بەرامبەری دانیشتبوو. کاتی خواردن بە حاستەم لێوەکانی دەجولاند. کراسی سپی بوکێنی کردبوە بەر و تاجە گوڵی بوکێنی لە سەر نابوو. ئەوەندەی سپیاو کرد بوو دەتگوت دم و چاوی بە گێچ سواخ داوە.

هەر تک بێدەنگ بەرامبەر یەک دانیشتبوون. چس‌گورک جاروبار دەیویست شتێک بێژێ، بەڵام وشەکان لە گەروویدا دەگیرسان. ئارەقی لە لاچاوان دەهاتە خوار. گزەبای شەوان جاروبار گڕی مۆمەکانی دەلەراندەوە

لە پڕ وانگلیو دەستی درێژ کردو دلۆپ دلۆپ شەرابی لە دوو پیالان کرد. لەو شەرابی سور و تاڵی ‹ کیسامۆس› کە مانوساکاسی رەحمەتی وەک دیاری بۆ بوکێنی هێنا بوو.

وانگلیو پیاڵەی خۆی هەڵگرت و بە توندی وەک بیەوێ بیشکێنێ لە لێوانی چس‌گوڕکی داو گوتی :

ـ بە سلامەتی تۆ پیاو گوژ ...

دەنگی وەک دەنگی مردوان گیرا بوو. لیوانەکەی بۆ لێوی نەبرد. راببوو چوە ژووری براکەی و دەرگای لە سەر خۆ پێوە دا. شەو کەس دەنگی لێ نەبیست. بەیانی دیتیان بە تەنافی جل شوشتن خۆی خنکاندوە.

* * *

پاڵەوان پولیکسینگیس لە ژووری ئامینەی بوو. ئەو خەبەرەی پێگەیشت. ماوەیەک بوو لە ماڵی ئەو بیوە ژنەی نەمابوو. ئامینە بۆ غوسڵی تەعمید ئامادە بوو، بەڵام چاوەڕوانی هێندی بونەوەی ڕاروەزخی کرێتی دەکرد، تا چەقۆ کێشی تورک تورە نەبن. شادبوو کە دەبێتە مەسیحی و ئیتر بە چارشێو ڕیەچە ناچێتە شەقام و دەچێتە کلیساو خۆی بە خەڵکی نیشان دەدا. هەموو دەیبینن. کەیفخۆش بوو کە هەتاوو هەوا لە ڕومەتی دەدا. جلی یونانی و سوخمەی بە ئاڵتون و گزیەڕۆک دەبەر دەکا. سەری رووت دەکاو پرچە جوانەکانی بە هەموو کەس نیشان دەدا. مەسیح بۆ ئەو دەرگای دەکردەوە کە بێ پەچەو ڕووبەند بچێتە خیابانێ.

ڕاست لەو کاتەدا کە ئامینە بەو بیرو خەیاڵانەوە لە تەنیشت پاڵەوان پولیکسینگیس ڕاکشا بوو. خۆشی دوا ڕۆژی لە دڵیدا دەژمارد. دایانی قولە ڕەش بە قژی ئاڵۆز و پەرێشان وەژوور کەوت. دایان بەیانی زوو چوبوە ماڵی سێ لەعبەتان تا لە دەنگو باسی دنیا ئاگادار بێ. بە توندی گەڕابۆوە، هەناسەی نەدەهات. بە گریانەوە گوتی :

ـ پاڵەوان ، وانگلیوی خوشکەزات خۆی خنکاندوە. پاڵەوان تێکڕا بوو. دەستی ئامینەی بەرداو گوتی:« خۆی هەڵاوەسیوە ؟ کەنگێ ؟ کێ گوتی ؟ »

ـ سێ لوعبەتان گوتیان: دوێ شەو لە ماڵی خۆیان بە تەنافێ.

لەو کاتەدا ئامینە خۆدی( ئاوێنە ) پچوکی خۆی بەدەستەوە گرتبوو. تەماشای زمان و ددان و برۆیەکانی دەکرد. بە ئارە نار لەبەر خۆیەوە گوتی:« ئاخ ئەورۆ زمانی من سوور نیە. وەرە ماریا، ئەو بنێشتەم بۆ بێنە.» دایان لەو کاتەدا کە لە بنێشت دەگەڕا گوتی : « ئەو مێردەکەی بە جێ هێشتوە تا بچێتە کن براکەی .»

پاڵەوان هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:« هەموو خاو وخێزانی ئێمە لە ژێر خاکدا دەڕزن، من هێشتا منداڵێکم نیە ...»

داهاتەوە تەماشایەکی ئامینەی کرد کە بێ خەیاڵ درێژ ببوو. لە ئاوێنەدا تەماشای جوانی خۆی دەکرد. پتر داهاتەوە، دەستێکی بە زگی داهێناو گوتی : « کوڕی من و تۆ، کرێتی و چەرکەسی نەبەدی دەبێ ! » دەتگوت هە وەڵێن جارە بیر لەوە دەکاتەوە. سینگی هەڵساند بوو، پڕ بوو لە هیوا بە خۆبوون. هەستا کە بڕوا،بەڵام ئەژنۆی دوولا بوونەوەو کەوتە سەر دۆشەک. دەیویست کوڕێک دروست بکا وەحشی و توند خوو بە خوێنی چەرکەسی کە بەر لەوە زمانی بکرێتەوە، بتوانێ سواری ئەسپ بێ. دەمێک بوو برازاو خوشکەزای خۆی بە هیچ دەزانین، چونکە بە کاری هیچ

نەدەهاتن. کورەکە هەتیوێکی گێل و حۆل و خوشکیشی قەیرە کچێکی گرژ و مۆن و مەمک و زگێکی ئەستووری هەبوو. پاڵەوان پولیکسینگیس بێجگە لەم دوانە میراتگری نەبوو. بنەماڵەی ئەو هەر وەک ئاگریان تێ بەر بووبێ، لەبەین دەچوون. بە خۆشییەوە لەو ژنە چەرکەسییە کە بێنێشتی دەجاوێ و زاری بۆنی عەتری لێدێ و لە ئاوێنەدا جوانی خۆی دەبینێ، کوڕێکی دەبێ. واتە مرۆڤێکی ئەبەدی وەدی دێت!

لە پڕ وەبیری هاتەوە کە دایانی قولە ڕەش خەبەری چی بۆ هێناوە. تەریق بۆوە. بە پۆڵە پۆڵ هەستا و پشتێندی بەست و کڵاوی لەسەر نا و گوتی:

. ئامینە ... ڕۆڵە ئەشێ من بڕۆم! ئامینە باسکە ڕووتەکانی لێک بڵاو کرد و خۆی لە بەرێک کێشایەوەو گوتی: بڕۆ

پاشان چاوەکانی لە سەر یەک دانا و باوێشکی هاتێ و تەماشای دەکرد.

* * *

لە ماوەی ئەم سێ ڕۆژەی نێوان دەرماندناو کردنی دیاماندیس و خۆ کوشتنی وانگلیو باروودۆخی کریت بەرەو ئاڵۆزی و شپرزەیی چوو بوو. لە دێهات فەلە بە ئاشکرا تورکیان دەکوشتن. لە کاتێ تورک ئاگریان گرتبوو، ئەگەر تورکێک لە گوندێ دەکوژرا،ئەوان هەموو شەوێ لە کۆڵانە تەنگ و تاریکەکانی شاردا دوو کەسیان سەر دەبڕین. کارەکە لە دەست پاشا چووبووە دەرێ.لە ماڵی خۆی لە پێش پەنجەرە دادەنیشت و بە دووربین تەماشای دەرەوەی دەکرد. بەو هیوایە کە پاپۆڕی پڕ لە سەر بازی تورکان بەرەو کریت بێن.

ڕۆژی سێیەم لە نیوە ڕۆدا لە پڕ هەر چوار دەروازەی شاریان داخست. کەس نەیدەتوانی هاتو چۆی دەرو ژووری شاری بکات. مەسیحی لە داو کەوتبوون. لە کاتێکا هێشتا وانگلیویان نەناشتبوو. بەڵام جارێکی دیکەش بەخت دەفریای ئەو پیرە کچەکەوت. کەس و کاری توانیان بە پەلە مەیتەکەی بگەیێننە قەبرستانی ئەو دیوی دەروازەی کاتە و لە پەنا براکەی بینێژن. هەر ئەو ڕۆژەش مانگی ڕەمەزان دەستپێکرا بوو. تورک بە ڕۆژوو دەبوون. لە تەواوی ڕۆژدا نە دەبوایە نان و ئاو بخۆن و سیغار بکێشن. بەڵام شەو کە یەکەم ئەستێرە دەدرەوشا، خواردن و خواردنەوەیان پەلامار دەدا. لە پێش ماڵە دەوڵەمەندەکان، ڕاست وەک زەمانی شەڕ، دەهۆڵیان دەکوتا. وەزعەکە جێگای تێگەرانیبوو. مەسیحی لە ماڵەکانیان کۆ دەبوونەوە کە دەیانبینی تورک دوای خواردن و ڕۆژوو کردنەوە بە کۆڵاناندا وەردەبن و دەرگای بەرتانیەکان دەشکێنن، لەرزیان دەهاتێ. دراوسێکانی پاڵەوان میکلس هەموو شەوێ لە ماڵی ئەو کۆ دەبوونەوە. دەترسان و داوای پشتیوانی ئەو پاڵەوانە بە سامەیان دەکرد. چونکە هاوین بوو، پیاوەکان لە حەساری لە بەر ماتکە شەوو ژنەکانیش لە ژووری دەنوستن. تەنیا پاڵەوان میکلس لە ژووری خۆی چەکی لە بن سەری دادەناو بە ئاگا دەبوو.

شەوێکی پیاو ماقوڵ و پاڵەوانەکانی شار بە نهێنی لە ماڵی خەلیفەی کۆ بوونەوە. پاڵەوان میکلس و پاڵەوان ستیفانیس، ئەو دزەی دەریایی بە چەکمەی پاپۆڕوانی کە دەتگوت بۆ سەفەری دەریا دەچێ، بەشداری کۆبوونەوە بوون.ئەو چەکمانەی بە یادی ڕۆژە خۆشەکان لەپێدەکرد و لە

بیری چوبۆوه که شەلەو ئیتر نەدەشەلی. خەلیفه به گرژو مۆنی و خەمباری له نێو راستی ژوورەکەی ویستا بوو. کریت جارێکی دیکەش تووشی سەردەمێکی شووم و ئالۆز ببوو.

جەعلی تەلایی پێشنیاری کردو گوتی :

- باوکی پیرۆز ! تۆ بچوو پاشای ئاتینێ ببینه و داوای لیّ بکه چەک و ئازوقەمان بۆ بنێری،دەنا له بەین دەچین. دیاره دەبیّ خۆت ئەو سەفەره بکەی.

خەلیفه پێشنیارەکەی رەت کردەوەو گوتی : « لەو کاتەدا که گورگ پەیدا بوە، من مێگەلی خۆم به جێ ناهێلم. باشتره پالەوان ئەلیاس بچیّ. »

پالەوان ئەلیاس تووڕه بوو گوتی : « باوکی پیرۆز ! من هێشتا لاق و چاوی ساغ و سلامەتم هەنە، من پیر نەبووم، دەتوانم فەرمان بدەم به سەربازان. کەوابوو من ناچم، با حاجی ساواس بچیّ. »

خەلیفه گوتی : «با یونانی فەقیر تووشی ئەم بەدبەختی و کێشەیه نەکەین. ئەو بەشی خۆی گیرو گرفتی هەیه. باشتره پشت به هێزی دەولەته گەورەکان ببەستین. بۆ نموونه رووسیای ئورتودوکس . »

پالەوان میکێلس گوتی : « من پێم وایه باشتره پشت به هێزی بچووکی خۆمان ببەستین. بۆ نموونه به هێزی خەلکی دورگەی خۆمان. ئەوه بیرو باوەڕی منه . »

پالەوان ئەلیاس گوتی :«منیش له سەر ئەو باوەڕەم. له گورگیان پرسی : ملت بۆ وا ئەستوره ؟ گوتی : چونکه کارەکانی خۆم بۆخۆم ئەنجام دەدەم. »

ئیدومەنەش وه زمان هات و گوتی: « هەموومان بچین هەر یەکه بەردێک بخەینه لەنگەرکای سودا. » بەلام کەس گوێی نەدایه نیوه شەو بیّ ئەوەی بڕیارێک بدەن بلاوەیان کرد.

رۆژگار به ترس و نیگەرانی رادەبرد. تورکەکان به رۆژ له بەر داهێزانی رۆژوو، ئاخافتنی هاندەرانەی بانگبێژ وەک مێگەلی رق هەستاو له مزگەوت دەهاتنه دەر وچاویان وەک چاوی کوێران رەنگی شوشەی هەبوو. شەو که دەیانخوارد و دەیانخواردەوه له قاوەخانه کۆ دەبوونەوە. پاشان وەنێو گەرەکی یونانیان دەکەوتن و بۆ ترساندنی کافران که له مالی خۆیان کەوتبوونه گەمارۆ، تەقەیان دەکرد.

هەموو شەویّ کاتێک هەوا تاریک دەبوو، چەقۆ کێشی تورک تا گەروو دەیانخواردەوە، عەلیاغا به نهێنی به کۆلانی تاریک و چۆلدا خۆی دەگەیانده مالە پالەوان میکێلس وئەوەی له دەرەوەو له قاوەخانه و له خاوەن مالەکەی بیستبووی، بۆی دەگێڕایەوە.. ده یگوت :« ئەمرۆ ئیمامی شار له فلان مزگەوت ئاوای گوت. له قاوەخانه ئاخافتنەکەی ئەویان ئاوا لێک دەدایەوە. بانگبێژ دەیەویّ مەسیحیەکان قەلاچۆ بکرێن. بەلام فلان بەگ دژی ئەوەیه. »

عەلیاغا خۆی نەیدەویست ئەو دراوسیّ باشانه قەلاچۆ بکرێن. چونکه ئەو دەم ئێواران رووی له کویّ دەکرد بچیّ قسان بکا و نانێکی بخوا. ئەو به ورتکه نانی دراوسێکان به ریندەچوو. بێجگه لەوه ئەو وەک کتکی گەرەک له ئاست دراوسێکان هەقناس و به ئەمەگ بوو.

شەوێکیان سیّ جار له دەرگایاندا. عەلیاغا به پەشۆکاوی وەژوور کەوت. له سەر نیو تەختێکی بچووک له پەنا عەمباریّ دانیشت و دەرو دراوسیّ لێی کۆ بوونەوە. هەناسێکی

هەڵکێشاو گوتی :

. لەعنەت لەو تیلگرافە، راست وەک سەگ دەچێ. سەری لە کریتە و کلکی لە قوستەنتەنیەیە. دایمە قورە قوریەتی. دوای سەعاتێک دەبینی هەواڵی چەند ناخۆش بلاو دەکاتەوە.

کراسۆ گئورگیس پەشۆکاو گوتی: روونتر بێژە. هەواڵی خەرابی چی، مەبەستت چییە؟

. ئەمڕۆ پاشا تیلگرافی بۆ هاتوە کە سبەینێ لەشکرێکی تورکان لە کاندی دادەبەزێ. وادیارە لەشکر بە تۆپ و سوارە نێرامەوە ئالای کەسکی پێغەمبەریشی پێیە.

یای پینلوب بە ئەژنۆ بادارەکانی داداو گوتی :

. رۆڵە دیمیترۆسی هەژاری من. خوا بکا خۆ بشارێتەوە و سەر بازی تورک نەی دۆزنەوە.

عەلیاغا باسی شادی تورکانی دەکرد بە هاتنی تیلگراف. گوتی:« تورک بڕیاریان داوە بەیانی بە چەکەوە بچنە لەنگەرگا و سلاو لە ئالای پێغەمبەر بکەن.» عەلیاغا لەگەڵ ناخافتن وردە وردە پەشۆکاوی کەم دەبۆوە. ئەو ئیتر ئەو پیرە مێردی وردیلەو لەڕ و لاواز نەبوو کە لە قوژبنان خۆی دەشاردەوە و کەس سەیری نەدەکرد. ئێستا سەری هەڵدێناو ملی قەپ دەکرد. دەراستی کۆبووتەوە بوو. هەموو چاویان دە زاری ئەو بڕیبوو. هەرچەندەی ترسی دراوسێکانی پتر دەبوو، ئەویش سام و هەیبەتی زیادی دەکرد. تەماشای چاوی هەموانی دەکرد و رەنگی ژنانەی گرتر دەبوو. بەڵام لە بەرامبەرپاڵەوان میکلس دا هەر مشکی جاران بوو.

مامسترا پاس کە لە ترسان چاوی داپچڕا بوون گوتی:« باشترە بانگی پاڵەوان میکێلس بکەین، بزانین ئەو دەڵێ چی؟ من بەیانی لە ماڵێ وەدەر ناکەوم.»

یای کریسانتی خوشکی پاڵەوان پولیکسینگیس گوتی :

. من بۆ نوێژی ئێوارێش ناچمە دەر. خوا لێم خۆش دەبێ. ئەویش لەو کاتەوە کە براکەی لە گەڵ ئامینە رایدەبوارد، هەمو رۆژێ ئێواران دەچوە ماڵی پاڵەوان میکێلسی. ئەو بێ ئەوەی هیچ بە کەس بێژێ بیری دەکردەوە :«خوا لە گوناحانم خۆش بێ. بەڵام ئەو برایەی من لە جیاتی ئەو ژنە بکا بە مەسیحی، خۆی دەبێتە تورک .»

ئەو شەوە دراوسێکان خەویان لێ نەکەوت. هەموو بیریان لە چارەنووسی چاوەڕوان نەکراو دەکردەوە. لە رێگایەک دەگەڕان کە پێیدا رابکەن.

بۆ بەیانی دەنگی شەیپوورەکان لە لەنگەرگاوە بەرز بۆوە. بورجەکان پڕ بوون لە گلاو سوور. بۆنی بێگانە دەورووبەری قورس کرد بوو. تراساکی کە لە ماڵێ هاتبوە دەرێ چو بوە پێش دوکانی بەر لەنگەر گا، بە چاوی زەقەوە تەماشای دەکرد. پاپۆرێکی رەش لە لەنگەرگا وێستا بوو، بارەکەیان خاڵی دەکرد. رۆژهەڵاتیەکانی تورکن بە دەموچاوی ئاوڵەیی و مێزەر بەسەر و خەنجەر لەبەر بە شەیپور و تەپڵ و تۆپ و ئەسپ و گارانێکیش دەروێشی کەسک پۆش لە پاپۆڕ هاتنە دەرێ. ئالای پێغەمبەریان کردەوەو لە سەر دەروازەی لەنگەرگا هەڵیان کرد. پاشان لە دەوری ئالا دەستیان کرد بە سەما وبەزم و چەپڵە لێدان.

تراساکی پتر چوە پێش. تورک بە دەنگێکی نەرم دەستیان کرد بە خوێندنی هەوایەک، وە تازیە دەچوو. بەڵام وردە وردە گەرم داهاتن و دەنگیان هەڵێنا و سەماکەیان توندتر دەکرد وەک

فرفره دەسوران و شاقەلیان با هەلیدەداوە. شیریان لە کالانێ دەر کێشابوو لێکیان دەداو خوێن دەرژا. پاشان سەماکە هێدی بۆوە، دەروێش شیریان دەکالانێ ناوەو ماندو ببوون. مێزەری سپیان کەمتر دەجولاوە.

تراساکی کە لەو دیمەنە پەشۆکا بوو گەڕایەوە بۆ ماڵ و بە سەبر دەیگێڕایەوە. بابی نێو چاوانی تێکناو گوتی: «کوڕم ترسای؟»

- نا... من قەت لە سەربازی تورک نەترساوم.

- لە دەروێشەکان ترسای؟

- نا... لە وانیش نە ترسام

- ئەدی لە چی ترسای؟

- تراساکی داما. بابی چەنەی گرت و سەری هەڵێنا و گوتی: «دە بڵێ بزانم لە چی ترسای»

تراساکی گوتی: «لە نالای کەسێک!»

* * *

ترس وتاریکی شاری کاندی داگرتبوو. بێدەنگی وترس و سام سێبەری خستبوە سەر شار. تورک و مەسیحی بێدەنگ ببوون. ریش سپیەکانی مەسیحی بە دوای یەکدادەچوونە ماڵی خەلیفە و دەرۆیشتن. لە پێش ماڵی پاشا و لە سەر بازخانەکانی پڕ لە هەراو هوریا تورک سرت و خورتیان بوو.

رۆژێ سەعاتێک سێ دەروازەی شاری دەکرانەوە، تورکەکانی گوندی بە ژن و منداڵ و بارو بنەوە، ترساو پەشۆکاو دەهاتنە شاری. مزگەوتەکان پڕ ببوون، تورک دەرگای ماڵی یونانیەکانیان دەشکاند و ئەوانیان وەدەر دەنار لە جێی وان دادەنیشتن.

خەلیفە حاجی ساراسی بە نامەیەکەوە ناردە ئاتێن و داوای لە براتازادەکانی کرد کە پاپۆڕبنێرن و مەسیحیەکان لە چنگ تورک رزگار بکەن. شەوێکیان دانیشتوانی گەرەکی پاڵەوان میکێلس بە خۆی چوون لە ماڵی ئەو کۆبوونەوە. پێویست بوو تا درنگ نەبوە بڕیارێک بدەن. کەس نەمابوو بەشداری کۆبوونەوە نەبێ. پاڵەوان پۆلیکسینگیس، ئاغا ئیدومنە، تولوپاناسی نانەوا، و کولیبوای گۆرهەڵکەن بە جلی رەشەوە، کاساپاکیسی حەکیم بە خاقی فەرەنسیەوە ئامادە ببوون. بای ئەرکانالدولە و برا کەرو لاڵەکەشیان بانگ کرد بوو. خانم خۆی نەهاتبوو، ئەو لە ژێر چاوە دێری پاشادا بوو. کاری بە پاڵەوان میکلس نەدابوو. بە تایبەت کە براکەی رەسمێکی پاشای کێشابوو، ئەویش دە چوارچێوەیەکی گرتبوو، بە ئانقەست روویەرووی کۆلانێ لە پێش مجەرە لە دیواری دابوو تا خەڵک بیبینێ. رەسمەکە زۆر وەپاشا دەچوو. خالی سەر کەپۆی و تووکە بەرازاویەکەی نێوگوێی وەدەورو بەری گوێچکەی پاشا لە رەسمەکەدا هاتبوون. هێندی کەس کە رەسمەکەیان دەبینی دەترسان ولایان دەدا.

ئەو شەوە هاوسێکان وەک جاران لە حەسارێ دانەنیشتن. چوو بوونە ژوور، دەبوایە وتووێژەکانیان بە نهێنی بێ. هەموویان لە ژێر وێنەی قارەمانەکانی ساڵی ١٨٢١ بە ریز دانیشتبوون. بای کاترینا چرا گەورەکەی پێکرد بوو. پاڵەوان میکلس لە جێگای خۆی دانیشتبوو.

بە مۆنی تەماشای میوانانی دەکرد. ئەو ئەم جۆرە کۆبوونەوانەی بە دڵ نەبوو. لە دیتنی پاڵەوان پولیکسینگیس نیوە تورک و نیوە چەرکس بێزار بوو. بە قینەوە تەماشای سەروچاوو ملی ئەستووری دەکرد. هەموو لەشی بۆنی ماچانی لێدەهات. پاڵەوان میکلس لە بەر تووڕەیی و بێزاری دەلەرزی. ژنەکان لە پشت سەری پیاوان دانیشتبوون بە چاوی نوقاو گوێچکەیان هەڵخستبوو. لە وەتاغی سەرەوە رینیو لانکی خوشکە چکۆڵەکەی رادەژاند. تراساکی لە نێو پیاوان دانیشتبوو، چونکە بارکی گوتبووی: تۆ دانیشە گوێ بدەیە، شت فێر بە، تۆ ئیتر پیاوی . .

بێدەنگی باڵی بە سەر کۆبوونەوەدا کێشابوو. خاوەن ماڵ باسی داتەدۆمەزراند. پاڵەوان پولیکسینگیس خۆی پێ رانەگیراو، تەماشایەکی کریستانی خوشکی کرد کە بە زۆر هێنابوویە ئەم ماڵە تا بە روالەت بۆ رزگاری لە تەلاچۆ کردن رێگا چارەیەک بدۆزنەوە گوتی : ئەم شەو ئێمە بۆ چی لێرە کۆبووینەوە. ؟

پاڵەوان پولیکسینگیس بە بێ ئامینە نەیدەتوانی هیچ بڕیارێک بدا. بە تەنگ ئەو کارانەشەوە نەبوو کە ئەو خەڵکە دەیانەویست بیکەن. پاڵەوان میکێلس سەری هەڵێنا دەیویست پێی بڵێ :

. ها...پولیکسینگیس بەگ، تۆ لێرە چدەکەی؟ ئێستا ئیتر گەورەکی تۆ گەورەکی تورکانە، ماڵی تۆش ئەو خانوە دەروازە سەوزەیە. بەڵام خۆی راگرت. ئێستا حەریف هاتووە ماڵی، هەق نەبوو نارەحەتی بکا. ناچار بێدەنگ بوو.

چس‌گورک هاتە پێش. ئەو کەم کەم هاتبووە سەر خۆ. ئیتر خەونی بە مردوانەوە نەدەبینی. دەرمانداو کراویش نە دەهات نارەحەتی بکات. ئەو ئیتر مرد بوو. نەیدەتوانی هەستێتەوە. چس‌گورک لەو رۆژەوە کابرای کوشتبوو، وەغیرەت کەوتبوو، تێگەیشتبوو کە ئەویش پیاوەو دەتوانی خەڵکیش بکوژێ. لە مەدرەسەش خۆی لە قوتابیان تووڕە دەکرد و لێشی دەدان، نەیاندەتوانی گاڵتەی پێ بکەن. ئەو شەوە کە براکەی بێدەنگبوو، ئەو وەدەنگ هات :

. ئەو شەو ئێمە لێرە کۆ بووینەوە تا رێگای رزگاری لە چنگ تورکان بدۆزینەوە. بە بڕوای من سێ رێگامان لە پێشە: بە ئاسوودەیی لە ماڵی خۆمان دانیشین و هیوادار بین کە تامان کوژن، هەوڵ بدەین بە دەروازەکانی کاندی دا وەدەر کەوین و خۆ بگەیێنینە گوندەکان، یان راوەستین تا لە یونانەوە پاپۆڕەکان دێن و دەمان بەن. چونکە خەلیفە حاجی ساواسی هەر بۆیە ناردوە. ئێستا با باسی بکەین و بزانین کام رێگا هەڵبژێرین باشترە. خوا پشت و پەنامان بێ.

کورسیەکان وە جیرە جیر کەوتن. سەر بەرزرانەوە. دیار بوو هەموو خەریکن بیر دەکەنەوە، بەڵام ئەو رێگایانە هەر یەکەی عەیبێک و گیرو گرفتی خۆیان هەبوو.

کاساپاکیس جوتیارزادەی دوکتور بەو دوو چاوی خوێنکاوی و پێستی گەش و لەلەوی یەکەم کەس بوو وەدەنگهات. ئەو کە بۆ خوێندن چوبوە پاریس سێ مانگان بە خەیاڵی ئەوە کە دەچێتە زانکۆی پزیشکی، چوبوە زانکۆی حقوق. دوای ئەوەی هەموو باخەکانی بابی خواردە بوو، بە کلاوێکی (میرابۆیی) و بە کیژی خاوەن ماڵەکەی پاریسیەوە گەڕابۆوە بۆ کریت و دەرمانخانەیەکی کرد بۆوە. دوکتور بە قیزەوە سەیرێکی چس‌گورکی کرد و گوتی :

. بیورە ئاغا مامۆستا. من لام وایە رێگای چوارەمیش هەیە، ئەویش ئەوەیە کە پەنا بۆ باڵیۆزخانەی دەوڵەتە گەورەکان بەرین.

کراسوکتورگیس بە ئاقڵی جوتیاری خۆی گوتی:«بەڵام ئاغای دوکتور. هەموو لە باڵیوزخانان جێگامان نابێتەوە تۆ وشەی باڵیوزخانەت پڕ بە زارت دەبری. بەڵام ئەوەش بزانە کە باڵیوزخانە خانوێکە بە چوار لادیوارەوە. بۆ چما جێگای چەند کەسان دەبێتەوە ئەو پەڕی یەک یا دوو خێزانان دەگرێ.»

کولیوا کە ژنی مرد بوو، کۆشێک منداڵی کەچەڵ و کوێری بە سێزوە بوون و نەیدەزانی‌دەکوێ‌یان باخنێ تا لە کوشتار رزگاریان بکات، هەڵیدایەو گوتی :

. دوکتور تۆ بچوو لە باڵیوزخانەی فەرانسە داوای پەنا بەری بکە. ژنەکەت فەرەنسی‌یە و زارۆکیشت نییە. گۆڕ هەڵکەن لەعنەتی لەو کاتە بیر بزوێنە دەکرد کە شەیتان وەسەر زەڵلەی دەپەڕاند و بە مردوویی دە چوە کن ژنەکەی. بە تووڕەیی سەیری ئەو ژنانەی دەکرد کە لەوێ دانیشتبوون. بە بۆڵە بۆڵ دەیگوت:« ئەی کارخانە لەعنەتیەکان !»

ماستراپاس ئەو پیاوە پیرلزە زاری لێک کردەوە کە شتێک بڵێ، بەڵام وەک ترسا بێ هیچی نەگوت. چس‌گورک پاڵی پێوە نا گوتی:« ها .. دراوسێ ... بیژە ...بیژە ..»

زەنگوڵە فرۆش لە شەرمان سوور هەڵگەرا و گوتی:« بڕیار بە ئێوەیە، من چتان عەرز بکەم کراسوکتورگیس رابوو گوتی: «گوێ بدەنە من !»:

کابرای پیسی ورگ زل، تەواوی رۆژ لە ترسان و لە پەشۆکاویان ئارەقەی دەردا بوو، هەڵمی لێ هەڵدەستا و بۆترشاوی لێدەهات. خێزانی بە چاوی فیز و ئافەرینەوە تەماشای دەکرد. کاتێ مێردەکەی ئاوا بەگوڕو چالاکی دەبینی، خۆشی دەویست.

چس‌گورک گوتی : بیژە ... کراسوکتورگیس بیژە ... گوێمان لە تۆیە .

. باشە .. کە وابوو بەبڕوای من رێگای هەرە دڵنیا ئەوەیە کە بچینە دێهات. مانەوە لێرە لە نێو تەڵەی مشکان مانای‌نیە. .ئەوە یەکەم جار نیە کە تورک مەسیحیەکان قەلاچۆ دەکەن، دەڵێن چارەروانی پاییزەکانی ئاتێن بین. ئاو بە ژێر پردەکاندا دەڕوا و لەوێوە هیچ خەبەرێک نایێ. من لە بنەچەکەوە چاوم لە وێ ئاو ناخواتەوە. دیارە لە بەر ئەوە نیە کە بڵێم یونان نایەوێ یارمەتی ئێمە بدا، بەڵکو لە بەر ئەوەیە لە دەستی نایە. یونان لە دەوڵەتی وەسماتی دەترسێ، لەو فەرەنگیە سەگانەش دەترسێ. یەکەم جار نیە کە یونان ترسی خۆی دەر بڕیوە.

کولیوا بە هەناسە بڕکە گوتی:« بەڵام ئێمە چۆن دەتوانین وەدەر کەوین؟ لێرەدایە کە دەمەوێ رێگا چارەیەکی راست لە تۆ ببیسم. بەو هەموو منداڵە سەرو پێچکانەوە.....»

دراوسێ دەستی پێکردەوە : من چاوم لە ئاتێن ئاو ناخواتەوە. بەڵکوو پشت بە خۆم دەبەستم. ئێوە من بکەنە فەرماندە. بەو بەرەکەتەي لە پێشمە سوێند دەخۆم کە هەمووتان بە ژن و منداڵ و لێفەو دۆشەک و شڕەو بڕەتانەوە دەگەیێنمە چیا.

لە نێو دانیشتواندا بوو بە سرتو خورت. هەموو کوریسیەکانیان لە کراسوکتورگیس نیزیک دەکردەوە. ئەویش بێدەنگ لە ژێر کارتێکردنی قسەکانیدا خۆی کیف دابوو. نەخێر...تا ئێستا هەموو وایان دەزانی کە کراسوکتورگیس ورگ زلێکی نەخوێندەواری نەفامە.گاڵتەیان پێدەکردکە بۆچی چەکمەی پینەکراودەپێنەکات. ئێستایێیان دەرکەوت کە کاری لە دەست دێ.

دوکتور کە لەوە نارەحەتبوو گوێیان نەدارەتە قسەکانی گوتی :

- باشه .. بیژه بزانم نەخشەت چیه؟ تۆ دەزانی من چاپ و چوپم پێ خۆش نیه.
- دوکتور منیش هەروا. دووجار دوو دەبێته چوار. که وابوو گوێ بدەیه. من لەگەڵ دەروازەوانی دەروازەی لازارە نێوانم خۆشه. ئێستا بۆچی و چۆن، لەم بارەوە نامەوێ پرسیارم لێ بکەی. من زۆرجار شتی قاچاخ دێنم. بۆ ئەوەی زاریان ببەستم سمێڵیان چەور دەکەم. به ئارەق و پاکەته توتنێک و بەسته شیرینیەک زاریان دەبەستم. به کورتی من وادەکەم هەموتان وەک دەسته گوڵ له شاری وەدەر کەون.

کولیوا هاواری کرد : بژی کراسوگئورگیس. من منداڵەکانم به تۆ دەسپێرم و بڕوام به تۆهەیه.

ماستراپاس گوتی : منیش. گورج تەماشای ژنەکەی کرد تا بزانێ ئەویش رازیه یان نا!

لەو کاتەدا سێ جار به پەواشی له دەرگایان دا. چس‌گورک چوو دەرگا بکاتەوە. گوتی : عەلیاغایه.

پاڵەوان میکێلس گوتی بیگێڕەوە ، یا نەیە .

چس‌گورک دەرگای کردەوەو گوتی: «ببوورە عەلیاغا، ئێمه ئەم شۆ کۆبوونەوەمان هەیه. سبەی وەرە.»

بەڵام عەلیاغا له بەر دەرگا وێستاو به سەبروکه گوتی :

- دراوسێ! من هاتووم ئاگادارتان بکەم که چەلۆ کێشی تورک خۆیان بۆ کوشتار ئامادە کردوە.

- پەنا بەخوا ... کەنگێ ؟

- هەر ئێستا بە بۆنەی جێژنەوە .

- کەوابوو وەرە ژوورێ ..پیرەمێردی وردیله هاته حەساروپاڵی وەدیواری دا و به گورجی گوتی: «سلاو دراوسێکان.» خەبەرێکی به ترسی هێنابوو، شانازی پێوە دەکرد. بەڵام له پڕ له قوژبنێ چاوی به پاڵەوان میکلس کەوت، خۆی کۆکردەوەو گوتی :

- ببوورن .. من ئەم شۆ نامێنمەوە، چونکه به پەلەم. بەڵام زۆر پێویست بوو بێمه ئێرە. بۆ خاتری خوا ئاگادار بن. چەتۆ کێشەکان خۆیان ئامادە کردوە به بۆنەی جێژنەوە دەست به کوشتار بکەن. هەر له ئێستاوە گەرەکی بزنابیەکانیان له نێو خۆدا دابەشکردوە. ئەوانەی له هەموان مل ئەستورترن بۆ پاڵەوان میکێلس دانراون.

پاڵەوان میکێلس دەستی هەڵێناو گوتی: زۆر باشه، تۆ بڕۆ به دوای کارت دا.

ماستراپاس رووی کردە پیرەمێردو گوتی: «هەواڵەکان کۆ بکەیەوەو سبەی شەوێ بێ‌یەوە ئێرە. بڕۆ به سلامەت عەلیاغا.»

پاڵەوان پولیکسینگیس رابوو گوتی :

- گەیرەته ئێسکانم. ببوورن. دەبێ بڕۆم. ئەم شۆ کارم هەیه. هەر بڕیارێکی ئێوە بیدەن، خۆشکم پێم رادەگەیێنێ. بەڵام پێش رۆیشتن تەنیا دەمەوێ پێتان بێژم من کەسێکم بۆ چوونی چیا ئامادەم. چونکه شەرافەت واهەڵدەگرێ.

پاڵەوان میکێلس به بۆڵه بۆڵ گوتی :

دیسان جێگای پێخۆشبوونه که تۆ شەرافەتی خۆت له بیر نەبردۆتەوە.

پاڵەوان بە پەلە وەدەر کەوت. وەدرنگی کەوتبوو. ئێستا دەبوایە تامینە لە سەر تەخت ڕاکشا بێ و بنێشت بجاوێ تا پێش هاتنەوەی ئەو خەوی لێ نەکەوێ.

ئەوانی دیکە ڕوویان کردە پاڵەوان میکێلس تا بیرو ڕای ئەو بزانن. ئێستا پاڵەوان پشوی باشتر دەهات. هەوا خاوێن بوو، بۆنی عەترو تورک نەمابوو. سەری هەڵبڕاو گوتی :

ـ دراوسێکان ! ئێمە کە لێرە کۆ بووینەوە گشتمان مرۆڤی ئازاو ڕەشیدین. بە جێ هێشتنی کریت لەو هەلو مەرجە دژوارەدا شەرمە . هەر وەک کراسوگۆرگیس گوتی: ژن و منداڵان بۆ جێگایەکی ئەمین دەنێرین. خۆشمان تاقە یەک ڕیگامان هەیە.ئەویش خەباتی چەکدارانەیە. ئاغا مامۆستاو ئاغا ئیدۆمنەش لە گەڵمان دەبن.

تولوپاناسی پیر هەروا سەری بەرداوەوە و یاری بە قامکەکانی دەکرد و بیری لە کوردەکەدەکردەوە کە خۆرە تیرەی دەموچاوی داگرتبوو. ئاخر ئەو دەیتوانێ بۆ کوێ بچێ.؟ کێ ڕایدەگرێ؟ هەر کەس ببینێ دەترسێ. نەخۆشیەکە لێی دەگرنەوە. پێش دوو ڕۆژ هاتبوون بیبەن بۆ خانوی گولان. دایکی فەقیر بە گریان و ڕۆرۆ نەیدابوو. باوکی پارەیەکی دابوو بەسەرباران وازیان لێ هێنا بوو.

تولوپاناسی پیر هەناسەیەکی هەڵکێشاو هەموو تەماشایان کرد. لێیان پرسی :

ـ چبوو دراوسێ، ئەو هەناسەیە چبوو؟ دیار بوو وەزعی ئەویان لە بیر چوبۆوە. پیرە مێرد بە چاوی بە ئەسرینەوە گوتی:«وەدەتانەوێ چیێ ؟...هیچ...». پاش تاوێک لێیزیاد کردو گوتی : «من نارۆم. ئاخر بچمە کوێ؟ کێ پێویستی بە من هەیە؟» ڕابوو ڕۆیشت.. کەسیش پێشی نەگرت.

چس‌گورک گوتی:«باشە ئێستا گەیشتینە ئاکام. تۆ ئاغا ئیدۆمنە لەم بارەوە نەزەرت چیە؟ هێشتا هیچت نەگوتوە ؟.»

ـ تۆ بیرو باوەری من دەزانی. هەموو لێی ئاگادارن. زۆر جار گوتومەو دووپاتەی دەکەمەوە: تا ئەو کاتەی لەنگەرگای سۆدا هەیە، هەرچی بیڵێن و بیکەن وەک ئەوەیە کەبتانەوێ ئاو دەدەینگیدا بکوتن.

دوکتور پێشی پێکەنینی خۆی گرت و گوتی: «منیش لە گەڵ تۆم.» پاشان دەستی‌دا کڵاوەکەی کە بڕوات. شەو درنگ بوو. پاڵەوان میکێلس گوتی: « دوکتور تۆش دەبێ لە گەڵمان بێی بۆ چیا »

ـ بەڵام ....

ـ بەڵامی نیە. ئەشێ بێی. تۆ هەر بۆیە بووی بە دوکتور، لەوێ برینداریمان دەبن.

دوکتور تەماشای ژنەکەی کرد کە لەو سەری لەسەر تەخت دانیشتبوو. باش لە وتەکان تێ نەدەگەیشت. دەکۆخی، دەسرەیەکی پچوکی بە دەمەوە دەگرت. فەقیرە لاواز ببوو. ڕەنگی بە ڕوانەوە نەمابوو. لە بەر دیتنی قەتارەکانی کریت کە بە بەر ماڵەکەیدا دەڕۆیشتن و تەرس و پەیتیان بە با دەکرد، هیلاک و هەراسان ببوو. پاریس بۆ ئەو ببوو بە کۆنە چیرۆکی باوەر پێ‌نەکراو. بیری لەوە دەکردەوە کە خۆزیا دەیتوانی لە پاپۆرێک و یا لە لۆتکەیەکی با دا، دەچوە نێو دەریاو دەڕۆیشت و هەر دەڕۆی. بەڵام بێدەنگبوو هیچی نەگوت. بیری ئەو ببوە جۆگەلە

ئارێک کە دەرژێ و دەرژاوە نێو دەریا.

پاڵەوان میکێلس هەستاو گوتی: کەوا بوو بریار درا. خێرا چۆوە ژوورەکەی خۆی، هەستی کرد پێویستی بە حەسانەوە هەیە

دوای رۆیشتنی ئەو دراوسێکان پتر هەستیان بە ئاسوودەیی کرد. ژنەکان پتر خۆیان دەرخست و هاتنە نێو باس و ئاخافتن. ریتیو کەشەفێک ئارەق و میوەیەا و قاوەی هێنا. کراسوگۆرگیس جامی خۆی هەڵێناو گوتی :

- خوا یارمەتیمان بدا. بە سلامەتی تۆ پای کاترینا و بە سلامەتی گشت کەسوکارت. بە هیوای بوکێنی تۆ ، ریتیو !

هەموو جامیان لێکدان و پێیانا کرد. ریتیو ئارەقی هێناو بۆی تێکردنەوە. هەموو کەیف خۆشبوون. کراسوگۆرگیس لە کاتێکا ملچەی لە زاری دەهات گوتی :

- بە راستی ئەو ئارەقە شتێکی سەیرە. ئیستکانێکی چکۆڵە بە قەدرایی قوچەکەش بێ. بەشی نوقم کردنی دەوڵەتی وەسمانی دەکا. بزانن..! من هەر ئێستا سوڵتانی لە بنی ئیستکانەکەمدا دەبینم کەوەک مەشکەی فودراو لەوێ کەوتوە.

چس‌گۆرک گوتی:« ئەوە کاری ئارەق نیە، کاری یەکێتی‌یە .»

ماستراپاس کە ئارەق زەینی روون کرد بۆوە گوتی :

هەقی تۆیە ماموستا. ئینسانەکان وەک زەنگوڵە وان

کاتێک رێک بن لە مردن ناترسێن. گوێچکەی زەنگوڵە فرۆش راهاتبوو وەک کوێ ماسیلکەی دەریا هەر دەنگی لێوە دەهات. هاوینی رابردوو چوبوە گوندی خۆیان، شەوی هەوڵێ نەیتوانیبوو بخەوێ. چونکە گوێی لێ دەبوو کە زەنگوڵەی مێگەلە مەرێک رێک نین و دەنگەکانیان تەواو نیە. بەیانی هەستابوو چوبوە چیا، مێگەلی دۆزیبۆوە، زەنگوڵەکانی رێک کردبوو، پاشان گەرابۆوە لێی نوستبوو.

بەڵێ ... زەنگوڵ فرۆش دووپاتەی کردەوە: ئینسانەکان وەک زەنگوڵەی وان، زەنگوڵەکان، جقجقەکان، گەورەو پچوکیان هەیە. ئەو مێگەلە بەختەوەرە کە دەنگی رێک و ساف دەبیستێ. ئەو مێگەلە ئیتر لە گورگیش ناترسێ.

ئاغا تیدۆمنە سەری راوەشاندو لە دڵی خۆیدا گوتی: « من لێرە چدەکەم؟ ئەم وتانە بەکاری چی من دێن؟ » رابوو بە چس‌گۆرکی گوت: « هەستە با برۆین هاورێ. وەرە لە ماڵی من بخەوە. بابەتەنیا نەبم. » ئەو شەوە ئەو پێویستی بە باسی گرنگتر هەبوو. دەیویست باسی ئەستێرەو ئەبەدی بوونی گیان بکات. مەسەلەی دیکە بۆ ئەو لەم دنیایەدا نەبوو. ئەو تەنیا دوو پرسی هەبوون. لەوانە بوو پرسی لەنگەرگای سوداش لە پەنا ئەوانەدا بێتە ئەژمار. تەوانیتر گشتیان هەوا بوون.

هەمویان هەستان و کۆبوونەوە تەواو بوو. هێندێکیان کە ئارەق غیرەتی وەبەر نابوون، پیاوانە چوونەوە ماڵی خۆیان. ئەوانیتر لە بەر مانگە شەو لە حەساری پاڵەوان میکلس لێی نوستن. نیوە شەر تێپەربوو.

تەواوی شەو تراساکی بێ ئەوە هیلاک بوویێ، دانیشتبوو گوێی دابوە. هەموو شتێک

،ناخافتن وترس و نیگەرانی و ئارەقخواردنەوەو گاڵتەو گەپ لە مێشکیدا نەخش ببوو. بەڵام باوکی پتر لەهەموان کاری تێکردبووکە هەمیشە سەری بەردابۆوە. جاروبار سەری هەڵدەهێنا، ئەمری دەکرد و دیسان سەری دادەخستەوە. دەتگوت نایەوێ لەگەڵ ئەم زلزوڕوانەی دەوروبەری دابنیشێ کە هەر پرتەو بۆڵەیانبوو. تراساکی تەماشای بابی دەکردو بێ ئەوەی بەخۆ بزانێ کەم کەم دەبوو بە پیاو.

قوتابخانە داخرابوون. بەیانی کور لەخەو هەستاو چوە دوکانی بابی. پێی خۆشبوو بۆن بە باوکیەوە بکات. کەم کەم تێدەگەیشت کە ئەو پیاوە بۆچی وا توڕەوبێدەنگە. ئەویش ئەگەر ریش و سمێڵی هاتبا، وەبابی دەچوو.

کاتێک ئەو فیکرە لە مێشکیدا دەجولاً، لە لای لەتگەر کاوە دەنگی جنێو هەرا هەرا دەهات. هەنگاوی توند کردن. زۆری پێنەچوو لە پێش سەرتاشخانەی پاراسکە واس دیتی تورک دەوروەی سەرتاشیان دابوو جنێویان پێدەدا. تفیان لێدەکرد. چەقۆیان لێ تیژ دەکرد کە بیکوژن. ئەو چارە رەشەش بە کراسی دادراوو خوێناوی، بە سەروچاوی سواخدراو بە هێلکەی پیس و تەماتەی رزیو دەلەرزی و دەگریاو سوێندی دەخوارد کە ئەگەر بەرەڵای بکەن دەچێتەوە سیرا وتازە نایەتەوە کاندی. هەر لەو کاتەشدا دەیگوت : کوێێکی عەزەبی هەیە، دەپاراوە کە بەژەییان بەو دابێ.

تراساکی کە ئەوەی دیت، بە غار بۆ دوکانی بابی. پاڵەوان لە پشت مێزی دانیشتبوو، نامەی بۆکۆسماسی برازای دەنووسی کە لە فەرەنگستان ئاوارە ببوو. لە نامەکەدا نووسیبووی:« ئەگەر تۆ پیاوی و شەرمت بە خۆیە دەست لە ئوروپا هەڵگرەو بگەڕێوە. خۆزیا دەمزانی تۆ لەو چەند ساڵە لە ئوروپا چت کردوە و خەریکی چی. پێت دەڵێم دەست لە ئوروپا هەڵگرە و بگەڕێوە بۆ نیشتمانی خۆت. کاتی هاتنەوەت هاتوە، ولات پێویستی بە تۆ هەیە. تۆ بۆچی لە کریت لە دایک بووی؟ لە گەرانەوەدا تالۆکەی بکە. تۆش وەرە تفەنگ دەست دەیە. ئەی برازای من بزانەو ئاگادار بە کە.....»

ڕاست لەو دەمەدا تراساکی بە پەشۆکاوی وەژوور کەوت و هاواری کرد:

- بابە ئەوە خەریکن پاراسکەواسی ئەقیر لە پێش دوکانەکەی سەر بڕن. زووبە لە فریای کەوە، تالۆکەی بکە.

پاڵەوان میکێلس راست بۆوە، لەبەر دەرگای دوکانەکەی راوەستا، سەیری کرد ئەوا پۆلێک تورکی سەرسەری سەرتاشیان گەمارۆ داوە، کەس دیار نیەو تەنانەت مەسیحیش دیار نیە سەر وەدەرنێ. کاسبکاری یونانی گشتیان دوکانیان داخستبوو.

پاڵەوان لە بەر تیشکی هەتاو بریقەی چەند چەقۆی چاوپێکەوت.

- دەی بابە... دەچی ؟ ناترسێی ؟ ... دەی دەچی ؟

بابی رووی گرژ بوو. تورک زۆر بوون ،پەلاماردانیان وەک بەردو مردن ڕۆیشتن بوو. بەڵام پاڵەوان شەرمی لە کوڕەکەی دەکرد . ئەگەر تەنیا بابە دەچۆوە ماڵێ نەیدەویست خۆی توشی ئەو ژانەسەرە بکات. بەڵام ئێستا کوڕەکەی لە پەنای وێستاوە تەماشای دەکا. تراساکی جارێکی دیکەش گوتی: بابە ناچی ؟ دەترسێی ؟

- دەچم ... بۆلای تورکان وەرێکەوت. ئارام و لەسەرخۆ دەڕۆیشت. سەروڕووی خۆش بوون و

توره‌یی‌و ترسی لیٚ دیار نه‌بوو.

کاتیٚکی تورک دیتیان پاڵه‌وان لیٚیان وه‌نیزیک ده‌که‌ویٚ، ده‌ستیان راگرت. ئه‌و کافره چی به گیانی ئه‌وان ده‌ویست، ده‌هات شه‌ریان له‌گه‌ڵ بکا؟

پاڵه‌وان میکیٚلس چوه پیٚش و به‌واش ده‌ستی دریٚژ کرد تا به نیٚویانڤا ریٚگای تیٚپه‌ر بوون بوٚ خوٚی بکاته‌وه. تورک ریٚگایانداو قوت بوون تا بزانن چده‌کا. چه‌ڵتزگانیان نوشتانده‌وه‌و چاوه‌روان بوون. پاڵه‌وان‌گوٚنچکه‌ی پاراسکه‌واسی‌گرت وله‌پرسه‌روچاوی گرژ و توره بوون. وه‌پیٚش خوٚیداو گرتی : بالاّ بزوره مالّی خوٚت ئیٚتر نه‌ئیبینمه‌وه.

پاراسکه‌واس ملی حیزکرد و له کاتیٚکا هیٚشتا گوٚنچکه‌ی به ده‌ست پاڵه‌وانه‌وه بوو به‌ره‌و مالّی خوٚیان که‌وته ریٚ. تورک بیٚ ئه‌وه‌ی زمانیان بگه‌ریٚ ریٚگایان بوٚ چوٚلکرد که بروا. پاڵه‌وان جاریٚکی دیکه‌ش به توره‌یی ده‌نگیدا :

. بالاّ بزوره مالّیٚ زوویه ! پاراسکه له هه‌ره‌ڵیٚن کوٚلاّنڤا ونبوو. تورک واقیان ورمابوو، له جیٚی خوٚیان نه‌بزووتن. ته‌ماشای پاڵه‌وانیان ده‌کرد که هه‌روا به هیٚدی و له سه‌رخوٚ بوٚ لای دوکان ده‌گه‌رایه‌وه.

تراساکی به ئافه‌رین و سه‌ر سوڕمانه‌وه ته‌ماشای بابی ده‌کرد. نیزیکبوو پرسیاریٚکی لیٚبکا، به‌لاّم بیٚده‌نگی بوٚباشتر بوو. پاڵه‌وان میکلس له پشت میٚز دانیشته‌وه‌و ده‌ستی دایه‌وه قه‌ڵه‌م تا نامه‌که‌ی ته‌واو بکات:«تاویٚک پیٚنوسه‌که‌م داناپوو تا کاریٚکی بچوک رایه‌ڕیٚنم. به‌ڵیٚ برازام، بزانه‌و ئاگادار به که مانوساکاسی مامت ......».

## ٩

جێژنی ڕەمەزان چەند کێشەکانی تورک وەک تازە زاوا خۆیان دەرازاندەوە، هێرشیان دەبردە سەر چایخانەکان و لەسەر باڵنجان دادەنیشتن. هەتیو مەتیوی تورک ملیان تەپ دەکرد بە گۆرانی (ئەمان ئەمان) بە کۆلانانا دەسوڕانەوە. هەوا زۆر گەرم بوو. بارپایانیش باری سێ هێستراتی بەفر لە چیاوە بۆ هاتبوو. بەملاولادا رایدەکرد و شەربەتی بە تورکان دەفرۆشت.

لە سەرباژخانەی تیژیک بە سێتاق کێشکچی لە بەیانیەوە شەیپوریان لێدەداو تەقەیان دەکرد. پاشا لەگەڵ ملنەستورانی تورک بۆ نوێژی جێژنێ دەچوە مزگەوتی تازە. لەسەر منارەکان دەستە مۆم هێشتا دەسوتان. لە حەساری حەمیدە مەلا، قەبری ئیمام زادە بە دەسکە گوڵی کێوی و ڕیحانە رازابۆوە. ئەفەندم لاتی هاوریشتیوە سەرلاقی و لە کاتێکابۆ پێشەوە رادەژا، بە هەوای گۆرانی قورئانی دەخوێند. لە دەوروبەری قەبران پیرە موسڵمان قەلبانیان دەکێشاو بە چاوی نیوە نوقاو گوێیان بودەنگی کتێبی ئاسمانی راگرتبووکە وەک وزوزەی مێش هەنگوین دەنگی دەهات.

ئەو پیرە مێردانە زۆر کەیفخۆش بوون لایان وابوو بە زیندوێ سەری دەچنە بەهەشت. لەژیانیدا هیچ کەمایسیان نەبوو. دەنگی هەراو گرمەی شار بە قەڵشتی دەرکان و بە پەنجەراندا دەهاتە دەرو وە خورەی ئاو ی جۆگەلان دەچوو. لە پشتی قەلاّو بورجەکانی ڤیتیزی دەنگیهەتاسان وەک تاوی دەریا دەبیسرا. حەمیدە مەلا بە پێی پەتی ئارام و بێدەنگدەهاتو دەچوو.

راحەتەلقومی بۆ پیرە مێردان دەهێنار ەێندێ جاریش خەڵوزی لە سەر قەلیانەکان دادەنا. پیرە مێردەکانیش کە باش خواردبوویان، بە قوڵتە قوڵتی قەلیانەکان لاسای کۆتریان دەکردەوە.

لە نەکاو بە زیڕەو هاواری جەرگبڕو بە دەنگی شکاندنی دەرک و پەنجەران بە شین و گاڵۆری ژن و منداڵن و تەقەی گوللە تێکرا ـبون و هێمنایەتی پیرە پیاوان کۆتایی هات و هەموویان بە سەر لێ شێواوی راست بوونەوە.

لە نێو حەساران و لە سەربانان دەنگی (کوشتار..کوشتار.) دەبیسرا. ئەفەندم قورئانەکەی هاویشتە عەرزیو رابکردە بەر دەرگا. چەند تورکی چەکدار کێردیان بە دانی گرتبوو، بە قورە قور رایاندەکرد. باسک و سنگیان خوێناوی بوو.

خولامی قولە رەشی پاشا بە پێخواسی ئەو دەستەیەی ڕێبەری دەکرد. سنگی رووت کرد بوو، عەبایەکی زەردی هاویشتبوە سەر شانی چاوەکانی دە کالاتێدا دەسوڕان و لە لێوە ئەستورەکانی تف دەباری. ئەمەی هەڵدەسوڕاندو دەیشەراندو دەیگوت

ـ قەتڵ عام...قەتڵ عام ...!

ئەفەندی ترسەنۆک بە کەلێنی دەرگادا سەری هێنادەر و گوتی :

ـ دەچیە کوێ برام ؟

قوله رەش نەڕاندی و گوتی :

ـ دەچم سەری ئەو سەگە دەبڕم و خوێنی دەخۆمەوە...

ـ مەبەستت کێیە سولەیمان ؟

ـ پاڵەوان میکێلس !

ئەفەندم ڕەنگی بە رواتەوە نەما و هاواری کرد و گوتی :

ـ بۆچی تۆ لە خوا ناترسی ؟ بەڵام دەنگی لە نێو شین و گاڤوری مەسیحیەکاندا بزر بوو.

تورک دەرگایان دەشکاندن، ژن لە پلیکانان وەسەر دەکەوتن و بە هاوار وگریان لەبەر خودا دەپاڕانەوە . هێندێ بە منداڵەوە لە سەر بانی خۆیان فڕیندەدا خواری. هێندێ لە پیاوەکان بەربەرەکانیان دەکرد. دەنگی گوللەو لێکدان دەبیسرا. پاشان هاوارێکی توند دەهات و بێدەنگی زاڵ دەبوو.

پاڵەوان میکێلس چەک بەدەست لە پشت دەرگا وێستابوو، ژنەکەی ناردبوە سەرێ و تراسانی لە کن خۆی ڕاگرتبوو.:

ـ وەرە پاڵەوانی من. لێرە بەو گوێ بدەیە بزانە دەڵێم چی. ئەگەر تورک دەرگا بشکێنن، من هەمووتان دەکوژم. نامەوێ ئێوە بە زیندویی بکەونە دەستی تورکان. تۆش تراساکی،هەوەڵ کەس دەبی کە دەتکوژم. تێگەیشتی ؟

ـ تێگەیشتم .. بابە

ـ لە گەڵمی ؟

ـ بەڵێ ... لەگەڵتم ..

ـ بەوان مەڵی، ئەوان ژنن دەترسێن

ـ هیچیان پێ ناڵێم . هەر تگ بێدەنگ بوون. هەرتک لە پشت دەرگا وێستا بوون و گوێیان دابوە هەراو دەنگی لاقان کە بە کۆڵاندا هاتو چۆیان دەکرد.

چەند کەس لە دراوسێکان، وەک کراسۆکتورگیس و ماستراپاس و کولیوا، لەگەڵ کەچەڵ و کوێرە کانیان، بای پینلوپ و کریسانتی. ڕۆژەکانی پێشوتر توانیبوویان لە شاری بچنە دەر و ڕزگار بن. ژنەکان جلی پیاوانیان کردبوە بەرو بە نێو قەڵباڵغی و بێ نەزمیدا لە دەروازە دەرکەوتبوون. چس‌گورگیش بە شاڵواری تورکی‌و پشتێندێکی سور و مێزەرێکی سپی خۆی ڕزگار کردبوو. چاویلکەی دە باغەڵی نابوو بە ترس و لەرز بە دەروازەی لازارەدا تێ پەڕیبوو. تولویاناسی پیر کورەکەی بەرەڵا نەکرد بوو. دوکتور ئالای ئەرانسەی لە پێش پەنجەرە چەقاند بوو. ئیدومنەش رابگەیاندبوو کە ناروا و ئالای دەوڵەتە گەورەکانی ئوروپای لەسەر بانی چەقاند بوو. بە پیرێژنی کارەکەری گوتبوو: «ئێستا ئەگەر ئازان بابێن دەست لە ماڵی من بدەن

ڕۆژی پێشتر تراساکی لە باوکی پرسیبوو:« بابە ئێمە کەنگێ دەڕژین؟» کور بە پەلە بوو کە وەک ئەوانیتر بە دەشت و چیادا رابکاو سەرکەوێ . بابی لە وەڵامدا گوتبووی :« ئێمە دوای تەواوی خەڵکی گەرەک دەڕژین.»

ـ بۆ چی بابە ؟

ـخۆت بزانە بۆ چی ؟

نیزیکی نیوە رۆبوو کاندی لە ژێر زەبزی قەمەو خەنجەری تورکاندا پەلەقاژەی‌ئەبوو دەینالاند. بانگبێژ لەسەر منارە بانگی دەداو تاریفی رەحم و بەزەیی خوای دەکرد. هەرلەو کاتەدا لە گەرەکی گولستان لەو سەری کاندی پێنج شەش تورکی چەقۆکێش ئاسنێکی درێژیان بەدەستەوە بوو دەرگای مالی پاراسکەواسی سەرتاشیان شکاند و چوونە ژووری. کیژەکەیان گرت و هاوێشتیانە سەر تەختی. چەند تورکی دیکە سەرتاشی فەقیریان لە پشت کوپان هێنا دەرو سەریان بری. پاشان کیژی خوێناویان گرتە ئامێز و بردیان.

پالەوان میکێلس گوێی هەلخست. لەو سەری کۆلان لە سەر کانی ئیدۆمنە تەقەیان دەکرد. تفەنگی هێنا سەرێ و لە بەر خۆیەوە گوتی: « ئەوە دێن ..ئاوڕی دایەوە تەماشای کورەکەی کرد و گوتی : ئەوە دێن ... »

تراساکیش دەمانچەی ئامادە کرد و دووپاتی کردەوە : ئەوە دێن ... رۆژەکانی پێشتر باوکی فێری سێرەگرتن و هاوێشتنی کردبوو. جارێکی دیکەش بەتوندی تەماشای کورەکەی کردو گوتی: ئیشەلا ناترسی .!

ـ بۆ دەترسم ؟ دەزانم دەمانچە باوێم

لاتی لەبەر دەرگای حەساریٚ قایم کرد و چاوەروان بوو. لە دوورەوە دەنگی تەقە پتر دەبوو. تورک لە بەر مالی ئیدومنە راوەستابوون، بەشانی پالیان بەدەرگاوە دەنا کە بیشکێنن. ئیدومنە لە بەیانیەوە لە پشت میزی کاری دانیشتبوو نامەی بۆ دەولەتە گەورەکانی‌دنیا دەنووسی:« ئەی دەولەتە خاوەن دەسەلاتەکانی جیهان، لەو کاتەدا کە من خەریکی نووسینی ئەو نامەیەم، کاندی ئەوە خەریکە دەمرێ. ریزەی گوللە لە حەوا دەنگ دەداتەوە. تورکی کێوی دەرگای مالی مەسیحیەکان دەشکێنن، پیاوان دەکوژن، ژنان فە ساد دەکەن، مندالە شیرەخۆرەکان سەر دەبڕن. من هاوار دەکەم هەر چەندە دەزانم کەس نیم. کابرایەکی هیچ و هەژارم کە لە قوژبنێکی ئورووپا دوور لە ئێوەی دەولەتی مەزن بژرم. خوا لەکن منەو تورە یە. ئەو لەم ژوورەدا کە نامەی بۆ ئێوە تێدا دەنووسم دێتو دەچێ و لە سەر شانی منەوە تەماشای نووسینەکەی من دەکاو دە یخوێنێتەوە. خزمات دەکا و لێوان دەکرۆژێ و چاوەروانی ئەم وەلامەیە کە ئێوە دەمدەنەوە. بزانن کە بێجگەلەو نامەیە نامەی دیکەتان بۆ نانووسم. ئیتر لە هاوار کردن ماندوو بووم. ئەگەر ئێوە وەلام نەدەنەوە، روو لە خوا دەکەم و ئەویش . »

لە پڕ دەستی راگرت. دەنگی چەند دەسڕێژی بیست. سەری لە پەنجەرەی بردە دەرو دەستە تورکێکی دیت کەوا دەرگای مالەکەی دەشکێنن. بە سەریاندا گوڕاندی و گوتی:

ـ چتان دەوێ؟ کوێرن نابینن ئالای دەولەتە گەورەکان لەسەربانی هەلکراوە؟. دەنگی پێکەنین و هاواری بیست. گوللەیەک بە پەنا روومەت و گوێچکەیدا رابرد ولە ژووری‌ئاوێنەی وردوخاش کرد. ئیدۆمنە سەری بردەوە ژووری، کە دەستی بە گوێچکەی داهێنا، دەستی پڕبوو لە خوێن. نارەحەت بوو، لە داخان وەهەناسە بڕکە کەوت. ئەو دنیایە هیچ و زالم بوو، دەولەتە گەورەکانیش هیچ و زالم بوون. ئەوانیتر هەموو فەقیرو چارە رەش و بێ دەسەلات بوون. ئیدومنە بەری دەستی بە خوێن کردو بە نیشانەی دەربڕینی‌بێزاری لە سەر نامەکەی دانا کە بۆ دەولەتە مەزنەکانی نووسیبوو. پاشان بە بۆلە بۆل گوتی :

ـ وەریگرن ! ئیرەو ئیرەو ئیرەم بۆ ئیوە مۆر کردوە ، نامەکەم ئاوا تەواو کردوە:« ئەی دەوڵەتە مەزنەکانی دنیا، ئەی ئینگلیز، فەرانسە، ئیتالیا، ئوتریش، ئەڵمان، روسیا، خوێنی کریت لە ئەستوی ئیوەو کوڕ و نەوەکانتا دەبێ !»

دەرگای حەساریێ روخابوو. تورک لە کاتێکا قەمەکانیان بە دانی گرتبوو، رژانە حەساریێ. لە پلیکانان وەسەر کەوتن، ئیدومنە لە پشت میزەکەی دەنگی هەراو هوریای بیست. هەستاو بیری کردەوە :« ئیدۆمنە تۆش ئەجەلت هاتوە ...نەکەی ئابرووم بەری ! » سەیرێکی ئەملاولای کرد، دەتگوت دە پەویێ ئامرازی مردنی خۆی هەڵبژێرێ. چەک لە سەر دیواری نەبوو، تازە ئەو پێویستی بەچەک نەبوو، ئەو شەڕی بە شیری نەدەکرد، شەڕی ئەو بە بیرو قەڵەم بوو. بەهاری داو مستێکی توندی لە میزەکەی دا و لە بەر خۆیەوە گوتی: «جێگای من ئێرەیە. هەر لێرە خەباتم کردوە،هەر لێرەش دەبێ بمرم.»

دانیشت و دەستیدا پێنووسەکەی. تورک بە پێلاقە دەرگایان کردەوە. کاتێ چاویان بە ئیدومنە کەوت کە هێدی و ئارامسەری بە سەر پەڕە کاغەزی خویناوی داگرتوە، واقیان وڕما. پاشان نەڕاندیان و گوتیان :

ـ کافر دراوەکەت لە کوێ شاردۆتەوە. پولەکەت لە کوێیە ؟

ئیدۆمنە سەری هەڵبڕی و نێوچاوانی خۆی نیشانداو بە سەبروکە گوتی: «ئەوەتا لێرە دایە »

یەک لە تورکەکان قاقا پێکەنی و گوتی:«برایم سەری بشکێنە بزانە چی تێدایە. ؟»

بەرلەوە ئیدومنە وەلام بداتەوە، شیرێکیان لە تۆقی سەریداو مێشکی بە گۆڕی وەر بوو. خوێن بەسەر پەڕە کاغەزاندا بلاّو بۆوە. تورک بۆ تاڵان بە ماڵێ وەر بوون. هەرچی لە ماڵێدا بوو بردیان و بلاّوەیان کرد.

کاتێ گەیشتنە سەری کۆلاّن، توشی سولەیمانی قولە رەش بوون کە بە سەرۆکایەتی دەستەیەکی چەقۆکێشو بەرەلاّ بەرەو ماڵی پاڵەوان میکێلس رایان دەکرد. سولەیمان راوەستاو بە هەناسە برکە پرسیاری کرد: «ئێوە لە کوێوە دێن؟»

ـ لە کاتی ئیدومنە

ـ نەکەن بچنە ماڵی پاڵەوان میکێلس، دەنا خوێنتان دەخۆمەوە. لە بیری نەکەن کە ئەو کافرە پارووی منە.

سولەیمان لە کاتی وەنیزیک کەوت، سەروروی خۆی شوشت، فێنک بۆوەو هێندێ ئاوی خواردەوە. چەقۆکێشەکانی هاوالی لاسایان کردەوە. یەک لەوان تەماشای دەرگا شکاوی ئیدومنەی کرد دیتی پیرێژن لە عەرزی کەوتوە دەگری و قژی دەڕنێتەوە. یەک لە پیاو کوژەکان گوتی :« دەڵێن چی ئەو پیرێژنەش بکوژین .؟»

یەکیتر گوتی:« لێگەڕێ مستەفا ! ئیتر دەستم شلبوە. ئەم رۆ لە بەیانیەوە ... »

سولەیمان هاواری کرد بۆ پێشەوە. گشتیان بە غار کەوتنە رێ و بۆ خۆتواندن شیرەکانیان لێک دەدا.

پاڵەوان میکێلس کە لە پشت دەرگا خۆی مات کرد بوو. دەنگی لاتی دەستەیەکی دەبیست کە بەرەو ماڵی ئەو دێن. دەنگی سولەیمانیشی دەناسی. بیری کردەوە: ئەوانە بۆ من دێن لە

پشت دیواری چالاوەکەی ئەژنۆی دادا کە پەنا بگرێ. تراساکیشی بردە کن خۆی، لەبەرە خۆیەوە گوتی : « خوا یارمان بێ » نیشانەی خاچی کێشا، رووی کردە کورەکەی و گوتی :
- ئازایە کورم. هەوەڵجار بوو تراساکی دەیبیست کە بابی وا بەخۆشی بیدوێنێ و پێی بڵێ کورم. لە خۆشیان سوور هەڵگەرا و هیچی نەگوت.
تورک بە پەلە نیزیک دەبوونەوە. دەیان نەراند. هەموویان لە پێش دەرگا راوەستان. سولەیمان هەمووی کۆکردنەوە و ئەمری پێکردن. دووکەس لەوان دەبوایە قولاب بگرن، تا ئەویتر بچێتە سەریان و لەوێوە بچێتە حەسار و ئەوانیتر دەرگا بشکێنن.
سولەیمان گوتی: « کەس نابێ دەست لە پاڵەوان میکێلس بدا، ئەو پارووی منە. ئەو کافرە رۆژێک نابروی بردوم. من بە راکێش راکێش دەیبەمە بن دار چناری گەورە و لەوێ لەئو پەتی دەکەم و دەیهاوێمە بەر کسوکەکانی کاندی کە بیخۆن. »
تراساکی ئەو هەرەشەیەی بیست وچاوێکی‌لە بابی کرد. بەڵام پاڵەوان بێدەنگ بوو. لولەی تفەنگی هاویشتبوە سەر دیواری.
تراساکی لە بابی پرسی : « بابە گوێت لێ بوو ؟ »
پاڵەوان بە سەبروکە گوتی : بێدەنگ بە .
لە دەرەوە تاوێک دەنگ بڕان. دەنگی هەناسەی یەکێک دەهات کە لە سەر سینگ بە سەر بانیدا دێتە پێش. پاڵەوان بە دەستی چەپەتراساکی گرت و لە پشت سەری خۆی دانیا. چاوی بڕیبوە سەر دیواری . لە نەکاو سەرێکی قژنی وەک کێوی وەدەر کەوت. خەنجەری بە دانی گرتبوو بریقەی دەهات. تەماشایەکی حەساری کرد کەسی نەدیت. پاشان دەستێک لە سەو دیواری دەرکەوت کە دەبویست لە جێیەک بەند بێ و پێیدا سەر کەوێ. پاڵەوان راست تەقەی لە نێوچاوانی هێنا. دەست لە دیوار کرایەوەو لە کۆلانێ کەوتە عەرزی .
لە دەرەوە هاواریان دەکرد : یالاّ..یالاّ.. دەرگا لە رێسمە چوو. لە وەتاغی سەرێ یای کاترینا لە پشت پەنجەرە هەڵتروشکا بوو شیری دەدا بە منداڵەکەی. رینیو لە کەلێنی پەنجەرەوە تەماشای تراساکی و بابی دەکرد. کاتێ کە دیتی کەلاکی تورک بە گوللەی بابی کەوت، هاواری کرد :
- هەر بژی بابە .!
دایکی گوتی : « رینیوی هەژاری من ! ژیانی ئێمە بە موێەک بەستراوە. دەزانی بابت چ بڕیارێکی داوە ؟ »
- بەڵێ دەزانم. ئەگەر تورک بێنە ژوورێ ئەو گشتمان دەکوژێ.
دایکی بە سەبرەوە تەماشای کرد و گوتی :
- تۆ پیار بای باشتر بوو . ناترسێی !
- دایە ... مرۆڤ جارێک دەمرێ. کەوابوو باشترە بە شەرەفەوە بمرێ.
هەرتکیان بێدەنگ بوون. لە کۆلانێ چ باسبوو؟ دەنگی هەنگاوی تازەو دەنگی تازە دەبیسران.
لە دەرەوە بیوە کێشە. رینیو لایەکی پەنجەرەی کردەوە وگوتی:« دایە دەڵێی دەنگی ئەفەندم دێ. »
بە هەڵکەوت ئەفەندم بوو. لەو کاتە کە ئەفەندم پەنجەرەی کرد بزوەو چاوی بە سولەیمان کەوتبوو کە تورەو سەر خۆش بۆ لای ماڵی پاڵەوان میکێلس دەچێ، کەوتبوە دڵە خورپە. ئەو

پاڵەوانی خۆش دەویست. هەر چەندە ساڵێ دوو جار تووشی گوناحی دەکرد. هەر بۆیەش لە پاڵەوان خۆشی دەهات. بە بێ ئەو بوونایە بە سامە ژیانی ئەفەندم هیچ بوو. لای خۆی بیری دەکردەوە ؟ منی چارە رەش لە ژیاندا خۆشییەکی دیکەم نیە. دایکم لێم دەدا، خەڵکی کاندیش بە تورک و مەسیحییەوە تونلکە لیمزم پێدادەدەن. پارەم نیە، ژن و ماڵم نیە ، پیاوێکی ئازا نیم. جگە لە پاڵەوان میکێلیس هیچ شتێکم نیە. هەمیشە رۆژەکان دەژمێرم. هەر شەش مانگ جارێک خۆشیەکی گەورەم هەیەو تووشی گوناحێکی گەورەش دەبم. کێ چوزانێ! خوا گەورەو خاوەن کەرەمە. دوور نیە دوای مردن ببم بە موشایخ. ئەو دەم لە پەنا مەرقەدی باپیرە گەورەم دەم نێژن. خوا پاڵەوان میکێلیس سلامەت کا، ئەگەر ئەو نەبایە هیچ هومێدێکم نەبوو کە ببم بە مرۆڤێکی پیرۆز.! نەخێر..نەخێر.. ناهێڵم پاڵەوانی من بکوژن. ئەو گەورەی منە، من چەند مریشک و گۆشت بەرازم لە ماڵی ئەو خواردوە.

ئەفەندم لە تورەییان سوور هەڵگەرا، باسکی هەڵماڵین و بە غار بەرەو ماڵی پاڵەوان کرتای. لە بەر پەشۆکاوی بە چالاکی و بە توندی بە هاواری دزستەکەیەوە دەچوو. لە شەقامی گەورە چەند تورک کە تاڵانیان دەبرد بانگیان کرد :

. ها ئەفەندی مەلعون بۆ کوێ دەچی؟ کێ وەدوات کەوتوە وا باڵت گرتوە؟ تورک رێگایان گرت. ئەفەندم زمانی دەرکێشا بوو، تورە ، راوەستا. ئێستا قولە رەشی مەست دەبێ بە ئاوات گەیشتبێ. دەرگای شکاندبێ و پاڵەوانی کوشتبێ. ئەفەندم هاواری کرد و گوتی :

. ئاخر خوا لەبان سەرتان نیە؟ رێگا بدەن بڕۆم بە تالوکەم. رێگا بدەن.

. پێمان بڵێ کێ وەدوات کەوتو؟ هەتا پێمان نەڵێی ناڕۆی .

بیرێکی باشی بە خەیاڵدا هات. ئاورێکی دایەوە گوتی : ( سن میناس )

تورک لە قاقای پێکەنینیاندا،

. بۆ پێدەکەنن بەد بەختینە؟ بۆگوێتان لە دەنگی سمی ئەسپەکەی نیە؟ من بە چاوی خۆم دیتم لە کلیسا هاتەدەر. بەڵێ بۆ خۆم دیتم. ئەو وەدوام کەوت. بە راستی ئێوە نایبینن ؟ ئەوەتا وەنیزیک کەوت. تورک هەستیان بە مەترسی کرد. دەتگوت بە راستی گوێیان لە دەنگی سمی ئەسپ دەبێ. بە هەڵکەوت سوارێک دوور وادەهات. ئەفەندم هاواری کرد :

. ئەوەتا گەیشتێ تەماشا کەن. !

تورک ئیدی ئاوڕیان نەداوەو پاڵاوتیان. ئەفەندم کە دیتی تورک هەڵاتن، لە ترسان لاقی بە عەرزیەوە نوسا، دەلەرزی و دەترسا و دەیگوت : « نەکا راست بێ ! »

ئەو لە شۆرشی رابردودا بە چاوی خۆی سن‌میناسی دیبوو ئەو تورکانەی پەلامار دابوو کە وەستبوویان بچنە کلیسا. ئارەقەی ساردی لە ئێوچاوان دەهاتە خوارێ. ئێستا تەواو بۆی روونبوو کە وا سوار وەنیزیک دەکەوێ. جارێکی تر باسکی هەڵماڵین و هاواری کرد: .. ئەلا..ئەلا ..بە تالوکە رایکرد. هەڵدەهات و دەترسا.لە کاتی ئێدومنە لە دوورەوە قولەرەش و چەقۆ کێشەکانی ناسی کەوا خەریکی دەرگای پاڵەوان میکێلیس ـ ن. ئەفەندم رووی لەوانکرد و هاواری کرد :

. کورینە وریا بن هەموانمان دەکوژن. ئەوەتا سوار گەیشتێ.

سرلەیمان پرسی : « کێ دێن ..شێت بووی ؟ »

. دراوسێ ..

. کام دراوسێ ؟

. سن میناس .. ئەوەتا ..گەیشتێ ..

تێکڕا ئاوڕیان داوە. چاویان ڕەشکەو پێشکەی دەکرد و هیچیان نەدەدیت . ئەفەندیم هاواری کرد :و ئەوەتا..هات .. ئەوەتا ... لە ترسان خۆی بە دەرکی ماڵی پاڵەوان میکێلـەوە نوساند. سوار دەهات لە کانی ئیدومنە تێدەپەڕی. ئەفەندیم بە ئاشکرا دەیبینی. جارێکی تر هاواری کرد :

. ئەوەتا... ئەوەتا.. لێوەکانی دەلەرزین.

. کوا لە کوێیە ؟ من کە هیچ نابینم

. سەیرە ! چۆن نایبینی؟ ئەو سوارە ڕەشپۆشە نابینی ؟ ئەو ئێمەی دیوەو خەریکە پەلامارمان بدا. ئەفەندیم دەرپەڕی و بەرەو دەریا هەڵات. تورک بە هەناسە بڕکە بەدوای ئەودا. ئەوانیش دەنگی سمی ئەسپیان دەبیست کە وەدوایان دەکەوێ. خولامی قوله ڕەش ئاوڕی دایەوە ، سوارێکی لە بان سەری خۆی بینی کە لە حەوا وەک شەپۆل لینگ دەدا. هاواری کردو گوتی : ـ کوڕینەڕاکەن.عەبای لە سەر شانی کەوتبوو، لە ترسان بۆی هەڵنەدەگیراوە بە ڕوتی هەڵدەهات.

تورک پشویان لێ بڕابوو گەیشتنە لەنگەرگا.دەموچاویان شوشت و لە بن سێبەرێک پاڵیان داوە. وەک سەگ زمانیان کێشا بوو.ئەفەندیم لە سەر ڕوان کەوتبوو پشوی نەدەهات. تاماوەیەکی زۆر هیچیان زمانیان نەدەگەڕا. ئاخرەکەی خولامی قوله ڕەش وەدەنگ هات و گوتی :

. قسەی خۆمان بێ چاکمان نەجاتی بوو. چاک هەڵاتین !

* * *

کاندی لە ژێر تیغی تورکاندا دەیناڵاند.مەسیحیەکان دەستیان بەرەو ئاسمان پانڕاکرد بوو لە بەر خودا دەپاڕانەوە.خەلیفە نیشانەی خاچی دەکێشا. تیتر نەیدەتوانی هەرئاوا سەیری سەربڕینی میگەلەکەی بکات.لە بن لێوانەوە یارمەتی لە خوا دەخواست.لە جێی خۆی ڕابوو، دەستی لێکدان و مورتزوفلوس هات. خەلیفە گوتی :

. جلە تازەکانی من بێنە دەمەوێ بچمە کن پاشا.

. ئاخ باوکی پیرۆز ... دەتەوێ بچیە دەرێ ؟ نابێ، تورک هەر کەسێک ببینن سەری دەبڕن... منیش لە گەڵت دێم.

. نا... خۆم تەنیا دەچم... وەرە یارمەتیم بدە جلەکانم لەبەر کەم. خەلیفە لیباسی ئوسقوفی کردە بەرو تاجی ڕوحانیەتی لە سەر نا، وەکازی درێژی ئوسقوفی بە دەستەوە گرت کە دوو ماری زێڕین لە سەری لێک هاڵابوون.

مورتزوفلوس بە چاوی ئافەریتەوە تەماشای دەکرد. خەلیفە مرۆڤێکی ئازاو بە هەیبەت بوو. ریشی ڕوباری بەستەڵەکی وەبیر دەهێناوە. چالاکی و ژیری لە چاوەکانیدا دیار بوون. لە ڕووی شکڵ و بیچمی ئەو بوو کە مورتزوفلوس دەیویست وێنەیەکی خودا بکێشێ و کراسێکی لە هەوری زێڕین بکاتە بەری و لە ئاسمانەوە دایکێشێتە زەوی تا کوشتاری مەسیحیان کۆتایی پێبێنێ.

خەلیفە دەرگای گەورەی ئوسقوف نشینی کردەوە. لە سەر دەرگای مەڕ مەڕ بە پیتی ڕەش

نووسرابوو:« ساڵی ١٢٨١ تورک لە پێش ئەو دەرگایە خەلیفەیان لەدار داوە .ڕوحی شاد بێ.»
خەلیفە کاتی وەدەرکەوتن لە بن لێواتەوە گوتی :«ڕوحی شادبێ» مورتزوفلوس چاوی پڕبوون لە ئاو، بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی:«خوداو سن‌میناس » لە گەڵت بێ!.

خەلیفە پیتە ڕەشەکانی سەر دەرگای مەڕ مەڕی پێ نیشانداو گوتی:« مورتزوفلوس نیگەران مەبە. من نەهەوەڵینی ئەوانم و نە ئاخرینیان دەبم.» خەلیفە هاتە باخی کلیساو کاتی تێپەڕ بوون سلاوێکی لە سن‌میناس کرد و بە قیزو سەر بەرزی بەرەو ماڵی پاشا کەوتە ڕێ. مورتزوفلوس دەیبینی کە وەدەرکەوت و ڕووی لە خەڵک وەردەگێڕاو بە پێشوازی مەرگەوە دەچوو. لەوەی کە بە تەنیا هێشتبووی بڕوا تەریق بۆوە، لە بەر خۆیەوە گوتی:

. ئاخ... مرتزوفلوس ،ئێستا کاتی ئەوەیە کە تێبگەی کە داخوا تۆ گیانت دەبەردایە یان مەشکەی فوو دراوی.! نیشانەی خاچی کێشا و بە دوای خەلیفەدا ڕۆیشت و بەڵام ماوەینێکی هەر دەهێشتەوە،

کاندی لە هەراو کێشە پڕبوو، مەسیحی هاواریان دەکرد. تورک دەیان قیڕاند و پێدەکەنین.دەنگی شین و گریان لەگەڵ تەقەو شکاندنی دەرکان تێکەڵ دەبوون.

خەلیفە دەچوە پێش و لە بیستنی ناڵەو گریانی خەڵک جەرگی ژانی دەکرد. :« تا کەی دەبێ یونانی قەلاچۆ بکرێن! ئاخ...ئەی مەسیح ...ئاخر ئێمە ئینسانین وەک تۆخودا نین. ئیتر توانامان نەماوە. ئەدی کوا ئەو زیندوو بوونەوەی تۆ؟»

شاری کاندی، دیوارەکان، گەڕەک و دانیشتوەکانی، بوونە بەشێک لە بەدەنی ئەو.کاتێ دەرگایەک دەشکا و یان ژنێک لە داخی دەردو ئازاری خۆی لە سەرو سینگی دەدا ، ئەو جەرگی ژانی دەکرد.

کۆمەڵێک تورک شەشدانگ مەست بە کراسی خوێناویەوە لە مەیدانێ پەیدا بوون، ئاچاریان بە خەلیفە کەوت کە سەرتاپێ جلی زێڕکفتی لەبەر دایە، واقیان وڕما و هاواریان کرد: « باڵا ئەو جانەوەرەچیە و دەچێتە کوێ .؟ ڕاکەن دەنا ئەو دێوە هەمووانمان دەخوا. »

خەلیفە ڕاست بۆ لای مەرگ دەچوو. چاوی پڕ بوون لە بێزاری و خەفەت و فیداکاری.دەچوە پێش و هیچی نە دەبینی. هیچ ئاگای لە کۆلان و دوکانان و زەلامان و ماڵە یونانیەکانی دەوروبەری نەبوو. تەنیا بیری لە یەک شت دەکردەوە: «لە ڕێگای خەڵک و بۆ ڕزگاری گەل،» مەرگ چەند شیرینە! پیرەوانی ئینجیل لایان وایە کە مەسیح لە سەر خاچ ڕەنجی کێشا، بەڵام ئیلی! ئیلی ! لە زمانی فیداکاریدا، یانی شادی! خەلیفە لە ناخی خۆیدا هاواری دەکرد: ئیلی ! ئیلی!. هەرچەندی لە بارەگای پاشای وەنیزیک دەکەوت، هەنگاوی توندتر دەکرد. مورتزوفلوس وەگ سەگ بە دوایەوە بوو.

خەلیفەگەیشتە دارچناری گەورە کە سەوز و گەش وەک پێستی پڵنگی ڕاوەستا بوو. با گەڵاو لقەکانی دەلەراندەوە. خەلیفە تاوێک سەیری کرد و وایزانی بەری هێناوە. ئەوبەرەی کە بریتی بوو لە هەزاران مەسیحی کە پێی داکرابوون.

دەرکەوانەکانی بەر بارەگای پاشا ، پێشیان گرت. مورتزوفلوس کە تورکی دەزانی چوە پێش و تێی گەیاندن. ڕێگایان بۆ کردەوە، خەلیفە چوە پێش و مورتزوفلوس دەرگاکانی بۆ کردەوە.

پاشا بە دیتنی خەلیفە گرژ بوو. لە پێش پەنجەرە دانیشتبوو گوێی دابوە دەنگی هاوارو گریانی کاندی. ئەو رۆژهەڵاتیە چاک سروشتەش کە رەوشێکی نەرمی هەبوو، وردە وردە دەبوە وەحشی.تینوایەتی‌تورکان بە خوێنی یونانیەکان گاری لە ویش‌کردبوو. لە لایەک‌شەرمی دەکرد کە پاشابوو، بەلاّم غیرەتی ئەوەشی نەبوو کە دەنگ دەربڕێ و قەمە لە دەست پیاو کوژان دەر بێنێ.

خەلیفە کە بەو قەدو قەوارەوە دەرگای پڕ کرد بوو، بەسەر پاشادا نەڕاندی و گوتی:« پاشا تۆ لە خوا ناترسی!»

پاشا تورە بوو لە وەلاّم دا گوتی:« ئەی ئیمامی گافران ، ئەو کراس و زەرق و بەرقە چیە؟ پێت وایە بەم کەش و فشە دەمترسێنی !خەلیفە بە هەیبەتەوە قامکی بەرەو عاسمان راگرت و جارێکی دیکەش هاواری کرد:

- تۆ لە خوا ناترسی؟ نازانی لە دەرەوە خوێن دەرژێ؟ هیچ دەزانی کە ئەو خوێنانە بە سەری تۆدا دەرژێن؟

- باشە باش ..هەرا هەرایە مەکە. دارچنار لە بەر دمت وێستاوە !

- تەنیا خوا لە پێش من وێستاوە .. من لە هیچ ناترسێم .

پاشا رابوو، دەستیکرد بە هاتو چۆ و پاشان لە بەر دم خەلیفە راوەستا و ماوەیەک بە ماتی و پەشۆکاوی تێی راما. لە زە ینی خۆیدا خەلیفەی دەبینی کە بەو هەموو جلی زێڕ کفت و جەواهێر و تاج و وەکازی ئوسقوفیەوە بە دارچناری‌یەوە کردوە. بەلاّم غیرەتی ئەوەی تەبوو کە فەرمانی ئاوا بدا. لە گەڵ ئەوەش بیری دەکردەوە کە: « هەر چۆنێ بێ پێویستە زاری ئەو بێشەرمە بدروم. من ناتوانم لەوە زیاتر ئەم قسانە ببیسم..» بەسەر خەلیفەدا گوڕاندی و گوتی:« تورەم مەکەو برۆ، من خێری تۆم گەرەکەو لە کەس ناترسێم.»

خەلیفە لە پەنا بردن بۆ خودا وازی هێناو رووی لە سولتان کرد و گوتی :

- زۆر باشە.. ئەگەر لە خوا ناترسی، خۆ لە سولتان دەترسی! ئەوەی بزانە کە سولتان لە دەست کریت وەئەمان هاتوە. گەرەکیەتی لەم دورگەیەدا ئاسایش و هێمنایەتی جێگر بێ. هەر بۆیەش تۆی ناردۆتە ئێرە. بەلاّم تۆ چدەکەی؟ تۆ فەرمانی کوشتار دەدەی. کوشتار دەبێتە هۆی شۆرش. شۆرش دەبێتە هۆی دەست تێوەردانی رووسیا... ببورە پاشا ئەفەندم. بەلاّم وادێتە بەر چاو کە سەرت لە لەشت زیاترە.

پاشا تێکچوو. لە راستیدا خۆشی هەستی بە قورسایی سەری دەکرد. بە هەناسە برکە گوتی:

- باشە ... بێژە پێم ئێستا چبکەم ؟

- خێرا . بێ پشودان، بێ تاوێک وەستان، سەربازان بنێرە و فەرمان بدە کە شەپبور لێبدەن و لغاویان بکەن. لای خۆ تۆ پاشای، ئیرادە ی خۆت نیشان بدە !.

پاشا سەری خستە نێو هەردک دەستانی وەدەتگوت خەریکە توندتری کات. ئاخرەکەی هاواری کرد :

- لەعنەت لەو کاتە کە من پێم لەو دورگە لەعنەتیە نا ! چاوێکی لە خەلیفەی کرد و داوای یارمەتی لێکرد و گوتی :

جەنابی خەلیفە بۆ راوەستاوی، فەرموو دانیشە با تۆزێ بیر بکەینەوە، بزانین چبکەین ؟

. لەو کاتەدا کە ئێمە کاتی خۆمان بە چەندەرێژی دەبەینە سەر، لە دەرەوە مەسیحیان سەر دەبڕن. من ناتوانم دابنیشم و ناشڕۆم. فەرمان بدە . تا گوێم لە دەنگی شەیپور نەبێ، ناڕۆم و دانانیشم.

. ئاخ .. ئەی کریتیە بەدبەختەکان، ئێوە هەموو شەیتانن، لەعنەت لە هەمووتان. لە چاک و خەراپتان . پاشان بە تووڕەیی لە وەتاغێ وەدەر کەوت و چوە سەرای پارەگا. دەنگی هاواری ئەو وروشتنی بە پەلەی ئەفسەرانی تورک کە بە مامزەو شیرەوە بۆ لای پاشا رایان دەکرد، دەبیسرا.

خەلیفە کە لە بەر دەرگا ڕاوەستا بوو، هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:« خودا پێی ڕەوا نەدیتم کە وەک خەلیفەی پێشوو لە بەرامبەر دەرگای ئوسقوف نشین لەداریدرێم. گرنگ نیە. لە جیاتیان مەسیحی لە کوشتار نەجاتیان بوو ئەوەندە بەسە.»

پاشا گەڕایەوە. دەستێکی بە نێوچاوانی داهێناو گوتی :

. ئێستا گوێت لە دەنگی شەیپووران دەبێ. دەتوانی بڕۆی. ئیتر لە دەست هەمووتان وەئەمان هاتووم. نامەوێ کەس ببینم . نازانم لێرە لە سەر زەویم یا لە سەر باروت ڕاوەستاوم.؟ پاشا بێحاڵ لە سەر نێوتەخت درێژ بوو. تەسبیحی کارەبای بەدەستەوە گرت تا تۆزێ بحەسێتەوە. جارجا لە بنەوە چاوێکی لە خەلیفەی دەکرد. کە لە بەر دەرگا ڕاوەستا بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت :« ئەم پیرە قەشە لەعنەتیە چەندە بە سام و هەیبەتدا ئەگەر واتەبایە و رووسی لەعنەتی نەبان، بە هاسانی موسڵمانم دەکرد و شێخێکی بە سامم لێ ساز دەکردا »

* * *

هەر لەو کاتەدا کە پاڵەوان میکێلس ئاوڕی لە کوڕەکەی دەداوە کە لە پەنا ئەو چۆکی دادا بوو، گوێی دابوە هەرای کۆڵان و جنێو وچەقەی ئەفەندم و ئەهرەتەی سولەیمانی قوڵە ڕەش و دەنگی قاچیان کە ڕایان دەکرد،، جار جار لە کانی ئیدومنە دەنگی کریانێکی داغدار دەهات.

پاڵەوان لە کوڕەکەی پرسی : تراساکی برسیتە ؟

بەڵێ بابە برسیمە ..

. بچو بە دایکت بڵێ بێتە خوار نانی ساز کا، وادیارە ئەم رۆ ئیتر دەردە سەریمان نەما، پاشان تفەنگەکەی هەڵپەسارد و ویستی سیغارێک تێبکا. جارێکی تر بوو بە شین و گاهۆر. قامکی پاڵەوانی لە کارکەوتن. گوێی هەڵخست و لە بەرخۆیەوە گوتی:«بێگومان ئیدومنەی ئەفەریان کوشتوە .» سەری ڕاوەشاندو دووبارە بیری کردەوە :« ئەو خۆ پیاو نەبوو. چۆن دەیتوانی بەر بەرەکانی بکات.؟ تەنەی تێدا نیە هەر گریاوە، وەک بەرخ سەریان بڕیوە .» لەو کاتەدا کە خەریکبوو سیغارەکەی داگیرسێنێ، دەنگی شەیپور لە کۆڵانان بەرز دەبۆوە. دەنگی قاچی خەڵک دەهات کە بە تاڵوکە ڕایان دەکرد. پاڵەوان هەستاولایەکی دەرگای کردەوە. دیتی سەر بازی تفەنگ بەشانی تورک بەوێدا دەڕۆن، جارچی وە پێشیان کەوتوەو هاوار دەکا:« ئەی مەسیحیەکان هێمنایەتی بەرقەرارە، لە ماڵەکان وەرنەدەرێ، ئاسایش و هێمنی گەڕاوەتەوە.!»

پاڵەوان میکلس بە بەواشی بۆڵەیەکی کردو گوتی:«دوای ئەوەی کە کوشتاریان کردوە ، ئەو پاشا دوورووو کڵاو چیە سەرباز دەنێری تا هێمنایەتی بگێڕنەوە. بە راستی نازانم داخوا خودایەک

هەیە؟ ئەگەرهەشبێ، بێگومان خەڵکی ئەڵبانیە. ئیشەڵا هەر ئەو ڕۆژانە دەیهێنمە خوارێ، بەڕێ و نەبەوێ شاڵوارێکی دەلنگ فشی دەپێدەکەم!»

بەیانی ئەو ڕۆژە پاشا فەرمانێکی ئاوای دەرکرد: «ئەوەی بوو، بوو. قەزاو قەدەر وایدەویست. ئێستا ئارام بنەوە. ئیتر خوێن مەڕێژن. دەروازەکانی شار بکەنەوە. ئەو مەسیحیانەی پەنایان بۆ گوندەکان بردوە، بگەڕێنەوە. گوندیەبە موسڵمانەکان کە هاتونەشاری، بچنەوە گوندەکانی خۆیان. یاخیەکان چەک دابنێن و لە چیا بێنە خوارێ و خەریکی کارو کاسبی خۆیان بن.ئەوان دڵنیا بن داوێنکیان لە مووی سەری کەم نابێ.سولتان خاوەنی کەرەم و بەزەییە. لە هەموان خۆشدەبێ. ئەی مەسیحی و موسڵمانان! بە قازانجی ئێوەیە کە بۆ فەرمانی پاشا مل ڕاکێشن. دەنا پاشا لە حەساری ماڵی خۆی هەم چناری هەیەو هەم تەناف و سابوون...»

تورک خەنجەری خوێناویان خاوێن دەکردنەوەو دەگەڕانەوە بۆ قاوەخانەکان.لە کاتێکدا قەلیانیان دەکێشا، گوێیان بۆ دەنگی ژنانەی لاوانی خڕپن وقەڵەو کە گۆرانی ئەمان.ئەمان یان دەگوت، ڕادەگرت. مەسیحیەکانیش لە ماڵان دەهاتنە دەر، مەیتەکانیان کۆ دەکردەوە .ناردبوویان کولیوا بگەڕێنەوە بۆ شار. تێکڕا دەستیان دابوە پاچ و پێمەڕە. موورتزوفلوس، کاپامبیس، باکێش، مستبگری و ئەوانیتر کە وزەو توانایەکیان لە بەر دابوو، لەو دیوی دەروازەی کاندی، لە حەساری کلیسای سن‌ماتیو نیزیک گەڕەکی گولستان، قوڵکەیان هەڵدەکەندن.

قەشە ماتولی بە هەناسە بڕکە داوێنی عەبای بەلاداکرد بوو. پێنج پێنج مردووەکانی دەپاڵ یەک دەنا ، بە گوڕجی دوعای بۆ دەکردن.پاشان هەتا بەر دەرگای دنیای دی لە گەڵیان دەچوو. تا سێ ڕۆژ پیاو قەبریان هەڵدەکەند و ژنیش خوێنی دەرک و حەسارانیان دەشوشتەوەو دەگریان نەکا چەقۆ کێشی تورک دیسان بادەنەوە. چونکە لە نیگار کردەوەیان هێشتا هەرەسی جینایەتی تازە دیاری دەدا.

ڕۆژی چوارەم پاڵەوان میکێلس بانگی کوڕەکەی کردو گوتی:

- تراساکی! کاتی ڕۆیشتن هاتوە. پاشا چ‌دەڵێ با بڵێ. ئەو تورکی خەڵکی کاپادوکیە. ناتوانێ لە بارو دۆخی ئەم وڵاتە تێبگات . کاتی کریت گڕ دەگرێ، ئیتر کوژاندنەوەی هاسان نیە.تێدەگەی؟

ئێمە هەر لە بەیانیەوە پێویستە ژن و منداڵان لە شاری وەدەر خەین. من لە پێشەوە دەڕۆم و تۆش لە دوایە. ژنەکان لە نێوان ئێمەدا دەڕۆن. تێگەیشتی؟

بابە ... دەمانچەکەشم بێنم؟

- ئەدی چۆن ؟ بێ چەک چۆن دەبێ ؟ ئێمە دەچینە کن بابە گەورەت. بچو بە دایکت بێژە خۆی و زارۆکان ئامادە کات.

پاڵەوان میکێلس دوای نیوە ڕۆ سواری ماینی خۆی بوو لە دەروازەی لازارەوە چوە کاروانسەرای بیوە ژنێ. لەوێ دابەزی، خاوەن کاروانسەرای بانگ کرد. بیوە ژن هەروا جوان ودڵتەڕ بوو. پاڵەوان پێی گوت :

- ئەو شۆ ماینەکەم لای تۆ بەجێ دێڵم. باش تێری کە، سبەی دێم دەیبەمەوە. هەوڵ بدە سێ ولاخانم بۆ پەیدا بکە .

بیوەژن لەکاتێکا دوگمەی سوخمەکەی بە ناز دادەخست گوتی:
- بۆ پاڵەوان دەتەوێ بڕۆی؟ کوشتار تەواو نەبوە ؟
- تازە دەست پێدەکات . بۆ ئەوەی دەروازەکانی شار دانەخرێن ، بە پێیان و بە تالوکە بۆ نێو شار گەڕایەوە. نیوەڕاستی هاوین بوو. بایەکی گەرم و وشک لە خوارەوە دەهات و تۆزو غوباری لەگەڵ خۆی دەهێنا .
پاڵەوان بەرەو دەریا ڕێی داگرت تا فێنکی دەریای بۆبێت. لە دوور دوورگەی چۆلی «دیا» بە ڕەنگی گڵی و هەڵمساوی، وەک پەرەسێلێکەیەک کە لە سەر دەریا هەڵنیشتبی دیار بوو. جاران کاتێ خەمبار دەبوو، سواری لۆتکەیەک دەبوو تەک و تەنیا دەچوە ئەم دوورگەیەو لە لەنگەرگای خۆرست دەهاتە خوار و لۆتکەکەی دە گاشە بەردێک دەخست، بە کوێرە ڕێیەکدا دەڕزی. هەڵم لە بەردە داخەکان هەڵدەستا ، دوو داعبای دەریا بە بان سەریدا تێپەڕین، تۆزێ ئەوی بوون و پاشان تێ هەڵچونەوە. کەروێشکێک لە بن بەردان دەرپەڕی، لە سەر پاشوان ڕاوەستاو تەماشای دەکرد.
پاڵەوان بۆ لوتکەی دوورگە سەرکەوت. تەماشای دەوروبەری خۆی کرد، عەرزێکی چۆڵ و بەردەلان، دەریای قوڵ و بە شەپۆل ڕۆخەکانی دەکوتا. هەوا لە ڕادە بەدەر سافبوو. لە بەر خۆیەوە بیری دەکردەوە : «دەمویست لێرە لە نێو ئەم بەردانە ژیابام. من لە ئاوی شیرین و لە سەوزە بێزارم... لە ئادەمیزادیش بێزارم.»
پاڵەوان وەپەلە کەوت. لە دەروازەی کاندی تێپەڕیو ڕێگای کۆڵانە تەنگەکانی گرتە بەر. هێشتا چەند مەیت نەنێژرابوون. لە کۆلان کەوتبوون و بۆگەنیان لێ دەهات. گەیشتە بەر دەرگای ماڵی میستیگری. پاڵی بە دەرگایەوە ناو چوە ژوورێ. چاوی گێڕا کەس دیار نەبوو. هاواری کرد : خاوەن ماڵ!
دەنگێکی نەرم و مردوڵە. وەک زیقەی چوێلەکە بەرز بۆوە. پاشان سەری کەچەڵی بیرتولدو لە بن عەبا وەدەر کەوت. لە ترسان چاوی نەیدە دی. هاواری کرد: ئەوە کێیە؟ کێ لە وێیە ؟
- بیرتولدو مەترسێ منم.
بیرتولدو پاڵەوان میکێلسی ناسی، هاتەوە سەر خۆ.دەستی بۆ سڵاو بەرز کردو گوتی:
- سڵاو لە ئازاترین پیاوان !
- ئەوە نەساخی ئاغا بیرتولدو ؟ بۆچی دەلەرزی. سەرماتە ؟
- نا.. پاڵەوان میکێلس دەترسێم.
- شەرمێ ناکەی ؟
- نا ... پاڵەوان ، شەرمێ ناکەم ..
بیرتولدو عەبای دەخۆی وەرگرت و پاڵی وە دیواری‌دا و پاشان لە بەر خۆیەوە گوتی:« یا سن دنیس! من دەتوڵکەیەک کەوتووم کە شێریان تێدا بەرەڵاکردون. نیشانەی خاچی کێشا و دووبارە بە بۆڵەبۆڵ گوتی : ئەی خودای گەورە !هەرچەندی بیری لێ دەکەمەوە ئاقڵم نابڕێ. چۆن شتی وادەبێ،پیاوێک چەتۆ دەست داتێ و سەری یەکی دیکە بڕێ؟ بەراستی من لەوە تێ‌ناگەم. من ناتوانم مێشولەیەک ئازار بدەم. بێژم چی؟ باوەڕ بکە بۆ خەیار بڕینیش دەستم دەلەرزێ.»
- میستیگری لە کوێیە ؟

. خوا بیپاریزێ . چت پێ بڵێم پاڵەوان . ئەو مستیگرییە چەندە مرۆڤێکی باشە! لە جەنگەی کوشتاردا هاتبوە خانوە چکۆلەکەی من کە بهێنێتە ئێرە. من ئەوەندە دەترسام تەمدەتوانی بڕۆم. ئەو لەئامێزی کردم، سێ‌تارەکەی لە سەر شانی دانابوو دەرۆیشت. ئازانی پاڵەوان ...تورکی چەندە بە سام، بە سمێڵی چەخماخی و بە لاتی وەک کۆڵەکە، لە کۆلانێ وەستا بوون. من عەبام دەسەروچاوم وەر گرتبوو، هیچ کوێم نەدەبینی و ئاواش بە رەحەت تر بووم. هەرئاوا منی بردە حەسارێ و لە پەنا چاڵاوی دانام. ژنەکەی کە منی دیت، تەماشای سێ‌تارەکەی کردو بە تووڕەیی بە سەریدا گوڕاندی کە : هەربینا بە سەریان دادابێ و سەریان بڕێن، تۆش راست لەو کاتەدا دەچی سێ‌تارلێ‌دەدەی. لام رابوو ژنەکەی منیشی بە سێ‌تار دانابوو. بەلاّم خوا رەحمی کرد، ژنەکەی بەیانی چوە گوندی خۆیان و ئێمە لە دەستانی ئاسودە بووین.

لەوکاتەدا مستیگری وەژوور کەوت.:

. سلاّو پاڵەوان میکێلس ! بۆ خانوەچکۆلەی من بە خێر هاتی. دەزانم چکارێکت بە منە، ئێستا وا لە ماڵی ئێوەڕا دێمەوە. کەی قەوارە بڕۆین؟

. سبەی بەیانی ... پاکێش و کاپامیبیش ئاگادار کە.

. زۆر باشە پاڵەوان . پاشان قامکی بۆ بیرتولدو راداشت و گوتی : { ئەویش }

بیرتولدو بە چاوی زەقەوە گوێی دابوبەو دەیزانی ئەو کریتیانە بە لاتاو باسی چدەکەن. ئەوان لە باسی تفەنگ و رۆیشتن بۆ چیا دەدوێن. دیسان وەلەرزە کەوت. پاڵەوان داهاتەوەو تەماشایەکی پیرە مێردی رەوشت پاشی کرد کە خۆی دەعەبا وەر پێچا بوو، گوتی :

. ئەویش لە گەڵ خۆمان دەبەین. نانخۆرێکی زیادی گرنگ نیە. ئەو بێگانە و میوانی ئێمەیە.

کونت سەری لە بن عەبا هێنا دەر. چەند تاڵە مووی بە سەریەوە مابوو لە ترسان قرژ ببوون. بە ناڵینەوە گوتی:

. بۆ چیا ! من بێم بۆ چیا ؟ ئەویش بە تفەنگەوە ؟

پاڵەوان میکێلس لە کاتێکا بۆ لای دەرگا دەرۆیشت گوتی :

. نا بابە... تۆ لەگەڵ ژن و منداڵان بەو چیرۆکی شیرینیان بۆ بگێڕەوە و سەریان گەرم بکە. جارێ ماڵئاوا..

میستیگری پرسی :

. پاڵەوان ئێمە لە کوێ یەکتر دەگرینەوە.؟

. لە چیای سلێنا. لە سەرەوەی گوندی پێترۆکفالو، لە ئاغەڵی مەڕەکانی سیفاکاسی پیر.

پاڵەوان دوور کەوتەوەو رۆیشتە نێو کۆلانێکی تەنگەوە. باربابانیسی هیلاک وشەکەت بە روو گرژی بۆ ماڵێ دە گەرایەوە. کە چاوی بە پاڵەوان کەوت راوەستا و گوتی :« پاڵەوان وەک دەڵێن خوێنێ زۆر رژاوە، چۆن دەکرێ تۆڵەی بستێنینەوە.؟»

پاڵەوان کابرای لەسەر رێی خۆی لاداو گوتی « من پیاوی ئەحمەقم خۆش گەرەک نیە.»

لە بەر ماڵی پاڵەوان ستیفانیس راوەستا. ئەو کەشتیوانی‌گرژو مۆن لە سەر تێوتەختی خۆی دانیشتبوو، پینەی دەکرد. ئەو چونکە بە سەڵتی پیر ببوو، هەموو کارێکی ژنانەی دەزانی. لیباسی دەدروو، چێشتی لێدەنا، جلی دە شوشتن و ماڵی خاوێن رادەگرت. رۆژی‌دەچرای خێراتی سێ‌نیکولا

دەکرد. هەر چەند سن نیکۆلاٌ رۆژی نوقم بوونی پاپۆرەکەی دە فریای تە کەوتبوو، پاپۆرەکەی لە نوقم بوون نەجات نەدابوو. کەشتیوانی پیر هەموو رۆژێ دەیگوت: «سن‌نیکۆلای نەقیر لە کاتی نوقم بوونی پاپۆردا چی لەدەست دەهات و چۆن دەیتوانی دەفریای من بکەوێ؟ بەلاٌم هەر چۆنێک بێ شیاوی ئەوەیە کە رۆنی بۆ دەچرای بکەم» . چراکەی تا سەر لێوان پڕ دەکرد.

پاڵەوان ستیفانیس کە دەرزی بە دەستەوە بوو، سەری هەڵێنا و رابوو گوتی :

ـ سلاٌو پاڵەوان میکێلس! خۆر لە کام لاوە هەلاٌتوە کە واتۆ لێرە دەبینم؟

پاڵەوان میکێلس بێ ئەوەی دەنگ بکا چاوێکی لێکرد، ستیفانیس دوو بارە گوتی :

ـ دەزانم خەریکی چی؟ تۆ خۆت بۆ شەڕ ئامادە دەکەی، لە داوتەڵەبان دەگەرێی و دەتەوێ دەستە تەواو بکەی... بەلاٌم ئەگەر ناوی منت نوسیوە، رەشی کەوە، من لە گەڵ تیم.

ـ لام وایە پاڵەوان ستیفانیس تۆش خۆت بۆ شەڕ ئامادە دەکەی. کەوابوو لەگەڵ من وەرە.

ـ گوتم ناوی من رەش کەوە، من و شەر لە وشکی؟ ئەم کارە لەگەڵ زەوقی من رێک ناکەوێ. بۆ ئەم کارە لاق پێویستە، منیش لاقم نیە، شەلم. من دەچم بۆ ‹سیرا› و لە گەڵ کۆمەڵی کریتیان پێوەندی دەگرم، بەڵکوو پاپۆرێکیان لێ بستێنم.

پاشان رووی کردە لای پەیکەری سن‌نیکولاٌ و گوتی : « گوێت لێ‌یە سن نیکولاٌ؟ ئیشەلاٌ ئەم جارە وەک جاری رابردوو ئەم پەندەم بە سەر ناهێنی !»

پاڵەوان میکێلس گوتی :

ـ بە سلاٌمەت پاڵەوان ستیفانیس. ئەگەر یەکترمان نەدیتەوە گەردنم ئازا کە. هیوادارم خوا بتبەخشێ.

پاڵەوان ستیفانیس دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

ـ پێرێ پاڵەوان پولیکسینگیس- یش هەر ئەو قسەی دەکرد. دڵنیا بە من نامرم. ئەم جۆرە جیابوونەوە لە من فایدەی نیە.

چاوە شەیتانیەکەی دەتروسکا. چاوێکی لە پاڵەوان میکێلسی کرد کە بۆلای دەرگا دەچوو، هاواری کرد:

ـ هۆی پاڵەوان میکێلس ! دیتت پاڵەوان پولیکسینگیس وەپێش تۆ کەوت. ئەو ئێستا ئاڵای خۆی هەڵکردوە و لە گوندی ‹کاستلی› کە شارۆچکەیەکی گەورەی تورک نشینە ناوەندی خۆی دامەزراندوە. وەک دەڵێ خانمەکەشی بردۆتە ئەوێ.

پاڵەوان میکێلس گرژ بوو، دەرکەی وەها توند پێوەدا کە لاشپانەی بزوتن. پاشان بازدێکی دار چوە دەکوڵانێ.

رۆژی دوایی سۆزی کاروان کەوتە رێ. پاڵەوان باڵتۆی مەخمەری‌هاویشتبوە سەر شانی، دەمانچەو خەنجەری لە خۆ شەتەک دابوون و لە بەرایی دەرۆیشت .خێزانی بە بەژنێکی بەرزو هەیبەتێکی پیاوانە منداڵە شیرخۆرەکەی لە ئامێزی گرتبوو، .رێنبو بوخچەی خشڵ و جەواهیراتی هەڵگرتبوو لە پەنا دایکی دەرۆیشت. تراساکی لەدوای هەموانەوە بوو. هەموو‌جارێ بۆ ئەوەی گەورە بنوێنێ خۆی هەڵدەکێشا. عەلیاغا پێشتر دوو کەری بارکردبوون و دەرۆیشت.

عەسکەری تورک بە پۆزێکی وەحشیانە لەکاتێکاتفەنگیان هاویشتبوە سەر شانی، دەروازەی

شاریان دەپاراست. گوندییەکان بە کۆمەڵ دەهاتنە شاروەدەگەڕانەوە. تیژەو هەرای خەڵکو زەڕەی گویدرێژان سەری لەخەڵک دەشێواند. پاڵەوان میکێلس دەسەری گەورەو ڕەنگاو ڕەنگی خۆی هێنا دەری، وای تیشاندا کە دەیەوێ سەروچاوی بسڕێتەوە. خۆی تێکەڵی پۆلێک کارواتچی گوندی کرد و لە دەروازەی تێپەڕی، تراساکیش بە فیتو لێدان چوە دەرێ. لە ڕۆژ ئاوادا هەموویان گەیشتنە ماڵەگەورەی پاڵەوان سیفاکاسی بابە گەورەی گشتیان.

حەساری ماڵێ پڕ بوو لە نەوەی کوڕ وکچ. وەرزی ترێ چنین بوو. کرێکاران هێشوە ترێی گەورەیان دە تەشتی مەزن دەکرد و لاوانی بە تاقەت لاقیان تا ئەژنۆیان هەڵدەماڵی وترێیان دەشێلا. هەموویان لە بۆنی شەرابی نەگەیشتوو سەرخۆش دەبوون.

پاڵەوان میکێلس لە خۆشی و لە تامی شەراب کونەتفنگی وە خرو هاتن. بۆنی شەرابی نەگەیشتوو لە بەر لوتی ئەو بۆنی شیرینی خوێنی لێدەهات، هاواری کرد و گوتی :

- سڵاوتان لێبێ برازاکانم. بە بیستنی دەنگی ئەو بای کاترینا ئاوڕی دایەوە، چونکە قەت دەنگێکی ئاوا شادی لەمێردەکەی نەبیستبوو، هەموویان لە نێوەراستی حەساری ڕاوەستا بوون. بابە گەورەی پیر بۆ بە خێر هێناتیان لە بەر هەیوانێ دەرکەوت. باسکە وشکەکانی کە وەک بەفری سپی لە تۆزلی گوشادی کراسەکەی هاتبوونەدەری. لێک کردەوەو گوتی :

- خۆش هاتن رۆڵەکانی من. بخۆن و بخۆنەوە، لێرە هەمو شت بۆ ئێوەیە .

پاڵەوان میکێلس گوتی :

- بابە ! من بوک و نەوەکانت بۆ بەجێ دێڵم و خۆم وەشاخی دەکەوم.

- بە سلامەت ، میکێلسی پیرۆزی من! تۆ هەمیشە کەللە شەق بووی، هێشتا ئاقڵ نەبووی.

- بابە من کاتێک ئاقڵ دەبم کە کریت ئازاد بێ .

پیرە مێرد بە گاڵتە گوتی: « ئاخ . کەوابوو باشترە کریت قەت ئازاد نەبێ. کاتێ مرۆڤ ئاقڵ بوو، ئیتر ژیان تامی نامێنێ ! »

باوک و کوڕ بەم چەشنە گاڵتەیان دەکرد. ژنەکانیش لە نێوە راستی حەساری مێزێکی گەورەیان بۆ شێو خواردن ئامادە دەکرد.

بوک و نەوەکانی کە لە کوڕی زیندوومردووی سیفاکاسی پیرپاشەکەوت ببوون، گشتیان بە چالاکی دەهاتو چۆ دابوون و خزمەتیان دەکرد. حەسارو ژوور لە توخم و تۆی پیرە مێرد پڕ ببوون. لەم ڕۆژە دژوارەدا خەڵک لە گوندەکانی دەورووبەریشەوە خۆیان گەیاند بوە ژێر سێبەری پیرە مێردی، هەموو کەروگاو سەگ و پشیلەشیان هێنا بوو. ئەو ڕۆژە ماینی پاڵەوان میکێلس ڕەگەڵ ڕەوەی دیکە کەوتبوو.

هەموو جارێ کە دەنگی پێیان لە کۆڵانان دەهات، پیرە مێرد دەهاتە دەرو بە باوەشی ئاواڵەوە پێشوازی لە میوانانی تازە گەیشتوو دەکرد. هاتنی پاڵەوان میکێلس گوندەکانی دەوروبەری ئاروژاندبوو. ڕۆژی دوایی پاڵەوان سواری ماینی خۆی بوو، لە گوندەکاندا دەگەڕا و بۆ ڕاپەڕین هانی دەدان. دەگەیشتە هەر گوندێک بێ ئەوەی دابەزێ، هاواری دەکردو دەیگوت

- ئەی برایان لە کاندی خوێن ڕژاوە. شەرافەت داوامان لێدەکا تۆڵەی کوژراوەکان بستێنینەوە. بۆ پێشەوە، چەک هەڵگرن. دەچوە چیای سلناو خەڵکی گوندەکانی ڕەدوای خۆ دەدا. لەو شوێنەی

کە ئاغەڵی مەڕەکانی باوکی بوو، ئاڵای هەڵکرد. لەسەر ئاڵاکەی کە پارچەیەکی ڕەشبوو، بە پیتی سوور نووسرابوو: « ئازادی یا مەرگ ». پاشان دووپیاوی ئازاو بەکاری ناردە سەر لوتکەی چیا تا لەوێ ئاگر بکەنەوە. لوتکە چیاکانی تر لە ڕۆژ هەلاّت و ڕۆژ ئاوا دەبوایە پەیامی ئەو وەربگرن و بۆ ناوچەکانی دیکەشی بنێرن.

تئودوریس لە ڕێگای هاوکارەکانی خۆیەوە لە هاتنی مامی ئاگادار بوو. کاتێ چاویان بە یەکتر کەوت،برازا دەستی مامی،ماچ کرد لەکاتێکا لە خۆشیان ڕەنگی سوور هەڵگەڕابوو، گوتی:

. بەخێر هاتی مامە پاڵەوان میکێلس! من ئاڵای خۆم و هاوڕێکانم دەخەمە بەردەسەلاتی تۆ. هەرچی تۆ فەرمان بدەی وادەکەین.

پاڵەوان میکێلس گوتی: « تئودوریس، من بە تۆم گوتبوو تەنیا بە کارەکانی خۆت ڕابگەی. بەلاّم تۆ منداڵی دوێنێی، هێشتا سمێڵت نەهاتوە، ڕانەوەستای، ویستت سەربزێوی بکەی. ئێستاش گورج ئاڵاکەت بپێچەوەو دەباخەڵتی بنێ،و تەنیا کاتێ وەدەری خە کە من بکوژرێم. »

پاڵەوانانی دەوروبەر ئاگریان بینی و پەیامیان وەرگرت و لە هەموو لایەکەوە لە ئاغەڵی مەڕەکانی پاڵەوان سیفاکاس کۆ بوونەوە. پاڵەوان میکێلس پیاوێکی ناردە کن باوک و ئیجازەی لێ خواست کە چەند مەڕ بۆ هاوکارانی بکوژێتەوە.

پیرە مێرد ئەسپاردی :

. شانازیە بۆ مەڕەکانم کە ببنە خۆراکی پاڵەوانان. تەنیا بەرانە ڕەشی من دەست لێ مەدەن. ئەوم بۆ ڕۆژی تازیەی خۆم ڕاگرتوە. لە ڕۆژی میعراجی مریەمی پاکیزە پاڵەوانان جێژنێکی شاہانەیان ساز کرد. شوان مەڕیان کوشتبوو، خەریک بوون کەبابی ساز بکەن. پاڵەوانگەل لە حەساری کۆ ببوونەوە، خەریکی وتووێژ و ڕێکوپێک کردنی کارەکانیان بوون. ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی بە شکۆ بوو. بابە گەورە بە پێ،یان هاتبوە سەر چیا تاله کۆبوونەوەی نەتەوەیی دا بەشدار بێ.

پاڵەوانگەل گشتیان چاردە کەس بوون. هەریەکەیان چیرۆکێکی تایبەتی خۆی هەبوو. پیرەکان بە شاڵواری تایبەتی و دەمانچەو سەروشەدەی کریتی، وەک بەشێکی دیرۆکیان لێ هاتبوو. شەپۆلێک لە هەوای گەرم، وەک سایەی شەهیدانی پیرۆز لە بان سەری سپیان لە هاتو چۆدا بوو. سێ کەس لە پاڵەوانگەل، لە نێویاندا بە ئەبەدی دەژمێردران، لەسەر کەوڵە مەڕ و تەختیان دانابوو. لە وان گەنجتر لە دەوروبەریان لە سەر بەردان دانیشتبوون. ئەوان تەمەنیان نەگەیشتبوە ۷۰ساڵ، پلەو پایەیان لەو سێ کەسە نزمتر بوو.

باوە پیرە لە نێوە ڕاستێ دانیشتبوو. ئەو کەڵە پیاوە سەت ساڵە ڕیشی سپی،و درێژی بە سەر سنگی توکناویدا هاتبوە خوارو جێ برینەکانی شۆڕشی مەزنی لە بەر چاوان دەشاردەوە.برۆ ئەستوورەکانی بەسەر چاوانیدا هاتبوون ،بۆ ئەوەی باشتر ببینێ، جاروبار هەڵیدەدانەوە. سەرەڕای پیری ڕومەتەکانی هێشتا سوور بوون و کاتێ تووڕەدەبوو، خوێن لە لاجانگی دەکوڵی. دەمارەکانی هێشتا وشک نەببوون و بێ وەستان کاریان دەکرد وبە ڕەوانی خوێنیان دەگەیاندە هەموو ئازای بەدەنی. ئەم لەشە داتەپیوە هێشتا بە ئیشتیا دەیخواردەوەو هێشتا تینووی دنیا بوو. دەهێشتا هەر بە زوقو شۆقی بیست ساڵی سەیری جیهانی دەکرد. لە تەمەنی پیری،دا، سەیری قەدو بالاّی پیاوەکانی لە خۆی بەرەژێرتر دەکردو بە چکۆڵەی دەهاتنە بەرچاو.

نازی دەکردن و بۆ دڵخۆشی دانەوەیان، دەستە پان و ئەستورەکانی بە سەریاندا دەهێنا. ئەو خۆشی گەرەک نەبوو خوێن بڕژێ، بەڵام کە دەبوو بەشەڕ هەموو شتێکی بە سوور دەبینی و لە بیری دەچۆوە کە تورکیش ئادەمیزادن و باسکی لە لێدانیان ماندوو نەدەبوو.

جوتیاران هەروەکداربەرووی پیر وزەلامەکۆن ساڵ دەپەرستن، ئەویشیان دەپەرست و لە بن سێبەری دادەنیشتن. رۆژەکانی جێژن و یەکشەمۆیان لە دەوری کۆ دەبوونەوە. ئەو بیرهێنەرەوەی یەکێک لە خودایانی قەدیمی ئەبەدی بوو. کاتێ ریش‌سپیەکانی کریتی کۆ دەبوونەوە تا لە بارەی ئازادی یا مەرگ بدوێن، ئەویان لە نێوەراستێ دادەنا. ئەو پاڵەوانانەی کە بۆ وتاردان رادەبوون، دەبوایە تەماشای ئەو بکەن، تا تین و توانایان بێتە بەر.

بەڵێ،... لەو رۆژەشدا بابە گەورە سەرۆکی کۆبوونەوە بوو. لە لای راستەی ئەو درندەیەکی دیکە بە ناوی پاڵەوان مانداکاس دانیشتبوو کە ریشێکی کوزرەی دانابوو، ملی دەتگوت ملی گایە. زەلامێکی چوارشانەو قەوی،شوێنی برینی زۆری لە سەروچاوان دیار بوو. گوێچکەی نەبوو، لە شۆرشی ساڵی ١٨٢١دا، تورکێک گوێچکەی لێکرد بزوە، خوارد بووی. دوو قامکی دەستی چەپیشی بە گەلچی مار پێوە دابوو، قامکەکانی پەڕاند بوو. چێژی لە خوێن رشتن وەر دەگرت. کاتێ کریت چەکی دەست دەدایە.ئەو باسکی چەپی بە بەر چاویەوە دەگرت و تورکی پەلامار دەدان. گوندی دوژمنی دەسوتاندو خەڵکی تاڵان دەکرد ژنە تورکی دەکوشتن بەڵام دەستی لێ‌نە دەدان. ئەو تەنانەت لە گەڵ ژنی خۆشی نەدەنوست. کاتێک ژنەکەی فیشەک و خواردنی بۆ دەهێنا، بانگی دەکرد:« هۆی لەعنەتی ! لێم نیزیک نەبەوی‌و پیسم بکەی. هەرچی هێناوتە لە سەرەردێکی دابنێ و برۆ !» بەڵام کاتێک شەر تەواو دەبوو، بێجگە لە رابواردن لە گەڵ ژنان چیتری نەدەکرد.لە گەڵ پیری، دەردو بەڵای لابەلاش رووی تێکرد بوو. جمگەکانی ئەستور ببوون. چاوی کز ببوون، بە داخ‌و حەسرەتەوە تەماشای ژنانی دەکرد و بەڵام دەستی لێ‌نەدەدان. زۆرجار هەناسەی هەڵدەکێشاو دەیگوت: «جێگای بڕوا نیە، ژنەکان لەو ساڵانەی دواییدا زۆر چەموش بوون.» تاقە خۆشی ئەوەبوو کە لە کۆبوونەوەی پاڵەواناندا بەشدار بێ، تا بە سنگی رووت وەدەمانچەی زێوو جێ برینەوە خۆ هەڵسەنێو خۆی بنوێنێ.

لەلای چەپی بابە گەورە، پاڵەوان کانسیرماس، ئەو دزەی دەریایی دانیشتبوو. ئەو زەلامێکی باڵابەرزی بە قەد چەڵەکەیەک بوو. هەمیشە ریشی دەتاشی‌و چاوێکی خێل بوو. ئەو نەگەورەیی‌و رەسەنی بابە گەورەو نە ئازایەتی پاڵەوان مانداکاسی هەبوو. قەت بڕوای نە بە خودای بوو نە بە شەیتانی. لەو کاتەوە هەستی بە توانای خۆی کردبوو، تەنیا باوەڕی بە خۆی هەبوو. بەڵام ئێستا پیرو بێتاقەت ببوو. چونکە ئیتر نەیدەتوانی دەریا ببڕێ و دزی بکاو تەنانەت نەیدەتوانی بە بێ ژانە پشت بچێتە حەسارێش. لە خۆی بێزار بوو، لە گوندەکەی خۆی بە زیندوێ سەری خۆی دفن کرد بوو، کەسی نە دەبینی. بڕیاری دابوو وەک هەشت پای بەحری بە ناهومێدی و بە تەنیایی بمرێ. دەیگوت :

کەسێکی تین و توانای نەماوە، ئیتر مانی ژیانی نیە. ژیان خەباتە، لە دەریا یا لە وشکانی. کەسێک نە توانێ لە بیورێک کەلک وەرگرێ، یا نەتوانێ فەرمان بە سەر ئەو کەسانەدا بدا کە دەتوانن کەلکی لێ وەرگرن، بمرێ باشترە.

یازدە پاڵەوانی دیکە هاتن بە دەورە لەسەر بەردان دانیشتن. ئەوان کەم تەمەنتر بوون و تەمەنیان لە ٧٠ کەمتر بوو. تیکەڵێک بوون لە رووخۆش و کرژ و مۆنی. هێندێکیان زەلام و قەبە بوون و هێندێکیش وردو وریا وەک ئینسانان. ئەوان تیکەڵێک بوون لە بارکی بنەماڵان و لە شوانی بەر مەڕی کە بۆنی نێری و ئارەقەو پنگی سەحرایان لێدەهات. قەشەیەکی دەرسەدەری شەلی داتەپیوی بێکارەی سەر بە ‹غاری مەسیح› بە چاوی کاڵ و ریشی تزیەڵەوە رەگەڵیان کەوتبوو. کاتێ تەماشای دەرسەدەریان دەکرد، هەموو دەیانگوت: «ئەوە کێیە ئەم کەروێشکە قەقبرە لە لانی شێراندا چدەکا؟» بەڵام باشبوو کاتی شەر بیاندیبایە. بڕوا نەدەکرا ئەم شەلە وەک ئاگر وابێ. هەر ئەو زەلامە لە جێژنەکاندا سازی وای لێدەدا بەردبشی وەسەما دەخست. کاتێ وتاری دەدا، گوێگر حەزی دەکرد گوێی بداتێ.

پاڵەوان پولیکسینگیس - یش بە کەیف و سەر خۆش بە دەمانچەی زێوەوە. لە کۆبوونەوەدا بەشدار بوو. دەسرەیەکی هەوریری بۆن خۆشی دیاری ئامینەی لە باخەڵدا بوو. لە بەرامبەر پاڵەوان میکلس دانیشتبوو. چاویان تێک بڕیبوو بەڵام بێدەنگ بوون.

هێندێ پێشنیاریان کرد کە بەدوای چس‌گورگیشدا بنێرن، چونکە ئەو ئێستا وەک هاوڵاتیانی دیکە وەخۆ کەوتووە. وازی لە دەرس و کتێب هێناوە. گوند بە گوند دەسوڕێتەوە، رۆژەکانی یەکشەمۆ لە کلیسا وتار دەدا... بەڵام بابە گەورە گوتی:

- ئەو لە هەموو ژیانیدا بێجگە لە قسە هیچیتری نەکردوە. ژیانی پاڵەوانی ژیانێکی سەختە.جگە لەوە ئەو هێشتا فرە گەنجە.

دانیشتوان روویان بۆ لای سەرۆکی کۆبوونەوە وەرگێڕاو تەماشایان کرد. پیرە مێرد ڕابوو، باسکەکانی بەرەو ئاسمان بەرز کردەوەو دەنگی وشک و بە سامی لە چیا دەنگی دەدایەوە:

- ئێوە ئەی پاڵەوانان! بۆ چیاکانی من بەخێر هاتن. بۆ مرۆڤێکی کریتی تەنیا دوو شت گرنگە. ئەم دوو شتە هەموو ژیانی ئەوە. خودا و تفەنگ - کەوابوو کۆبوونەوەی ئەمڕۆ بە ناوی خودا و تفنگ دەکەمەوە. هێشتا لە بارەی کریتەوە قسە زۆرە ئەشێ باسیان بکەین. هەریەک لە ئێوە دەتوانێ رابێ و هەرچی لە دڵیدایە دەری ببڕێ. بەڵام باشترە بەر لە هەموو شت، قەشەی دێری ‹عەبای مەسیح› دوعامان بۆ بکات.

قەشە کە پێشتر جلی تایبەتی دوعای لەبەر کرد بوو، لە قوڵکە بەردێک نیزیک بۆوە، کە نەختێ ئاوی بارانەی تێدا بوو. پاشان داهاتەوە چڵە پنگێکی کێوی بە رەگەوە هەڵکەندو دەستیکرد بە دوعایان. پاڵەوانەکان گشتیان رابوون و گوێیان داببوویە. کەم بووە ئەوانەی شتێک لە وشەگەلی کلیسا تێگەیشتبان. خودا و سەرکەوتن بە سەر وەحشەکاندا و دادپەروەری و بەزەیی و ئیمان. بەڵام ئەوانە گرنگ نەبوون. ئەوان تەنیا کریت- یان دە بینی. کریت، ئەو دایکە داخدارو برسی و بێ‌بەتی و خوێناوییەی کە دەستی بەرەو ئاسمان بەرز کردۆتەوە.

پاڵەوانگەل نیشانەی خاچیان کێشاو دانیشتنەوە. ئاماوەیەک کەس زمانی نەگەڕا. قین گەرووی گرتبوون و نەیاندەتوانی بیروڕای تاڵیان دەر بڕن. ناچار جارێکی دیکەش بابە گەورە رابوو رووی کردە دەستی راستی و گوتی:

- پاڵەوان مانداکاس! تۆ کە سێکی بە گەنجیەتی باروتت بە کەچکان دەخوارد. دوو بەرە باب

لە وشکانیدا شەرت کردوە. ئەگەر بە گەنجیەتی سەر بزێو بوری، ئێستا بە تێپەڕ بوونی تەمەن تۆزێ ئاقڵ بووی. کەوابوو وەزمان وەرەو بیروڕای خۆت دەر بڕە.

پاڵەوان مانداکاس گوتی:« لە پێشدا با گەنجەکان وەدەنگ بێن. »

پاشان بابە گەورە رووی کردە لای چەپەی و گوتی :

ـ پاڵەوان کاتسیرماس ! تۆ دەڵێی چی ؟ تۆش پتر لە دوو پشت لە دەریادا شەرت کردوە. ساردو گەرمی زەمانەت چێشتوە. هەموو رەنگێکت دیوە. بیروڕای تۆ تەواوە، قسە بکە

پاڵەوان کاتسیرماس برۆی تێک نان و گوتی :

ـ شتێکم نیە بیڵێم، بیروڕای پیاوی بێتوانا نرخی نیە. ئەوانەی گەنجن با قسە بکەن.

سیفاکاسی پیر دەستی لەسەر دەمانچە دانار گوتی: « زۆر باشە، با لاوەکان وەدەنگ بێن »

قەشە رابوو، بە لاقی کورت و قەڵافەتێکی چوار شانەوە، جێگای برینی شیر وگوللەی بە هەموو لەشیەوە دیار بوو. رووی کردە پاڵەوان میکێلس و لێی مۆر بۆوە و گوتی :

ـ پاڵەوان میکێلس ! پێم وایە تۆ دەبێ بەر لە هەموان دەنگ بکەی. چونکە تۆ ئێمەت بۆ ئێرە بانگ کردوە تۆی لە کوشتار دەربازبووی گەیشتوویە چیاو خەباتت دەست پێکردوە. ئێستا دەتەوی چیمان پێ بێژی ؟

پاڵەوان میکێلس رابوو، خوێن لە دەمارەکانیدا وەجۆش هاتبوو، پاڵی وەلولەی تفەنگەکەی داو گوتی:

ـ برا پاڵەوانەکانم هەمووتان من دەناسن. من ناتوانم وتار بدەم. بۆیە ڕک و ڕاست مەبەستم دەردەبڕم. لێم ببورن. کریت توشی مەترسیەکی گەورە بوە. ئەو تەنافەی خستویانەتە ملی،تادێ پتردەکوشرێ وتا دەخنکێت. عەسکەرو دەرویش لە پاپۆڕ دابەزیون. تورک گەلێکیان لە برایانی ئێمە کوشتوە. ئێمە خۆ ئاژەڵ نین. خوێنی کوژراوەکان لە ئێمە داوای تۆڵە دەکات.

رابن ئەی پاڵەوانەکان ! ئازادی یا مەرگ !

پاڵەوان دوودوو سێ‌سێ سەریان پێکەوە نا. دەنگە دەنگی نەرم لە کۆمەڵ هەستا. کاپانارسی پیرو زیر راست بۆوە. ئەو مرۆڤێکی ئاقڵ و دنیا دیتوو خاوەن تەجرویە بوو. کەم دوێ بوو، بەڵام کاتێک وەدەنگ دەهات. ئەوانەی تورەو هەڵەشە بوون، دەبوایە ئاوی سارد بە خودا بکەن. ئەوانەی قورس و ژیریش بوون چێژەیان وەر دەگرت. پیرە مێرد بە دەنگێکی بەرز دەستی پێکردو لەگەڵ تەماشاکردنی توندی پاڵەوان میکێلس گوتی :

ـ کاتێک نەتوانی سوڵتانی بکوژی، نابێ هەرەشەی لێ بکەی،! بۆ خاتری خودا ئێمە کەی ئاقڵو شعورێک پەیدا دەکەین.؟ تا ئێستا نازانم چەند سەت جار هەرەشەمان کردوە، بەڵام قەت نەمانتوانیوە هەتا سەر وەدوای کەوین و تورک لە کریت وەدەر بنێین .ئێستاش دەبینین کەوتووینە چ رۆژێک. کاتێ لە سەرمان دەدا شێت دەبین، باخ و باحات وێران دەکەین، خەڵک دەکوژین. هەزاران کەس بە هۆی چەوتی و هەڵەی ئێمە لە بەین دەچێ.

تۆ پاڵەوان میکێلس رکوراست بێژە وەدوای چی کەوتووی؟ دەتەوێ جارێکی دیکەش کریت لە خوێندا نوقم کەی؟ تۆ مرۆڤێکی ئاقڵ‌وژیری، لە قسەکانت وادەردەکەوێ کە پێشتر رات کردوە کە پاپۆڕی پڕ لە چەک و ئازوقەو خواردەمەنی و خێوەت و تەسب بگاتە دەستمان. چەند

تۆپیشمان بۆ روخاندنی بورج و قەلای دوژمن بۆ دێن وادیارە پێشتر لە گەڵ ئاتێن و موسکو رێک کەوتووی و زەمینەت ساز کردوە کە ئێمە سی‌کەس دەتوانین بچین سەری سولتانی پان کەینەوە. داخوا ئەو مەسەلاتە براونەوە یان نا؟ ئەو نهێنیە بە ئێمەش بێژە یا دڵمان بحەسێنەوە.!

هەموو روویان کردە پاڵەوان میکێلس، بەلام ئەو ڕانەبوو وەلام بداتەوە. سمێڵەکانی دەزاری دەگرت و دەیجاوی.لە بەر خۆیەوە بیری دەکردەوە :« ئەو پیرە مێردە زۆر ویژە باسی نهێنی چی دەکات؟ نهێنی لە گۆڕێ دانیە. ئاتێن و موسکو کاریان بەم کارەچیە؟ من خۆم هاتووم و کریت ناردوومی. ئەو کریتەی کە لە دڵی مندا هاوار دەکاو شین دەگێڕێ. »

ماموستا بەو سمێڵی قەیتانی و بالای کورت و ڕەنگی بزرکاو ولەشی داتەپیوی لە سەر بەردێک ڕاست بووەو زمانی وەگەڕ خست و بە ئاهەنگێکی توند دەستی پێکرد :

- زۆر سەیرە ! کاباناروسی پیر باسی مەسەلەی لێبڕاو دەکا. بۆ ئەوەی بجوڵێنەوە پاپۆڕی پڕ لە چەک و خواردەمەنی دەخوازێ، چاوەروانە موسکو لەشکر بنێرێ و بونان بە سێ سەربازی قوڕەسەر، دەست بخاتە کار. بەلام من دەمەوێ بزانم کام بزووتنەوەی گەورە لە جیهاندا بەرپا بوە کە بە ئامرازی ئاوا دڵنیا سەر کەوتبێ؟ کەی شتی‌وابوە کە ئاقڵی ساخ پالی بە خەلکەوە نابێ تا ماڵ و حاڵی خۆیان بە جێ بێڵن، وەچیا بکەون و بۆ ئازادی شەر بکەن؟ غیرەتی ڕاستەقینە ئەوەیە کەمرۆڤ بێ ئەوەی لە شتێک دڵنیا بێ، بچێتە پێش. بەڵێ پاڵەوان کاباناروس! گیانی مرۆڤ بازرگان نیە، بەڵکو خەباتگێڕە ئێمەی کریتی شەرکەرین نەک کاسب. دڵی هەر یەکی کریتی بۆمبایەکە پاپۆڕی سولتان دەتەقێنێ. منیش هاودەنگ لە گەڵ پاڵەوان میکێلس هاوار دەکەم: بۆ پێشەوە ، برایان بۆ خاتری خوا چەک هەلگرن.! ئەوە بوو قسەکانی‌من.

قەشەی دیر دەستی ڕاستەی خۆی بۆ ماموستا ڕاداشت و بە دەنگێکی بەرز کە هەموو گوی‌یان لی‌بی گوتی :

- دوعای خێری من پارێزگارت بێ ماموستا ! خوا جەزای خێرت بداتەوە. هەقتە ماموستا، گیانی مرۆڤ تەرازوودار نیە، بەڵکو شیر بەدەستە !

پاڵەوان تریانولیس لە پڕ وەدەنگ هات و گوتی :

( سەعاتێک ژیانی ئازاد، باشترە لە چل ساڵ ژیانی‌کۆیلەتی.[1]) ئەو پیاوێکی کورتە بالاو کزلکە خوێندەوار بوو. ئینجیلی خوێندبوو، دیوانی شیعرەکانی‹ ریکاس فرابوس›[2] و کتێبی دوعای ‹ ئاگاتانکلوس›ی لە بەر بوو. بۆ ئازایەتی تای نەبوو. هێندێ دەیانگوت : ئەوە کەوا بێترس تورکان پەلامار دەدا، دیارە بێچوە جندوکەیەو گوللە کەری لێ ناکات. دەیانگوت بویە لە مردن ناترسێ چونکە تیشەڵێک داری خاچی پێیە. هێندێکیش دەیانگوت :ئەم تیشەلە دارە هەر دڵی خۆیەتی.

کاباناروسی پیر سەری گەورەو پڕ لە ئاقڵی راوەشاند و گوتی :

---

(١) شیعرێکە لە ریکاس فرابوس .

(٢) *Rigas Pheraios* شاعیری میللی کریت (١٧٥٧ - ١٧٩٨ )

. ئاخرەکەی شیعرەکانی ( ریکاس فرایوس ) گشتمان بە کوشت دەدا.
پاڵەوانەکان کە لە بیستنی وتار وقسە ماندو ببوون، هەستا بوون و دوو دوو و سێ سێ و پێنج پێنج سەریان پێکەوە نابوو خەریکی دم بەدمە بوون. ئەوانەی ژیر بوون ودووریان بیردەکردەوە لە کەمایەتی دابوون. ئەوانەی ئاژاوەچی کە دەیانویست داروتەداری خۆیان لە سەر ئەم کارە دابنێن زۆرتر بوون. پاڵەوان کاتسیرماس بە چاوی خێل و شەیتانی، سەیری ئەو پاڵەوانانەی دەکرد کە لە حەساری ئاغەڵدا دەهاتو دەچون و وەک دەریا شەپۆلیان دەدا. پاڵەوان ماندا گاس سەردەمی لاوەتی وەبیر هاتبۆوە، هەناسەی هەڵدەکێشاو دەیگوت:
. ئەوانە هەر بۆیە باشن قەڵەم و پەڕە کاغەزێکیان بدەیە دەست. لە سەردەمی ئێمەدا بۆ ئەوەی خوێنی خەڵک وەجوش بێ و قەلای کاندی پەلامار بدەن و بیروخێنن، ئەوەندە بەسبوو کە هاوار بکەی : ( ئازادی یا مەرگ ). بە راستی پاڵەوان سیفاکاس ، ئینسانەکان گۆڕاون و چکۆلە بوونەتەوە.
بابە گەورە پتر سەیری ئەو لاوانەی دەکرد کە بە دەوریدا دەهاتن و دەچوون و لە گەڵ ئەوان بزەی دەهاتێ. پیرە مێرد لە بەر خۆیەوە بیری دەکردەوە :« من دڵنیام کە وەزع بەرەو باشی دەچێ. پیرە مێردەکان دەچنە ژێر خاک و دوای ئەوەی هێزیان تازە کردەوە، دووبارە دێنەوە دەرێ.
کریت قەت نامرێ !» لە جێ رابوو بە دەنگی بەرز گوتی :
. رۆڵەکانی من ! ئێرە ئەنجومەنە، کۆبوونەوەی پیرە پیاوانی قەومە. ئێرە بازار نیە .وەرن دانیشن تا باسی لەسەر بکەین. پاڵەوان کاباتاروس بیرو رایەکی هەیە. ماموستاش بیرورایەکی تر. واتە دوو بیر و بۆ چوونی لێک جیاواز، ئێمە لەو چیایە کۆبووینەوە تا لەو دوو بیرورایانە یەکیان هەڵبژێرین.
پاڵەوان پولیکسینگیس لە جێ ڕابوو، سمێڵی خورمایبو عەتر لێدراوەکانی باداو لە بەرامبەر سێ پیرەمێردەکاندا بە دابی ریز لێگرتن سەری دانواند. یەخەی کراسی کرابۆوە جێ گەستنی ئامێنەی لە گەردنی ناسکیدا دیاری دەدا. تەماشای پاڵەوانانی کرد و پتر لە هەموان لە سەروڕووی مرچ و مۆنی پاڵەوان میکلس مۆر بۆوە کە سەری بەردابۆوە . پاشان گوتی:
برایان ! پاڵەوانان ! ئەی پێشەوایانی کریتی رۆژهەلات ! کەسێکی رادەبێ و لە پێش ئێوە قسان دەکا. پێویستە هەموو وشەکانی هەڵسەنگێنێ. من وشەکانم لێک داوەتەوە. کەوابوو گوێ بدەنە وتەکانم. ئەگەر ئێمە وەک پاڵەوان کاباتاروس چاوەروانە بە هیوای گەیشتنی پاپۆڕان بین و چاومان لەوە بێ کە ورچ بیزوێژ لە شیمالەوە بێتە خوارو بە هاواری ئێمەوە بێ، ئەوا قەت ئازاد نابین. ژیان و شەر ئەوەیان فێری من کردوە کە ئازادی پارویێکی هاسان نیە. بەڵکوو شارێکە ئەشێ بە زەبری شیر بیگری. کەسێکی ئازادی هەروا لە دەستی خەڵک وەر بگرێ، هەرواش کۆیلەو ژێر دەست دەمێنێتەوە. دیارە دەبێ گوندەکانیش بسوتێنن، دارەکانیش لە رەگو ریشە دەر بێن، ئینسانەکانیش بکوژرێن و لافاوی ئەسرین و خوێن وەرێ کەوێ. ئەگەر زەبرێکمان ریکەوت و کەوتین، دەبێ هەوڵ بدەینەوە هەستینەوە. ماوەیەکی زۆر کریت ئەشێ خەبات بکا و بناڵێنێ. سەت ساڵ، دووسەت ساڵ، سێسەت ساڵ، من نازانم . بەلام دەزانم ریگا چارەی دیکە نیە. گوێ مەدەنە قسەکانی وەک پاڵەوان کاباتاروس. بەڵێ ... سوێند بەو رۆژەی کە لە بان سەرمانەو دەدرەوشێ،

رۆژێ دەگەینە ئازادی .!

پاڵەوان پولیکسینگیس لە بەر هەتاو سەری روت کرد بوو، هەڵمی لێ هەڵدەستا. زۆر لە پاڵەوانان ئارۆژا بوون، رابوون و هاواریان دەکرد : { ئازادی یا مەرگ }.

پاڵەوان میکێلس لە پولیکسینگیس وەنیزیک کەوت و بە ئابەدڵی دەستی بۆ درێژ کرد وگوتی . پاڵەوان پولیکسینگیس ! شەیتانێک لە نێوان ئێمەدا هەیە، دەیەوێ لێکمان بکا، بەلاّم کریت کەوتۆتە مەترسیەوە، وەرە دەستی‌من بگرە.!

پۆلیکسینگیس لە وەلاّمدا گوتی: برام تۆش دەستی‌من بگرە .باشە یتان بچێتە جەهەندەم، قاقا پێکەنی. بەلاّم پاڵەوان میکلس لە کردەوەی خۆی پەشیمان بۆوە. لێی وەدوور کەوت و گرژ بوو.

ئەنجومەن سەعاتێکی دیکەش درێژەی کێشا. لە بارەی مەسەلەکانی هەرە پچوکیش قسەیان کرد و دایان نا کە کێ و لە کوێ خەڵک ببینن. چۆت بستوی چیاکان بگرن و گوندی تورکان گەمارۆ بدەن و لە دێرەکان خۆ قایم کەن.

پاشان شەرابیان هێنا. بە ڕشتنی چەند دڵۆپە شەراب بە سەر زەویدا، هەموو پەیمانیان قایم کرد، سێ ڕێبەر لە سەر تەختەکانیان هاتنە خوارێ. رۆژ دەهات ئاوا دەبوو. کۆبوونەوە دوایی هات. پێشەوایان دەستی یەکتریان کوشی و لێک جیا بوونەوە.

* * *

پاڵەوانگەل لە ناوچەی ژێر دەستی خۆیان دا بلاّو بوون تا دەستەکانی ژێر فەرماندەری خۆیان ڕێک بخەن. پیرو لاو چەک و چۆڵی خۆیان لە بن میچ ولە ژێر عەرز و لە باخچان دەهێنا دەرێ و خاوێنیان دەکردنەوە. ئەگەر لولەی تفەنگەکانیان تەواو نەبایە بە شریتی دەیان پێچان تا لێک بلاّو نەبن. ئەوانەی فەقیرو بێ چەک بوون، چۆماخیان ساز دەکردن و چاوەروانی دەرفەت بوون تا لە کاتی هێرشدا سەربازێکی تورک بکوژن و تفەنگی ئەو هەڵبگرن.

لە حەساری دێرەکان ژن و کیژی لاو کتێبەکانیان دەدڕاند و فیشەکیان دە پەرەکان وەر دەپێچا. ئەوانەی داماوتر بوون هەتوانیان لە ئاونگاندا ساز دەکرد. هێندێکیش قوبەی سەری گومبەزی کلیسایان لادەبرد و لە قەلاّیەکەی گوللەیان دروست دەکرد. کریت ببوە کارخانەیەکی مەزنی ئازادی شەوو رۆژ کاری دەکرد. مانگی خەرمانان شەواتە مانگ ئاسمانی‌روناک دەکرد. هەتاو ئارامتر ببوو. دەغڵو دان و ترێ کۆکرابۆوە. چاوەروانی بارانی پایزی بوون. هەوری سپی پایزی بەری ئاسمانیان دەگرت و شنەبایەکی سووک ڕایدەدان و بلاّوەی پێدەکردن. پاشان هەوری دیکە وەدەر دەکەوتن و بە نۆرە کریتیان دادەپۆشی و دەریان دەخست.

شەراب لە کوپەکاندا دەکوڵی. کریتیەکان لە خۆیان دەپرسی: «کێ ئەو شەرابانە دەخواتەوە ؟ کێ ئاردی گەنمی تازە دەکاتە هەویر؟ کێ سەری ساڵی تازە جێژن دەگرێ؟» دایک تەماشای کورە لاوانیان دەکرد، ژن تەماشای مێردان و خوشک تەماشای برایانیان دەکرد و لە بیچمی هەموانیاندا مەرگیان دەبینی. بەلاّم بێدەنگ دەبوون. دەیانزانی ئەوان کریتین و مەرگیش چارەنووسی کریتیانە.

ئامینەش هاتبوە نێو ئەم بەزم و هەرایە. ئەویش جلی گاورانی کردبوە بەر. بە سەری رووتەوە

لە پێچانەوەی فیشەکان یارمەتی ژنەکانی دەدا. بەڵام بیری لە شوێنێکی تر دە خولایەوە. ئەو نەلە بیری کریت دابوو، نە لە فیکری پاڵەوان پولیکسێنگیسدا. بیری لە مەسیح و پیرۆزەکانیش نەدەکردەوە. بیری لە سەیرو سەفەر دابوو، لە چیا بەرزەکان. بەدوای ئەو پیاوە تێکسڕماوەدا دەگەڕا کە دڵی دەیویست. چەند حەوتووی تر، واتە ڕۆژی ڕێزگرتن لە خاچی پیرۆز کە دەبوو چارەی مانگی سپتامبر بە ئایینی مەسیح دەیان شوشت و دەبوو بە گاور. یای کریسانتی خوشکی پاڵەوان پولیکسێنگیس کە لە ماڵی عەلی بەگی لە ملکی داگیرکراوی براکەی دەژیا، پێشەکی ئەو کارەی ئامادە دەکرد. بەژنەکانی گوتبوو کە بۆ ڕۆژی گاوربوونی ئەم ژنە موسوڵمانە نانی متفەرک دروست بکەن.

لەم ڕۆژەدا، حەوت پاڵەوان هەر یەکە بەداروودەستەی خزیانەوە جێگای باوکیان دەگرت، چس‌گورکیش دەهات وتاری دەدا. جوتیارانی گوندەکانی دراوسێش دەهاتن تا لە ئاهەنگی گاوربوونی ژنی نوری بەگیدا بەشدار بن . ئەوەیان بە فاڵی باش دەزانی و بە یونانی بوونی وەسمانی و بە کۆتایی هاتنی دەردو ئازاری کریتیان دادەنا. هەموویان هاتبوون خزمەتی ئامینەی بکەن. بە جوانی ئەویان هەڵا دەگوت و چاوە ڕوانی ئەو جێژنە بوون. ژنی چەرکەسی ئەو خزمەت و نازکردنەی بە ڕوو خۆشی وەردەگرتو بەڵام هەست و بیری هەر لە چیادوورەکان دە سوڕایەوە. تەنیاجارجار کە کریسانتی ڕێنوشوێنی ئایینی تازەی فێر دەکرد، تووڕە دەبوو،بە توندی وەڵامی دەدایەوە.

شەونکیان پیرە کچ لە سەر نیوتەخت دانیشت و دیسان دەستی کرد بە حکایەتی‌کورتە مێژووی ژیان وکەرامەت وموجیزەی‌مەسیح‌و خەلیفەکانی. باسی ترێژ و ڕۆژوو خۆ نەشوشتن و سەبرو خوراگری ئەوانی دەکرد و گوتی : ئەگەر زللەیان لە لارروومەتێک دابان، لایەکەی دیشیان وەر دەگێرا. •

ئامینە گوتی:« باشە .. یای کریسانتی! بۆجما کریتیەکان مەسیحی نین ؟ئەدی بۆچی کاتێ سولتان یەسەریان دادەدا، ئەوان شۆڕش دەکەن پەلاماری دەدەن و دەیانەوێ چاوی دەر بێنن. ؟ »

کریسانتی دوای تۆزێ دوودڵی گوتی:« رۆلە ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە. ئەمە ئەو شتەیە کە تۆ پێی ئێژی نیشتمان و منیش ناوی دەنێم ئایین ..تێدە گەی؟ »

ژنی چەرکەسی لەم وڵامە تێ نەگەیشت . لە بەر خۆیەوە گوتی :«هەر چۆنێ بێ من بەڵێنیم داوە دەبم بە مەسیحی. بەڵام خۆشم هەر دەشۆم. ئەو پیاوەی خۆشم ئەوێ ئەگەر دەستم لێ بدات، چاوەکانی دەردێنم. ئەگەر مردم با مەسیح چیدەوێ لە گەڵم بکات. بەڵام تا زیندووم دەسەڵاتی خۆم بە دەست خۆمە. »

ئێوارە ڕۆژی ئەنجومەنەو ئامینە لە پێش پەنجەرەی ژووری خۆی دانیشتوە. چاوەڕوانی گەڕانەوەی دەسگیراتیەتی. خۆی ڕازاندۆتەوە، زولفەکانی شۆرشتوە، وەسمەی کێشاوە،چەندەی دەویست لە گەڵ دەسگیرانی بچێتە ئەنجومەن و تەماشای ئەم چاردە پاڵەوانە بکا کە وەک هەڵۆ بە ڕیز لە سەر گاشە بەردان دانیشتوون. ئەو پاڵەوان میکلسە کەللە ڕەقە ببینێ کە بە یادی ئەو مەمکەکانی وەخرو دەهاتن. بەڵام خوایە! ئامینە بۆچی بیر لە پاڵەوان میکلس دەکاتەوە ؟چی لە لەشی دایە کەوا ئەم ژنە بۆلای خۆ ڕادەکێشێ؟ ئەوە کە ئینسان نیە، شەیتانێکی درندەیە بۆ

لەگەلْ ژیان تابیْ. نا..نا.. ئامینە خۆشی ناویْ، لیی بیزارە . ئاخا خۆزیا دەیتوانی هەو تک دەستانی بپەرێنیْ و بە چاوی خۆی ببینیْ کە چۆن هێزی لەشی‌لەگەلْ خۆێنی بە عەرزیدا دەچنە خواری، چەند کارێکی باشی کردوە کە شووی کردوە بە پالْەوان پولیکـــبکیس، شادو رووخۆش و بە تەربیەتە. بەلاْم لە گەلْ ئەوەش خۆزیا دەیتوانی بۆ چرتە یەکیش بابەلە چیا چاوی بە پالْەوان میکلس کەوتبایە. ئەوە بوو ئەوەی کە ئامینە لە رۆژئاوادا، لە بەر پەنجەرەی ژوورەکەی خۆی بیری لێدەکردەوەو چاوە بادامیە بە کلەکانی دە لوتکەی چیای سلنا بریبوو. بە جاریْ نوری بەگی لە بیر چووبۆوە. دەتگوت قەت هەر لە دایکیش نەبوە. قەت جوان وبالاْ بەرز نەبوە، قەت باسکی بۆ لە ئامێزگرتنی ئەو لێک نەکردۆتەوە. گۆشتی لەش و لاری ئامینە وە دەریایەک دەچوو کە کاتی پاییزی پیدا بروا. بۆ تاوێک قەلْشێکی لیْ پەیدا دەبێو دوای تێپەڕ بوونی پاییز رێک دەکەوێتەوە.هەروەک دەستی وێنەکەوتبیْ. داخوا هیچ بیری لەو پاشا خەرفاوە دەکردەوە کە ئەوی لە باوکی کڕیبوو؟ کاری باوکی ئەوەبوو کە کیژی جوان دروست بکاو بەخێویان بکاو بیانفرۆشیْ. داخوا ئەو لاوە چەرکەسەی وە بیر دەهاتەوە کە هێشتا خەتی سمێلْی نەدابوو، شەوێکیان بە شەوی هاوینیْ لە نێو بیستانی لە عەرزی دابوو، سواری ببوو. لە پێشدا وای زانیبوو کە دەیکوژیْ، ویستبووی بەربەرەکانی بکا. بەلام لاو نەیکوشتبوو. دوای ئەختێک ماچ و موچ کە ماندوو ببوو، ئیتر رام ببو، داسەکنابوو. بە زەردە خەنەیەکی شیرین پرسیبووی : ناوت چیە؟

. ناوی من... ناوی من ..؟ ناوێکی پیْ گوتبوو، ئێستا ناوەکەی وەبیر نەدەهاتەوە. بەلْیْ! تەواوی ئەو پیاوانەی سواری ببوون و پاشان رۆیشتبوون. ئێستا نۆرەی پولیکـــینکیـــە . ئەویش هەر ماوەیەک بۆی دەبیْ، بەلاْم حەیف ا لەو کاتەدا کە دەبیْ شووی پیْ‌بکا، هەست دەکا لە ویش وەدووردەکەویْ. لەو دەمەدا کە بیری لەوشتانە دەکردەوە لە دوورەوە پاپۆڕێکی بینی کە بۆ قەراخی دەریا دێت، هی دزەکانی دەریایی بوو،

کاتیْ کریسانتی کارەکانی تەواو کرد، چوو لە پەنای دانیشت. رۆژی رابردوو ئەو چیرۆکی یەکێک لە پیرۆزەکان واتە < سن ژان کرلبە>ی تەواو نەکرد بوو.گەیاند بوویە ئەو جێیە کە < سن‌ژان> لە بەر نوێژ و رۆژووی زۆر کەوتبوو. دوای چل سالْ بزربوون هاتەوە نیشتگەی خۆی و لە دەرگای‌دا... دایکی تەیناسی و پارووە نانێکی دایە. < سن ژان >پێی گوت :

. دایە من نانم ناویْ، تەنیا رێگا بدە لە قوژنێکی حەساری ئەم خانوە ی تۆدا برم ..

ئامینە رابوو، بە نارەحەتی بە نێو ژوورەکەدا دەهات و دەچوو. ئەو خواردنی باش و پیاو وشەڕی لە هەموو شت پیْ خۆشتر بوو. بەلام ئەو پیرە کچە بەو چیرۆکانە دەیویست مێشکی ماندو بکا. پێی گوت:

. خانم بۆخاتری خوا چراکەی هەلْکە وەختە بخنکێم ،

کریسانتی گوتی: « کیژم نارەحەت مەبە ئێستا دەگاتەوە.چما دەتوانی تاوێک لە تۆ وەدوور کەویْ؟ بزانە.. ئێستا گوێم لە حیلەی دەنگی ماینەکەیەتی . » کریسانتی برایەکەی ئەوەندە خۆش دەویست، وەک ئەو دەمەی کە پێکەوە لە زکی دایکیان دابوون. جۆرێک لەگەلْ ئەو خۆی بە یەک دەزانی کە وەک‌پیاوێکی ئاشقی گەرم داهاتوو سەیری ئامینەی دەکرد.

کاتێک دەیبینی کە براکەی دەست دە قەدی ئامینە وەردینی‌و بۆ ژووری نوستنی‌دەبا،ئەویش لە

سەرتەختەکەی درێژ دەبووە لە دنیای خەیاڵدا خۆی نوقمی لەزەت و خۆشی دەکرد.
ئامینە لە پەنجەرەوە گوێی هەڵخست، حیلەی مایینەکە بوو، بەڵام دیار بوو کە هێشتا دوورە. لە گوندی چرا هەڵدەکران. زارۆک و سەگ لە دەرەوە بانگ دەگرانەوە. گوندییەکان شێویان دەخوارد. ئەستێرەی ڕۆژئاوا شادو پرشەنگدار لە سەر چیای سلناوە تەماشای ئامینەی دەکرد.پاشان بازدێکی داو لە پشت چیاوە بزر بوو.

* * *

لەودەمەدا کە ئامینە سەری لە پەنجەرە هێنابوە دەرو هەناسەی هەڵدەکێشا، پاڵەوان میکێلس تورەو شەرمەزار بە دڵە کوتە لە چیا دەهاتە خوار وبۆ لای ماڵی باوکی دەچوو. لە دڵدا هاواری دەکرد و دەیگوت :« تۆ داوای ئەوەت هەیە کە بۆ ئازادی شەر دەکەی، لە کاتێکا هێشتا کۆیلەی. بیرەکانت شتێک دەبێژن و دەستەکانت کارێکی تر دەکەن.. دڵت هیچ کامیان پەسند ناکات. بۆ وات لێهاتوە بە درۆ بۆ کریت دە ناڵێنی ؟ شەیتان دەستی خستوتە نێو هەناوت وبە سەرتدا زاڵە.تۆ ئەگەر لە شەردا بمری وبا کاندی بگری و کریت ئازاد بکەی، دیسان هەر ئەو هەژارەچارە رەشەی هەر ئەوەی کە بووی. چونکە هەوەسی تهێنی لە دڵت داهەیە و فیکرت لە جێگایەکی دیکەیە »
تنودوریس هەوەڵبن هاوخەباتی پاڵەوان بە ئالاوە لە پێشەوە رۆیشتبوو. پاڵەوان میکێلس تەنیا لە چیا دەهاتە خوارێ و لە بەر خۆیەوە نارە ناری بوو. ئەو جارێکی دیکەش پاڵەوان پولیکسینگیس دیبوو، بۆنی میسک، واتە ئەو بۆنە لەعنەتیەی تورکی بۆ هاتبوو. خوێن لەدەمارەکانیدا هاتبوە جۆش لە بەر خۆیەوە دەیگوت: « ئاخ لەو دێلەسەگە لەعنەتیە.. ئاخ ..هەتا ئەو زیندوو بێ، من هەر ئەو پیاوە رەزیل و بەد بەختەم...»
لەو کاتەدا کە زاوا دەیویست لە نێو پاڵەوانەکانی ئەنجومەندا بۆ مارەکردن شاهید پەیدا بکا، بیستبووی کە بۆ چێژنی میعراجی مریەمی پاکیزە بانگیان دەکاتە ماڵێ. دیتبووی کە لەویش وەنیزیک دەکەوێ،تا بانگی بکا، بەڵام لە دوایدا کشا بۆوە، بێگومان لە تیپگای بە سامی ترسا بوو.
پاڵەوان میکێلس هاوارێکی کردو گوتی:
- ئیترخۆ راناگرم. ئەوە ئەبوو بەژیان.دەبێ ئەم وەزعە کوتایی پێ بهێنرێ! رکێفی لە ماینەکەی داو لە تاریکایی شەودا بزر بوو.

* * *

پاڵەوان پولیکسینگیس و ئامینە و کریسانتی وەک تورکان لە پێش مێز دانیشتبوون نانیان دەخوارد. لە پڕ لە دەرگایانداو چسگورک وەژوور کەوت. پاڵەوان بە دیتنی حەپەسا . لەوەتا خوشکە زاکانی، دیاماندیس و وانگلیو مرد بوون، چسگورگی ئەدیبوو . لە پێشدا شکی لێدەکرد کە رەنگە ئەو لە بەر حەسودی دیاماندیسی دەرمانداو کردبێ. بەڵام زوو ئەم شک و گرمانەی لاچوو بوو. گوتبووی نا، شتی وانابێ، ئەو مەری خودایەو ناتوانێ خەڵک بکوژێ. هەمووی خستبوە سەر تەزاو قەدەر. ئیتر قینی لە ماموستا نەبوو، ئێستا کە چسگورک دەوری خەلیفەکانی

عیسای یاری دەکرد، بە گوندانددا دەگەڕاو بە وتار دڵی ئیمانداران دە هاژاندو هاتی‌دەدان. پولیکسینگیس رابردووی لە بیر خۆ بردبۆوە . بەهاتنی کوتو پڕی فرە خۆشحاڵبوو. لەو کاتەدا کە رادەبوو جێگای بۆ بکاتەوە گوتی :

ـ سڵاو ئاغا ماموستا ! بە خێر هاتی ! ماموستا سڵاوی کرد و چوار مێردەکی لە عەرزی دانیشت. شۆقی چرا لە سەروچاوی دابوو. پاڵەوان بە سەیرەوە تەماشای دەکرد. داخوا ئەوە هەر چس‌گورکی جاران بوو؟ هەر ئەو شل و سپاڵە بوو کە چاویلکەی بە دەزوو لە گوێچکەی قایم دەکرد؟ هەر ئەو پشت کوڕە بوو کە شاڵواری تەنگی دەپێ دەکرد؟ ئێستا پیاوێکی دیکەی لە پێش خۆی دەدیت.

بەراستی چس‌گورک ببوە پیاوێکی دیکە.لەو رۆژەوە کە ژنیرا لۆتیەکەی مرد بوو، بە جارێ گۆڕابوو. تێگەیشتبوو کە پیاوەتی تەنیا بە لەشی ساخ و بە هێز نیە. بەڵکوو گیانی قەوی و ئیرادەشی پێویستە. مێشێک ئەگەر بزانێ چی دەوێ، دەتوانێ گایەک لە عەرزی بدا. رەشیدی مەسەلەیەکە بەستراوە بە روح، نەک بە لەش. لەو رۆژەوە کە چس‌گورک ئەوە تێگەیشتبوو، گۆڕابوو وردە وردە بەدەنی بە پارمەتی بانی بە هێز ببوو. لە سەرکەوتنی چیا پشوی سوار نەدەبوو.

پشتی راست ببۆوە. نانی بە ئیشتیا دەخوارد. شەرابی دەخواردەوە. روومەتی سوور هەڵدەگەڕان. لە هەموو سەیرتر هەستی دەکرد لە ئاست ژنان هەوەسی دەبزوێ‌و بە جوانیان دەبینێ. لەو ماوەیەدا کە کوڵ بە شان بە گوندانددا دەگەڕا، بۆ ئەوەی بتوانێ شەو لە شوێنێ سەر بنێتەوە، ببوە زڕبابی چەند منداڵان. بە هەڵکەوت دایکی یەک لەو منداڵانەی خەڵکی کاستلی کە مێردی‌بزر ببوو، دەیخورا. شەوێک لە جەنگەی گاڵتەو گەمەدا زڕباب و دایکی منداڵەکە لە جێدا لێک هاڵابوون. بەدوای ئەمەدا، چس‌گورک پتر لە کاستلی دەمایەوەو لە گەڵ دایکی منداڵەکە دەنوست.

پاڵەوان پولیکسینگیس لەو کاتەدا جامی میوانەکەی پڕدەکرد پرسی:

ـ جەنابی ماموستا تۆش بۆ ئازادی شەڕدەکەی، تۆش بوویە پاڵەوان، بەڵام پاڵەوانێکی زانا بە ئاڵایەکەوە کە پیتی ئەلف و بێی لە سەر نوسراوە..

ماموستا بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە :

ـ لام وایە بەم زوانە منیش دەبێ تفەنگ هەڵگرم. ئەلف و بێ شتێکی زۆر باشە، بەڵام تەنیا بۆ ئیشتیا کردنەوە دەبێ. خواردنی باش گۆشتی تورکە.

ئامینە سەری هاویشتبوە سەر دەستی و تەماشای چس‌گورکی دەکرد. لە بەر خۆیەوە بیری دەکردەوە کە : ئەوە برای پاڵەوان میکێلسە.. هەوڵی دەدا تا لە سەرو رووی پیاوێکدا کە بەرەو رووی دانیشتوە، خەتی روخساری توندو تیژی ئەو بدۆزێتەوە.

کریسانتی هەستاو رۆیشت. بوونی چس‌گورک نارەحەتی دەکرد. دەتگوت دوو مردوە کانی لە قەبر هاتونەوە دەرو رووبەرووی دانیشتوون.

پاڵەوان پولیکسینگیس پرسی:

ـ بە راستی ماموستا ، دەکرێ رۆژی جێژنی میعراجی مریەمی پاکیزە بۆ ئاهەنگی گاوربوونی

ئامینە تەشریف بێنی؟ ئامینە لەو رۆژەدا دە بێتە مەسیحی و پاشان ناوەکەشی دەبێتە هێلینا. هەرئەو شەوەش ئێمە شایی دەکەین.

چس‌گورک گوتی :

. پاڵەوان من هەر بۆ ئەو مەسەلەیە هاتبووم. واتە بۆ مەسەلەی غوسڵی تەعمید. مارولیاسی پیر لە دەوروبەری کاستلی کاتی زەوی کێلاّن کوپەیەکی گەورەی لە ژێر زەویدا دۆزیوەتەوە. پیرە مێرد بە دوای منیدا نارد. چوم کوپەکەم دیت. دەڵێ ئەوە عەنتیکەیە. راستیش دەکا، خوا دەزانێ چەند هەزار ساڵ لەمەو بەرە.

لە دیوی دەرەوەی نەخشی ئەوتۆ هەڵکەنراون کە وەک گوڵە گەنم دەچن. وە باسکی هەشت پێی دەریاییش دەچن. دیارە پاش ناناسرێن. بەلاّم لە بن کوپەکەدا مستێک باقلەی میسریم دیتەوە کە بە درێژایی زەمان وەک قسڵیان لێ هاتبوو. بە بروای من ئەو کوپەیە دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی مینوس.(١)

پاڵەوان پرسی : « باشە. ئێستا دەتەوی چ لەو کوپەیە بکەی؟ من هیچ تێناگەم. »

. تێ ناگەی پاڵەوان ؟ بۆ هەوری ‹غوسڵی تەعمید › لەم کوپەیە کەڵک وەر دەگرین. قەشەی گوندی دەڵێ: هەورەکانی کلیسا پچوکن. لەوە نارەحەتە کە خاڵی تازە وەرگەراو چۆن پاک کاتەوە. بەلاّم خوا لە کاتێکی باش دا ئەم کوپەی گەیاندوە کە پێویستمان بوو. ئەم دۆزینەوەیە نیشانەی شانسە. لە سەر ئەو باوەرەم کە بەو زوانە قوستەنتەنیەش دێتە سەر دینی مەسیح. چس‌گورک ئەوانەی گوت وراببوو. بە پەلەشبوو، چونکە دایکی منداڵەکە بۆ خواردن چاوەروانی بوو.

پاڵەوان پولیکسیتگیس دای لە قاقای پێکەنین و گوتی :

. ماشەلاّ ماموستا ! بە راستی بیرێکی تیژت هەیە. ئامینە تۆ دەڵێی چی؟

بەلاّم ئامینە بێدەنگ بوو. تەماشای ماموستای دەکرد، بەلاّم گیانی لە لەشی جیا بوو. بێ ئەوەی بیر لە مەسیح و لە خۆ شوشتن بکاتەوە، سەرگەردان بە هەموو لایەکدا دەخولایەوە.

* * *

لە راستیشدا ژنە دێهاتی دۆستی چس‌گورک خواردنی ئامادە کرد بوو. سفرەی راخستبوو، گوزەڵەی پڕ لە شەرابی لە کن دانابوو. چاوە روانی ماموستا بوو. ئەو ژنە بیچمێکی پیاوانەی هەبوو. دانەکانی خواروخێچ و ئەوەندە سپی بوون دەتروسکان.

سمێڵێکی رەش لە پشت لێوانی شین ببوو، ئەگەر گروێ نەبایە لەوانە بوو چس‌گورک هەرگیز ئاشقی نەبێ. بەو زوانەش لەرووی هەڵئەدەهات ژنێک لە ئامێز بگرێ.

ماموستا سلاّوی کرد. منداڵەکە نوستبوو. مێردی ژنەکە چەرچی بوو بە گوندانئدا دەگەرا. ئێستا ژن و زرباب ببوونە پاشای ئەو ماڵە. هەرتک بە کاوەخۆ نانیان خوارد، گوزەڵەی شەرابیان خاڵی کرد، پاشان دوعایان خوێند پەیکەری عیسای مەسیحیان داپۆشی و چوونە نێو جێگا.

---

*١ - مینوس: پاشای کریت، کوری مرشەری و مێردی پازیفایی بوە کە دەڵێن قازی جەهەندەمە (میتولوژی)*

مامۆستا لە دڵدا دەیگوت :« گیانم چس‌گورک : لێدە، چاکت بۆ هاتوە. تا ئێستا بەسترابوری، ئێستا بووی بە پیاو. ئیشەلا هەزارساڵی دیکە دەژی» وەهای تەختی خەویٔ وەلەرزە خستبوو،دەتگوت ئێستا تێکی دەقرمێنێ. بەیانی کە چوە حەساریٔ دەستو چاوی بشوا چاوی بە کوری سێ‌ساڵەی ژنەکەی کەوت، لە قوژبنێک ڕێستا بوو خێسەی لێدەکرد. چس‌گورک ترسا. بیری کردەوە دەبیٔ هەتیو شتێکی زانیبیٔ. نەکا بچیٔ بە باوکی بڵیٔ. لە منداڵەکە چوە پێش، بۆ ئەوەی دڵخۆشی بداتەوە. دوو سکە دراوی هێنا دەرو بۆ لای کورەکەی راداشت. هەتیو بە توڕەیی دەستی وەلاناو گوتی : تۆ دوێنیٔ شەو گازت لە دایکم دەگرت، ئێستا پارەم دەدەیەی. دراوەکەی بە سەروسەکوتی داداوە.

چس‌گورک گەڕایەوە . دەستی دا خورجێنەکەی کە پێشتر نان و زەیتون و پەنیر و شەرابی تێنا بوو. ماڵاوایی لە ژنەکەی کرد کەخەریکی جیٔ هەڵگرتن بوو. چس‌گورک کەوتە ریٔ. لە مەیدانی گوندی لە بن دارچنار خەڵکێکی زۆر کۆ ببۆوە. دەرگای ماڵەکان دەکرایەوە. گوندیەکان کە گوییان لە هەرا هەرا ببوو، بە غار دەهاتنەدەر و روویان دەکردە مەیدانی گوندی. لەو کاتەدا قەشەیەک بە سەروسەکوتی پەرێشان و لاقی خوێناوی ، بە هەناسە برکە گەیشتە نێو گوندی و هاواری کرد: « برایان ! باوکە پیرەکانی دێری عیسای مەسیح متیان بۆ لای ئێوە ناردوە. حەسەن بەگی سەردار بە لەشکرێکی گەورەی سەرباز و چەتەوە لە کاندی وەدەر کەوتوە و ئێستا دێری گەمارۆ داوە. ئێوە دەبیٔ لە فریامان کەون. ئەدی پاڵەوانی ئەم گوندە لە کوێیە ؟ برایان دەست دەنە چەک ! »

بەڵام پاڵەوان هێشتا لە ئامێزی ژنی چەرکسی دابوو. بە بیستنی هەراو هوریا وەخەبەر هات و لە جیٔ دەر پەری. بەڵام نەیدەتوانی بە بیٔ شاڵوار بێتە کۆڵان. ناچار خۆی گۆری، چەکمەی کردە پیٔ و دەمانچەی لە خۆ بەست و بەرەو شوێنی کۆبوونەوەی خەڵک ڕۆیشت.گەیشتیٔ باسکی قەشەی ماڵوێرانی گرت و گوتی :

. ئەو هەرا هەرایەت لە چییە؟ ئەم خەڵکە بۆ دەترسێنی؟ قەشەی لەعنەتی. ئەوەی تۆ باسیان دەکەی ئاخر هەر تورک نین ؟ دڵنیابە حیسابیان پاک دەکەین .

## ١٠

خۆر سەری چیاکانی روناک کرد و پاشان گردو تەپک و دەشت و سەحراشی داگرت. لەشی بریندارى کریت لە بەر شۆقی هەتاو دەدرەوشا. ئەگەر خودا خۆی تۆزێ‌زەحمەت دابایەو چاوێکی لە خوارێ بکردایە، دڵی دەسوتا. دەیدیت کە خانوەکان دەسوتێن، ژنەکانی دەبینی کە قژیان دەڕننەوە، هەتیوەکانی دەبینی کەبرسیو روت لە چیاکان سەرگەردانن. پیاوەکانی دەبینی کە پەرێیەکی نەخشەی خاچیان بەدەستەوەیە، بە بێ نان و فیشەک، بە پای پەتی‌دەچنە شەڕێ‌و تەنیا کزنە تفەنگ چەکیانە. ئەوانە پشتاو پشت لە بەرخودا پاڕاونەوە.. بەڵام داخوا خوا قەت داهاتۆتەوە گوێ بداتە هاوار و ناڵەیان. خودا یا کەڕ بوە، یا نابینی گۆڕیوە . کەواببو خەڵک بێجگە لە یەک هەڵگرتن چاری دیکەی نەماوە.

کاتی بەیانی پاڵەوان پولیکسینگیس لە حەساری ماڵەکەی ، خۆی بۆ شەڕ ئامادە دەکرد. شەوی پێشتر قاسیدێکی ناردبوە کن پاڵەوان میکێلس تا خەبەری تازەی بۆ بێنێ. هەواڵی بۆ ناردبوو کە تورک دیزی عیسای مەسیحیان گەمارۆ داوە، ئالاکەت هەڵگرەو وەرێ کەوە. ئازادی یا مەرگ. ئیتر وتاردان و کزبوونەوە بەسە. کاتی ئەوە هاتوە کە کریت دەنگی راستەقینەی خۆی کە لە لولەی تفەنگ دێتەدەرێ بەرز کاتەوە.

لە نامەکەداهەر وەها نووسیبووی :« ناخ ! ئەی پاڵەوان میکێلس ! وەرە با قین و ناکۆکیەکان لە بیر بەرینەوە. ئەو قینە بێ جێیانە ئێمەیان خواردۆتەوە. رۆژێک لە شێریان پرسی : تۆ لە چی دەترسی لە فیل‌و لە پلنگ، یا لە گا کێوی ؟ شێر لە وەڵامدا گوتی : من لە کێچ دەترسم ! بەڵێ پاڵەوان کێچێک لەم ناوەدا هەرتکمانی دەگەست. ناوی ئەو کێچە شادی بوو باخەم، هەرچی بوو، کێچ پتر نەبوو. ئێستا کاتی ئەوە هاتوە کە ئەو کێچە بچێتە جەهەندەم. کریت بانگی ئێمە دەکات. کەواببو وەرە وەک برایان دەست بدەینە دەستی یەک . »

ئامینە هاتەدەروپاڵی وەڵاشیپانەی دەرکێ‌دا. دەوری چاوەکانی شین و لێوەکانی لەبەرگازگرتنی شەوانە سوور هەڵگەرابوون. پاڵەوان ناوری وێناو دیتی. لەبەر ئەوەی قسە بە قیزەکانی کە بۆ پاڵەوان میکێلس نوسیبوو. هێشتا ورێ کردبوو، لە ئاست ئامینە وشک و خڕگر بوو.

ژنی چەرکەسی بە تورەیی بانگی کرد و گوتی:« بیر لەچی دەکەیەوە؟ من لە بەرامبەر تۆدا ویستاوم، تۆ چاوم لێ ناکەی؟ »

پاڵەوان خەریکبوو خورجینەکەی لە پاشەرکی زینی‌قایم کا. لایەکی خورجینەکەی پڕکردبوو لە فیشەک و داو وەدەرمان و کەتانی برین پێچان. لایەکەی دیکەش نان و پەنیر و شەرابی تێ‌نابوو. نەیدەزانی وەڵامی ژنێک چ بداتەوە کە پاڵی وەڵاشیپانەی دەرکێ داوەو دەزانی بۆ شەر دەچێ.

شەوی پێشوو کاتێ نامە نووسین بۆ هاو خەباتە بەدگوزەکەی، بۆ هەوەڵین جار لە ژیاتیدا تێگەیشتبوو کە لە دڵی پیاوێکدا، جێگای ژن لە کوێ بێ و جێگای نیشتمان لە کوێ بێت.

ژنی چەرکەسی لە کاتێکا لە پلیکان دەهاتەخوارو لێی وەنیزیک دەکەوت، گوتی:

ـ من رازێکم لە دڵدایە و ئەشێ پێتی بێژم. دەستی بە ملی ماینەکەی داهێنا. پاشان سەری دانواند وپرچە درێژەکانی کە بەقەد باڵی ماینەکە درێژ بوون، بەری داتەوەو حەساری پڕکرد لە عەتر.

پاڵەوان پولیکسینگیس پرسی : راز..! دەستەکانی لە کار کەوتن .

ـ بەڵێ راز ... من ئێستا ئەو رازەت پێ دەڵێم تا پاشان گلەیی نەکەی. چارویار لە کاندی‌یەوە خەبەرم پێدەگەن، گۆیا خۆم و کەسی توری دەیانەوێ لە گەڵ هێندێ سەرباز و چەقۆ کێش، شەوێک بێن کاستلی پەلامار بدەن و منیش بڕفێنن. ئەگەر دووبارە موسوڵمان نەیەوە بمکوژن. جا تۆ بچۆ دیری عیسای مەسیح و بەڵام لە بیری ژنەکەشت دابە، پاڵەوان!

ـ پاڵەوان تاوێک مات بوو. لە دەرەوە لە مەیدانی گوندی دەنگی هەراو هوریا دەهات.مێرد خواحافیزیان لە ژنەکان دەکرد، پیرێژن دەگریان. گشتیان لە مەیدانی گوندی لە بن دارچنار لەژێر ئاڵای پاڵەوان پولیکسینگیس دا کۆ ببوونەوە.

ئامینە کە دیتی مێردەکەی بێدەنگ بوە دووبارە گوتی:

ـ لە فیکری ژنەکەت دابە! ژن وەک قەڵا وایە، دەتوانی بیگری .

ـ لە فیکری ئەویش دادەبم. باسکی دە ئامینەی وەرهێناو کێشابە لای خۆی. هەستی کرد کە مەمکە توندەکانی وەسینگی دەکەون، تاوێک پەشۆکاو لە بەرخۆیەوە گوتی:«دنیا وێران بێ باکم نیە و ئەوەندە بەسە کە ئەم لەشە لە ئامێزی خۆم بگرم »

ژن چاوەکانی لە سەر یەک داناو سەبرۆکە هەستا سەر پەنجەکانی و لێوی بە لێوی مێردەکەیەوە نوساند. ئەژنۆی پاڵەوان نوشتاوە و هەناوی پڕبوو لە مەرگ و لە هەنگوین.

ماینەکە حیلاندی. پاڵەوان هاتەوە سەر خۆو پاڵی وەدیواری دا. سەبرۆکە ژنەکەی دوور خستەوە. لێوەکانیان لێک جیا بوونەوە. پاڵەوان پێی دەرکێفێ نا و سوار بوو گوتی : خوا حافیزا بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە لە حەساری وەدەر کەوت و بەرەو مەیدان کە خەڵکی لێ کۆ ببۆوە رکێفی لێدا.

* * *

هەر ئەو رۆژە بەیانی زوو، لە پیترۆکفالو لە حەساری بابە گەورەدا، لە کاتێکا پاڵەوانەگەل لە دەوری پاڵەوان میکێلس کۆ ببوونەوە، ئاڵایەکی دا بە تئودوریس کە بە پیتی سوور لێی نوسرا بوو.دوو کۆنە دۆست و هاو پیاڵەی، واتە مستیگری و کاپامپس سەرتا پێ چەکدار وێستا بوون. باکێش چووبوو تا خێزانەکەی لە شوێنێکی ئەمین دابنێ. بیرتولدو لە پشتەوە خۆی دە باڵتۆیەک وەر پێچا بوو، لە نێو ژناندا خۆی حاشار دابوو. لە فێنکی بەیانیدا لە سەرمان دەلەرزی. بە چاوی زەق تەماشای دەکرد و لە بەر خۆیەوە دەیگوت :« ئەم وەحشی‌یە درندانە کێن و بەم بەیانیە بۆ کوێ دەچن! »

پاڵەوان میکێلس تەماشای ژنەکەی کرد لە بەردەرگا بێدەنگ وەستا بوو دەستی تێک وەرهێنا بوون .گوتی:ژنێ خوا حافیز !

ژن بە نەرمی لە وەڵامدا گوتی :« خوا حافیز پاڵەوان میکێلس ! خوا بتپارێزێ، خوا هەموو پاڵەوانەکان بپارێزێ.» پاشان تەماشای یەک یەکی ئەو پیاوانەی کرد کە لەگەڵ مێردەکەی بوون.

بابە گەورە هاتە دەرێ. ریشی چەرموکی لە ژێر شەبەقی زەردەی بەیانیدا رەنگی گوڵی دەدا. دەستی هەڵێنا و هاواری کرد :

- بۆ پێشەوە رۆڵەکانم. بۆ پێشەوە! دوعای خێری من لە گەڵتان بێ. بۆ پێشەوە بە هیوار پشتیوانی خودا! گاڵتە نیە، ئێوە دەچن بۆ ئازادی کریت شەڕ دەکەن. ئەم کەسە بەختەوەرە کە لە رێگای نیشتماندا بمرێ.

پیرە مێرد بێدەنگ بوو، پاشان گوتی :

- سوێند بەو رۆژەی کە ئێمە روناک دەکات، هەر چەند نازانم بۆ چی، بەلام من مردنی لە پێناو کریت دا، لە ژیان بۆ کریت بە باشتر دەزانم.

کاپامبیس گوتی : « ئەمە لە ئەڤینەوەیە »

پاڵەوانەکان دایان لە قاقای پێکەنین و حەسار بە دەنگیان وەلەرزە کەوت. تراساکی گرێی لە دەنگی هەرا و هوریا بوو، هەستی کرد کە باوکی دەچێتە شەڕ. لە جێ ڕا بوو، پەتوی سووری دەخز وەرگرتو چوە حەساری. پاڵەوان میکلس چاوی بە کورەکەی کەوت کە بە خەواڵویی لە کن دایکی و بابە گەورەی وەستاوە، زەردەیەکی هاتێ و گوتی:

- تراساکی خوا حافیز ! نۆرەی تۆش دێت. پاشان نیشانەی خاچی کێشا و گوتی: بە پشتیوانی خوا ! پەرچەم دار کەوتە پێش و ئەوانیتر تفەنگ بە شان کەوتنە دووی.

* * *

دێری بە ناوبانگی عیسای مەسیح لە زۆر کۆنەوە، واتە پێش ئەوە کە ڤینیزی یەکان کریت بگرن و بەر لە گرتنی قوستەنتەنیە لە لایەن تورکی وەسمانیەوە،لەو سەردەمەدا کە ئیمپراتوری بیزانت هێشتا بە سەرعەرەب و رۆژهەلات دا حوکماتی دەکرد، دروست کراوە. دەڵێن ئەم دێرە لە شا«نیسەفور»[1] ماوەتەوە. شانیسەفور روحێکی گەورەو بەرزی هەبوو کەمی مابوو لە بەر ژنێکی جوان بۆ قولایی جەهەندەمێ شۆڕ بێتەوە. بە خۆشیەوە لەو کاتەدا کە پاشا لەسەر لێواری هەڵدێران بوو، داوای یارمەتی دەکرد، خودا گرێی لە دەنگی بوو، بەزەیی پێداهات لە گەڵ پاشاگەلی دیکەی شەهیدو گوناحبار، ناردیە بەهەشتێ.

نیسەفور دوای گرتنی دنیا لە کریت دابەزی. عارەبی« سارازنی » تارومار کرد، ئاڵای مانگ نیشانی فڕێداو ئاڵای خوێناوی مەسیحی لە بان گوندە سرتاوەکان و شارە تاڵانکراو وێرانکراوەکان هەڵکرد. دەڵێن رۆژێکیان کە دەهات دنیا تاریک بێ، شا بە تەراخ خرێکدا

---

*(1) Nicephore هەوەڵین ئیمپراتوری رۆمی رۆژهەلات (۸۰۲-۸۱۱) کە لەگەڵ شارلمانی پەیمانی بەست. بەلام لەبەر هارون الرشیدو لەبەر بولغارەکان شکا.*

دەرزیشت، بڕیاریدا هەر لەوێ خۆ مات کاو بەیانی بەرەو کاندێ کە ئەوەدەم ناوی <خەندەک> بوو، مل پێوە نێ. لەو کاتەدا کە لەبن داری لیمۆ خەوتبوو، شەوێکی خۆشی مانگی مای بولبول دەیانخوێند، شا مەسیحی هاتە خەو، ماندو وەبلاک و پێ پەتی لە سەفەری دوور دەگەڕاوە. مەسیح بێ ئەوەی بزانێ پاشا لەوێیە، لە بن دارلیمۆیەکی تر ڕاوەستا. هەناسێکی هەڵکێشاو لە سەر زەوی درێژ بوو بەردێکی وەبن سەریدا و بە ناوە نارگوتی:« ئاخ چەند ماندووم. »

پاشان دەستەکانی وەک خاچ خستە سەر یەک و چاوی لە سەر یەک داناو خەوی لێ کەوت.

بە درێژایی ئەو شەوە پاشا لە خۆشیدا نوقم ببوو. ئەوەش لە بەر مانگ و بلبل و خەو نەبوو، بەڵکوو لە بەر ئەوە بوو کە خۆی لە بەهەشت دا دەبینی.

بەیانی لە خەو ڕابوو. لە بەر خۆیەوە گوتی: « ئەو دارەی مەسیح لە بنی نوستوە، دارێکی پیرۆزە» . فەرمانیدا تا دیواری لە دەورە بکێشن. بەڵێ : دەڵێن دێری عیسای مەسیح بەم جورە دروست کراوە.

پاشاکانی بیزانت مردن. تورک قوستەنتەنیەیان گرت، ڤێنیزییەکان بە سەر دوورگەی کریت دا زاڵ بوون و پاشان کافر ئەوێیان پەلاماردا. دێر وێرانکرا. دووبارە دروستیان کردەوە، دووبارە وێران کرایەوە، ئێستاش ئەوە تورک گەمارۆیان داوە. لەو حالەدا کە ناقوسەکان بە هەوای خەفەتبارەوە لێدەدران، قاسید بۆهەموو لایەکدەچونوهاواریاندەکرد: یارمەتی..یارمەتیئەی مەسیحیەکان تورک دێری مەسیحیان گەمارۆ داوە . لە نێو کلیسادا قەشەکان لە ژێر میحراب و لە بن عەرزی تفەنگیان دەهێنانە دەر و خۆیان ئامادە دەکرد. پێش نوێژی دێر، لە بەرامبەر وێنەی گەورەی مەسیح، لە لای ڕاستەی میحراب چۆکی دادا بوو، بە دەنگێکی بەرز هاواری دەکرد:«خودایە لێم خۆشبە، ئەوە گوناحی منە ! بەڵێ تاوانی منە . ئێستاش ئەوە سەگ هاتوون دەیانەوێ تۆڵە بستێننەوە. »

لە ڕاستیشدا خەتای ئەو بوو. لە سەرەتای سالی ئایینی ‹ هەوەڵی سیپتامبر › پێش نوێژی دێر لە کاندی دەگەڕایەوە. ئەو لە شار چووبوە لای خەلیفەو تەواوی خەزێنەی قەدیمی دێری دابوو بە خەلیفە و داوای لێکرد بوو تا لە بن باڵی خۆی بگرێ ولەکن پاشا تکای بۆ بکات کە تورک ئەو جێگا پیرۆزە پەلامار نەدەن. بە خەلیفەی گوتبوو :

. باوکی پیرۆز تا ئێستا زۆر جار ئەو دێرە پیرۆزەیان ئاگر داوە. ئیتر بەزەییان بەمن دابێ. من پیر بووم، هێشتا برینەکانم ژان دەکەن. لە پێ کەوتووم، ناتوانم بیپارێزم. خەلیفە لە وەڵامدا گوتبووی:« پیریش بووبی، خودا خۆی پیاوە پیرۆزەکان دەپارێزێ. برۆ ئاسودە بە. دوعای خێری من هاوڕێت بێ. »

پێش نوێژ لە گەڵ دوعای خ...ی خەلیفەی بە سواری ئێسترە بۆزی خۆی لە دەروازەی لازارە وەدەرکەوت. لە ڕێـــــکا سەیری چیاکانی دەکرد کە بە زەردەی تاو پەڕین ڕەنگی ئاسمانیان گرتبوو.. بە دیتنی مەزراکانی سەر ڕێگا کە دروێنە کرابوون، بە و ڕەزانەی کە ترێیان لێکرا بۆوە، بەو دارزەیتونە پڕ بەرانەو بە سەیری دەریا دڵخۆشبوو. بە ناوە نار لە بەر خۆیەوە دەیگوت :« ئەم دنیا پوچە چەندە جوانە.کریت چەندە جوانە و خودا چەندە مەزنە.!»

لە ڕۆخی دەریا لە زەویەگڵە سوورەکان تێپەڕی. لە کاروانسەرای بیوە ژن لایداو ئارەقێکی پێدا

کردو ڕێگای درێژە پێدا.

لە چیای زاڵم وەسەر کەوت و ئێستەرەکەی بە کوێرە ڕێێکی هەڵدێردا وە پێش خۆ دا. شنە بایەکی سوک دەهات. پێش نوێژ تەماشای دەریای کرد کە لە لای ڕاستەی تاریک دادەهات. خاچی لە سینگی کێشاو جارێکی دیکەش لە بەر خۆیەوە گوتی:

- چەند جوانە ئەم دنیا پوچەو کرێت چەند جوانە.

لە پڕ سێ تورک لە بن بەرد دەرپەڕینەو بە چەقۆ غاریان دایە. سوێندیان خوارد بوو کە بیکوژن. خۆیان لە سەر ڕێگای ئەو مات کرد بوو. ئەو جەنابە (پاڵەوان قەشە) لە شۆڕشی ١٨٦٦ دا، چەند ژنی کردبوونە بێوە ژن کە هێشتا کەسوکاریان زیندوو بوون و پیر ببوون. ئەو سێ هەتیوە تورکە سوێندیان خوارد بوو کە تۆڵەی خوێنی باوکیان لەو کەسەبستێننەوە کە ئابڕووی بنەماڵەی ئەوانی بردوە.

ئێستر ڕەوییەوە وکەمی‌مابوو قەشە هەڵدێرێ. بەڵام سەرەڕای پیری ویان و پۆڕی توانی وەک پشیلەی چالاک خۆ کۆبکاتەوەو لە کاتێکا هاواری دەکرد: یا حەزرەتی مەسیح، هەڵیکێشا خەنجەرێ. هەر چواریان وەک هار تێک هاڵان. پێش نوێژ بە باڵای کورت و سینگی پان و ئێسکی ئەستور و تۆکمە، بە گورجی لە چەپ و ڕاست دەیوەشاند. داگیر سابوو، گەنج ببۆوە. گشت باوک و باپیری وە بیر هاتبوونەوە کە لە شەڕی تورکاندا کوژرا بوون. لەو شەڕەدا ئەو بە تەنێ نەبوو. بەڵکوو گشت خەڵکی کرێت لەوێ بوون. قەشەی پیر لە باسک و لەش و گیانیدا هەستی بە هێزێکی بێ پایان دەکرد.

هەر چوار تێک بەر ببوون، بە چەقۆ لێکیان دەدا، بە سەر بەردانیدا دەکەوتن و هەڵدەستانەوە. خوێن لە لەشیان دەچۆڕاوە. هەناسەیان تێکەڵ دەبوو. سێ تورکی لاو هەوڵیان دەدا گۆشتی قەشە بە دان لێ بکەنەوە. هاواریان دەکرد :

- کافر...بەد بەخت ... پیاو کوژ !..

قەشە هاواری دەکرد :( یا مەسیح ! بە مست دانی تورکانی تێک دەکردەوە و بەسەر بەردانیدا بەر دەبوونەوە. ئاخرەکەی شەوداهات و دەریا تاریک دەبوو. ئەستێرەکان هێدی و لە سەرخۆ سەریان وەدەر دەنا. داعبایەکی شەو لە سەر بەردێک دەیخوێند وسەیری ئەو چوار زەلامەی دەکرد کە تێک بەر ببوون و سەمای مەرگیان دەکرد. پێش نوێژ جارێکی دیکەش هاواری مەسیحی کرد و خۆی لە چەنگ شەش دەست و قاچی تورکان ڕاپسەکاند و تورکی بۆ سەر لێواری هەڵدێر ڕاکێشان و هەرسێک بە لاداهاتن و خۆیان پێ نەگیراوە، قەشە توندپاڵێی پێوە نان و هەرسێک لە کاتێکدا هاواریان دەکرد بە دۆڵێدا خلۆر بوونەوەو ڕۆیشتن.

پێش نوێژ پاڵی وەبەردێکدا و خاچی لە سنگی کێشا. خوێن بە سنگ و بەرۆکانیدا دەهاتە خوار. کراسەکەی دڕاند، برینەکانی پێچا ، لە بەر خۆیەوە گوتی :« خودایە ئەوەندەم توانا بدە بگەمەوە دێر و پاشان چیم بە سەردێنی کەیفی خۆتە.»

دانی دەچیرەوە بردن و لە کاتێکدا لە بەر ژان و دەرد دەیناڵاند، دەنگی ئێستری داو لە بەر خۆیەوە دە یگوت : « خوا گەورەیە» بەرەو دێر کەوتە رێ.

بۆ بەیانی هەواڵی شیرینکاری قەشە کە سێ تورکی کوشتبوو، بە شاری کاندی دا بڵاو بۆوە.

هەرای ساز کرد. سێ پەیژن کە کورەکانیان کوژرا بوون، لە گەڵ دەستەیەک تورک بە شین وگابۆر بەرەو شوێنی کارەسات کەوتنە رێ. تەرمی کورەکانیان لە دۆڵێدا دیتەوەو ناشتیانن. پیاوەکان خەڵجەری خۆیان لە سەر گۆرەکانیان چەقاند و سوێندیان خوارد کە خوێڵەمیشی ئەو دێرە لەعنەتیە بە سەر گۆری لاوەکان وەر دەکەن. پاشان راببوون و وەدوای بەڵێنی خۆیان کەوتن.

رۆژێک بەیانی دیتیان ، دەوور بەری دێری عیسای مەسیح پر بوە لە پەیاخ سوور. زەردەی خۆر وەدەروازەی لازار کەوت. دەروازە کرایەوە. دەستەی تازە لە تورکان لە دەروازە وەدەر دەکەوتن. هێندێ بۆ لای دێری گەمارۆ دراو وهێندێکیش بۆ لای ئاوایی تورک نشین <کاستلی> کە کافر داگیریان کرد بوو ، کەوتنە رێ.

برازاو ژن براکانی نوری و دۆستە کانی، بە سەرۆکایەتی بانگ بێژی خۆێن رێژ وەپێش دەستە کەوتبوون. وەک شەیتانیان لێهات بوو. مەسیحیەکان لە پشتی پەلجەرەی داخراو تەماشایان دەکردن کە بە قەمەو تفەنگ و دەمانچەوە رێگایان داگرتبوو. لە کاتی رۆیشتن دەیان نەڕاند و بە قەمە لە دەرگای یونانیەکانیان دەدا.

< سێ لوعبەتان > خەوالوو لە قەڵشتی دەرگاوە تەماشایان دەکردن. گوێیان لە هاتو چۆو گوڕە و هەرای گەرەکی تورکان دەبوو. ئەو دەرگا سەوزەشیان دەبینی کە تورکی لایەنگری نوری لێی دەهاتنەدەرێ. هەرەشەکانیان دەبیست. ناگلاڤە گوتی:

ـ ئەوانە دەچن ئامینەی دێڵە سەگ پێش ئەوەی ببێتە فەلە بیدزن و بیهێننەوە.

قروسینی بە خۆشیەکی شەیتاناناتەوە گوتی:

ـ دەچن پاڵەوان پولیکسینگیس ژنباز بکوژن .

خوشکی سێیەم هەناسەیەکی هەڵکێشا و بێدەنگ لە بەر خۆیەوە دەیگوت: « خۆزیا من لە جێی ئامینە بومایە تورک و مەسیحی ئەڤینداری بووبایە»

لەو کاتەدا دەنگی کۆخەی ئاغا ئاریستوتلیس هات کە لە ژووری سەرەوە لە خەو هەستابوو. هەرسێک کراسی خەویان داکەند، جلیان گۆری و چوونە ژووری. تا یەکیان بۆ چاو شوشتنی ئاو گەرم بکا و یەکیان کراسو شاڵواری بۆ ئامادە بکا وئەوی تریش قاوەو مرەبای گوڵی بۆ بێنێ.

هەر لەو سەعاتەشدا شاری ئاتێن لەو بەری دەریا لە ژێر شەبەقی هەتاودا، لە خەو رادەبوو. رۆشنایی لە کۆڵەکەکانی پانتئون دەهاتە خوارو ئەو دەشتەی دادەگرت کە ئەو شارەجوانەی مەشهور بە ئاقڵ و جوانی بە خەوالویی تێیدا ئارامی گرتبوو. شاری ئاتێن لەسەر ئاخ و مەر مەر خۆی لە بەر یەک کێشا بۆوە و بە فیز لە خەو رابوو، باوێشکی هاتێ. هەوراڵێن ئاهەنگی بە یانیاتی شارە. لە زمانی شیر فرۆش و رۆژنامە فرۆش و میوە فرۆشان بەرز بۆوە. لە کۆلانە تەنگەکانی گەڕەکە دوور کەوتوەکان، پەنا بەرانی کریتی‌مات و بێدەنگ لە حەساری سەدرەسە چۆڵەکان و عەمبارو کاولەکان دە هاتنە دەرێ.

ئەم هەژارانە بە بێدەنگی لەم شوێنانە بە رێز لە سەر زەوی دادەنیشتن وبە سەر یەکدا دەکەوتن و خەویان لێ نەدەکەوت. ژن دەسماڵیان بە سەری دادەدا و قاپلەمە یا قوتوە تەنەکە بە دەستەوە ، بۆ پێشێ دەچوون.هەموویان بە رێز لە بەر دەرگای حەسارێک دەوێستان کە مەنجەڵی گەورەیان وەسەر ئاگر نابوون و چەند سەعات چاوەروان دەبوون تا نۆرەیان دێ و یەک دوو کەوچک

شوێپاوی ئارد وەر دەگرن.
لە سەرە تاوە شەرمیان دەکرد، چونکە فێر نەبوون سواڵ بکەن. بەڵام برسیەتی شەیتانێکی بە هێزە. ئەوانی ڕاهێنابوو کە لە ژێر باری پێداویستیدا پشتیان بچەمێنن.
یونان. ئەو دایکە خەفەتبارە لە زاری خۆی دەگێڕایەوە تا خواردەمەنی بدا بە کرێتی برسی و لێتەوماو. تەنانەت ئەوانەی هەرە لەچەریش زاری کیسەیان دەکردەوە. دەزگیرانە گەنجەکان لە موخاریجی بوکێنی‌یان دەگێڕایەوە. قەشەکان لە بەر خودا دەپارانەوە تا لە ڕۆخە چۆڵەکانەوە پاپۆڕی پڕ لە ئازوقەو چەک و تەقەمەنی و سەربازی داوتەڵەب بۆ لای کرێت بنێرێ.
دووروتر لە ‹ سیرا › ئەو دوورگە ئاوەدانەی پڕ لە گەمی و پاپۆڕ، پاڵەوان ستیفانیس بە لاکی شەل بە کوڵانەکاندا دە سوڕاوەو دەستی سواڵی درێژ دەکرد و دەیگوت:
ـ ئەی مەسیحیەکان! ئێوەو خوا گەمی بدەن، گەمی بۆ کرێت . خودا دوعای قەبوڵ کرد. لەو ڕۆژەدا دوو دۆستی ئەو بۆ بەرگری دێر دەچوون. پاڵەوان ستیفانیس گەمیەکی پڕی لە ئاتارد و کەوڵ و پارچەوئازوقەو تەقەمەنی لە نیشتمانپەروەرانی ‹سیرا› کۆکرد بۆوە، خستیە ڕێ. شنەبایەکی نەرم گەمی بۆ لای کرێت ڕادەدا. پاڵەوان ستیفانیس خاچی لە سینگی کێشا. وێنەی سن‌نیکولای هەڵگرت و لە سینگی گەمیەکەی‌دا. پاشان داهاتەوە ماچی کرد و بە سرتە بە وێنەکەی گوت :
ـ بابە بەرز سن‌نیکولا ! باش چاوەکانت بکەوە . بزانە تۆم لە سینگی پاپۆڕداوە. پاشان نەڵێی لە ژێر عەمباری گەمی بووی و هیچت نەدیوە.› ئیمامی دەریا گەڕان بەو ڕیشی کورت و تێک هاڵاوی، بێ ئەوەی شتێک بێژێ، تەماشای کرد. لە دەستەکانیدا کە خوێنی دەریا وردی کرد بوون ئامرازێکی چکۆڵەی یاری دەبینرا. لۆتکەیەک بوو چەند زەلامی تێدا دانیشتبوون. سن نیکولا خۆی بزەیەکی لە سەر لێوان بوو. پاڵەوان ستیفانیس داهاتەوەو وێنەکەی ماچکرد.
پەڵە هەورێک وەک دووکەڵێکی پڕلە لای خوارەوە لە ئاسمان دەرکەوت. خێرا زیادی کرد. کزمەڵە هەوریتر بە دوای دا هاتن. بای گەرمی خوارووا وەک شرانێک ئەو مێگەلەی لێ دەخوڕی. کاتی نیوە ڕۆ هەور بە جارێک ئاسمانیان داپۆشی. هەوەڵین دڵۆپە بارانی پایزی هاتە خوار و عەرزی تەڕ کرد. هەوەڵین گرمەو بروسکی هەور دەریای کوتا. پاڵەوان ستیفانیس چاوە وورد و زەقەکانی بۆ لای خوارووا وەرگێڕا و بە زەردە خەنەوە گوتی:
ـ دەک گیانم بێ بای خوارووا. ئەی پڕکەری مەشکەی بەتاڵ. لافاوێک لە ئاسمان هەڵسێنەو بە سەر زەویدا بڕێژە. مەهێڵە نە ڕۆژ بێتە دەر و نە مانگ. دنیا بە تەواوی تاریک کە، تا من بتوانم بچمە قەراخ و بە پەلە و بە بێ ترس و گێشە شتەکانی کرێت خاڵی بکەم.
پاکێش کە لە چیا سەر دەکەوت، گوێی لە گرمەی هەوری بوو. چاوێکی لە ئاسمان کرد بروش داگیرسا بوو. ترساو هەنگاوی توند کردن و گوتی:« ئاخ ئاسمان! تاوێک بوەستە تا من دەگەمە ماڵی گئورگاروس، ئەو دەم چت گەرەکە وابکە . »
پاکێش دەچوە گوندی ‹ئاناپولی› لە چیا، تا ژن و کچەکانی تا دوایی شەر لای براددەرەکانی دامەزرێنێ.
نیوەشەو گەیشتە ئەوێ. لە دەرگای دا، بەڵام کەس وەڵامی نەدایەوە. دیسان لێی دا،

گئورگاروس بە چاوی خەوالو وقژی پەرێشان و ڕەنگی بزرکاو هاتە دەری. پاکێش گوتی:
- سلاو هاورێ. دەتوانم ئەم شەو لە مالی تۆ بمێنمەوە ؟
- زۆر بە خێر هاتی... مالی خۆتە ..
پاکێش وەژوورکەوت، کابانی مالێی نە دی. دەنگە دەنگێک لە قاتی سەرەوە دەهات.لە برادەرەکەی پرسی:
- خێزانت لە کوێیە ؟
- ببوورە . لەو رۆژانەی دوایێدا خۆی ماندوو کردوە و نەخۆش کەوتوە. سلاوی دەگەیاندی. تکای دەکرد کە لێرە وەک مالی خۆت بحەوێیەوە. سفرەی ڕاخست. خواردن و شەرابی هێنا. چرایەکی دیکەشی پێکرد و گوتی :
- ببوورە پاکێش ئەگەر نانەکە باش نیە. نەم دەزانی ئەم شۆ سەر بەرزم دەکەی. بەلام بەیانی بە ئیزنی خودا کەلە شێرێکت بۆ سەر دەبڕم. لە دەرەوە باوباران حەشری دەکرد. لە حەسارێ لقە دار هەلجیری کۆنە سالێ بە توڕەیی دە جولانەوە.
پاکێش گوتی:« بە ئیزنی خوا سبەی بەیانی دەڕۆم. چونکە بەلێنیم بە پالەوان میکێلس داوە ئەگەر بەلێنیم نەبەمە سەر تەریق دەبمەوە. جگە لەوەش من لەو پیاوە دەترسێم. ئێستاش بۆیە هاتوومە ئێرە تکایەکت لێ بکەم. »
- هەرچی لە دەستم بێ بۆت دەکەم.
- دەمویست تکات لێ بکەم ئەگەر ژوورێکی زیادیت هەبێ. تا وەزع هێدی دەبێتەوە، ژن و مندالەکەی من پەنا بدەی.
گئورگاروس وەک شتێکی لە گەروو گیرابێ، قومە شەرابێکی خواردەوە و پاشان سەری بەرداوەو گوتی:
- بە هەلکەوت ژوورێک خالی بوە، تۆ دەتوانی داگیری بکەی. ئەوەی گوت و هەستا دەرگای کردەوە و دوای تاوێک گەرایەوە هەموو لەشی تەڕبوو. دانیشت و گوتی :
- سوپاس بۆ خودا ، باران دەبارێ ، زەوی بۆ کێلان نەرم دەکات. مێزەکەی کۆکردەوە و جێگای بۆ ڕاخست و گوتی:
- بخەوە. هیلاکی، لە ڕێگای دوورەوە هاتووی.
بەیانی زوو گئورگاروس قاپە شیرێک و کولێرەیەکی نانی جۆ وپارچە پەنیرێکی بۆ دانا. لە ماوەی شەودا ئاسمان هەورەکانی خالی کردبوو، هەوا تاووساو بوو. کەلەشێر لە سەربانی دەیانخوێند. پاکێش گوتی :
- مالیاوا گئورگاروس! بە چ زمانێک سوپاسی ئەو چاکەیەت بکەم خودا جەزات بداتەوە.
- نارەحەت مەبە پاکێش. خودا تورکێکی مل ئەستورە و دەبینی چۆن تۆلەمان بۆ دەکاتەوە.! برۆ بە سلامەتی.
تاوهەلات. بەردەکان کە تازە شۆرابوونەوە هەر بریقەیان دەهات. دلۆپە باران لە سەر گەلای داران دەدرەوشانەوە. پاکێش کوێرە ڕێی چیای گرتە بەر و بە دلنیایی فیتووی لێدەدا. پەناگای بۆ ژن و مندالان دۆزیبۆوە. خەیالی ئاسودە بوو. وەپەلە کەوتبوو کە بگاتە پالەوان میکێلس و

کایامبیس و میستیگری.

لەولای گوندی دەرگای خانوێکی بچوک کرایەوە. پیرەمێردێکی پچکۆلە سەری وەدەرنا. باکێش دەیناسی. ئەو زاخاریاسی مامی‌گئورگاروسی بوو. پیاوێکی هەمە کارە بوو. داری پێوەند دەکرد، حەکیمی خەڵکی گوندی بوو، ئێوارەی ڕۆژەکانی شەمۆ گۆزەڵەو مقەست وگوێزانێکی هەڵدەگرت و لە سەرپلیکانی کلیسا دادەنیشت. هەرکەس سەری لەبەر دەستی نابایە دەیتاشی. کیسەیەکێشی لەگەڵ خۆی دەهێنا، خەڵک نان و سەوزی و کشمیشیان بۆ تێدەکرد. دوو بوتڵی‌گەورەشی پێبوو یەک بۆ شەراب و یەکیش بۆ زەیتون. کاتێک موشتەری نەدەبوو، تۆکە تاشراوەکانی کۆ دەکردەوە،وئاگری دەدان وبۆگەن و دووکەڵی بە نێو گوندی وەر دەکرد. باکێش سڵاوی لە پیرە مێرد کرد و گوتی: تەمەنت درێژ بێ باوە !

پیرە مێرد لە وەڵامدا گوتی: سڵاو چەنگ زەن ! دنیا لە چ مەرگێک دایە و بۆ کوێ دەچی

. ئاخ ! هەر مەپرسە. دنیا بەرەو جەنەدەم دەچێ.

. تۆ چۆنی :

. منیش لە گەڵ دنیا دەڕۆم. چما کارێکی دیکەم لە دەست دێ؟ دوێ شەو لە ماڵی گئورگاروس خەورتم. نەختێ گاڵتەمان کرد. ئێستاش ئەوە دەگەڕێمەوە.

پیرە مێرد بەرەو ئاسمان دەستەکانی بەرزۆ کرد و لە بەر خۆیەوە گوتی:

. لە ماڵی گئورگاروس خەوتی؟ ئاخ خودایە ! کە وابێ هەر بۆیە بوو کە ئەو فەقیرە خەبەری دابوو نەچینە لای و دەست بە گریان و ڕۆڕۆ نەکەین.

. دەڵێی چی بابە.... گریان و رۆ ڕۆی چی ؟

. بۆ ..چما نەتزانیوە ؟. نا .. چ بوو ؟... چ بزانم ؟

. ئاخر ئەو دوێنێ بەیانی کورەکەی مردوە .. یانی کوشتوویانە ... ئەوان لە ژوورەکەی سەرێ لە سەر مەیتەکەی بوون. شەویان ڕۆژ دەکردەوە . سەیرە تۆ نەتزانیوە ..!.باکێش بێ ئەوەی هیچ بڵێ، هەرتک دەستی بە چاوانەوە گرت و دەستی کرد بە گریان .

پیرە مێرد گوتی : « باکێش مەگری ... ئەوە چارە نووسی هەموومانە . »

* * *

ئەو شەوە بەسەردێری مەسیح دا باران باریبوو. ئەو قەشانەی کە سێ شەو وڕۆژ لە پشت مەتەریز نەبزووتبوون وبێ حەسانەوە دژی تورک بەرگری‌یان کردبوو ، ئێستا هەستیان بە فێنکی دەکرد. قەشەکان هەموو ٣٢ کەس بوون. بیست کەس لە گوندی‌یەکانی دەوروبەری دێر، کە نەیانوێرا بوو ڕابکەن، هاتبوونە نێویان. گوندی‌یەکان کە گوێ‌یان لە دەنگی خەفەتباری ناقوسی کلیسا ببوو، ژن و منداڵیان بردبوە نێو ئەشکەوتێکی سەر چیا کە بە مەتەریزی خودایان دەزانی، خۆشیان بە ویست و دڵخواز لە مەر و بزن و نان و کولیچەو ئازوقە چی‌یان هەبوو بە کۆڵیان دادا بوو، بە ڕیشی مەرگ پێکەنی بوون و هاتبوون ڕەگەڵ ئەوا ن کەوتبوون.

دەوروبەری تیوە ڕۆ بوو، پاڵەوان پولیکسینگیس لە گەڵ دەستەی خۆی لە بستوی دێر وەنیزیک کەوت و دێری لێ وەدیار کەوت. لە دووردەنگی شەیپور و تەقەی تورکان و هەرای ئەو

خەڵکەی دەکوژران و با دەیانکوشت، دەبیسرا. لەو سەرەوەش ئاسمان تاریک و هەورەکان بۆ لای سەروو دەبزووتن. شەرکەران دەیانویست بە پەلە خۆیان بگەیێننە سەر باسکی، تا تێنێک وەبەر براکانیان بنێن. بە تەقەی تفەنگ گەیشتنی خۆیان رادەگەیاند.

هەوەڵ کەسێکی گەیشتە سەر بستوێ پاڵەوان پولیکسینگیس بوو. دەمانچەیەکی هاویشت وهاواری کرد :

ـ سڵاوتان لێ بێ ..براکانم . پاشان ئاوڕی لە هاوڕێکانی خۆی داوە کە بە هەناسە برکە سەر دەکەوتن .هاواری کرد : کوڕینە سڵاوا نامەوێ ئاقە گوللەیەکیشتان بە خۆڕا بڕوات. هەمیشە دەستڕێژ لە کۆی دوژمن بکەن. ئەوەی گوت و کۆمەڵێکپەپاخ سووری نیشاندان کە وەک خاشخاشک لە دەوری دێر شین ببوون. پەلجا گوللەیان بە تورکانەوە نا. هێندێ بە ریزە ریز وەبەردان دەکەوتن و هێندێکیش تورکیان وەسەرێنک دەگێڕان. بیست کەلاکێکی دوژمن کەوتە عەرزی. لە دێر هوڕای شادی بەرز بۆوە.: بەخێر هاتن کوڕەکان .. هیلاریسون ئەنانی ناقوسی راوەشاندوەنگی شادی بڵاو کردەوە.

تورک تووڕە ببوون، لە تاریکی شەودا فەلەکانیان دەبینی کە بڵاو دەبوون و لە پشت گاشەبەردانەدا خۆیان حاشار دەدا. دەیان لوراند، هاواریان دەکرد.: ئەلاّ...ئەلاّ،، کافری دیکەش گەیشتنێ: عەسکەری خەتی پێشی جەبهە. بۆ پاراستنی گەمارۆی دێر لە مەتەرێزەکانیاندا مانەوە. ئەوانیتر هێرشیان بۆ لای بستوێ برد،

بارانێکی توند دایبدایە. هەورێکی ئەوی لە سەر باسکی چیا فەلەکانی ئەدیو کرد. باران تورکەکانی سەخڵەت دەکرد.

پاڵەوان پولیکسینگیس هاواری کرد : کوڕینە دەسڕێژ بکەن خوا لە گەڵ ئێمەیە .

جارێکی تریش تەقەی دەسڕێژ بەرزدەبۆوە ، ناڵەی بریندارن و جنێوی سەربازان دەبیسرا. بەڵام هەورەکان هەر ئەوی دەبوون و بارانیش کاری خۆی دەکرد. بێجگە لە پەپاخی سوور و بریقەی نیزە هیچیتر دیاری نەدەدا.

پێش نوێژی دێر لە پشت مەتەرێزێنک چۆکی دادابوو، کاتێنک دیتی لەشکری دوژمن دوویەش دەبێ، هاواری کرد:

. بۆ پێشەوە برایان ...هێزی دوژمن دابەشبوە. کاتی ئەوەیە پەلامار بەرین و گەمارۆ بشکێنین.

قەشەو گوندی بە جارێنک راست بووڤەوە. ناقوسی کلیسا توند دەنگی دایەوە. لە کاتێکا تفەنگەکانیان رادەوەشاند، هەموو لە حەساری کۆ بوونەوە. پێش‌نوێژ وەپێش کەوت و دەروازەی گەورەی دێری کردەوە. گشتیان بە هاوار و هوڕا وەدەر کەوتن. تورک کە لە نێوان دوو ئاگردا گیر ببوون، لە پێشدا پە شۆکان. فەرمانیان پێدرا کە بۆ نێو دۆڵ پاشە کشە بکەن. قەشە وەدوایان کەوتن. پێش‌نوێژ دەچوە پێش و هاواری دەکرد : مەسیح سەرکەوت...مەسیح سەرکەوت.! پیری خۆی لە بیر چووبۆوە، بە سەر بەردو کەندو قوڵکاندا ڕایدەکرد و بەسەر درک ودالّدا بازدی دەدا. تارێنک دەوێستا، تەقەیەکی دەکرد و ڕایدە کردەوە. بۆنی باروت سەرخۆشی کرد بوو.

لە پڕ دەنگی شەیپوڕێنک لە حەوا دەنگی دایەوە. تورک لە جێی خۆ راوەستان. پاشان لە

پشتەوەی قەشەکان دەنگی شەبپورێکی دیکە هات. قەشەیەک هاواری کرد :« ئێمە گەمارۆ دراوین کەوتووینە نێو داو، هاوار بگەرێنەوە.»

قەشەیەکی تر هاواری کرد : وای...وای.. تورک چوونە نێو دێر.

پێش نوێژ دەمانچەی هەڵکێشاو خەنجەری لە کالان هێنا دەرو بێ ئەوەی لە گەڵ کەس بدوێ، ڕای کردە دەروازەی کراوەی دێر. پاڵەوان پولیکسینگیس هەستی بە مەترسی‌کرد و لە گەڵ زەلامەکانی خۆی هێرشی دەستپێکرد. باران هەر دەباری. ڕۆژ سەری دەبن هەوری نابوو. تارێکی زەوی داپۆشیبوو. تورک و فەلە تێکەڵ ببوون و لێکیان دەدا.. پێش نوێژ کە بە زەبری خەنجە ڕێگای خۆی دەکردەوە، دەچوە پێش و هاواری دەکرد : کوڕینە بە دوای مندا !

پاڵەوان پولیکسینگیس لە گەڵ پیاوەکانی ڕای دەکرد بگاتە دەروازەی دێر هاواری کرد :

. کوڕینە ئازا بن ..! هێندی لە تورکان گەیشتبوونە حەساری دێر و بۆ کلیسا دەچوون.پەڕۆو کۆنە تەلیسیان ئاگر پێوە دەنا تا کلیسا بسوتێنن. دوو دەنگی وشکو بە سام، دەنگی پێش نوێژ و پاڵەوان کە پێکەوە لە دەروازە هاتبوونە ژوور و تورکیان پەلاماردابوون، بە گوێ گەیشت...«ئەی سە:...ئەی مەلعون ..» قەشەگەلێتر بە دوای ئەواندا دەهاتن و تورکیان دەورە دابوون. بۆ قوژبنێکی سەربانی کلیسا ڕاپانداو هەموویان لەتو پەتکردن.

لە دەرەوە تینی گەرمایی شەڕ دامرکا بوو. پاڵەوان لە دێر هاتەدەر تا بچێتەوە کن هاوڕێکانی. دەروازەی گەورەی دێر جارێکی‌دیکەش داخراوە. شەو داهاتبوو، ئاسمان و زەوی بە هەوروباران داپۆشرا بوون. پاڵەوان پولیکسینگیس بە هاوڕێکانی گوت :«کوڕینە بۆ جێی خۆمان، بۆ مەتەرێزەکانی سەر باسکی.» بەیانی ڕۆژبۆوە. مەسیحی کوژراوەکانی خۆیان ژمارد. سێ کوژراوو بێ شوێنێکیان هەبوو دەستەی پاڵەوانیش دوو کوژراوو چەند برینداریان هەبوو. لە خوارەوەی بستوێ قولکەیان هەڵکەند و مەیتەکانیان شاردەوە. دوو کوژراوەکان مام و برازایەکی گوندی کاستلی بوون. پاڵەوان دوو لقەداری هەڵگرتنەوەو بە شکڵی خاچ لە سەر قەبرەکەیانی چەقاند و گوتی :

. ئەرەش دوو قوربانی دیکە ! داخوا کەی نۆرەی ئێمەش دێت .! پاشان ڕووی کردە هاوڕێکانی و گوتی :

. هەر چی خواردەمەنی هەمانە ئامادەی بکەن. مرۆڤ ئەوەندەی زیندوە برسیش دەبێ. ئاگریان کردەوە، چێشتیان لێنا و خواردیان. باسی زیندو ومردوانیان کرد. کێشکچی یان داناو ئەوانی دیکە نوستن. بەیانی زوو شەر دەستی پێ‌دەکردەوە. لە خوارەوە لە نێو دۆڵێ دێر تا نیوەشەو روناک بوو. قەشەکان سوپاسی خودایان دەکرد کە دێری لە سوتان نەجات دابوو.

فوتیوسی پیر هەتوانی بۆ برینەکان ساز دەکرد، برینەکانی دە شوشت و دەیبرژاندنەوە و دەرمانی دەکردن.

عەسکەری تورک کە لە نێو دوو لەشکری مەسیحی دا مابوونەوە، کوژراوەکانیان ناشت و بریندارەکانیان دەرمانکرد، مات و بێدەنگ لە بەر ئاگری دانیشتبوون و بیریان لە ژن و منداڵی دەخۆ دەکردەوە کە لە ئەنە دۆڵ و ئاسپای پچوک بە جێیان هێشتبوون. پاشملەی ئەوان کێ مەزراکانی دەکێڵا، کێ ڕەزەکانی تەکیش دەکرد، کێ نانی بۆ ماڵەکانیان دەهێناوە: ئاخر

ئەوانیش ئینسان بوون و بە پێچەواتەی بۆ چوونی فەلان، سەگ نەبوون.
لە گەڵ کازیوەی بەیانی تورک و مەسیحی لە خەو رابوون و شەڕیان دەست پێکردەوە. دوو دەرویش تەپڵ و زورنایان دەست دایە وەدەیانکوتا و بە پێش سەفی عەسکەر دەهاتن و دەچوون و هانیان دەدان. ئەشە چوونە نێو مەتەرێزان. پیش نوێژ کە سەری بریندار ببوو، ژانی دەکرد و خوێن بە ریشی سپیدا دەچۆڕاوە. بەو حاڵەش بەر لە کازیوەی بەیانی چووبوە دە مەتەرێز و چۆکی دادا بوو. چاوی لە تورکان نە دەتروکاند. کەدەیدیت سەرێک دەجوڵێتەوە، سێرەی لێ دەگرت وەدەی گوت :« ئینسان کوشتن با کافریش بێ کارێکی خەراپە. بەڵام خەتای ئێمەش نیە. بە راشکاوی دەڵێم خەتامان نیە. ئاخ... خودایە ئێمە ئازاد بکەی. تا لە مەو بە دوا لە ئاشتی و ئاسایش دا بژین. »
لەسەر باسکی هاوڕێیانی پاڵەوان پولیکسینگیس لە پشت گاشە بەردان خۆیان قایم کردبوو، لولە تفەنگەکانیان ئاراستەی تورکی پەپاخ سوور کرد بوو. بەڵام پاڵەوان هەروا بە پێوە راوەستا بوو، بە سەر شەڕکەراندا دەگەڕا.
پیاوەکان هاواریان دەکرد : «داوەرەوە پاڵەوان گوللە مێشکت دەپڕژێنێ.» لەراستیشدا لە بان سەریان گوللە دەباری. بەڵام پاڵەوان پێکەنی و گوتی :« خۆ منیش دەمەوێ سەر دانوێنم. خودا خۆشی دەزانێ منیش دەترسێم. بەڵام شەرم دەکەم. ئەگەر ئێوەش پاڵەوان پولیکسینگیس بان، هەروا دەسوڕانەوە. »
کابرایەکی زلحۆل بە شێوەی پلار و لاتاو گوتی :
- لام وایە ئاغای پاڵەوان تۆ پارچە خاچێکی راستیت پێیە، بۆیە ناترسێی.!
ئەم جارە پاڵەوان بە دڵی گرت و گوتی :
- نیکولیس ! بزانە خاچی بەراستی هەر ئازایەتی‌یە. من خاچی بە راستی دیکە ناناسم.
لەو کاتەدا شەڕ لە داوێنی چیا توند ببوو، تورک پتر لە دێر وەنیزیک دەکەوتن. و دێر دەکەوتە مەترسیەوە. پاڵەوان پولیکسینگیس هاواری کردو گوتی :
- رابن ئەی پاڵەوانان.. رابن ، مەسیح سەر دەکەوێ. تورکان پەلامار دەن پاڵەوان لە پشت بەردان هاتنە دەر و هێرشیان برد. بەرد لە ژێر پێیانیان خلور دەبوونە، چیا لە پشت سەریان دەخزی.
لە پێشدا شەڕە تفەنگ بوو. پاشان بوو بە شەڕی تەن بە تەن. بە خەنجەران تێک بەربوون. لە پڕ لە دێریشدا تەقە بڕا و دەنگی تفەنگان نە دەهات. تورک و فە لە لێک جیا نەدەکرانەوە. پیش نوێژ پیاوە ئازایەکانی کردە مەعموری پەلامار وبە هێندێکانیشی گوت ،مەتەرێزان بپارێزن. ژمارەی مەسیحیەکان کەم بوو. تورک لە هەموو لایەکەوە هەڵدەقوڵین. ژمارەیان یەک بە حەوت بوو. پاڵەوان پولیکسینگیس‌و پیش نوێژ بە لەشی خویناویەوە لە سەرڕادەهاتنە خوارو هاوڕێکانیان هان دەدا. تورک وەک لافاو پەلاماریان دەهێنا.
نیزیک بە نیوە ڕۆ مەسیحی بەرەو کزبوون دەچوون. بورجەکانیش یەک بە یەک دەروخان. رۆژ لە ئاسمان بە گاوەخۆ دە بزووت و نەیدەکردە شەو تا شەڕکەران لێک کاتەوە. باران نەدەباری تا چاوی تورکان کوێر بکا. رۆژ درێژ و هەوا خۆشبوو.

لەم ئاگرو خوێنەدا پاڵەوان و پێش نوێژ، دەمێکی کورت تێک هەڵەنگوتن. چاویان تێک بڕی و هیچیان نەگوت. بەڵام هەرتک لە نیگای یەکتردا بەدیان دەکرد کە دێر لە دەست چوە.

لە نەکاو دەنگی دەستڕێژ لە تێو دۆڵێدا دەنگی دایەوە. ئەلە ئاڵایەکی وەشیان چاو پێکەوت کە دەلەرێتەوە. بە دوای ئاڵاکەدا زەلامێک بە گوڕ بە سەر بەردانێدا بازدەداو دێتە پێش. پاڵەوان میکێلس بە سام ئەسپ تاو دەداو بە تەقەی تفەنگ سلاوی لە شەرکەران کردو تورکی پەلاماردان وگوتی:« ئەی سەگی دەمەلعون ! لەم خوشبەختیەکە وا ئێوەم دەگیر خستوە.» ئەو رۆژەو رۆژەکانی تریش دەستە دەستە بریندارى تورکیان بۆ کاندی دەهێنایەوە. پاشا لە حەیفان ریشی خۆیدەڕنیەوەو دە یگوت: «چما ئەو دێرە لەعنەتیە چی تێدایە کە وا هێشتا بەربەرەکانی دەکات. ئێوە ئەی بێ عورزانە شەرمێ ناکەن ؟»

بریندارەکان دەیانگوت :« ئاخ پاشا ! لە سەرەتاوە ئێمە لە سەر بووین، بەڵام ئەو پاڵەوان میکێلسە لەعنەتیە گەیشتێ و ...

هەموو لە تێوان هیلاک ببوون. بانگی باریابانیس - یان کرد شەربەتی بۆ دەهێنان. ئەفەندم هات بە هەوای گۆرانی قورئانی بۆدەخوێندن تا رەنج و دەردی شەریان لە بیربەرنەوە. هیلاریسونی ناقوس راوەشێن کە رۆژی پێشوو بە دیل گیرابوو . بە دارچناریانەوە کردبوو دەسوڕاوە. ئەو هێشتا لە تەنافی ناقوسەکە کوتێکی بەدەستەوە بوو. کاتێ بە دیلیان گرتبوو، نەیویستبوو تەنافی ناقوسەکە بەر بدات. تورک تەنافەکەیان هەڵبڕیبوو.

خەلیفە لە بارەگای نوسقوف نشین ،شەووڕۆژ لیباسیداتەدەکەندو لەسەر هەست بوو. چونکە نەیدەزانی چ‌رۆژ و چ سەعاتێک دێن دەیگرن. نەیدەویست بە رووتی بگیرێ‌و بە نێو کۆلان و بازاردا بیگێڕن. قەشەیەکی لە دێری چیای کودوما، لە کەنار بەحری لیبی هێنابوو، ئیقراری لە کن دەکرد و شەو ورۆژ دوعای بۆ دەکرد تا گیانی ئامادەی شەهید بوون بێ. مورتزوفلوس دەمێک لێی جیا نەدەبۆوەو هەمیشە وەک سەک لە دەورەی بوو. لە پێش دەرگای ئەو دەنوست ،تا نەکا بێ ئاگاداری ئەو خەلیفە بدزن ولە بەرەکەتی گیان دەرچوون لە گەڵ ئەو بێ بەشی بکەن.

ئاخرەکەی شەو داهات. خاچ و مانگ لێک جیا بوونەوە. فەلەو تورک ئاگریان کردەوە. مەسیحیەکان لە بناری چیاو تورکیش لە دەوروبەری دێر وەک تارمایی رەش دەهاتن و دەچوون. دوو پاڵەوان گەیشتبوونە یەک و لە بارەی شەر و نەخشەی هێرشی بەیانی قسەیان دەکرد. پاشان بێ ئەوەی تۆزێک باسی دۆستایەتی بکەن لێک جیا بوونەوە.

پاڵەوان پولیکسینگیس کە هێشتا لە بەر کوڵ و گەرمی شەر پۆشەکابوو، نەیڕژا باسی دۆستایەتی بکا. خۆ ئەگەر باسیشی بکردایە، پاڵەوان میکێلس لەوانە نەبوو گوێی بداتێ. پاڵەوان میکلس بە تەنیا لە کن ئاگرەکە مابوە. سیغارێکی داگیرساندو توروشی بیری لێڵ و تاریک بوو. نەخێر. ویژدانی ئاسودە نەبوو. شەری دەکرد، دەیکوشت، هەمیشەش بێ ئەوەی سکاڵابکا بۆ گیانبدایی ئامادە بوو، بەڵام بەو حاڵەش ئەو بیری لە کریت نەدەکردەوە. کاتێک سوار دەبوو، رکێفی لێدەداو هاواری دەکرد : بۆ پێشەوە، بیرو بارەڕی تەواوی نەبوو، شەوانەش کە دەکشایەوە، وەک رۆژ بیری‌لە ئازادی نەدەکردەوەو فیکری بۆ شوێنێکی تر دەچوو. ئەوە خۆی گیانی ئەوی پڕکردبوو لە شەرمەزاری .

بە نارە نار تفێکی لە ئاگر کرد و لە بەر خزیەوە گوتی:« شەرم بکە ئەی پالەوان میکێلس»
لەو کاتەدا کە لە دەریای بیرو خەوتە تاریکەکانیدا نوقم ببوو، دەنگی هەناسە بڕکەو هەنگاوی بەسپایی بیست. ئاوڕی دایەوە، باکێش بوو بە هەناسە بڕکە دەهات. پالەوان راست بۆوەو پرسی :
. چ باسە..؟ لەعنەتی چقەوماوە ..؟
باکێش دەمێک بوو هەستی بەوە کردبوو کە خەمێکی نهێنی پالەوان میکێلس دەخواتەوە. سەری بردە بن گوێی و گوتی :
. پالەوان..پالەوان ... ئامینە ..
پالەوان راچەنی . باسکی باکێشی گرت و بە توندی دایناو گوتی :« سەبر قسە بکە .»
. پالەوان .. دەستەیەک تورک ئەم شەو هاتنە کاستلی و رفاندیان . پالەوان دەستەکانی بە ئاگری راداشت و دەیویست بیانسوتێنێ، هەرتکیان ماوەیەک بێدەنگ بوون. ئاخرەکەی پالەوان پرسی : بۆ کوێیان برد ..؟
. بۆ کاندی !
. کەنگێ ؟
. هەوەڵی شەوێ ..
پالەوان راست بۆوە گوتی : « لە گەڵ من وەرەو زمانت نەگەڕێ »
بەلام باکێش خۆی پێ رانەگیراو هاواری کرد :« چۆن تۆ مەتەریزی خۆت بە جێ دێڵی ؟ ئەگەر تورک نیوە شەو پەلاماریان هێنا چی ..؟»
. بێدەنگ بە .. دە کەسی لە شەرکەرە باشەکان هەڵبژارد وگوتی :
. کوڕینە لە گەڵ من وەرن. دەمانەوێ راوێکی دەشتێ بکەین. پاشان رووی کردە هاوڕێکانی دیکەو گوتی ؟
. پێش تاریک و روونی بەیانی دەگەڕێمەوە. باش ئاگادار و وریا بن. پاشان لە گەڵ دەستەیەکی دەکەسی رێگای دەشتێی گرتە بەرو لە تاریکاییدا بزر بوو.
دوو سێ سەعات تێپەری. نیوە شەو لایدا بوو، ئەوانە فرە هیلاک و شەکەت بوون، کێشکچییان دانان و خەویان لێ کەوت. لە ژووری دێر ئەو قەشانەی لە هەموان پیرتر بوون، لە سەر بەردەکانی حەساری دێر کەوتبوون ولە بەر خودا دەپاڕانەوە. کە سەر خوار کاتەوەو دێر بگرێتە ژێر پەناو پشتیوانی خۆی.
پێش نوێژ برینەکانی بەپەرۆ پێچابوو جۆبوە نێو مەتەریزی خۆیەوە. لە مەتەریزدا عەسکەری تورکانی دەبینی کە وا لە بەر ئاگر دێن و دەچن و دەنگی جرینگەی چەکەکانیان دێت.لە بەر خۆیەوە دەیگوت : « ئەو سەگانە وەرناکەون، بێگومان خەریکی فرت و فێڵن .!»
ئاسمانی بان سەریان یەکجار ساو بوو، ئەستێرەکان دەدرەوشان. هەوایەکی سارد لە چیاوە دەهاتە خوارو کاری لە ئێسکان دەکرد. بروسکە یەک بە پانایی ئاسماندا راخوشی. پێش نوێژ خاچی لە سینگی کێشا و لە بەرخۆیەوە گوتی:« ئەوە نیشانەی کۆنایی شتێکی گەورەیە. خوا بکا دێر نەبێ ! » هەروا کە رووی لە ئاسمانێ کرد بوو دەپاڕایەوە. لە پڕ دەنگی تەپڵو شەیپور هەستا، هەرلەو کاتیشدا هەرای ئەلا ئەلادەهات لافاوێکی پڕو رەش بەرەو دێر کەوتە رێ. تورکی

توره و حەسارەوە دێریان پەلاماردا. عەرز دەلەرزی. لەوکاتەدا کە شەر لە بناری چیا توند بوو، عەسکەری تورک پێژەیان بە دیواری دێرەوە دەنا، تاسەر کەون. رۆژ دەهات تەواو رووناک دەبوو.
پێش نوێژ بە هاوار بانگی قەشەکانی کرد:
ـ ئەی برایان دێر لە دەست چوو. چیتان پێ نێژم گوێ بدەنێ دێر لە دەست چوو. خەتای منە. ئەوان تەنیا دە یانەوێ من بگرن، تۆڵە بستێننەوە. من ئەوە دەچم تەسلیم دەبم.
فوتیوس، قەشەی حەکیم گوتی : « ئەی روحانی پیرۆز، دەتکوژن ! »
ـ گومانی تیدا نیە دەمکوژن . دەتویست چیم لێ بکەن؟ بەلاّم لە جیاتیان دێر نەجاتی دەبێ.
ـ ئاخ .. ئەوان دەتکوژن و دێریش نەجاتی نابێ. تورک فێڵە زان و بە مەکرن .
ـ من ئەرکی خۆم بە جێ دەگەیێنم. ئەوان چۆنیان گەرەکە با وابکەن. خوداش چۆنی دە خوازی وادەکات.
وەکازی پێش نوێژی دەست دایەو، پەرۆیەکی سپی لێ هالاّند ، چوە سەر دیوارێک، رایوەشاند و بانگی کرد .
تورکێکی بە رەگەز کریتی هاواری کرد : قەشەی مەلعون چت دەوێ ؟
ـ سەرکردەی ئێوە کێیە. برز پێی بێژە کە پێش نوێژ تەسلیم دەبێ، بەلاّم بەو مەرجەی کە دەست لە دێر نەدەن.
هەرای وان لە هەرتک نزردوو دەنگی دایەوە. ئەوانەی دەستەو یەخە بوون لێک جیا بوونەوە. تەقەی تفەنگان راوەستا. لەو کش و ماتیەدا کەڵە شێری دێر دەستیان کرد بە خوێندن. دەبوو بە رۆژ.
حەسەن بەگی سەرکردەی تورکان بانگیکرد : چەکت دانێ وەرە دەرێ. من دەست لە دێر نادەم.
پێش نوێژ بەرەو ئاسمان دەستی هەڵێناو هاواری کرد : سوێند بخوا
ـ سوێند بە محەمەد !
پێش نوێژ هاتە خوارێ. قەشەکان دەورەیان داو لە ئامێزیان گرت، شانیان ماچ کرد، هەموو ئاخرین مالاّواییان لە گەڵ کرد و دەیانگوت : خوا حافیز ئەی شەهیدی مەزن .
پێش نوێژ چوە نوێژدان، عەرزی ماچ دەکرد و دەیگوت : خوا حافیز ئەی خودای من ! جارێکی لە حەسارو لە حوجرەکان و لە ژێر زەمین و لە ئەویلەکان کرد و پاشان دەستی هەڵێناو جارێکی دیکەش گوتی : خوا حافیز ..
لە گەڵکو لە دەروازە چوە دەرێ، تورک گرتیان و نیتر کەس نەیدیتەوە. پاشان تورک بە لوورە لوور رژانە نێو دێر.
پاڵە وان پولیکسینگیس هاواری کرد :
ـ وای ئەو سەگانە پەڵپێنی خۆیان شکاند و دێر دەسوتێنن. پاڵەوان سەری پێچابوو، برینەکانی ژانیان دەکرد. لە کاتێکا رکێفی لێدەداو بەرەو دێر دەیکوتا گوتی :« ئەدی پاڵەوان میکلس لە کوێ یە؟ »
بەلاّم پاڵەوان میکێلس نە گەڕابۆوە. تنودوریس لە گەڵ دەستەی خۆی بزووت. هەموو پێکەوە

تورکیان له پشتەوەرا پەلامار دا.
دێر دەسوتا. له پێش دۆڵێ پەپاخ سووری تازه گه یشتوو پەیدا بوون. کاتێکی هەرتک لا ده گەیشتنه یەک، پاڵەوان پولیکسینیس پرسی : « تئودوریسی برا ! ئەدی پاڵەوان میکلس له کوێیە ؟ » خوێن له سەرو ملی دەچۆڕاوه.
تئودوریس له وەلاّم دا گوتی: « ئەو بۆ ڕاوێکی دەشتێ رۆیشتوه... »
ـ ڕاوی چی ؟ نازانم ..!
مەسیحی له سەر بستوێ ڕێستا بوون تەماشای دێریان دەکرد. که له خوارەوه دەسوتێ. گڕی ئاگر دیوارەکانی دەلستەوه و دووکەڵ بەری ڕۆژی گرتبوو.
پاڵەوان پولیکسینگیس مات و پەشۆکاو وناهومێد دەبوو. دەردو ژانی له بیر برد بۆوه. خوێنی برینەکانی پاک نەدەکردەوه. چاوی پر له ئاو ببوون. هاورێکانی پێیان گوت :
ـ پاڵەوان با بڕۆین، تۆ برینداری. ئیتر تەماشای دێر مەکه. دێر له دەست چوو. خوا وای گەرەک بوو، ئێمه ئەرکی خۆمان بەجێ گەیاندوه.
پاڵەوان هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی:« ئەگەر پاڵەوان میکێلس – مان له گەڵ دەبوو ...»
ئاخرەکەی توانیان ڕازی بکەن. هەموو بۆ بناری چیا هەڵکشان و هاتنه نێو دۆڵ و ڕێگای کاستلییان گرته بەر.دەستەی پاڵەوان میکێلس یش ڕوویان ده پیترکفالو کردەوه. هەواڵی داخداری سوتانی دێر ، زووتر لەوان گەیشتبوو. خەڵک هاتبوونه سەر ڕێگا و دەگریان. قەرەوڵێکی له سەر بستوێ دایانتابوو تا ئاگای له بزووتنەوەی تورکان بێ، لای نیوه ڕۆ خۆی گەیاندوه دەستەی پاڵەوان پولیکسینگیس که دوای خواردن له بن دارچنار ڕاکشا بوون بحەسێنەوه. پاڵەوان له بن سێبەری دارێ درێژ ببوو، فوتیوسی حەکیم برینەکانی ده شوشتەوه وپەڕۆی برینەکانی دەگۆڕی. که چاوی به قەرەوڵ کەوت بانگی کرد و پرسی :
ـ ها...یاکوریس ! خەبەری تازه چییە ؟
یاکوریس هاته پێش . زەلامێک بوو ڕەقەڵەی ڕەشی کوورته بالاّ. لاق وەک لاقی کولله و ئیگای زیندوو. ئەوەندەی کوشت و کوشتار دیبوو، تاڵی و سوێری ڕۆژگاری چێشتبوو. ئیتر ترس و خەم و شادی له چاوەکانی دیاریان نەدەدا. یاکوریس دەیگوت : « دنیا وەک چەرخ و فەلەک وایه. دایم دەسوڕێتەوه، بۆ من هیچ سەرنج ڕاکێش نیه. »
لێیان دەپرسی: « باشه ، بڵێ بزانین کێ ئەو چەرخ و فەلەکه دەسوڕێنێ؟ »
له وەلاّم دا دەیگوت :
ـ هێندێ جار خوای میهرەبان و هێندێ جاریش شەیتان. ئەوەدوانه پێکەوه ڕێککەوتوون. یەک وێران دەکاو ئەویتر دروستی دەکا. تاوێکیش کاریان ناوەستێ.
یاکوریس هاته پێشتر و گوتی:«قەرارو مەدارێکی باشه پاڵەوان. تۆش ناهومێد مەبه. ئێستا ئێمه وەبن کەوتووین، بەلاّم دڵنیا به سەر دەکەوینەوه، چونکه چەرخ دەسووڕێ. »
ـ دێر چی به سەر هاتوه ؟
ـ دەتەوێ چی بەسەر بێ ؟ ئەویش گەیوەته جەندەم ...
فوتیوسی حەکیم خاچی له سنگی کێشاو گوتی :

ـ كافر زمانت گرنده. بیدبن کوفران مه‌که ..
ـ مه‌به‌ستم ئه‌وه‌یه وه‌ک رۆژی پێش دروستکردن بۆته‌وه ده‌شت.
ـ سه‌گه‌کان چی‌یان به سه‌ر هاتوه ؟
ـ ئه‌وان پێش نوێژیان وه‌پێش خۆدا و رۆیشتن. ده بینی له که‌وڵه‌که‌ی کیسه‌ی توتن دروست ده‌که‌ن. قه‌ڵه‌و وزه‌لامیش بوو، پێسته‌که‌ی کیسه توتنی زۆری تێ‌ده‌بێ .

له‌و کاته‌دا قه‌ره‌وڵ ئه‌م قسانه‌ی ده‌کرد، عه‌سکه‌ری تورک به‌ره‌و گاندی ده‌رۆیشتن و پێش نوێژیان وه به‌ر نوکه چه‌قۆیان دابوو ده یانبرد. له رێگادا ده‌وریان دابوو تا نه‌هێڵن خه‌ڵکی گوندی که به خوێنی سه‌ری تینو بوون، بیکوژن.

پاشا فه‌رمانیدا بوو که به زیندوویی بیهێنن. هێشتا هه‌ر ئێواره بوو که سواره‌ی تورک به ده‌هۆڵ و زورناو شه‌یپوره‌وه گه‌یشتنه‌وه نێو گاندی. پاشا له هه‌یوانێ وه‌ده‌رکه‌وت، هه‌ر ترنگه‌ی ده‌هات. سواره‌کانی به خێر هاتن کرد. پێش نوێژیان به راکێشان برده به‌ر ده‌می پاشا.. که دیتی پێش نوێژ قیت له به‌ر ده‌می راوه‌ستاوه‌و ته‌ماشای ده‌کا، به سه‌ریدا گوڕاندی و گوتی :« ئه‌ی ئیمامی له‌عنه‌تی کافران سه‌ر دانوێنه‌و ئیکلام بکێشه.»

برینی که‌ون وتوێی پێش نوێژ زازیان کرد بۆوه. دڵۆپه‌ی خوێنی ره‌ش‌به ریشی‌دا ده‌تکاوه. به‌ڵام نیگای هه‌روا روون وساف بوو. جاروبار ته‌ماشای پاشاو ئه‌م تورکانه‌ی ده‌کرد که ده‌وره‌یاندابوو، گاڵته‌یان پێده‌کرد. سه‌یری رۆژی ده‌کرد که له‌ئاوابوون دابوو. هه‌ستی به سوکی خوی ده‌کرد. ده‌تگوت ده‌یه‌وێ باڵ بگرێ. له سه‌ر نوکی په‌نجه‌کانی ده‌سوڕا و ده‌تگوت خه‌ریکی بزووتن و فڕینه.

پاشا نه‌ڕاندی و گوتی :
ـ کافر ئه‌وه ناترسیی ؟ روحه‌تت بۆوا ده‌دره‌وشێن ؟ پێت وایه ئێستا له گوێی ؟
قه‌شه له وه‌ڵام دا گوتی : « له به‌هه‌شتم ...»

پاشا توره بوو. ئه‌وه هه‌وه‌ڵ جار نه‌بوو به‌ره‌و رووی کریتی یان ده‌بوو. واته ئه‌م که‌سانه‌ی که گشتیان وه‌ک گاشه به‌رد قورس بوون و ته‌نانه‌ت تیغی تیژیش نه‌یده‌توانی زمانیان ببڕێ. قیژاندی و گوتی :
ـ قه‌شه‌ی شه‌یتان تۆ له به‌هه‌شت نی‌و له ژێر دار چناری !
پێش نوێژ گوتی فه‌رق ناکات .
پاشا که له به‌ر توره‌یییان که‌فی هه‌ڵده‌خراند، گوتی:
ـ ئه‌و کافره له دار چنار هه‌ڵاوه‌سن .

سوله‌یمانی زه‌نگی و چه‌ند سه‌رباز به راکێشان بردیان بۆ حه‌سارێ. تورکی دیکه‌ش به قیژه‌و هه‌را وه دوای که‌وتبوون. کۆڵانه‌کانی ده‌ورو به‌ر پڕ ببوون له خه‌ڵک. دارچناری گۆزین له نیزیک ماڵی پاشا و له کن ئه‌و کانیه بوو که ئینبزی یه‌کان یه‌کێکه‌ری شێریان له به‌ردی مه‌ڕ مه‌ڕ له سه‌ر دروست کردبوو.

رۆژ بۆ ئاوابوون هاتبوه سه‌ر سوێ. دار چنار له‌و باڵندانه پڕ ببوو که بۆ خه‌و هاتبوونه‌وه هێلانه‌کانیان و شادو سه‌ر خۆش جریوه جریویان بوو.

پێش نوێژیان لە سەر کورسیەک داناو سەرتاشێکی تورکیان بانگ کرد. سەرتاش بە مقەست و گوێزان و تەشتەوە کە چاوی بە قەشەی پێش‌نوێژ کەوت، دای لە قاقای پێکەنین و گوتی:

- تۆ کوڕێکی باشی. ئێستا بێ سابون ریشت دەتاشم. قژەکانی گرت و دەستی کرد بە ریش تاشینی. پێش نوێژ لێوەکانی دەگرزت تا لەبەر ئێش هاوار نەکات. ئەو تورکانەی لێی وە کۆ ببوون، قاقا پێدەکەنین.

سولەیمان تەنافی داری هێنابوەخوارو سابونی لێ دەدا. چەند کەسی مەسیحی لە پشتی پەنجەرەکانەوە سەیریان دەکرد و پشوویان دەر نەدەهات. لەو کاتەدا پاشا هات و لە بەرامبەر پێش نوێژ لە سەر کورسیەک دانیشت، تا سەیری ئەم بەزمە بکات. سەرتاش لە ریش داماڵینی بۆوە، برینەکانی ئەو پیرە شەرانیە وەدیار کەوتن.

پاشا نەڕاندی و گوتی :

- ها..! ئیمامی کافران ! ئێستا تەناف و دار ئامادەیە . خولامی رەشیش چاوەڕێی فەرمانە. وەرە موسولمان بەو گیانی خۆت نەجات بدە.

پێش نوێژ لە سەر کورسیەکە هاتە خوار. بە سەرو ریشی‌تاشراو نەدەناسراوە. تەنافەکەی لە دەستی خولامی رەش وەرگرت‌ولە ملی خۆیدا گرێی دا. پاشا جارێکی دیکەش نەڕاندی و گوتی :« کافر وەلام نادە یەوە ؟ »

پێش نوێژ گرێی پەتی ملی نیشاندا و گوتی : « ئەوە یە وەلامی من ... »

پاشا لە قینان شین هەلگەڕابوو. هاواری کرد:« لەعنەت لە هەمور کریتیان لە داری دەن »

قەشە چوە سەر کورسی. خولامی قولە رەش تەنافەکەی بە لقە دارێکەوە کرد. پێش‌نوێژ تەماشای دەوروبەری خۆی کرد و خاچی لە سینگی کێشا، باو وباپیرەکانی، ئەو پیرە شەرکەرانەی کە مرد بوون و گشتیان وەک مەسیح تاجی دڕک و داڵیان لە سەر بوو، لە ئاسمان دەهاتنە خوارێ تا بەخێر هاتنی بکەن!

پێش نوێژ هاوارێکی شادی کرد و گوتی :

- هاتم ! پاشان شەقێکی لە کو رسیەکە داو دووری خستەوە ...

* * *

کاتێ پالەوان میکێلس لای نیوەڕۆ گەیشتەوە دێر، تا شان بە شانی هاورێکانی شەر دریژە پێبدا، ئە دێر مابوو نەهاورێ. دێری عبسای مەسیح ببوە تەپۆلکی‌خۆلەمێش. گومبەزی کلیسا تێک تەپی بوو. قاپی گەورەی رەسمی پیرۆزەکان کە بە وەستایی ساز کرابوو، کتێب و دوعاو هەموو شت سوتا بوون. شەراب و رۆن زەیتوون لە عەرزی رژابوو، دووکەڵێکی توند بۆ ئاسمان هەلدەکشاو چوێکە بای نەدەهات لە دۆڵەکەدا گژ دەبۆوە.

پالەوان میکێلس بە توڕەیی، چنگی دەریشی وە ردا و تەماشای دەکرد و نەیدەتوانی روو لە گری سوتانی دێر وەرگێرێ. مووی ریشی دەرنیەوە و بە بۆلە بۆلێ دەیگوت:

- ئە دەبوایە برۆم و ئێرە بە جێ بێلم. ئەشەوی رابردووی وەبیر هاتەوە کە تورکی ڕاو دەنان وهاورێکانی بەدوایدا پشویان لێ برابوو. پاشان بەستێنی وشکی چۆمێکی وەبیر هاتەوە کە

زەردەی بەیانی گەیشتبوونە ئەوێ. لە سەر بەردە سپیەکانی ئەو بەستێنە تورشی سوارەی تورکان ببوون کە ژنێکیان سوار کردوەو دە بیەن.

پاڵەوان میکێلس و هاڤاڵەکانی کەنگێ گەیشتبوونە سەر تورکان وکەنگێ بە گژ یەکداچووبوون، تا کەی شەریان کرد بوو، سەعاتێک ..دوو سەعات ... بەلاّم ئەمانە گشتیان بۆ پاڵەوان چرکەیەک درێژەی کێشا بوو. دشت و چیا لەدەوری سەری دەسووراو زەوی پچوک دەبۆوە و دەبوە مەیدانی شەڕ. لە نێوە ڕاستی ئەو مەیدانە دارێکی زەلام و لە بن دارەکە ژنێک بە سواری بە جلی ئەستور خۆی داپێچا بوو. سەیری دەکرد بزانێ کێ لەم شەڕەدا سەر دەکەوێ لە گەڵ ئەو بروات.

ژن بێ ئەوەی تەماشای پیاوان بکا، چاوی لە ئاسۆ بریبوو چاوەڕوانی دەکێشا.!

لە پرتورک هاواریان لێ هەستا، مەیدانیان بە جێ هێشت و بۆی دەرچوون. دەمانچەو خەنجەریان فڕێدان وبە بریندارى بەرەو گاندی هەلاّتن.

پاڵەوان ئاوڕی داوە تا سەیری ئەو ژنە بکاکە سرتێنەرو بۆنخۆش لە پێشی ڕاوەستاوە. بانگی یاد کێشی کردو گوتی :

ـ گورج ئەو ژنە بەرە ماڵی پورم لە گوندی ‹گوراکیس› و بڵێ تا خەبەری دەدەمێ خواردن و خواردنەوەی بداتێ. چاوە شەیتانیەکانی باکێش زەق بوون و گوتی:

ـ یانی نەیبەمەوە بۆ کاستلی؟ پاڵەوان پولیکسینگیس قەتیر لە داخ و تورەییان دیق دەکات.

ـ بە جەهەندەم ...با دیق بکات ! لغاوی ماینەکەی بەدەستەوە بوو، نەیدەزانی بچێتە کوێ. نەیدەویست و نەیدەتوانی مەقسەدێک دیاری بکات. بەلام لە پڕ دانی لێکدان، بڕیاری دابوو. ڕکێفی لە ماینی داو بەرەو دێری عیسای مەسیحکەوتە ڕێ. ئێستا بە سەر سوڕمانەوە لە بەرامبەر دێردا ڕاوەستا بوو تەماشای دەکرد. ریشی خۆی هەڵدەکەندەوەو بە بۆڵە بۆڵ دەیگوت: « من نەدەبوایە بڕۆم ... نە دەبوایە ئێرە بە جێ بێڵم .!»

لە ماینەکەی دابەزی و مستە خۆڵەمێشێکی گەرمی هەڵگرت و دەیویست بە سەروچاوی خۆی دابکات. بەلاّم هاتەوە سەر خۆ، خۆڵە مێشەکەی بە باداداو لە بەر خۆیەوە گوتی :«هیوادارم تاوانباری ئەسڵی بسوتێ و خۆڵەمێشەکە بەبادا بڕوا.» پاشان سوار بۆوە و ڕکێفی لێداو بەرەو دۆڵ کردیە غار و لە نێو دوکەڵدا بزر بوو.

* * *

هەر چوار گۆشەی کریت ئاگری گرتبوو. تەقەی تفەنگ و نەڕەی وەحشیانە لە چیار کەژ و دۆڵ دەنگیان دەدایەوە. پیاوەکان ببوونە دڕندە ، دەیان نەڕاند و دەیانگەست و دەیانکوشت.

شەڕکەرانی پیرێش کە ئێرەییان بە گەنجەکان دەبرد و گەنجیەتی خۆیان وەبیر دەهاتەوە، چووبوونە چیا. هێندێ لە وان چەکیشیان دەست دابەو بەشداری شەڕیان کرد. ئەوانەی لە هەموان پیرتر بوون و لە بەر بڕینی کۆن و ساڵی بەسەر چوو شەڕیان پێ نەدەکرا، لە ئۆردووی پاڵەوانگەلی تازە کار مابوونەوە ، فەرمانیان دەداو پێشیان دەخواردەوە. هەر لەو کاتەشدا، باسی نەخشەی شەڕی پێشەوایاتی قەدیمیان دەکرد، وەک ‹ کاراکاس و ماسترا پاس و یاناریس› کە چۆن

کەمینیان گرتوە و تورکیان فریو داوەو گەمارۆیان داون. چۆن بە شەو دیهاتی دوژمنیان پەلامار داوە .

پاڵەوان ئەلیاسیش بە سواری ئێستر لەم کەژە بۆ ئەو چیایە دەچوو ، لە ئۆردووی پاڵەوانان دادەنیشت و بە هەناسە هەڵکێشان دەیگوت :

رۆڵەکانی من ،مرۆڤ قەت پیر نابێ من چونکە ناتوانم بە باسکان شەر بکەم، بە مێشک شەردەکەم. ئەوەندە بە شەڕ دێم، تا دەبمە خاک و خۆڵ. ئەو رۆژە پاڵەوان ئەلیاس لە گوندی < وریس> گوندی خۆش و پڕ لە کانی و ئاو بارگەو بنەی لە بن دار چنارێکی کۆن بە عەرزی دادا بوو. ژن و زارۆک و پیرە پیاوی گوندی لە دەوری کۆ ببوونەوەو گوێیان بۆ قسەکانی هەڵخستبوو. پاڵەوان ئەلیاس باسکە رەق و تەقەکانی بۆ لای گەلا سەوزەکانی ئەو دارە درێژ کرد بوو، دەیگوت - چەند پاڵەوانی گەورە لە بن ئەو دارە دانیشتوون‌و لە بن سێبەری حەساونەوە. کاتێ مرۆڤ تە ماشای ئەدو بالأی دە کردن،

دەیگوت :« ئەوانە ئەبەدین.» بەو حاڵەش هەموو مردن و لە بەین چوون و بوون بە خاک. خاکی ئەو کریتە کە وا ئێمە پێی لێ دەنێین.ا هەناسەی هەڵدەکێشاو ئەو رۆژە دڵی پڕ بوو. هەواڵی سوتانی دێری عیسای مەسیح کە وەک قەلە رەشە لەم گوند بۆ ئەم گوند دەچوو دوای ئیوەرۆ گەیشتبوە گوندی <وریس>. پیرە پیاو لە دەوروبەری پاڵەوان ئەلیاس سەریان رادەوەشاند و پرتەو بۆڵەیان بوو. ژنیش دەگریان.

پاڵەوان ئەلیاس وای ئیشاندا کە هیچ نابینێ و هیچ نابیسێ. هەوڵی دەدا بە گێڕانەوەی باسی کارەساتی کۆن و مەزتر. خەڵک لە بیرکردنەوەی کارەساتی تازە سارد کاتەوە.باسی کارەساتی دێر ئارکادی دەگێڕایەوە.

دێر ئارکادی جارێکی تر لە پێش چاویان راست دەبۆوە، وەک پێشوو پڕ دەبوو لە باروت و قەشە. گابریلی پێش‌نوێژی دێر جارێکی دیکەش جامی پیرۆزی پڕ لە گۆشت و خوێنی عیسای مەسیحی لە سەر سەری ئەوان رادەگرت و دەیگوت :

ـ برایان خوشکان ! دەرگای ئاسمانەکان لە بان سەری ئێمە کراوەتەوە. خۆشبە حاڵی ئەوانە کە لە رێگای باوەڕ و نیشتماندا دەمرن. هەر لەو کاتەشدا کونستانتین پامبوداکیس چرای نیو سوزی لە سەر عەمباری باروت رادەوەشاند.

راست لەو کاتەداکە کریتەفریو خواردوەکانی‌چیرۆکی‌دێرکاردی لەگەڵ گڕی تەقینەوەی باروت بۆ ئاسمان‌هەڵدەبەزینەوە ، دەنگی سەر رەوی ئەسپێک بیسترا، هەموو ئاوڕیان دایەوە. لە پشت لقی دارزەیتونەکان سوارێکیان بینی کە مێزەری رەشی لە سەرە. هێندێ جار ون دەبوو، پاشان دەر دەکەوتەوە. ئێکرا هاواریان کرد:

ـ پاڵەوان میکێلس ! پاڵەوان ئەلیاس سەری بەرداوە و بە نوکی وەکازەکەی هەردی دەکۆڵیەوە. ژنێک کە شیری دەدا بە منداڵەکەی هاواری کرد:

ـ ئەو بە تەنیا دێتەوە . دوگمەی سرخمەکەی داخست و بە ناڕەحەتی گوتی «ئەدی پیاوەکانی ئێمە لە کوێن ؟ ئەو بەرازە بەرپرسی گیانی هەموریانە.»

ژنێکی دیکە هەستا بوو کە بڕوا، گوتی :« وادیارە لە کاتی مەترسیدا دێری بە جێ هێشتوە.

دەبێ بە زیندوویی بیسووتێنن.»

ئەوژنە نەیدەویست پاڵەوان میکێلس ببینێ. پیاوێکی پیر گوتی :

ـ پاڵەوان ئەلیاس چاوی لێ مەپۆشە. پیاو لە کاتی شەڕدا نابێ مەتەرێز چۆڵ بکات. تۆ کە پیرترین و بە ڕێزترین ڕێبەری قەومی، هەقی‌خۆی دە مستی بنێ و ئەوەی پێویستە پێی بێژە. ئێمە ژێر دەستین، ناتوانین ڕک و ڕاست قسەکانمان بکەین.

پاڵەوان ئەلیاس بە توندی وەکازەکەی بەرزۆ کرد و بە تووڕەیی گوتی :

ـ بە سە ... نامەوێ تۆ دەستوورم پێ بدەی. ژن و پیاو ئاڵقەی دەوری پاڵەوان ئەلیاسیان فرەوانتر کرد و گوتیان :

ـ ئەوەتا هات ! پاڵەوان میکێلس گەیشتێ. لە سەروچاوی چرژاوی ئارەقە دەتکا. برۆی بە سەر چاوی دا شۆڕ ببوونەوە. لە ئەسپ و لە سوار هەڵم هەڵدەستا . کاتێک پاڵەوان ئەلیاسی لە بن داری دیت و ناسی، نێو چاوانی تێک نا. ئەو قەت حەزی نەدەکرد لەگەڵ پاڵەوان ئەلیاس بەرەو ڕوو بێ. بەلاّم ئێستا تووش ببوو. ڕێگای گەڕانەوەی نەبوو. هەر چۆنێک بوو دابەزی و دەستی بۆ درێژ کرد و گوتی : سلاّو پاڵەوان ئەلیاس !

پاڵەوانی پیر وای نیشاندا کە ئەودەستەی بۆ لای ئەو درێژ کراوە، نایبینێ. سەری بەرداوەو بە ڕوو گرژی گوتی:

ـ ئەگەر پێت وایە سلاّو جێی ماوە، منیش سلاّو !

پاڵەوان میکێلس فرە ناڕەحەت بوو، جڵەوی ماینەکەی بە دەستەوە بوو، تەمابوو سوار بێ و بڕوا. ئەو ئەوسو پلارەی پێ خۆش نەبوو. سەیرێکی خەڵکی دەوروبەری خۆی کرد و بیری کردەوە :«دەبێ ئەو هەواڵە گەیشتبێتە ئێرەش.؟» سەرو چاوی وەحشیانەی پتر تێکچوو. دەستی بەرز کردەوەو چەند گەڵاداری لێکردنەوە، ڕێکی کوشین و بە عەرزی دادان و گوتی :

ـ شەڕ هەر وایە. پاڵەوان ئەلیاس تۆ لە هەموو کەس باشتر دەزانی. لە سەر دەمی تۆشدا، فەلە زۆر جار لە ئاگردا سووتاون.

هەر ئەو کارەساتەی ئارکادی وەبیر بێنەوە.

پاڵەوان ئەلیاس وەک تۆق تۆقە هەڵبەزیەوە. بروسک لە چاوانی دەرپەڕی و گوتی :

ـ ئەم ناوەی مەهێنە . لە ئارکادی فەلەکان نەسووتان، بەڵکوو بوون بە خودا. بەلاّم لە دێری عیسای مەسیح ئەگەر بە خۆتی نەگری ... قسەکەی تەواو نەکرد، ڕووی کردە خەڵک و گوتی : « ئێمە بە جێ بێڵن و بچنەوە ماڵی خۆتان.»

هەموویان بە بۆڵە بۆڵ ڕابوون. پیرە پیاو کاتێ بە بەر دەمیدا تێ دەپەڕین، لێی مۆن دەبوونەوە. ژنەکان لە بنەوە جنێویان پێدەدا. ڕوویان وەردەگێڕا تا نەیبینن. بەلاّم دایکێکی گەنج کە شیری دەدا بە منداڵەکەی، نە دە ڕۆی، ڕاوەستا و چاوی دەچاوی پاڵەوان میکێلس بڕی و هاواری کرد :«ئەدی پیاوەکانی ئێمە چییان بە سەر هات خودا عەزابت زیاد کات.»

پاڵەوان ئەلیاس گوتی:« بڕۆ بە دوای کارت دا، کەم چەنە لێ بدە .»!

کاتێ هەرتکیان تەنیا مانەوە، پاڵەوان ئەلیاس پاڵی دا بە وەکازەکەی و هەوڵیدا هەستێ و گوتی :«پاڵەوان میکێلس ! تۆ ئێستا لە ڕێوە هاتی و دەستت بۆ لای من درێژ کرد. بەلاّم من

دەستم نەدایەی. چونکە تۆ ناوی خۆت، واتە ناوی پاڵەوانیت عەیبدار کردوە.

پاڵەوان میکلس لە وەڵام دا گوتی:« دامنا لە من گەورە تر بی. دامنا یەکێک لە قارەمانانی شۆرشی ۱۸۲۱بی. بەلام لە وەڵامی تۆدا یەک قسە دەکەم و هیوادارم لە بیرت نە چێ. ئەویش ئەوەیە کە من پێم خۆش نیە ئاوا بدوێنی.»

– منیش تەنیا یەک قسەت پێ دەڵێم، ئەویش ئەوەیە کە تۆ ناوی خۆت، واتە ناوی پاڵەوانەتیت عەیبدار کردوە.

پاڵەوان میکێلس لە حەیفان دەهات بتەقێ. بەلام تەرەفەکەی ریش سپیەکی‌بەرێز و یەک لە پاشماوەکانی شۆرشی ۱۸۲۱بوو.

لە کارەساتی دێری ئاکاردی گیانی دەرباز کرد بوو. پاڵەوان میکێلس نەیدەتوانی دەستی لێ هەڵێنێ. لە بن دار چنارەکە دەستی کرد بە هاتو چۆ. سمیلەکانی دەجاوی. پاڵەوان ئەلیاس گوتی:

– تۆ ئەو شەوە بۆ چی دێرت بە جێ هێشت و رۆیشتی.؟ ها... وەڵام نادەیەوە .؟چوویە کوێ؟ چما نەت دەزانی کە تورک لێت دەترسێن و بۆ پەلاماردانی دێر لە نەبوونی‌تۆ کەڵک وەر دەگرن؟ بێگرمان یەکێک چوە بەو سەگانەی گوتوە. من نازانم کێ ئەو کارەی کردوە. تەنیا ئەوەندەی دەزانم کە دێر لە دەست چوە. تاوانی ئەو کارەساتەش لە ئەستۆی تۆیە.

پاڵەوان میکێلس هەستی کرد کە وا کەللەی دەتەقێ. سەری بەرداوە و بە یەواشی گوتی :

– نە خێر تاوانی من نیە.

– پاڵە وان ئەلیاس کە هەروا پاڵی وە دار چنار دابوو گوتی :« کە وابوو خەتای کێ‌یە ؟ ...

– پاڵەوان میکێلس بێدەنگ بوو. پیرە مێرد دیسان گوتی :

– ئەو شەوە تۆ بۆ کوێ چووبووی ؟ ئەگەر خەتای تۆ نیە ، ئەدی خەتای کێ‌یە؟

– پاڵەوان میکێلس لە بەر تورەییان دە کوڵی. ئاخرەکەی وەدەنگ هات و گوتی :

– پاڵەوان ئەلیاس هیچ لە من مەپرسە. ئەو کارە پێوەندی بە خۆمەوە هەیە و نە بە کەسی دیکەوە.

. وا نیە . ئەوە پێوەندی بە باپیرەکانی من و باپیرەکانی تۆ و بە هەموو ئەو کەسانەوە هەیە کە بوون‌بە خاک و ئێستا ئێمە پێشێلیان دەکەین. چما تۆ کریتی نی؟ چما لەشی تۆ لە خاکی کریت نیە ؟ ئەدی چۆن ئێژی ئەو کارە پێوەندی بە کەسەوە نیە ؟ شەرم ناکەی ؟

پاڵەوان میکێلس تینۆکەکانی لە دار چنار بردە خوار. ئەوە یێکەم جار بوو کە ئاوا بە سوکی دەیاندواند. قین گەرووی گرتبوو. نەیدە توانی وەڵام بداتەوە. رەنگە پیرە مێرد هەقی بوو بێ، بەلام پاڵەوان میکێلس نەیدەویست دابنوێنێ. جارێکی دیکە بە قینە بەری گوتی :

. گوتم لە خۆم زیاتر پێوەندی بە کەسی دیکەوە نیە . خودا حافیز پاڵەوان ئەلیاس. دەمەێ بە تەنیا بم تا لە بارەی خۆمەوە بیر بکەمەوە و بتوانم بریار بدەم.

. تەنیا دوای قەزاوەتەکە دەردەکەوێ، داخوا گیانێکت لە بەردا ماوە یان نا ؟ ئەگەریش ماوە چ گیانێکە . برۆ پاڵەوان میکێلس. رەحمەت و یا لەعنەتی عیسای مەسیح و خودای ئێمەت لە گەڵ بێ. من تەنیا شتێکت پێ دەڵێم وتۆش هەوڵ بدە لە بیری نەبەیەوە: « کریت هێشتا پێویستی بە بوونی تۆ هەیە ! بێگرمان دەزانی دەڵێم چی.»

پاڵەوان ئەلیاس لە پرترسی لێ نیشتبوو، نەکا پاڵەوان میکێلس بچێ خۆی بکوژێ و کریت لەم کزلەکە قایمە بێ بەش بکات.

پاڵەوان میکێلس لە وەلاّم دا گوتی : تێدەگەم . بێ ئەوەی پێ دەرکێفێ بنێ، خۆی هاویشتە سەر پشتی ماینێ.!

پاڵەوان میکێلس بە پێچەوانەی خەیاڵی پێشووی، لە جیاتی ئەوەی بۆ لای راست، واتە بۆ پێتروکفالو بڕوا، بۆ لای چەپ واتە بەرەو چیای سلنا کەوتە رێ. رۆژ ئاوا بوو. شەویش لە گەڵ دەست و پێوەندەکانیخۆی ، وەک‌سپسرەو مشک و مار وشەیتانۆکە و داعبای شەوگەڕ، بە سەر دنیادا زاڵبوو. لە چیا شنە بایەکی فێنک دەهات. پاڵەوان سینگی خۆی رووت کرد تا لەو هەوا فێنکە کەلک وەر گرێ. لە پڕ راوەستا. لە بەر خۆیەوە گوتی: « ئەوە خەتای ویە..ئەوە خەتای ئەو ژنە سەڵیتەیە.» مێزەری لە سەری کردەوە. دم و چاوی پێ سڕیەوەو هەناسەیەکی هەڵکێشا. زەینی تۆزێ روون بۆوە. ئێستا دەیزانی دەچێتە کوێ‌و دەبێ چبکا. دەیزانی لە جیاتی بۆ گوندی پیترۆکفالو بچێ، بۆچی رێگای چیای سلنای داگرتوە ؟ پاڵەوان ئەلیاسی پڕ هەقی بوو. دەبویست بگەڕێتەوە لە بن هەمان دارچنار دەستی پیرە مێرد بگرێ و ماچی بکا. بەڵێ ! پیاو ئەگەر گەرەکی بێ لە گەڵ مرۆ قسە بکا، ئەشێ ئاوا توندو رەق بدوێ.

پیاوێکی پیر بە کزلە پشتێکەوەو گزچانێکی نوک تیژ بەویندا رادەبرد، تووشی پاڵەوان میکێلس بوو، بەلاّم نەیناسی. شەو تاریک بوو. دیسان لێی پرسی : « هاوڕێ! ئەرێ راستە دەڵێن دێر سوتاوە ؟ »

پاڵەوان میکێلس گوتی : بەڵێ سوتاوە . رکێفی لە ماینێ داو تێپەری .

پیرە مێرد گزچانەکەی هەڵێناو گوتی : « لەعنەت لە خەتا باری ئەم کارە ساتە بێ »

پاڵەوان میکلس لە تاریکایی شەودا وەلاّمی دایەوەو گوتی :« لەعنەت لە خەتا کار بێ . »

کەوانەی مانگ لە بەر چاوان ونبوو. ئەستێرەی قوتبی، ئەو شوانەی ئاسمانان، مێگەلە خوشکەکانی بۆ پێشەوە لێ خوڕی .

بەلاّم پاڵەوان میکێلس تەماشای ئاسمانی نەدەکرد. سەیری چەند چرای‌کەم نووری دەکرد‌کەلە بناری چیا دابسان. ئەوێ گوندی کوراکیس بوو.ماڵی پووری هەر لە سەر رێگای گوندی بوو. دەبوایە بەم شەوە پیرێژن لە خەو دابێ. ئەو هەمیشە بەیانیان بە دەنگی کەڵە شێر لە خەو رادەبوو. ئێوارانیش لە گەڵ ماماران دەنوست. ئەو بە گەنجی شووی کرد بوو، منداڵ و ئەوەو ئەتیژەی نەبوون. ئێستا پیرێژنێکی وشک هەڵگەڕاو، کوڕ ببۆوە، بەلام چاوەکانی زیت بوون. دەتگوت ئیزراییل لە بیری بردۆتەوە. پاڵەوان لە ئەسب دابەزی. لە پەنا جادە لە سەر بەردێک دانیشت . سەری خستە نێو هەردتک دەستان و توند رێکی گوشی . قسەکانی پاڵەوان ئەلیاس وەک خەنجەر کاریان لێکرد بوو:«تۆ ئەمڕۆ پاڵەوان میکێلس ناوی خۆت عەیبدار کردوە .» ئەو قسانەی لە دڵیدا دوو پاتە دەکردەوە تا خۆی بۆ بەجێ گەیاندنی بریارێک ئامادە بکا کە لە مێشکیدا دێت و دەچێ. دەنگی لە تاریکیدا دەدرەوشان. لە نێو گوندی‌سەگێک دەیلوراند. دەتگوت هەستی کردوە کە مەرگ لەم دەوروبەرە دەسوڕێتەوە. پاڵەوان میکێلس بیری کردەوە: «حەساری پوورم سەگی لێ نیە .. کەس دەنگی لاقم نابیسێ ... کەس ...»

هەستا، سەیرێکی لای گوندی کرد. خەڵک و خانوو گشتیان خەویان لێ کەوتبوو. سوار بوو، خاچی کێشا و لە بەر خۆیەوە گوتی : لە پەنای خوادا...کوێرە ڕێگای سەر هەورازی گرتە پێش کە دەچوە نێو گوندی کوراکیس شەوێکی زۆر تاریکبوو. ئەسپەکەی لە ئاڵقەی کۆنە دەرگی خانوەکە بەستەوە و چوە حەساوێ. ئەو ماڵەکەی باش دەناسی. لای ڕاستە جێگای ترێ گوشین و کوپە شەراوان بوو. تەویلەی وڵاخان و کەری مێردە مردوەکەی پووری لە لای چەپەبوو. بەڵام ئێستا کەر و وڵاخ نەمابوون. ڕەزەکەش دابەشکرابوو. بەو شەوە لە کەلاوە بەدەر هیچی دیکەی نەدەهاتە بەر چاو. سەبروکە چوە پێش و دەستی بە دەرگاوە ناو کردیەوە. هەناسەی ڕاگرت وگوێی هەڵخست.لە نێو تەختێکی پچوک کە لە ژوورێنێک دانرابوو، دەنگی هەناسەیەک دەهات.لە نەکاو دەنگی جیرە جیرێک هات، کەسێک لە خەودا وەردەسوڕا. دڵی داچڵەکی ! ئەوە کێ بوو.؟

لە سەر پەنجان لە تەختەکە نێزیک بۆوە دەستی بە پشتێندی گرتبوو. دەسکی خەنجەرەکەی دەگوشی. خەوتوەکە بۆنی عەتری لێ نەدەهات. فیکری کردەوە ، دەبێ پیرێژن بێ. دڵیهاتەوە سەر خۆ. داهاتەوە چەند داوی مووی سپی کەوتبوونە سەر سەرینێ. ڕوخسارێکی چرچ و چروک دە بینرا. پاڵەوان پاشەو پاش کشایەوە. لە بەر خۆیەوە گوتی :

. ئەشێ ئەو لە ژوورێکی دیکە بێ. لەو ژوورەی کە بە تابلۆیان ڕازاوەتەوە. دیسان وە دڵە کوتە کەوت. دەرگای پچوکی ئەو ژوورەی پاڵ پێوە نا. ژوورەکە بە چۆڵە چرایەکی زۆر کزەڵۆک، کە لە پێش وێنەی مریەمی پاکیزە دایسا، نەختێک ڕوناک بوو. لە دوو لای ژوورەکە دوو پەیکەری دیکەش دەبینران. یەکیان هی میکائیلمەلائیکە بوو، ئەوی دیکەیان هی سنت کاترینای شەهید بوو. پاڵەوان پاڵی وە چوار چێوەی دەرگای دا. لە بەرامبەر خۆی لە سەر کۆنە تەختی پووری پەیکەرێکی چاو پێکەوت . قژی وەک ئاوریشمی ژنێکی دیت کە بەسەر باڵیف دا بڵاو بۆتەوە. سەرتاپێ بۆنی عەتریان لێ دێ.

چاوی ڕەشکەو پێشکەیان دەکرد. وە هەناسە برکە کەوت. دڵە کوتە گرتی . هەڵیکێشا خەنجەر و ئیتر هەناسەی هەڵنەدەکێشا. سەبروکە لە سەر پەنجان چوە پێش و بە دەستی چەپەی لێفەی لە سەر لادا، سینگی ساف و سپی ژنەکە دەر کەوت. لە پڕ چاوی بروسکەیاندا، بەڵام فیکری هەروا پەرێشان بوو. جوانی نوستوو هەناسەیەکی هەڵکێشاو بزووت. وێدە چوو خەونی خۆش ببینێ. چونکە بزەی دەهاتێ و لێوەکانی وشەی نهێنی یان لێ هەڵدەوەری . پاڵەوان داهاتەوە، تیغی خەنجەرەکە لە بەر شۆقی کزی چرا بروسکی دا. پاشان هەوای تەلاشت و بە سەر سینگی سپیدا هاتە خوارێ ، و تا بن دەسکان چوە ژووری.

ئامینە هاواری کردو گورج چاوی هەڵێنا و لێکی نانەوە. ئەو پاڵەوان میکلسی بەو چرتەیە ناسیبوو. سەر سوڕمان و شادی و دەرد و ڕەنجیلەو ئاخرین نیگایەدا درەوشا بوو. پیارەکە ئۆخەیەکی هاتێ و سەرتا پێی لە بەر خەفەت لەرزی. خەنجەرەکەی هێناوە دەر و لە پڕ بە ئاوات بوو کە زەبرەکەی کاریگەر نەبوو بێ. بەڵام ئیتر زۆر درەنگ بوو چاوەکانی ئامینەلە نیگا خاڵی ببوون.

## ١١

بابە گەورە لە بن پیرە دارلیمۆیەکی حەساری خۆی دانیشتبوو. تەتەڵەیەک لە سەر ئەژنۆی و میدادێک بە دەستەوە. بە حاڵێکی خەمبارو پەرێشان لە کەلێنی دەرگاوە تەماشای چیاکانی دەکرد. ئەم رۆ نووری هەتاو ئارامە . هەوا شەدار وپڕ لە دڵۆپەی شەونمە. هەور بەری ئاسمانی گرتوەو دەیەوی ببارێنێ. هەوا ساردە. پیرە مێرد هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی :

. ئەوەتا زستان داهات.! ئەو لە فیکری ئەو ژن و منداڵانەدا بوو کە تورک دەر بەدەر و ئاوارەیان کرد بوون. ئێستاش بێ نان وجل و بەرگ و بێ سەر پەرشت لە غار و ئەشکەوتاندا کەوتبوونەوە. لە فیکری کریت دابوو کە جارێکی تریش ڕاپەریوە و دەیەوێ زنجیری کۆیلەتی لە ملی خۆی دابڕێ. نەیدەزانی دەستی یارمەتی بۆ کام لادرێژ بکات،

پیرە مێرد چاوی لە سەر یەک دادەنان و لە بەر خۆیەوە دە یگوت:

. فەرەنگیەکان. ئەو فەرەنگیە سەگرمەلعونانە دڵیان نیە. یونانی فەقیریش بێ هێزە . کریتیەکانیش هەم کەمن و هەم تفەنگ و نانی تەواریشیان نیە. بەم حاڵە چۆن دەتوانن بەربەرەکان بکەن.؟ ئەم خودایەش بە داهێنانی زستانی سارد، لە گەڵ تورکان بۆتە هاودەست و دەیەوێ شەری ئێمە بکات. کریتی بێچارە... دەردو ژانی تۆ کەی کۆتایی پێ دێت ؟

دەتگوت کریت بە چیاو دەشت و باخی زەیتون و رەز و ئاوایی و منداڵەکانی و بە خوێنیەوە، لە ئێوچاوانیدا نەخشیان دەبەست. ئەم بابە گەورەیە چەندە شۆرشی دیتبوون و چەند ماڵیان لە بەر چاوی سوتاند بوون و چەندیان دەست درێژی بۆ ژنان کرد بوو، چەندیان تاڵان کرد بوون وبیاویان کوشتبوون وئەشکنجەو ئازاریان دابوون، بەڵام لە سەر ئەوەشەوە خودای گەورە قەت ئاوڕێکی وەسەر گریت نەدابوو.

هەر ئەو پاڵەوان سیفاکاسە خۆی دیتبووی کە کریت حەوت جار شۆرشی کردوە ولە خوێندا شەلاڵ بوە و بۆتەوە ژێر دەست .

پیرە مێرد مستی لە تەتەڵەکە دار هاواری کرد :

لەم جیهانەدا ئەداد هەبەو ئەبەزەیی و ئەدلسۆزی . ئەوە چۆنە خودایە؟ بەراستی داخوا خودا هەیە؟ دەنگی ئێمە نابیسێ؟ غەڵەت نەکەم، نازانێ یا بەزەیی لە دڵدانیە ؟.

لەو کاتەدا تراساکی نەوەی هاتە دەرو رووەتی پیرە مێرد بە دیتنی ئەو گەشانەوە. دەتگوت خودا وەلامی داوەتەوە: «مەبکەهەرا پیرە مێرد! کارەکان جێبەجێ دەبن ! ئەوەش نەوەکەت ! »

سەروچاوی تراساکی بە هەتاو سوتا بوو. ژیانی کوێستانێ وای لێکردبوو کە بە خۆدابێ و کەڵگەت و بە هێز بێ. ئێستا ئیتر وەبابی دەچوو. چاوەکانی. برۆی، دم و لێوی وە بابە گەورەی دەچوو. تەتەڵەکەی لە دەستی هێنا دەر و ئێوچاوانی ئێک ناو بە توڕەیی گوتی : «تۆ هێشتا

مەشقەکەت نەنوسیوەتەوە ؟»

مانگێک بوو تراساکی خەریکبوو بابەگەورەی فێری نووسینی ئەلف و بێ بکا. پیرە مێرد سەرە ڕای پیری هاتبوە سەر ئەوە کە دەرس بخوێنێ و لانی کەم ئەوەندە بخوێنێ کە بتوانێ ناوی خۆی بنووسێ. ئەو نەخشەیەکی دیکەی لە سەری دا هەبوو. بەڵام هێشتا بە ئەوەکەی نە گوتبوو. بۆ بە جێ گەیاندنی ئەم نەخشەیە دەبوایە ئەلفوبێ فێر بێ. پیرە مێرد بە زەحمەت دە یتوانی ناو وشکڵی پیتەکان لە مێشکیدا ڕابگرێ. ئەو دەستەبە هێزانەی کە بە تفەنگ ڕاهاتبوون، نە یاندەتوانی باش قەڵەم ڕابگرن و بۆ نوسینی پیتەکان بە سەر تەتەڵەدا بێن. هەموو جارێ یا قەڵەم دەشکا ویاتەتەڵە دەدڕشا. تراساکی لە حەیفان ددانی دەچیڕەوە دەبرد. باپیری سەری بەردەداوە دەیگوت : «ڕۆڵە کارم هەبوو لێم توڕە مەبە»

. کاری چت هەبوو؟ دوێنێ خۆم دیتم تەواوی ڕۆژ لە بەر دەرگی حەسارێ دانیشتبووی هەر کەس بەوێدا هاتبا گاڵتەت لە گەڵ دەکرد. تەتەڵەکەت وەلا نابوو، مەشقەکەت نە دەنوسیەوە. ئەدی چۆن دەتوانی خوێندن و نوسین فێربی؟ بەم جۆرەی تۆ دەکەی قەت هیچ فێرنابی.

. ڕۆڵە گیان لێم توڕە مەبە، ئەم کارە بۆ من زۆر گرانە. دەستم وەک پێویستە ڕانەهاتوە. نازانم چت پێ بڵێم، من دەمەوێ ڕاست بنوسم، دەستم بۆ لای چەپ دەڕوا. دەمەوێ مێدادەکە زۆر داگرم، دەشکێ... تێدەگەی ؟

تراساکی سەری باداو گوتی :« تەوەندەی کە تۆ قەت فێر نابی. ئێستا دەستت بدە بەمن. قەڵەمەکەت دەست دەیە تا پێت بڵێم . »

دەنگی لاقان هات. پیرە مێرد لە خۆشی ئەوەی کە لە دەست خوارە پێچەی پیتەکان نەجاتی دەبێ، سەری هەڵێنا. کابرایەکی بێگانە بە هەناسە بڕکەو بە ڕەنگی بزڕکاو، لە جل و بەرگی فەرەنگیدا، تێدە پەڕی. چەترە کۆنێکی پەڕۆکراوی بە دەستەوە بوو. بێگانە ڕاوەستا و هیچی نە گوت . پیرە مێرد لێی پرسی : بۆ کوێ دەچی ؟

بێگانە وەڵامی دایەوە ؟ دەچمە گەرانی !

پیرە مێرد بە سەر سوڕمانەوە گوتی :

. گەڕان ؟ بۆ گوێت لە تەقەی نیە ؟ دنیا شلوقە و تۆی هەژاریش لەم کاتەدا بۆ گەڕان دەچی؟ لە جیاتی ئەم چەترە باشتربوو تفەنگت هەڵگرتبایە. بۆ چما تۆ خەڵکی کریت نی ؟

. بۆچی من کریتیم...

. کە وابوو چاوەڕوانی چی دەکەی ؟ چەترەکەت فڕێدە !

کابرا چاوێکی لە ئاسمانێ کرد هەور بوو. توند دەسکی چەترەکەی گرت و گوتی :« باران دەبارێ. » لەو کاتەدا تراساکی کە لە کابرا ڕامابوو وەک ئاسیاری دەهاتە بەرچاو، هاواری کرد و گوتی:«ئاخ ... ئاغا تۆ دیمیترۆس نی ؟ دیمیترۆس پیتزکولۆس ... بای پینلوپی فەقیر ئێستا لە داخی تۆ خوێن دەخواتەوە. »

کابرای غەریب تێکچوو. پرسی : « ئێستا ئەو لە کوێ یە ؟ »

. من چوزانم ؟ لام وایە گوند بە گوند بە دوای تۆدا دەسوڕێتەوە . باران دایدابە .دیمیترۆس چەتری هەڵداو کەوتە ڕێ !

پیره مێرد هاواری کرد : « کوڕم بۆ کوێ دەچی؟ ئێستا کە باران دەبارێ. بوێستە، وەرە دانیشە،پیاڵە ئارەقێکی پێداکە. »

دیمیترۆس بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە گوتی : « من چەترم هەیە »... لە بەر چاوان ونبوو.!

تراساکی گوتی : ئەو کابرایە دەڵێی وەدوای کەوتوون.

پیرە مێرد لە کاتێکا قاقا پێدەکەنی گوتی :

ـ ژنەکەی وەدوای کەوتوە ؟ بێگومان ئەو بەد بەختە لە دەست ژنەکەی رایکردوە، کەوتۆتە چیا تا لە شوێنێ خۆی وەشارێ.

لەو کاتەدا بیرتولدۆ کە باڵتەی لە خۆ وەرپێچابوو، گیتارەکەی لە ئامێز گرتبوو هاتەدەر. بە لەتە ئاتێکی جۆ کە بە سرکە تەڕی کردبووو، لە گەڵ پاروە پەنیرێکی دە شەراب هەڵکێشراو، فراوینی خوارد بوو، هێزێکی هاتبۆوە بەر و هاتبوە حەساری تا هەوایەک هەڵمژێ. ئیتر لە دانیشتنی نێو ژن و منداڵان مانندو ببوو. گیتاری بۆ لێدەدان تا سەریان گەرم بکا و نەهێڵێ زۆر خەمی مێردەکانیان بخۆن کە لە گەڵ تورکان لە شەردابوون. زۆرجار بایەک دەهات و تەقەی تفەنگ دە بیسرا. ژن گورج وەسەریانی دەکەوتن تا گوێ بدەنێ. ژنەکان تەنیا تۆزێ بە گیتارەی بیرتولدۆ دلیان دە حەسایەوە. گیتاری بۆ لێدەدان، گۆرانی ولاتی بۆ دە چرین، بەم شتانە هێندی دەکردنەوە دوو رۆژ پێش کریستینای تازە بوکی قەشە پێی‌گوتبوو:« خوا بتپارێزێ بیرتولدو پچکۆلەی من .گۆرانی راست وەک پیاو وایە، دلی ژنان دەحەسێنێتەوە.» پیرە مێرد خۆی‌هەڵمساندبوو گوتبووی : گۆرانی بۆ ژنان وەک پیاو وایە ! منی ئەحمەق تا ئێستا ئەوەم نەزانیوە. کە وابوو منیش دەمتوانی ژنم هەبێ و منداڵ دروست بکەم و کەسو کارێکم هەبێ پاشان بۆ ئەوەی پتر قسان لە تازە بوک دەربکێشێ پرسیبوی« چۆن خانمی من»

تازە بوکی جوان بزەیەکی شەیتانانەی هاتبوەو گوتبووی :

ـ ئاخ ... بیرتولدۆ، پچکۆلەکەی من ! چۆنت بۆ روون کەمەوە . تەنیاژن ئەو مەسەلەیە دەزانن. باشترە هەر باسی نەکەی.

بیرتولدۆ لە بابە گەورە نیزیک بۆوە. پێکەنینی لە روومەتی دیار بوو. گوتی :« باشە بابە گەورە ئاخرەکەی لە ئەلف گەیشتیە ‹ب›ێ . ئاخ دەرس خوێندن چەند گرانە !»

بابە گەورە رووی کردە نەوەکەی گوتی:« تراساکی فریوی ئەو بەرەڵایەی نە خۆی. چونکە ئەگەر ئەو فێری گیتارت بکا، زۆر گەمە دەبێ. ئەم کارە تەنیا بۆ گۆرانی بێژان دەبێ. »

بیرتولدۆ مات بوو، هیچی نەگوت. چونکە جێی وەڵام دانەوە نەبوو پێش چەند رۆژ وەغیرەت کەوتبوو، قسەی لە قسەی پیرە مێرد کرد بوو. ئەو دەم پاڵەوانی پیر رقی بیۆیە بردبووی بە دەستێک لە سەر دیواری دانابوو. بیرتولدۆ دەستی کرد بوو بەهاوارو ژنەکان پێی پێکەنیبوون. ناچار پەیژەیان هێنا بوو هێنا بوویانە خوارێ. ئیتر وزەی لێ نەدەهات و گیتاریشی لە پشت خۆی حاشار دەدا.

پیرە مێرد بە نەوەکەی گوت :« تراساکی وەرە ئێرەتا فێری تفەنگ هاوێشتنت بکەم. ئەو کارە لانی کەم . گەمەیەکی پیاوانەیە. برۆ ئەو تفەنگە بێنە .»

تراساکی پێشتر تفەنگی هێنا بوو لە پشتەوەی دانا بوو. بە بابە گەورەی گوت :

. ئەوەتا بابە گەورە. من دوێنێ خەریکی خاوێن کردنەوەی بووم. پێش ئەوەی عەمباری بکەم، لولەم خاوێن کردۆتەوە، چەورم کردوە . بزانە چەند جوان بروسکەی دێت.!

. رەحمەت لە شیرت. تۆ لە باوکت باشتر دەبی. بۆ وا تەماشام دەکەی ؟ دەبارە دەبێ هەر وابی. هاوار بۆ ئەو کوڕەی لە باوکی باشتر نەبێ. ئەگەر وانەبێ دنیا تێک دەچێ. دەستی بە سەری نەوەکەی داهێناو گوتی :

. تراساکی تۆ دەبێ لە هەمومان باشتر بی. لە بیر نەکەی کە ئێمەی کریتی‌لە خەڵکی دیکە جیاین. ئێمە دوو جۆرە خەم و خەفەتمان هەیە. لە وڵاتەکانی دیکە ئەو کەسەی شرانە تەنیا لە خەمی مەڕەکانی دایە. ئەگەر جۆتیارە لە خەمی مەزراو باران و ئاژەڵی دایە. ئەگەر کاسبکارە لە خەمی کاسبەکەی دایە. بەڵام‌کریتی بێچگە لە وانە دەبی لە خەمی کریت - یش دابێ.

دووپاتی کردەوە : بەڵێ ! کریتی سەرە ڕای هەموو پەژارە یەک دەبێ خەمی کریت - یشی لە بەر بێ. ئەوە خۆی خەفەتێکی گەورەیە. ئەم کریتە چارە ڕەشە ، وادەکا ئاژەڵ و بەرهەم و کار و کاسبیمان لە کیس بچێ. هەتیشیەتی. بە گیانی خۆم کە بەم زوانە دەیبەمەوە بە خوا، کریت نرخی ئەو فیداکاریەی هەیە . بزانە دەڵێم چی ؟ ئەو پتر لە وانەش نرخی هەیە. هەر وەک ئێمەش ئامادەین، بە دڵخوازلە ڕێگای ئەودا گیانمان فیدا بکەین. بەڵێ ! گوتم لە بیر نەکەی کە ئەو خەمە پەژارەیەکی گەورە یە. بە بڕوای من گیتارەکان و بیرتوڵدەکان و گۆزاتیەکان و پاتۆڵ فەرەنگیەکان و سمێڵ تاشراوەکان بڕۆن و گۆڕیان گوم کەن. لە بارەی دەرسیشەوە ئەوەندەی بزانە هەرکاتێ ویستم دەیبە خوێندەوار. لەم بارەوە بیرم کردۆتەوە. دوایە پێت‌ئێژم.!

پیرە مێرد تفەنگی لە سە کۆشی داناو هەروەک لە گەڵ بوونەوەرێکی زیندوو بدوێ، دەستیکرد بە لاواندنەوەی گوتی :

. دۆستی قەدیمی من ئەوە یە. بە حەزەوە دەستیکرد بە عەمبار کردنی. کاتێک لەم کارە تەواو بوو، تراساکی گوتی :

. باشە بابە . ئێستا ئەوەتا قەلە ڕەشەیەک لە سەر ئەم دارەی بەرامبەرمان نیشتوە، یالاً بزانم بەری دەدەیەوە. ؟

پیرە مێرد قۆنداخی تفەنگی بە شانیەوە ناو سێرەی لێگرت. بیرتولدۆ گوێچکەی گرت و چاوی لە سەر یەک دانان. تەقە لە تفەنگێ هات و قەلە ڕەشە بە سەر مەقولات هاتەخوار وکەوتە عەرزی. تراساکی لە خۆشیان هەڵدە بەزی و دەیگوت :

. دەست خۆش بابە گەورە دەست خۆش. پاشان رایکرد قەلەڕەشەی هەڵگرتەوەو هاویشتیە بەر پێی بیرتولدۆ تا بیترسێنێ.

کوێتی چارە ڕەش دەرپەڕی. گیتارەکەی دەست دایەو بە بۆڵە بۆڵ لە گەڵ ژنەکان چۆوە ژوورێ.

تەواوی بوک و نەوەکانی پیرە مێرد لە ماڵی ئەو کۆ ببوونەوە. پێش دوو ڕۆژ هەموو خاوخێزانی دوو دراوسێی پاڵەوان میکلس، واتە ماسترا پاسی زەنگوڵە فرۆش و کراسوکتورگیسی مەشکەش هاتبوونە ئەوێ. ئەو گوندانەی ئەوان پەنایان بۆ بردبوون، لە لایەن تورکانەوە داگیر کرا بوون. ئەوانیش کەل و پەلیان لە ئێستران بار کرد بوو، بە ژن و منداڵەوە کەوتبوونە ڕێ.

سەرگەردان و ئاوارە. روو بکەنە کوێ؟ لە پڕ پاڵەوان سیفاکاسی باوکی پاڵەوان میکێلس‌یان وەبیر هاتبۆوە و گوتبوویان :

ـ ماڵی ئەو قەلای لە گیران نەهاتوە. خۆشی پیاوێکی پیاوە. ئەو کەس لە ماڵی خۆی دەر ناکا. باشترە بچینە ئەوێ. بەم چەشنە پێش دوو رۆژ لە بەر ماڵی ئەو راوەستا بوون. کراسوگئورگیس کە پیاوێکی سەرو روخۆش بوو. دەستی بە سینگیەوە ناو بە بابە گەورەی گوت کە بۆ پێشوازیان هاتبوە دەرێ:

ئەی پیرە هەڵۆی سوڵتانی ! من و ماستراپاسی زەنگوڵە فرۆش کە وا ئێستا لێرە ئامادەین، دراوسێی پاڵەوان میکێلسی کوری تۆ بووین. لە بەرتورکان هەڵاتووین و پەنامان بۆ ژێر باڵی‌تۆ هێناوە. تۆ ئەی پیرە هەڵۆ ئێمە لە ژێر باڵی‌خۆتدەرمەکە.

پیرە مێرد لە قاقای پێکەنینی داو گوتی : « وەرنە ژوورێ، باڵەکانی من فرە پان و بەر بلاون. »

بیرتولدۆ هاتەدەر و بە ئەدەبەوە سلاوی لێکردن. ماستراپاس گوتی: «خوا بتپارێزێ پاڵەوان سیفاکاس. زۆر بە جێ بوە کە ماڵی تۆیان ناو ناوە عیبادەتگا. »

پیرە مێرد دەستی خۆی هەڵێناو بە توندی گوتی :

ـ ئێوە بە مەرجێک بە خێر هاتن کە هەر تکتان چەک هەڵگرن و بۆ شەر لە گەڵ پیاوەکانی تر گەون ـ من راکردووی ترسەنۆک راناگرم. لە ئاست ژن و منداڵەوە دڵنیا بن. من بەر پرسیەتی ئەوان دەگرمە ئەستۆ. پاشان بە پێکەنینەوە گوتی: «ئێوە تەماشای ئاغا بیرتولدۆ مەکەن ئەو شتێکە وەک ژن و یا منداڵ دەچێ. »

هەموو لە قاقای پێکەنینیان دا.تەنیا ماستراپاس و کراسوگئورگیس نێو چاوانیان تێک نا. کراسوگئورگیس گوتی :

ـ پاڵەوان سیفاکاس ئێمە ! ئێمە فێری شەر نەبووین . ئەگەر بچینە شەر ئیتر کارمان تەواوە.

پیرە مێرد گوتی : « هەر چۆنێک بێ ئێوە کارتان هەر تەواوە ».

ـ هەتا درەنگتر بێ باشترە ، پاڵەوان !

ـ دەک نە مێنی !

کراسوگئورگیس لە ترسان داهاتەوە گوتی :

ـ زۆر باشە پاڵەوان . تورە مەبە . ئێمە بە ئەمانی خودا دە چینە شەر. گورج بارەکانیان هێنا خوار، ژنەکانی ماڵێ یاریدەی میوانانیان کرد وهەموویان جێ کردنەوە. لە قوژبنێکی بەر نوای حەساریٰ کوچک و ئاگریان بۆ پەنا بەران ساز کرد. شەو گشتیان لە سەو سفرەیەک کۆ بوونەوە. بەیانی زوو بابە گەورە دوو تفەنگی لە بەری میچی هێنا دەر و هەر یەکە تفەنگێکی ویندان وهەتا دەردەوەی گرگەی لە گەڵیان چوو. پاشان بە هاریدیموسی پیرە شوانی ئەسپاردن و گوتی :

ـ برۆن خوا ئاگادارتان . برۆن و دەست بە کار بن. ئێوە پیاون و پیاوانە بچن. من ئاگام لە منداڵتان دەبی. سەفەر بە خێر. سلاوی من بە چیاکان بگەیەنن.

لەولاوە تراساکی لە گەڵ دوو هاوڕێی خۆی ‹ مانولیوس و ئاندریکوس› خەریکی باس بوو دەیگوت :

ـ کوڕینە ، ئێوە ئیتر گەمە نیە . لێرە لە گەڵ چس‌گورگ و کیژی سەرتاش ڕووبەڕوو نین. ئێرە شوێنێکە دەبێ بکوژین و بکوژرێین.

ئاندریکوس گوتی ئێمە ناترسێین.

ـ ئێوە دەزانن تۆچەقانی باوێن؟ دەزانن تفەنگ: عەمبار کەن؟ دەزانن سێرە لە نیشانە بگرن؟

مانولیوس گوتی : فێر دەبین .

تراساکی گوتی : من فێرتان دەکەم. ئێوە لە دەستەی خۆمدا جێ دەکەمەوە. خۆم دەبم بە فەرماندەی دەستە. کاتێک فێری تفەنگ هاوێشتن بوون ئێوە سوێند دەدەم. ئێستا سوێند خواردن فایدەی نیە .لە ڕۆژی دوایەوە منداڵان دەستیان بە فێر بوون کرد. وەک دەستپێکی کار تراساکی هەریەکە دارێکی بۆ برین و ئامادەی کرد و پاشان گوتی:

ئەلفبای چالاکی ئەوەیە پێش هەموو شت لێدان فێر بن. ئەوەش بەستراوەتەوە بە ڕاهاتن. مرۆڤ لەو دەمەوە کە ڕاهات لێبدا. ئیتر لێدەدا.کە وابوو ئێوەش دەبێ بە لێدان ڕابێن.

ڕۆژێک بابە گەورەیەم چەشنە لە گەڵ تراساکی دوا بوو، ئەویش قسەکانی دە گوێ گرتبوو، ئێستا فێری دۆستەکانی دەکرد.

دۆستەکانی ئەلفبای پاڵەواناتی فێر ببوون و دەیانتوانی لە قۆچەقانی کەلک وەر بگرن. تراساکی شایی بە خۆ بوو. هەموو ڕۆژێ دەیبردن مەشقیان دەکرد. خۆشی بە تفەنگی ڕەشۆکی بابە گەورەی وەپێشیان دەکەوت. چەند منداڵی بەرەڵای گوندیش هەر یەکەی دارێک بە دەستەوە وەک شیر دەکەوتنە دویان. بە خەباڵی خۆیان دەچون تورکان پەلامار بدەن. لەو مەشقەدا بنە دڕک و گوێنی ولقەدار بە تورک دادەنران . ڕۆژئاوا کاتی گەڕانەوە هەر یەکەی گوێنیەک یا بڕکە دڕکێکی بە دوای خۆیدا ڕادەکێشا و گۆیا ئەوە تورکن سەریان براوە هێندێ جار تراساکی قەلە ڕەشەیەکی بە تفەنگ دەکوشت و دە یهێناوە. دەیگوت : ئەوە پاشای تورکانە.

بابە گەورە زۆرجار لە گەڵ نەوەکەی لە بەر دەرگا دادەنیشت و فێری دەکرد کە چۆن تفەنگ عەمبار بکا و بە شانی خۆیەوە بنێ و سێرە بگرێ. باسی شۆڕشی مەزن و قارەمانەتی باو وباپیرانی بۆ نەوەکەی دەکرد و دەیگوت :

ـ دوژمنی هەرە گەورەی ئێمە تورک نین، بەڵکوو ترسە. لێت ناشارمەوە لە هەرزەکاریدا بۆ هەرەڵین جار چومە شەڕ، زۆر ترسام. لاوێکی پێ نەگراو بووم. بەڵام وردە وردە تێگەیشتم.

تراساکی کە پاڵی وە ئەژنۆی پیرە مێرد دابوو، گوێچکەی بۆ قسەکانی ڕاگرتبوو گوتی :« چ تێگەیشتی بابە ؟».

ـ ئەوە تێگەیشتم کاتێ مرۆڤ لە شتێک بترسێ، ئەو شتە هەرچی بێ، شێر، زەلام، یا ڕەشایی، هەوەڵجار دەبێ خۆی پێدابدا. ئەو دەم ئیتر ترسی نامێنێ. تەواوی ڕازەکە هەر لەوە دایە.

لەو کاتەدا کە بابە گەورەو تراساکی لە ئاخافتن دابوون، لە پڕ دەنگی خلۆر بوونەوەی بەردان هات و دەدوازدە ئێستر سوار وەدەر کەوتن. پیرە مێرد ڕابوو، دەستی بە بەر چاوانەوە گرت ، لە بەر مژ و هەوای تاریک نەیتوانی هیچیان لێ بزانێ. جارچی گوندی ‹ماورۆدیس› ی پیر تێ دەپەڕی. پیرە مێرد هەمیشە بە ناوی ‹ پاڵەوان جارچی› بانگی دەکرد. هەرای کردێ وگوتی:

یالاّ پاڵەوان جارچی ! چۆنی ؟ ئەوانە کێن لە چیا دێنە خوارێ ؟»
جارچی گوتی : « وادیارە پاپۆڕی ستیفانیــە لە لەنگەرگای ‹ سنت پلاژ › وێستاوە و پڕە لە ئازوقەو چەک و چۆڵ.»
بابە گەورە نیشانەی خاچی کێشاو لە بەر خۆیەوە گوتی :
ـ ئاخ .. ئەی یونانی فەقیر، تۆ خۆت برسی، بەلاّم پاروو لە زاری خۆت دە گریەوە و بۆ ئێمەی دەنێری ... باشە ئیتر چی ؟
ـ ئیتر ئەوەیە کە چەند کەس لە شۆڕشگێڕانی ئۆردووی کوری تۆ ، بە سواری ئێستران لە چیا هاتونە خوار تا ئەو ئازوقە و چەک و تفاقەی بگوێزنەوە. ئەوەتا گەیشتنە ئێرەو رابە بە خێر هاتنیان بکە.
بابە گەورە دەروازەی کردەوەو گوتی : « بە خێر هاتن پێتان سەر چاوم ! »
سوارەکان نێزیک دەبوونەوە. باکێش شاد و بە فیز وەپێشیان کەوتبوو. پاڵەوان میکێلس پێی گوتبوو: « تۆ بۆ شەر نابی، بەلاّم تۆ کە وەک ڕێوی فێڵەزان و وەک سەگ ڕادەکەی بۆ پەیک باشی.» ئێستا باکێش بە سەرۆکایەتی دە کەسیتر دەچوو تا باری پاپۆڕی ستیفانیس خاڵی بکات.
کاتێ باکێش لە ئێستر هاتە خوارێ گوتی :
ـ سلاو پاڵەوان سیفاکاس! ئەگەر بۆ ئێوە زەحمەت نیە، ئەم شەو لێرە دەبین و بەیانی بەرەو دەریا دەڕۆین.
بابە گەورە ئامێزی کردەوەو گوتی :
ـ بە خێر بێن ڕۆڵەکانم ! بخۆن و بخۆنەوە. ئێوە کرێکارن . شۆڕشگێڕەکان کە بە دوکەڵی باروت ڕەش هەڵگەڕا بوون و لە برسان لاواز ببوون، لە حەساری پیرە مێرد هاتنە ژوورێ. ژنان کە نیگەرانی حاڵی پیاوەکانیان بوون، بە چالاکی ئاگریان دەکردەوە، چێشتیان لێ دەنا و سفرەیان ڕادەخست. شەو داهاتبوو. چراکان روخساری گرژ و ماندووی شەر کەرانیان ڕووناک دەکردەوە کە وەک هار دەیانخوارد و وەک گا دەیانخواردەوە. تەقەیان لە شەویلکان دەهات. بونی توندی پیاوانەیان حەساری پڕ کرد بوو. ژنەکان بێدەنگ لە دەورەیان وێستا بوون و بە دڵ خزمەتیان دەکردن بابە گەورەش بە ئافەرینەوە سەیری دەکردن. پاش خواردن و وەخواردنەوە، بابە گەورە گوتی :« باشە ... ئێستا بچن بنوون . ئاخ .. خۆزیا منیش لە تەمەنی ئێوەدابام و لە گەڵ ئێوە بەشداری کوێرەوەری بام. ئاخ .! ڕۆڵەکانم ! بزانن کەوتومە چ ڕۆژگارێک. هەموو شەو لە سەر دۆشەکی نەرم دەنووم. بە ڕۆژ وەک زەلامی بێکارە دەخۆم. ئیتر تفەنگیش ناوێم. کەسیش بۆ کوشتنم خۆ مات ناکا. خودا نەکا دوژمنیشم لەو ڕۆژە بکەوێ.
باکێش گوتی:« ئاخ ... پاڵەوان سیفاکاس،! خوا ئەو ڕۆژەمان بە نەسیب بکات.» باکێش تۆ سەر دەستەی نە مانەی. خەویشت بێ نەشێ درەنگتر بنووی . تۆ بمێنەوە کارم پێتە !
ـ بە چاوان پاڵەوان سیفاکاس، من دەبێ ئەم شەو نرخی ئەم مەنسەبە بدەم کە تۆ پێت داوم.
هاورێکانی بە چەک و جلو بەرگەوە لێی نوستن. هێشتا ژن سفرەیان کۆ نەکرد بوو پرخەیان دەهات. سەرمای ئەو شەوە حەشری دەکرد. ژنەکان ئاوردوویان هێنا و ئاگریان کردەوە. پیرە مێردو باکێش لە پەنا ئاگری دانیشتن. پیرە مێرد لە ئاگرەکە ڕامابوو دەنگی نەدەکرد. بەلاّم لە بزۆ

هەڵتەکاندنیەوە دیار بوو بیرێکی بە زەینی دادێ‌و نارەحەتی دەکات. ئاخرەکەی خۆی پێ ڕانەگیرا و بە دەنگێکی نەرم گوتی :

ـ باکێش دەمەوێ شتێکت لێ بپرسم. لە سەر دڵم بۆتە گرێ. تۆ ئەشی شەراقەتمەندانە وەڵامم بدەیەوە. هەرچی دەیزانی پێم بێژی. چونکە من پیرە مێردێکی سەت ساڵەم و ناتوانم درۆ ببیسم.

باکێش بە نیگەرانی بیری دەکردەوە. دەبێ پرسیاری چیم لێ بکات؟ ئاخرەکەی گوتی :

ـ دڵنیا بە پاڵەوان سیفاکاس . ڕاستیت پێ دەڵێم.

بابە گەورە دەنگی ئەوی کردو گوتی :

ـ ئەو شەوە پاڵەوان میکێلس بۆ چی ئۆردوی بە جێ هێشت و ڕۆی. دوای ڕۆیشتنی ئەو دێریان سوتاند. ئەوە خەتای ئەو بوو. باکێش ئاگرەکەی خۆش کرد و خۆی کۆ کردەوە. پیرە مێرد باسکی گرت و گوتی :« لە ئاگر گەڕێ، ئەوەم پێ بڵێ ئەو شەوە بۆ کوێ چوو؟.»

باکێش دوودڵ بوو. ئەگەر وەتسە هاتبایە دەبوایە تەواوی ڕووداوەکە باس بکات. لەوە دەترسا. ئاخرەکەی گوتی:« پاڵەوان سیفاکاس ئەو مەسەلەیە بەمن چی؟ پێوەندی بە منەوە نیە

پیرە مێرد توند باسکی ڕاوەشاند و گوتی :

ـ دەی قسە بکە. خۆت خەشیم مەکە. ئەو شەوە بۆ کوێ چوو بوو.؟ ئەو ئابڕوی منی بردوە، هەر بۆیەش ناوێرێ چاوم لێ بکات. لەوەی دەترسێ پرسیاری لێ بکەم. بڕوا بکە وام دێتە سەر کە ملی ڕێ بگرم و بچمە چیا. شۆڕشگێڕان بانگ بکەم و لە بەر دمی ئەوان دادگایی بکەم . ئەگەر تۆ ئەم شەو ڕاستیم پێ نەڵێی، سوێند بەم ئاگرە، بەیانی ڕوودەکەمە چیا. ئەو دەم ئەگەر پیاوە با بی‌لە پێش من داوای پاڵەوانەتی بکا.

ئەو پیرە دار بەڕوە لەوانە بوو هەرچی بیڵێ بیکات. باکێش ترساو گوتی :

پاڵەوان نارەحەت مەبە. هەموو شتێکت پێ دەڵێم . لە سەر خۆ بە.!

ـ من لە سەر خۆم و گوێت دەدەمێ.

ـ تۆ دەزانی کە نوری بەگ ژنێکی چەرکسی هەبوو.

پرە مێرد لە سینگی خۆی دا و گوتی : « ئەی هاوار ... پای ژن لە نێو دایە ؟ لەو شەرم و ئابرو چووتە ؟ »

باکێش گوتی: « بەڵێ پای ژن لە نێو دایە. چما تۆ ڕاستیت نەدەویست ؟» دیارە کە ڕاستیم دەوێ. بەڵام سەبرتر قسە بکە. کەس نابێ قسەکانمان ببیسێ. درێژەی پێ بدە .

ـ ئەو ژنە ناوی ئامینە بوو. پاڵەوان میکێلس لە ماڵی نوری بەگی دیتبو ببوو بە ئەڤینداری. پاش ماوەیەک کاتی بومە لەرزەکە پاڵەوان پولیکسینگیس دیتی، ئەویش عاشقی بوو. دوای ئەو ڕۆژە ئەو پیاوە ئیتر لە گەرەکی ماڵی نوری بەگی دوور نەدەکەوتەوە. ئەوەندەی هاتو چۆ کرد و هەناسەی هەڵکێشا، تا خۆی گەیاندە ئامینە و پاشانیش سەر جێی. دوایە بڕیاری دا بیهێنێ. هێنایە سەر دینی مەسیح. بڕیار بوو ڕێو ڕەسمی ئاینی و گواستنەوەی لە ڕۆژێکدا بەڕێوە بچێ. یانی لە ڕۆژی میعراجی مەسیح‌دا.

باشە درێژەی پێ بدە. تا ئێستا نەمزانی کوری من لەم کارەسانە ئابرو بەرەی پاڵەوانپولیکسینگیس دا دەوری چ بوە؟ ئەوەی تێناگەم.

. ئێستا تێدەگەی . خوا لە گوناحانم خۆش بێ. لام وابە جوانی ژنە چەرکەسیپتر کاری لە پاڵەوان میکێلس کردوە. نازانی چەندە جوان بوو. بە خۆری دە گوت نەبە دەرێ من لێرەم. بەڵێ ئەوەندە جوان بوو.

. باشە ..درێژەی پێ بدەو قسەی زیادی مەکە. من دەمەوێ بزانم کە پاڵەوان میکێلس بۆ چی مەتەرێزی بە جێ هێشتبوو.؟

. ئەو شەوەی کە ئەو لە بن دیواری دێر لە گەڵ تورکان شەڕی دەکرد. من خەبەرم بۆ برد کە خزم و کەسی نوری بەگ گوندی کاستلی یان گرتوە و ژنە چەرکەسی یان ڕفاندوە . پاڵەوان میکێلس گورج سوار بوو ڕۆیشت. دە کەسیشی لە گەڵ خۆ برد تا بە تەنیا نەبێ. بەری بەیانی ڕاست لە پشت دەروازەی گاندی لە کن زاڵم کێو گەیشتنە تورکان. کوڕی تۆ وەک شێر پەلاماری دان. بڕوا بکە پاڵەوان سیفاکاس، من تا ئێستا هیچ کەسی وا ئازاو وەشیدم نەدیوە. تۆ دەبێ شانازی بەو کورە بکەی. دەبێ سەر بەرز بی کوڕی وات هەیە. تورک سەریان لێ شێوا، ڕایان کرد و ژنەکەیان بە جێ هێشت.

بابە گەورە ناڵاندی، هەرتک دەستی بە چاوانەوە گرت و گوتی :

. وای لە من ... کەوابوو ئەو بەدبەختە بۆ ئەو ژنە مەتەرێزی خۆی بەجێ هێشت؟ ئابڕوی خۆی و منیشی بردوە. داخوا ئازایەتی ئەو ئابڕوو چوونە دێنێ؟

. ئاخ پاڵەوان سیفاکاس ! نارەحەت مەبە. بە گۆڕی باوکم کوڕی تۆ هەر چاویشی لێ نەکرد. تەنیا بە منی گوت : ئەو ژنە بەرە گوندی کوراکیس لە کن پورمی دابنێ و پێی بێژە تا خزم خەبەری دەدەمێ ئاگاداری بێت. باکێش تاوێک بێدەنگ بوو. تەماشایەکی ئاگرەکەی کرد و پاشان گوتی: « بەڵێ بابە گەورە دەزانی پاشان چ قەوما.؟ »

پیرە مێرد وەڵامی نەدایەوە . ڕەنگی سپی هەڵگەڕا بوو. باکێش بە سەبروکە گوتی :

. ڕۆژێکی بەیانی ژنەکە مرد بوو، خەنجەرێکیان لە سەر دڵی دابوو. بابە گەورە دەستی درێژ کرد. گۆزەڵەی شەرابی هەڵگرت و بە سەریەوەنا. هێزێکی هاتەوە بەرو پرسی :

. کێ کوشتبووی؟ دەنگی ئەوەندە گزیبوو دەتگوت لە قولایی چاڵاوێک دێتە دەرێ. باکێش سەری بەردایەوە. گوتی: « چت پێ بڵێم ؟ لەوانەیە خۆی کوشتبێ. چونکە دەڵێن خەنجەرەکە لە دەستی خۆی دابووە.. »

. لە« دەڵێن » گەڕێ. تۆ چۆن بیر دەکەیەوە.؟ کێ کوشتوویە ؟

. ئاخ . پاڵەوان سیفاکاس تۆ پشوت لە من بڕیوە. دەست هەڵناگری. ئێستا کە وایە گوێ بدەیە: کورەکەت ..پاڵەوان میکێلس.

. بۆ چی ؟. بادکێش بە درکاندنی ئەم ڕازە هەستی کرد سوک بوە. ئیتر هیچی نەمابوو بیشارێتەوە. گوتی : چونکە ئیرەیی پێ دەبرد.

پیرە مێرد لقە دارێکی هاویشتە سەر ئاگرەکە و گوتی: « کارێکی باشی کرد. دەستپێکی خەراب بوو، بەڵام باشی تەواو کرد. ئەو کرمە هەناوی دەخوارد. ئەوە کارێکی باشبوو. »

. تۆ پاڵەوان سیفاکاس نازانی کە ئەو کارە گوناح بوو.؟

. ئەو تەنیا گوناحێکی کردوە و چیتر. مە تەرێزیشی بە جێ هێشتوە. بەڵام ئەو بارتەقای ئەم

گوناحەی داوەو دیسانیش دەیدا، تا هیچی لە سەر نەمێنێ. من بڕوام بە توڕەمەی خۆم هەیە.

. بەلاّم ئەو ژنە بێگوناح بوو.

. ئاخ .. تۆش لە فیکری ژن دای؟ تۆ دەبێ لە فیکری کریت دابی. باشە .. ئیتر بڕۆ بخەوە. ئاگادار بە زمانت نەگەڕێ. نەکەی لای کەس باس بکەی. ئەگەر ئەو رازە دەر کەوێ، پالەوانەکان یەکتر دەکوژن. ئەوەش بە زیانی کریتە. جارێ شەو باش... بڕۆ بخەوە ... من جارێ لە بەر ئاگر دەبم ...

* * *

بەیانی بەردا بوو، پیرە مێرد هێشتا هەر لە بەر ئاگری بوو. ئاگرەکە کوژا بۆوە، بابە گەورە سەری کەوتبوە سەر سینگی و خەوی لێ کەوتبوو. باکێش و هاڤاڵەکانی دوای ئاولێی خواردن، وەک گورگ کەوتبوونە رێ و رۆیشتبوون. بە پەلە بوون تا زووتر بگەنە پاپۆڕوپارەکەی خالّی بکەن. کاتێ بابە گەورە چاوی هەڵێنان کەس نەمابوو. تەنیا بۆنی سیغاروشەراب لە ژوورەکەی دەهات.

نیزیک نیوەرۆ ، لەو کاتەدا کە ژن چێشتیان لە سەر ئاگر وەلادەبرد، بابە گەورەش تواتیبووی سێ پیتی هەوەڵی ئەلفوبێ لە سەر تەتەڵە بنوسێت و بە دڵنیایی بە نەوەکەی نیشان بدات. لاوێکی نامۆ بە کەوار کالّە و گۆرەوی وپەپاخێکی بە گوڵنگی درێژ بە سەرەوە گەیشتە بەر دەرگا. ژنەکان لە پێشدا ترسا بوون و پاشان لە خۆشیان هاواریان کرد. چەتە ..چەتە ..

پیرە مێرد سەری هەڵێنا و گوتی :

. بە خێر هاتی چەتەی یونانی. وەرە ژوورێ هەڵۆی لاو.

چەتەی یونانی وە ژوور کەوت. ژنەکان وە غیرەت کەوتن و هاتنە پێش تا قەدو بالاّی جوانی ببینن. یەکێ لە ژنەکان گوتی:

. دایکی دەبێ شانازی پێ بکات. وە کریتی یان دەچێ. لاو لە پێش پیرە مێرد راوەستاو سلاّوی کرد و پرسی :

. پالّەوان سیفاکاسی پیر ئەتۆی ؟

بەڵێ خۆمم. سەردەمێک پالّەوان بووم، بەلاّم ئێستا تەنیا سیفاکاسی پیرم. چۆنە رووت لە مالّی من کردوە ؟

. من لە پاپۆڕی ستیفانیەوە دێم. ناوم میترۆسە. خەلّکی رۆمل- م. هەوالّمان پێگەیشت کە کریت لە شەر دایە. بۆ یاریدەدانی ئەو هاتووم . لە سێرا پیاوێک کە لیباسی فەرەنگی لە بەردا بوو، دەیگوت نەوەی تۆیە. نامەیەکی بۆ تۆ نووسی و سپاردی کە وەدەستی خۆتی بدەم.

بابە گەورە نامەکەی وەر گرت و دەستی پێدا هێناو فرە خۆشحالّ بوو. ئەوە نامەی نەوەی‌هەرە خۆشەویستی بوو ، کوری کۆستاروسی کورە گەورەی بوو. ئەم نەوەیەی پتر لە نەوەکانی تر لە سەر کۆشی دانا بوو، هەر ئەویش بە نێو باپیری کرد بوو. رووی کردە لاوی نامۆ و گوتی :

. هەر خۆش بی کورە لاو کە زەحمەتت کێشاوەو ئەم نامەیەت هێناوە. پاشان نامەکەی دەباخەڵی‌نا. تەماشای تراساکی کردوبە پێکەنینەوە بە لاوەکەی گوت : ئەم نامەیە دەدەم بە

ئەوەیەکی دیکەم کە خوێندەوارە بۆم بخوێنێتەوە. ئێستاتێوە ژنینە سفرەی راخەن. ئێمە میوانێکی بە ڕێزمان هەیە، یونانیەکی گزک و پۆشتەیە. بچن ئەو کورسیە نەخشاوەی بۆ بێنن.

گورج کورسیان بۆ میوان هێنا کە هەلۆیەکی دوو سەری لێ نەخش کرا بوو. بابە گەورە بە سەروروی خۆش لە حەساریْ وێستا بوو. ئەوەندە کەیف خۆش بوو دەتگوت میوانی هەرە خۆشەویست لە یونان میوانداری دەکات. ئەگەر شەو بابە تەواوی چراو شەمەکانی ئەو ماڵەی بۆ ڕۆشن دەکرد. بەڵام نیوەڕۆ بوو، هەتاوی کریت لە بان قژی خورمایی لاوی یونانیدەدرەوشاو قایشی دەمانچە و زەنگاڵی سپی درێژی بریقەیان دەهات.

میوان ئەیدەویست دانیشێ. وێستا بوو، بە چاوی ئافەرینەوە سەیری پیرە مێردی بە گوڕو موو چەرموکیدەکرد. لە بەر خۆیەوە بیری لەوەدەکردەوە، دەبێ ئەوە چەندە پیربێ، هەردەڵێی ئەهەدییە.

پاشان دەستی پیرە مێردی گرت و گوتی :

- بابە گەورە! من بیستومە تۆوەک پیرە دار بەڕوی سەت ساڵە ژیاوی، باوبارانت دیوە، کوێرەوەریت کێشاوە، شەڕت کردوە، بەختەوەر بووی، ئێستا پێم بڵێ لەو سەت ساڵەدا ژیانت چۆن دیوە !.

پیرە مێرد گوتی : کوڕم ! ڕاست وەک گۆزەڵە ئاوێکی فێنک.

بابە گەورە تۆ هێشتا تینووی؟

پیرە مێرد دەستەکانی بەرز کردەوە، قۆڵی فرەوانی کراسەکەی خزین وباسکە ڕەق و تەقەکانی دەرکەوتن. پاشان بە دەنگێکی قەوی، وەک لەعنەت لە خۆ بکا گوتی :« لەعنەت لەو کەسە کە تینوایەتی دەشکێ.»

هەرتکیان تاوێک بێدەنگ بوون. لاوی یونانی تاسەی پیرە مێردی هەبوو. پیریش سەیری لاوی دەکردو تراساکیش لە بەینیاندا وێستا بوو تەماشای دەکردن. ژنەکانیش دەست لە سەر سینگ وێستا بوون و گوێ یان هەڵخستبوو.

پیری مەزن وەدەنگ هات، دەستی بۆ لای ڕاستە ڕاداشت و گوتی : لاوی قۆزا لەو لاوە چ هەواڵێکی تازەت بۆ ئێمە هێناوە.؟ ئێوە بێگومان ئیتر تورکتان لە نێودا نەماوە. خەنی لە خۆتان. هەناسەیەکی هەڵکێشاو لە سەر نیو تەخت دانیشت.

لاوی یونانی لە سەرکورسی نەخشین دانیشت. تراساکی کە لە پەنا بابەگەورە دانیشتبوو، چاوی لە لاوی یونانی وەرنەدەگێرا. میتروس لە وەڵامی پیرە مێردا گوتی :

. ئێمە ئیتر تورکمان نیە. بەڵام لە جیاتی ئەوان دەرەبەگی گەورەو ژاندارم ونوێنەری مەجلیس هەن. بەڵام باشترە باسی ئەو مەسەلەیە نەکەین.

ژنەکان تازە نانیان بە تەندوورەوە دەدا،بۆنی نانی گەرم حەساری پڕکرد بوو. لاوی یونانی کەمی مابوو لە خۆ بچێ. ئەو لە بەیانیەوە هیچی نەخوارد بوو. چاوی لە تەبەکی نانی بڕیبوو. پیرە مێرد تێگەیشت و هاواری کرد:

. هۆی ژنینە ! دە زووبن نانی گەرم و پەنیر و گۆزەڵە شەرابێکمان بۆ بێنن، با تینێکمان بێتەوە بەر،دەنا چاومان خێل دەبێ.

پاشان سەیرێکی دەوروبەری خۆی، واتە عەمبار و چاڵاو وحەساری کرد و سەیرێکی لاوی

یونانیشی کردو بە پێکەنینەوە گوتی: « لاو ! دە زانی بۆ پێدەکەنم. لە راستیدا بیری پیاوی پیر وەک قەبرستانێکی لێ دێ کە لە پڕ بەردەکانی سەر گۆڕ راست دەبنەوە و مردوەکان دەردەکەون. بۆ نموونە : ئەم کەوایەی تۆ لە حەساری من شتێکم وەبیر دەخاتەوە. ساڵی١٨٩٦بوو. پاڵەوان لیپاپیسی رەحمەتی کەوایەکی لەبەردابوو، لە سەر ئەو کورسیە دانیشتبوو کە وا تۆ لە سەری دانیشتووی. ژنە رەحمەتیەکەی من و خەسوی فەقیرم ‹مالامو › کە ژنێکی زۆر باشبوو، نانیان دەکرد. واست وەرزی پاییزو ساڵ ئەم کاتەو جێژنی حەزرەتی سن ژۆرژ ی شەرابخور بوو. لە گوندی شەرابیان دروست دەکرد، سەری کوپەکانیان هەڵدەگرت ، کە تامی بەرهەمی تازە بکەن. واست لەوکاتەدا ‹کاستانیاس›ی رەحمەتی گەیشتێ. ئەو پیاوێکی تازا بوو وەک یونانیە قەدیمیەکان. لە سوار چاکیدا تای نەبوو. ئەسپ خۆی لە بن رانەدەگرت. ‹سورملیس›ی رەحمەتی،پاپۆزواتی بە ناوبانگی پاپۆزی نوقم بووی ‹سیدام ماندلی› یشی لە گەڵ بوو. من بە کوستاروسی کورە گەورەی خۆم گوت: کوستاروس برۆ بەو دەستە گەورانەت کوپە شەرابێکمان بۆ بێنە، تا لەم حەسارە چۆنی لێ ببرین. لەو قسانەدا بووم هیروگورگیسی شوانی رەحمەتی بەرانێکی سەر براوی لە سەر شانی دانابوو، لە چیا هاتە خوارێ. ژنەکەشی بە سەلکە پەنیرەوە لە گەڵبوو. هەموو هاواریان کرد : مەزەی شەرابیش خوا گەیاندی. دایان لە قاقای پێکەنین. مامۆستای مەدرەسە بە کزلانێدا رادەبرد، گوێی لە پێکەنینی ئێمە بوو، هاتە ژوورێ. تێکرا هاواریان کرد:بەیانیت باش مامۆستا. وەرە دانیشە، ئێمە دەخۆینەوە، تۆش بینووسە. لە وەلاّم دا گوتی : مردوو شۆر مامۆستای بەرێ ، منیش وەک ئێوە دەخۆمەوە. پاشان دەچم ‹مالباروسی› شاعیر دەبینمەوە، دەیهێنم بە دەنگ شیعرمان بۆ بڵێ. وەدەر کەوت، زۆری پێ نەچوو ‹مالباروس› و‹ئاندرولیس›ی بە زۆرناوە هێنا. ئاخ ... ئەو فەقیرە خوا لێ خۆشبوانە چی‌یان بەسەر هات.! من راست بوومەوە لولەیەکی لاستیکم دەستێ دایە و لە شیرەی کوپە شەرابم قایم کرد و بانگم کردن : جانەوەرینە ئیتر جام پێویست نیە. خۆ گوێلەکە بە جام ئاو نادرێ. وەرن تێکرا بە لولە بخۆنەوە. بەلاّم بە نۆرە. پاڵەوان لیساپیس تۆ لە هەموان پیرتری، وەپێش کەوە. ئەو پێویستی بە پێگوتن نەبوو، لولەی دەست دایە و بە زاریەوە نا. دەنگی قوڵتە قوڵتی کوپەی شەراب، دەتگوت قەڵیانە. کابرا دەیخواردەوەو دمی لێ نەدەکردەوە. ئەوانیتر دەیانگوت : وەک ئەو دەستی پێکردوە چۆنی لێ‌دەبڕێ. بە هەزار زەحمەت لولەیان لە زاری کردەوە. ئەمجار بە نۆرە دەستیان بە خواردنەوە کرد ، تا لە سایەی خوا منیش نۆرەم بەرکەوت. ئەی خوایە جێژنێکی خۆش. باسکیان لە پەنیری تازە هەڵکردبوو، دەیانخوارد و دەیانخواردەوە. بەرانیش کرابوە کەباب. لیپاپیس دیسان کوپەی پەلامار دا. لە پشت دەرگاوە یەکێک بانگی کرد: نوشی گیان کورینە نوشی گیان ..دەنگی ‹نکتاریسی› قەشەبوو لەگەڵ پێش نوێژی دێری نوتردام دمبرت هاتبوو. ئەو دوانەش دەمێکە بە رەحمەت چوون. هەرتکیان سەر خۆش بوون. لە گەڵکو وەژوور کەوتن دەستیان کرد بە سەماو گۆرانی گوتن. هەرایەکیان سازکرد ئەو سەری دیار نەبێ. کەمی مابوو هەموو شت بشکێنن. دە یانگوت : کورینە کاتی ماڵاوایی یەکجاری هاتوە. ئەوانیش کوپەیان پەلامار دا. دیسان کوپە وە قوڵتە قوڵت کەوت. وای لێهات، خەستی شەراب نەبێ، هیچی تێدا نەما. ئای لەو فەقیرانە ...چ پێکەنین و سازو ئاوازێک. چۆن لاقیان بە عەرز دادەداو گاڵتەیان بە مەرگ دەکرد. هاواریان دەکرد: کورینە ئەو

عەرزە بکوتن، چونکە رۆژێک دێ ئەو دەمانکوتێ. پاشان هێندێ بە پای پەتی و هێندی بە پۆتین بە عەرزیان دادەدا. هەموو دەلنگیان هەڵکرد بوو. خوایە لەو ئەژنۆ و بەلەک و تۆکانە، دەتگوت تۆکی بەرازیە.!»

بابە گەورە بێدەنگ بوو، دەستی بە ریشی داهێناو چوە دەفیکرەوە. لە پڕ چاوی گەش و روونی لێڵ بوون و گشت رابردووەکان لە ویندا رەنگیان دایەوە لاوی یونانی بە بیستنی ئەو قسانە دەلەرزی، دەنگی لاقی ئەوانەی دەبیست کە بە عەرزیان دادەدا. بەلەکە تۆکناویەکانی دەبینی و دەترسا. ژنەکان گوێیان هەڵخستبوو. تراساکی بەو لاقە چکۆڵانە بە عەرزی دادەدا.ئەویش بە شادی مەرگی بۆ خەبات بانگ دەکرد.تەنیا بیرتولدۆ هاتبوە دەر کە تەماشای لاوی یونانی بکات. بەلام بە بیستنی باسی مردن چوبۆوە ژوور و خۆی شارد بۆوە.

بابە گەورە جارێکیتر هاتەوە دەنگ و گوتی :

. من لە پێشدا بە پێکەنینەوە دەستم پێکرد. پاشان بە یادی مردوان تێکچووم، نا ببوورن، تێک نەچووم. تووڕە بووم. ئەوە هیچ داد پەروەرانە نیە. ئەوە نەبێ، خوا کارەکانی دیکەی باشن. ئینشەلاٌ لە گوناهانم خۆش دەبێ. بەلام ئەو کارەی هیچ باش نیە. لە جیهاندا مرۆڤ هەبوون، کە نەدەبوایە بمرن. ئەو چیایانە دەبینن، قەت نامرن. ئەوانیش وەک کێو بوون. وەک کۆڵەکە قاچیان وەبەر ئاسمانێ دەدەو رایان دەگرت. ئاخ... ئەی خاکی لەعنەتی ! منیش پێت پێدادەدەم. تۆ دەتوانی کەسانی ئەحمەق وترسەنۆک و ناسک نارنجی و ئەخلاق دزێو و هێ ئاوا، قوت بدەی و ورگی خۆتیان پێ پڕ کەی. بەلام ‹لیپاپیس› و‹کاستانیاس› و‹پێش نوێژی دێری نوتردام دمبرت› وکوستاروسی› کوڕە گەورەی من نا.!

پیرە مێرد لە گەڵ ئەم قسانە لاقی بە عەرزی دادار دوو دڵۆپە لە چاوەکانی دەرژانە خوارێ . تراساکی دەستی گرت و گوتی:« بابە گەورە سفرە ئامادەیە. لاوی یونانی برسیەتی. »

پیرە مێرد داهاتەوە. دەستی نەرم و فێنکی تەوەکەی لە سەر پێستی گەرمی خۆی هەست پێکرد و گوتی :

- رۆڵەکانم ببوورن.من رۆیشتوەکانم وەبیر هاتەوە، تێکچوم. بەلام خۆمان هێشتا زیندووین، وانیە !کە وایە بچین نان بخۆین.

ئەوەی گوت و چوار مێردەکی لە عەرزی دانیشت. مێزی پێچک کورتی کێشا پێش خۆی و میوانەکەی. تراساکیشی لە کن خۆی دانا و گوتی : بە خێر هاتی هاوشاری. هیوادارم هەمیشە یەکتر لە خۆشیدا ببینین.قاپەکەی میوانی پڕکرد لە خواردن.

* * *

پاکیش و هاواڵەکانی لە رۆخی دەریا وەنیزیک دەکەوتن. شنەبای دەریا وردە وردە ریشوی پێچەکانی دەلەراندەوە. هەموویان لە خۆشی ئەوەی کە ئێستا باری پاپۆڕەکە خاڵی دەکەن وتفەنگ و ئازوقەو خواردەمەنی کە بۆ شۆڕش هاتبوو، لە ئێستراتی با ر دەکەن، وەسەما کەوتبوون. لە بەر ئەوان بوو کە یونان ئەو چەک و ئازوقەی دەنارد. بەلام داخوا ئەو دیاریە ئەگەر لە کاتی ئاشتیدا هاتبا، ئەو تامو چێژەی دەبوو.؟ لە بارەی ژنیشەوە راست وایە ئەگەر پیاوێک دڵداری خۆی بە

زۆری نەرفینێ تامی چیە؟ ئەگەر خێزان بتوانن بووک برازێننەوە و سفرەی بوکێ پاتراکەن، تامی نیە. گۆشت ئەگەر بە دزی وەگیر نەکەوی بێتامە. سەردەمێک دڵدار سواری ئەسپ دەبوو، دڵبەرەکەی دەرفاند. ئەویش گۆیا دەستی دەکردەوە، بەڵام دەبهاریشتە پاشتەرکی خۆی، وەک تیر بەرەوماڵی دەبرد. کاتی غاردان چەند تفەنگێش بە حەواوە دەنا.پاپۆری ستیفانیسی رەنگر توانیبوی‌لە تارێکی شەودا گەرۆکی دەریایی تورکان فریو بداو خەتی‌گەمارۆ بپرێ ولەلەنگەرگای دووره دەستی « سنت پلاژ » لە پەنا گاشە بەردی گەورە لەنگەر بگرێ.

دەریا ئارام بوو. جوتیارانی گوندەکانی دراوسێ، هێشتا نەیانزانیبوو کە پاپۆرێکی‌پر لە چەک و ئازوقە لە رۆخی مڵکی ئەوان لەنگەری گرتوە. ستیفانیسی پاپۆروان کاتی تەواوی هەبوو کە بە سلامەتی بارەکانی خۆی خاڵی بکاو لە سەر تەختە بەردەکانی رۆخی دەریا دایان بنێ.

ئەوێ رۆژێ هەتاوی نەرم و خۆشی پایزێ هەڵاتبوو. داهیای دەریایی بە سەر پاپۆرەکەدا دەفرین و یا لەسەر گاشە بەردان دەنیشتن و سەیریان دەکرد. ستیفانیس بە شەلە شەڵ بە سەر بەرداندا هاتو چۆی دەکرد. پەیکەری «سن‌نیکولا»ی لە پاپۆر هێنابوە دەر و روو بە دەریا لە سەر بەردێکی دانا بوو. تا هەم گەرم بێتەوەو هەمیش ئاگای لە پاپۆرەکە بێ. بە سەر بەردەستەکانیدا گوڕاندی و گوتی :

. کوڕینە تا تورک پێ‌یان نەزانیبوە تاڵوکەی بکەن. لە مەسیحیەکانیش خۆ بپارێزن. ئەوان تاڵانمان دەکەن. من پتر لە مەسیحیان دەترسێم. بە هیوای خودا ئێستا سەروشوێنی پیاوەکانی پاڵەوان میکێلس پەیدا دەبێ. یەکێک لە هاوڕاڵەکانی کە لە سەر بەردێک دانیشتبوو، بە دەست سوارەکانی نیشاندا کە دەهاتن. گوتی: ئەوەتا گەیشتنێ. ستیفانیس ئاوڕی دایەوە ، باکێنشی ناسی، دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی :« ئاخ ... باکێنشی من ! ئاخرەکەی تۆش بووی بە شۆڕشگێڕ ؟»

بادکش خۆی لە ئێستری فڕێدا خوار وستیفانیسی لە ئامێز گرت و گوتی :« قەزاو قەدەر وای دەویست. » پاشان درێژەی پێدا : چەندە بە وەخت هاتوی برا. ئیتر ئازوقەمان نەمابوو. وردە وردە برسیەتی لە کاری دەخستین. بە راستی هەزار کەرەت بە خێر هاتی. ستیفانیس بە پەلە بوو، گوتی : کوڕینە تەردەستی بکەن. من دەبێ تا شەو دانەهاتوە بگەرێمەوە . جارێک .بە شەو دەگیر کەوتووم، ئیتر بەسە. باڵا زووبن، هەروا بزانن بۆ دزی هاتوون.

باکێنش دەستێکی لە شانیداو بردیە ئەولاو بە سرتە پێی گوت:

. پاڵەوان میکێلس سڵاوی دەگەیاندی ودەیگوت : ئەگەر پەیامێکت بۆ هێناوە، بە منی بڵێ تا پێی بڵێم.

ستیفانیس سەری خوراندو گوتی : پەیامی چی ؟

. تۆ دەتوانی بڕوا بە من بکەی. دڵنیا بە جگە لە پاڵەوان میکێلس کەسیتر لێم ئازانێ.

ستیفانیس داهاتەوە بەردێکی هەڵگرتەوەو دە دەریای هاویشت. هەروا بێدەنگ بوو. ئاخرەکەی قیروسی کرد و گوتی :

. گوێ بدەیە باکێنش! دەزانم دەفەی باش لێدەدەی. بەڵام ببورە، من بڕوا بە زارشری تۆ ناکەم. تۆ کە پیاڵەیەکت زیاد خواردەوە.....باکێنش هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی:

. ئاخ ... ستیفانیس ! ئاخر من لەو بەردەلانەی پیالەی زیادی لە کوێ پەیدا دەکەم.؟ دڵنیا بە . لێرە بەندەی خودا گشتیان بە رۆژوون، چونکە هیچیان نیە بخۆن.

پاپۆڕوان تەماشایەکی کرد، پێستی لەشی لەبەر هەتاو سوتا بوو.ملی باریک ببوو. مێشکی تازەی لە چاواندا دەدرەوشا و پێوەندی بە سەر خۆشبەرە نەبوو. دەنگی ئەوی کردەوەو گوتی :

باش گوێ بدەیە باکێش. هەرچی پێت دەڵێم لە بیری مەکە.بۆ پاڵەوان میکێلس بگێڕەوە. بەلام چت پێدەڵێم، دەبێ هەر ئەوی بگێڕیەوە. هیچی لێ کەم و زیاد نەکەی.

. دڵنیا بە پاپۆڕوان .. قسە بکە .

. پێی بێژە دەنگ و باس خۆش نینە. من چوومە ماڵی پیاوە گەورەکان. لە گەڵ کەسانی گرنگ دوام. تکام لێکردن کە راستیم پێ بڵێن. پرسیارم کرد کە داخوا ئەم هیوایە هەیە کە کریت ئازاد بێ. یان ئێمە ئەو هەموو رەنج و زەحمەتە بە خۆڕایی دەکێشین. هێندێک سەر بەستە وەلامیان دەدایەوە. هێندێ قسەی بێ جێیان دەکرد. تەنیا کەسێکی لام وایە لە هەموان زاناتر بوو، رک‌وراست وەلامی دایەوە . بزانم دەزانی ئەو کەسە کێ بوو.؟ ئەو برازای پاڵەوان میکێلس بوو. بە پاڵەوان بێژە، کەساسێ برازای پێش چەند رۆژ لە سپا لە کەشتی دابەزیوە. لە ئوروپا گەراوەتەوە. بە منی گوت :ستیفانیس غیرەتت هەبێ. ئەم جارەش ئازادی وەدەست نایە.! من لێم پرسی:« کەوابوو ئەو خوێنانە بە خۆڕایی دەرژێن؟» ئەو گوتی:

. خوێن قەت بە خۆڕایی نارژێ. چما نازانی ئازادی تۆڕێکە نەک بە ئاو، بەڵکوو بە خوێن ئاو دەدرێ. ئێستا ئێمە خەریکین ئەم تۆیە بە خوێن ئاو دەدەین. دڵنیا بە کە رۆژێک لێی سەوز دەبێ. بەلام ئەو رۆژە هێشتا نەهاتوە .»

پاشان نامەیەکی لە گیرفانی هێنا دەرو دای بەمن گوتی : « بە پیاوێکی باوەر پێکراودا بیگەیێنە دەستی پاڵەوان سیفاکاسی باپیرم. » هەر ئێستا لاوێکی یونانی کە لە پاپۆڕدا لە گەڵ من بوو لە رێگا دایە. ئەویتر پاڵەوان میکێلس دوای خوێندنەوەی نامەکە خۆی دەزانێ.

باکێش سەری بەردابۆوەو گوێی هەڵخستبوو. بە تورەیی ورتکە بەردەکانی رۆخی دەریای پێکدادەدا. کاتێ ستیفانیس تەواو بوو، هەڵچوو. بە چاوی بە ئەسرینەوە گوتی: « کەوابوو خودا هەر نیە. لەم بارەوە تۆ بیروڕات چیە پاپۆڕوان ؟»

. لە عنەت لەمن .. دەتوانم چ بێژم .! من تەنانەت نازانم ئەسڵەن سن‌نیکولا یەک هەیە یان نا. تۆهاتووی لە بارەی خوداوە لە من دەپرسی؟ هەر ئەو سن نیکۆلایە لەوانەیە هەبێ و لەواتەیە نەشبێ. ئەوە تاقە شتێکە لە ماوەی خەبات لە دەریادا فێری بووم. زەینی خۆت بە بوون و نەبوونی خوداوە خەریک مەکە. با بزانین چۆن دەبێ.

خۆر دەهات نەوی دەبوو. رەنگی دەریا بەرەو لێڵی‌دەچوو. باری کەشتی بە تەواوی بە تاڵ دەکرا. تفەنگ و فیشەک و پێست و ئانارد و ماسی وشک کراو کە هەموویان نیعمەتی خودا بوون، لە ئێستران بار دەکران. دەبوایە بەهەشتی کریتیەکان لەو نیعمەتە تەژی بێ. ستیفانیسی خاوەن پاپۆڕ لە کاتێکا سلاوی لە دە پیاوی شەرکەر دەکرد گوتی: «کوڕینە من دیسان فیشەکی باش و ئازوقەی چاکتان بۆ دێنم. » پاشان سێراو بە شەلە شەل رایکرد پەیکەری سن‌نیکۆلای لە سەر بەردێ هەڵگرت. دەئاوێی هەڵکێشا تا لێنک بێتەوە. پاشان هەرتک دەستی پەیکەری ماچ

کردو گوتی :

- لەم کاتەوە کە هاتووینە ئێرە، ئەرکی خۆت چاک بە جێ گەیاندوە ! ئافەرین پاڵەوان نیکۆلاّ ئێستا وەک پیاوان لە رۆیشتنیشدا رومان سپی بکە. من نەزرم لە خۆگرتوە سوێندبە ئاوی دەریابە دەستی‌قەشەکانی دێری‌«مون ئاتوس»وێنەیەکت لێ بکێشم کە بە شاڵواری کورت و پەپاخی رەش و دووربین بە دەستەوە پاپۆڕی «میائوس» داژۆی. هەر چۆنێک بێ نیکۆلای پاپۆڕوان و کەشتی «میائوس» هەر تک یەکن. ئەوەدەم ئیتر خۆشم ئاسودە دەبم.

ئەوەی گوت و سوار بوو. هەورەکان لە ئاسمانێ لێک کۆ دەبوونەوە. زەوی تاریک دەبوو. بایێکی سارد هەڵبکردێ و دەریا دەهاژا. ستیفانیس دووربینی هەڵگرت و تەماشای پانایی دەریای کرد. چۆڵ بوو. نیشانەی خاچی کێشاو گوتی :

- کورینە لەنگەر بەردەن. بە ناوی خودا دەکەوینە رێ. تۆش سن‌نیکۆلاّ خۆت ئامادەی بزووتن بکە.

* * *

لاوی یونانی دوای خواردن و خواردنەوەی باش پاڵی وە چوار چێوەی دەرگا داو خەوی لێ‌کەوت. دەریا جەرگ و ریخۆڵەی هێنا بووتەدەرێ. هەوەڵجاربوو لە لوتکە چیای«کارپنیس»دەهاتە خوارو سواری پاپۆڕدەبوو. رشابۆوە، کەواکەی پیس کرد بوو. کاتی دابەزین لە کەشتی زەوی لە بەر چاوی دەسوڕا. سەرە گێژەی گرتبوو، کەللەی دەهات بتەقێ. بەلاّم ئێستا تێری خوارد بوو، چەند جامی شەراب پێدا کردبوو. لە تەویلەوە بۆنی پەینی بۆ دەهات، هەستی کرد کە هاتۆتەوە سەرخۆ بەیانی ئەگەرهەوای خۆش دەبوو، هاریدیموسی شوانی‌بابەگەورە دەیگەیاندە ئوردووی پاڵەوان میکلس.بە دڵنیایی لێی نوست.

لە گەڵکوو لاوی یونانی پرخەی هات، بابە گەورە تراساکی بردە بن دارە لیمۆی‌حەساری و داینا. ژنەکان لە کاری چێشت لێنان بیوونەوە و چووبوون بحەسێنەوە. لە بەیانیەوە هەستابوون، تاوێنک هەدایان نەدابوو. تاوتفاقیان دابوو بە حەیوانات ، هەویریان کرد بوو، نانیان پێوەدابوو، چێشتیان لێنابوو، جلیان شۆرشتبوو. ریئیو کیژی پاڵەوان میکلس خەریکی‌نامەیەکی‌درێژ بوو کە بای کراسوگئورگیس و بای ماستراپاس پێ‌یان دەنووسی. کاتی زانیبوویان کە لاوی یونانی دە چێتە ئوردوگا، بە دەرفەتیان زانیبوو تا نامە بۆ مێردەکانیان بنووسن. یەک دەینەراند و یەکیش دە پاڕایەوە. هەر تکیش لەعنەتیان لە سوڵتانی دەکرد کە بۆچی ئەومەلعونە ئازادی نادا بەکریت، تامێردەکانیان بگەڕێنەوە ئامێزی ژنەکانیان. ئاخیان هەڵدەکێشا.

حەسار چۆڵ ببوو، دەرفەت بوو کە بابە گەورە نامەی کەسایی نەوەی بکاتەوە و بیدا بە تراساکی بۆی بخوێنێتەوە. بابە گەورە نیگەران بووهەستی بە ناخۆشی پەیامەکە کرد بوو. چونکە ئەونەوە دووروڵاتیە جاروبار ئەگەرکارێکی‌گرنگ هاتباپێش نەوی وەبیر دەهاتەوەو نامەی دەنوسی. رەنگە کارێکی گرنگ بێ‌کە نامەی نوسیوە. سەری پاکەتەکەی کردەوەو گوتی:«تراساکی وەرە ئەم نامەیە بخوێنەوە. بەلاّم بە سەبرو لە سەر خۆ تا باشی تێبگەم.!»

نامەکە بە خەتی خۆش نووسرابوو، باش دەخوێنرا یەوە. تراساکی بە رەوانی دەستی کرد بە

خوێندنەوەی :« بابە گەورەی زۆر بە ڕێز و خۆشەویست! من ئێستا هاتوومەوە نیشتمانی‌باو وباپیرم لەوانەیە بەم زووانە بێمەوە کریت و دەستە بە ڕێز و پڕ لە شانازیەکانت ماچ بکەم.... »

پیرە مێرد سەری هەڵبڕی و گوتی:« ئاخ... ئەوەش پیاوێکی چاخان و ڕیا بازە. ئەوە چ جورە نوسینێکە؟ لە سەرە تاوە نەینوسیوە : هیوادارم سلامەت بی و ئەگەر لە منیش دەپرسی شوکر سلامەتم..» باشە قەیناکا. تراساکی درێژەی پێبدە.

. ... بەلام بەرلەوەی شانازی ئەوەم بە نسیب بێ، ناچار بووم ئەو نامەیەت بۆ بنوسم. تکایە دوای خوێندنەوەی بە پیاوێکی باوەڕ پێکراودا بۆ پاڵەوان میکلسی مامی بنێرە. زانیومە کە ئالای ڕاپەڕینی هەڵکردوە. جارێکی دیکەش لە چیا لە گەڵ تورکان کەوتۆتە شەڕ. باشە من لە کارەکان ئاگاداری دەکەم تا ئەو بزانێ چەکا و دەچێتە کوێ. ئەو دەم خۆی دەزانێ و خوا چۆنی وەبەرینێ باوابکات....پیرە مێرد گوتی چەندە زۆر بڵێیە...باشە ... درێژەی پێبدە ...تکایە نەختێ سەبرتر...

.....بەڵێ یونان جێگای هومێد نیە. یونان لاوازەو هیچی نیە. کەلوپەلی شەڕی نیە. بە دەوڵەتە ئورووپاییەکانیش پشت ئەستور نیە. کریت پارویەکی نەرم و چەورە. دەوڵەتە گەورەکان بەرژەوەندی خۆیان لەوەدا دەبینن کە ئەم پاروە لە قاپی سولتان دابێ. کاتێ سولتان تەقی و سامانی ئەویان دابەشکرد، هەریەک بە هیوایە کریت بەو ببڕێ. بەلام ئەگەر کریت بۆ یونان بگەڕێتەوە. ئەو دەم نەخوداو نە شەیتان‌هیچیان ناتوانن ئەم دواتە لێک جیا بکەنەوە.... »

پیرە مێرد هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی :

. های... ئەم ئەوەیەم فرە زوو تێگەیشتوە ... باشە.. پاشان ؟

..... بەڵێ .. بزانە کریت ئەمجارەش دەشکێ. ئێستا تاقە ڕێگایەک لە پێشە، ئەویش ئەوەیە لە گەڵ سولتان وتوویژ بکرێ و هێندی شتی لێ وەر بگرین .دیارە ئەوە ئێستاکێکە دەبهارێنە پێشمان. بەلام بروکە گۆشتێکی پیروایە، تا گەیشتن بە ئازادی دەبێ بیکروسێنەوە..... »

پیرە مێرد هەناسەیەکی تریشی هەڵکێشا و گوتی :« کەوابوو ئێمە بووینە سەگی برسی، بێجگە لە ئێسقان هیچی ترمان بۆ فڕێ نادەن..». باشە .. درێژەی پێبدە ....

. .... من لە یونان و لە ئورووپا لەگەڵ کەسانی ڕەسمی باسم کردوە. سبەی دەچمە ئاتێن تا لە گەڵ سەر زلەکان پێوەندی بگرم. ئەگەر پێویست بێ دێمە کریتیش‌تا یارمەتیتان بدەمو ئەوەی دەکرێ نەجاتی بدەین، پێکەوە رزگاری بکەین. بەداخەوە ئەمجارەش قەڵەم بە سەر شیری دا سەر دەکەوێ. شیروەشێنەکان ئەرکی خۆیان بەجێ گەیاندوە و ڕێگایان بۆ قەڵەم کردۆتەوە. بەلام نەیانتوانیوە تا ئاخر برۆن. ئێستا بابە گەورەی هێژا خەمگین مەبە و بزانە لە مەو دوا قەڵەم بە دەست دێنە مەیدان.... »

بابە گەورە وەک برشێتەوە تفێکی لە عەرزی کردوگوتی :

. ئاخ..ئاخ..ئەو کاغەز ڕەش کەرەوانە... ئەو چاویلکە لەچاوانە..ئەو دوولینگ لەپێ و شەبکە بەسەرانە کە لیباسیان کلکی هەیە ؟ تف ...تراساکی تەواو بوو یا شتێکی دیکەشی نوسیوە ؟

. تەنیا خەتێکی دیکەی ماوە بابە گەورە .

. ... لە بەرامبەر تودا ئەی بابە گەورە سەری ڕێز دادەنوێنم و دەستەکانت ماچ دەکەم .دوعای

بە خێرم بۆ بکە .. ئەوەت کـساس ...»
پیرە مێرد سەری بەردایەوە. شتێکی لە سینگی دابوو دەینالآند. چاوی لە سەریەک دانان و گریتی لە بەرامبەر خۆیدا دیت کە رەشپۆش و داماو و خوێناوی لە حەساریێ وێستاوە.داخوا ئەوە گریت بوو، یا مریەمی پاکیزە بوو کە لە سەیری لە خاچدانی کورەکەی گەڕابۆوە؟ چاوی هەڵێنان. شەوداداهات و باران دابابوو. کیژۆڵەی گەنج بە قاوقیژ کارویەرخیان لە مەزرایە دەهێناتەوە. ئەو پیرە مێردانەی کە بە بارە دارەوە لە دەشتێ دەگەرانەوە کە دەیان بینی دەرگای ماڵی پاڵەوان سیفاکاس ئاوا لەیە، تاوێک رادەوەستان، سلاوێکیان دەکرد و دەیان پرسی :
. چۆنی پاڵەوان‌سیفاکاس ! دەنگوباسی کورەکەت چیە ؟ لە وەلآم دا دەیگوت:
. سوپاس بۆخوا بە کەیفی ئێمەیە و بەو زوانە ئازارو رەنجی گریت کۆتایی پێ دێت . پیرە مێرد رووی کردە تراساکی و گوتی :« تراساکی تۆ ئێستا رازێکت لە دڵی دابێو نابێ دەری بپەی. تۆ ئێستا بۆ خۆت پیاوێکی .»
. دڵنیا بە بابە گەورە. بێجگە لە من و تۆو باوکم کە دەبینە سێ کەس، هیچ کەسێتر نایزانێ. بابە گەورە گوتی :
. خوداش دەیزانێ، کەوابوو دەبینە چوار کەس.!
* * *
لەو کاتەدا کە ئەوەو بابە گەورە پێکەوە دەدوان، چس‌گورک بە رووەمەتی سوورو داردەست و کۆڵە پشتێکەوە لە بەر دەرگا سەری هەڵدا. بابە گەورە پاڵی وەدار لیمۆ دابوو، باران تەری کردبوو، دڵۆپەی بارانە بە ریشبەوە بریقەیان دەهات. وەک پیرە دارێک لە بەر باران وێستابوو، نەدەبزووت. لە پێشدا کورەکەی نەناسی. چونکە چس‌گورک رەنگی پێستی قاوەیی ببوو،ئەدی پشت کورپەکەی چی لێهاتبوو.؟ پیرە مێرد سەری هەڵێناو گوتی :
. ئاخ ... پاناکوسی لەعنەتی ئەوە تۆی؟ بەراستی چەند گۆراوی. سوپاس بۆ خوا، ئیتر تۆ ماموستا نی. وەرە بزانم .!
ماموستا بە رەنگ و رووی کراوە، چوە پێش و گوتی: سەیرە بابە، چۆن منت نەناسی؟
. چۆنت بناسم. دیارە تۆ دەستت لە دەرس و کتێب هەڵگرتوە و توانیوتە ئەو مل و رووەمەت و شان وشپیلکە پەیدا بکەی. من بە تۆم دەگوت کە پیتی ئەلفوبێ وەک زەروو وانە. بەڵێ ٢٤ زەروو، خوێنی مرۆڤ دەمژن..منیش ئێستا کە پیر بووم، دەمەوێ قبری ئەلفو بێی لەعنەتی بم. ئەو بێ پیرانە وەگاشە بەردی سەر چیا دەچن. ئەگەر بەوێ لە سەر یەکیانەوە بۆ سەر ئەوی تر بازد دەم‌سەرم دەشکێ. دیارە من لەوەدا مەبەستێکم هەیە. تۆ چۆنی ؟
چس‌گورک بزەیەکی هاتێ و دەستی باوکی ماچ کردو بە کەیف گوتی : «بابە هەموو خەتای تۆ بوو من بوومە ماموستا. لە بیرتە ؟»
. چۆن لە بیرم نیە؟ تۆ پێت وایە من منداڵ بوومەوە. وام لە بیرە هەر دەڵێی دوێنێ بوو. فانوریوسی برات بە سەرت دا هاتبوو کە پارەوە گۆشتێکت دزیبوو دەتخوارد. مستێکی لە پشتێ دابووی، گۆشتەکەت لە زاری دەرپەڕیبوو وەدیواری کەوتبوو. لە بیرمە کە ئەوەم بینی، ملی تۆم

گرت و گوتم : «برۆ پاناکوسە فەقیرەکەم، برۆ شرە وبرەی خۆت کۆ بکەوەو بچوو لە شاری دەرس بخوێنە تا ببی بە ماموستا. چونکە بە کاری هیچیدیکە نابەی. بەڵێ ئاوا بوو،راست دەکەی خەتابوو»

پیرە مێرد چس‌گورکی دەسوراند، دەستی لە پاسکی دەداو دەستەکانی دەگوشی. وەک تەماشای زاری رەشەولاخی بکا، زاری لێک دەکردەوە، تەماشای دانی دەکرد و پاشان لە خۆشی ئەو تەماشا کردنە گوتی :

– بە راستی وردە وردە تۆم خۆش گەرەکە.من ناڵێم تۆ منداڵی من نی، هەی، خۆشیشم دەویستی. بەلأم نازانم بڵێم چی! خۆشم گەرەک نەبووی. تۆ زەلامێکی قۆڕ دەماخ و کوڕ و نالەبار بووی لە نێو خێزانی‌ماڵێدا ئەندامێکی ناجوربووی. تەماشای رابردووی بنەماڵەی خۆم دەکەم گشت باو وباپیرمان شاڵواری راو وچەکمەیان لە بەر دەکرد. تفەنگیان دە شانی دەکرد بەلأم تۆ..؟ تۆ وەک فەرەنگیان جلت لەبەر دەکرد. چاویلکەت لە چاوی دەکرد، قەڵەمت بە دەستەوە دەگرت. بە خۆم دەگوت : ئیتر کارمان تەواوە. خوێنی بنەماڵەمان پیس بوو. بنەماڵەمان فەوتاوە. بەلام ئێستا دەبینم کە تۆ خۆت نەجات داوە. لە کوێرە ڕێ لات داوە، هاتوویەوە سەر رێگای بنەماڵە خۆمان. سوپاس بۆ خودا. سوێند بە ناوی خۆم، ئەگەر بە شاڵواری ڕاو وچەکمەو تفەنگەوە نەت نێرمەوە دەری، ئیتر سیفاکاس نیم. دەزانی ؟ بۆ پێدەکەنی؟

. چونکە باوکە تۆ پێغەمبەرێکی بە راستی‌و دەتوانی ئەوەی بە مێشکی خەڵک دادێ، بیخوێنیەوە. سوێند دەخۆم کە ئەم شەو هەر بۆ ئەو مەبەستە لامدا ماڵی تۆ. پێم وایە دەستێک جلی خۆماڵی لە جلەکانی خۆت، یا هی کوڕە شەهیدەکانت بۆت بەجێ ماون. لە پشت ئەم تاڵوردارانەش تفەنگت هەیە. من هەر بۆیە هاتووم. ئێمە پێکەوە هەر وەک لە جێژنی پاک پەهودا دەسورتێنین، ئاواش جلە فەرەنگیەکانم دەسورتێنین. من جلی کریتی دەکەمەبەر، تفەنگ دەکەمە شانم وروو دەکەمە چیا. منیش بۆ خۆم نەخشەیێکم هەیە.

پیرە مێرد سەری کورەکەی بە سینگیەوە ناو گوتی :

– خێرت بێتە ڕێ کوڕم. من ئەم شۆ بە شانازی تۆ کیسکێک دە کوژمەوە. ئەم شۆ جێژنی ئێمەیە. من پێم وابوو تۆ بە جارێک فەوتاوی. بە راستی بە خێر هاتی پاناکوسی من.

پیرە مێرد خەم و خەفەتی نامەی ئەوەکەی لە بیر بردەوە. سندوقێکی‌گەورەی کردەوە، دەستێک جلی هەرە باشی خۆماڵی‌وەک: سوخمەیەکی گوڵدرزی کراو، شاڵوارێکی ماهوت، پشتێندێکی پارچەی کەتانی و پەپاخێکی تونسی، جوتێک چەکمە و تفەنگێکی هێنا دەر و هەمووی لە سەر سندوقەکە دانان تا سبەی شەو کورەکەی وەک تازە زاوا لەبەریان بکات.

خۆشی کەوتبوە نێو ماڵەکەوە. دەنگۆ بلأو ببوو کە تورک ماموستایان بە تاوانی گەران لە گوندەکان و هاندانی خەڵک بۆ راپەرین، گرتوە و بردوویانە. دەیانگوت وەک بەرخێک بە شیشەیەوە دەکەن. بەلأم راست نەبوو، ماموستا حاڵی زۆر باشبوو لە گەڵ باوکی کەبابی دەخوارد و شەرابی پێدا دەکرد. هەموش سەیریان دەکرد. تراساکی ئەوەندەی پێ سەیر بوو خواردنی لە بیر چوبۆوە. بە سەر سورمانەوە تەماشای ماموستای دەکرد. داخوا ئەوە هەرئەو کەسە بوو کاتێک ورتکە بەردێکی دەهاتە سەر رێگا دەکەوت و چاویلکەی دەشکا. ئەگەر مشکی دیتبایە لە ترسان

دەلەرزی ؟

بابە گەورە بە تراساکی گوت:

ـ تراساکی تۆ ئیتر بچو بخەوە. من دادەنیشم لەگەڵ مامت قسان دەکەم. جگەلەوەش تۆ ئیتر بە ناوی ماموستا بانگی نەکەی. تێگەیشتی؟ ئەشێ بڵێی : مامە پاناکوس !

کاتێ باب و کور بە تەنیا مانەوە پیرە مێرد پرسی :« باشە ژنەکەت چی بەسەر هات؟ دەڵێن خۆی کوشتوە، لە سەر چی؟ دەتوانی هۆی ئەم کارەساتە م بۆ روون بکەیەوە ؟ من لە خەڵکی دیکەشم پرسیوە، بەڵام وەڵامی تەواوم وەر نەگرتۆتەوە.»

ـ ئاخ .. خوا بیبەخشێ. ئەو ژنێکی زۆر تۆسن و توند بوو. ئێستا ئیتر حەساوەتەوە.

بابە گەورە گوتی:

ـ کارێکی باشی کردوە . ژنێکی بە غیرەت بوە. خۆکوشتن هەروا کارێکی هاسان نیە. غیرەتی دەوێ. بەڵێ، بە راستی حەساوەتەوە. بەلام من پێم وایە تۆش ئاسودە بووی. ئێستا تەختەت چیە؟ ئاتەوێ دووبارە ژن بێنی؟ ئاتەوێ نەوەیەکی پچکۆلانە بۆمن دروست بکەی؟ تاڵوکەی بکە، چونکە لاقێکم لە سەر لێوی قەبریە .

ماموستا گەشایەوە گوتی:« بە راستی سەیرە. هەر چەندی لە مردن وەتیزیک دەکەوی، ئەوەندەش ئەبەدی دەبی بژی. بەڵام تۆ دووەمین هۆی هاتنی منت زانی ؟»

ـ کە وابوو بێژە . لەوانە یە دڵت کیژێکی گرتبێ ؟

ـ بەڵێ بابە ... کیژێک هە یە دڵم گرتو یە. هاتوم بیروڕای تۆ بزانم.

ـ باشە ناقۆلا ...ئەو کیژە کێیەو چۆنە ؟ زەلام و چوار شانەیە ؟ بە بەژن و بالایە؟ سینگێکی پان و پۆری هەیە ؟ ٣٢ددانی ساخن.؟

ـ بەڵێ بابە ... باشە .. ٣٢ددان و رەنگە زیاتریش بن !

ـ نا رۆڵە زیاتر بە قازانجت نیە . چونکە ئەو دەم سوارت دەبێ. خودا خۆشی گەرەک نیە کە هیچ شتێک لە رادەی خۆی زیاتر بێ. ٣٢ ددان بەسە باشە.. ئێستا بێژە بزانم کێیە و لە کام بنە ماڵە یە ؟

ـ ئەو یەک لە نەوەکانی پاڵەوان ئەلیاسە. ناوی ‹پلاژیا›یە. هاتوم تا بیروڕای تۆ بزانم.

ـ ئاخ... ئافەرین پاناکوس. دوعای خێری منت لە گەڵبێ. بەرە بابی پاڵەوان ئەلیاس بەرە بابێکی بە هێزو بە بەرەکەتە. کوروەنەوەی زۆریان هەیە. کیژەکە پێت رازیە ؟

ـ خۆی رازیە، لە گەڵ باوکیشی دواوە. باوکی‌گوتویە :«دەبێ پیرە مێرد رازی بێ،سەرۆکی بنەماڵەیە.» مەسەلەکەیان بە پاڵەوان‌ئەلیاس گوتوە. لە پێشدا خۆی گرژ کردوە. گوتویە : ها...ئەو ماموستایە دەڵێن، من دەیناسم. ئەو لوت بەرزێکە. بەلام لە بنەماڵێکی باش و بە هێز وپر بەرەکەتە. کور و نەوەو رەز و باخیان هەیە.راست ئەو قسانەی کردوە کە تۆ ئێستا لە بارەیْ ئەوانەوە دەتگوت. پاشان گوتویە : ماوەیەک راوەستن تا بیری لێ بکەمەوە. بەلام کیژەکە ئەوەندە خۆی شیرین کردوەو تاوی داوە تا پیرە مێردگرتویە: «زۆر باشە رازیم و دوعای بە خێرت بۆ دەکەم. بەلام بەو مەرجەی کە جلە فەرەنگیەکانی فرێ بدات وجلی ئێمەکانتان بکاتە بەر.»

پاڵەوان سیفاکاس دەستی لێکدان و گوتی :

ـ خوا بتپارێزێ پاڵەوان ئەلیاس! منیش لەم جلە فەرەنگیانەی تۆ بێزار بووم. بەڵام پێم نەدەگوتی. جلەکانت داکەنەو بیانخە نێو ئاگر. بەیانی زوو لە حەساری ئاگریان تێ بەردەدەین.

ماموستا لە پەنا ئەو سندوقەی کە جلی زاوای تێدا بوو، شەوێنکی خۆشی کردەوە. خەوی بە ‹پلاژیا› وە دەبینی. نەیدەویست وەخەبەر بێت. بە پێچەوانە، بابە گەورە خەوی لێ نەدەکەوت. تەماشای فتیلەی دەکرد و چاوەڕوانی کازیوەی بەیان بوو. خوا بەزەیی پێداهات و کەڵەشێری بەیانی خوێندی. وردە وردە بوو بە ڕۆژ. پیرە مێرد لە جێ ڕابوو، لاقێنکی گەیاندە چس‌گورک و گوتی: «هەستە کورم.جلی زاوایی تۆم لە سەر سندوق داناوە. جلە فەرەنگیەکانت بەرە حەسار، ئێستا دەچم ئاگری دەکەمەوە.

ئەو هەمیشە لە ئوروپاییان بێزار بوو. بەڵام نامەی کساسی ئەوەی بێزاریەکەی کرد بوو بە تورەیی. لە پلیکان چوە خواری و ئاگری کردەوە ، پاشان چوو تراساکی وەخەبەر هێنا ، گوتی :

ـ ڕابە تراساکی ! با بچینە حەساری، دەمەوێ ‹بەهودا›ی ئاگر تێ بەردەم. ماموستا کە جلی کریتیانی لەبەر کرد بوو، شاڵوار و جلیتقەو کۆت و کڵاو وکەوشی خۆی لە نێوەڕاستی حەساری داناو ئەوتیان پێداکردن تا سەعاتێک زووتر لە بەین بچن. پاشان پیرە مێرد ئاگرێنکی دا دەست تراساکی و گوتی: «وەرە ڕۆڵە ئاگریان تێ بەردە . ئوروپا ئێمەی ئاگر تێ‌بەرداوە. ئێمەش ئەو دەسوتێنین وەبەر یەک کەوێ..».

تراساکی ئاگرەکەی بردە بن جلە ئەوتاویەکان و گڕیان لێ هەستا. ئوروپا ئاگری گرت.سەرورووی ئەو سێ کەسە گەشایەوە. لاقی پرەمێرد تەزوویان پێدا دەهات و دەیویست سەمایە بکات. هەرسێک دە ئاگری ڕامابوون و سور هەڵگەڕابوون. کاتێ ئاگرەکە دامرکا، پیرە مێرد مستە خۆڵە مێشێنکی هەڵگرت و دەرگای حەساری کردەوەو بە بایدادا و گوتی:

ـ ئەی فەرەنگیە لەعنەتیەکان ! هیوا دارم ڕۆژێنک کورو نەوەکانتان بە چاوی خۆیان ببینن کە خانو وکارخانەو کۆشکی پاشاکانتان ئاوا ئاگری گرتوەو ئاوا بۆتە مشکی و خۆڵە مێش. ئاخ ئەی فەرەنگیە مەلعونەکان، هەروەک ئێوە ئاگرتان دە ئێمە بەردا، خۆشتان ئاوا ئاگرتان تێ بەربێ.

* * *

دەوروبەری نیوە ڕۆ میتروسی لاو کە لە بەر هەورازی چیا ئارەقەی دەڕشت. گەیشتە ئوردوگای پاڵەوان میکێلس. ئەم ئوردوگایە دەشتێنکی بەرز بوو، لە گەڵ دە دوازدە کاولی‌بەرد سەت کەسی لێ دامەزرا بوو. لە خوارتر چەند گوندێک هەبوون، هێندێکیان دەسوتان و چونکە بای نەدەهات دوکەڵ لە هەوا وێستا بوو وەک هەور داپۆشیبوون.

پاڵەوان میکلس لە ئوزە کێشک وێستا بوو، بە دووربین دەیڕوانی. کابرایەکی فەرانسەیی دۆستی یونان ئەو دووربینەی دابویە. ئەو فەرانسەییە پێش مانگێک هاتبوە ئوردوگا و تەوەتەدەی وەزعی شەرەکان بە دڵبور بە پاڵەوان میکێلسی گوتبوو :

ـ بۆ کوێ بچم؟ بۆچی بچمەوە شار؟ من لێرە لای ئێوە دە مێنمەوە. من لە هیچ کوێ‌نانی واخۆشم نەخواردوە و ئاوی وا فێنکم نە خواردۆتەوە. لە هیچ کوێ یونانی ئاوام نەدیبوون کە ڕاست وە یونانیەکانی قەدیم بچن. من بە تۆ ناڵێم پاڵەوان میکێلس، پێت تێژم پاڵەوان ئاشیل. من

ناوم « ئەریکوهانری»یە. کلاوێکی وەک گومبەزی لەسەر بوو، وە کلاو خودی قەدیم دەچوو. گیرفانەکانی پڕبوون لە قەڵەم و کوتە کاغەز. کەم تا کورتیەک یونانی دەزانی. کاتێ کە لە گەڵ کریتیەکان دەدوا، هەمیشە یادداشتی هەڵدەگرت، کریتیەکان پێدەکەنین. یەک دەیگوت :«تەقەڵی لە سەر یەک نین»، یەک دەیگوت: « گیڕەی لە هەولێر دەگەڕێ» یەک دەیگوت : کابرا ڕۆژنامە نووسە . لێیان دەپرسی : «تۆ بۆچی بێ چەک دەگەڕێی؟» کوا تفەنگت ؟ کابرا قەڵەمی نیشان دەدا، دەیگوت ئەوەتا.!

، ڕوومەتی سوور و ریشێکی خورمایی هەبوو. دوو دانی پێشەوەی ئاڵتون بوون. چەند داوە تووکی بە سەریەوە مابوو وەک پزیەی کەڵە شێردەچوون. هەر بۆیەش کریتی ناویان نابوو قوقلیقو.

ڕۆژێکیان کە قارەمانانی پاڵەوان میکێلس لەشکری تورکیان پەلاماردابوو، ئەو بێگانەیەش بە بێ چەک بەدوایاندا لە چیا چوبوە خوارێ. هاواری دەکرد : هۆی پاڵەوان ئاشیل! پەلامار بۆ سەر دوژمن. تاو تاو قەڵەمەکەی لە گیرفانی دەر دەهێنا و شتێکی دەنووسی، کاتێک شەڕداهات و تورک شکان و فەلە بە تالان ودەستکەوتێکی زۆرەوە گەڕانەوە بۆ ئوردوگا . یەک لە کریتیەکان کە مرۆڤێکی توندو تیژ بوو، «قوقلیقوی» ڕەشیدی خۆش دەویست، خۆی گەیاندە کابرای فەرانسەیی و کەللە سەری تورکێکی بە دیاری دایە کە بەدەستی خۆی بڕیبووی. کابرا کە ئەو دیاریە سەیرەی دیت، هاواری کرد و لەخۆچوو. کریتیەکان قاقا پێکەنین. ستڵە ئاوێکیان بە سەری داکرد تا وەخۆ هاتەوە. دەتگوت مریشکی ئاوەرووت کراوی سەیرە. لەو کاتەدا پاڵەوان میکێلس گەیشتێ و لێیان تووڕە بوو گوتی:« رادەزانن هەموو کەس کریتیە ؟ ئیتر قەت گاڵتەی ئاوا لە گەڵ کەس مەکەن .!»

پاشان ڕووی کردە میستیگری و گوتی :« یاسکی ئەو فەقیرە بگرەو یارمەتی بدە با لە چیا سەر کەوێ.» کابرای کریتی کە سەرە تورکی بە دەستەوە بوو، دای لە قاقای پێکەنین و گوتی :« سواریی وشتر خۆ نەوی کردنی ناوێ» بۆ ئەو باشبوو کە ئەو کارەمان کرد.

لەو ڕۆژەوە «قوقلیقوی» فەقیر تای دەهاتێ و ڕۆژ بە ڕۆژ زەردو لاواز دەبوو.گۆشتی نەدەخوارد. خەونی ئاڵۆزی دەبینی. لە گەڵ یونانی دە قەدیم زیانی دژوار دەبوو. بڕیاری دا لەوێ بڕوات. ڕۆژێک کەباران دەباری، بۆ ماڵاوایی خواستن چوە کن پاڵەوان میکلس و گوتی :

. ئەی پاڵەوان ئاشیل !من یونانیە قەدیمیەکان بە پیاو دەزانم. بەڵام زۆر توندن. ڕەنگە بزانی من ماموستای کتابخانەم. من پیاوێکی باشم، بەڵام پیاوی کاغەزم. ئێوە لە گۆشت و خوێن دروست کراون. من پتر خۆڕاناگرم و دەڕۆم. ئەو دووربینەش بە یادگار لە من وەرگرە.

دووربینەکەی خستە ملی پاڵەوان میکلس و گوتی :

. تۆ فەرماندەی. ئەشێ لە سەربازانی خۆت دوورتر ببینی. پاڵەوان میکلس دووربینی گۆڕینی بە دەستەوە بوو، تەماشای دەشتێی دەکرد. وای هاتە بەر چاو کە لە پشت دوکەڵی خانووەکان، بەپاخ سوور جم وجۆڵیانە. دەستەی حەساوەی تورکان لە کاندیەوە دەگەیشتن وخۆیان بۆ گرتنی چیا ئامادە دەکرد، پاڵەوان لە بەر خۆیەوە گوتی:« ئەو سەگانە بنەیان نایە. زەحمەتە دەستیان بگاتە مەتەرێزەکانی ئێمە. بەڵام ئێمەش کەمین. پاڵەوان پۆلیکێنگیش دیار نیە، دەبێ بە

دوایدا بنیرم.»

لەوکاتەدا کە دووربینی لەسەر چاوان لابرد بوو، دەیویست بچیّ بزانیّ داخوا پاکیش گەڕاوەتەوە،یان نا؟ میترۆسی لاوی یونانی لە بەر دمی سەوزیبوو وتی:« سلاو پاڵەوان میکێلس! من لە پاپۆری ستیفانیسی‌کەشتیوانەوە دیم.» نامەکەی وەدەستی دا . پاڵەوان دەستی لاوی یونانی گوشی و گوتی:

. بەخێر هاتی هاوشاری . تامن ئەو نامەیە دەخوێنمەوە، بچۆ لای شەڕکەران. بە پەلە سەری پاکەتی هەڵپچری و کوتە کاغەزێکی لە گەڵ نامەکەی دیت کە خەتی کوڕەکەی بوو. تاوێک رومەتی گرژی گەشایەوە. تراساکی نوسیبووی :

. بابە سلاو! ئەم چەند وشەوە لە لایەن بابە گەورەمەوە بۆ تۆ دەنوسم . نامەکەی بخوێنەوە، هەرچی خوا وەبەری نای بیکە. هیچ هومێدێک نیە. ئەم جارەش بە خۆڕایی شەر دەکەین. تەگبیر بە دڵت بکە. بڕیاری پێویست بدە.

پاڵەوان میکێلس بزۆی تیک تانو بە بۆڵ بۆڵ گوتی : « بەد بە حاڵمان .. ئەگەر تەگبیر بە دڵم بکەم دنیا دەتەقیّ. پاشان نامەی براژای کردەوەو دەستیّ کرد بە خوێندنەوەی. جاروبار رادەوەستا. ناڵەیەکی لە گەروی دەهاتە دەر، دیسان دەستی پێدەکردەوە. کاتیّ نامەی خوێندەوە .پێچایەوە و سوتاندی و گوتی : تەنیا دەبیّ خۆم تێوەروکی بزانم، تەنیا خۆم. لە داخان تەلاشە بەردێکی لێکردەوەو خوێن لە دەستی هات. دیسان لە بەر خۆیەوە گوتی :

. هیچ هومێدێک نیە . دایک لاوازە. فەرەنگی بوکە شوشەن، کریتی ش فرە کەمن. قەی ناکا من لێرە نابزووم. بن ئەو گاشە بەردانە چۆڵ ناکەم. هەرچەندە دایک بیّ هێز بیّو فەرەنگی بوکە شوشە بن وکریتی کەم بن. هەرچەندە خوا خۆی لە ئاسمانەوە بێتە خوارو بڵێتەسلیم بە،تەسلیم نابم.

دیسان دووربینی بە چاویەوە ناو تەماشای خوارەوەی دەکرد. لە دەشتی پتر دەنگە دەنگ دەهات. تیپی تازەی تورک لە خروزلان سەریان وەدەردەنا. پاشا سوێندی خوارد بوو کە پاڵەوان میکێلس و پیاوەکانی لە هێلانەی هەڵۆ بێنێتە خوار و سەریان پیّ دانویّنیّ. گریت لە پیّ کەوتبوو، گشت گیانی بریندار بوو. کەم کەم ئارام دەبۆوە. دەنگی تەقەی تفەنگان تا دەهات کەم دەبوو. تەنیا چەند کەسی کەللە شەق نەیاندەویست خۆ بەدەستەوە نەدەن. بە چیارە نووسا بوون و مەتەریزیان خاڵی نەدەکرد. سوڵتانی وەسانی تورەبوو. قینی لە پاشا هەستابوو، پاپۆڕێکی پڕ لە زنجیری لەبۆ نارد بوو، فەرمانی دابوو، یاخیەکان بگریّ وزنجیر لە مل بیان نێریّ بۆ قوستەنتەنیە. ئەگینا زنجیر بکاتە ملی خۆیو بیّ.

پاشا فرە نارەحەت بوو، هەستی کرد کە سەری تورس بووە و بە سەر ملیدا دەکەویّ. بڕیاریدا دەست لە خەو وخۆشی کاندی هەڵگریّو خۆی سەرکردایەتی لەشکری بکا وبەرەو چیای رژدو هەڵدێر وەریّ کەویّ. بۆ ئەو نارچەیە کە پاڵەوان میکێلسی مەلعونی تێدادامەزراوە. خەلیفە کە بەوەی زانیبوو، بە دزی پیاوێکی نارد بوو، خەبەری دابویە:« رابکە .. لۆتکەیەک پەیدا بکەو خێرا خـۆت دەرباز کە. چونکە پاشا سوێندی خواردوە کە لە بەینت بەریّ.»

پاڵەوان میکێلس گوتبووی:« نەخێر من راناکەم. من گوناحێکی گەورەم کردوە.«دێر»ێک لە

دڵی من دایە، شەو ورۆژ دەسوتێ. ئەوە خەتای منە. من دەبێ کەفارەتی ئەو گوناحە بدەمەوە. تەنانەت ئەگەر ئەوانی دیکەش بڕزن . من لێرە لە بن ئەو گاشە بەردانەدا دەمێنمەوە. ئەوت بە خۆم دادەکەم و خۆم دەسووتێنم. تا وەک دیزی عیسای مەسیح دەسووتێم.»

بە دووربین تەماشای دەشتێی دەکرد کە پڕببو لە پەپاخ سوور. لە بناری چیا گوندی مەسیحیەکان دەسوتان. گڕنچکەی هەڵخست. بادەنگی تەپڵو شەیپوری بە گڕنچکەی دادەدا. هەروەها کە سەیری بستوی کێوەکانی دەکرد، لە بەر خۆیەوە گوتی:« پاڵەوان پولیکسبنگیس وە درنگی کەوت. دەبوایە بێ، بەڵێنی دابوو. ئێستا ئێمە لە شەڕداین. کاتی شەر بڕوای پێدەکەم.»

پاڵەوان میکێلس لەو کاتەوە کە ئامینەی کوشتبوو، هەستی دەکرد کە وردە وردە، دۆستایەتی کۆنی پاڵەوان پولیکسبنگیس لە دڵیدا زیندوو دەبێتەوە. ئێستا بە بێ قین و تەنانەت بە هەستی خۆشە ویستیش بیری لەوە دەکردەوە.

ناڵەو گریانی ئەڤینداری چارە رەش مارەیەک بوو لە گوندەکان دەنگی دابزوە. دۆستەکانی وریایان دەکرد ئەوەکو خۆی بکوژێ. سەرتاپێ رەشپۆش بوو. هەرلایەک شەری لێبایە رووی لەوێ دەکردو خۆی بە تورکان دادەدا هەتا بە کوشت بچێ، دڵنیابوو کە تورک ئامینەیان کوشتوە هەتا نەچێتە سەر دینی مەسیح.سوێندی خوارد کە لەسەر گۆڕی ئامینەی لە کەلاکی تورکان تەپۆڵکە ساز دەکات.

پاڵەوان میکێلس دەنگی سمی ئەسپان و هاواری شادی و خۆشی گوێ لێ بوو. چوە سەر بەردێک وتەماشای ئەو دەشتەی دەکردکە لە نێو چیاکان ئابلوقە درابوو. لەو کاتەدا باکێش و دەپیاوی چەکدار بە بارو بارخانەوە دەگەیشتنە جێ. چەکداری نوردوگا، تێکرا بەسەر ئێستران وەر بوون، تا بارەکان بکەنەوە. هێندێک بە پەلەئاگریان دەکردەوە تا چێشتێک ساز بکەن. دەمێک بوو جگە لە نانی وشک چێ دیکەیان نەخوارد بوو. بۆ جەمە خواردنێکی گەرم جەرگیان دەسوتا. بارەکانیان دەبردە نوردوگاو لە دیوی فەرماندەیان دادەنان. باکێش چەند دەمانچەی لە هەوا تەقاند و گوتی :

. کورینە سلاو لە دایکمان بکەین. ئەو دایکەی خۆی برسیەتی و بەم حاڵەش لە زاری خۆی دەگرێتەوە بۆ ئێمەی دەنێرێ،

پاڵەوان میکێلس بە تورەیی بە سەر باکێش دا ئەڕاندی و گوتی :

. فیشەکان بە خۆڕایی خەسار مەکە، وەرە ئێرە کارم پێتە. باکێش هات و پاڵەوان سەری بردە بن گوێی و دەستی پێکرد. ئەویش گوێی قوت کردبوون، لە سەر پەلجان دەسوڕا و دەتگوت خۆی بۆ رۆیشتن ئامادە دەکات.

. تێگەیشتی باکێش! ئەوە مەسەلەیەکی زۆر گرنگە. تێبکۆشە بەر لەوەی بگەیە مەقسەد نە کوژرێی. لە گەڕانەوەدا بشکوژرێی گرنگ نیە. باکێش بە پێکەنینەوە گوتی :

. دڵنیا بە پاڵەوان! من دەبێ کوپە شەراپان خاڵی بکەم و بەتاڵیشیان دەکەم .سوێند بە پاکیزەی پیرۆز لە گەڕانەوەشدا دڵت خۆش ناکەم. رووی بەرەو دەشت وەرگێڕا کە وەرێ بکەوێ. بەڵام میستیکری بۆی لە کەمین وێستا بوو. کاتی باکێش تێدەپەڕی، شاڵوارەکەی گرت و گوتی:« هاوڕێ باکێش ! تۆ برتولدوی ئاشنای منت بینی؟ ئەو فەقیرە حاڵی چۆنە؟ بڕوا بکە لە

ژنەکەم زیاتر لە بیری ئەو دام.»

. خەمێ مەخۆ. زۆرباشە. لە ماڵی سیفاکاسی پیر دیتم. زۆر بە کەیفبوو. دایمە لە نێو ژنانە، تەنیا کراسی ژنانەی کەمە.

. ئاخ .. باکیتشی خۆشەویست! ئەو ڕۆژە خۆشانە چی‌یان لێهات کە لە ژێر خانی ماڵی پاڵەوان میکێلس سەر خۆش دەبووین. تازە مەگەر بە خەون بیبینینەوە.

بەڵام باکیتش گوێی نەدەدایە و لێی دوور کەوتبۆوە. دەتگوت باڵی لێ ڕواوە .

* * *

سیفاکاسی پیر سەری بەسەرتەتەڵەی مەشقی خۆدا گرتبوو، بە زەحمەتی زۆر پیتەکانی ئەلفو بێی دەنووسی، لە ترسی شکانی نوکی قەڵەمەکەی. زۆری دانەدەگرت، چەند ڕۆژ بوو لە ڕادە بەدەر هەستی بە بێتاقەتی دەکرد. دەتگوت تەواوی لەشی داتەپیوە. ڕەنگی پەڕیبوو، خەوی لێ نەدەکەوت. ئەژنۆی ڕاست نەدەبوونەوە. لە بەر خۆیەوە بیری دەکردەوە :

. ئەگەر بمەوێ بە ئامانج بگەم، دەبێ پەلەی بکەم. بەڵێ پێویستە ئالۆکەی بکەم. بۆیە سەری بەسەر مەشقەکەیدا بەر دەداوەو دەینووسی. پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر، دەستی لێڕاهات و توانی لە سەر تەتەڵەی پیتی گەورەی ئەلفو بێ بە جوانی بنووسێ.

تراساکی مامۆستای دەیویست پیتی چکۆلەشی پێ بنووسێ. پیرە مێرد گوتی: « من پێویستم بە پیتی بچوک نیە. تەنیا پیتی گەورە بە کاری من دێت.» بابە گەورە لە فێربوونی ئەلفوبێ مەبەستێکی هەبوو. ئەو ڕۆژە چاوە نواڕی تراساکی بوو تا ڕازی دڵی خۆی پێ‌بێژێ.

نیوە ڕۆ لایدابوو، ژنەکان سفرەیان ڕاخستبوو، نانیان ئامادە کردبوو، بەڵام تراساکی دیار نەبوو. دایکی ئاوتاو دەچوە دەرو بە نیگەرانی سەیری لای چیای دەکرد. کوڕەکەی بۆ کوێ چوبوو؟ بۆچی وەدرنگ کەوتبوو؟

بەیانی‌زوو تفەنگە کۆنە داگیراوەکەی دەست دابویە ولە گەڵ هاوالەکانی ‹مانولیو› و ‹ئاندریکس› و‹ هاریتوس› و دەدوازدە منداڵی گوندی بۆ گەمەی ڕاو چوبوە کێوی. هێندی داس و تۆرچەقانیان پێ‌بوو. هێندێکیش چۆماخی نوک تیژ. ئاندریکوس کۆنە پەپاخی زەنگوڵەداری باپیری بە سەری داڕنیکەوە کردبوو، بە قسەی خۆی ئاڵای دروست کرد بوو.

کاتێ گەیشتنە بناری چیا، تراساکی فیکری کرد و هەموو لە دەوری کۆبوونەوە، گوتی: منداڵینە من دوێنێ باسی نەخشەی خۆم بۆ کردن. گوتم ئەمڕۆ بۆ کوێ دەچین. ئێمە هەموو پیاوین. شەرمە لە ماڵێ لە نێو ژنان دابین . ئێستا سەردەمی شۆڕشە. گاڵتەو گەمەی منداڵان نیە. ئێستا باوەکان لە کێوی لە گەڵ تورکان لە شەر دان، وەرن ئێمەش بچینە شەڕێ.!»

هاریتوس بە ترسەوە هاواری کرد :

- بچینە شەڕێ ؟ شەڕی بەڕاستی ؟. ئەو پێی وابوو وەک جاران بۆ گەمە دەچنە چیا. تیوە تورک و نیوەشیان دەبنە فەلەو وەدوای یەک دەکەون. تراساکی گوتی: « تۆ پێت وابوو منداڵ بازاریە؟ تا ئێستا هەر مەشقمان کردوە تا دەستی خۆمان فێری پیاو کوشتن بکەین.»

هاریتوس گوتی: «دروونی بکەوە. داخوا بە ڕاستی ئێمە دەچینە شەڕی تورکان ؟ من دوێنێ

شوان بووم، نازانم چت گوتوه. ئێستا بێژه بزانم مەبەستت چیە ؟»
. باش گوێ بدەیە بزانە دەڵێم چی. ئەگەر دەترسێی، بچووە گوندێ و لە ژێر داوێنی دایکت دا خۆ وەشێرە. لەودیوی چیا گوندێکی تورکان هەیە بە ناوی « بۆهوس » . ئێمە دەچینە ئەوێ. کاتێک گەیشتین، یەک لە ئێمە دەچێتە پێش، منداڵە تورک تووره دەبن و دێن شەڕمان لە گەڵ بکەن. ئێستا تێگەیشتی ؟
. باشە... ئەدی ئەگەر باوکیان هات؟
. با بێن..من تفەنگی داگیراوی بابە گەورەم هێناوە. مانولیوس دڵخۆشی داوە گوتی: «مەترسێ، پیاوەکانیان هەموو چوونە شەڕێ.» ئاندریکوس پشتی قسەکانی گرت و گوتی: بێجگە لە ژن و منداڵان کەس لە گوندێ نەماوە. نابێ دەست لە ژنان بدرێ. کوڕەکانیان هان دەدەین و شەڕیان لە گەڵ دەکەین.»
هاریتوس کە ترسا بوو تەریق بۆوە گوتی :« قەی ناکا، با بچین. بەلام بۆ دڵنیایی با لە پێشدا نیشانەی خاچ بکێشین.»
تراساکی گوتی : « پێت خۆشە بیکێشە. باوکیشم کە دەچێتە شەڕێ، خاچ دەکێشێ.»
هەموو نیشانەی خاچیان لە سینگی کێشاو دایان لە قەدی چیا. زستان بوو، بایەکی ساردی دەهات. لە لوتکەی کێوی سلنا تازە بەفر باریبوو. دوو قەلە رەشە بە قارە قارێ بە سەر مناڵەکاندا تێپەڕدە پەڕین و پاشان بزردەبوون.
ئاندریکوس گوتی: « باشبوو بیرتولدو شمان هێنا بایە. ئێمە هیچمان نازانین شەیپور لێ بدەین. لە جیاتی شەیپور ئەو گیتاری بۆ لێدەداین.»
تراساکی هاواری کرد : « زۆر گوتن بەسە. دوو دوو بە سەف ڕاوەستن. بە گیانی ئاخێز ئێمە لەشکرین و دەچینە شەڕێ.»
مانولیوس دەستی بە زگی گرت و گوتی : « ئاخ ... برسیمە .» هەموو گوتیان لە بیرمان چو نان بێنین.!
تراساکی هاواری کرد : « کەس هەقی گەڕانەوەی نیە. مرۆ لە شەردا برسی و تینو دەبێ. دەبێ وا بجولێینەوە، وەک نانو ئاومان خوارد بێ. پاڵەوانەکان ئاوان .»
ئالا هەلگر گوتی: « لە وانەیە مناڵە تورک نان و ئاوو پەنیرو کولیچەیان پێ بێ. چونکە تورک پەنیرو کولیچەیان پێخۆشە. ئەودەم لێیان دەستێنین و دەیخۆین.گوڕینە بۆ پێشەوە » لە کاتێکا ئەو ئالایەی کە بە کلاوی بابە گەورەی سازی کردبوو بەرزی دەکردەوە لە چیا سەردەکەوت. چەند منداڵ خەریک بوون خۆیان بدزنەوە. تراساکی لە سەر گاشە بەردێک ڕاوەستاو ئاگاداریان بوو.کاتێ کەس نەیتوانی ڕابکات، دەستە دوو بە دوو کەوتە رێ.
تراساکی بۆ دڵدانەوەیان گوتی:
. ئەگەر لە رێگا کەروێشکێکمان دیت، بەو ساچمە زەنە دەیکوژم و دەیکەینە کەباب. کێ شەمچەی پێیە؟
گیرفانیان گەڕان کەس شقارتەی پێنەبوو. ئاندریکوس گوتی :
. قەی ناکا. تورکەکان شقارتەیان پێیە، لێیان دەستێنین. یالا بۆ پێشەوە.! بۆ ئەوەی نەبێتە

هەوا، سەبرۆکە بەسەر بەردانیا هەنگاویان داریشت. بێدەنگ ببوون، وایان دەزانی چونە نێو خانوی تورکان بە سپایی دەبزووتنەوە. هەورەکان شۆڕ دەبوونەوەو لوتکەی چیایان دادە پۆشی. گرمەی هەور لە دوورەوە دەبیسرا. هەوا بۆنی بارانی لێدەهات. هاریتوس گوتی :

ـ لە بیرمان چوو بارانیەکانمان بێنین. منداڵە گوندی یەکان گوتیان: گرنگ نیە. ئێمە هەر بارانیمان نیە !

هاریتوس گوتی: « منالینە سەبر قسە بکەن. هاوار مەکەن. تورک گوێیان لێ دەبێ. » هەموویان بە غیرەتەوە لە چیا وەسەر دەکەوتن. تا ماوەیەکی زۆر هەموو مات بوون. لە کوێرە ڕێ لایاندا بوو، بە قەد پالی چیادا دەڕۆیشتن. دوای ماوەیەک هیلاک بوون، یەکیان گوتی :

ـ با تاوێک ڕاوەستین، پشوێکمان بێتەوە بەر، بەم جورە شەڕمان پێناکرێ.

هارالامبیس گوتی: « زۆر باشە .. با ڕاوەستین .تا ئەوەدەم بە گڕژ وناڕەحەتی ڕێگاڕۆیشتبوو، زمانی نەگەڕا بوو. جارێکی تر هاواری کرد:« ڕاوەستن منداڵینە قسەم هەیە، ئەشێ بیلێم . »

تراساکی لە بەرامبەری قوت بۆوە گوتی : تۆ قسەت هەیە؟ لێوەکانی دەلەرزین .

ـ بەڵێ قسەم هەیە .

ـ باشە ... قسەکەت بکە ...پێش ئەوەی لە گەڵ دوژمن شەر بکەین، دەبێ فەرماندەیەک بۆ خۆمان دیاری بکەین. واتیە ؟ قسەکەم ئەوە بوو. بەڵێ پێویستە فەرماندەیەک دیاری بکەین.

تراساکی تفەنگی ڕاوەشاند و گوتی : فەرماندە منم ..

ـ کێ تۆی هەڵبژاردوە. تۆ بە خەیاڵ خۆت کردۆتە فەرماندە. چما چەند ساڵی ؟

لەبیرە مەسەلەی ساڵ و تەمەن نیە. من کوری پاڵەوان میکێلس - م.

ـ وایە یان نا ؟

ـ باشە. بەلام مەسەلەی پاڵەوانی میرات نیە. من لە هەمووتان گەورە ترم.

ـ با گەورە تربی، من لە هەمووتان قەوی ترم.

هارالامبیس پێکەنی و گوتی : تۆ ؟ ...تۆ ؟ وەرە با زۆرانی بگرین !

تراساکی تفەنگی دا بە دەستی تاندریکوس وگوتی زۆر باشە ئامادەم تۆش داسەکەت دانێ فێڵێ مەکەو پیاوانە وەرە پێشێ.

منداڵەکان دەتگوت دەمێکە چاوە ڕوانی ئەو بەزمەن، بە دوو دەستە دابەشبوون. زۆربەیان لە دەووری تراساکی کۆ بوونەوە، ئەوانی دیکەش لایەنگری هارالامبیس بوون. ئالا هەڵگرکەدەستەی خۆی بە هێزتردەزانی گوتی: با هەرتک دەستە شەڕبکەین.

تراساکی بە توندی گوتی :« نابێ، ئێمە دوو کەس ملانێ دەگرین .ئێوە دوور دانیشن و کارتان بە ئێمە نەدابێ. هەر کەس حەریفی لە عەرزیدا، ئەو فەرماندە یە . »

هاودەنگن ؟

هەر تک دەستە هاواری کرد : هاودەنگین .

مە یدانێکی گەورەیان خالی کرد، ورتکە بەردیان لێ هەڵگرتنەوە. لێیان دوور کەوتنەوە. هێندێ ڕاوەستان و هێندێکیش لە سەر گاشەبەردان هەڵتروشکان. تراساکی پشتێندی توند کرد و لە مەیدا‌ن چەقی. لەو لاشەوە هارالامبیس تفی کردە دەستی ورایکردە مەیدانێ. ئەوەتە لێک

نیزیک ببوونەوە لوتیان وێک دەکەوت. هەناسەیان تێکەڵ دەبوو، گڕ لە چاویان دەهاتە دەر. لە لایەک هاواریان دەکرد :

- یاڵاّ هارالامبیس ، ئەو منداڵ شارستانیە رامالە و بیکە پارویەک.

لە لای ترەوە هاواریان دەکرد: یالاّتراساکی فەرخە پاڵەوان ... ئیشەڵاّ سەر دەکەوی .

وەک کەڵە شێری جەنگی بەرامبەر یەک وێستا بوون. لەشی نەرم و پێکراویان لە سەر پەنجەی پێ دەسووا.

ئامادە بوون خۆ پێکدادان.بەڵام هێشتا گەرم دانەهاتبوون.دەستیان‌کرد بە جنێوان.هارالامبیس بە هەڵەوەرو زار پیس ناسرابوو. تراساکی لە شەرە جنێودا لە پاش بوو. هەر چەندی جنێوی دەبیست پتر تورە دەبوو. دەیویست زووتردەگۆی راچێ. لە پڕ خۆی پێ رانەگیرا، لێوی سەرەوەی هەڵگەراوەو دانی نیشاندا. هارالامبیس سەری بردەوە نێوشانی‌و وەک بەرانی خۆی پێدادا. بە دەوری یەکدا هەڵدەبەزین و ورتکە بەردیان بە لاقی بۆ ئەملاولا رادەدا. هارالامبیس هاواری دەکردو جنێوی دەدان. بەلام تراساکی بێدەنگ بوو. لە دەرفەت دەگەرا کە حەریف غافڵگیر بکاو لە عەرزی بدات.

باران دابدایە.ئاو لە سەروسەکوتیاندا دەهاتە خوارێ. هارالامبیس پێنخواس بوو، لاقی دەچەقین. بەلام تراساکی‌چەکمەی دە پێدابوو. دەخلیسکا. هارالامبیس پشتە پێێکی لێدا، ئەگەر تراساکی دەستی بە گاشە بەردێک نەگرتبایە لە سەر چاوان دەکەوت. ئالاّ هەڵگر لە کاتێکا بە تورە یی فیسی بابە گەورەی رادەوەشاند هاواری کرد : ئەی خاین...ئەی خاین...

ئەوانیتر چەپڵەیان لێدەداو هاواریان دەکرد : ..ئافەرین هارالامبیس ... ئافەرین ..

تراساکی لە رکان شێت ببوو، داهاتەوە دەستیدا بەردێک . بەڵام هارالامبیس گورج خۆی گەیاندە داسەکەی و گوتی :« منداڵە شاری پیس ! ئەو بەردەی فرێدە، دەنا بەو داسە ملت دەپەرێنم.»

تراساکی تفەنگی لە دەست ئاندریکوس هێنا دەرو گوتی:« بەم تفەنگە وەلاّمت دەدەمەوە. دیارە لەوە تێ‌پەریوە، یا تۆ من دەکوژی و یا من تۆ.!»

مانولیوس هاواری کرد بۆ خاتری خوا دەست راگرن، دیارە تورکتان لە بیر چۆتەوە.

یەکیان گوتی: « پشکێ باوێن. بۆ هەر کەس هات ئەو فەرماندەیە.» هارالامبیس گوتی :

- پشک بە کار نایە. هەرکەس ئەویتری لە عەرزی دا ئەو فەرماندەیە. داهاتەوە داسی دەست دایەو پەلاماری برد، تراساکی کشاوە، بۆ پشت بەردێک و تفەنگی بە شانیەوە ناو تەقەی لێ هێنا. گوللە سەریکرد و چیا دەنگی دایەوە. هارالامبیس قاقا پێکەنی و گوتی :« کونە ئاسنت خاڵی بوو، بەدبەخت ئەم جار چدەکەی ؟ کارت کراوە .»

تراساکی تفەنگی داناو ئاوری دایەوە. دیتی ئاندریکوس داسی بۆ راداشتوە .داسەکەی وەرگرت و لە کاتێکا داسیان هەڵدە سوڕاند یەکتریان پەلامار دا، ئەمجارە لایەنگرانی هارالامبیس ئالاّهەڵگریان پەلامارداو بە هاواری خاین خاین تێک بەربوون. زۆریان وەعەرزی کەوتن، هێندیک چوونە پشت بەردان و بە قرچەقانی‌بەردیان داوێشت. خوێن بە سەروپاسکاندا دەهاتە خوار. تراساکی ئەژنۆی بریندار ببوو دەشەلی. تراساکی تفەنگی هەڵگرتەوە بە شانیەوە نا. هاریتوس لە

وەترسا کارەساتێک بقەومێ. لە پشت سەری تراساکی وێستابوو، ڕاست لەو کاتەدا خەریک بوو پەلامپێکەی بکێشێ، دەستێکی لە باسکی تراساکی دا و تفەنگ سەری کرد. ڕاست لەوکاتەدا تیزیک بوو کوشتار بکرێ، لە دوورەوە دەنگێک هات.. زەلامێکی زلحۆل لە کاتێکا چزماخێکی هەڵدەسووڕاند لە چیا سەر دەکەوت. مانولیوس هاواری کرد :

. کوڕینە تورکێکی نێرە کەر دێ، با ڕاکەین. مانولیوس کە خەریک بوو ڕابکا، تراساکی پشت ملی گرت و گوتی :

. شەرمێ ناکەی هەڵدێی، چقەوماوە، تورک با تورک بێ. یاڵاّ کوڕینە چەک بەدەست ئەو تورکە پەلامار بدەین. تراساکی وهارالامبیس پێکەوە غاریان دەدایەو هەر کەسە دەیویست وەپێش بکەوێ. ئەوانەی قنچەقانیان پێ بوو، وەسەر بەردان کەوتبوون و خۆیان ئامادە دەکرد. لە پڕ هاوار هەستاو گوتی:

های .. شەیتانینە بەردان ناوێن. من تورک نیم، من هاریلاتوسی پیرە شوانی سیفاکاسم.

منداڵ ڕاوەستان و پەشۆکان. حەیف کابرا تورک نەبوو تا بیکوژین. بە دوای سەری پیرە شراندا دەنگی زەنگوڵەی بە ر نێری پێش مەڕی دەهات. هاریلاتوس چوە نێو زاڕۆکان لە بەر هیلاکی دەهاژان و نیوە گیان ببوون. بە سەر سوڕمانەوە چاوێکی لێکردن و بە قاقای پێکەنینەوە گوتی :

. ئەوە چیە؟ ئێوە بۆ کوێ دەچن ؟

تراساکی گوتی: « دەچوونە شەڕی تورکان . من تفەنگیشم هێناوە» . هاریلاتوس بە پێکەنینەوە بە ڕانی خۆی داداو گوتی:« ئەی تورکی بەدبەخت لە ترسان بلەرزن، تراساکی دێت و دەتان کوژێ. »

تراساکی لە وەلاّم دا گوتی :« پیرە سەگ پێ مەکەنە. دەنا سوێند دەخۆم کە ... ئەوەی گوت وتفەنگی لێ ڕاست کردەوە. »

ئەمجارە شوان بە تووڕەیی دەنگی دان وگوتی :« دەڕاکەن منداڵە وڕتکەی سەرسەری و بەرەلاّ. ڕاکەن بڕۆنەوە دەناتوشی ئەو درندانە دەبن. » سەگی زەلامیش گەیشتنێ، دەوری شوانیان دەداو جار جاریش بە منداڵان دەوەڕین.

هاریلاتوس جارێکی دیکەش گوتی:«گوتم بڕۆن، دەنا ئەو سەگانەتان تێ بەردەدەم، تا لەت وپەتتان کەن. » منداڵ لە دەوری فەرماندەکانیان کۆ بوونەوە دەبوایە بڕیار بدەن. هێندێک کە ئاقڵتر بوون، پێشنیاریان کرد بکە ڕێنەوە و ڕۆژێکی دیکە بە پەرداخی‌نان و ئاو وشقارتە هەڵگرن و بچنە گیانی تورکان.

شوان بزەی هاتە سەر لێوان و بە ئافەرینەوە تەماشای کردن.لە بەر خۆیەوە دەیگوت : « ئەم پچکۆلە بەد جسنانە چەندە بە تامن. چەندە باشیان گوتوە کە: کریتی دەست بە تفەنگەوە لە دایک دەبن. بە دەستێکیان تفەنگە و بەویتر مەمکی دایکیان دەگرن. هەر لە ئێستاوە وەک شەرکەری پیر پێکەوە ڕاوێژ دەکەن. دەڵێی دە یانەوێ وەلامی سوڵتانی بدەنەوە.. »

پاشان ڕووی کردە تراساکی و گوتی : منداڵ ! بێژە بزانم چند ساڵی ؟.

تراساکی لە وەلاّم دا گوتی : « سەت ساڵ .هەزار ساڵ .. بۆ تۆ فەرقی چیە ؟ »

شوان فرە شاد بوو، ئەویش بە منداڵی هەروابوو. رۆژێک تفەنگی بابی دزیبووتا بچێ تورکان بکوژێ. جارێکی دیکەش کە لە گەڵ دایکی چوبوە لەنگەرگای < سپینالنکا>لەوێ پاپۆڕێ دیبوو، وەسەر کەوتبوو بانگی پاپۆڕەوانی کردبوو. پاپۆڕەوان پرسیبووی: < چت دەوێ چلمن ؟ !>

. منیش لە گەڵ خۆت بەرە ...

. بۆ کوێ ؟...دەتەوێ بچیە کوێ..؟

. بو قوستەنتەنیە ..

دەچی چدەکەی ؟

. دەچم سوڵتانی دەکوژم. مەلەوانی گەمی گوێیان لەو قسانە ببوو. هات‌روبە دەرو لە قاقای پێکەنینیان دابوو. هاریلاتوس ترسابوو، رایکرد بوو. شوان کاتێ سەردەمی منداڵی خۆی وەبیر دەهاتەوە، دڵی پڕدەبوو لە خۆشی. بە منداڵەکانی گوت :

. وەرن منداڵە ئازایەکانی من . وەرن.. من لە گەڵ سەگ و مەرەکانم وەپێش دەکەوم. ئێوەش بەدوامدا وەرن. لە گوندی دەڵێم کە ئەمڕۆ هەموو پێکەوە چوو بووینە بەر مەڕی، هەتا شەرتان لەگەڵ نەکەن. یالاّ فەرخە شێرە خۆشەویستەکان وەرێکەوین. هاریلاتوس بە زمانی خۆش زارۆکی رام کردن. پاشان نردوە نانێک و سەلکە پەنیرێکی لە خورجێن هێنا دەرو لیّی بەشکردن. منداڵ برسیبوون، بە ئیشتیا نانەکەیان خوارد. پاشان گوتیان : خوزیا ئاویش هەبایە تینومانە. شوان قمقمەی هێنا دەر و گوتی منداڵە خۆشەویستەکان من ئاوم نیە. بەڵام شەرابم هەیە، شەرابیش خەراب نیە. بە سلامەتی !

سەری هەڵێناو بە زاریەوە نا. پاشان بە منداڵانیدا گێڕا و قمقمە خاڵی بوو. شوان گوتی :

. ئیتر بکەوینە رێ. تورکمان کوشت و گوندەکەمان سوتاند. ئەوانەشمان بە دیل گرتوە، مەرو بزنەکانی نیشاندا.

لەولاوە بابە گەورە کە نیگەران ببوو، بەرەو چیا کەوتبوە رێ. تەتەڵەی بە دەستەوە بوو بانگی تراساکی دەکرد. کاتێ لە دوورەوە چاوی بە تراساکی کەوت‌کە بە دوای مێگەلدا دێت، ئامێزی لێک کردەوەو گوتی :

. ئاخ... تراساکی لەعنەتی لە کوێ بووی. راست ئەمڕۆ پێویستم بە تۆ هەبوو.منت بە جێ هێشتوە رۆیشتووی. وەرە دەمەوێ شتێکی باشت لێ بپرسم. تراساکی کە راست بۆ ژووری دەچوو گوتی :

. بابە گەورە ! من لە پێشدا دەمەوێ نانی بخۆم، برسیمە .ئەژنۆی دیشان، بەڵام بۆ ئەوەی وەسەر خۆی نەهێنێ، هەنگاوی توندی داویشت.

هێشتا ئاسمان کەمێک روناک بوو، باران لێی‌کرد بزوە. پەڵە هەوری زێرین پەردەیان بەسەر رۆژئاوادا کیشابوو. بابە گەورەو نەوە لە بەر دەرگای حەساریّ دانیشتن ، پیرە مێرد تەتەڵەکەی نیشان دا کە هەمووی بە پیتی گەورەی ئەلفوبێ پڕ کرد بزوە.

. تراساکی ! ئەمڕۆ ئیتر ناتوانی شەرم لە گەڵ بکەی. چونکە دەرسەکەم رەوانە. تەماشای کە ر بزانە . هەموو پیتەکانی ئەلفو بێ فێر بووم و نوسیومنەوە.

. ئافەرین بابە گەورە ! ئەمڕۆ نمرەت بیستە . چۆن توانیت بە جارێک هەموو پیتەکان فێربی؟

- ئاخر تراساکی من ئیتر کاتێکی زۆرم نیە ناچار بڕیارم دا فێریان بم. ئێستا کاتی ئەوە هاتوە رازی دڵی خۆمت پێ بڵێم. کەوابوو گوێ بدەیە ! تۆ دەزانی بۆچی لەم تەمەنەدا دەمەوێ ئەلفوبێ فێر بم؟ پێت وایە بۆ شت خوێندنەوەیە ؟ باش بیری لێ بکەوە. من لە تەمەنی سەت ساڵیدا هەموو شت دەزانم و هیچیش نازانم. نا...نا، بۆ شتێکی دیکەیە .
- بۆ چی بە بابە گەورە ؟
- بۆ ئەوە بوو تەنیا نووسینی شتێک فێر بم، بەڵێ.. شتێک .. هەتا نووسینی ئەو رستەیەفێر نەبم نامەوێ بمرم .
- کام رستە . ؟ شتی چی ؟
- رستەیەکی کورتی ! وەرە دەست لەسەر دەستم دابنێ و رێنوێنیم بکە. فێرم بکە ئەو رستەیە بنوسم. پیرە مێرد لێرە دەنگیزم کردەوەو گوتی :« ئازادی یامەرگ »
تراساکی هاواری کرد : ئاخ .. هەر بۆ ئەوە بوو...ئێستا تێگەیشتم .
- نا.. تراساکی تاڵوکەی مەکە تۆ هێشتا تێ ناگەی. وەرە دەستی من بگرەو رێنوێنی بکە .
تراساکی بە هەرتک دەستان دەستە زۆر وقایمەکانی بابە گەورەی گرت و سەبرو لە سەرەخۆ بە سەر تەتەڵەکەی دا دەهێنا، تا ئەم رستەیە بە پیتی گەورە نوسران :« ئازادی یا مەرگ » !

## ١٢

زستانە. بایەکی سارد لە لوتکە چیاکانی بە بەفر داپۆشراوەوە هەڵیکردوە. کاندی لە سەرمان دەلەرزێ. لە بناری چیای سلنا، لە نیزیک ئۆردوی پاڵەوان میکێلس، ئەو ئەشکەوتە گەورەنیستاش پڕ لە ژن و منداڵە. ئەو ئەشکەوتە بەستێنی چۆمێکی زۆر قەدیم بوە، ئێستا وشک بوە لە هەموو شۆڕشێکدا ژن و منداڵی مەسیحیەکان پەنایان بۆ ئەم ئەشکەوتە هێناوە. لە سەردەمی شۆڕشی گەورەدا، تورک ئاگریان هاویشتۆتە نێو ئەشکەوت ، تا پەنا بەرەکانی نێو ئەشکەوت بسوتێن. هێشتا لە تاریکی دا، ئێسکی مردوەکان لە نێو سەهۆڵی ئەشکەوت دا بریقەیان دێت. ئێستا ژن و منداڵی دیکە لە بەر دەستی تورکان رایان کردوە، هاتوونە ئەم ئەشکەوتە تا بە ئێسکی خۆیان بارستایی ئێسکی کوژراوانی کۆن قورستر بکەن .

بە رۆژ دێنە دەرێ، تا هێندی گژو گیار رەگە دار بجوون و وەک ئاژەڵ بلەوەڕێن. سەر هەڵدێنن لە دوور تەماشای ئەو تەختە بەردانە دەکەن کە پاڵەوان میکێلس گردونی بە مەتەریز و بەو تەماشایە هێزێکیان دێتەبەر. مادام کە رێبەریان بەربەرەکانی دەکات، ئەوان ناترسێن. پێش چەند رۆژ تورک تا نیزیک ئەشکەوت هاتبوون. هاوارو رۆرۆی پەنا بەران دەستپێکرا بوو. لە پڕ پاڵەوان میکێلس لە هێلانەی هەڵۆ هاتبوە دەر، تورک و یونانی پێک وەر ببوون. چیا لە هەیبەتان دەلەرزی. تاریکی شەو لێکی جیا کردبوونەوە. بەیانی دیسان دەنگی گریان و هاوار لە چیا هەستا. ژن لە ئەشکەوتێدا دەگریان، هێندی داوای یارمەتیان لە خودای دەکرد، هێندێکیش کە ئازاتر بوون،بەدوای کێرد و چزماخدا دەگەران کە دەست بوەشێنن.

مەسیحی کەم بوون و برسەیەتی هیلاکی کرد بوون .تورکیش دەستە دەستە لە دەشت و مەزرا شین دەبوون. پاشا فرە تورە ببوو، سو یندی خوارد بوو کە سەری پاڵەوان میکێلس لە کیسە یەکدا بە دیاری بۆ سوڵتان بنێرێ. دوو سەعات دوای نیوەڕۆمەسیحی وردە وردە بەرەو کزی دەچوون. دەنگی هوراو هەرای سەربازانی تورک لە چیا دەنگی دەداوە. ژنو منداڵ لە ئەشکەوت دا هاوار و گریانیان بوو. لە پڕ رەحمەتی خوا هاتە خوار. لە بنتوی چیاو لە پشت سەری تورکان دەستەی پاڵەوان پولیکسینگیس گەیشتە مەیدانی شەر. پەیاخ سوور کە کەوتبوونە نێوان دوو ئاگر، خۆیان نەگرت و رایان کرد. هێندێ کەوتنە عەرزی و هێندێکیش بە دەشتێدا رەوین. دوو پاڵەوان بە سواری سەریان دەدوو نان. هەرتکیان برێندار بوون. بە لاَم لە گەرمەی شەرێدا بە خۆیان نەزانیبوو. شەو کە گەڕانەوە برینەکانیان دەرمانکرد و پێچایان. پاڵەوان میکێلس لە شان و پاڵەوان پولیکسینگیس لە رانی برێندار بوون. هەرتک برسی بوون . قارەمانانی پولیکسینگیس خورجێنیان کردەوە و نیعمەتی ئاسمانیان هێنا دەرێ، بریتی بوو لە : نان و زەیتون و پیواز و شەراب.

لە کاولە بەردێک دا کە ئالاَی رەشی پاڵەوان میکێلس، بە نوسراوەی سور لە سەری دەلەراوە،

هەرتک پاڵەوان بەرەو رووی یەکتر دانیشتبوون. بای ساردی گوێستان بە قەڵشتە بەردانیدا دەهاتە ژوور لە دەرەوەش بەفر دەباری.

تئودوریس بە ئامێزێک داری وشکەوە هاتە ژوور. دڵی بۆ ئەم دوو پاڵەوانە بریندارە دەسوتا. هاتبوو ئاگریان بۆ بکاتەوە. بەڵام زوو وەدەرکەوت تا بە تەنیا بن چوونکە لە ئاخافتنەکانیان دیار بووکە وتووێژیان جیددی‌یە. پاڵەوان میکێلس دەیگوت:

- خێرت بێتە رێ پاڵەوان پولیکسینگیس ! خوا تۆی بۆ ئێمە ناورد. ئەو سەگانە نەیانده‌هێشتین.!

لە کاتی ئەو قسانەدا بە دڵێکی خەمبارەوە، تەماشای هاو سەنگەری خۆی دەکرد. پاڵەوان پولیکسینگیس کە سەرتاپێ رەشپۆش بوو، دەسماڵێکی رەشی لە سەری بەستبوو، خەمبارو رەنگ زەرد زووتر لە کاتی خۆی پیر ببوو. نانی دەخوارد، بەڵام هەست و هۆشی لە جێیەکی تر بوو. ئەو زارەی کە ئەوەندە گەپ و گاڵتەو پێکەنینی پێخۆش بوو، ئێستا گرژو پێکدادراو بوو. روومەتە سوورەکانی سپی و چرچ ببوون. لە روومەتی جوان و میهرەبانی ریشێکی زووروو ئاڵۆز هاتبوە دەری.

پاڵەوان قمقمەی شەرابی بۆ لێوی برد و گوتی :

- بە سڵامەتی تۆ پاڵەوان پولیکسینگیس !

- بە سڵامەتی تۆ پاڵەوان میکێلس ! تازە لە من تێ پەریوە !

پاڵەوان میکێلس دڵی کوشرا. ئەو دڵسۆزیە بۆ ئەو ژنە نەبوو کە بە دەستی خۆی کوژرا بوو. چونکە ئەو ژنە ژیانی پیاوانی تێک دەدا. دەبوایە بکوژرێ. پاڵەوان میکێلس لەو شەوەوە هەستی دەکرد کە سوکتر بوە. ئیتر کاتێ بە تەنیا دەبوو هەستی بە شەرمەزاری نەدەکرد. زەینی روونتر بوو. ئێستا ئیتر بە بێ قەیدو بەند بۆ کریت شەری دەکرد. بەڵام ئەو پیاوە رەشبیدەی کە بەرەو رووی دانیشتبوو خەمی دەخوارد ولە خەفەتی مردنی ژنەکەی توا بۆوە. پاڵەوان میکێلس گوتی :

- پاڵەوان پولیکسینگیس دەمەوێ شتێکت پێ بڵێم لێم دلگیرمەبە. لەو کاتەدا کە کریت لە بەرچاومان لە خوێنی‌دا دەگەوزێ. خەمی ژن خواردن شەرمە. بە شەرەفی خۆم سوێند دەخۆم، ئەگەر ژنێک لە ژیانی مندا ئەوەندە کاریگەر بایە کە نەهێڵێ ئەرکەکانم بە جێ بگەیێنم، دەمکوشت .
ئەوەی گوت، ئەو دەستەی کە ژنی چەرکەسی پێ کوشتبوو بەرزی کردەوە. پاڵەوان پولیکسینگیس پاروە نانێکی بە دەستەوە بوو کە بیخوا ، بە عەرزی دادا و لە کاتێکا قین گەرووی گرتبوو، لە وەڵام دا گوتی:« پاڵەوان میکێلس تۆجانەوەرێکی دڕندەی، منیش ئینسانێکم.» رووی بۆ لای ئاگرەکە وەرگێڕاوهەموو لەشی دەلەرزی.

پاڵەوان میکێلس لە ئاگرەکە وەنیزیک کەوت و تاوێک هەرتکیان مات و بێدەنگ بوون و لە ئاگرەکە راما بوون.

تئودوریس جارێکی تر هاتە ژوور تا ئاگرەکە خۆش بکا. بەلام کە ئەو دووپاڵەوانەی وا لە فیکردا دیت، سەبرەکە لە سەر پەنجان‌کشایەوە. لە نەکاو پاڵەوان میکێلس بە دەنگێکی گیراو، وەک لە دوورەوە بگوترێت، پرسی :

تۆ دەزانی کێ کوشتویە ؟ هاتبوە سەر ئەوەی کە هەرچی هەیە روونی بکاو دەری بیرێت .

پاڵەوان پولیکسینگیس تێکڕابوو، دەستی پاڵەوان میکێلسی گرت و گوتی : کێ ؟

. هێدی بەوە . لە سەر خۆبە. من رازی لەوە تاڵترم لە لایەو پێویستە بۆت باس بکەم. دانیشەو گوێ بدەیە. سوێند دەخۆم کە پاشان تەریق دەبیەوەو ئیتر قەت بیر لەو ژنەو لە قاتڵەکەی ناکەیەوە.

پاڵەوان پولیکسینگیس کە ئاگری لە چاوان دەباری، دووبارە پرسیاری کرد : کێ کوشتوویە؟ کێ؟.

. من لە کەماسی برازامەوە نامەیەکم پێگەیشت، دوای خوێندنەوەی سوتاندم. بەڵێ پاڵەوان پولیکسینگیس ! ئێمە بە خۆڕایی خۆمان زەحمەت دەدەین. بە خۆڕایی خوێنی خۆمان دەڕێژین. کریت ئەم جارەش ئازادی نابینێ. یونان لاوازە. ئورووپایی بێ شەرەفن. سوڵتان فرە بە هێزە.

پاڵەوان پولیکسینگیس گوێی نەدەدایە و کە لە جێ هەستا، سەری وە بەردێکی کەوت و تەقەی لێهات. جارێکی تر هاواری کرد :« کێ کوشتوویە پێم بڵێ و پاشماوەی قسەکانت بۆ دوایە هەڵگرە.»

پاڵەوان میکێلس لە کاتێکا هێدی و ئارام هەڵدەستا، چاوی لە چاوی ئەو بڕیبوو گوتی : من..بەڵێ من!

پاڵەوان پولیکسینگیس پاڵی وە بەردێکی داو دنیای لە بەر چاوان تاریک بوو.گوتی :

. نا...نا.. شتی وا نیە ..تۆ ؟ تۆ...؟

. بەڵێ من. من دەبوایە یا تۆ بکوژم یا ئەو . بەڵام کەوتمە فیکری کریت و دیتم تۆ شۆرشگێرێکی باش و کریت پێویستی‌یە تۆ هەیە. ناچار ئەوم کوشت. ئەو کارە منی هێدی کردەوە ودەبینی تۆش ئارام دەکاتەوە. لە خۆڕا دەست بۆ خەنجەرت مەبە. ئەگەر دەتەوێ تا دەرگا داخەین و چرا بکوژێنینەوەو شەر بکەین تا یەکتر بکوژین .بەڵام بیرێکیش لەو ژن و منداڵانە بکەوە کە لە تەشکەوتێدان و بزانە ژیان و نامووسیان لە دەستی ئێمە دایە. بیر لە باوکان و لە کریت بکەوە و بڕیار بدە.

پاڵەوان پولیکسینگیس شل بۆوە، کەوتە عەرزی. دەستی بە دەموچاوی گرت و لە بەرگریان خۆی پێ ڕانەدەگیرا. پاڵەوان میکێلس بێ ئەوەی گوێ بداتە گریانی دۆستەکەی، قسەکانی درێژە پێدا:

– من هاوڕێ پولیکسینگیس کاتێ ئەو نامەیەم خوێندەوە و زانیم ئیتر هومێدێک نیە، نازانم چم بەسەرهات و چ شەیتانێک لە بوونی مندا سەری هەڵدا. لە جیاتی ئەوەی بپە شۆکێم، هەستم کرد وەحشیتر و قەویتر بووم. ئاخ ئەی دەوڵەتە بە هێزە ئورووپاییەکان کە خۆتان لە ئازاد کردنی کریت بواردوە، تف لە ئێوە، تف لە ئێوەی قاحبەی پیس. من پێویستم بە ئێوە نیە.

من پاڵەوان میکێلس، نۆکەرێکی بچوکی کریت. پێویستم بە ئێوە نیە. تەنانەت ئەگەر خوداش کریت بە جێ بێڵێ، من بە جێی ناهێڵم.

داهاتەوە،دەستێکی لە شانی پاڵەوان پولیکسینگیس داو بە ئارامی گوتی:

– بەسە پاڵەوان..بەسە . شەرمێ ناکەی!؟

ئەو ئیتر تێر گریا بوو. بە چاوی وشکەوە گوێی بۆ وتەکانی قاتڵی ژنەکەی ڕاگرتبوو. وتەکانی

یەک بە یەک بە دڵیەوە دەچەسپا. پاڵەوان میکێلس هەروەک ورێنە بکا، درێژەی پێدەدا:

. لەو رۆژەوە کە ناهومێد بووم. سوێند بەو خاکەی پێی لەسەر دادەنێم، وادەزانم کە ئەبەدی بووم. ئێستا کێ دەتوانێ شان لەشانم بدا؟ ئیتر مەرگیش ناتوانێ هیچم لە گەڵ بکات. تە نانەت ئەگەر دەوڵەتی و ئەسمانیش بە هەموو تواناوە گەمارۆم بدات، پێم هیچ نیە. من سەروقژو ورگ و ریخۆڵەشم پڕ لە باروتن. من ئێستا شتێکی وەک قەڵای نارکادیم. کاتێک زانیم هیچ دەرەتانێک نەماوە، ئیتر خۆم دەتەقێنم. ..تێگەیشتی؟

ئەمە راست بوو. لەو رۆژەوە کە پاڵەوان میکێلس ئەو ژنەی کوشتبوو کە لە نێوان کریت و ئەودا ببوە پەرژین، لەوەش زیاتر لەو رۆژەوە کە ئەو نامەیەی خوێند بۆوە و زانیبووی کە بێ هومێد و هیوا شەر دەکات، شەیتانێکی بە فیزو کەللەرەق لە ناخیدا سەری هەڵدا بوو.داخوا ئەوە شەیتان بوو، یان خودا، یان یەکێ لە باپیرە کۆن و قینە بەرەکانی؟ خۆشی نەیدەزانی. تەنیا ئەوەی دەزانی و هیچی تر کە هەر کارەساتێک‌هاتبا پێش، ئەو قەد تەسلیم نەدەبوو. سکالاو گلەییشی نەدەکرد. بیری لە وەش نەدەکردەوە کە لە گەڵ خودا، یا شەیتان و پاسولتان رێک بکەوێ بەڵکوو وەک‌دێری نارکادی خۆی دەتەقاند.

پاڵەوان پولیکسینگیس هەستاو پێنچەکەی لە سەری هاڵاند و لە کاتێکا رووی دەلایەکی دیکە بوو، گوتی:

. پاڵەوان میکێلس من ناتوانم لە گەڵ تۆ لە بن میچێکدا بخەوم. ناشتوانم تا ئەو کاتەی نیشتمان لە شەر دایە، شەرت لە گەڵ بکەم. یان لە شەردا بە تەنیا بە جێت بێڵم. بەڵام کاتێ کریت هاتەوە سەر خۆ حیسابی زۆرمان هەن کە دەبێ پاکیان بکەین. چونکە تۆ دڵی منت شکاندوە.

پاشان بێ ئەوەی روو بۆ لای قاتلی ژنەکەی وەرگێڕێ، وەدەر کەوت و بە لاکە لاک لە نێو بەفردا ونبوو.

* * *

لەو سەرانە مەسیحیەکان چی‌یان بە سەر دەهات؟

ژن چووبوونە سەربانی، لە ترسی ئەوەی نەکا بەفری زۆر خانووەکان بڕووخێنێ، بانەکانیان دەماڵی و بە زەردە خەنەیەکیش چاویان لە چیاکان دەکرد و هەناسەیان هەڵدەکێشا. خوایە لەو سەرە فەلەکان چی‌یان بە سەر دێت؟ بای کاترینناش چاوی دە لوتکە چیای بە بەفر داپۆشراو بڕیبوو، بیری لە مێردە بە سامەکەی دەکردەوە.

ئەوێ رۆژێ‌تار وساو بوو، کزە بایەکی ساردی دەهات. دوروسێ پاساری لە حەساری بابە گەورە نیشتن و دەستیان بە چینە کرد. تراساکی بە پارووە نانێکەوە هاتەدەرو حەسار پڕبوو لە داعبا، کورەکە لە کاتێکا پاساریەکانی بە بابە گەورە نیشان دەدا، بانگیشی دەکرد. بەڵام پیرە مێرد مات و بێدەنگ لە تۆزێنێک لە پەنا ئاگر دانیشتبوو، تەماشای‌گڕەکەی دەکرد کە چۆن ئەو دارانە دادەپەلۆسێ و دەیانکات بە مشکی و خۆڵەمێش.!

بابە گەورە مارەیەک بوو رۆژ بەرۆژ بێدەنگتر دەبوو. هەمیشە مات و لە دەریای بیرو فیکری

تاریکدا نوقم دەبوو. دیار بوو کە خەمێکی گەورە لەشی داگرتوە.

تراساکی نانی بۆ داعباکان ورد کردو کە گەڕابەوە ژوورێ، دیتی بابە گەورە هەڵدەستێ. ئەو سپارد بووی لە کاسێلی ستڵێک رەنگ و قەڵەمێکی مووی بۆ بێنن. ئێستا هێنا بوویان . بە تراساکی گوت :

. ئەو ستڵە رەنگەی هەڵگرەو لە گەڵ من وەرە. منیش قەڵەمی موو هەڵدەگرم. « دەچینە کوێ بابە ؟»

. دە بینی .! جارێ تا بەفر دەستی پێ نەکردۆتەوە تاڵوکەی بکە. کاتێک بابە گەورەو تراساکی گەیشتنە بەر دەرکی حەسارێ، تاوێک راوەستان، تا تەماشای گوندەکانی خواروو بکەن لە بەفریندا نوقم ببوون. بەفری سپێ لە سەریان و لە کۆڵان و لە سەر بەردان چەندە جوان بوو. بەفر دارە بێ‌گەڵاکان و کاوڵ و شتەکانی نێو گوندی چەندە جوان کرد بوو. تراساکی لە تەماشای گوندی کە بەشێوەیەک وا گۆڕابوو تێر نەدەبوو.

بابە گەورە دەسماڵی رەنگاو رەنگی خۆی هێنا دەرێ و بەفرەکانی سەر دەرگای حەسارێ پاک کردەوە و گوتی :

. تراساکی برۆ پەرۆیەکی بێنەو زوو وەرەوە تا یاریدەم بدەی. داری دەرگا خاوێن و بریقەدار دەرکەوت. بابە گەورە داهاتەوە سەری ستڵەکەی لابرد، قەڵەمی مووی دە رەنگی‌هەڵکێشاو لە بەر خۆیەوە بە نارە نار گوتی :

. بەناوی باوکی وەسمانی !

. چدەکەی بابە گەورە ؟

. ئێستا دەبینی ..قەڵەمەکەی هەڵگرت و بە کاوە خۆ بە وردی و ژیری هەوڵین پیتی بە خەتی سوور لە دەرگا نووسی: ئا . پاشان ز، پاشان ا، پاشان د، پاشان ی... تراساکی هاواری کرد :

. ئاخ ... بابە گەورە ، ئێستا تێگەیشتم. بابە گەورە بزەیەکی هاتێ و گوتی :

. کوڕم ! ئێستا تێگەیشتی کە بۆ چی گرەوم گرتبوو کە خێری ئەلفو بێ بم؟ من بۆ خۆم نەخشەیەکم هەبوو. دەمەوێ تەواوی گوندی بەو دروشمە برەنگێنم. من یەک دیواری نەنووسراو ناهێڵم. تەنانەت لە بورجی کلیساو لەمنارەی مزگەوت دەچمە سەرو بەر لەوەی بمرم لە هەموو شوێنێ دەنووسم : ئازادی یا مەرگ ...ئازادی یا مەرگ ...!

لە گەڵ ئەوە کە قسەی دەکرد، وشەکانی بە نوکی قەڵەمی موو دەنووسی. جاروبار ئاوڕی دەدایەوە تا جوانی کارەکەی خۆی ببینێ و تەماشای بکات.

پاش کێشانی چەند جەغزو خەت ، بەسبوو تا شکڵی ئەوتۆ پێک بێن کە هەر وەک گیان بازارو کەرووی ئادەمیزاد وەدەنگ بێن و هاوار بکەن. پیرە مێرد لەم نوکتە سەرسوڕ هێنەرە، واقی وڕمابوو. زۆر جار لە نەوەکەی دەپرسی:

. تراساکی ! بڵێ بزانم کە ئەوانە قسە دەکەن یان نا؟ ئاخ ... خودایە تۆ جادو گەری ؟!.

بەڵێ ! ئێستا دەرگایماڵەکەی هاواری دەکرد. پیرە مێرد تاوێک راوەستا و تەماشای کرد. ئێستا ئیتر دەرگای ماڵ نە بوو، خودی پاڵەوان سیفاکاسی پیر بوو. دوولای دڵی ئەو بوون هاواریان دەکرد. بە نیگەرانی لە نەوەکەی پرسی :

ـ تراساکی باشم نوسیوە ؟ غەلەتم نیە ؟ تراساکی بە پێکەنینەوە گوتی :
ـ ئەرەت بیستە بابە گەورە ، زۆر باشە....
ـ ئێستا بۆ پێشتر بچین ! لە بادانەوەی کۆڵان دیوارێک بە فرنەیگرتبوو. پیرە مێرد جارێکی دیکەش قەڵەمی مووی دە سڵی رۆکرد و دەستی کرد بە نوسین. هەر دەینوسی و دەچوە شوێنە دوورەکانی گوندی و دەینوسی. ریشی رەنگی گرتبوو، بەلام گوێی نەدەدایە.گرێک لە ئاخیدا بلێسەی دەداو بۆ پێشەوەی رادەدا. لە هەر شوێنێ دەرگا و یا دیوارێکی خاوێنی دەبینی، رادەوەستا و ئەو شکڵە هاجیاتیانەی دەکێشا. پاشان ئەو درک و دیوارە لاڵ و بێ خەمانە لە پڕ دەستیان بە هاوار دەکرد و دەردی دڵی خۆیان بە ئازایی دەر دەبری. لە ئاکامدا ئەو هەموو درگاو دەر و دیوار و دارە وشکانە وەگیان هاتبوون، قسەیان دەکرد و وەک خاچی راستە قینە موجیزەیان دەنواند.
ئێستا پیرە مێرد دەستی بە نوسین راهاتبوو. گەیشتە گۆرەپانی گوندی . مەدرەسەو کلیساو مزگەوت و لەولاتریش قاوەخانە بوو. قەڵەمی مووی دە سڵی رەنگی هەڵکێشاو دەستی بە نوسینی دەرگای مەدرەسە کرد : ئازادی یا مەرگ ! دوو پیاوی پیر لە چایخانە دەهاتنە دەرێ، گوتیان :
ـ بە...بە... پاڵەوان سیفاکاس بۆ چما تۆ دەزانی بنوسی ؟ لە کەتگێرە ؟ چدەنوسی ؟ تۆ وات لێهاتوە ؟
بابە گەورە بێ ئەوەی راوەستێ، لە وەلاْم دا گوتی :
ـ من والەگەڵ هەمووتان مالاوایی دەکەم. ئەوە ئاخرین وەسیەتی منە. تا رۆژێک ئێوە یادم بکەن.
ـ کام وەسیەت ؟
تراساکی بە دەنگی بەرز گوتی : « ئازادی یا مەرگ »
پیرە مێردەکان سەریان راوەشاند و چونەوە نێو چایخانەکە و گوتیان : « کاری سیفاکاسی پیر تەواوە. بێگومان عیزرائیلی دیوە. » بابە گەورە لە بەرامبەر مزگەوت راوەستا. دیوارەکانی مزگەوت فرە خاوێن بوون. تازە سپیان کردبوونەوە. دەرگای مزگەوتیش رەنگێکی زەردی جوانی هەبوو . پیرە مێرد بە نەوەکەی گوت :
ـ تراساکی ! دارێکی دەست دەبەو رەنگەکەی جوان تێک وەردە . دەمەوێ لێرەدا بە تایبەت زۆر هەوڵ بدەم. هەر پیتێکی بنوسم دەبێ کلکێکی پچوکی هەبێ. پاشان دەستیکرد بە لوسکردنی ئەو پیتەی لە دەرگای مزگەوت نوسیبووی. لەو کارەدا لێهاتوویی تایبەتی بە کار هێنا. بۆ ئەم کارە هێزی هەبوو. ئاخرەکەی هەستی بە هیلاکی کردگوتی:
ـ تراساکی با بچینەوە. کلیسا رابگرین بۆ رۆژێکی تر. ئەمجارە نیردیوانێک دێنین، تا سەر بورجی زەنگوڵە سەر دەکەوم.بۆ ئەو کارە دەبێ هێز هەبێ.
ـ بابە گەورە ئەشێ وریا بی تا نەکەوی .من لە گەڵ تۆ دێمە سەرێ.
پیرە مێرد گوتی : نا..نا! من ئەشێ تەنیا بچمە سەر ..تەنیا . ئێستا با بچینەوە.
لە گەرانەوەدا ماڵ پڕبوو لە ژن. چەند ژنی دێهاتیش رەگەڵ ژنەکانی ماڵێ کەوتبوون. خەڵکی گەرەکیش هەموو لە وێ کۆ ببوونەوە. تا گوێ بدەنە دەنگی کریاراسی پیر. گۆرانی بێژی گەرەک

که هاتبوه مالی پالەوان سیفاکاس. کریاراس تەنیا لەو ماڵە دەیتوانی تێرو پڕ بخواو بخواتەوە. لە کاتی پێویستدا دەیتوانی پەنابۆ ئەوماڵە بێنێ. ئەو پیرە مێردێک بوو بە ریشی دوولیزگەو درێژ وچاوی کاڵ.

لە شۆڕشی کریت دا کە هێشتا دمروت و هەرزە کار بوو، لە گوندی کاستلی مەڕی حەمە عەلی دەلەوەڕاند. کە زانی شۆڕش دەستپێکراوە، تفەنگێکی هەڵگرت و هەموو مەڕو ماڵاتی کابرای وەپێش خۆیداو بە دیاری بۆ شۆڕشگێڕانی برد. دوای شکانی شۆڕش، تورک بوونەوە خاوەن دەسەڵات، ئیتر کریاراس نەیتوانی بچێتەوە کاستلی. ناچار لە دەوروبەری «ریتیمنۆ»سەر گەردان دەسوڕایەوە،پاشان بوو بە چەرچی و دوایەش دەفەی لێدەدا. دەژنانی هەڵدەپێچاو لە سەر ئەوە لیٚیان دەدا. تەنانەت جارێکیان کەمی مابوو،کوستانداراسی مەرداری گەورەی چیای ئیدا، بەو چەقۆیەی بەرانی پێ دەخەسێنێ، ئەویش لە پیاوەتی بخات. چونکە وەدوای کروستالیتای کچی کەوتبوو. لەوانەشە بە راستی لە پیاوەتی خستبێ، چونکە دوای ئەو رۆژە ئیتر کریاراس تەواو ئاقڵ ببوو. ئارام و تەڵەویش ببوو. لەو دەمەشەوە گۆرانی گوتنی دەستپێکرد. گوند بە گوند دەگەڕا، شیعرو گۆرانی بۆ خەڵک دەگوت وخورجینی پڕ دەکرد. ژنی گوندی لێی کۆ دەبوونەوەو پێیان سەیر بوو کە چۆن دەتوانێ ئەوبەندانە رێک بخاو شیعر بهۆنێتەوە کە هەر کەس ببیستێ دەگری. لە شیعرەکانیدا شۆڕشی گەورە زیندو دەبۆوە. قارەمانی ئەفسانەیی لە قەبری دەهاتنە دەر. دیری ئارکادی دەتەقێنرا.. پیرە مێردەکان دەگریان و چاویان دەسڕی. لە دڵی خۆیاندا دەیانگوت: ئارکادی هێشتا بەر بەرەکانی دەکاو هەرچەندە هەمیشە هەر دەسوتێ. بە قەدرایی ئەو شیعرانە زیندوو ئەبەدی دەبێ.»

بە بیستنی شیعرەکانی خەڵک دەگۆڕان‌و باشتر دەبوون. پیاوە لەچەرەکان زاری کیسەیان دەکردەوەو دەرگای سندوقەکانیان ئاوالە دەکرد. خورجینی کراباراسیان پڕ دەکرد لە دانەوێڵە و نان وخواردەمەنی. هەرچەندی خورجینی پڕتربایە، سەروڕووی تاو بردووی خۆشتر دەبوو. ئەو رۆژە ژنانی گوندی لە دوور دیتبوویان. لە بەر ئەوەی لە دەشت و چیا دەسوڕایەوە لەوانە بوو خەبەری مێردەکانیان بزانێ. ژن وەدوای کەوتبوون وخستبوویانە بەر پرسیاران. بەڵام گۆرانی بێژی گەرۆک بە پەلە بوو، دەیویست زوو خۆ بگەیێنێتە ماڵە سیفاکاسی پیر، پرسی بوو.

کاتێ بابە گەورەو تراساکی هاتنەوە ماڵێ، کریاراس لە بەر ئاگری دانیشتبوو خۆی گەرم دەکردەوە. بابە گەورە بە خێرهاتنی کردو گوتی: سڵاو پالەوان شاعیر!

شاعیر لە جێ هەستا، سیفاکاس لەوی بە تەمەنتر بوو. بێجگە لەوە خاوەن ماڵێکی دڵ ئاوالەو شەر کەرێکی بە ناو بانگ بوو. لە بەر ئەوە کریاراس فرە رێزی لێ دەگرت. لە وەڵامدا گوتی:

ـ سڵاو ئەی پالەوان سیفاکاس! ئەی پیرە شێری کریت! ماوەیەکە من لە تاریفی تۆدا شیعر دەڵێم. دەمەوێ تۆ بکەم بە ئەبەدی. بابە گەورە رووی تێک نار گوتی: «جارێ راوەستە با بمرم پاشان..»

ماستراپاس کە چاوەڕێی بیستنی دەنگوباسی مێردەکەی بوو، پرسی:

ـ مامە کراباراس خەبەر چیە؟ مێردەکەم لەو سەرانە لە نێو بەرداندا چدەکا؟ فەقیرە ئەو قەت شەری نەدیوە. من خێزانی ماستراپاسی زەنگوڵە فرۆشم. دەزانی؟

گۆرانی بێژی شاعیر گوتی :« له پێشدا پێم خۆشه شتێک بخۆم و لێوێک تەر کەم تا هۆشم بێتەوە بەر. سەری من وەک خەڵەفی مێش وایە، ئەوەندە برسیم سەرم وزە وزی لێ دێت.»

بابە گەورە گوتی :

- نانی بۆ بێنن. گۆزەیەکی گەورەش شەرابی لە کن دانێن. زگی شاعیری گەڕۆک بێ بنە. ڕاست وەک ناوچەی مردوان دەچێ. هەرچەندی لێی بنێژی دیسان جێ هەیە.

شاعیری گەڕۆک پێکەنی. مێزێکی کورتیان بۆ هێنا. سفرەیان لە سەر ڕاخست، لە نێزیک ئاگر لە سەر عەرزی دانیشت. لاقی هاویشتە سەر لاقان‌وزاری بە قەدرایی زاری چاڵاوێک لێک کردەوە. ژنەکان کە دەورەیان دابوو بە سەر سور مانەوە تەماشایان دەکرد. بابە گەورەش لە بەرامبەری دانیشتبوو، سەیری دەکرد. تا ماوەیەک هەموو بێدەنگ بوون. بێجگە لە چیرەی دانی کریاراس و قوڵتە قوڵتی گۆزەی شەراب هیچ دەنگی دیکە نەدەهات.

ئاخرەکەی دەستی لە خواردن هەڵگرت. ڕیشی پاک کردەوە وجارێکی دیکەش گۆزەی شەرابی بە سەریەوە نا. چاوێکی لە سیفاگاسی پیر کرد کە بەرەو ڕووی دانیشتبوو. تەماشایەکی ژنەکانی کرد کە دەورەیان دابوو. قاچە درێژەکانی بۆ لای ئاگر ڕاکێشاو گوتی :« ئێستا هەر پرسیارێکتان هەیە بیکەن.»

ژن بە سەری وەر بوون. هەر کەس دەیویست دەردی خۆی گەورە تر نیشان بدا.: مێردەکەی منت دیت ؟ براکەمت دیت ؟ بریندار نەبیبوو! هێشتا زیندوە ؟...» هەموو چاویان دە زاری ئەو بڕیبوو. بەڵام ئەو نە کەسی دیبوو نە هیچی دەزانی . گوتی:« من بەو بەفرو سەرمایە چۆن دەمتوانی بە چیادا سەر کەوم.؟ من بە و برسیەتی و شەر و سەرمایە چکارم بەوێ هەبوو.؟ شیعر پێویستی بە هێمنایەتی و ئاسودەیی هەیە » کەوابوو کەسی نەدیبوو. بەڵام ئێستا کە تێری خوارد بوو، دڵی بە حاڵی ئەو ژنانە دەسوتاو بۆ لای یەکە یەکەیان ڕووی وەردەگێڕا و هەریەکەش وشەیەکی دڵخۆشی دانەوەی پێ دەگوتن.

کاتێک ژنەکان ڕۆیشتن چاوێکی لە بابە گەورە کرد و بزیەکی هاتێ‌و گوتی :

- هەمیشە باسی بەختەوەری بکە. خۆشیە ختی خۆی دێت. من لەوەی کە خەبەری خۆش قالب دەکەم، ئەرکی خۆم بە جێ دەگەیێنم. ئێستا ئەوە خودایە کە دەبێ ئەویش ئەرکی خۆی بە جێ بگەیێنێ و من بە درۆزن دەر نەیەنێ.

بابە گەورە تورە بوو گوتی :« کەوابوو تۆ بە درۆیان خەڵک دڵخۆشی دەدە یەوە »

کریاراسی پیر گوتی :« من بەندان هەڵدەبەستم، واتە دەبێ خەبەری خۆش بگێڕمەوە. ئەوەیە کاری من.»

- ئێستا کە خۆمانین و تەنیا من و تۆو نەوەکەمە، ڕاستی بێژە تو گەڕۆکێکی بە شارو گوندانەدا دە سوڕێیەوە. هەموو دەنگوێەک دەبیسی. بێژە بزانم چت بیستوە ؟ تۆ چاوی ڕوونت هەن. هیچ شتێک لە بەر چاوت ون نابێ. چ شتێکی سەیرت دیوە؟ باشە، مامە کریاراس اتۆ پێت وابە کریت هیوای وەر گرتنەوەی ئازادی هەیە ؟ بیستوومە ئێوەی شاعیری گەڕۆک کاتێ بە تەنیا دەبن لە گەڵ خودا دەدوێن. خودا چت پێ دەڵێ ؟ داخوا کریت ئازاد دەبێ ان نا ؟

کرایاراس سەرە زلەی خۆی بەرداوە. لە سینگی دا وشە تێکەڵ دەبوون و بە بێ ئەزمی‌دە هاتنە

گەرووی. تاوێک ڕاوەستا، تا باش بیر بکاتەوە. دوایە گوتی :

ـ ئەی سیفاکاسی پیرا ئێستا ئێمە تەنیاین. من دەمەوێ ڕازێکت بۆ دەرخەم کە تا ئێستا بە هیچ کەسم نەگوتوە. تۆ سەت ساڵ لە تەمەنت ڕابردوە، لە حەقیقەت ناترسێی ....

بابە گەورە گوتی: ... من لە حەقیقەت ناترسێم .

ـ کەوابوو گوێ بدەیە . کاتێک مەسیح هاتە سەر دنیا، سپی و زەردو ڕەش چوونە سڵاوی. لە کاتی مردنیشیدا دیسان هەموو میللەتەکان چوونە سڵاوی. کریتیش چووبوو. لە تازیەی ڕۆڵەکانیدا دەسماڵێکی ڕەشی لە سەر بەستبوو. کریت لە پشت سەری میللەتەکانی تر وێستا بوو. دوای هەموان خۆی بە مەسیح نیشاندا. ئاخر ئەو چۆن دەیتوانی لە گەڵ میللەتە گەورەکانی وەک ڕوس و ئینگلیس و ئەمریکا پێکەوە بچێتە لای؟ ناچار چاوەڕوان بوو تا هەموو ڕۆیشتن. پاشان ئەویش لە خاچ وەنیزیک کەوت و لاقە خویناویەکانی مەسیحی ماچ کرد. ئەوەندە مایەوە تا شەو داهات. تەواوی ڕۆژ هەتاو بەردەکانی سوور کرد بۆوە. بەشەو هەورەکان کۆ بوونەوەو ئاسمان تاریک داهات و دڵۆپەی درشت و گەرم دەستیان بە بارین کرد. ئەو دڵۆپانە باران نەبوون، فرمێسک بوون. مەسیح لەتاریکی و لە باراندا چاوەکانی کردەوە، لە نیزیک خاچەکەی خۆی ژنێکی ڕەشپۆشی دیت. پێی وابوو مریەمی پاکیزەی دایکیەتی. هاواری کرد: دایە...دایە..! بەلام کریت سەری هەڵێنا، بروسکێکی ڕووناک سینگی ئاسمانی قەڵاشتەوەو ڕوخساری کریت لە ڕووناکیدا دەدرەوشا. ئامێزی لێک کردەوەو هاواری کرد: ئەی مەسیح من مریەمی پاکیزە نیم. من کریتم ! مەسیح گوتی وەرە پێش ! کریت بە ترسو لەرزەوە چوە پێش. خاچەکەی لە ئامێز گرت و لاقە بزمارلێدراوەکانی مەسیحی ماچ کرد. زاری پڕبوو لە خوێن. بە ئارە ناو گوتی: « ئەی مەسیح بۆچی منت وێڵ کردوە ؟ »جارێکی تر لە سەر خاچەکەوە دەنگێک هات و گوتی : مەگری، دەستی ڕاستت هەڵێنەو تەماشا کە! کریت دەستی ڕاستی هەڵێنا. ئێستا خۆت لێکی دەوە کە لە ڕوناکی بروسکەدا چ دیت؟ دیتی کە لە قامکی چکۆلەیدا ئەنگوستیلەیەک دەدرەوشێ. بە دڵێکی لەرزیو، هاواری کرد: یا حەزرەتی مەسیح ئەوە ئەنگوستیلەی دەزگیرانیە، یان ئالقەی زنجیری دیلی و کۆیلەتیە؟ مەسیح بزەیەکی هاتێ، سەری بەرداوە و سرتەیەکی لە گەڵ کرد، کریت تێ نەگەیشت، پرسی :چت گوت ؟ ئەنگوستیلەی دەزگیرانی بوو یا ئالقەی دیلیەتی؟ بەلام وەلامی نەدایەوە. جارێکی تر هاواری کرد، بەلام کەس نەبوو.

کریاراسی پیر تاوێک ڕاوەستا و پاشان گوتی :

ـ کریتی فەقیر هێشتا هەر لەوێیە و لە بەر سێبەری هەور وباران وەک ژنی مێرد مردوو بە جلی ڕەشەوە وێستاوەو هەروا هاوار دەکات. کریاراسی پیر هەناسەیەکی هەڵکێشا. قومە شەرابێک لە گۆزەیدا مابوو، ئەویشی خواردەوە تا گەرووی تەر کاتەوە. لە بەر خۆیەوە گوتی : « بێچارە کریت » و لە جێ هەستا.

بابە گەورەش ڕابوو، کاترینای بووکی بانگ کرد و گوتی :

ـ ڕۆڵە ئەو گۆزەیە پڕکەوە لە شەراب، بە ڕاستی ئەو شەرابە گەیشتە موستەحەقی خۆی. پاشان ڕووی کردە کریاراسی پیرو گوتی : « ددانەکانت هەموو ساخن ؟ »

شاعیری گەرۆک بزەیەکی هاتێ و گوتی « تەنیا داتێکم کەمە، ئەویش دانی ئەقڵەو خۆم بە

گازی کێشام.»

بابە گەورە بە کاترینای گوت : « دوو مستی گوێز و بادامیش بۆ بێنە . » پاشان پیرە مێردی تا بەر دەرگا بەرێکردو دەستی دایەو گوتی :

- بڕۆ بە سلامەتی . ئەگەر لە شوێنێکی تر ئەو چیرۆکەت گێڕایەوە، لە کۆتاییدا لە قەولی مەسیحەوە وەلام بدەوە : « ئەوە ئەنگوستیلەی دەزگیرانیە ! » قەی ناکا، خۆت گوتت: باسی خۆشبەختی بکە ، خۆشبەختی خۆی دێت .

شاعیری گەڕۆک گوتی:

- ئارام بە پاڵەوان سیفاکاس ! ئارام بە . من ئەو چیرۆکە بۆ هەموو کەس ناگێڕمەوە. خۆم دزانم چدەکەم. بۆ هەر کەس بە قەد تێگەیشتنی خۆی.

بابە گەورە لە بەر دەرگا وێستا بوو، تەماشای گۆرانی بێژی گەڕۆکی دەکرد کە بە نێو بەفرێدا لە تەپۆڵکان سەر دەکەوت.

تراساکی دەستی بابە گەورەی گرتبوو ئەویش تەماشای میوانی دەکرد. کاتێ کریاراسی پیر لە بەر چاوان وتبوو، بابە گەورە رووی کردە نەوەکەی و گوتی:

- تۆ لە چیرۆکی مەسیح وکریت وئەنگوستیلەو دەزگیران هیچ تێگەیشتی ؟

تراساکی گوتی : « من چیرۆکی پەریانم پێ خۆش نیە. ئێستا ئیتر گەورە بووم.»

بابە گەورە بە ئارە ئار گوتی :« ئەگەر گەورە تر بووی، پێت خۆش دەبێ‌و بێدەنگ بوو .»

* * *

لەوکاتەدا کە شاعیری گەڕۆک چیرۆکی کریت و مەسیحی دەگێڕایەوە، پاشا لە بارەگای حکومەتی دانیشتبوو قەنەی دەکێشا. گرژو پەرێشان بوو. خەبەری ناخۆش لە قوستەنتەنیەوە دەگەیشت. خەبەري لەو ناخۆشتر لە چیای سلناوە دەهات.

بەو حاڵە لە سەرانسەری کریت پاڵەوانەکان لە جمو جۆڵ دەکەوتن ، دادەنیشتن و پێکەوە راوێژیان دەکرد. دەرگای هومێدیان لەسەر خۆ بە داخراو دەدیت. چونکە یونان و ئوورووپاو رووسیا پشتیان تێکرد بوون. تە نیا چەند کەسێک دوو دڵبوون،هەرچەند ئەوانیش بە حوکمی پێویست زوو سەر بەر دەدەنەوە.

سولتان رایدەگەیاند کە من کریتم مات کردووەو ئێستا تەقەی تفەنگی لێ نایە. ئەوەی پێشتریش بە دڵخواز دابووم بە خەڵکی وێندەری، لێیان دەستێنمەوە. چونکە بەو راپەڕینە نیشانیان دا کە نمەک بە حەرامن.

لە گەڵ ئەوەش لە بەرزاییەکانی چیای سلنا دەنگی تفەنگ هەر دەهات و دەگەیشتە قوستەنتەنیە . پاڵەوان میکێلس تەسلیم نەدەبوو. سولتان زۆر تووڕە بوو. کیسەیەکی بۆ پاشای کریت نارد بوو، خەبەري دابویە : « سەري پاڵەوان میکێلسی لەو کیسەیەدا بۆ بنێری.ئەگەر سەری وی نەنێری، سەری خۆی بنێری.»

پاشا چرژا بوو. کیسەکەي وەرگرت و دەملی خۆي کرد و سوێندی خوارد : « بە محمد سوێند دەخۆم کە بروام پێ‌بەتی، من ئەو کافرە لەعنەتیە دەکەمە قاورمەو دەرخواردي فەلانی دەدەم.

یەکەم کەس کە دەرخواردی دەدەم خەلیفەی نیمامی مەلعونی ئەوان دەبێ.» پاشا شیری لە خۆ بەست و لە پەنجەرە وەنیزیک کەوت. تەماشای چیاکانی کردو گوتی :

. کافری مەلعون قرە قەویە. دەستەی رێنگ و تارێنک لە هەموو لاوە گەمارۆیان داوە. رێگای ئاوو خواردەمەنیان لێ گرتوە بەلاَم تا ئێستا بێ ئاکام بوە... لە راستیشدا پاڵەوان میکێلس و هاوکارەکانی نانی وشکیان دەخوارد ویرسیەتی ئازاری دەدان. پاشا دەیزانی ئەوان لە چ وەزعێک دان. جارێک قاسیدێکی ناردە لایان وتەسپاردی :

. ئەی پاڵەوان میکێلس ! تۆو شەرکەرەکانت بە ئالاَو چەکەوە لە مەتەرێزان وەرنەدەر و بەدوای کاری خۆتاندا برۆن. من بە محمد سوێند دەخۆم ، ناهێڵم یەک تاڵە مووتان لە سەری کەم بێتەوە.

پاڵەوان میکێلس هەر بەو قاسیدەدا وەلاَمی بۆ نارد بۆوە و گوتبووی :« تا پشووم لە بەردا ماوە لێرە دەمێنمەوە. تەنانەت ئەگەر کریتیش تەسلیم بێ من تەسلیم نابم. ..... بەرێشت ..»

تورکی گەورە تێکچوو. شیروقایشی لە پشتێ کردەوەو لە بەر خۆیەوە گوتی :

. ئەی لەعنەت لە کریت و کریتیان ، لەعنەت لەو چارە تووس و لەو پاشایەتیە! من کە ناتوانم بەو سەرمایە بچمە چیاو بەدوای ئەو کافرە بکەوم. ناچار دەبێ عەسکەری حەساوە بنێرم. لە ئاگر وە نیزیک کەوت و دەستی لێکدان. سولەیمانی قولە رەش وەژوور کەوت. پاشا گوتی

. بزۆ سولەیمان ئارەق و بەرووم بۆ بێنە، ئەم شۆ نارەحەتم. دەزانی سولتان چ پەیامێکی بۆ ناردووم.؟

قولە رەش هیچی نەگوت . گیلاسی ئارەقی هێنادەرو چۆکی دادا مستە بەرووێکی خستە بن ئاگرەکە. پاشا دوگمەکانی کردەوەو لە سەر تەختی لێی کەوت و گوتی : « سولەیمانی مەلعون قسەیکی بکە پێم خۆش بێ. تۆ باش دەزانی درۆیان بهۆنیەوە. حکایەتێکی خۆشم بۆبکە. درۆش بێ تەیناگا.»

قولە رەش ددانە پان و سپیەکانی گڕ کردو گوتی : « پاشا ئەفەندم هەڵکەوتێکی خۆش. خەبەرێکی خۆشم پێیە کە دڵت وەک چوار باخ روناک دەکاتەوە.»

. دەست پێ بکە مەلعونی ناقولاَ. خوا خێرت وەرێ بێنێ. بێژە بزانم پاڵەوان میکێلس چەک دادەنێ یان نا ؟

. نا...پاشا ئەفەندم من خەبەرێکی دیکەم پێیە لەو خۆشترە . تۆ حەمیدە مەلای فاڵگرەوە دەناسی؟ ئەو ژنەی کە پیاوێکی پیرۆز لە حەسارەکەی نێژراوە. من ئەم شۆ چوومە لای، داوام لێکرد تا بە باقلە دوا رۆژی تۆ پێشبینی بکات. ئەو بە کیسە باقلەوە لە حەساری دانیشت. بێجگە لە باقلە گوێ ماسیلکەو ورتکە بەردو ئێسکی شەمشەمە کوێرەشی لە کیسەکەی دابوو. داهاتەوە فوی تێکرد و پاشان ویردو دوعای‌تایبەتی خوێند. لە نەکاو هاواری کردو شرەویرەی فاڵگرتنەوەی کۆ کردنەوەو دەستی بە سەمایە کرد. لێم پرسی حەمیدە مەلا چت دیت؟ باقلەکان دەڵێن چی؟ داخوا خەبەری خۆش هەیە؟ حەمیدە مەلا دووبارە دانیشتەوە و بە قامکان دەستی کرد بە تێک وەردانی باقلەکان و گوتی :

. پیاوێک دەبینم کەپەپاخی سووری لە سەرە وتەواوی دووگەی کریتی لە‹ کرابوسا ›وە بگرە

تادیری ‹تۆپلۆزی› دەگری. پاشاش دەبینم کە فەرمانێکی بە مۆری زێڕین و بە پیتی زێرکفت و بە نیشانی ئاڵتونەوە لە تورستەنتەنیە وەردەگرێ. سولتان لیرەی عوسمانی ، یا سەرشانی ئاڵتونی بۆ دەنێرێ. تەنانەت لە وانەیە کچەکەی خۆشی بداتێ. سوێند بە و پیاوە پاکەی کە ئێستا گۆڕی لە قسەکانە، باش بۆم لێک ناکرێنەوە...»

من لێم پرسی:«حەمیدە مەلا تۆ ئەو خوایە سەیر قسان بکە. باشە..ئەو هەموو شتەی باسیان دەکەی کەنگێ بۆ پاشای دێن تا بچم مزگێنی بدەمێ و مزگێنی باشی لێ وەربگرم .» حەمیدە مەلا سەری بەسەر باقلەکاندا گرت و تێکی وەردان وگوتی:

- لە ئێستاوە تا سێ وادەی تر دەگەنێ. زوو ڕاکە مزگێنی بۆ پاشا بەرە، تا خەم و خەفەتی نەمێنێ...

ڕاست ئەو کاتەی تۆ دەستت لێک دان، من لە گن حەمیدە مەلای دەهاتمەوە تا ئەو خەبەرە خۆشەت بۆ بێنم .

پاشا لە کاتێکا تەسبیحی کارەبای خۆی هەڵدەسوڕاند، بە سەر سوڕ مانەوە گوێی دابوە قسەکانی. ڕوخساری گەشابەوە و هاتەوە سەر خۆ و چاوی لە سەر یەک دانان و خەونی دەبینی کە پیاوەکانی سولتان بە کاروانی وشترانەوە لە ڕۆخی کاندی دابەزیون. باری وشتران هەموو دیاریە کە خەزوری واتە سولتان بۆی ناردوە کیسەی پڕ لە لیرەی عوسمانی و پڕ لە مرواری و دوڕ یاقوت و کیسەی پڕ لە هێل و دارچین. ژنێکی جوان و لەباریش کە کچی پاشا بوو. سەرتا پێ بە جلی ئاوریشم لە وشترێکی سپی دادەبەزی و بە لەنجەولار بە پلیکانانەدا بۆ بارەگای پاشا سەر دەکەوت.

سولەیمان بێدەنگ بوو. پاشا وەک لە خەوی خۆش ڕاپەڕیبێ، تێکڕابوو، بارێشکی هاتی و گوتی:

- سولەیمان تەواو بوو.؟

- بەڵێ پاشا ئەفەندم تەواو بوو.

- زۆر باشە ! کە وابوو قاوەیەکی سەر بە ترقاغم بۆ دروست کە. قاوەی باش خەو دەرەوێنێ. ئەرێ بەرۆکان نەبرژیون ؟

- ئێوە شتێکی وەک دیاری بۆ حەمیدە مەلا نانێرن ؟ پاشا بزەیەکی هاتی و گوتی :

- ئاخ... ئەی سولەیمانی خەرفاو ! ناهێ زۆریش دڵ بە وادە خۆش بکەی . لانیکەم ڕاوەستە لەو سێ وادانە دوانیان بگەنەجێ. کوله ڕەش لە بەر خۆیەوە گوتی :

- ئەم پاشایە ئەوەندەش ئەحمەق نیە وەک من بیرم لێ دەکردەوە. پاشان قاوەی لە سەر ئاگری دانا.

* * *

ڕۆژ دەهات ئاوا بێ. خەلیفە لە سەر کورسی نوسترقی دووربینەکەی بە دەستەوە گرتبوو، دەیڕوانیە دەریای کریت کە لە بەر شەپۆلان شڵەقا بوو. چاوەڕوانی کەمی بوو کە حەوتوی جارێک وەک قاسیدی نهێنی یونان دەهاتە کاندی. ئەمجارە دەبوایە فەرمانێک لە گەڵ خۆی بێنێ و دیاری بکا لەم کاتە قەیرانەدا ئەشێ چ ڕێگایەک بگرنە بەر. لە چیاکان چەند پاڵەوان ماون کە تەسلیم

تەبوون. ئەوانەی ئاقڵتر بوون هاواریان دەکرد :« بۆ خاتری خودا وەرن دڵمان رازی بکەن و چەک دابنێن. لێگەڕێن کە هەم خۆمان تێنێکمان بێتەوەبەر و هەم دایکی نەقیرشمان پشوێنک بدات. هەر چۆنێک بێ‌خودا گەورەیە ! هەمیشە ئەو دەرفەتەمان هەیە کە جارێکی دیکەش راپەڕین. »

ئەوانەی خوێن گەرم بوون، لە وەڵام دا دەیانگوت:« یانی ئەو دەستەی ئەتوانین بیبڕین ، ماچی بکەین ! حاشا، ئازادی یامەرگ ! » یونان لە کاتێکا خۆی دەلەرزی، هەرەشەی لە وەسمانی دەکرد، یا خۆی داوێشتە بەر پێی ئوروپا و دەپاڕایەوە کە یارمەتی بدەن. خەلیفە لە بەینی ئەم دوو بۆچۆنەدا حەپەسابوو. ئاقڵ پێی دەگوت : سەبر بگرەو ئارام بە. ئێستا سەر داخە. بەڵام دڵی شێت و شوری هاواری دەکرد: « ئازادی یا مەرگ » بە خۆشیەوە ئەم رۆژە دەبوایە قاسیدی نهێنی یونانی بگاتێ و رێگای بۆ روون کاتەوە.

خەلیفە تەواوی رۆژ بە دووربین دەریای پشکنیبوو. بەڵام ئاسمانی تاریکو دەریای شلەقاو گەمی ونکرد بوو. دیار نەبوو. لە بەر خۆیەوە گوتی :« دەبێ سەبر بگرین. سبەی رۆژ دەبێتەوەو دەنگو باسی تازە دەگەن. بۆ ئێمڕۆ جاوە روانی بەسە. » لە پلیکانان هاتە خوار و چوە کلیساو داوای لەخوا کرد کە دەریا ئارام کاتەوە.

* * *

لە گەڵ تێپەڕبوونی شەو. دنیا روناک بوو، پاپۆڕ لە دەریادا دەبینرا. رۆژ سەری دەسوێ نا و بۆنی عەتری گوڵان لە لای چیاکانەوە دەهات. کسماس هەوەڵین ئەوەی سیفاکاسی پیر لە سەر پاپۆڕ وێستا بوو، بە هەناسەی قوڵ هەوای نیشتمانی هەڵدەمژی. چەند گاشە بەردی گەورەو چەند تەک داری لێک بڵاو لە دوورەوە رەش دەچوون. لوتکەی چیاکان لە دوورەوەسووری دەنواند. لە جەنگەی زستاندا ئەو رۆژە رۆژێکی بەهاری بوو. خودا بەزەیی بە گیاندارو داعبایاندا هاتبوو، رۆژی بۆ دەر خستبوون. کسماس ملی راکێشابوو لە دیتنی نیشتمانی خۆشەویستی تێر نەدەبوو .ئەو لە تەمەنی بیست ساڵیدا کە تازە سمێڵی بۆر دەبوون، بە دڵێکی خەفەتبار نیشتمانی بە جێ هێشتبوو. ئێستا ئەوە دەیدیتەوە. ژنێکی گەنج ، لاوازو وردو رەنگ بۆرکاوی لە پەنا راوەستا بوو. ئەویش بە چاوی کراوەی پڕ لە ترس تەماشای کریتی دەکرد. کسماس بزەیەکی هاتێ و دەستێکی لە شانی ژنی جواندناو گوتی: « ئەوەش کریت ! » .

ژنی جوان تێکڕا بوو، تەنیا ئەوەندەی گوت : بەڵێ!

کسماس جارێکی دیکەش بەڵام سەبرتر گوتی :« لەم وڵاتەیە کە تۆ دەبێ کورت بێی. ئێرە نیشتمانی تۆیە. پاشان بە خۆشەویستی تایبەتیەوە گوتی :« نیشتمانی دیکەت لە بیر بەرەوە. »

ژنی جوان تەنیا گوتی : بەڵێ ...کسماس.. ئیتر بێدەنگ بوو..بەڵام لە پڕ باسکی مێردەکەی گرت و بە نیگەرانی گوشی.

دەتگوت دەیەوێ لە بوونی ئەو دڵنیا بێت. پاشان تۆزێ هاتەوە سەر خۆ.

وردە وردە کریت بە چیاو رەز و باخە زەیتونەکانی نیزیک دە بۆوە. کاندی لە زەردەی بەیانیدا شەبەتی دەدا. بۆنی گوڵان پتر دەهات. زەردەی رۆژێ لە لوتکەی چیاکان بۆ دەشتێ دادەکشا. گەیشتبوە بنارو دەهات بە دەشتیدا بڵاو بێتەوە. هەموو وڵاتی دادەگرت. دارەکان لە ئاسۆ وەدەر

دەکەوتن. کەڵە شێر لە هەوای بەیانیدا دەیانخوێند. دنیا وەخەبەر دەهات.

کــەماس رووی کردە ژنەکەی و گوتی:

. تۆ ئێستا لە ماڵی بابم وەژوور دەکەوی. تکات لێدەکەم مەترسێ‌و دڵت قەوی بێ. وا بیر بکەوە کە من هەمیشە لە پەنا تۆم. بیرلەوە بکەوە کە کوڕەکەمان لە زگی تۆدایە. نابێ بترسی. دایکم ژنێکی بە دینە تۆی خۆش دەوێ. بەڵام خوشکم، دەبێ پێت بڵێم کە ...

کــەماس بێدەنگ بوو، بڕۆی تێکنان. ژنەکە نیگەران بوو. چاوێکی لە مێردەکەی کردو گوتی :« چۆن ..؟»

. کاتێ خوشکم دوازدە ساڵانە بوو، باوکی پیرم بانگی کرد و پێیگوت : « تۆ ئیتر هەقت نیە بچیە دەرو نابێ قەتیش لە پێش من دەرکەوی ، نابێ بتبینم.» لەو رۆژەوە کیژی فەقیر لە ماڵێدا حەپس بوو. تەواوی رۆژ لە ماڵێ دادەنیشت، دەیچنی و گوڵدۆزی دەکرد. شتومەکی جیازی خۆی ئامادە دەکرد. کاتێک ئەو پیرە مێرد دەهاتەوە ماڵ، خوشکم گورج رایدەکرد و بە قوژبنێک خۆی حاشار دەدا. لە تەمەنی بیست ساڵیدا رۆژێک چاوی بە لاوێک کەوت کە بە پێش پەنجەرەکەدا هاتو چۆ دەکا و تەماشای دەکا. رۆژەکانی دیکەش ئەوە دووپات کرایەوە. ئەوێکیان دراوسێ پارچە کاغەزێکی لە لایەن ئەو کوڕەوە بۆ هێنا، رۆژەکانی دیکە ئەم نامە نوسینە دووپات کرایەوە. وادیاربوو لاو خۆشی دەویست و دەیویست خوشکم بچێتە خوار و پێکەوە قسان بکەن. تا یەکتر بناسن و ئاخرەکەشی بیخوازێ وشایی بکەن. ئاخرەکەی خوشکم دڵی بە لاوەکە سوتاو بە هۆی دراوسێکەوە وەڵامی دایە کە ئێوە شەو بێتە بەر دەرکێ دێمە دەرێ.

کــەماس بێدەنگ بوو، دەمارێک لە دەمارەکانی نێوان بڕۆی پەڕی و خوێن وە جوڵە کەوت. بێزاری و ترس و ئاقەرین لە لەشیدا بزوتن. کرێت لە بەر چاوی ون بوو. تارمایی پیرە مێردی رەحمەتی هاتە بەرچاوی کە بە هەڕەشە ئیشارەی بۆ دەکرد.

ژنی گەنج دەستی بە زاری مێردەکەیەوە نار گوتی: «بەسە ئیتر بێدەنگ بە ...بێدەنگ ...»

- نا...نا.. تۆ ئەشێ لە هەموو شت ئاگادار بی. ئەوە بیبیستە. بەڵێ شەو قەراریان دان. خوشکم بە پێخواسی و لە سەر خۆ تا دەنگی پلیکانان ئەیە هاتە خوارێ. بەڵام باوکم بە خەبەر بوو. دەنگی وی بیست و سەبر سەبر وەک دڕندەی وەحشی وە دوای کەوت. کیژەکە گەیشتە حەساریێ.تا ویستی دەرگا بکاتەوە پیرە مێرد ئامادەی بوو. پرچەکەی کێشا و بە چەنگ و نینۆک پێستی سەری دارووشاند. بە بێهۆشی رایکێشاوە ژوورێ و حەپسی کرد.و کلیلی دەرگاشی دە گیرفانی خۆی نا و لەم بارەشەوە هیچی بە کەس نەگوت. دوای ئەو رۆژە ئیتر خوشکم نەچوە بەر پەنجەرەو نە چوە بەر دەرگاش.

چەند ساڵ هەروا تێپەری تا بابم لە دژی ئارکادی کوژرا. ئەوەدەم بیست ساڵ لە روداوی ئەو شەوە رابرد بوو. بەڵام ئیدی خوشکم ئاقڵی نەمابوو. ئێستاش بە رۆژ لە ماڵێ کار دەکات. جلێ دەشوا، چێشت لێدەنێ. دەچنێ، گوڵدرووی دەکا. شتومەکی جیاوازی خۆی ئامادە دەکات. بەڵام شەو خەوی لە چاوی ناکەوێ. کە نیزیک نیوە شەو بوو پەنجەرە دەکاتەوە. تەماشای دەرەوە دەکات. ئەگەریە هەڵکەوت ڕێبوارێکی دی کەدرنگ دەچێتەوە ماڵێ. بە ترسەوە بانگی دەکاو دە پرسی:« نیوە شەو بوە ئاغا ؟ نیوە شەو ».

کـسماس دیسـان بێدەنگ بوو. دیمەنی ئەو پرچە خورمایی و ئەو چاوە کاڵانەو ئەو میهرەبانی و زەردەخەنەی خوشکی سەردەمی منداڵی دەهاتەوە بەر چاوی. دەتگوت تەماشای ئرتیانوسی قوڵیو لینیلْ دەکات کە لە ژێر لاقیدا پان بۆتەوە. چەند پی‌یەک هاتو چوو. تەماشای خوارەوەی کرد و لە ژێرخانی پاپۆڕدا چاوی بە عەسکەری تورک کەوت کە بە سەر یەکدا کەوتبوون. بۆگەنێکی لێدەهات، رووی وەرگێڕا. دەستی بۆ بەری کەوایەکەی برد کە نامەی نهێنی تێدا شارد بۆوە. لە بەر خۆیەوە گوتی:« کریتی فەقیر» پاشان رووی کردە ژنەکەی و گوتی :تۆ لەمەودوا دەچیە ماڵی بابی من، تکا دەکەم نەترسێی

ئێستا کریت پتر وەنیزیک دەکەوت. وەک جانەوەرێکی دەریایی بە ترس بەرەو پاپۆڕ دەهات. ئێستا کـسماس لە پشتی کاندی و لە لای خواروو، چیای ‹پوشتاس›ی دە دیت کە شکلْ و دارێژراوی وەک ئادەمیزاد دەچوو. ‹پوشتاس› سەرێکی گەورەی هەیە کەبۆ دواوە گەڕاوەتەوە. جۆرێکە دەڵێی بە سەر باخەکانی رەزو زەیتوندا تەماشای ئاسمانێ دەکا. ئێوچاوانی رەق و ئالێکەو لوتی وەک ئێـسک راپەو زارێکی گەورە و ریشێکی درێژ کە لە بەرە و هەڵدێرگە پێک هاتوە. دێوێکە رەش و عابی لە سەر پشت کەوتوە و مردوە. وە پەیکەرێکی بەردی خودایی بێ رەحم و بێ قەرەوڵ دەچێ کە پشت ملی تۆزێ لە عەرز بەرز کردوە و دەڵێی هێشتا وریایی لە کریت دەکا.

کـسماس تەماشای ئەم چیا شکلْ ئادەمیزادەی کرد و لە بەر خۆیەوە بیری لێ کردەوە:

. نا...نا... ئەو دێوە هێشتا نەمردوە. تا ئەو کاتەی گیان لە لەشی مندا دەجولێ، ئەو نامرێ. تائەو کاتەی من زیندووم بیر لەو دەکەمەوە ، بێدەنگ نابێ. لە وانەیە خەڵکی تر ئەویان لە بیر برد بێتەوە، بەڵام ژیانی ئەو بەستراوەتەوە بە بوونی من. ئەو پاسەوانی منە و منیش پاسەوانی ئەو. باوکی وەبیر دەهاتەوە و دەستی لێ هەڵدەگرت. کاتی کـسماس لەدەرەوە دەژیا، هەمو جارێ کە باوکی وەبیر دەهاتەوە لە ترسان دەلەرزی. بەڵام قەت وەک ئێـستا هەستی نەدەکرد کە ئەو رەحمەتیە وەها بەسەر بیری ئەودا زاڵە وهەموو لەشی داگرتوە. دووبارە بیری کردەوە کە : بێگومان ئەو هەست دەکا کەبۆ چی هاتوومەوە کریت و چ پەیامێکی نهێنیم پێیە. بەڵێ. ئەو... ئەو شەرگەرە نەترسە هەست دەکاو تورەیە. دەیەوێ خۆم بە سەر دابداو نەهێڵێ قـسە بکەم.

کـسماس خۆی تورە بوو. ئاوڕی داوە، تەماشای ژنەکەی کرد تا بەڵکوو تۆزێ لە هەڵچونی خۆی کەم کاتەوە. ژنەکەی لە شوێنی پێشەوەی پاپۆڕلە سەر کۆمەڵە تەنافێک دانیشتبوو. چاوە رەش و گەورەکانی دەشارێک بڕیبوو کە بە بورج و قەلاێفبونیزی و خانووی تەوی و منارەی سپی، تا دەهات نیزیک دەبۆوە.

کـسماس دەستی لە قەدی وەرهێناو پاشان دەستی لە سەر زگی هەڵمـاوی داناوهەستی بە گەرمایی لەش و بۆنی هەناسەی کرد و بە توندی دەیویـست سەری ئەو ژنە خۆشەویـستەی لە سەر تەنافەکان وەر گێرێ و نوقمی ماچانی بکات. لە ماوەی دووساڵدا کە چێژ و لەزەتی لە لەشی زەریف و ناسک و گەرمی ئەو ژنە بێگانەیە وەر گرتبوو، هێشتا تێر نەبوو. ژنێکی کە لە وڵاتێکی دوور و لە رەگەزێکی رەنج دیتوورخەفەتبار هاتبوە دەر. کـسماس هەستی کرد کە بابی لە وجودی ئەودا زیندوو بۆتەوە و بە نیگایەکی بێزاری تەماشای ئەو ژنە دەکات. لەو کاتەدا ئەڤینی لە

ئاست ئەو ژنە جوانە توندتر دەبوو. پتر بە خۆیەوە دەکوشی و پتر داشداری دەکرد وبە پیرە میردی نەدەسپارد. سەبروکە سەری بردە بن گوێچکەی ژنەکەی و گوتی :

ـ نوئیمی ! سوپاست دەکەم کە لەبەر من زیندووی !

ژنی جوان سەری بەردایەوەو خۆی بە سینگی میردەکەیەوە نووساند. دەتگوت دەیەوێ لە وجودی ئەودا بتوێتەوە و بۆ هەمیشە ون بێت.

رەنگی شەبەق دەگۆرا. گوڵێکی رەنگ پەریو لە بەیانیدا سپی و بریقەدار دەبوو. دەریا کە بە شەپۆلی لە شکڵی مەمک داپۆشرا بوو، ئێستا سەمای دەکرد و خۆی لە بەر تیشکی رۆژێ گەرم دەکردەوە. ئاسمان کە لە تەم ومژی بەیانیان پاک ببۆوە، بە رەنگی روونی عابی دەدرەوشا. ژنی جوان هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی :

ـ بابی من کە سالم بوو، هەموو رۆژێ بە بانی پەنجەرەی دەکردەوە و دەگریا و دەیگوت : « خودایە ! چەندە جوانە، چەندە عەجایبە ! » لە کاتێکا بینجگە لە دوکەڵی رەشی بوخاری و لێوارێکی باریکی ئاسمانی شین وخەڵکی دزێو وەشو رووتی لە سەرمان لەرزیو، چیتری نە دەدیت. ئاخ... خودایە ! جا ئەوە ئەگەر کریتی دیتبایە چی دەگوت ؟

پیرە میردێک کە شاڵوارێکی یونانی لە پێدا بوو، بە دیواری پاپۆرەو نوسابوو نیشانەی خاچی دەکێشا و گوتی :

ـ ئاخ..ئاخ.! کریتی فەقیر ! تۆ ئەگەر ژن بای‌دە چووبە بەهەشتێ ، بەلام حەیف دوورگەی. ئەوەی گوت وچاوێکی‌پر لە قین و بێزاری‌لەو سەربازە تورکانە کرد کە لە ژێرخانی کەشتی دەهاتنەدەرو دوگمەی لیباسەکانیان دادەخست و چەکەکانیان رێکو پێک دەکرد. پیرە مێرد لە سەر خۆ گوتی :

ـ ئەی سەگی دەمەلعون ! هیچ نازانن بە لاقی خۆتان دە چنە قەسابخانە. پاشان رووی کردە کسماس و گوتی :

ـ هاورێ باش تەماشایان بکە و بزانە چەند کەلاک لەوانە دێتە دەست. سوپاس بۆ خوا کە ئەمساڵ مەزراکانی جۆ بەرووبوی باشیان دەبێ. چونکە لاشەی تورک بۆ مەزرایە کودێکی باشە.!

ژنی جوان چاوێکی لە مێردەکەی کردو گوتی:

ـ ئەو کریتیانە چەندە توند و دڵرەشن ! من هەر دەڵێی دەچمە لێرەواری. پاشان بۆ ئەوەی لە تیژیی قسەکانی کەم کاتەوە، بزەیەکی هاتێ و گوتی :

ـ لام وایە بە زیندوویی لێرە ناچمەوە دەرێ. وشەکانی ئاخری ئەوەندە بە سەبر گوت نەدەبیسران پاپۆر گەیشتە لەنگەرگا. لە لای راست شێرە بەردینەبەکی ڤینیزی کە لە چیا بەردکاری کرابوو، ئینجیل بازێکی بە چنگیەوە بوو. لە لەنگەرگا بیوە هەرا، بۆنی لیمۆی رزیو ورۆنی زەیتون و خەرنوبی شامی لێرە دەهات. لە پشت لەنگەرگاوە دەریا دەکوڵی. کسماس دابەزی، دەستی بۆ ژنەکەی درێژ کردو لە سەر خۆ پێی گوت :

ـ لە پێشدا لاقی راستەت لە عەرزی دابنێ. پەنا بۆ خوا ! بەراستی هەقتە، تۆ ئەوە دەچیە نێو لێرەوار!

هەوەڵین جار لاقی راستەی ‹نوئیمی›کەوتە سەر عەرزی کریت .ژنی نەقیبر هیلاک و ماندوو

خۆی بە باسکی مێردەکەیەوە هەڵاوەسی و گوتی : من زۆر هیلاکم. ئارەقەیەکی ساردی بە لاجانگاندا هاتە خوارێ.

ـ ئازا بە ! ماڵی ئێمەدوور نیە، ئێستا دەگەینێ. کەوتنە رێ. کسماس بە تاسەو حەزێکی تایبەتیەوە تەماشای خانو وکۆڵان و زەلامەکانی دەکرد. هەموو شت پیر ببوو. قژە رەشەکان سپی ببوون. رووەمەتە پڕەکان داگەوتبوون. رەنگەکان بزرکا بوون. دیوارەکان روخا بوون و زۆریان وێران ببوون. کسماس دەستی ژنەکەی گرت و کوشی و گوتی :

ـ ئەوەش ئیشتمانی منە! بەڵێ. من لێرە، لەم عەرزەی پێی لە سەر دادەنێی هاتوومە دنیایەوە.

ژنەکە داهاتەوە مستە خۆڵێکی هەڵگرت و بۆنی پێوە کرد و گوتی :

ـ خۆڵێکی گەرمە. من خۆشم دەوێ. هەر لەو کاتەشدا کەوتەوە بیری‌ئیشتمانی دوور و سەهۆڵگرتووی خۆی .

هەرتکیان چوونە کۆڵانێکی تەنگ. کسماس دەستی ژنەکەی بەردابوو بە هەنگاوی خێراتر لە پێشەوە دەرۆیشت. دڵی توند لێی دەدا. بۆ لای راستە بایدایەوە. چوە نێو کۆڵانێکی تەنگ و لە دوور دەرگای ماڵی بابی ناسیەوە. دەرگا داخرا بوو، پەنجەرەی ئاتی سەرەوەش هەر داخرابوو. کەس لە کۆلانێ دیار نەبوو. لە هیچ کوێ دەنگ نەدەهات .کسماس لەو دەرگای کۆن و دەنگ بەرز کە چەکوچی قورسی ئاسنی لە سەر بوو، نیزیک بۆوە. ئەژنۆی وەلەرزە کەوتن. بەلام بە سەر خۆیدا زاڵبوو. لە دەرگایدا. دەنگی پێ‌یەک لە حەسارێ دەهات. یەکێک هەناسەی هەڵدەکێشا.

پاشان دەنگەکە بڕا. کسماس جارێکی دیکەش لە دەرگای دا. دەرگا کرایەوە. پیرێژنێکی کورتە باڵای باریکەڵە، بە سەری سپی و لەشێکی لاوازو رەشپۆش وەدەر کەوت. لە گەڵ دیتنی کسماس هاواری کرد و گوتی :

ـ رۆڵەکەم ...! پاڵی وە چوار چێوەی دەرگادا، تا نەکەوێ. خوشکی کسماسیش کزوداماو، بە قژێکی خۆڵەمێشی و چاوی زیت کە بروسکی شەیتانی و دڵرەشی‌یان دەداو پەیدا بوو. مەمکەکانی کە چەند ساڵ لە چاوەروانی ئەڤینداریدا تورت و توند مابوونەوە، ئێستا داچۆڕا بوون. چەندە کەیفخۆشبوون و چەندەیان ئەسرینی شادی هەڵوەراند.دەستەکان بە تاسەو ئاواتەوە ئەو لەشە خۆشەویستەیان دە ئامێز دەگرت. لەو کاتەدا کە دایک کوری بە سینگیەوە دەکوشی و جۆرێک قسەی لە گەڵ دەکرد کە دەتگوت هێشتا منداڵەو شیری دایکی دەخوا، لە پڕ چاوی بە ژنێکی جوان و جحێڵ کەوت کە لە دەرگا وێستا بوو. بە سەبروکە پرسی: «ئەوە فلانە کەسە»

ـ بەڵێ دایە .. ئەوە خێزانمە !

خوشکی کسماس بە دیتنی ژنەکە رووی وەرگێڕا. دایکی گوتی :

ـ تۆ بۆ چی ئەو ژنەت هێناوە ئەو جولەکەیە و تۆ بەم کارە خوێنی بنەماڵەی ئێمە پیس دەکەی .کور دەستە چرچەکانی دایکی ماچ کرد و بە سەبروکە پێی گوت :

ـ دا بە تکات لێدەکەم...

ـ تۆ لەتکە جەرگی منی و ئێستاش تکام لێدەکەی. بوونی من بەستراوەتەوە بە بوونی تۆوە. چت گەرەکە بێژە پێم !

ـ دایە ! من ژنەکەم بە تۆ دەسپێرن . خۆشت بوێ. پاشان بە دەنگێکی نەرم گوتی: کورەکەشم

بە تۆ دەسپێرم ....

دایکی راچڵەکی و تەماشای کورەکەی کرد. بێدەنگ بوو. بەلام بە چاوپرسیاری لێ دەکرد و لە بەری دەپارایەوە.

کور لە وەڵامی نیگای ئەودا گوتی: « بەڵێ دایە ! ئەو ئێستا ئەوەی تۆی لە زگی دایە ».

گەرمایێکی نەرم و هێدی بە سینگی پیرێژنێدا هات و گەرو و رووومەتیشی گرتەوە. شۆق و بزێوی لە ناخیدا زیندوو بۆوە. بەلام لە پر هەستی بە ترسێکی گەورە کرد. ئاهەنگی دەنگی خۆی نەرمتر کرد و گوتی :

. تۆ ئیجازەت لەو وەرگرتوە؟ ئەو دەزانێ؟ لەم ماڵە ئەو خاوەن دەسەلاتەو ئەشێ تۆ تکا لەو بکەی. من لەو دەترسێم .

دایک دەنگی نەرم کرد بوو، بە سرتە قسەی دەکرد تا روحی مردوو گوێی لێ نەبێ. کور کە خۆشی ترسابوو پرسی :

. ئەو دەتوانێ چبکات؟

. کورم من چوزانم . ئەو لەشی نیە کە خۆی بە ئێمە نیشان بدات و بزانین لە کوێیە ! هەر ئێستا لەوانەیە لە حەساری بێ و نەهێڵێ ژنەکەت بێتە ژووری. کور توڕە بوو. هاواری کرد :

. ئەو ناتوانێ هەر چی ویستی بیکا. ئەو ئیتر لەو ماڵە هیچ کاری نیە. ئێستا دەچم ژنەکەم دێنمە ژووری. لە کاتێکا لە بەر ترس و توورەیی دڵی دەلەرزی، چوە حەسارێو بە دەنگێکی توند بانگی کرد :

. وەرە کریسولا ! وەرە ژووری. دەستی ژنەکەی گرت و بردیە کن دایکی و گوتی :

. دایە ئەوەش کچی تۆیە ...

ژنی جوان داهاتەوە دەستی پیرێژنی ماچ کرد وچاوەروان راوەستا. دایکی بێ ئەوەی دەنگ بکا، تەماشای کەپۆی هەڵگەراوە و لێوی گۆشتن و قژی زەرد و چاوی گەورەی <نوئیمی> کرد و سەیری زنجیری باریک و ئاڵتونی ملی کرد وبێ ئەوەی دەست بۆ بوکێ درێژ بکا گوتی :« تۆ « غوسلی تەعمید » ت کردوە ؟

کور لە جیاتی ژنەکەی وەڵامی دایەوە :

. بەڵێ دایە « غوسلی تەعمید » ی کردوە و ئەوەش خاچەکەیەتی. هەروەها بەناوی تۆشم کردوە. لە پێشدا ناوی نوئیمی بوو، ئێستا کریسولا- یە. لاو زنجیری ئاڵتونی ملی ژنەکەی نیشاندا و خاچێکی ئاڵتونی جوانی لە بەرۆکی هاتەدەر.

دایک دوای تۆزێ رامان دەستی بە سەری بوکەکەی داهێناو گوتی :« بە خێر هاتی. گێشتیان چوونە ژووری . »

کسماس بە دڵێکی خەمبارەوە سەری ژوورەکانی دا. لە پلیکانان سەرکەوت و هاتەوە خوار. دەرک و پەنجەرەو مۆبیلە کۆنەکان و سەعاتی گەورەی دیواری و دەمانچەی زێوی باپیری تەماشا کردو پاشان پرسی :

. بابە گەورە حاڵی چۆنە ؟

. ئەو لە گوندی دەژی. ئێستا بۆتە سەت ساڵ. بەلام هێشتا بە هێزە. مەرگیش پێی ناوێرێ.

هەمیشە پرسیاری تۆ دەکات.

هەرتک ژن لە سەر نیوتەختی کۆن و درێژ دانیشتن. دایک تەماشای کوڕی دەکرد .چەند گەورە بووە! ئێستا بۆتە پیاو. زۆر وە پاڵەوان سیفاکاسی باپیری دەچێ کە بە نیگای گەرم و میهرەبان هەرچی دەستی لێدەدا خۆشی دەویست و دەیلاواندەوە. پیرێژن جاروبار لە بنەوە تەماشای ژنی کسماسی دەکرد و لە دڵی خۆیدا دەیگوت : « قسەی چیم هەیە لە گەڵی بکەم. ئەو لە رەگەزێکی دیکەیە خوداینکی تر خوڵقاندوویە، من خۆشم ناوێ.» بەڵام ژنی جوان تەماشای حەساری پڕ لە بەرد و گوڵدانی ریحانەو داری مێوی دەکرد کە لە بەر سەرما گەڵایان وەراندبوو. تە ماشای دەرەوەی حەسارو دەشتی پان و بەرینی بە بەفر داپۆشراو جەنگەڵی سەرما بردووی دەکرد. تەماشای شاری تاریک و عەسکەری چەکداری دەکرد کە شیری رووت بەدەستەوە دەرگای ماڵانیان دەشکاند و جولەکەیان دەکوشتن. بەفر لە ژێر ئەو خوێنە گەرمەدا دەبوو بە ئاو ، دەبوو بە قوڕێکی سوور و مێگەلە ئینسانێک لە ژن و منداڵو پیاو ، بە گریان بە نێو ئەو قوڕەدا رایان دەکرد.

ئاوڕی دایەوە دیتی پیرێژن تەماشای دەکا. هەوڵیدا بزەیەکی بێتە سەر لێوان، بەڵام نەیتوانی. ئاوی دەچاوان گەڕا. دایکی دڵی پێ سوتاو لێی پرسی :

- بیر لە چی دەکەیەوە؟ لە نیشتمانت ؟ لە کوێ لە دایک بووی ؟

- دوور..دوور... لە شارێکی رەش و پڕ لە فابریک و کارخانە....

- کارخانەی چی؟ لەوێ چ دروست دەکەن ؟

- کارخانەی تۆپ و تفەنگ و ماشێن ... بە لام باوکم ... دە بویست بڵێ باوکم مالم بوو، ماشینی ئینسان کوشتنی دروست نەدەکرد. بەڵام پەژیوان بۆوە. پیرێژن پرسی : بابت چی...؟

- باوکم پیاوێکی باشبوو. پیرێژن هەستا چوە حەسارێو لقە ریحانەیەکی قرتاندو هێنای دای بە بوکێ و گوتی : لە ولاتی ئێوە ریحانە هەیە ؟

- نا ... نیە .. پیرێژن گوتی : ریحانە بۆ هەوەڵجار لە سەر قەبری مەسیح شین بوە . پاشان بڵاوبۆتەوە.

خەبەری هاتنەوەی کسماس لە گەڕەکێ بڵاو بۆوە. ژنە دراوسێ بە هەراو شادی گەیشتنێ. ماڵەکەیان پڕ بوو. هەموو بە چوارچاوان ئەو ژنە جولەکە جوانەیانچاو لێدەکرد. دەتگوت حەیوانێکی سەیریان دیوە. تەماشایان دەکردو لێی وەنیزیک دەکەوتن.

یەکێک لە ژنەکان سەیروکە بە ویتری گوت : دەزانی بۆنی چی لێ دێ ؟

ئەویتر گوتی : بۆنی جولەکەی لێ دێت.. لێوەکانی خۆی گەست ...

کسماس بە حەز و خۆشە ویستی تەماشای ژنەکەی دەکرد. وەک تورنگێکی بریندار دەچوو کە کەوتبوە نێو پۆلە قازو مراوی و یا قەلە رەشە. بۆ ئەوەی باشتر تەماشای بکەن سەریان هەڵدێنا و دە پاتقیژاندو بێدەنگ دەبوونەوە. ماریا کەشەفی قاوەو موورەبای هێنا ژوورێ. پیر ببوو، چرچ و لۆی ملی بە دەسماڵێکی رەش داپۆشیبوو. راست رەک دوژمنی گیانی سەیری کریسولای دەکرد. ئەو ژنە لەوی جوانتر و شۆختربوو، براکەشی لێ داگیر کرد بوو.

کسماس هەستا. ئێستا ئیتر ئەو تاسە و ئاواتی دیتنی نیشتمانی کەم بۆوە. کاتی زیادی

ئەبوو بە فیرۆی بدات. بە خێرایی بەرەو بارەگای خەلیفە کەوتە رێ‌و گوتی : « دەچم کەمێک لە شاری کاندی دەسوڕێمەوەو سلاوێک لە ئیشتمانم دەکەم. »

* * *

خەلیفە لە سەر کورسی خۆی دانیشتبوو چاوەڕوانی بوو. لە بەیانی زوو کە دەنگی سوتی پاپۆڕی لە لەنگەر کاوە بیستبوو، نیشانی خاچی کێشا بوو لە بەر خۆیەوە گوتبووی : خوا بکا خەبەری خۆش و باشی بۆ ئەلان هێنا بێ.

کسماس خۆش دەڕۆی، تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد. وای .. ئەو شارە خۆشەویستە پیر ببوو. وردە وردە دەبوو بە تۆز و خۆڵ و بە دەم بایەوە بۆ ئەملاولا دەچوو. بێگومان ڕۆژێکی تر شارێکی دیکە لە سەر وێرانەکانی دروست دەکراوە. بەڵام ئەو شارە ئیتر شاری ئەو نەدەبوو. کۆڵانەکانی ئەو شارە پڕدەبوون لە لاو. بەڵام ئیتر ئەو لاوانە نەدەبوون لە دڵی خۆیدا گوتی : ئاخ ئەی کاندی خۆشەویست، حەیف ئێمە هەرتکمان پیر بووین.

گەیشتە بەرامبەر کلیسای سن میناس. درێژایی حەساری بڕی و سلاوی لەو پیرە دار لیمۆیە کرد کە خەلیفە هەموو ساڵێ لە جێژنی پاک دا، لە بن لقە گوڵکردوەکانی ئاهەنگی جێژنی پیرۆزی زیندوبوونەوەی خودای بە ڕێوە دەبرد. بە شێواوی تەماشایەکی دەوروبەری خۆی‌کرد نەیدەتوانی لەوێ مەحتەل بێ. بە ناچاریەکوڕجی‌لە پلیکانەکانی‌بارەگای خەلیفە سەرکەوت.

خەلیفە تێگەران و پەشێو ڕابوو گوتی : « سلاو کسماس ! ئەوە خودایە کە لەو کاتە تەنگەدا تۆ بۆ ئێمە دەنێری.! چت بۆ هێناوین؟! » کسماس دەستی خەلیفەی ماچ کرد، لە کاتێکا نامەی نهێنی لە باخەڵی دێنا دەرێ، گوتی :

. باوکی پیرۆز، ئەم نامەیەم هێناوە.

خەلیفە نامەی وەرگرت، پاڵی وە پەنجەرە دار مۆری سەری پاکەتەکەی لابرد. دەستەکانی لە خۆشیان دەلەرزی. لە پێشدا نامەکەی بە پەلە خوێندەوە. جارێکی تر بە سەبر و بە کاوە خۆ پێی داهاتەوە. ئاخرەکەی لە پەنا پەنجەرە واوە هات و لە سەر تەختێک لێی کەوت. دەستی بە سەروچاوی گرت و لە بەر خۆیەوە گوتی:

. کریتی فەقیر... کریتی هەژارو بێکەس !

نامەکە ئەوەی دەگەیاند کە : هیچ هومێدێک نیە. ئوروپایی نایانەوێ سولتانی عوسمانی نارەحەت بکەن. سولتان خۆی بە هێز دەزانێ و دەیەوێ چەند سەر پشکێنکی بە پێچەوانەی ویستی خۆی داوە بە کریت، بیانستێنێتەوە. جگە لەوە سەردارێکی بە دەسەڵاتی تەواو بۆ کریت ناردوە، تا بکوژێ و بسوتێنێ و مەسیحیەکان قەڵاچۆ بکا. ئەو جاریش چەک دابنێن، سەبر بگرن و یونان خوێناوی مەکەن. یونانی فەقیر دەیەوێ یارمەتیتان بدا، بەڵام ناتوانێ ...

خەلیفە سەری هەڵێناو پرسی : « کسماس ! تۆ خۆت دەزانی لەم نامەیەدا چ نوسراوە ؟ »

. بەڵێ ،، باوکی پیرۆز دەزانم ...

. من ئێستا پەیامێکی درێژ بۆ هەموو پاڵەوانەکان دەنێرم و داوایان لێ دەکەم چەک دابنێن . ئیتر خۆ نابێ گاڵتە بە سەری خۆمان بکەین. من تەنیا لە کەسێک دە ترسێم. ئەویش پاڵەوان

میکیلسی مامته. ئەو زەلامێکی لاسارو کەللە رەقە. ماوەیەک پێش پەیامێکم بۆنارد کە بە تالاو چەک وسوارەکانیەوە لە چیا بێتە خوارێ و دڵنیا بێ کە پاشا داوێکی لە سەری کەم ناکاتەوە. دەزانی چی وەلامی من دابۆوە؟ گوتبووی : « باوکی پیرۆز ! داخوا من قەت خۆ لە کاروباری ئوێژی تۆ هەڵدە قوتێنم ؟ کە وابوو تۆش دەست لە کاروباری من وەر مەدە. من سەر بۆ تورکان دانانوێنم . مردن لەو کارە بە باشتر دەزانم » ئێستا ئەی کسماس ! تۆ پێویستە بچی و ببینی و بە وردی قسەی لەگەڵدا بکەی .

. باوکی پیرۆز من دەچم . بەلام هومێندم بە سەر کەوتن نیە. ئەویش وەک بابی من کەللە رەق و لاسارە.

لەو کاتەدا دەنگی تەپڵ و شەیپور و حیلەی ئەسپان و رمەی پێیان دەهات. خەلیفە بە پەشۆکاوی رووی کردە کسماس .

کسماس گوتی : « ئەوان عەسکەری تورکن. من لە گەڵ ئەوان هاو سەفەر بووم. لە لەنگەرگای کانە سواری پاپۆریان کردن. ئەوانە ناردراون تا کریت بە ئاگر و ئاسن وێران بکەن. »

خەلیفە چارێکی دیکەش گوتی : بیچارە کریت! لە کاتێکا دەستی بەرەو ئاسمان هەڵێنابوو هاواری دەکرد و دەیگوت :

. خودایە تا کەی ... تا کەی ؟

هەرتکیان بێدەنگ بوون،هەرتک بە ناهومێدی بیریان لە کریت دەکردەوە. ئاخرەکەی خەلیفە بۆ ئەوەی نەختێ فیکریان بگۆرێ گوتی :

. تۆ ماوەیەک لە فەرەنگ بووی، لەوێ خەبەر چیە ؟ تۆ چت دیوە ؟ ئێمە لێرە لە چۆل و بیابانی رووت دەژین.

. لە وێ گەلێک شتی باش و زۆری خەراپیش تێکەڵە. لە کوێوە دەست پێبکەم ؟

. داخوا فەرەنگی باوەڕیان بە خودا هەیە ؟ تەنیا دەمەوێ ئەوەی بزانم.

. ئەوان باوەڕیان بە خودایەکی تازە هەیە. کە بێ روحە وتواتایە. لەوانەیە رۆژێک توانای ئەو لەرادە بەدەر بێت.

. ئەوە چ خودایێکە؟

. زانست . !

. ئەو خودایە فیکرێکی بێ روحە، کەوابوو شەیتانە

. باوکی پیرۆز ! ئێستا کەوتووینە نێو بورجێک کە بورجی دریشکی پێ دەڵێن. بە واتەیەکی تر بورجی شەیتانە.

. خەڵکی تر رەنگە، بەلام ئێمەی کریتی نە خێر . ئێمە ئامالجێکمان هەیەو ئیمانێک کە لە خۆمان بەرزترە و دژی بەرژەوەندی ئێمەیە. ئێمە هێشتا لە بورجی خودا نەهاتووینەدەر.

کسماس وەلامی نەدایەوە. وەلامدانەوەی فایدەی نەبوو. دەبوایە چ بێژێ ؟ خەلیفە کابۆلەیەکی پیرو بە ئیمان، جگە لە ئیمان پالپشتێکی دیکەی نەبوو. خەلیفە درێژەی پێداو گوتی :

. رووس و کریتی وەک یەک وان . رووسیش هێشتا لە بورجی خودا دەرنەچوون. کاتێ من لە شاری کیف ئوسقوف بووم. زانیم ئیمان چیە و چۆن خودا دێتە سەر عەرز وچۆن بە رێگادا دەرواو

چۆن لە گەڵ ئادەمیزادان دەپەیڤێ. تا ئەو کاتەی رووسیا هەبێ من ترسم نیە.

کسماس رابەر گوتی : «باوکی پیرۆز من تۆ بە تەنیا بە جێ دێڵم. تا بتوانی ئەو پەیامەی بۆ پاڵەوانانی دەنێری بینووسی، نابێ کات بە فیڕۆ بڕوا ..»

- بڕۆ کوڕم .. دوعای خێری من لەگەڵت بێ. سۆزی وەڕەوە لام. من گشت ریش سپیەکان لێرە کۆ دەکەمەوە، دەمەوێ تۆ لە گەڵیان بدوێی .

* * *

شەو کاتێ کسماس گەڕایەوە لە پلیکانی ژوورێکی قەدیم سەر کەوت کە لە گەنجایەتیدا ژووری ئەو بوو. دیتی ژنەکەی پاڵی داوەتەوە دەگری. دەستی دە لەدی وەر هێنا، پرچەکانی لاواندەوە، چەنەگەی لە دەستی گرت، روخساری بەرز کردەوەو تەماشای چاوەکانی کرد. ژنی جوان بزەیەکی هاتێ. پیاوەکە گوتی: بۆ وادەکەی ؟ چییان لێکردووی ؟

- هیچ... هیچ.... تەنیا هیلاک و ماندوم . دەو چاوی لە نێو دەستەکانیدا شاردەوەو بێدەنگ بوو. دوای ئاوێنک گوتی :

- ژنەکان هەموو تەماشای منیان دەکرد و لوتیان بادەدا و روویان وەردەگێڕا و سرتەیان دەکرد. دایکت دڵی بە من سوتا، رابەر گوتی: «دۆستەکانم، باشترە بچنەوە ماڵی خۆتان، ئێمە ماندووین، سبەی یەکتر دەبینین.» پاشان دەستی منی گرتو هێنامی بۆ ئەم ژوورە، دەیگوت ئەوە ژووری تۆیە. تۆزێ داهاتەوە دیاربوو دەیەوێ ماچم بکات، بەڵام پاشان دەستی راگرت، تەنیا گوتی: درێژ بە گوێ مەدە قسەی ئەوانە، وابکە بخەوی .منیش هەروا لە چاوەروانی تۆدا دانیشتووم.

کسماس داهاتەوە، پرچەکانی لە پشت ملی لادار ماچی کرد. ژن چاوی لە سەر یەک دانان و بزەی هاتێ. لەوکاتەدا مانگ هاتبوە دەر و روخساری روناک کردبوو. کسماس لە دیتنی رەنگی بزرکاوی ترسا. لە ئامێزی گرت و لە سەر تەخت درێژی کردو بە سرتە پێی گوت :

- بنوو خۆشەویستم ... بنوو. تۆ هیلاکی.!

ژن دەستی مێردەکەی گرت و گوتی بە تەنیا خەوم لێ ناکەوێ تۆش لە پەنا من بخەوە. داوێنی مێردەکەی گرت و دەستی لە لەدی وەر هێنار خۆی بە سینگیەوە نووساند و پاش ئەوەی کە بە زمانی دایکی ئارە ئارێکی کرد ،خەوی لێ کەوت.

مانگ لە ئاسمان هەروا بەرزدەبۆوە. کسماس کەوتە یادی شەوگەلی شیرین و پڕ لە بیرەوەری گەنجایەتی کە لە گەڵ دۆستەکانی بە قسەو باسی هاروژێنەر لە بارەی مەسەلە چارە سەرنەکراوەکانی جیهان رایاندەبوارد. لە کوێوە دێین؟ بۆ کوێ دەچین ؟ بۆ چی هەین؟.. ئەم جۆرە پرسیارانە کە زەینی گشت لاوانی جیهانی بە خۆوە خەریک کردوە.

مانگەشەو مەلافەیەکی سپی بە سەر تەختی خەو دادابوو. لۆوە ئاڵتونەکانی «نوئیمی» لە سەر باڵێف دا بڵاو ببوونەوە، وەک کرمی ئاوریشم بریقەیان دەدا. روومەتی وەک مەڕ مەڕ دەدرەوشا. کسماس دەستی درێژ کرد تا نازی بکا. بەڵام لە ترسی ئەوەی نەکا وەخەبەر بێ، وازی لێ هێنا و گوتی :

- من لە رادە بەدەر ئەو ژنەم خۆش دەوێ. چونکە چاکەی زۆری لە گەڵ من کردوە. فیکرو دڵی

منی کردۆتەوە و فێری کردووم تا ئەو ڕەگەزە بێگانانەشم خۆش بوێ کە لە پێشدا لێیان بێزار بووم. فێری منی کردوە تا بیروباوەڕیان تێبگەم و بیانناسم کە دایم دژیان خەباتم کردوە، بزانم کە ئادەمیزاد گشتیان لە گەوهەرێکن. ئەو شەوەی لە گەڵی بوومە ئاشنا، مەلائیکەتێک دەستی گرت و بۆ لای منی هێنا. کسماس سەری ڕاوەشاند و بزەیەکی هاتێ و گوتی :

. مەلائیکە هەر نیە، ئەوە خۆم بووم دەستم گرت و جگە لە خۆم کەسیتر نەبوو. کەوتە یادی کتێبخانەیەک لە شارێکی دووری شیمال کە چووبوە ئەوێ و دارای کتێبی خۆشەویستی خۆی کردبوو بە ناوی « ئاوازە کانی چیتی زنجیرەی سونگ ». کتێبەکەی نە دیتبۆوە، هەروا گزرداماو بە شەقام دا دەسوڕاوە. چاوی بە کیژێکی جوان کەوتبوو کەوایەکی ئاوریشمی نارنجی لە بەردابوو بە کۆلاندا دەڕۆیشت . ئەو ڕەنگی‌نارنجی‌لە هەموو ڕەنگێک خۆشتر دەویست. کیژەکە لە بەر ڕوناکی ڕۆژێ ئاوێنگ دەدرەوشا و پاشان ون بوو. هەستێکی لە ڕەمزی جوانی و خەم لە دڵی ئەودا بە جێ هێشتبوو. خێرا ئەو فیکرە بە مێشکی دا هاتبوو کە :« ئەگەر بخوازم دەتوانم بیگەمێ و بیکەم بە ژنی خۆم. ئەگەریش نە خوازم ئەوا هەر لێرە دەمێنمەوە و وازی لێ دێنم با وەدوای کاری خۆی بکەوێ. من بەتەواوی ئازادم. بەڵام بە ڕاستی دڵم چی گەرەکە ؟ »

دەستبەجێ کەوتبوە بیری ئەو شوانەی کریتی کە لەت نەچووبوە کاندی. وای دەزانی کاندی شارێکی گەورەیە. بیستبووی کە کاندی بەهەشتەو هەموو نیعمەتی نرخگرانی سەر زەوی لێ هەیە وەک لە چەکمەی سپی دوو تەختەوە بگرە تا تفەنگ و شیر وکیسەی پاقلەو ماسی ‹موروو› ،ژنی جوان کە بۆنی عەتر و سابوونیان لێ بێ تێیدا هەیە.

شوانی‌گزرین ساڵەهای ساڵ لە فیکری ئەوەدا بوو کە دەستی بەو بەهەشتە ڕابگاو حەسرەتی گەیشتنی لە دڵدا بوو. ئاخرەکەی ڕۆژێک‌خۆی پێ ڕانەگیرا، چەکمە کۆنەکانی بە سەر شانی دادا، تا لە ڕێگا نەیاندڕێنێ، لە چیا داگەڕا خوارێ و ڕێگای کاندی گرتە بەر. حەوت سەعاتان بە ڕێگادا کوتای، تا شەو گەیشتە دەروازەی شار. بەڵام لە پڕ هەستی بە شەرم کرد، چونکە نەیتوانیبوو بە سەر خەیاڵی خۆیدا زاڵ‌بێ.. بە گزچاتی شوانی لە دەروازەی شاری‌داو هاواری کرد: « ئەگەر بمەوێ دێمە نێو شار، ئەگەر تەشمەوێ پێی تێ‌نانێم و نایەمە ژوور. » هەر لەوێوە بەرەو چیا گەڕایەوە .

بەڵام ئەو ڕۆژە کسماس بە ئارەنار لە بەر خۆیەوە گوتبووی:« من دەچمە ژوورێ ! » وەدوای کیژە جوانەکە کەوتبوو. کەوای ڕەنگ نارنجی لە نێو ئەو خەڵکە ڕەشپۆشەدا دیار بوو. کسماس وەدوای کەوتبوو، کیژی جوان ئاوڕی دابۆوە و بە ترسەوە تەماشای کردبوو. کسماس پێی گوتبوو: «لەو کاتەوە کە تۆ بە شەقام دا دەڕۆیشتی، من بیرم کرد بۆوە : « ئەگەر بمەوێ ئەوا دەگەمە ئەو کیژەو دەبینە دۆستی یەکتر. ئەگەر نەشمەوێ، ئەوا لێی دەگەڕێم با وەدوای کاری خۆی بکەوێ. پاشان بڕیارمدا، بەڵێ دەمەوێ. »

کیژی جوان بە چرژاوی تەماشایەکی کرد بوو، گوتبووی :« تۆ یادێنی و یا شاعیر . بەڵام من کاتی ئەدەم نیە .»

. وەرە پێکەوە بڕۆین و نەختێ قسەی خۆش بکەین. ئاخرەکەی بڕیار دەدەین.

کیژی گەنم جارێکی تر گوتبووی من کاتم نیە .. دەمەوێ بڕۆم ..

- بۆ کوێ دەچی ؟ کیژەکە بە دەنگێکی لەرزۆکەوە گوتبووی: «دەمەوێ بڕۆم .»
کـساس کە نارەحەت ببوو، باسکی گرتبوو بە توندی گوتبووی : مەڕۆ لە گەڵم وەرە .. ئاهەنگی دەنگی کیژەکە، لاوەکەی ترساندبوو، لەوکاتەدا کە گوتبووی : نا.. من دەڕۆم . چونکە دەنگی وە هاوار دەچوو. وەگ هاوار بکاو «ئەی هاوار..ئەی هاوار..» .کیژەکە تەماشایێکی لاری کردبوو، بۆ باریکەکانی کە لە سەر چاوانی پێکەوە لکا بوون، تێک نابوو. هەست دەکرا کە هەموو ژیانی بەوەدەمەوە بەستراوەتەوە و چارە نووسی‌لەو چەند وشە ئینسانیەدا کورت کراوەتەوە کە بێژێ: دەمەوێ، یان نامەوێ.
کـساس دووپاتی کردبۆوە وەرە. کیژەکە پرسیبووی : بۆکوێ ؟ هیچ کوێ !
دیسان وەک منداڵێکی زمان بۆ شکایەت بکاتەوە گوتبووی : ئاخر بۆ کوێ ؟
لاو گوتبووی :« هێندێک پێکەوە دەڕۆین، پاشان تۆ بڕۆ ...ژیان کورتە... بۆ گوتن چیمان هەیە، با بیڵێین .»
کیژەکە سەری رەنگ هەنگوینی بادابوو گوتبووی :« باوابێ. تا کات هەیە، چیمان هەیە بۆ گوتن با پێکەوە بیڵێین ... ژیان کورتە... با بڕۆین ...».
چووبوونە نێو باخ.. رۆژئاوا کە لە سەرەتاوە رەنگی زەردی هەبوو، کەمرەنگ دەبوو، سەبر سەبر رەنگی دەگۆڕا. هەرتک خۆش خۆش قسەیان دەکرد و پشوویان سوار ببوو. هەر تک بە پەلە بوون. لە پێشدا کـساس وەدەنگ هات تا هێندێ کاتەوە. باسی کریت و ئەم دوورگە بە ترس و خۆشەویستە و باسی باوکی ئەو دێوە بەسامەو باسی دایکی ئەو ژنە پیرۆز و زەحمەتکێشەی بۆ دەکرد. کیژی جوان بە پەشێوی گوتبووی: « تۆ چۆن ئاوا بە هەستی بڕوا لەگەڵ من دەدوێی!»
لە وەڵامدا گوتبووی : « لەبەر ئەوەی تۆ دەڕۆی و منیش دەڕۆم. ئیتر بۆناخافتن کاتمان نامێنێ...لە رابردوودا پیاوان بۆ گەیشتن بەم خاڵەی کە ئەم شۆ ئێمە پێی گەیشتووین، چەند ساڵ کاتیان رادەبوارد .»
هەرتک لە سەر تەختی دانیشتبوون . کوری لاو پرسیبووی : ناوت چیە :
- نوێبمی ..
- کەوابوو قسە بکە نوێبمی .. داستانی ژیانی تۆ لەوانەیە زۆر خەفەتبار بێ. بڕوا بەمن بکە، چونکە من کریتیم.
- کریتی ...یانی چی ؟
- کریتی یانی پیاوێکی گەرم و بە تین ... نویبمی !
کاتێ رابوون ببوو بە شەو. دڵی کەساس پڕ ببوو لە تین و خەفەت. ئەم کیژە جوانە گشت خەمی جیهانی لەدڵدا بوو. وتەکانی وشە بەوشە پەردەی لەسەر بێشەرمی و بێشەرەفی و شێتی ئەو جیهانە لادەدا. لاو لە کاتێکا دەموچاوی لە نێو دەستەکانیدا شاردبۆوە، گوێی دەدایەو لە خەیاڵدا نوقم ببوو:
« قازاخەکان بە سواری دەهاتنە نێو شار. وەنێو گەڕەگی جولەکان دەکەوتن، دەرگای ماڵەکانیان دەشکاند. پیاوەکانیان دەکوشت پیرە مێردو ژن ومنداڵیان گز دەکردەوە. باوکی نوێبمی ئەو ماڵە پیرە ریش چەرموکەیان وە پێش دەستەی خستبوو، هەموویان لە بەفریدا وەپێش خودابوو.

شەووروژ بە تیو پەفردا رایاندەدان.
دەم بە دەم دەتوانەوە. لەلای راست و چەپ هەرجارە یەک وەعەرزی دەکەرت. زوربەی کەوتوەکان ژن و منداڵ بوون. نوئیمی زوڕ زوڕ دەگریا. کساس دەستی لە قەدی وەرهێنابوو گوتبووی: تو خوت چون رزگاریت هات ؟
کیژەکە لە پر هاواری کرد بوو : ناژانم ... هیچ لە من مەپرسە ...!
کساس دەستی بە پرچەکانیدا هێنا بوو، پرسیبووی : « باشە ئەم ئیوارەیە بو کوێ دەچوی بو وا بە پەلە بووی؟»
نوئیمی سەری هەڵێنابوو گوتبووی : « من بریاری خوم دابوو یەکێ لە ژنە دوستەکانم ئەو کەوا نارنجیەی دابوو بەمن. سەرم شوشتبوو، پرچەکانم بە شانە کرد بوو دەرزیشتم. لێرە توزێ وەستابوو. پاشان لە سەرە خو گوتبووی: دە رویشتم خوم بکوژم و کوتایی بەم ژیانە بێنم . »
کساس داهاتبوو دەستەکانی ماچ کرد بوو. پاشان گوتبووی : وەرە با بروین !
- بو کوێ ؟
- لە گەڵ من وەرە نوئیمی ... گوتم بو کوێ؟
- بوچی دەپرسی ؟ ... بروا بە من ناکەی ؟من هێشتا نازانم توم خوش دەوێ یان نا. بەلام بە تەنیا بە جێت ناهێلم. هەموو توزیان بە جێ هێشتوە، بەلام من بە جێت ناهێلم .
کیژی جوان سەری بەردابوو. کساس بە تاریکی روخساری نە دەبینی. مات و هێدی چاوەروان بوو. هەستی دەکرد کیژی بێ کەس لە گەڵ باپیرەکانی کە مالی جولەکان بوون، راوێژ دەکات. خەریکە بریار بدا. لە پر نوئیمی سەری هەڵێنابوو بە دەنگێکی گیراولیراو گوتبووی : با بروین! دەستەکانی بو لای لاو درێژ کردبوو.

* * *

ئاخرەکەی مانگ ئاوابوو دنیا تاریک داهات. دایک و خوشک لە ژووری خوارەوە بە خەبەر بوون و بە سەبرکە قسەیان دەکرد. کساس دەنگی ئارام و یەک هەوای دایکی دەبیست، وەک دەنگی روبار دەچوو لە شەودا. سەگێک بە سوز قوراندی و پاشان بێدەنگ بوو. لە حەساری بونی ئەو ریحانانە دەهات کە سەردەمی گەنجایەتی حەساریان بوندار کرد بوو.
ریحانەو گوڵی خەنەو یاسەمین، یاری کون و خوشەویستی ئەو بوون. کساس هەناسەی قوڵی هەڵدەکێشاو هەر وەک حەساری مالی بابی زەینی پر لە گوڵ و گوڵدان بوو.
چالاوێکی ساردیش لە حەساریدا بوو. لە بەر خویەوە بیری دەکردەوە : ئەوەش نیشتمانی من... ئەوەش ئەم خانوە ی لە نێویدا گەورە بووم، ئەوەش ژنی من .!»
لەو کاتەدا کە کساس بیری لەو شتانە دەکردەوە و عەتر و فێنکی ماڵەکە هەموو لەشی داگرتبوو، پەنجەرەی ژووری خوشکی کرایەوە. سەعات دەبوایە لای نیوە شەو بێ. کساس تارێک گوێی هەڵخست. هەموو شوێنێ مات و بێدەنگ بوو. پاشان لە کوڵاندەنگی هەنگاوان دەهات. رێبوارێکبوو، وەدرنگی کەوتبوو. لە پر دەنگێکی خەفەتاوی و گیراو هات و پرسی :نیوە شەو تێپەریوە ئاغا؟ ..نیوە شەو رابردوە ؟ دەنگی پێ برا، پەنجەرە پێوە دراوە. حارێکی تر مەتی و

بێدەنگی بەر قەرار بوو. کـسماس لەرزی و لە بەر خۆیەوە گوتی :
ـ ئاخ.. خودایە .. چەندە خەفەتبارە ..! دەستی بە روومەتی خۆی داهێنا ، ئەسرینیان پێدا هاتە خوارێ. ئەو شەوە نەیتوانی بنوێ. لە چاوەروانی رۆژێ‌دا چاوی لێک نەنا. کاتێک تازە گازیوەی بەیانی دەدا، لە جێ هاتەدەر، بە یەواشی تا ژنەکەی وەخەبەر نەیە، لیباسی گردە بەر، لە پلیکانان هاتە خوار و لە جێگای بابی لە سەر نیو تەخت دانیشت. دەتگوت لە سەری داوە کە بە گۆ مردووی پیردابچێ و شوێ لە گەڵ بکاو لەو جێگایەی لێی دادەنیشت و لەو جێیەی لێی دەنوست و لەو خانو و حەسارەی تێیدا دەژیا، وەدەری بنێ. دەرگای لەسەر داپخا و نەهێڵێ بێتەوە ژوور تا زیان بە ژنەکەی نەگەیێنێ.

ئەو ترسە کۆنانەی کە لە ئورووپا پێی وابوو لە دەستیان نەجاتی بوە، لە ناخیدا زیندوو دەبزوونەوە. دڵی هێشتا ئەشکەوتێکی تاریکی پڕ لە خەون بوو.

خوشکی بە رەنگی زەرد و رووی گرژ پەیدا بوو. کە دیتی براکەی لە جێی باوکی دانیشتوە، ترساو پاشەو پاش گەرایەوە. دەتگوت پێی وابوو باوکی زیندو بۆتەوە و دیسان دەسەلاتی ماڵێی گرتۆتەوە دەست. لەو شەوەوە کە بابی دەستی دە پرچانی نابوو، نەی‌هێشتبوو دەستی وە دەستی پیاوێک بکەوێ، لە ناخیدا کین و بێزاری سەری هەڵدەدا. لەشی پەروەردە دەکردو نەیدەهێشت بری. دەیویست زیندوو بێنێ تا هەمیشە لەعنەت و توک و دوعا و بێزاری بۆ باوکی بنێرێ.هەموو شەوێ مجری‌یەکەی دەکردەوە، تەماشای ئەو پارچانەی دەکرد کە بە دەستی خۆی بۆ جیاز دروو بوونی. ئەو کراس خەوانەی کە بە کۆن رازاند بوونیەوە. ئەو لێفەو دۆشەکە ئاوریشمەی سەیرەدەکرد. دڵی‌دەشکا،هاواری دەکردودەیگوت :« لەعنەتی لێ‌بێ»

هێندێ جاریش توشی قینێکی دڵسوتێن دەبوو، لەسەری دەدا کە هەموو شتومەکێ ماڵێ کۆ بکاتەوە و بیانسوتێنێ. بەو هیوایە کە باوکیشی لە نێویاندابێ‌و بسوتێ. تەماشای شتەکانی خۆی دەکردو لە بەر خۆیەوە دەیگوت:« ئەوانە دەبن بە کفنی من» دووبارە دەیگوت : لەعنەتی لێبێ. شکافەکانی دەکردەوە کە چاوی بە لیباسەکانی باوکی دەکەوت، وەک دێڵە سەکێ کە کەوڵی گورگی دیتبێ دەلەرزی. قەت نەیویستبو دەستیان لێ بدا. بە دیتنی ئەوان ، دڵی تێک دەهالاو لێیان دەترسا. وایدەزانی ئەگەر دەستیان لێبدا، دەستی دەسوتێ. لە گەڵ دایکی بە شەر دەهات کە بۆچی لە هەموو ژیانیدا نەیتوانیوە بەرپەرەکانی مێردی بکات. تا رۆژی پێش هاتنەوە ، برایەکەی خۆشدەویستبوو. بەڵام کە دیتبووی ژنی هێناوە، ناخۆشی دەویست. براژنەکەشی بە قەدرێی لیباسەکانی بابی ناخۆش دەویست. دایکی پێی دەگوت :« ماریا لەسەر خۆبە» .ئەو لە وەڵام دا دەیگوت :« لەسەر خۆیی تەقروتونا بێ. باشترە پێم بڵێی کێردێک دەست دەمێ و سەری ببڕم ،تا قەت چاوم پێ نەکەوێتەوە.»

ئەو بەیانیە کە برای سڵاوی لێکرد، خۆی پێ رانەگیرا ودەستی کرد بە گریانێ. کـسماس لە ئامێزی گرت و گوتی:

ـ مەگری خوشکم. ژیانی تۆ دەگۆڕێ و تۆش بەختەوەر دەبی. ئەو لە کاتێکا براکەی لەخۆ دوور دەخستەوە گوتی :« بۆ ئەوەی بەختەوەر بم، مێرد بە مردن دەکەم.» پاشان وەدەر کەوت

کـسماس چوە حەسارێ، چونکە پێویستی بە هەناسە هەڵکێشان هەبوو. بەڵام لە پڕ هەستی بە

تیگەرانی کرد. یەکێک لەو سەرە هەناسەیەهە لکێشابوو، بە پەلە لە پلیکانان سەرکەوت، دەیویست ژنەکەی ببینێ. ئەو هێشتا لەخەودابوو.لاقە چکۆڵەکانی لە لیفە هاتبوونەدەرێ. کسماس داهاتەوە ماچی کردن. پاشان بە سپایی قژەکانی لاواندەوە کە کەوتبوونە سەر بالیفێ. هەناسەیەکی گەرم کە بۆنی مێخەکی لێ دەهات، لە زاری نیوە کراوەی دەهاتە دەرێ. راست لەو دەمەدا کە لێوەکانی لە زاری نیوە ئاواڵەی نیزیک دەکردەوە. لە پڕ پێی وابوو دەنگی جیرەی پلیکان دێ. کەسێک بە هەنگاوی قورس سەردەکەوێ.

کسماس تێکرابوو. گوێی هەڵخست و هەناسەی راگرت و دانیشت. دیسان دەنگ لە پلیکانان هەستاو هەنگاوەکان وە نیزیک دەکەوتن. ئێستا سەرکەوتبوون و بە ڕێڕەودا دەهاتنە پێش. کسماس ترساو لە بەرخۆیەوە گوتی:« پیرە مێردخۆیەتی.»

بۆ پاراستنیژنەکەی دەستەکانی لەسەر ئەو راگرت. لە بەر دەرگای ژوورەکە هەنگاوەکان وێستان. دڵی وەها لێی دەدا، دەتگوت لە سنگی دەردەپەرێ. وای دەهاتە بەرچاو کە خانوەکە سەرەو نخون دەبێ. ویستی هاوار بکار بڵێ کێیە ؟ بەڵام دەنگی دەرنەدەهات. لەو دەمەدا نوتنی هاواری کردو لە خەو راپەری. تەماشای لای دەرگای کرد .ئارەقەی لە باخەڵی دەتکایەوە. کسماس دە باوەشی گرت وبە بەواشی پرسی : خۆشە ویستم چیە.. چت بیستوە ؟ مە ترسێ هیچ نیە ...

. کەسێک لە پلیکانان دەهاتە سەر...ئێستا لە پشت دەرگایە.

. ئارام بە... مە لەرزێ.. بێگومان خەونت دیوە ...دەبینی کە هیچ نیە . ئەوەی گوت و رابوو، خۆشی دەترسا، بەڵام شەرمی دەکرد . دەستی درێژ کرد ، دەرگای کردەوە، کەسی لێ نەبوو. لە بەر ژنەکەی پێکەنینێکی بە قەستی کرد. پاشان لێی نیزیک بۆوە، لێفەیلە سەرلادا، ئەژنۆ لەرزیوەکانیماچ کردوگوتی:«مەترسێ نوتنیمی خۆشەویستم، ئیرە ماڵی خۆتە.»

ژنی جوان تەماشایەکی دەوروبەری شکاف و پەنجەرەو قاپی وێنەی لە دایکبوون و لە داردانی عیسا و میکائیلی مەلائیکەتی کردو گوتی :« بەڵێ ...ئیرە ماڵی خۆمە و پێی رادێم . چاوەکانی پڕلە ئەسرین بوون.!

کسماس تەماشای گریانی دەکرد لە پڕ ئیشتیای سەرجێی لە ناخیدا سەری هەڵدا. ئەت تەنانەت لە سەردەمی خەفەتباری ودوور کەوتنەوەی غەریبایەتیش بە قەدرایی ئەو دەمەی ئیشتیای ماچ و سەرجێی نەکرد بوو دەرگای ژوورەکەی کردەوە تا نیشانی بدا کە لە گیانی مردوو ناترسێ. پاشان دەئامێزی گرت و دەستیکرد بە نازکردن و لاواندنەوەی.

* * *

رۆژەکان بە دوای یەکدا تێدەپەرین. کسماس هەموو رۆژێ دایک و خوشکی دەبینی و پێکەوە باسی جیران و مردو وگیانی ئەویان دەکرد کە لە ژوورەکان دەسوڕاوەو ئازاری دەدان. باسی کریتیان دەکرد. ئێستا هیچیان نەمابوو کە باسی بکەن. تەنیا یەک شت واتە پێوەندیی خێزانی پێکەوەی دەلکاندن و ئەویش تەنیا لە بێدەنگیدا خۆی دەنواند.

کسماس کوڵان و کوێرە ڕێی کریتستانی سەردەمی منالی دە پێوان. هەر لەو مەیدانە، واتە لە

(سیٚتاق) بۆ هەوەڵین جار دڵی بۆ تەڤینی کیژێک لێی دابوو. کیژێکی جوان. یانی هەوەڵین تەڤینی لە کاتی رۆژ ئاوا دا سەری هەڵدابوو. کیژکۆڵێکی سووری محەمەدی بە دەستەوە بوو. ئەویش چەپکە گوڵێکی یاسەمینی پێ بوو. چ عەترێک لە هەوا بڵاو ببۆوە. رۆژێکی ئێوارەی هاوینێ بوو. گەورە کچی شۆخ و شەنگ بە کراسی سوور و عابی و مەمکی خڕ وزوڵفی پەریشانەوە بە هەنگاوی توند دەگەران و دەتگوت پاپۆڕی شەڕن ئالآیان هەڵکردووە و دەیانەوێ بچن دنیا بگرن. لاوەکانیش بە رەنگی بۆرکاو وبێ‌کەیف وەدوایان دەکەوتن. بەڵام وایان خۆ نیشان دەدا کە گۆیا بە پرچی کچەکان پێدەکەنن و گاڵتەیان پێدەکەن. کسماسیش لە گەڵیان بوو، لە تەمەنی شازدە ساڵیدا.

بە پەلە لە مەیدانێ تێپەری. سەری بەرداوە ئەوەکوو توشی پیرێژنێک بێ وبەکێک لەو کیژانەی ئێوارەی هاوینی سەردەمی هەرزەکاری بیناسێتەوە ، ئەو پیرە مێردە یونانیەی لە رەگەزی خۆی وەبیر هاتەوە کە ئەویش کاتێکی گەڕابۆوە بۆ دوورگەی خۆی، بە دڵێکی پڕ لە کین سەرانسەری دوورگە سووڕابۆوە. خانووەکان لە بەر چاوی ئەویتر ببوون، دۆست و برادەری قەریمی بیجگە لە یەک دوو پیت،وشەیان نەبوو لە گەڵی بدوێن. ئەوانەی لە گەنجایەتیدا ، لە کۆڵانە بە مانگەشەو روناکەکانی کاندی، سینگیان وەک سەر کەوتوان دەکردە مەتاڵ و بە گەرم و گوڕی لە بارەی خوداو نیشتمان و چارەنوسی جیهان دەدوان، ئێستا توشی گیروگرفتی ژن و منداڵ و ژیانی رۆژانە بوون و پاپۆڕی گەنجایەتیان لە تەشتە ئاوێکدا نوقم بوو.

* * *

لەو کاتەو لە رۆژی یەکشەمۆدا بابە گەورە لە گوندی پێترۆکفالو لە بەر ئاگر دانیشتبوو. سەرمای بوو. روومەتی داکەوتبوون و ئەژنۆی نوشتابوونەوە. تەماشای ئاگری دەکردو رابردووی خۆی وەبیر دەهێنایەوە. بیرەوەریەکانی رابردوی وەک چۆمێکی رەوان بە مێشکیدا دەرژیشتن و دەنگیان دەهات.

هەرلە و کاتەشدا پیاوێک کە چاوساخی رێبوارانی بێگانەبوو، بە ویندا رادەبرد و سلاوی کردو بە پێکەنینەوە گوتی:

. سیفاکاسی پیر بیرۆز بایبت لێدەکەم. کسماسی نەوەت لە ئوروپا گەڕاوەتەوە ئێستا ئەوە لە کاندیە. دەڵێن کاغەزو قەڵەمی هەیەو شت دەنووسێ.

بابە گەورە تێکڕابوو، داردەستەکەی هەڵێناو بە دەنگی بەرز بانگی کرد : چ دەنووسێ، بڵێ بزانم !؟

بەڵام چاوساخ دوور کەوتبۆوە. بابە گەورە بێدەنگ بوو. ئەو گەڕانەوەی بە فاڵی خەراب دانا، بە پێشکەوتنی مردنی خۆی زانی . لە بەر خۆیەوە بیری کردەوە: سەعاتی منیش گەیوەتێ ! هەستا هاریدیموسی شوانی بانگ کرد:

. هۆی هاریدیموس ایەبۆ گەورەکەی هەڵگرە و بە دوام دا وەرە .

. بۆ کوێ . . .ئەی سیفاکاسی پیر؟

. سەت جار گوتومە هیچ لە من مەپرسە... زوویە تاڵوکەی بکە . .

هاریدیموس پەیژەی هەڵگرت و بە دوای بابە گەورەدا. پیرە مێرد خۆی سەتڵ و ڕەنگ و قەڵەمی مووی هەڵگرتبوو. خێرا دەڕۆیشت. جاروبار لە سەرپەردەکان دەخلیسکا. ئاخرەکەی گەیشتنە مەیدانی گوندی. پیرە مێرد بورجی زەنگوڵەی کلیسای نیشاندا کە تازە بە گێچ سپی کرابۆوە گوتی
پەیژەکەی بە دیوارێوە نێ، قاپی پێوە نێ کە نەکەوم. تراساکی لە کوێیە؟
. ئەو لەگەڵ برادەرانی ڕۆیشتوە و تفەنگیشی بردوە .
. دوعای خێری منی لە گەڵ بێ. هەتیبەتی. شوان نێردیوانەکەی لە بن بورجی زەنگوڵەی کلیسا بە دیوارێوە نا و دوو پەردیوەپەردان و خۆشی توند هەرتک لای گرت. پیرە مێرد وەسەرپلەی هەوەڵیان کەوت ڕیە هانکە هانک وەسەر کەوت.
هاریدیموس بە ترسەوە تەماشای دەکردو نیشانی خاچی دەکێشاو لە بەر خۆیەوە گوتی :
. وای..وای... خودای من ! . ئێستا پیرە مێرد لە سەر نێردیوانێ گەیشتبوە بەردە چوار گۆشەکەی بن بورجی زەنگوڵە.
قەڵەمی موی دە سەتڵەکەی راکرد و دەستی درێژ کردو بە پیتی درشت دەستی کرد بە نوسینی ئا.ز.ا.د.ی. دڵەکوتەی گرتبوو. لە بەر خۆ بیری دەکردەوە : کێ دەزانی تەمەنی من بەم جورە کۆتایی پێدێت؟ یانی بە سەتڵەڕەنگێک و بە قەڵەمێکی موو لە سەر دیواران دروشم بنوسم!؟
ئێستا هەموو پیتە درشتەکانی مەتڵەبی خۆی نوسیبوو. نەیدەزانی لە سەر نێردیوانە.دەیویست بکشێتەوە و تەماشای نووسینەکانی خۆی بکات.کە ئاوڕی داوە، خۆی پێڕانەگیرا و لە سەر ڕا کەوتە خوارێ.
هاریدیموس هاواری کرد. دراوسێکان ڕایان کرد و پیرەمێردیان هەڵگرتەوە.سەری شکابوو، خوێنی لێ دەهات. بەڵام زاری بەسترا بوو، هاواری نەدەکرد. هاریدیموس بە دراوسێکانی گوت:
. نەوەکەی گەڕاوەتەوە. ڕەنگە لە خۆشی ئەو ئاگای لێ نەبوو بێ بۆیە کەوت. گوند واشڵەقا دەتگوت بومە لەرزە هاتوە. ئەو کۆڵەکەی کە پاڵپشتی خەڵک بوو ئێستا بەلادادەهات. پیرەژن هەتوانیان لە سەر برینەکەی دانا. هەرلەو کاتەشدا ئێستر سوارێکیان بۆ کاندی نارد، بچێ مستەفا بابای بێنێ. مستەفا بابا خاسیەتی هەموو گیایەکی دەزانی، جگە لەوە پیاوێکی باشیشبوو. بێ ئەوەی فەرق دابنێ، هەموو نەخۆشێکی دەرمان دەکرد جا تورک بایەو یا فەلەو جولەکە. دەیگوت :« هەموو فەقیرو نەخۆشن. یونانی بێ یا جولەکە فەرقی نیە».
ڕۆژی دوایی بە بانی زوو مستەفا بابا بە سواری ئێستر گەیشتێ. کیسە پچکۆڵەکانی هێنادەر و زاری شوشەکانی کردەوە و سەری شکاوی پیرە مێردی خستە نێو دەستە نەرمەکانی وخەریکی دەرمانکردنی بوو.
دوای سێ ڕۆژ بابە گەورە چاوی هەڵێنا، تەماشای دەوروبەری خۆی کردو بای کاترینای بوکی دیت. بانگی کردە پێشێ و گوتی :« خەبەری پیاوەکانی چیا چیە؟ خەبەری مێردەکەت؟ هیچ ئاگات لێ هەیە؟ »
ژن لە وەڵامدا گوتی : « ئەو نایەوێ تەسلیم بێ.»
پیرە مێرد گوتی :
هەتیبەتی ... پاڵپشتێکم بۆ دانێن، ڕاستم کەوە. لە ڕاکشانێ ماندوو بووم. بنێرە لە ئاغەڵێ

کوستاندیس بێتەوە، کارم پێ‌یەتی. پاشان هیلاک بوو، چاوی‌لە سەر یەک دانا.
دوای نیوسەعات دێوێکی نیوە ئینسان و نیوە حەیوان هاتە ژووری. چەنەی هاوێشتە سەر گزچان و لە پێش پیرە مێرد راوەستا. بابە گەورە چاوی لە سەر یەک‌دانابوو، گوێچکەی دەزرینگایەوە. کوستاندیسی نەدیت و دەنگی لاقانیشی نە بیست. کوستاندیس مات و بێدەنگ چاوەروان مایەوە. لە بەرخۆیەوە دەیگوت :« شتێ واناییْ‌ئاخری رۆژێک چاو هەرهەڵدێنێ و منیش دەزانم کاری چی بە منە ـ ؟ »
برک و نەوەکانی کۆ ببوونەوە. تراساکیش تفەنگ لە سەوشان گەیشتەوە. ئەو لە چیا دەهاتەوە. واتە لەو شوێنەی کە هەموو رۆژێ لە گەڵ برادەرەکانی دە چوو مەشقی شەڕیان دەکرد. ئێستا چاوەروان‌بوو بزانێ بابە گەورەی چی پەسەو دێت تا دیسان لەگەڵ برادەرەکانی نەخشەی پەلاماردانی ئاوایی تورکان پیادە بکات. کوستاندیس گوتی :
ـ تراساکی وەرە وەخەبەری بێنە. چونکە تۆ لێی ناترسی .
تراساکی گوتی : جوان توستوە. من لێی ناترسێم، بەڵام حەیفە وەخەبەری بێنم. بابە گەورە ورتە ورتی دەوروبەری بیست، چاوی هەلێنا. کوستاندیس لاقەگەورەکانی بزاوت و چوە پێشێ. پیرە مێرد تەماشایەکی دەوروبەری کرد وئەو کەسانەی دیت کە لێی کۆ ببوونەوە. نارەحەت بوو هاواری کرد :« ئەی میراتگرە خۆشەویستەکانم دڵنیا بن کە نامرم. نەخێر، من هێشتا نامرم. برۆن بە دوای کارەکانتاندا . » کوستاندیس تۆ وەرە پێشێ و سەرت نەوی کە. کابرای زەلام سەری زل و قرژنی نەوی کرد و گوێی بۆ قسەکانی پیرە مێرد هەڵخست.
سیفاکاس بە هەناسە برکەو لە سەر خۆ قسەی دەکرد. جارجار بێدەنگ دەبوو. چونکە ژانی هەبوو. پاشان دەهاتەوە سەرخۆ درێژەی پێدەدا . کاتێ قسەکانی تەواو بو پرسی:
ـ تێگەیشتی کوستاندیس ؟
شوان وەڵامی داوە گوتی : « بەڵێ... سیفاکاسی پیر ... تێگەیشتم »: پاش ئەوەی لە گوندی جارت کێنشا، سەرێکی شاری کاندیش بدە لەوێ بچۆ ماڵی کورە گەورەکەم، لای کریسولای بوکم. دەیانناسی. دوو بەستە پەنیری گەورەو بەرخێکی قەڵەوشیان بۆ بەردو بیکە بە دیاری من. وادیارە کساسی ئەوەم بۆ وڵات گەراوەتەوە. بە چاوی خۆت بیبینە. تێگەیشتی؟
پێی بڵێ بابە گەورەت خەریکە بمرێ. دەبێ بێی و بیبینی. دەیەوێ بۆ ئاخر جاردوعات بۆ بکا. تێگەیشتی ؟ کوستاندیسی لەعنەتی ؟
ـ تێگەیشتم. سیفاکاسی پیر...
ـ باشە ..برۆ.. یالا... پیرە مێرد ئاوری داوە کە شوانەکە ببینێ، بەڵام رۆیشتبوو. ئیتر بێچکە لە دەنگی بزماری چەکمەکانی دەنگی تر نە دەبیسرا. رۆژی دوای بە یانی زوو دەرگای ماڵی کریسولای پیر کرایەوە. دێوی تورکن بە دوو لەتە پەنیرو بەرخێکەوە، وەژوورکەوت ولە حەساری راوەستا. دیاریەکانی لە عەرزی داناو خۆی هاوێشتە سەرگزچانی. سێ‌ژن لە سەر نیو تەخت دانیشتبوون قاوەیان دەخواردەوە. کساس لە ژووری خۆی ئامادە دەکرد کە بچێتە دیداری خەلیفە. ئەودوانە پەیامێکیان ئامادە کرد بوو، بە تەنەرێکدا ناردبوویان بۆ چیا. پاڵەوانەکان سەریان بەو دەداوە و ئاخیان هەڵدەکێشا و دەیانگوت : « ئێستا کە دایکی نیشتمان رای گەرەکە، سەرمان

دەرپەندایە !» بەلام هەموویان چاوەروانی فەرمانی پاڵەوان میکێلس بوون. پاڵەوان میکێلس کە نامەی خەلیفەی بۆ هات، پاڵەوانی چیای سلنا، واتە پاڵەوان پولیکسینگیس - ی بانگ کرد و هەردکیان لەکەلاوەی بەرد سەریان پێکەوەنا. پاڵەوان میکێلس گوتی :

ـ من تەسلیم نابم.

پاڵەوان پولیکسینگیس گوتی :

ـ دایک تکا دەکات، باشترە تووشی کارەساتی نەکەین.

ـ کام دایک ؟ ئەو مێشکانەی بە سەر ئەودا حکومەت دەکەن، جێگای بڕوای من نین.

ـ یانی تۆ پتر بڕوات بە مێشکی خۆت هەیە ؟

ـ بۆ گاڵتەم پێدەکەی؟ قسە لە مێشکی من نیە . بەڵکو دلی منە. دلی من پێم دەلێ: تەسلیم مەبە. من تەسلیم نابم. تۆش هەرچی دڵت دەخوازێ وابکە.

ـ من ئەوەی بە باشی بزانم دەیکەم کە وابوو بە قسەی دەکەم.

ـ کەوابوو تۆ دەتوانی بڕۆی، دوعای خێری منت لەگەڵبێ. تۆش من بەجێ بێڵە. تۆ هەوڵ کەس نی ئەوەی دەکەی. من پێویستم بە هیچ کەس نیە. بڕۆ سەفەر بە خێر و بە هیوای دیدار پاڵەوان

پاڵەوان پولیکسینگیس دوودڵ ڕاوەستا. دڵی نەدەهات بڕوا و لە بەرامبەر مەرگدا بە جێی بێڵێ. گوتی :

ـ پاڵەوان میکێلس بە خۆڕایی دەمری .

پاڵەوان میکێلس بە سەریدا نەڕاندی و گوتی :

ـ لە شەردا کەس بە خۆڕایی نامرێ. هیوادارم مەبەست دلسۆزی نەبێ بۆمن.

ـ من لەم دنیایەدا تەنیا کەسێکم خۆش دەویست، تەویشت کوشت. پاڵەوان میکێلس‌من هۆگری شەخسی تۆ نیم. بەلام ناشمەوێ کە بکوژرێی. چونکە کریت پێویستی بە تۆ هەیە.

پاڵەوان میکێلس گوڕاندی و گوتی :

ـ بەلام من ئیتر پێویستم بەو نیە . .. گوتم بڕۆ بە دوای کاری خۆت دا.

ـ بە ژنەکەت چی ؟ بە تراساکی چۆن ؟

خوێن هاتە نێو مێشکی کابرای شەر کەر، دەماری ملی هەستان و دیسان گوڕاندی وگوتی:

ـ تۆ ئەگەر دڵت بە ژیانەوە هەیە بڕۆ ! بە پێلاقەیەک چراو وردە شتەکانی پێش دەرگای کاولەکە تووڕ هەلدا و پاڵەوان پولیکسینگیسی بۆ دەرەوە پاڵ پێوە نا. خۆشی لە بەر دەرگا ڕاوەستا و بانگی باکێنشی کرد و گوتی :

ـ باکێنش پاشنەی کلاشت هەلکێشەو خۆت بگەیێنە خەلیفە. لە قەولی منەوە سلاوی ئەو بارکە پیرۆزە بگەیێنە و پێی بێژە :

ـ پاڵەوان میکێلس نامەی تۆی وەرگرت. چوار گۆشەی نامەکەی سوتاند و بۆ تۆی ناردەوە. دەلێ من تەسلیم نابم .

باکێنش نامەکەی دەباخەلێ ناو گوتی:

ـ بە چاوان پاڵەوان میکێلس !

ـ خۆش بڕۆ پاکێش . ئەگەر تۆش هۆگری ژیانی مەبەوە. لێرە جگە لە مردن هیچی دیکە نیە .
پاکێش هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی :
ـ پاڵەوان من خێزاندارم. کیژێکم هەیە دەبێ بە شوی بدەم. ژنم هەیە. مەیخانەم هەیە.
پاڵەوان نەڕاندی و لە کاتێکا کە پشتی تێکرد بوو گوتی :
ـ کەواپوو گەرەک نیە بگەڕێیەوە. توپاکێشی و لەوەش پتر لە دەستت نایە .!! تو دەبێ گردەوەشت پاکێشی بیْ. بڕۆ کاپامیش و مستگری بدزەوەو پێکەوە بچنە سوراخی پیرتولدو و ئەفەندم. تا هەموتان لێک کۆ بنەوە.
پاکێش دوور کەوتەوە. بە کوێرە ڕێیکی نهێنیدا بەرەو دەشت داکشاو لە ڕاکردندا ناخی هەڵدەکێشاو جنێوی بە خۆی دەداو دەیگوت:« تۆ پاکێشی و لەوە زیاتر لە دەستت نایەو گردەوەشت ئەشێ پاکێشی بیْ» ئەم قسانە خوێنی لەشیان وەکوڵ دەهێنا.
لەوکاتەدا کە ئەو لە پلیکانەکانی بارەگای خەلیفە سەر دەکەوت، کوستاندیس لە ماڵی کەوکی کساس دەچوە ژوورێ. هەروەک پێشتر گوتمان لە نێوەڕاستی حەساری ڕاوەستا و دەستە گەورەکانی بە سینگی ئارەقاوییەوە ناو هاواری کرد :
ـ «هەموتان تەمەن درێژ بن .دەنگی وە دەنگی بزنان دەچوو. لە منداڵییەوە لە نێو مەڕو بزنڵدا گەورە ببوو. : تەمەنتان درێژ بێ خانمە بە ڕێزەکان.! سڵاو لە هەمووتان. وادیاربوو نانتان دەخوارد. نۆشی گیانتان بێ!»
دایک کوتی :« بە خێرهاتی کوستاندیس!..وەرە دانیشە و جامە شەرابێک بخۆوە حەمەڕی گوندی چیە ؟»
کوستاندیس لە قاقای پێکەنینی دار گوتی:
ـ پاڵەوان سیفاکاسی خەزوورت لە سەرە مەرگ دایەو هیوا بە ژیانی نەماوە. تەنانەت شەیتانیش ناتوانی نەجاتی بدا. هەروەها دیاریشی بۆ ئێوە ناردوە. چوار میْردەکی لە عەرزی دانیشت و گزچانەکەی لە سەر ئەژنۆیان داناو گوتی :
ـ سوپاس بۆخوا. ئەو باش ژیا، باشی‌خواردو خواردیەوە .گەلێک تورکی کوشتن. حەساری ماڵەکەی پڕ کرد لە منداڵ و کەروگا و ماین و بزن و مەڕ. زەویەکانی کوێستانی ئاوا کردەوە. گردنی بە مەزرای ڕەزو زەیتون. تەنانەت بۆ ڕۆژگاری گیانی کلیسایێکیشی دروست کرد. کەواپوو لەو لاشەوە خەیاڵی ئاسودەیە. ئێستا ئیتر ژیانی ئەو بە کاری چی دێت؟ تاقە کارێکی ماوە کە بارگەو بنەی خۆی تێک بنێ‌و خۆی بۆ سەفەری ئاخری ئامادە بکات..
کساس گوێی لە دەنگە دەنگێ بوو، هاتە خوارێ. کوستاندیس ئاوری دایەوە وسەرتاپێ تەماشای کرد و گوتی :
ـ جەنابی ئاغا ! ئەگەر بە هەڵە نەچویم. تۆ دەبێ‌هەوڵبێن نەوەی سیفاکاسی پیر بی. ملی درێژ کرد تا باش ببینێ. پاشان دەستە پان و خەپلەکانی بردە پێش تا دەستی لێبدا.
کساس‌گوتی: بەڵێ خزمم...
ـ باشە کە وابوو بزانە کە بابە گەورەت داوای کردوە بچیە لای. بەلام دەبێ زووبی. گۆیا بۆ چاو لەسەر یەک دانن تۆی ویستوە. گوتم زوویە ئەگەر دەتەوێ ببینی، پەلەی بکە. سوێند بە

هەتاوی ئەبەدی، من پێم وایە ئەو چەند ساڵانە هەر چارەڕواتی تۆ بوە کە بتبینێ و دوایە گیان بدا بە ئیزراتیل. بە منی گوت :«کوستاندیس بۆ ئێسترێکیش لە گەڵ خۆت بەرە و سواری ئێستری بکە .» دیسان گوتی :«من ئەوەدەم تەوەرزینم بە دەستەوە دەگرت و کورەکەشم تفەنگ. بستوومە نەوەکەم قەڵەم بەدەستەوە دەگرێ، کە وابوو کەسێکی ئاوا ناتوانێ بە پێیان بگاتە ئێرە.» ئێستا من ئێسترم هێناوە و لە پێش موسافیرخانە بەسترمەتەوە. با پێکەوە بچینە وێندەرێ.!

پاشان کوستاندیس رووی کردە کابانی ماڵێ و گوتی :« ئەوەبوون ئەو خەبەرانەی گەرەکت بوون بای کریسولا. ئێستا ئامادەم شەرابەکە بخۆمەوە تا دڵت نەیێشێ.» شەرابی پێداکرد و بەدەستە گەورەکانی پاروە نانێکی دەزاری تاخنی وبە پێکەنینەوە گوتی :

. بە راستی جێگای سەرسوڕمان و باوڕ نەکردنە! ئەم پاڵەوان سیفاکاسە پیرە بەم حاڵ وڕۆژانە خەڵک بانگ دەکات. هەر دەڵێی دە چێتە سەر شایی. پێش ٢٤سەعات لەدوای منی نارد. ئاخر لە منداڵیەوە شوانی ئەو بووم و هەم. ئێوە خۆ دەزانن. بە منی گوت : «کوستاندیس ! بڕۆ گزجانەکەت دەست دەیە، لەو چیا بەرزانە سەرکەوە. هەموو شەرکەرە پیرەکان بانگ بکە. لە نێو مەیدانی هەموو گوندێکەکان راوەستە و هاوار بکە وبڵێ :«دۆستان پاڵەوان سیفاکاسی پیر لە گیانە لادایە. تەواوی ئەو کەسانەی هاو دەوری ئەو بوون و لە گەڵ ئەو لە شەرەکاندا بەشدار بوون و ئێستا زیندوون بانگیان دەکا هەموو بێنە ماڵی ئەو. هیچ نەشترسێن، چونکە ئەو دیاری و سەوقاتی لە کەس ناوێ.دەرگای ماڵێ ئاواڵەیەو سفرەش راخراوە. ئێوە تەنیا وەرن بخۆن و بخۆنەوە، پاشان لە گەڵتان دەدوێ. مەتڵەبێکی گرنگی هەیە، گەرەکیەتی لە گەڵ ئێوەباسی بکات. دارەکانتان دەست دەنێ و وەرن.»

کسماس کە بە وردی گوێی دابوویە گوتی :« دەیەوێ چیبان پێ بڵێ ؟ دوایە لە بەرخۆیەوە گوتی :

. تەنیا پیرۆزەکانی دەورانی کۆن بوون کە بەو جاوجەلالە دەمردن.» بە دڵ هەستی بەسەربەرزی کرد کە لە تۆرەمەی مرۆڤێکی ئاوایە.

کوستاندیس گوتی :« دەیەوێ چیبان پێ بڵێ؟ من چوزانم. دەمویست لێی بپرسم بەلام ترسام. پیرە مێرد هێشتا دەتوانی بەدارێک سەرم بشکێنێ. هەربۆیە هیچ پرسیارم لێ نەکرد و خێرا کەوتمە رێ. لە چیاکان وەسەر کەوتم، چومە گوندەکان و جارم کێشا. تەنیا سێ پیرە مێرد هاتنە دەرێ، بریتی بوون لە :« پاڵەوان مانداکاس و پاڵەوان کاتسیرماس و مامۆستا شەڵ و پیرەکەی گوندی ئاپارو. ئەوان گوتیان تۆ بڕۆ پێی بڵێ زوو نەمرێ، خۆ راگرێ، هەتا ئێمە دەگەینێ. هەر سێک ئێستێ کوڵنگ درێژی خۆیان لەسەرنا و پشتێندیان بەست و هاتنە دەرێ.

کوستاندیس دیسان دەستی کرد بە پێکەنین و گوتی :

. ئەتیرانە چەندە لێقەوماون. هەرسێک لاقیان ئاوساوە. ئەوەندەیان گوللە وێکەوتوە هەموو لەشیان کون کون بوە. بە زەحمەت دەتوانن بە رێگادا بڕۆن. تەمەنی هەر سێکیان دەگاتە ٣٠٠ ساڵ. ئاو لە زاریان دێ و مۆزڵیان نەماوە. هەرسێک دەمانچەی زیوی خۆیان هەڵگرت، دەتگوت دەچنە شەڕێ. لە کاتێکدا بەکتریان گرتبوو کە وەعەرزی نەکەون کەوتنە رێ. لەوانەیە باوەڕ بە قسەکانم نەکەن. بەلام کە هاتی خۆت دەیانبینی.

کوستاندیس رابوو بە کسماسی گوت :

باشە ئەرباب. تۆش فیشەکەت لە سەرێ. گوتم بابە گەورەت خەریکە دەمرێ. ئەو دەیەوێ بە دەستی خۆت چاوەکانی لەسەر یەک دابنێی. دایک نیشانەی خاچی کێشاو گوتی : «ئەو پیاوی چاک بوو، دەچێتە بەهەشتێ.»

کسماس گوتی: باوکیشم دەچێتە بەهەشتێ. ئێمە هەمورومان دەچینە بەهەشتێ. چونکە زەحمەتمان زۆر کێشاوە .خوشکی کسماسی بە گاڵتە بزەیەکی هاتێو سەری هەڵێناو بە لاتاوێکی شەیتانی گوتی :« خوا داد پەروەرە ».

دایکی گوتی : خوا کەریمە... هەستا چوو ئەسپەند بێنێ بیسووتێنێ.

کسماس بە ژنەکەی گوت : « تۆش دەبێ لە گەڵمان بێی .» بەلاَم کوستاندیس گزچانەکەی لە عەرزی داو گوتی :

. ئەی ئاغا... هیچ پێویست نیە ژن لە گەڵ خۆت بێنی. ژنت لەگەڵبێ دەردی سەرە.ئەگەر پیێیان دەڵێی وەپێش کەون. دەڵێن تاوێک راوەستێن، پەلەی بۆچیە ؟ پاشان لە پر وەغیرەت دەکەون و رادەکەن. ئەودەم زوو پشوویان سوار دەبێ. ئێمەش ناچار دڵمان بۆیان دەسوتێ. چیکەبین، هەر لەوێ بە جێیان بێڵین، شتێوا نابێ. لە گەڵ خۆمان دەیانبەین، ژانە سەرە. بەلاَم تۆ ئەربابی، چۆنت گەرەکە وابکە .من هەر ئەوەبە گوتم .

دایک گوتی :« کورم کسماس ا کوستاندیس هەقیەتی مەیبە ... ئەو ماندوە .»

خوشکی بە شەیتانی گوتی :« بیبە..بیبە... ئەو هێزی تەواوی هەیە.»

نونیمی لە مانەوەی ماڵێ دەترسا. بۆئەوجێگایەکی ئەمین نەبوو. هەواکەی خەفەبوو. دەیویست بە قەدرایی داعبایەک پچوک بێتەوەو لە نێو گەڵا ریحانەدا خۆوەشارێو کەس نەیبینێ. ئەو گوتی :« منیش دێم، دەمەوێ کریت ببینم.»

خوشکی مێردەکەی لە بەر خۆیەوە گوتی :« بڕۆ و نە گەڕێیەوە .» ئەو نەیدەویست لەو ماڵەیدا بیبینێ. کاتێکی نونیمی لێی وە نیزیک دەکەوت، ئەو هەناسەی هەڵنەدەکێشا. قاپ و کەچکی تایبەتی بۆ ئەودیاری کردبوو. لە سەر ئەو باوەڕەبوو کە ئەو پیسەو ماڵەکەش پیس دەکات. شەوی پێشوو بە خەیاڵی خۆی ماڵەکە پڕ ببوو لە بۆنی جولەکە. ئەو دڵی تێکچو بوو، رشابۆوە.

نونیمی لە بەر خۆیەوە گوتی : « بەڵێ هێزی تەواوم هەیە... هەستا خۆی ئامادە بکا، بەلاَم لە پڕ سەری سوڕاو پاڵی وەدیواری دا. چاوی لێک نان. چەند رۆژبوو هەستی بە قورساییەک دەکرد. دەنگوت گۆزانی بە سەر داهاتوە. گۆڕاوە، خوێنی گەرم بوە. یەکێک دەستی لەسەر شانیدانا. ئاوری داوە مێردەکەی بوو بە لیوانە ئاوێکەوە لەوێ ویستابوو.بزەیەکی هاتی، ویستی ئاوەکەی لێ وەرگرێ. بەلام داهاتەوە وکەوتە عەرزی و لە خۆچوو. دایک بە شێواوی وەدوای گولاوێ کەوت. هێنای لاجانێگ و شانو ملی بە گولاوێ داماڵی و بە دڵسۆزی گوتی:« فەقیرە هیلاکە .» خوشکی مێردەکەی گوتی : « هیچی نیە. تەنیا لەخۆچوو. منیش هێندێ جار بێهۆش دەبم .»

کسماس ژنەکەی لە ئامێزێ گرتو لە ژووری سەرێ بردیە سەر جێ. کاتێک نونیمی چاوی

هەڵێنا، دایکی لەسەر سەری ڕاوەستابوو. نوئیمی گوتی : « دایە ببوورە،،، من هیلاکم..»

دایک گوتی : بنوو... بۆ هەوەڵین جار دەستی بە پرچەکانی داهێنا. کەماسیش گەردنی ماچ کرد و گوتی:

ـ بنوو لە گەڵ من مە یە... سەبر بگرە. من زوو دەگەڕێمەوە.

نوئیمی بە سەر ڕاوەشاندن سەلماندی و چاوی لە سەر یەک دانان و گوتی:« برۆ بە سلامەتی کەماس چوە بارەگای خەلیفە. دیتی خەلیفە زۆر شێواوە. بە کەماسی گوت :

ـ هەر ئێستا نامەی مامت هاتوە، نوسیویە، نایەوێ تەسلیم بێ ، باشترە دەست لە کاری ئەو وەرنەدەن. بۆ خاتری مەسیح تۆ برۆ بیدوێنەوە. پێی بێژە کریت لە مەترسی دایە وکاری ئەویش جگە لەوەی کە وەزعەکە خەراپتر دەکا. هیچ فایدەشی نیە. هەوڵ بدە ئەو کەللە کەرەی ناقڵ بکەی. چت لە تواناندا هەیە بیکە. کورم فرە پێویستە.

باوکی پیرۆزا من هەرچی لە دەستم بێ دەیکەم. هەر ئێستا دەڕۆم..!

نوئیمی لە سەر تەخت دانیشتبوو، چاوەڕوانی ئەوبوو. کراس خەوێنکی زەردی لەبەر کردبوو، قژە زێرینەکانی ڕەنگ هەنگوینی بە سەر شانیدا بڵاو کرد بۆوە چەنەگەی خستبوە سەر ئەژنۆکانی و پاڵی دابۆوە، بیری دەکردەوە... ئاخ ئەڤین چەندە بە هێزی ! هەر ئەو بوو «واتە ئەڤین » کە ئەوی گەیاندبوە ئێرە. واتە هاویشتبویە ئەو سەری دنیایە کیژی ماڵێکی جولەکانی گەیاندبوە ژوورێک کە وێنەی مەسیحی تێدا بوو. هەناسێکی هەڵکێشا و لە بەر خۆیەوە گوتی : « خۆزیا ئەو شتانەی دیتومن، نەمدیبان، خۆزیاگیانم هەروەک کاغەزێکی هیچ لێ نەنوسراو دەست ڕێ نەکەوتوو دەمابەوە. ئاخ لەو خۆشبەختیە »

کەوتە بیری شەوی پێشوو. ئەودەمەی بەر لەوەی خەوی لێبکەوێ لەبان کۆنە تەختێکی ئاسن ڕاکشابوو پەنجەرە والابوو. هەناسەی شەو لە گەڵ عەتری ڕیحانان دەهاتە ژوورەکەی. تەدەتکی لاقی زەلامان دەهاتو نە سەوەر بوو. کۆلانەکان پاشملەی ڕێبواران لە خەودا بوون. مانگ شەبەقی دابوو، وڵاتی ڕوناک کردبوو. تەنیا لە دوورەوە هەناسەیەکی سوک و لە سەر یەک دەبیسرا. هەناسەی دەریا بوو کە لەو لای بورجەکانی شار بە خەبەربوو، وەک نوئیمی خەوی لێ نەدەکەوت.

ـ شەو لەو سەری دنیا چەندە جوانە! ئەو پیاوەی خۆشم دەوێ و لە نێودڵم دایە، چەندە بە دڵنیایی لە پەنا من دەنوێ.»

کەماس هاتە ژووری. لە پەنا ئەو لەسەر تەختی دانیشت. بە موحیبەتێکی لە وەسف نەهاتوو، بە خۆشەویستیەکی تەوار شێلگیر تەماشای دەکرد. دەتگوت ماڵاوایی لێ دەکات. نوئیمی دەستەکانی گرت و گوتی :

ـ دەڕۆی ؟ دەستەکانی گەرم بوون. پیاوەکە نیگەران بوو. پرسی : « تات هەیە ؟»

ـ نا خۆشەویستم تا- م نیە. پێم وایە ڕەگەزی ئێمە هەموو خوێن گەرمن. بە زەردە خەنەیەک وەڵامی دایەوە. پاشان لێی‌زیادکردو گوتی :« جۆرێک سەیرم دەکەی هەردەڵێی دەتەوێ بە جێم بێڵی. کەمی مابوو بە دوای ئەودا بڵێ بۆهەمیشە.

بەڵام ترسا. دەیویست هاوار بکا: « لەم ماڵە بەتەنیا بەجێم مەهێڵە! » بەڵام خۆی ڕاگرت.

کەماس گوتی : «خۆشەویستم زوو دەگەڕێمەوە. دەچم کە چاوەکانی باوکم وێک بنێم .»

هێشتا دەستی ژنەکەی لەدەستی دابوو، هەستی کرد ئارامتر بووەو ژیانی بۆ هاسان دەبێ. هەموو سەدەکانی رابردوو وەک یەک وانو لە دەمێکی کورتدا، کۆدەبنەوە و ئەو دەمە کورتەش هەر ئەو تاوەیە کە یەکێک دەستی گەرمو زیندوی خۆشەویستەکەی لە دەستی دابێ. لەو دەمەدا بە خۆی دەڵێ :« هەمیشە وابووەو هەر واش دەبێ. ئەوە دەمی هەمیشەییە.»

نوئیمی ماوەیەکی درێژ تەماشای مێردەکەی کرد، بێ ئەوەی هیچ بڵێ. ئەوجار کەساس هاواری کرد :

ـ واچاوم لێ مەکە. تۆ جۆرێک سەیرم دەکەی کە دەڵێی بۆ هەمیشە بە جێت دێڵم. چاوەکانی نوئیمی ماچ کرد. لێوەکانی بە ئەسرین تەڕ بوون.

نوئیمی گوتی : « بەڵام ئاخر تۆش سەیر تەماشام دەکەی.»... دمو چاوی لە سەریندا شاردەوە.

لە خوارەوە دەنگی کوستاندیس بەرز بۆوە، دیاربوو تووڕە بوە. « ئەهای ئەربابا زوویە. بابە گەورەت دەمرێ. دایکت تنقمەی پڕکردوە لە شەراب لە رێگا جەمێکی چاک دەخۆین و دەخۆینەوە. تەنها زوویە. رۆژ خەریکە ئاوا دەبێ.

کەساس داهاتەوە بەو جورە کە پەیکەری پیرۆز ماچ دەکەن، سینگی ژنەکەی ماچ کرد و گوتی

ـ خوات لە گەڵ ! بە هیوای دیتنەوە !

ژن سەری مێردەکەی دەئامێزێ گرت. چاوەکانی پڕبوون لە خۆشەویستی‌و هەستی ترس و جیایی. جارێکی تر گوتی :

ـ سەفەر بە خێر ...

کەساس لێی نیزیک بۆوە کە زاری ماچ بکا. بەڵام ئەو دەستی بە زاریەوە ناو گوتی :

ـ نا...نا... خوات لە گەڵ !

## ١٣

روخساری کریت گرژو دەردەدارە.لە راستیشدا دەردی کریت هەر ئەو دەردی کۆن و پیرۆز وتیکەڵ بە شانازی ئەو دایکانەیە کە رۆڵەی قارەمانیان بوون و پاشان لە پرسەو تازیەنەیاندا دانیشتوون.

کاتێکی کساس بە سواری ئیتسترو کوستاندیس بە پێزیان و گزچان لەسەر شان لە شاری کاندی هاتنەدەر و چونە نێو باخی رەزو زەیتونی دەرەوەی شار. وردە وردە شەو دادەهات. دیمەنی سەحرا وەک پێستی پڵنگ بە رەنگی زەردو سوور کەرویشکەی دەکرد. لە پشت سەریانەوە چیای تیدا بە لوتکەی سەر بە بەفر داپۆشراوی، هێدی و بەتواناو میهرەبان ، وەک بابە گەورەیەک لە بەرامبەر خۆر چەقیبوو.بەرەو رووی ئەو ، چیای دیکە لە ژێر شەبەقی هەتاوی پایزیدا ئارام ونستا بوو. لە هەموو شوێنێ مەزرای تازە کێڵراو دەهاتە بەر چاو کە هێندێ رەنگی قاوەیی و هێندێکیش رەشی تاریک بوون. لە هێندێ جێگا باخی پچوکی زەیتون بە لقی زیوین وتاقە دارێکی شمشاد دەبینرا. رەزێک بە لقەمیوی بادراو کە چەند زەنگەتە ترێی پێوە مابوون دەهاتە بەرچاو.

کساس لە تەماشاکردن تێر نەدەبوو. دڵی وەهای لێدەدا. دەتگوت خەریکە دەر پەرێ.لەو کاتەدا بەخۆی دەگوت: « ئەوەیە کریت. ئەوەیە ئەم وڵاتەی کە لێی هاتوومە دنیا.! ئەوەیە دایکی من! »

کاتێک لە دەرەوە بیری لە کریت دەکردەوە هاوارێکی توندو بێ ئامان لە ناخیدا سەری هەڵدەدا.پاشان سەری بەردەداوە و بێدەنگ دەبوو. ئەو هاوارە بە سەریدا دەیگوڕاندو دەیگوت: تۆ ئێستا چت کردوە؟ بەراستی تۆ تەریق نابیەوە؟ تۆ لەو ماوەیەدا هەر لە گەڵ هەواو با بەشەرهاتوی و هەموتواناى خۆت بۆ قسەکردن ئەوخان کردوە. تۆ ئاگات لە واقعیەت نەبوە.تادڵت بە خەون خۆش کەی. من‌تۆم گەرەک نیە او ئەوەش‌کریت بوو لە ناخیدا هاواری دەکرد. ئەوەدەم سەری دادەخست و بێدەنگ دەبوو. ئەوەتا لەو دەمەوە کە پێی دە خاکی نیشتمان دەنا.سی و ریخۆڵەی پردەبوون لەبۆنی عەتری پێنگی دەشتێ. ئیتر نەیدەتوانی لە بەرامبەر ئەوەدەنگەدا بێدەنگ بێ. دەبوایە وەلامێک بداتەوە. بەڵام کام وەلام ؟ ئەو کەهیچی وای نەکردبوو بەکار بێ. دەست و رانو سینگی جگە لە پلە گۆشتێک شتێکی تر نەبوون. لە راستیدا ئەو مایەی شەرم و خەجالەتی بنەماڵەی باخی و سەربزێوی خۆی بوو.

ئێستا بۆ کوێ دەچوو؟ دەچوو یەکێ لە شێرەکانی بنەماڵەی خۆی بدۆزێ و شێرێکی دیکەش رازی بکا کە مل بۆ زنجیر رابکێشێ. بەڵێ ئەو کاری کەبوەتە ئەو جێگایە . بە هیوای ئەوەی دەنگی ئینسانێک ببیسێ.ئاوڕی وە کوستاندیس داو گوتی:« ها، کوستاندیس ! باسی پاڵەوان سیفاکاسی بابەگەورەم بکە ! وەرە وە پێش کەوە تا گوێم لە دەنگت بێ. »

سیغارێکی دایە. کوستاندیس سیغارەکەی خستە پشت گوێ و گوتی :
- چت دەوێ باسی چت بۆبکەم ئەرباب. جگەلەوە کە بڵێم ئێمە زیندوین و ئەو خەریکە دەمرێ. ئەو بە درێژایی تەمەنی خواردوویەتەوەو خواردوویەتەوەو تورکی کوشتون. ئێستاش خوا بیبەخشێ. بروا بکە ئەو فرە باش ژیاوە. تەنانەت لە باش باشتر. حەسرەتی هیچی نەماوە. کەوابوو نابێ بۆ مردنی بە پەرۆش بین. کاتێک دەهاتە چیا سەری مێگەلە مەری بدا، قالبە پەنیرێکی گەورەی دەکردە دوو پاروو. پاشان بە پلارکەروێشکێکی دەکوشت و دەیگوت: کوستاندیس وەرە ئەو کەروێشکەم بۆ لێنێ.من کەروێشکم بۆ لێدەنا، تەنانەت ئێسکەکانیشی دەخواردو هیچی نەدەهێشتەوە. بیستوومە شەوی ژنهێنانی سێ تەختی شکاندوە. پێمەکەنە ئەرباب، چت بۆ دەگێرمەوە وایە.
کوستاندیس بێدەنگ بوو. کلاوەکەی لەسەرکرد. ئارەق لە سەروچاوی رەش هەڵگەراوی دەهاتە خوارێ. ئەویش دەستی کرد بە پێکەنین و پرسی:« تۆ دەزانی ئەنکت چۆنی مێرد کرد؟
- نا.. نازانم. کوستاندیس بۆم بگێرەوە.!
- دایک وبابی‌نەیاندەویست بیدەن بە بابە گەورەت. وادیارە بابە گەورەت کابرایەکی نەقیربوە ودایک و بابی بوکێ دەوڵەمەندبوون و «خواجە باشی» بوە. لەوەش خراپتر رەوشتی بابە گەورەت جۆرێک بوە دەیانگوت دینەو بێ مێشکە. چونکە هەمیشە ئاژاوەی ناوەتەوە. هەرلەبەر ناو یا بەڵێ وەدەشتی کەوتوە. بەلام ئەوان خەڵکێکی ئاقڵ و گوێ لە مست بوون. جگەلەوە بنەماڵەش نەبوون. بابەگەورەت دەنێرێتە سەر کیژەکەیان، تەنانەت پێش نوێژی دێری عیسای مەسیحیش رەگەڵ دەخات. بەلام ئەو خێزانە شەریفە وەلامی نادەنەوە و دەڵێن « نا..نا..ناخودا نەیبنوسێ! ئێمە زاوای ئاوامان ناوێ. »
دەزانی بابە گەورەت چی کرد؟ کارێکی حسابی! شەوێک سوارەیێ وەدەچێتە گوندی کیژەکەی. تەنەکە نەوت وشقارتەش دەبا. ئەنگوستیلەیەکی‌دەزگیرانیش لە دەسرەیەکدا گرێ دەدا. کە دەگاتە گوندی نەوت بە خانوەکان وەر دەکا و هاوار دەکا: « هۆی خەڵکینە دەمەوێ ماڵەکانتان ئاگر تێ بەردەم. »
خەڵکی گوندی کە دەنگی ئاناسن لە جێ دێنەدەر. دایک وبابی کیژەکەش بە پەشۆکاوی لە خەو رادەپەرن و دەست بە پارانەوە دەکەن:« بۆخاتری خوا پاڵەوان سیفاکاس ئەوەمان لە گەڵ نەکەی! »
ئەو هاوار دەکا : کەوابوو «لێنا » م بدەنێ!
- چما تۆ لە خوا ناترسی ؟
- خوای مەهێننە نێو کارەکانی من.پێتان دەڵێم: «لێنا»م بدەنێ و تەواو. ئەوەش ئاڵقەی دەزگیرانی‌یە کە هێناومە.
دەسرەی لە سەری دەکاتەوە، ئەنگوستیلەکە نیشان دەدا و دەڵێ: « ئێستا سەرپشک بن... یان ئاگر یان ئەنگوستیلە. »
باوکی کیژەکە دەڵێ:« ئاخ... ئەی شەیتانی هەوسار پسار ، خودا سزات بدا. »
بابە گەورەی تۆ دیسان هاوار دەکا: « ئاگر یان ئەنگوستیلە ... زووبن ! »

ـ ئاخر بەزەبیت بە گوندی دابێ !
ـ گوتم ... ئاگر یا ئەنگوستیلە ...

خەڵکی گوندی تورە دەبن و دەڵێن:« یانی چی ؟ ئەو ئەحمەقە شێتە پاسا بۆ ئێمە دادەنێ؟ یالاّ... کوریە وەرن بەرگری لە خۆمان بکەین. بەلاّم پێش نوێژی گوندی دێتە نێو مەسەلەو دەڵێ:« برایانی من! لە خوا بترسێن و تەسلیمی ئەو هەتیوە مەبن کە شەیتان چۆتە کلێشەی. پاشان روو دەکاتە باوکی کیژەکەو دەڵێ: « زووبە <مینوتیس> بریار بدە! زاوا کوری چاکە، کیژەکەتی بدەیە ».

ریشسپی ئەومیش وەزمان دێن و ئاخرەکەی باوکی کچەکە دەڵێ:«باشە شەیتانی هەوسار پساو، من کیژەکەت دەدەمێ، برۆ. »

ـ من هەر ئێستا کچەکەم دەوێ، برۆ بیهێنە.

باوکی بە جنێودان بۆ لای کیژەکە دەچێ. دایکی دەست دەکا بە گریان ، بەلاّم بابە گەورەت دادێتەوەو کیژی گەنج بلێند دەکاو دەیهاوێتە پشت تەرکی خۆی و رکێف لێدەدا و تەپو توز دوای خۆی بە جێ دێڵێ. خەڵکی گوندی لەگەڵ پێش نوێژ بە پێیان وەدوای دەکەون. بەیانی زوو دەگەنە گوندی پێترکفالو. هەرلەوێ لێکیان مارە دەکەن. پاشان بابە گەورە بە سەریاندا دەگورێنێ و دەڵێ:

ـ ئیتر باشە برۆن بە دوای کاری خۆتاندا. یەکشەمۆی داهاتوو شایی دەکرێ، ئەودەم وەرن، پێلاوتان سەرچاوم. ئێستا کارم هەیە. لێرەدا کوستاندیس سیغارەکەی لە پشت گوێی هەڵگرت و گوتی:« بەڵێ ... پیاو دەبێ ئاوا ژن بێنێ. » ئەستێ و بەردی هێنادەرو سیغارەکەی داگیرساند. ئەودەم هەرتکیان لەدۆڵێ‌نێوان‌دووچیا تێپەربوون. ئاوێکی باریک بە سەر بەردەکاندا دەهاتە خوار. کوستاندیس پرسی : تەرباب تینوو نی؟

ـ نا.. کوستاندیس تاڵوکەی بکە باپرۆین .

ـ راوەستە من تینومە. بەرەو روو لە سەر بەردەکان درێژ بوو، ریش و سمێڵی خستە نێو ئاوو دمی پێوە نا. وەک پڵنگ بە زمان ئاوی دەخواردەوە. کسماس هەروەک تەماشای ئەو زەلامەچیاییەی دەکرد. لە بەرخۆیەوە بیری دەکردەوە کە: «ئەو دێوە ئاوی جۆگەی پیس دەگات.» بەهەستێکی‌فیزوشانازیەوە سەیری‌قەدوبالاّوپاسک‌وقژی تێکهالاّوی‌ئەو پیاوەی دەکرد. کوستاندیس هەستاوە، دەستێکی بە ریش وسمێڵی داهێناو گزچانی هاویشتە سەر شانی و گوتی :

ـ هەر لەسەر ئەم ورتکە بەردانەی کە ئێستا لەسەریان درێژ ببووم‌و ئاوم خواردەوە، رۆژێکی حوسێن ئەلْبانی دوژمنی مەسیحیانم سەر بری. لەو رۆژەوە سوێندم خواردوەهەرکاتێ بێرەدا تێپەرم، تینوشم یا نەبم ئاوێ دەخۆمەوە.

کسماس کە شەوی‌پێشتر حکایەتی کوشتنی حوسێن ئەلْبانی بۆ گێرابۆوە و گوتبووی کە ئەو کارە یەکێ لە هۆیەکانی قەتل‌عامی شاری کاندی ، ئەو کوشتارە سامناکە بوە، پرسی :

ـ ئەوە توڕەی سەرت بریبووکوستاندیس؟ ئەو کارەت هەر بە تەنێ کرد؟ کوستاندیس لە وەلاّم دا گوتی:

ـ دیارە بەتەنێ بووم. پێت وایە چۆن بوو؟ ئەو بەتەنێ بوو، دەبوایە منیش بە تەنیا بم. من

لە پێچانەوەی فیشەکان یارمەتی ژنەکانی دەدا. بەڵام بیری لە شوێنێکی تر دە خولایەوە. ئەو نەلە بیری کریت دابوو، نە لە فیکری پاڵەوان پولیکسینگیسدا. بیری لە مەسیح و پیرۆزەکانیش نەدەکردەوە. بیری لە سەیرو سەفەر دابوو، لە چیا بەرزەکان. بەدوای ئەو پیاوە تێکسرماوەدا دەگەڕا کە دڵی دەیویست. چەند حەوتووی تر، واتە ڕۆژی ڕێزگرتن لە خاچی پیرۆز کە دەبوو چاردەی مانگی سیپتامبر بە ئایینی مەسیح دەیان شوشت و دەبوو بە گاوڕ. پای کریسانتی خوشکی پاڵەوان پولیکسینگیس کە لە ماڵی عەلی بەگی لە مڵکی داگیرکراوی براکەی دەژیا، پێشەکی ئەو کارەی ئامادە دەکرد. بەژنەکانی گرتبوو کە بۆ ڕۆژی گاوڕبوونی ئەم ژنە موسوڵمانانە نانی متفەرک دروست بکەن.

لەم ڕۆژەدا، حەوت پاڵەوان هەر یەکە بەداروودەستەی خۆیانەوە جێگای یارکیان دەگرت، چس‌گورکیش دەهات وتاری دەدا. جوتیارانی گوندەکانی دراوسێش دەهاتن تا لە ئاهەنگی گاوڕبوونی ژنی نوری بەگیدا بەشدار بن . ئەوەیان بە فاڵی باش دەزانی و بە یونانی بوونی وەسمانی و بە کۆتایی هاتنی دەردو ئازاری کریتیان دادەنا. هەموویان هاتبوون خزمەتی ئامینەی بکەن. بە جوانی ئەویان هەڵا دەگرت و چاوە ڕوانی ئەو جێژنە بوون. ژنی چەرکەسی ئەو خزمەت و نازکردنەی بە ڕوو خۆشی وەردەگرتو بەڵام هەست و بیری هەر لە چیادوورەکان دە سوڕایەوە. تەنیاجارجار کە کریسانتی ڕێوشوێنی ئایینی تازەی فێر دەکرد، توڕە دەبوو،بە توندی وەڵامی دەدایەوە.

شەونکیان پیرە کچ لە سەر نیوتەخت دانیشت و دیسان دەستی کرد بە حکایەتی‌کورتە مێژووی ژیان وکەرامەت وموجیزەی مەسیح‌و خەلیفەکانی. باسی نوێژ و ڕۆژوو خۆ نەشوشتن و سەبرو خوراگری ئەوانی دەکرد و گوتی : ئەگەر زللەیان لە لاڕوومەتێک دابان، لایەکەی دیشیان وەر دەگێڕا.

ئامینە گوتی:« باشە .. پای کریسانتی! بۆجیا کریتیەکان مەسیحی نین ؟ئەدی بۆچی کاتێ سولتان بەسەریان دادەدا ، ئەوان شۆڕش دەکەن پەلاماری دەدەن و دەیانەوێ چاوی دەر بێنن. ؟ »

کریسانتی دوای تۆزێ دوودڵی گوتی:« ڕۆڵە ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە. ئەمە ئەو شتەیە کە تۆ پێی ئێژی نیشتمان و منیش ناوی دەنێم ئایین ..تێدە گەی؟ »

ژنی چەرکەسی لەم وەڵامە تێ نەگەیشت . لە بەر خۆیەوە گوتی :« هەر چۆنێ بێ من بەڵێنم داوە دەبم بە مەسیحی. بەڵام خۆشم هەر دەشۆم. ئەو پیاوەی خۆشم نەوێ ئەگەر دەستم لێ بدات، چاوەکانی دەردێنم. ئەگەر مردم با مەسیح چیدەوێ لە گەڵم بکات. بەڵام تا زیندووم دەسەڵاتی خۆم بە دەست خۆمە. »

ئێوارە ڕۆژی ئەنجومەنەو ئامینە لە پێش پەنجەرەی ژووری خۆی دانیشتوە. چاوەڕوانی گەرانەوەی دەسگیرانیەتی. خۆی ڕازاندۆتەوە، زولفەکانی شوشتوە، وەسمەی کێشاوە،چەندەی دەویست لە گەڵ دەسگیرانی بچێتە ئەنجومەن و تەماشای ئەم چاردە پاڵەوانە بکا کە وەک هەڵۆ بە ڕیز لە سەر گاشە بەردان دانیشتوون. ئەو پاڵەوان میکلسە کەللە ڕەقە ببینێ کە بە یادی ئەو مەمکەکانی وەخرو دەهاتن. بەڵام خوایە! ئامینە بۆچی بیر لە پاڵەوان میکلس دەکاتەوە ؟چی لە لەشی دایە کەوا ئەم ژنە بۆلای خۆ ڕادەکێشێ؟ ئەوە کە ئینسان نیە، شەیتانێکی درندەیە بۆ

بدوێنم!. گوندیان گەمارۆدابوو کەس رانەگات. گورانی هەرزەکارو چەند پیاوی بەساڵاچوو کە هەموویان ٤٠کەس دەبوون، لە کلیسا کۆبوونەوە. پیاوێکی پشتکۆری وردیلە چوە پێش و بە حوسێنی گوت : «ئەگەر بتەوێ ئەو لاوانە بکوژی، من شەرمێ دەکەم، زیندوو بمێنمەوە. من بکوژە و لە جیاتی من یەک لەو لاوانە ئازاد بکە. کامەی خۆت گەرەکتە.»
تەڵیاتی قاقا پێکەنی. پشت کووری گرت و هاویشتیە نێو چل کەسەی. پاشان روویکردە هاورێ سەگەکانی و فەرمانی دا:
« تەقە لەو کافرانە بکەن!»
کسماس گوتی: « کوستاندیس بیبڕەوە بەسە !»
بەڵام کوستاندیس بیدەنگ نەدەبوو. چونکە دیمەنی ئەو خوێناوەی لەبەر چاوبوو. درێژەی پێداو گوتی:
- تورک دەسرێژیان لێکردن. هێندێک هەر لەجێ تەواو بوونو کەوتن. بەڵام هێندێکیان کەوتبوون و دەجولانەوە و هێشتا نیوە گیان بوون. پاشان قوڵکەیەکیان هەڵکەندو هەموویان خستنە نێو. بەڵام قوڵکەکە زۆر قوڵ نیە، هێشتا بۆنی دێت، وەرە تا بیبینی.»
کسماس لەرزیو گوتی:« نامەوێ بیبینم» ودەنگی ئێسترەکەی دا. هەرتک گەیشتبوونە مەیدانی گوندی. خەڵک لە دەوریان کۆبوونەوە. هەموو پیرە مێردو ژن لە پشت سەریان وێستا بوون. پیرە مێردێکی باڵابەرزی لەرولاوازکەریشسپی گوندی بوو هاتە پێشو کڵاوی لەسەری هەڵگرت و گوتی:
- کورسیشمان نیە بۆتان بێنین لە سەری دانیشن. لیوانمان نیە ئەگەر تینوین ئاوی پێ بخۆنەوە. نانمان نیە ئەگەر برسی بن بۆتانی بێنین. کسوک هەموو شتێکی ئێمەیان سوتاند. خودا ناگریان تێبەردا.
پیرەژنێک بە گریان گوتی:«تەنانەت پیاوێکمان نیە لە گەڵتان بدوێ. ئەو ژنانەی لە دەوری پیرەژن وێستا بوون، دەستیان کرد بە گریان. ریشسپی گوندی ژنەکانی دەنگدا و گوتی:
. نازانن ژنەکان. بۆچما لە شۆرشی ١٨٦٦-یشدا هەر ئاوانەبووین؟ ئەوێ رۆژێ تەنیا دوسێ منداڵی شیرە خۆرە مابوونەوە. خەڵکی ئەم گوندە لەو منداڵانە وەپاش کەوتوون. هەتا ئێرو مێیەک بێنن، کریت هەردەمێنێ.
ژنێک لە گوێ ماسیلەیدا هێندێ ئاوی بۆ کسماسی هێنا. کسماس خواردیەوە، بەڵام دڵی فێنک نەبۆوە.
پیرە مێرد رووی کردە کوستاندیس و گوتی:
لاو خودا دەستی تۆ بکاتە متفەرک، بەو کێردەوە کە سەری ئەو سەگەت پێبری. بتباتە بەهەشت.خودا ئەو کێردەش بکاتە متفەرک. کسماسکە نەیدەتوانی بەسەر هەڵچوونی ناخیدا زاڵ بێ گوتی :
. بەسە ئیتر با بڕۆین .. خواحافیز !
پیرە مێردان لەکاتێکا خۆیان هاویشتبوە سەرگۆچانەکانیان، تەماشای رۆیشتنی ئەوانیان دەکرد. پیرەژن تەسرینی چاویان دەسریەوە. گەورە کچێک لە سەر وێرانەی خانویەکیدانیشتبوو.

بە تاسەوە تەماشای گورج وگۆڵ کوستاندیسی دەکرد کە لە سەر بەردێکەوە بۆ سەو ئەویتر بازدی دەدا.

ڕۆژ بەرەو ئاوابوون دەچوو. ئێستا گەیشتبوونە دەشتێکی چۆڵ کە چەند داربەڕوی سەوز لە تاریکیدووروتارمایان دەدا.. کوستاندیس گۆچانێکی لە ئێسترەکەی داو گوتی :

. توندتر برۆ...تاشەو دانەهاتوە ئەشێ بگەینە گوندی. لەوێ دەچینە ماڵی «گوبلینا»ی پورم. ئەو پیرێژنە خانووی نیە، بەڵام دڵێکی گوشادی هە یە و لە کاولەکەی خۆیدا ڕامان دەگرێ. لەو گوندەش هەروەک گوندی دیتمان خانو نەماون. سەگەکان بەو گوندەشدا تێ پەڕیون. لەعنەتی خودایان لێبێ.!

پیرێژنێکی کزۆڵەی پێپەتی کوێرە موشە بە گۆڵەدارێکەوە ڕادەبرد. کساس لێی پرسی :

. نە نە حاڵت چۆنە! ژیان چۆن دەگوزەرێ ؟

پیرێژن لە وەلامدا گوتی: «چت پێ بڵێم ڕۆڵە. ژیانی سەگمان هەیە. خوامرۆ لە هەموو چارە رەشیوکوێرەوەری دوور رابگرێ.»

. تورک تۆشیان ئازارداوە ؟

. چت گوت ڕۆڵە !... من هیچ نابینم ...

ئەنەگیان گوتم خوا حافیز . ئەنەگیان دەروزین ..

. تۆ کریتی ؟

. بەڵێ ...ئەنەگیان...

رەحمەت لەتۆ.. ئادەتوانی منداڵ دروست کەا کریت چۆڵ بوە. منداڵ دروست کە تا رەگەزی کریتیان لەسەر زەوی پاک نەبێتەوە. کریتیش بە کاری شتێک دێن.

کوستاندیس گوتی:« بە سە درنگە با برۆین ...» ئێستریان دەنگداو دوور کەوتنەوە.دیسان گوتی:

. باشبوو پیرێژن بە خرگە بەردان تێمان بەر نەبوو. باش لە دەستی دەرباز بووین. ئەو پیرێژنە ناوی «کوستاندینا»یە. پێی دەڵێن « حاجی خانم» بەدبەختە کە چاوی بە پیاوی کەوت ئاقڵی نامێنێ. بە بەردان دایدەگرێ. هەر کەسێکی دیت، وادەزانی تورکە. پاشان داهاتەوە چەند دەنکە بەرووی هەڵگرتنەوە، پاکی کردن وخواردنی.تەماشای کرد کساس بە وشتی سەیری دەکا. پێکەنیو گوتی:

. ئەوانە بەرو نین، شابەروون . لای کەم کە هەواتاریکەو باش لێکیان ناکەینەوە، هیچیشمان نیە بیخۆین، دەڵێین شابەروون. بەڵام لە بارەی حاجی خانمێ کە ئێستا باسمان دەکرد گوێ بدیەتا بۆت باسکەم کە سەرت سوڕ بمێنێ. ئەو پیرێژنە بەدبەختە چوار کوڕی هەبوو. هەموویان گەنجو ئازاو جوانچاک. هەرچواریان چووبوونە چیا تا لە دەستەی پاڵەوان «ولاهوس»دا دژی تورکان شەر بکەن. شەوێکی هەرچواریان بۆ سەردانی دایکیان کە نەخۆشبوو، لە چیا هاتبوونەخوارێ. بەیانی زوو سەربازی تورک وەنێو گوندی کەوتن‌و چوونە ماڵە پیرێژنێ. چوار لاوی بێ چەک هێشتا لەخەودا بوون. تورک دەیانگرنو دەستیان دەبەستن‌وبەدیواریانەوە دەنێن. پیرە دایک بەگریان‌و هاوارخۆداویتە سەرپێلاوی ئەفسەری تورک وەدەپارێتەوە.

ئەفسەر پێدەکەنی‌و بە پیرێژن دەڵێ:«یەک لەو چوارانە هەڵبژێرەو بزانەکە نایکوژم.» دایک لە کاتێکا وەک دارە بی دەلەرزی‌وتەماشای کورەکانی‌دەکرد. کامیان هەڵبژێرێت ؟ سێ کور گوتیان دایە : ‹تیکولیس›هەڵبژێرە، چونکە ئەو ژن ومنداڵی هەیە. نیکولیس تورەبوو گوتی :« من منداڵم هەیەو تۆی خۆم چاندوە، دەبێ یەک لە ئێوە زیندوویێ تا ژن بێنێ‌و منداڵی بێ.» پاشان ئەو سێیانە دەستیان کرد بە کێشەو باس، هەریەکە دەیویست ئەویدی نەجات بدا. ئەفسەری تورک ئاخرەکەی حەوسەڵەی بەسەر چوو، فەرمانی دەسڕێژی داو هەرچوار لاو کەوتنە عەرزی.

کسماس هاواری کرد وگوتی :

ـ کوستاندیسی لەعنەتی! تۆ بەکام دڵەوە دەتوانی ئەم کارەسانە بگێڕیەوە. ؟

کوستاندیس پێکەنی گوتی : « ئەرباب ! پیاو دەبێ خۆراگربێ، بەردو پۆلاً خۆراناگرن، بەلاًم مرۆڤ خۆرادەگرێ. ئیتر ئەوەندەی گوتمان بەسە. خۆشتر بڕۆین، شەوداهات »

لە دەشتی هاتنەدەر و گەیشتنە پاسکێکی چیا. کوستاندیس بە دەست نیشانیداو گوتی :

« ئەوەش گوند »

کسماس تەماشای کرد جگە لە چەند گاشە بەرد کە بە چیاوە نوسابوون، چیتر دیار نیە. پرسی «کوا گوند..؟ من هیچ نابینم.» کوستاندیس گوتی :

ـ پێش خۆت تەماشا کە، ئەو گاشە بەردانە گوندە. ئێستا زەلامانیش دەبینی. ئەوەش سەگی گوندی کە بۆنیان کردوەو وادێن

دوو‌سێ کسۆکی لەری برسی لە کاولان هاتبوونەدەرو بەوەڕین بۆیان دەهاتن. ئیتر شەوداهاتبوو.

کسماس گوتی : « من چرایەک نابینم »

ـ ئەی ئەرباب ! چرای چی؟ چراو نەوت لەکوێ بێنن؟ ئەگەر رۆژ ئاوابوو وەک کوند دەچن خۆیان لە کاولاندا دەشارنەوە.

لەپڕ لە بان بەردێکەوە چوار پێنج سەر هاتنە دەرو گوتیان :« بەخێرهاتن دەچنە کوێ/ »

کوستاندیس گوتی :« ئێمە دەچینە ماڵی ‹نەنەکۆیلیتا›. ئەو رامان دەگرێ». هەر پێنج دەستیان کرد بە پێکەنین. یەکیان پرسی !:« ئێوە خۆتان هیچتان پی‌یە بیخۆن؟

ـ بەڵێ... شتێکمان پی‌یە.

ـ کەوابوو باشە... نەنەکۆیلیتاش شتێک دەخوا.

ـ هیچتان هەیە بەخۆتانی دادەن ، لە سەرما بتان پارێزێ؟

ـ بەڵێ هەمانە .

ـ کەوابوو نەنە کۆیلیتا ئەمشەو شتێک بە خۆی دادەدات.

لەپشت بەردەکانەوە دەنگی گاڵتەو پێکەنین دەهات.

ـ سەیرە ... لەم گوندە هەموو پێدەکەنن. ئەوانە چما دەردو زەحمەتیان نەدیوە، یان بە سەر دەردەکانیاندا زاڵن. ؟

کوستاندیس بۆ روونکرنەوە گوتی :

ـ ئەوانەش لەهەووەڵەوە رەنجیان کێشا. جگە لەوە چی‌یان پێدەکرا. ئەوانەش ئینسانن. بەلاًم لە

ئاخردا تێگەیشتن کە بە خەمخواردن هیچ ناکرێ. ناچار دەردو خەمی خۆیان دایە شەیتانو وێڵیان کرد. تەنانەت کەمانچە ژەنێک هەیە، دێت،کەمانچەیان بۆ لێدەدا. ئەوان بێ ئەوەی شەراب بخۆنەوە سەرخۆش دەبن. وەک دوویشک لە سەرپەردان ژنو مێردایەتی دەکەن. ئەریاب، خۆت دەزانی ئادەمیزاد فەرامۆشکارە. هەر بۆیەش تەبەدی‌یەو نامرێ.

کوستاندیس راوەستاو دەستی کرد بە ئەژماردنی خانووی وێران. خانوو بە قەدرایی گاشە بەردان بوون. گوتی :

- چوار... پێنج... شەش...،ئەوە خانووی پووری منە. پێویست ناکا لەدەرگا بدەین. چونکە دەرگای نیە. هاواری کرد :

- های خات کوبلینا ... وەرە دەرێ، وەرە سەر هەیوانێ. پیرێژنێکی کەلاکی تێتزلڕاو کە بە داری دەرزی لە نێو کاولێک هاتە دەرێ و پرسی :

- کوستاندیس ئەوە تۆی ؟تۆ کەی دەبی بە جیسان ؟ کێت لەگەڵە ؟

- گوتم دەرگای وەتاغەکان بکەوە، ئێمە دەمانەوێ میوانی تۆبین. بە نۆکەرەکانت بێژە گورج دوو مامر سەر ببرن. یەکیان بکەنە سوپ و ئەوی دیکەش لەگەڵ پەتاتە سوور کەنەوە. دەرگای سندوقەکان بکەوە، لێفەو دۆشەکی ئاوریشم بێنە دەرێ. جێگامان بۆ چاپکە پوورێ گیان، بە دیتنت چەندە شادم. هیوادارم شادو بەختەوەر بی.!

پیرێژن لە وەڵامدا گوتی:« بەقسەت دەکەم کەللە کەرا » پاشان لە کسماس وەتیزیک کەوت و گوتی :

- تۆ ئەریابی من بە خێر هاتی! کسماس لە ئێستر هاتبوە خوارو بە لاکەلاک بەسەر بەردانىدا دەرزی. پیرێژن دیسان گوتی:

- رۆڵە بەخێرهاتی، گوێ مەدە قسەکانی ئەو کوستاندیسە شێتە. لێرە قوژنێک هەیە و میچێک. ژووری دانیشتنوماڵم هەر ئەوەیە. وەرە ژوورێ.

هەموویان لە سەر بەردان دانیشتن. کوستاندیس هێندێ چیلکەوداری کۆ کردەوەو ئاگری سازکرد. کسماس خورجینی خۆی کردەوەو ئەو خواردنی کە دایکی بۆ رێگا بۆی تێنابوو، هێنایەدەر. نەنە کۆبلیناش هات لە پەنای دانیشت.

وەک خۆ ناساندن پێکەوە یەک دوو قسەیان کرد. پیرێژن نیشانەی خاچی کێشا و هەرسێکیان دەستیان کرد بە خواردن.

خانەخوێ گوتی:« رۆڵەکانم خۆزیاهەموو شەوێ دەهاتن. هەموو شەوێک.چونکە منیش شتێکم دەخوارد شەرابیشتان هەیە؟

قمقمەی کوستاندیس دەست بەدەست گەڕا. پیرێژن چاوی وە تروسکە کەوتن. وێدەچوو بە کیژی جوان بووبێت. تاقە شتێکی لە جوانی بۆی مابۆوە، چاوە رەشو گەورەکانی بوون.

کوستاندیس کە بە شەراب گەرم داهاتبوو گوتی:« پورە کۆبلینا! ئیجازەبە گۆرانیەک بڵێم ؟

- چۆنی دەتەوێ، کۆستاندیسی لەعنەتی! تۆ زیندووی کەواببوو دەتوانی گۆرانیش بڵێی.

زەلامی لەندەهۆر دەستی بە گۆرانی وتن کرد. پیرێژن گوێی دەدایە و بەو زاری بێ ددان تاقا پێدەکەنی.

کوستاندیس دەیگوت : « منو پورە تیئودۆرا پێکەوە دەچووینە شاری. لە ڕێگا پێکەوە قسەمان دەکرد. ئەو دەستی لە من دەداو من دەستم لەوی دەدا. خودا وای کرد کە پورم لە پێش لاقانم وەعەرزی کەوێ. ئاخ پورێ گیان، خۆزیا پورم نەبای !

ـ ئاخ.. کورم... تۆ چت لەوە داوە ، من دیسان هەر پورت دەبم! »

پیرێژن بەو گۆرانیانە، گیانێکی دەهاتەوە بەر و چەپلەی لێدەداو سوور دەبۆوە.

کسماس بە سەر سورمانەوە چاوی لێدەکرد و لە بەر خۆیەوە دەیگوت : « چ توانایەکی مەزنی گیانی! ڕازی مانەوەی کریت هەر لەوە دایە ! »

پیرێژن بە پێکەنینەوە گوتی :« کورم، فەقیری‌و هەژاری پێویستی بە شادی هەیە، خەم وخەفەت پێویستیان بە خۆشی هەیە. ئەگینا خەم‌و خەفەت دەمانتۆپێنێتەوە. بۆچی دەبێ ڕێگا بدەین کە خەمی قاحپە بمانخوا؟ باشترە ئێمە ئەو بخۆین. »

لە قسەکردندا مستی لە بەردەکان دەداو جارێکی تر گوتی:

. منێکی کەوا ئێستا شادو پێدەکەنم، لە دەستی مەرگ چم نەکێشاوە. نازانم لەو ڕەزیلە بێشەرمە چۆن تۆڵە بستێنمەوە. ئێستا تەمەنم ۷۰ ساڵە. داخەکەم تازە منداڵم نابێ، دەناحاڵم دەکرد!

کوستاندیس گوتی : « پورێ گیان لە سەربردەی خەفەتباری خۆت هێندێکمان بۆ باس بکە. بۆ خۆشت باشە. »

. . ئاخ... کوستاندیسە ڕەبەنەی من ! باسی چت بۆبکەم. من ئێستا گەروم وشکە. هەر لەو نیزیکانە ئەشکەوتێک هەیە. جارێکی پارتیزانێکی یونانیم تێدا شارد بۆوە کە سەربازی تورک وەدوای کەوتبوون نان نەبوو منداڵی خۆم بیخۆن، بەڵام نانم بۆ دەبرد. منداڵی خۆم پێخەفی نەبوو، من پێخەفم بۆ دەبرد. ڕۆژێکیان ئەفسەرێکی تورک لە گەڵ سەربازان لێم وەژوور کەوت و گوتی :« کویلیناى لەعنەتی ! ئەگەر جێگای ئەو پارتیزانە یونانیەمان پێ نەڵێی،تاقە کورەکەت دەکوژین»

گوتم بە جێگای هیچ کەس نازانم. تۆش چت گەرەکە وابکە. بەڵام بزانەو لەم کویلینای پیر بیسەو پاشانیش وەبیرت بێتەوە کە کریت بەو خەم دەردو خەفەتەوە بەسەر دەوڵەتی وەسمانیدا سەردەکەوێ. من سەرم لە گرێو دادەنێم. لەسەر چی گرێوم لەگەڵ دەکەی؟ ئەگەر سەرنەکەوت سەرم ببڕە ئەو سەگە لە حەیفان گێنگڵی دەخوارد. لەو کاتەدا کورەکەم هاتەوەماڵێ. سەر بازان گرتیان‌و بە دیواریانەوەنا. پاشان ئەفسەری تورک سەیری منی کرد. کورەکەم هاواری کرد و گوتی : « دایە ... دایە.. جێگای پارتیزانەکەی ئاشکرا نەکەی! » من گوتم :« نا..نا..کورم مەترسێ.. جێگای نالێم..خوا حافیز.. » تورک کورەکەیان کوشتم، خانوەکەیان سوتاندم و ڕۆیشتن.

کسماس لەوکاتەدا لە جێ ڕادەبوو گوتی :« دایە گیان بۆچی وات کرد؟ »

پیرێژن لەوپەری خوێن ساردی دا گوتی:«چونکە دەمزانی ئەو لاوە پارتیزانە لە گوندێکی ‹روملی› دایکی هەیە.ئەوەشم دەزانی کە دەردی دایکبوون چیە؟ »

کسماس تەواوی شەو نەیتوانی بخەوێ. هەمیش بیری لە کویلینای پیر دەکردەوە و لە دڵدا دەیگوت: «چ هەستێکی بەرزو مەزن» هەر دەڵێی گیانێکی پیرۆز کریتی‌زیندوو ڕاگرتوە. گیانێکە

لەوانەیە بتوانی بە ‹روح›ی ناوبەری، گرێکە لە سەرووی مەرگ و ژیانە. ئێستا ئەوە فیزە، شانازیە، یا لاساریە، ئازایەتیە یا هەموویانە پێکەوە لە گەڵ شتێکی لە وەسف نەهاتوو کە دەبێتە هۆی ئەوە مرۆڤ شانازی بەوە بکات کە ئینسانە ...»

بەیانی کاتێک ماڵاواییان لە پیرێژنێ دەکرد، تەنە کۆیلینا بەردێکی لە حەساری هەڵکەند کە پەڵەی سووری پێوە بوو. هێنای‌و دای بە کسماس‌و گوتی: «من دیاری دیکەم نیە بیدەم بە تۆ. وەرە ئەم بەردە لەمن بە دیاری وەرگرە. تا هەتا بیبینی، کریت وەبیر بێنەوە.» پاشان پەڵە سوورە رەش‌هەڵگەڕاوەکانی نیشاندان وگوتی: «ئەوە خوێنی کورەکەمە.»

رێبوارەکان کەوتنە رێ. کوستاندیس گۆچانی هاویشتە سەر شان و کەوتە پێش. گۆرانی دەگوت. کسماس بێدەنگ تەماشای دەوروبەری خۆی دەکرد. ئەو رۆژە بۆ هەوەڵین جار هەستی بە دەنگی نهێنی و سامناکی نیشتمانی خۆی کرد. دەنگی ئەم وڵاتە گرژو سەربزێوەی هەست پێکرد کە تاوێک دەرفەتی هێمنی‌و حەسانەوە نادا بەو کەسەی کە بۆ نیشتمان گەڕاوەتەوە. لە کریت شتێکی سەرووی ئادەمیزاد هەیە، ئەو شتە ئەوەندە قامچی لە رۆڵەکانی خۆی دەدا، هەتا خوێن لە لەشیان دێت. ئاوڕی داوە، تەماشای گوندو گاشە بەردانی‌کرد.لە نێو کاولەکان ژن‌و منداڵی لێک کردنەوە.دەنگی هاوارو پێکەنینی بیست. لەبەر خۆیەوە گوتی :« وای چ توانایێکیان هەیە ئەم خەڵکەو چ گیانێک ! ئێستا ئەوە هەزاران ساڵە بە برسیەتی و تینوویی ومەرگ‌و کێشە لە سەرئەو بەردە رەقانە خەبات دەکەن وچۆک دانادەن. تەنانەت سکاڵاش ناکەن ئەم‌کریتیانە رزگاری خۆیان لە داوێنی ناهومێدی و بێبەشیدا دەبیتن.

ماڵی سیفاکاسی پیر، بەرزو بەرفرەوان، لە سەرەوەی گوندی دیاری دەدا. پڕبوو لە کوپەی شەراب و رۆنی زەیتون و تەویلەو عەمبارو داڵانی‌درێژ و ژووری مێچ بەرز کە هاوینان لێفەو دۆشەکیان تێدا هەڵدەچنی. دەرگاکان ئاواڵەبوون. خەڵک بۆ سەردانی پیرە پاڵەوان دەهاتن و دەرۆیشتن. چەند رۆژبوو لەگەڵ مەرگ ملبەملەی بوو.

لە ژووری ماڵێ ژن‌و بوک‌ونەوەکانی پیرە مێرد لە هاتو چۆدابوون. بۆنی رۆنی زەیتون‌وکوپەی شەراب وکەوڵەمەری هەڵاوەسراو وپەنیری کوپەو پەنیری سپی سەلک کە لەسەر تەختە دانرابوون، دەیانپژاردن‌و بە دەنگی بەرز بەڤی هەموانیان دیاری دەکرد. هێشتا پیرە مێرد نەمردبوو‌میراتیان بەشدەکرد. پیرە مێرد ناڕەحەت‌بوو گوتی:

. لە حەسارێ درێژم بکەن، نامەوێ گوێم لە دەنگە دەنگتان بێ. بە دۆشەکەوە هەڵیان گرت‌و بردیانە حەسارێ. پاشان گوتی:« لە بن داری لیمۆ لەسەر عەرزم دابنێن. بچن داردەستەکەم بێنن. دەمەوێ هەرلێرە پاڵ وەعەرز بدەم‌و گیان بدەم. دەمەوێ دەست لە زەوی بدەم، زەویش دەست لەمن بدات. هێندێ بەرزم کەنەوە تا دەوروبەری خۆم ببینم.

پیرە مێردیان بەرز کردەوە. پاڵپشتیان بۆ دانا. داردەستەکەیان لە پەنا دانا. گۆزەیەکیان ئاوی سارد لەکن دانا تا بخواتەوە. پاشان گوتی:« زۆرباشە، ئێستا هەموتان برۆن بەدوای کارەکانتاندا. تەنیا تراساکی لە لام دانیشێ.»

لە حەسارێ تەماشای تەویلەو چاڵاو وعەمبارو دووداڕە شمشادو دەوروبەری خۆی دەکرد. گەڵای دارەلیمۆی بۆن دەکرد. ئەو بۆنەی زۆر پێخۆشبوو. دەستی دەرێشی وەردەدا کە کەوتبوە

سەرسینگی. لە پرەهەستی‌کرد کە لەپشتەوە دەنگی هەناسەی ئینسان دێت. ئاوری داوە لاوێکی قەڵەوی تورکناوی چاو پێکەوت کە تەماشای دەکات. پیرە مێرد پرسی :

. پێم بڵێ بزانم تۆ کێی ؟

. کۆنستانتینس ..

. کوری کێی ؟

. کوری نیکۆلیسی کورت

. چت دەوێ وا بەمنەوە نوساوی ؟

. بابە گەورە وادیارە مردنی تۆ درێژە دەکێشێ. منیش بە تالوکەم کە بچمەوە چیا و ئاگام لە مەڕەکان بێ. جا ئەگەر رێگا بدەی من دەڕۆم.

کەوابوو مەحتەڵ مەبە. من بەوزوانە نامرم. برۆ بە باشی ئاگات لە مەڕی بێ.

لاو گوتی تا دوعای خێرم بۆ نەکەی ناڕۆم. لە بەیانیەوە هەرپێوە ڕاوستاوم.

. زۆر باشە... دوعای خێری منت لەگەڵ بێ. ئێستا ئیتر برۆ. گوێ بدەیە: بە ماڵێ بێژە سفرەی نانی ئیوەرۆ هەر لەو حەساری ڕابخەن. پاڵەوانەکان دەبێ بێنە حەساریێ لە بەر چاوی من نان بخۆن. دەمەوێ بیان بینم. خۆهێشتا دەستیان بە خواردن نەکردوە. ؟

. هێشتا..! بابە گەورە لە دوێنێ ئێوارێوە کە گەیشتووێ، یەکسەر خەریکی خواردنن، هەر تاوێکیش لغاوەیان بێکار نەبوە.

. چیم پێگوتی وابکە. بە ماڵێ بێژە سفرە لە حەساری ڕابخەن. تا بتوانم‌نانخواردنی پاڵەوانان ببینم. ئەگەر پاڵەوانەکان ناتوانن برۆن، تۆ کۆنستانتینس یارمەتیان بدەو پێیان پێمەکەنە.تۆ دەزانی ئەوانە پاڵەوانن و بێویستە رێزیان لێ بگیرێ.

لەو کاتەدا هاریدیموس بە هەناسە برکە گەیشتێ. بابە گەورە ناردبویە کن پاڵەوان میکێلس خەبەری بداتێ کەباوکی لە مردنەو چاوەروانە بێ خواحافیزی لێ بکات. پیرەمێرد کە چاوی بە شوانەکەی کەوت پرسی :

. باشە.. پاڵەوان میکێلس وەڵامی چی دایەوە، دێت یان نا..؟

. ئەو بە منی گوت : بە تۆ بڵێم « لێم ببورە بابە. من ناتوانم پۆستی خۆم بەجێ بێڵم. لە دوورەوە دوعای خێرم بۆ بکە. خودا حافیز. هیوادارم زوو یەکتر ببینینەوە ! » بەڵێ... ئەو بە منی گوت کە وات پێ بێژم.

پیرە مێرد گوتی خەتای نیە. جارێک کارێکی وا ئەحمەقانەی کرد بوو، ئەوە بۆی بوو بە دەرس. من هەر لەو دوورەوە دوعای بەخێری بۆ دەکەم. دەستی هەڵێنار نیشانەی خاچی کێشا. پاشان رووی کردە تراساکی‌و گوتی :

. تراساکی تۆدەزانی کەوا چ رادەبرێ ؟

. بەڵێ بابە گەورە من هەموو شت تێدەگەم.

. باشە چاوەکانت بکەوە، تەماشای دەوروبەری خۆت بکە. گوێچکەکانیشت باش بکەرەو گوێ بدەیە. تێبکۆشە لە هیچ شت خافڵ نەبی. ئێستا دەبینی کە سێ کێوی بەرز، سێ پاڵەوانی مەزن دێنە ئێرە.

لەو کاتەدا کە پیرە مێرد ئەوقسانەی دەکرد، ستارولیوسی دارتاش لە دەرگی حەساری پەیدا بوو. نەوەکانی پیرەمێرد خەبەریان دابوویە کە بێ بۆ دروستکردنی تابوتی ئەندازەی بابەگەورەی بگرێ. دارتاشی گەنج وەک دزان هاتە ژوور بە ترس ولەرزەوە، وەنیزیک کەوت. پیرە مێرد وای نواند کە نەیدیوە. دارتاش بۆ ئەندازە گرتنی داهاتەوەو لێی پرسی :

. پاڵەوان سیفاگاس حاڵت چۆنە.؟ وادیارە ئەمڕۆ زۆر باشتری، سوپاس بۆ خوا. بە راستی تۆ مردن دەبەزێنی.

پیرە مێرد لە بنەوە تەماشای دارتاشی کرد کە بە ترسەوە دەست درێژ دەکا ئەندازەی بگرێو لە بن سمیلانیشەوە پێی پێدەکەنێ. ئاخرەکەی دڵی پێسوتاو گوتی:

. مەترسێ ستارولیوسی خۆشەویستم. مەترسێ. میترەکەت بێنە دەرو راست ئەندازەم بگرە.

دارتاش تێکراببوو گوتی :ە باسی چەدەکەی پاڵەوان ؟

. کەرە ! گوتم میترەکەت بێنەو ئەندازەم بگرە.

دارتاش دیتی پیرە مێرد دەستی بۆ داردەستەکەی درێژ کردوە. ترساو میترەکەی لە بەر پشتێ هێنادەرو خەریکی ئەندازە گرتنی بالأی رەشیدی پیرە مێرد بوو. پیرە مێردپرسی:ە چەند میترم ؟

. میترێکو هەشتاو پێنج سەنت پاڵەوان . پیرە مێرد هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی :

. حەیف کە کورببوومەوەو پیرو چرچ بووم. باشە .. ئیستا پانایی سینگم ئەندازە بگرە. پانایی سینگیشی ئەندازە گرت و راوەستا. پیرە مێرد گوتی :

. باشە، ئێستا برۆ بەدبەخت، بیر لە تابوت بکەوە. هەوڵ بدە تابوتێکی باشم بۆ دروست بکەی. داری گوێزت هەیە؟

. بەڵێ پاڵەوان هەمە

. دەمەوێ تابوتم لە دارە گوێز بێ. پاشان رووی کردە تراساکیو گوتی :

. تراساکی تۆ داری گوێز دەناسی ؟

. بەڵێ بابە گەورە .

. کەوابوو بچو ئاگات لێبێ، ئەو هەتیوە فێڵمان لێ نەکا.

لەو کاتەدا ژنەکان لە حەساری سفرەیان رادەخست.کەبابو جامی مسو گۆزەی شەرابیان دەهێنا. پیرە مێرد کە پاڵی دابوو، تەماشای دەکردن. دووردانە مێش هەنگوین لە سەر تۆە ئاڵۆزەکانی وزەوزیان بوو. مێرولە بە لاقە توکنارییەکانی هەڵادەچوون. بەوە کەیفخۆشبوو کە لە بان سەری لیمۆی بە دارەوە دەدیتو مێرولەش بە لاتی هەڵدەگەڕان. پرسی :

. ئەری پاڵەوانگەل لەکوێن ؟

. ئەوە دێن بابە گەورە... ئەوەتا هاتن..

پیرە مێرد بە زەحمەت سەری ئورسی وەرگێڕاو تەماشای کرد. سێ پاڵەوانباسکی یەکتریان گرتوە، بە لاکە لاک دێنە پێش. هەرسێک کلاویان خوار داناوە. سمێڵیان شۆڕە و قایشی پشتیان شلەو شالواریان هەڵمساوەو چەکمەی رەشیان کۆن بووە هەر یەکەش لقە گوڵێکیان لە پشت گوێیان داناوە. بە سەبروکە بە یەکتریان دەگوت:

. هاوڕێ، راست برۆ، وانەکەی ئابرومان بچێ. مامۆستای مەدرەسە سەرخۆشبوو. دەشەلی و

لەرو لاواز بوو.گوتی ؟

. کورینە بگرن، دەنا دەگەوم. تارە کوژنەکەشی وەها بە سینگیەوە نوساندبوو دەتگوت قانوسقەیە. لە لای راست و چەپی ئەو دوو پالەوانی دیکە، واتە پالەوان مانداکاس بەو سینگی پان و گونی براو و بە ریشی کورت و پشت ملی ئەستور و بە دەمانچەی زیو کە لە بەر پشتی شزقی دەدا، پالەوان کاتسیرماس ئەو دزی دەریایی بە روخساری رەش هەلگەراوی و بە چاوی خیل و بیچمی وەحشیانەی بەسامی دەرویشتن.

هاتنە ژوورێ.کەچاویان بە پیرە مێردکەوت لە بن دارلیمۆ درێژ بوە، تێکرابوون‌و راوەستان. مانداکاس لە قاقای پێکەنینیداوبە دەنگی بەرز گوتی :

. ناخ... سیفاکاس تۆ هێشتا زیندووی؟ سەیری ئێمەکە. ماوەیەک پێش دەمانخواردەوەو بۆ لێخۆشبوونی گیانی تۆ پیالەمان لێک دەدا.

. ئێوە هێشتا لەخواردن و خواردنەوە تێر نەبوون؟ ئەی پالەوانە لەعنەتیەکان! گویا لە دوێنێ ئێوارێوە زارتان رانەوەستاوە. ئەم ورگە ماخۆمردەی ئێوە کەی پردەبێ؟ دەگرێ تاوێک ئەم ورگە چلێسەتان لە بیر بەرنەوەو بێن وەک پیاوان‌دوو قسان‌بکەین.؟

ماموستا خەریکبوو وەدەنگ بێ. بەلام زمانی تێکهالاو وشە وەک ورتکە بەرد لەزاریدا وێک دەکەوتن و زاریان بریندار دەکرد. کاتسیرماس دەستی پانی بەزاری ماموستاوەناو گوتی: بێدەنگ بە بێدەنگ،دەنا تابروشان دەبەی.»

پاشان رووی کردە سیفاکاسی پیرو دەستی بە سینگیەوەتا وزۆر بە ئەدەبانە گوتی:

. تەمەنت درێژ بێ‌پالەوان سیفاکاس،ئێمە فرە شادین کە هاتووینە مالی تۆ. تائێستا خواردوومانەو خواردوومانەتەوە،دیسان بە سلامەتی تۆ دەخۆین‌و دەخۆینەوە. پاشان ئەگەر ویستت لە پەنات دادەنیشین.وەک پیاوان قسەت لەگەلْ دەکەین. بەلام پەلەی مەکە.

پیرە مێرد گوتی : « من پەلەم نیە ئەو بە تالوکەیە »

. ئەو...کێ ؟

پیرە مێرد دەستی بۆ پشتەوە راداشت و گوتی:« مەرگ ..»

پالەوان مانداکاس دەستێکی بە سمێلی داهێناو گوتی:« ئێمە سێ کەسین‌و بەتۆوە دەبینە چوار،باچاوە روان بێ.»

پاشان هەرسێک پالەوان وەک جانەوەری مەست سێ سەرو شەش لاق جارێکی تر کەوتنە رێ. ماموستا خلیسکاو کەمی مابوو بکەوێ. بەلام دوو کەسەکەی تر پشت ملیان گرت و راستیان کردەوە. لە پشت سەریانەوە دەنگی قاقای پێکەنین هات. بوکو نەوەی پیرە مێرد بوون پێدەکەنین. بە دیتنی سێ پالەوانی سەرخۆش خۆیان پێ رانەگیرا بوو. سیفاکاسی پیر نارەحەتبوو گوتی:«بۆ پێدەکەنن. ئەو پالەوانانە پیاوی مەزن‌و بە رێزن دەستیان بگرن کە نەکەون.»

پالەوان کاتسیرماس نەڕاندی و گوتی :

هەرکەس لێم وەنیزیک کەوێ چەنەی دەشکێنم. من خۆم بەتەنیا بەرێگادادەروم. ئەوەی گوت و لە وانیتر جیا بۆوە و بە هەنگاوی بەرز چوو لە سەر سفرەی دانیشت. دووکەسەکەی تریش چوون دانیشتن.گۆزەی شەرابیان هەلگرت و جامەکانیان پرکرد. ماموستا کۆنە کەمانچەی لە سەر ئەژنۆ

دانا، پله گۆشتێکی هەڵگرت، تا پێش کەمانچە لێدان تێنێکی بێتە بەر.

واست لەوکاتەدا کە خەریک بوو دەست پێبکا، کـساس لە بەر دەرگا پەیدابوو. چاوی بە پیرەمێرد کەوت کە لە بن دارلیمۆ درێژ بوو. سێ پاڵەوان لە سەر سفرە دانیشتوون‌و چنگ و زاریان پڕ لە گۆشتە. لە پشت سەریان کۆمەڵێک بووک و نەوەو نەتیژە راوەستاون. واقی وڕماو راوەستا. پیرەمێرد دیتی. نێوچاوانی تێک ناو زەق تێی راما تا باش بیناسێ. پاشان گوتی: ئەو گێژە بێ مێشکە کێیە لە بەر دەرگای ماڵێ وەستاوە.؟

کـساس لە وەڵامدا گوتی :« ئەوەی تۆیە بابە گەورە ! بۆلای پیرە مێرد چوو.»

ـ کوری کێی ؟

ـ کوری پاڵەوان کوستاروس، کورە گەورەی تۆ .

پیرە مێرد دەستی درێژ کردو گوتی :

ـ ئاخ... خۆش هاتی! وەرە پێش تا پیرۆزت کەم... لەو ماوە درێژەدا کە کوێ بووی ؟ لە کوێ دەسوڕایەوە؟ لەگن ئەرەنگان چت دەکرد.؟ خۆزیا دەرفەت هەبایە شتت لێ بپرسم‌و تۆش وەڵامم بدەیەوە. بەڵام داخەکەم کە چرای من رۆنی نەماوە.

کـساس وەنیزیک کەوت، سەری دانواند، پیرە مێرد ماوەیەک سەری دەتامیزێ گرت‌و نەیدەویست بەری بدا. لێی پرسی:

ـ دەڵێن تۆ شت دەنووسی، مەسەلەن چ دەنوسی؟ چیرۆک یا شیعر؟ تەریق نابیەوە؟ دەترسم تۆش هەروەک کریاراسی شاعیرو گۆرانی بێژی گەڕۆک کە خورجێنی بە کۆڵەوەیەو بە گوندانا دەگەڕێ‌و بە سواڵ رۆژگار دەباتە سەر کارت بێتە گەڕان و گەدایی.

کـساس سوور هەڵگەڕا. لەراستیدا چی دەنووسی و بۆچی دەنووسی؟ داخوا شەرمی‌نەدەکرد؟ لە نەکاو هەموکریاراسەکانی دنیای بە بێ مێشک‌و چارەرەش و بێ نرخ هاتنە بەرچاوی. بابە گەورە بە وردی تەماشای کردو دەیویست دووبارە بیقرسێنێ. ئەوە ئیتر چ نەوەیەکبوو؟ داخوا بەکاری هیچ دەهات؟ چۆن میرزا بتوسێکی ناوا لە تۆرەمەی ئەو کەوتبۆوە؟ لە کـساسی پرسی: ژنت هێناوە ؟

ـ بەڵێ

ـ دەڵێن ژنێکی جولەکەت هێناوە

کـساس چاوێکی لە پیرەمێرد کرد و گوتی : « بەڵێ »

ـ قەی ناکا کوڕم. جولەکەش هەروەک خەڵکی دیکەن. هەموومان یەک خودا دروستی کردوین. کارێکی زۆرباشت کردوە. کیژەکەت خۆش ویستوەو ئەو غیرەتەشت هەبوە مارەی بکەی. ئەوەندە بەسە کە ژنێکی نەجیب وکابان و بەگوێی‌و جوانی‌وکورت بۆ بێنێ. بێجگە لەوە نابێ‌چاوەڕوانی هیچی دیکەت لە ژن هەبێ.

ـ بابە گەورە ئەو بۆتە مەسیحی. روحێکی پاک‌و خاوێنی هەیە. بێگومان خۆشت دەوێ.

ـ ژن دەیەوێ چ لە روح بکا. لەش پێویستەو منداڵ لە لەش دا وەزگی دەکەوێ. لە کەیەوە شاییتان کردوە؟

ـ دووساڵە بابە گەورە .

- منداڵتان هەیە ؟
- هێشتا نا ...
ئاخ... درنگە درنگ.. کەواتەوو ئێوەی ئەحمەق شەوانە چدەکەن ؟ زووبن زوو.من ئەتیژەم گەرەکن کە بە هێزو بەسام بن وەک پۆلا بن. پێی بڵێ منداڵی کرێتی بۆی ئەک جولەکەیی. هەروەها گوێ بدە قسەکانم، هەتا پێت دەکرێ مەهێڵە منداڵت دەرس بخوێنێ !
- ئەو ئێستا کوڕێکی لە زگی دایە بابە گەورە
- باشە ..پیرۆز بێ. ناوی بنێ سیفاکاس، تێگەیشتی؟ تەنیا لەو ڕێگایەوە مردو زیندو دەبنەوە. ئێستا بڕۆ بحەسێوە.
پیرە مێرد کاترینای بوکی بانگ کرد کە لە پشت سەری وێستا بوو، گوتی :
- سەرینێکم وەبەر پشتێ بدە، دەمەوێ دانیشم و قسان بکەم. لیمزیەکیش لەت کە تا بۆنەکەم بۆ بێ. لەو ماوەیەشدا کە من لە گەڵ پاڵەوانان دەپەیقم، کەس قسان نەکات. پاشان دەستی بۆ نەوانەی لەوێ بوون درێژکردو گوتی:
- بڕۆن بەدوای کاری خۆتاندا. ئێرە خاڵی بکەن. دەمەوێ لەگەڵ پاڵەوانان بدوێم. لەو ماوەیەدا پیرە پاڵەوان لە خواردن و خواردنەوە ببوونەوە. ماموستا کە لەبەر خواردنەوە سەری قورس ببوو، پاڵی وەدارێک دابوو کەمانچەی لێدەدا و هەر ئەو گۆرانیەی‌دەگوت کە لەهەوەڵەوە دەستی پێکرد بوو. چاوەکانی بە ئەسرین بوون و دەیگوت :

« ئەی کەوی بە لەنجەو لاری من
من ئاخرین گوللەی فیشەکدانم بۆ ڕاوی هەوێردان حەرام کرد
ئێستا تاقەکارێکی لە دەستم دێ و دەتوانم بیکەم
هەرنەوە یەکە بە دڵێکی پڕ لە داخ و حەسرەتەوە تەماشات بکەم »

بابە گەورە چەپڵەی لێداو پاشان هاواری کرد :
- ئەی پاڵەوانەکان هێشتا ورگتان پڕ نەبوە؟ پێم وایە ورگ و ڕیخۆڵەتان لەبەر یەک کشاوەتەوە. بەسە ئیتر بەسە! ئێستا سمێڵەکانتان خاوێن کەنەوە. دەستان بشۆن. قایشی پشتێنتان توند کەن و وەرنە پێشێ. لەگەڵ ئێوە چەند وشەیەکم هەیەو هەر بۆیەش بانگم کردوون. تۆش ئاغا ماموستا کەمانچەکەت لەولا دانێ و واز لە کەوی بە لەنجەوهەوێردە و گوللەو فیشەکدان بێنە.
پاشان رووی کردە ژن و نەوەکان و گوتی :
- ئاوێ بێنن با ئەو ئاغایانە دەست و زاری خۆیان پاک کەنەوە. پێێ هێندێ گولاوی نارنجیان پێداکەن، تا بۆنی ناخۆشیان نەمێنێ. زووخاوێنیان کەنەوە، یاریدەیان بدەن، با بێنە کن من.
گەورە کچ عەترو گولاویان بە سەروچاوی پیرە پیاواندا کرد. پاشان گولاویان لە بەرلوتی ڕاگرتن تا بێنەوە سەر خۆ. دوایە باسکیان گرتن تا بیبان گەیێننە بن دارە لیمو.کن بابە گەورە. دوو پاڵەوان لەلای ڕاستی چەپی بابە گەورە دانیشتن و ماموستاش لەبەرامبەری.
سیفاکاسی پیر باسکەکانی والاکرد، دەتگوت هەروەڵجارە کە دەیانبینێ. بە شێوەی مەزنان بەخێر هاتنی کردن و دایمەزراند:
- تۆ ئەی پاڵەوان ماندا کاس ئەی شەرکەری نامدار. تۆ ئەی پاڵەوان کاتسیرماس، ئەی دزی

تەردەستی دەریایی، تۆش ئەی ماموستا پاڵەوان کە لە سایەی ئێمەدا شەرت کردوەو نوسەری شۆرش بووی و نامە گۆرینەوەت لەگەڵ تورک و فەرەنگان لە ئەستۆ بوە، هەزارجار بۆ ئەو ماڵە پچوکەی من بە خێر هاتن.

هەرسێک پیرە مێرد دەستیان بە سینگیەوە ناو بە ئەدەب گوتیان :

- سلاو لە تۆ ئەی پاڵەوان سیفاکاس.

سیفاکاسی پیر ماندو بوو، پیاڵەئاوێکی خواردەوەو درێژەی پێدا.:

برایان ! ئێوە باش لە بیرتانە کە لە هەموو شۆرشێکدا ئێمە لە بندارێکی باڵە دێرێک کۆ دەبووینەوە، باسمان دەکرد، پێکەوە پەیمانمان دەبەست و بەر لەوە بە پێشوازی مەرگەوە بچین سەروورووی یەکترمان ماچ دەکرد. ئێستاش وەک ئەو رۆژانە لە بن دارەلیمۆی سیفاکاسی پیر کۆبووینەوە. لە مێژە من ماڵاوایی لە ژیان دەکەم بەلام نەرۆیشتووم. من ئیعترافاتی خۆم کردووەو داپو رەسمی رۆیشتنم بە جێ هێناوە. بەڵام هێشتا هەرلێرەم. بەڵێ پاڵەوانان من تاڵەگەڵ ئێوە قسان نەکەم نارۆم. بەڵێ ئەی برایان! ئەمجاریش قسە لە جۆرێک شۆرشە. کەوابوو باش سەرنج بدەنە ئەو بریارانەی کەدەیاندەین. بێگومان گوێتان لەمن هەیە. نا؟. داخوا ئێستا هۆشتان لە سەر خۆتانە.؟ زەینتان روونە؟ شەراب لە نێو ورگتاندا ترشاوە؟ قسەکانم تێدەگەن ودەتوانن وەڵامم بدەنەوە؟ یامن بۆ دیواران قسە دەکەم.

هەر سێک پاڵەوان هەروەکو سوێند بخۆن دەستیان لەسەر سینگی داناو گوتیان بەڵێ دەتوانین.

- کەوابوو گوێ بدەنێ . من ئێستا تەمەنم سەت ساڵە. ئێوەش چیرۆکی ژیانی من دەزانن. پێویست ناکا بۆتانی بگێرمەوە. من شەرم کردوون، کارم کردوون، خۆشیم دیوە، رەنجم کێشاوە. وەک مرۆ ئەرکی خۆم بە جێ هێناوە. ئێوە دەتوانن شاهیدی ئەم وتانەم بن. ئێستا تەمەنم کۆتایی پێهاتوە. زەوی لە ژێرلاقم زاری کردۆتەوە، دەیەوێ قوتم بدا. لێگەرێن با قوتم بدا. بەلام تەماشاکەن و بزانن من چیم بە جێ هێشتوە.

پیرە مێرد راوەستا، ئەوەو ئەتیژەکانی خۆی نیشانداو گوتی:

- وەک دەبینن عێلێکم لە پاش خۆ بەجێ هێشتوە. کەوابوو لە مردن ناترسێم. من تەنانەت مەرگیشم بەزاندوە. بەڵام خەمی دیکەم لە دڵدا هەنە.

هەناسێکی هەڵکێشا، تاوێک راوەستا،جارێکی تر هەناسەی هەڵکێشاو بە دەنگێک کە بۆ هەوەڵین جار دەلەرزی گوتی :

- ماوە یەکە ناتوانم بنووم. بەڵێ پاڵەوانان خەوم لێ ناکەوێ و کرمێک لە ناخمدا دەمخوا.

تەماشای روخساری پیرەمێردانی کرد، سەری راوەشاندو هاواری کرد و گوتی :

- گوێتان لە دەنگی من هەیە.ئەوەی دەیڵێم زەینو داوەتێ؟ هۆی ئاغاماموستا، تۆکەوا خەو بەلاتدا دەبا.

ماموستا بەم وتەیە نارەحەت بوو گوتی:« گوێمان لێتە، مەبەستت لە کرم چیە؟

- بەڵێ برایان ! کرمێک هەتاوم دەخوا. تەماشای پشت سەرم دەکەم، ژیانی خۆم دەبینم، تەماشای پێش خۆم دەکەم، مردن دێتە بەر چاوم. ناچار لە خۆم دەپرسم:« لە کوێوە دێمو بۆ کوێ

دەچم؟ ئەو گرمەیە هەناوم دەخوا.»

لیوەکانی لەرزین، بێدەنگ بوو. سێ پاڵەوان بزووتن. مامۆستا سەرەدرێژو بێ توکەکەی قووراندو زاری لێک کردەوە تا وەدەنگ بێ، بەلاّم گورج دمی پێکەوە ناوە، چونکە نەیدەزانی بڵێ چی؟

بابە گەورە پرسی: ئێوە تا ئێستا لەمبارەوە بیرتان نەکردۆتەوە؟ ئەو گرمە قەت هەناوی ئێوەی نەخواردوە.؟

هەرسێک پیرە مێرد لێکرا گوتیان: نا.. نەخێر!

. خوادەزانێ منیش تا ئێستا بیرم لەم شتانە نەکردبوەوە. بەلام چەند رۆژێکە خە و ئارامم لێ هەڵگیراوە. ئەو گرمە لە عەرز هاتۆتەدەرو بەلەشمدا هەوراز هاتوە. ئێستاش ئەوە هەناوم دەخوا. من کەسم نیە دەردی خۆمی لەگەڵ باس بکەم. کورەکانی من هێشتا فرە گەنجن. تەمەنیان لە پەنجاو شەست تێ نەپەریوە. ئەگەر کوستاروس کورە گەورەم مابایە، ئێستا لە ۷۰ساڵ زیاتر بوو. ئەو لە قسەکانی من تێدەگەیشت. بەلاّم ئەمانە کەم تەجرووبەن. ناتوانن قسەکانی من تێبگەن. بەلاّم ئەویش لە دێر ئارکادی بە زیندوویی سوتا. بۆیە گوتم با دۆستانی قەدیم کۆ بکەمەوە. پێکەوە لەم بارەوە باس بکەین. کەللەی ئێوە وەک هێشووی گەیشتو دەچێ کە پڕ لە بەرە. بێگومان ئێوە شتێک لەورازە تێگەیشتوون. کەوابوو قسەبکەن. گرێی دڵتان بۆمن بکەنەوە. ئێوە شەرابتان خواردۆتەوە. ئەوە خۆی یارمەتی بە ئاخافتن دەکات. قبوڵ بکەن وایە. من نامەوی بە کەرو کوێری بمرم.! تۆ پاڵەوان مانداکاس! دوای من لە هەموان پیرتری. لەپێشدا تۆ قسە بکە. ساڵی ۱۸۲۱ تۆ تەمەنت چەندە بوو؟

. ۲۲ساڵ کاکە سیفاکاس. چما تۆ لەبیرت نیە؟

من ئەوردەم ۳۰ساڵ پتربووم. کەوابوو هەشت ساڵ لەتۆ گەورەترم. لە پێشدا تۆ قسە بکە. ماوەیەکە تۆ زیندوی، خەبات دەکەی. تۆ چ تێگەیشتوی؟

پاڵەوان مانداکاس دەستێکی بەزاری خۆیەوە نا، کەم‌کەم دەستی بەرداوە بە ریشی داهێنار ماوەیەکی زۆر بە فیکردا چوە خوارو ئاخرەکەی وەدەنگ هات و گوتی:

. کەوابوو ئەی سیفاکاسی پیر! هەربۆ ئەوە ئێمەت بانگ کردبوو. بە راستی زۆرمان ئازار دەدەی و ئەو گۆشت و شەرابەی خواردوومانە، زۆر گران لەسەرمان دەکەوێ. تۆ دەڵێی‌چی مامۆستا؟

پیرە مێرد هاواری کرد:

. لە مامۆستا گەڕێ. تۆ دەبێ لەگەڵ من قسە بکەی. ئاخر ئەو تەمەنە درێژەبە کاری چی تۆهاتوە؟ دەتوانی پێم بێژی بەرهەمی ئەو ژیانەت چیە؟ من پرسیارت لێ‌دەکەمو تۆش وەلام بدەوە. لەخۆوە ئەملاولا مەکە. وەک پیاوان بە مەردانە وەلاّم بدەوە.

پاڵەوان مانداکاس قوتوە سیغاری هێنا دەر، سیغارێکی پێچایەوەو بە حاڵەتێکی کزو خەمناکەوە دووکەڵی بەبادا کردو پاشان گوتی: «سیفاکاسی پیر تۆ منت غافڵگیر کرد. ئاخر دەتەوی چت پێ بێژم. نازانم لە کوێوە دەست پێ‌بکەم. من لە تەواوی تەمەنمدا هەروەک تۆ دەڵێی وەک‌پەرێکی کوێر ژیاوم. بۆ ئەم وەزعەش هیچ خەفەت ناخۆم. کاتێک لە مەیدانی شەردا دوژمنم

پەلامار دەدا کوێر بووم. پێنچەکەم توند لە سەرم دەبەست، تا مێشکم بڵاو نەبێ. خۆم بە تورکان دادەدا. کاتێک ژنم هێناو منداڵم دروست کرد وچوومە کلیساو شەمم پێکرد و لە پێش پەیکەری پیرۆز چۆکم دادا، دیسان کوێر بووم. کاتێکی گەنم دەچاندو درووێنەم دەکردو دەمکردە نان و دەمخوارد، دیسان کوێر بووم. من لە ژیانمدا قەت لە خۆمنە پرسیوەکە بۆچی دەخۆم، بۆ نوێژ دەکەم،بۆدوعادەکەم.بۆچی خەڵک دەکوژم. مەگەر ئێستا کەوا تۆ ئەو هەموو ‹بۆچی› یانەت لە پێش داناوم. بۆخاتری خوا، پاڵەوان سیفاکاس، تۆزێ لە سەر خۆبە تا مێشکم بپشکنم، بەڵکو وەلامێک بدۆزمەوە. خۆ پەلەت نیە؟

بابە گەورە هەرتک دەستی وەک خاچ بە سنگیەوە نارو گوتی :

. زۆرباشە پاڵەوان مانداکاس مێشکت بپشکنە بزانم!

پاڵەوان مانداکاس‌رووی کردە زێرکوڕەکەی کە لە پشت سەری وێستا بوو گوتی :« پاناکوس! بچۆ ئەو خورجینەی من بێنە.»

هەموو بێدەنگ چاوە روان بوون. بابە گەورە بە چاو کسماسی تێگەیاندو گوتی:

. تۆش کورسیەک بێنە دابنیشەو گوێ بدەیە. راوەستان هیلاکت دەکا. هیچ تێدەگەی ئێمە دەڵێین چی؟

کسماس لە سەر عەرزێ دانیشت و گوتی : بەڵێ بابە گەورە تێدەگەم.

باناکوس گەراوە، خورجینی لە پێش بابی دانا. مانداکاس دەرگای خورجینی کردەوە، بوتڵێکی گەورەی زار فرەوانی هێنا دەر کە سەری بە چەرمێکی قایم بەستبوو. بابە گەورە ملی درێژ کرد کە باش ببینێ. پاشان پرسی :

. ئەو بوتڵە چی تێدایە ؟ پاڵەوان مانداکاس پێدەکەنی . بابە گەورە بە تورەیی گوتی :

. وەلامەکەت هەر ئەوە بوو؟ گوتم ئەو بوتڵە چی تێدایە ؟

. خەڵک کاتێ بە سەفەر دەچن، نان‌و شەراب‌و گۆشت دەخورجینێ دەنێن. من نان‌و شەراب و گۆشت لەگەڵ ئەم بوتڵە لە خورجینێ دەنێم.

بابە گەورە جارێکی تر پرسی :« چی تێدایە؟ من کە هیچ نابینم .»

پاڵەوان مانداکاس بوتڵەکەی لە پێرە مێرد وەنزیک خست. تیشکێکی رەنگ ئەرخەوانی‌بە سەری دادەهات. بوتڵەکەی دەسوراندو پرسی : « دیسان هیچ نابینی ؟»

. من تەنیا چەند پلە گۆشت دەبینم کە دەناویندا مەلەی دەکەن .

. نا... سیفاکاسی پیرا ئەوانە پلە گۆشت نین. ئەوانە گوێچکەن. ئەمەش ئاو نیە، ئەمە ئالکوڵە. لە رۆژێکی ساڵەکانی ١٨٢١، تورکێک لە عەرزێ‌دام و گوێیەکی منی هەڵکەند و خواردی. منیش شەرتم کرد هەر تورکێکی بیکوژم، گوێیەکی ببرم و بیخەمە نێو ئەم بوتڵەوە. ئێستا ئەی سیفاکاسی پیر، ئەگەر چەوێ سەربردەی خۆمت بۆ بگێرمەوە، ئەوەندە بەسە کە تەماشای ئەو گوێ‌یانە بکەم و دەست پێبکەم. من دەزانم ئەو گوێ‌یانە هەریەکە ئی‌کێن. بۆ نمونە : ئەو گوێ تۆکناویە گوێی عەلی بەگی دوژمنی خوێنی ئەلانە. ئەو ‹پانابیسی› برای منی کوشتبوو. پاشان چووبوە خانوی کوێستانی لە دەرەوەی ‹ریتمنو› تا لە نێو ژنانی حەرەمیدا رابوێرێ. تەنانەت قانونسەکانی بورجی قەلاشی نەکوژاندبۆوە. تا هەموو بزانن لە ماڵی خۆی

خەریکی کەیف و رابواردنە. ئەو شەوە من لە پێش دەروازەی رتیمنو لە چاپخانەیەکی تورکان دانیشتبووم و قەلیانم دەکێشا. بە قاوەچیم گوت : « پولو ئاگرێک بێنە، قەلیانەکەم خەریکە بکوژێتەوە.» ئەو وەدوای ئاگر کەوت منیش لولەی قەلیانەکەم پێچایەوەو بەپێدەنگی لە قاوەخانە هاتمەدەرو وەک با بە دەشتێدا گوتام تا گەیشتمە کۆشکی کلاو قەرەنگی عەلی بەگ. خۆم دە ژووریَ هاویشت‌و بە پلیکانانەدا سەر کەوتم. عەلی بەگ لە ئامێزی ژنەکەیدا نوستبوو. خۆم بەسەرداداو سەرم بری. گوێیەکیشم هەلکەند‌و دە دەسرەم‌وەر پێچاو چوومە وە قاوەخانەکە. کەس ئاگای لە ونبوونی من نەبوو. بەیانی کە خەبەری کوشتنی لە شاردا بلاو بۆوە. پاشا گوتبووی : کاری ماندااکاسە، ئەو عەلی بەگی کوشتوە‹» بەلام تورکەکانی کە ئەو شەوە لە قاوەخانە بوون، سوێندیان خواردبوو کە پالەوان ماندااکاس شەوێ لە قاوەخانەی حەسەنی قەلیانی کێشاوە.

ماندااکاس بوتلەکەی هەلێناو بە پالەوان کاتسیرماسی نیشاندا، گوتی :

. تۆ دەیبینی ئەمەیان گوێچکەی عەلی بەگە .

پاشان بە قامک یەکی دیکەی نیشانداو گوتی: « ئەو گوێچکە رەش‌و گەورە کە ئالقەیەکیشی تێدایە، هی خولامێکی قولە رەشە. ناوی رەمەزان بوو. لە عنەت لە روحی. ئەویش دوژمنی ئەلان بوو. ئەو مەلعونە ژنی مەجبور دەکردن کە مەمکی خۆیان لە سەر زاری سندوقێکی سەر ئاوالە دابنێن، پاشادەرکی سندوقەکەی بە سەر مەمکیاندا بەردەداوە، خۆشی لە سەری دادەنیشت. شەوێکیان لە قەراخ ‹ تریپیتی› لە دەرەوەی شاری کاندی تووشی هاتم. گوتم : باشە رەمەزان بلێ بزانم تۆ لە خوا ناترسی؟ ئەو سەگە گوتی:« من رەمەزانم... خوا لە من دەترسێ»

قەمەی خۆم هێنادەرو گوتم :« منیش ماندااکاسم. قەمەت دەرێنەو ئامادە بە .»

گوتی کافر بەختی خۆت، بە تەنیاو بە بێ قەمە دەگیرت خستوم. من قەمەی خۆم نەهێناوە. گوتم من دوودانەم پێیە، کامیانت دەوێ هەلبژێرە . یەکیانم بۆ هاویشت. شەری دەستەو یەخە لەسەر بەردان دەستپێکرا. چەند سەعات لە شەر دابووین. شەوداهاتبوو. ئارەقەو خوێن لە لەشمان دەچۆرا. لە گەرمان دەسوتاین. جارجار خۆمان دەئاوێ داویشت، تا فێنک دەبووینەوە. ئاو سوور هەلدەگەرا، قسەمان نەدەکرد. تەنیا نالەمان دەهات. دۆستێکی قولە رەشە کە خەلکی بنغازی بوو، بەوێدا تێدەپەری، دەهات یاریدەی رەمەزانی بدا، دەنگیداو گوتی :« دەست راگرە دەنا زگت دەدرم. لێمانگەرێ، وەدوای کاری خۆت کەوە. پێم گوت :

. ئافەرین رەمەزان، بە راستی پیاوی. ئەویش گوتی تۆش پالەوانی. ئێمە هەرتکمان حەیوانی درندەین، دەبێ یەکمان بمرین.! ئاخرەکەی دەرقەتم لێ هێناو پشت ملم گرت‌و هەر وەک بەرازی سەردەبرن ئاوا سەرم بری، ئەو گوێ گەورە بە ئالقەشم بری کە وا دێرە دایە .

ماندااکاس گوێچکەیەکی دیکەی نیشاندا. بیرەوەری ئازەمانەتیەکانی گەرمیان داهێنابوو گوتی:« ئەو گوێیەش کەوا خەریکە سەوز هەلدەگەرێ، گوێچکەی مستەفا قەسابە. ئەوەی لە نێوەراستی بوتلەکە دایە هی کابرایەکی خەلکی ئەلبانیە. ئەوی تریان گوێچکەی ئیمامێکی جەماعەتە، ئەو مەلعونە دەنگێکی خۆشی هەبوو، حەیف بۆ ئەو دەنگە. دەبوایە زمانی ببرم و لە ئالکۆلدا رایبگرم. تازە رابردوە. ئەو گوێ بچوکە دەلێی گوێ ماسیە، ئەوە گوێچکەی « پرتو ئەفەندی» یە. ئەو بەدبەختە ئەوەندە جوان بوو، دەتگوت پەیکەری پیرۆزە .راست وەکو

سەرزۆرۆ بوو. مردنەکەشی خەتای خۆی بوو. سوار دەبوو بە گەردەکی فەلان دا دەگەڕا، ژنی نەزیەت دەکردن. کام ژن دەیتوانی بەربەرەکانی لەگەڵ بکا؟ دڵم بە ژنان سوتا. شەوێک لیی وەژوور کەوتم. لە ژووری دەگۆ یەک ڕاچووین. بەڵام ئەو یەکی ناسک نارنجی‌و ژنانە بوو، زۆر خۆی ڕانەگرت. ملە ناسک و جوانەکەم بڕی‌و ئەو گوێچکە جوانەشم لێکردەوە. دەڵێی جەواهیرە. ئەو گوێچکانە هەر یەکە مێژووی خۆیان هەیە. لەم بوتڵەدا دەتوانی نیشانەی هەموو شۆڕشەکانی کریت بدۆزیەوە. تازە من گوێی ئەو کەسانە نازمێرم کە لە شەڕدا کوشتومن. شوێنەوارێک لە شۆڕشەکانی ١٨٢١، ١٨٣٤، ١٨٤١، ١٨٥٤، ١٨٨٨ لەم بوتڵەدا هەیە. بەڵام ئێستا ئیتر پیر بووم، باسی گوێ بڕین نیە. دەیگوت و کریت وەک ئاگر لە لەشیدا گڕی دەدا. سەری داغ ببوو. دووبارە گوتی :

. بەراستی من جانەوەرێکی درندەم. خودا ببەخشێ. کاتێ شۆڕشێک سازدەبوو، من ماڵ و ژن‌و منداڵ و ڕەزی تەکبیش نەکراو و مەزرای نەکێڵراوم بە جێ دەهێشت و سوار دەبووم و دەچوومە لای پاڵەوان کوراکاس. کەوتە یادی پاڵەوان کوراکاس‌و هەناسەیەکی هەڵکێشا و دووبارە گوتی: «ئیتر پیاوی وەک ئەو نابێتەوە. بەراستی ئێمە لە ئاستی ئەو چین! زەلامی گاڵتە ! پاڵەوان کوراکاس کەم قسەی دەکردو قسەکانی هەمیشە پرمانا بوون. قەت نەبوو کەسێک وشەیەکی گاڵتەی لێ ببیستێ. یا قسەیەکی توند. چاوی دەتگوت چاوی هەڵۆیە تماوی و بەسام. عەیبی تێدا نەبوو. قەت شەرابی نەدەخواردەوە. دەستی لە ژنان نەدەدا. کاتی شوڕش ڕکێفی لێدەداو بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە داخوا کەسی لە پشتە یان نا. خۆی بە تورکان دادەدا. قەت پەیاخ سووری پێش خۆی نەدەژمارد. گوللە کاری لێ نەدەکردو با وێی تەدەکەوت. ئەو ئینسان نەبوو، فریشتە بوو.

جاریکی تر هەناسەی هەڵکێشاو لیی زیاد کرد:: « تەنیا کەمایسی ئەو پیاوە هەرئەوە بوو کە باڵی نەبوو. »

سیفاکاسی پیر لەگەڵ ئەوە کە گوێی بۆ ئەو هەڵخست بوو، باڵنجەکەی خۆی ڕێکوپێک دەکردو نارەحەت بوو. بەڵام لیمۆی دەروشاندو بۆنی پێوە دەکرد و دانی بە جەرگی دادەگرت. ئاخرەکەی خۆی پێ نەگیراو بە تورەیی گوتی :

. واز بێنە پاڵەوان ماندداکاس ! بوتڵەکەت بخەوە نێو خورجێن. دڵرەقی و بەدفەڕی ئادەمیزاد رادەو ئەژماری نیە. گوتم بیخەوە نێو خورجێن و وەڵامی من بدەوە. داخوا تەواوی ئەو گوێچکانەی بڕیوتن شتێکیان فێر کردووی؟ تۆ ژیانی خۆت لەو بوتڵەدا دەبینی. کەوابوو پێم بڵێ، ئەو ڕێگایەی گرتوتە پێش ڕاست بوە یان نا. ئەوەی تا ئێستا کردوتە داخی بۆ دەخۆی یان نا؟ پاڵەوان ماندداکاس نارەحەتبوو هاواری کرد :

. داخی بۆ بخۆم ؟ بۆ چی ؟ ئاخ ئەی پاڵەوان سیفاکاس. ئەگەر قەرار بێ سەرلەنوێ‌دەست بە ژیان بکەمەوە، دیسان هەر ئەو ژنەم دەهێنا کە هەمبوو، هەر ئەو تورکانەم دەکوشت و ڕەنگە زیاتریش. هەر ئەو شاڵوار و پشتێندو چەکمانەم دەبەر دەکرد، تاقە هەودایەکم لە ژیانی خۆم نەدەگۆڕی. زووش وەبەر ڕەحمەتی خودای دەکەوتم. هەر بەو بوتڵەوە دەچوومە خزمەت‌خواو پێم دەگوت :« خودایە ڕێگە بدە بەو بوتڵەوە بچمە بەهەشتێ. یان پێویستم بە بەهەشتی تۆ نیە »

- کەوابوو ئەی ماندا‌کاسی پیراتۆزتەنیاو تەنیا بۆ پیاوکوژی هاتوویە دنیاوە ؟ واتە خودا تۆی بۆ پیاوکوژی ناردۆتە سەرزەوی.

- نا..نا سیفاکاسی پیر..نا. من پیاو کوژیم خۆش ناوێ. بۆچی گێژم دەکەی؟ من پیاو کوژو خوێن خۆر نیم. هەر تەنیا بۆ پیاو کوژی پیاو ناکوژم، بەڵکوو...

پیرە مێرد سەری کەچەڵی خوراند و کەوتە فیکرو پاشان لە پڕ گوتی : « بەڵکوو بۆ ئازادی شەڕ دەکەم »

پاڵەوان ماندا‌کاس هەناسەیەکی هەڵکێشاو زەینی روون بۆوە. ئێستا کەم‌کەم دەیزانی مەبەست لەم باسە چیە دیسان‌گوتی :

- ئاخ پاڵەوان ! ئێستا تێگەیشتم. تۆ لەمنت پرسی لە کوێوە دێم‌و بۆ کوێ دەچم. من لە سەرەتاوە نەمدەزانی وەڵام بدەمەوە. بەڵام لە ئاخافتندا زەینم روون بۆوە. بەڵێ! پاڵەوان سیفاکاس لە کۆیلەتیەوە دێین‌و بۆ لای ئازادی دەچین. کۆیلە دێینە رووی جیهان‌و تەواوی تەمەنمان خەبات دەکەین هەتا ئازاد دەبین. بۆ ئێمەی کریتی بۆ گەیشتن بە ئازادی تاقە رێگایەک هەیە، ئەویش پیاو کوژیە، من بۆیە تورکم دەکوشتن. تۆ پرسیارت کرد و منیش وەڵامم دایەوە. ئێستا پیر بووم و قەمەی خوێناویم خستۆتەوە کاڵان و دەستم لەسەر دەست داناوە و چاوەروانم مەرگ بێتە سۆراخم.

پاشان رووی کردە زڕکوڕەکەی و گوتی:« یاناکیس! وەرە بوتڵەکەی بەرەوە جێگای خۆی . »

بابە گەورە هاواری کرد:

- ئافەرین پاڵەوان ماندا‌کاس! چەند باشت گوت. ئەمە ئەو رێگایە بوو کە تۆ هەڵت بژارد بوو، تۆ ئاتاخر ئەو رێگایەت بڕی‌وئەرکی خۆت بە جێ هێنا. بەڵام تۆ لات وایە کە بێجگە لەم رێگایە رێگای تر نیە؟ ئێستا دەبینی کە رێگای دیکەش هەنە. ئێستا ئەی پڵەوان کاتسیرماس، ئەی پیرە دزی دەریایی، نۆرەی تۆیە وەدەنگ بێی.

گورگی دەریاستەکانی کردە گرێ، چاوە خێلەکانی سوور هەڵگێراو گوتی:«ئەی سیفاکاسی پیر! من ئەو گەمانەم پێ‌خۆش نیە. تۆ بەو بیانوە کە دووسێ ساڵ لە ئێمە پیرتری،لەحەساری خۆت‌کردووین و خۆت کردۆتە سەرۆکمان و وەبەر پرسیارانت داوین. من قسە ناکەم.

بابە گەور گوتی :« شێتە لەخۆڕا خۆت گرژ مەکە. من ئەگەر خۆم کردۆتە سەرۆکی کۆبوونەوە، نەک لە بەر ئەوەیە کە لە ئێوە گەورە ترم. بەڵکوو لەبەر ئەوەیە لە پێش ئێوەدا دەرۆم و بە پەلەم. نامەوێ هەروا بمرم. نازانم چۆن مەبەستەکەم دەر بیرم. نامەوێ بە کەرو کوێری بمرم. من لە ئێوە برایانم ویست کە رووونم بکەنەوە. ئێستا تێگەیشتی پاڵەوان کاتسیرماس ؟

- بەڵێ تێدەگەم. مەیکە هەرا. مەسەلەن تۆ ئەگەر پاپۆڕێکی لە حاڵی نوقم بوون دابای، من گورووج بە هاوارتەوە دەهاتم. من هەموو تەمەنم لە گەڵ خەبات لە دەریادا رابواردوە. بێجگە لە دەریاش ئاگام لە هیچی تر نیە. هیچ بارمەتیەکیشم لە دەست نایە. کەوابوو بۆچی شت لە من دەپرسی. چاوەروانی بارمەتی چت لە من هەیە. ؟

بابە گەورە بە ناڵینەوە گوتی :

- ئاخر ئەی دزی دەریایی لەعنەتی! من خەریکم نوقم دەبم و ئەوەی دێ نوقم بێ‌تەنانەت خۆ بەمووی سەریشی هەڵداوەسێ.

- لەی ئاگا ئەی سیفاکاسی پیر. تۆ بە قژی سەرت خۆت هەڵوەسە تەک بە مووی سەری ئێمە. تۆ لە سەرە مەرگ دای و دەترسێی، ئاوت لێ ئاوە کرم. بەڵام من ئاوی ترسی لێ دەنێم ئەوەدەم تۆ بە قیژەو هەرا بە دەستەکۆنەکانی خۆت‌ئێژی: «کوڕینە چم بەسەر دێو بۆ کوێم دەبەن؟» ئێمە هیچ لە تۆ پتر نازانین. ناتوانین هیچی وات پێ بڵێین کە دڵت ئارام بێ. ئێمە هەموومان وەک پاپۆڕی بێ فەرمان بە کوێری دەژین و بە کوێری دەمرین. بۆکوێ با بخوازێ بۆ ئەو لامان دەبا. پاپۆڕی ژیانی ئێمە کۆن بووەو ئاوی دێتە ئێوێ. ئێمە شەووڕۆژ خەریکین ئاو خاڵی دەکەین. بەڵام ئاوەکە هەر زیاددەکات. ئاوای لێ دێت نوقم دەبین. ژیان بێجگە لەوە شتێکی تر نیە. تۆ ئەوەندەی دەتەوێ هاوار بکە. دەپرسی ئێمە چبکەین؟ ئێمە دەبێ شەو ورۆژ ترومپا لێ بدەین و تاوێک دەست لەسەر دەست دانەنێین. ئەولاولا نەکەین و زمان بۆ سکاڵاو گازندە نەکەینەوە. بەڵێ ئەی سیفاکاسی پیر، تەکلیفی ئێمە ئەوەیە کە نەجیب‌و شەریف بێنینەوە، شەو ورۆژ ترومپا لێ بدەین. ئەوە بوو ئەوەی من لە ژیانمدا فێری بووم. پێمان خۆش بێ‌و ناخۆش بێ هەر ئەوەیە. پاشان بە توڕەیی رووی کردە پاڵەوان مانداکاس و گوتی :

- ئەی پاڵەوان مانداکاس من وەک تۆ خانە نشین نەبووم چاوی خۆم بیەستم‌و بێجگە لە تورکان چیتر نەبینم. کارم ئەوە بێ هەر گوێیان ببڕم‌و بۆ ئەوەی بە خەڵکیان نیشان بدەم لە بوتڵێکدا بیانگێڕم و بە خەڵک بڵێم: «ژیانی من هەر ئەو بوتڵەیە.»

بەڵێ‌ئەی پاڵەوان مانداکاس من بۆهەموو شوێنێ‌سەفەرم‌کردوە. هەموو شوێنێکی‌جیهانم‌دیوە. لەگەڵ ژنی‌جۆربەجۆرنوستووم. قوڵایی ئەفریقاو ئەو شوێنەی کە نان بە تینی ڕۆژێ دەبرژێ ، ئەو لەنگەرگایانەی لێیان وەستاوم لە رادە بەدەرن.

من بە میلیۆن خەڵکی ڕەش و زەردم دیوەو چاوم لێیان پڕ بوە لە سەرەتاوە لەهەموو کەس بێزار بووم. تەنیا مەسیحی‌و خەڵکی کریتم خۆش دەویست. بە لام وردە وردە لەگەڵ خەڵک ڕاهاتم و تێگەیشتم کە هەموویان بە باری چاک‌وخەرابی خۆیاندا وەک یەکن. پاشان بووم بە دزی دەریایی. زانیم کە دنیا لە دوو جۆری مس کاشی دروست کراوە وهەمیشە پێکەوە لە کێشەدان. بەخۆم گوت : «کاتسیراماسی بەدبەخت تۆ گۆزەی مس‌بە تانەشکێنی. چونکە ئەگەر بشکێنی، ئیتر کارت تەواوە وتۆ گاو ناگرێیەوە.» ئەوە بو کە لەگەڵ دزەکانی ئەلجەزایری بووم بە هاودەست. تالانێکی ڕەشمان هەڵکردو پاپۆڕەکانمان پەلاماردەدا و دەمانکوشتن‌و تالانمان دەکرد. پاشان دەچووینە دوورگە چۆڵەکان و تالانمان دەشاردەوە. ڕەنگە لە بیرت مابێ کە جارێکیان لە ‹گرابرسا›پاپۆڕێکی پڕ لە دارچین‌و میخەک و هێل‌و گوێزی هیندیمان خاڵی کرد. بۆن هەموو کریتی داگرتبوو. لە بیرتە ئەی سیفاکاسی پیر، باری گەرێکم لەو بەهاراتە بە دیاری بۆ ناردی؟

پیرە مێرد گوتی : « باشە ـ درێژەی پێ‌بدەو لە قسەکانت نەتیجە وەرگرە. مەبەست لەو هەموو درێژ دادڕیە چی‌یە؟»

- ئێستا دەزانی مەبەستم چیە؟ ئێدەگەی کە ئێمە لە هیچکەس نە لەخواو نەلەعەبدی خوا نەترساوین من مەسیحی بووم وئەوان موسوڵمان. بەڵام هیچ پاپۆڕێکمان وە پاش نەدەدا. جا بۆ مەککە چوبایە، یا بۆبەیتولموقەددەس. گورج بە سەری وەر دەبووین‌و حاجی بابە یا زیارەتکەری مەسیح دەمانکوشت. من حەیوانێکی‌دڕندە بووم کە لەگەڵ کۆمەڵێک حەیوانی‌دڕندەی‌دیکە

دەژیام.منیش وەک ئەلجەزایریەکان سەرم تاشی بوو. تەنیا قژێکی کورتم لە پشتە سەرم هێشتبۆوە. عەمبارێکم ئەشرەفی و لیرەی مەجیدیە گز کردبۆوە. لەو پاپۆڕانەی دەمانگرتن، دووسێ ژنمان هەڵدەبژاردو رامانئەبوارد، پاشان لەدەریامان داویشتن. بەڵێ.. پاڵەوان مانداکاس!ا بە تۆم گوت کە جانەوەرێکی درندە بووم. زۆر لە تۆ خەراپتر. تۆش ئەی سیفاکاسی پیر ئەگەر لە من بپرسی ئەوەی کردوومە لێی پەژیوانم یان نا، لە وەلأمدا دەڵێم: تەمەنی من بە خۆشی و دلێری ودادوئینــــاف گوزەراوە. لێی پەژیوان نیم. خوا منی وەک جانەوەرێکی‌درندە دروست کردوە،وەک جانەوەرێکی درندەش ژیاوم.

خودا منی بە گورگ دروست کرد، منیش بەرخەکانم خوارد. ئەگەر خوا بە بەرخی دروست کردبام، گورگ دەیانخواردم. چاک چاکیشیان دەکرد کە دەیانخواردم. ئەمە یاسای سروشتە. خەتای کەس نیە کە گورگ و بەرخی دروست کردوە.

کاتــبراماس تاوێک بێدەنگ بوو. بە چاوە خێلەکانی تەماشای هاورێکانی دەکرد. دەتگوت چاوەروانە کە شتێکی پێ بڵێن و کێشەی لەگەڵ بکەن. بەلأم کەس هیچی نەگوت. ناچار درێژەی پێدا:

- ئێستاش ئەی پاڵەوانان من پیر بووم. بنی پاپۆڕەکەم کون بوە. پشتێندەی دارەکان لێک تر‌ازاون. ئاوی دێتە نێوی. ئیتر ترومپایەکانم باش کار ناکەن. ناچار خۆم گەیاندۆتە وشکانی و لاسای خەڵک دەکەمەوە. بۆچی؟ لە بەر ئەوە کە ئیتر ناتوانم کارێک بکەم، لە کار کەوتووم. تورکم بە سەیەوە نەماوە، دانم کەوتوون. ئێستا ئیترگورگ گروێ بوە، ئەسپێی کەوتوونێ و دانی نەماون. ئیتر ناتوانم پیاو بکوژم و بگوڕێنم، ناچار وەک مەڕ دەکارێنم. لە پەناگای گوندی دادەنیشم تا چاوەکانم بکوشم‌وتەماشای کیژە جوانەکان بکەم‌کە دێنە سەر کانی. جارێکیان وەک گێژان چاوم لێدەکردن، دەستم کرد بە گریان. کچەکان قاقا پێکەنین‌و گوتیان : « ها... مامە پیرە بۆ دەگری ؟ » گوتم :«بۆ ئەوە دەگریم، رۆژێک دەمرم و ئەو لەش‌ولارەناسکەی ئێوە لە پاش من بەجێ دەمێنێ» سوێندبەو خوایە ئەگەرمن شابام، ئەوەی لەهەموان جوانترم هەڵدەبژاردوفەرمانم دەدا لە سەر گۆری من سەریان ببرن. تا لەگەڵ خۆمیان بەرم.

سیفاکاسی پیرهاواری کرد:

- ببیرەوە پاڵەوان کاتسبرماس. تۆ جانەوەرێکی درندەی، حەیوانێکی خوێن خۆری ، بەسە... بێدەنگ بە !

پاڵەوان کاتسبراماس گوتی: « تۆ پرسیارێکت لەمن کردو منیش وەلأمم دایەوە. تۆ گوتت دەریچەی دڵم بۆ تۆ بکەمەوە. منیش کردمەوە. ها سیفاکاسی پیرا چت لێقەوما، ترسای؟ بە تەوسەوە چاوە خێلەکانی دە پیرە مێرد بری و هاواری کرد:

- بەڵێ، من دەرگای‌تەڵەی دڵم بۆتۆ کردەوەو شەیتانەکان لە بەری هەلأتن. ئێستا گوێت لە دەنگە دەنگیانەو ترساوی. تۆ پرسیارێکت لە من‌کرد و منیش ئەوەی ئاقڵم پێشکا رەلأمم دایەوە. گوتم پێت خۆش‌بێ یا ناخۆش هەرئەوەیە. تۆ پرسیت:

« لە کوێنوە دێین »، لە خاکەوە دێیین ئەی سیفاکاسی پیر. بۆکوێ دەچین ؟ دیسانەوە بۆخاک، ئەی سیفاکاسی پیر. ئەگلیفی ئێمە چیە؟ بە کورتی پێت بڵێم: ئەگەر گورگی بخۆ، ئەگەر

بەرخیشی بخوری! ئەگەر دەتەوێ بزانی گورگی گەورە کێیە، بزانە کە خودایە! بەڵێ خودا گورگی گەورەیە. ئەو هەموان، واتە گورگ و بەرخ پێکەوە دەخوا.

پاڵەوان مانداکاس باسکی خۆی درێژ کردو گوتی:«کوڕان مەکە ئەی دزی دەریایی‌خەرفاو! تۆ سەرخۆشی، لەسەر خۆشی نازانی چەقەڵەتێک دەکەی. گورگی گەورە خودا نیە ...مەرگە.».
کاتسیراماس ئاغا پێکەنی و گوتی :

ـ هاوڕێ! مەرگ هەر خودایەو خوداش هەر مەرگە. تۆ تێناگەی، وتەی خەڵک دووپات دەکەیەوە. پاشان رووی کردە پاڵەوان سیفاکاس و گوتی :« ئەوە بوو ئەی سیفاکاسی پیر! ئەوەی دەبوو پێت بڵێم. ئەوەبوو وەڵامی من. دەتویست لێم نەپرسی. ئێستا بێژە جامەکەم بۆ پڕکەنەوە.

پیرە مێردیە نەوەکانی‌گوت:« پیاڵەکەی پڕکەن لە شەراب. ئەو ئیعتراقاتی‌خۆی کردوە، ئێستادەبێ نەزری «تناول القربان»<٨>بەجێ بگەیێنێ.» پاشان بێدەنگ بوو. سەری بەردایەوە، کەوتە بیر کردنەوەو بە خۆی گوت:

ـ قەزاوەت لە کاری ئەودا کاری من نیە. من قازی نیم. خودا قسەکانی وی بیستوە، هەروا باشترە کە خۆی لەکاری ئەودا قەزاوەت بکا.!

پاشان رووی کردە ماموستا کە بە سەری تاسەوە گوێی دابوە قسەی پاڵەوانان و گوتی :

ـ ئیستا ئاغا ماموستا نۆرەی تۆیە، سەرت بەرزۆکەو قسە بکە.

ماموستا کەمانچەکەی لە شانی کردەوەو گوتی:« من تەمەنم بە قسەکردن بردۆتە سەر. ئیتر بەسمە. تۆ پاڵەوان سیفاکاسی پیر! شتی گران دە پرسی. کێ تۆی هێناوەتە سەر ئەو فیکرانە.من لە وەڵامی تۆدا شتێکم نیە.»

پیرە مێرد تووەبوو گوتی:

ـ کەوابوو دەبێ لاڵبی؟ واتە بۆ رەحەتی تەواو دەبێ کەڕو لاڵو کوێرو خواجە بی. تۆ ئەوەت گەرەکە؟ بەلام هاوڕێ! ئادەمیزاد حەیوانێکە،زمانی دەگەرێو پرسیار دەکات.

ـ تورە مەبە پاڵەوان سیفاکاسی پیر. ئاشکرایە پرسیارکردن بە وشە دەبێ، تۆش چەندی گەرەکتە قسە بکە، چونکە دڵت دەخوازێ. پرسیار بە وشە دەبێ، بەلام وەلام دانەوە پێویست نیە بە وشە بێ. دیارە تۆ وەڵامت گەرەکە وانیە؟

ـ دیارە وەڵامم دەوێ ...وەلام !

ماموستا کەمانچەی هێنادەر و گوتی:« زۆرباشە سیفاکاسی پیر! تۆ وەڵامت گەرەکە. منیش وەڵامت دەدەمەوە. بەلام بە کەمانچە. کەمانچەی من زمانی واقیعی منە. ئەگەر تۆ تێبگەیشتی باشە، ئەگەر تێنەگەیشتی خەتای من نیە. من چبکەم. ئەی سیفاکاسی پیر! تۆ بە کوێری هاتوویە دنیاوە بە کوێریش دەمری.»

بابە گەورە گوتی:

باوابێ ماموستا، کەمانچەکەت لێدە بە هیوای خوا. چاوەکانی لە سەریەک دانا. هەوا تاریک دەبوو. باران بە دڵۆپەی درشت دەستی بە بارین کرد. گەڵای دارلیمۆ لە بەر قورسایی دڵۆپەی باران وەسەما کەوتبوون. چەند دڵۆپەبارانی گەورەو فێنک کەوتنە سەر روومەت وسمێڵە ئەستوورەکانی بابە گەور. پیرە مێرد بە زمانی تەرایی سەر لێوانی سڕیەوە ، تینو بوو.

مامۆستا داهاتەوە کەمانچەی بە سینگیەوە ناو هەوەڵین زەبری ئارشە کەوتە سەرسیمی کەمانچە. لە سەرەتاوە ئارشە لەسەر سیْ سیم کەوتە سەماو هەڵپەزینەوە. زەنگوڵەکانی وەدەنگ هاتن. ئەو حەسارە تاریکە دەتگوت پڕبوە لە قاقای پێکەنین. .هەموو پێیان وابوو لە مەدرەسەن و زەنگی پشودان لیْدراوە. گوێیان لە دەنگی منداڵان دەبیْ کە ڕادەکەن و پێدەکەنن و یاری دەکەن. لەوانەیە باڵندەش بووبن‌کە لە سەر لقە دارچنارێک لەگەڵ زەردەی هەتاو لە خەورابەڕبن ولە کاتی‌فڕیندا بخوێنن

ئارشە دەبزووتەوەو پێدەکەنی‌و سەمای دەکرد. پاڵەوانانی پیر دنیاو بوونیان لە بیر بردبۆوە. وەک منداڵان، یاوەک پە لەوران دڵیان سوک‌دەبوو. بووکو نەوەکانی خاوەن ماڵ وردە وردە نیزیک دەبوونەوە. نۆکەرو قەرەواش لە ژووری ماڵیْ دەهاتنە دەریْ و هەر چەند باران دەباری، بەڵام لە سەر عەرز دادەنیشتن و ملیان رادەکێشاو گوێیان دەدایە.

بابە گەورەش گوێی دابویەو هەستی دەکرد کە لەشی زەلام‌و قورسی سوک بوە. ڕەحەوا کەوتوەو ئێستا وەک هەورێک لە سەر دارە لیمۆو شمشاد دەسووڕێتەوە. وەبیری نەدەهاتەوە کە لە گەنجایەتیدا ئاوا سوک و بەکەیف بووبێت.مەگەر ڕۆژێک تەرها بووبێت. ئەو ڕۆژە لەشەر گەڕابۆوە. سەری شوشتبوو، خوێنی سەروچاوی پاک کرد بۆوە، جلی تازەو خاوێنی لەبەر کرد بوو، بۆ نوێژو دوعا چوبوە کلیسا، لەو ڕۆژەشدا هەستی کردبوو کە لەشی وەک هەورێکی فێنک وسوک شەپۆلان دەداو لە گەڕانەوەدا بۆ ماڵیْ لاقی وەعەرزی ناکەویْ.

وردە وردە ئاوازی کەمانچە گۆڕا، توندو قورس بوو. زەنگوڵەکان، دەنگیان وەزەنگوڵەی لاقی بازێک دەچوو کە ئامادەی ڕاوەو بە دوای نێچیر لە هەوای خاڵی‌دا دەفڕیْ. دەنگی نەعرەتەی پیاوان لە سیمەکان دەهاتە دەر. پیرە مێردەکان بە سەر سوورماوی سەریان بەرز کردبۆوە. سەردەمی گەنجیەتی و مەیدانی شەڕو هاواری برینداران و شین و گریانی ژنان و حیلەیْ ئەسپیْ بیْ سواریان وەبیر دەهاتەوە کە خوێناوی‌و سەرلیْ شێواو هەستا بوونە سەوپاشراون‌و لە سواری خۆیان دەگەڕان.

زۆری نەمابوو پاڵەوان مانداکاس هاوار بکا : « ئەی مامۆستای لەعنەتی، یا گەنجایەتیم بۆ بگێرەوە، یا بێدەنگ بە!. »

بەڵام کەمانچە لە گەرمی‌و هاژان کەوتبوو. ئاهەنگ گۆڕابوو. ئێستا هەوایەکی نەرم و شیرینی لێدەدار دەنگی خۆشی بە دڵەوە دەتووسا. پاڵەوانان گوێْ تۆکناویەکانیان قوت کرد بوو، بە زەردە خەنەوە گوێیان دەدایە. دەنگی کەمانچە لە هەوای شەداری ڕۆژپەڕدا وەک وزەوزی مێش هەنگوینی بارگران کە لە چیا گەڕابنەوە، یا وەک دەنگی دووری چۆمێک کە بە ژێر عەرزدا بڕوا،یاوەک سکاڵای عاشقانەی ژنێک کە لە بناری کێوەکانی ئەوبەرەوە بیسرێت، دەچوو. لەوانەشە دەریا بوویْ مەمکەکانی هاوشتبێتە سەر زیخ و بناڵێنیْ. یان دەنگی سیحراوی تر بوو کە شیرین و خەماوی لەو بەری سنووری ژیان، واتە لەو دنیاوە دەهات‌و گیانی لە جەستە دێنا دەریْ. یان لەوانەیە خودا بوویْ کە لە تارمایی شەداری شەودا، خۆی شاردبێتەوەو خۆشەویستەکەی خۆی، واتە گیانی مرۆی بانگ کردبیْ و بۆلای خۆی بەرێتەوە.

مامۆستا کە شەیتان چوبوە نێو ناخی، بەسەر کەمانچەدا خوار ببۆوەو لیْیدەدا. ئارشە وەک شیرێک دەهات ودەچو.سیتگی سازی دەقەڵاشت‌و دەنگی هەرە بە هەستبو داخداری وەدەر دەنا.

کەم کەم دەبوو بەشەو. مامۆستا لە لفاوەی تاریکیی شەودا بزر دەبوو، هەروەک ئیتر کەس نەیدەبینی. کەمانچە وەک تارماییکی کەم رەنگ بە تەنیا لەبن دارلیمۆ ویستابوو. لەخۆوە دەینالاند و هاواری دەکردو دەپاڕایەوە.

بزەیەکی گوشادو قوڵ لێوەکانی بابەگەورەی لێک کردەوە. لە نەکاو گیانی سوکباڵی کە لە سەر دارەلیمۆ لەفڕیندابوو، وەک مانگی تەڕو تازە لە حەوا بەرز بۆوەو چوو سەرو هەورازتر چوو. بوو بە هەور، دەڕژێ تابیێتە باران و بێتەوە زەوی تا دەنکەکان بنێژی و شینیان بکات.

بابە گەورە لە بەر خۆیەوە بیری دەکردەوە: «مەرگ هەر ئەوەیە و بە هەشتیش هەروا. ئێستا ئەوە من دەچمە بەهەشت و دەگەمە خزمەت خودا. سڵاو ئەی خودای من!» پیلوی چاوەکانی هەڵێناو بێجگە لە تاریکی شەو هیچی نەدیت. لەو شەوەدا دەنگێک بەسەبرۆکەو بە ناو بانگی دەکردو دەیگوت :

- وەرە.... وەرە .... وەرە...

بابە گەورە گوتی : هاتم... هاتم.... هاتم...

چاوەکانی لەسەر یەک دانا.

* * *

تەواوی شەو تەرمەکەیان لە حەساری لە بن دارلیمۆ دانا. دەتگوت دارێکی ئەستووری براوەو باران تەری کردوە. کسماس چزکی داداو چاوەکانی کە هێشتا گەرم بوون لە سەر یەکدانا. تراساکی لە پەنا مەیتی هەڵتروشکابوو تەماشای دەکرد. هەوەڵجاربوو ئاوا لە نیزیکەوە مردووی دەبینی. تەماشای مەیتی کەسێکی دەکرد کە زۆری خۆش دەویست. دەلەرزی، دەترساو هەرلەوێ مابۆو و تەماشای دەکرد. خاوخێزانی مردوو لەسەر تەرمەکە کێشکیان دەکێشا. دەرگای حەساری ئاواڵە کرابوو. خەڵکی گوندی کە بیستبوویان سیفاکاسی پیر مردوە، خەفەتبارو تازیەدار دەهاتن بۆ ئاخرین جار سڵاوی لێ بکەن. یەکە یەکە ئارامو بێدەنگ دادەهاتنەوەو دەستی پیرە مێردیان ماچ دەکرد. دوو پیرێژن بە شەراب شوشتیان و دەکفنێکی ئاوریشمی سپیان وەرگرت کە خێزانی بە دەستی خۆی بۆ رۆژێکی ئاوای دروو بوو. دوو لە بووکەکانی فانۆسی گەورەیان لە بان سەری و لە لای لاقان راگرتبوو.

پایکاترینا پێشنیاری کرد کە باشترە مەیتەکە بەرنەوە ژوورێ و لە بەر بارانێ نەبێ. بەڵام کسماس نەیهێشت و گوتی :«خۆی گرتوویە لەبەر باران بێ و با بە باران تەڕبێ.»

شەو تاریک و هیچ ئەستێرەیەک نەدەدرەوشا. جگە لە هەور هیچ شتێک نە دەبینرا. زریانێکی نەرمو فێنک دەهات. نەوەکانی پیرەمێرد ئاگریان کردبۆوە تا سەرمایان نەبێ. ئێستێرنکو دووجاشەکەر و ماینی پیرەمێرد لە تەوێلە هاتبوونەدەر، لەبەر گڕی ئاگر دەبینران. خەویان نەدەهات و تەماشای دەوروبەری خۆیان دەکردو هەوڵیان دەدا بزانن ئەمشەو بۆچی حەساروارووناک و پڕ لە خەڵکە.سێ پاڵەوان کەزۆریان خوارد بوو، پاڵیان وەدار لیمۆ دابوو پرخەیان دەهات. ژنەکان لە کاتێکا دەسماڵی سەریان دەکردەوە ، بە گریان دەیانگوت :

- خوات لە گەڵ ئەی سیفاکاسی پیر. لە قەولی ئێمەوە سڵاو بە مردووەکان بگەیێنە.پیرە پیاوان

لە کاتێکا دەستی مردوویان دەکوشی، هاواریان دەکرد :

. ئەی پاڵەوان سیفاکاس ! بە هیوای دیداری زووتر !

هەر ژنە چڵە ڕیحانەیەکی بۆ داوێشت، تا وەک یادگاری عەترای ئەم جیهانە، بۆ دنیای مردوانی بەرێ. دایکێکی گەنجی داخ دیتوو، کێلی نەنوسراوی کوڕەکەی لە پەنا تەرمی سیفاکاسی پیر داناو گوتی:

. پیرە مێرد ئەوەی بدە بە کوڕەکەم، ناوی ‹دیمیتراکی›بوو، دراوسێی تۆبوو، تۆ دەیناسی. کڵاوێکی سووری بە گوڵنگی لە سەر بوو، بە پای پەتی دەگەڕا.

بای کاترینا لێفەیەکی ئەستووری بە سەرشانی سێ پاڵەواتی پیردادا!. پاشان چوو دەستی تراساکی گرت و گوتی:

. ڕۆڵەکەم بچو بنوو، نیوەشەوە.

تراساکی گوتی: « من دەمەوێ لە بان سەری باپەگەورەم بە خەبەر بم. باپم کە نەهاتەوە، ناچار ئەشێ من جێگای بگرمەوە.

لەوکاتەدا ئاگر خۆشتر ببوو، تیگای گڕۆ خاوەن ئیرادەی تراساکی نیشاندا کە ڕاست وە باوکی دەچوو. دایکی کشاوە بێدەنگ بوو. باران هەروا دەباری. ڕێبو ونەوەکانی دیکەی پیرە مێرد، کەشەف بەدەست دەهات و دەچوون و قاوەیان بۆخەڵک دەهێنا کە لە پشت سەری پیرە مێرد ڕێستا بوون. هێندێ جار بێدەنگی بە سەر حەساردا زاڵ دەبوو. لەو حاڵەدا دەنگی داعبار سەک و پەلەوران دەهات کە خەویان لێ نەکەوتبوو. گاپەکان دەیانبۆڕاند، لە نەکاو کەڵە شێر خوێندیان. بەیانی بەردا بوو.

کاتێ سێ پاڵەوانی پیر چاویان هەڵێنا و مەیتی پیرە مێردیان لە سەر بەردەکانی حەسارێ دیت، ڕۆژ بەرز ببۆوە، بەڵام نەبزوتن و خەویان لێ کەوتەوە. لای تیوە ڕۆ ستاوروولیوس تابوتەکەی هێناوە، تراساکی چو سەیری بکاو بزانێ لەداری گوێزە. دارتاش فێڵی نەکرد بوو، دارە گوێز بوو.

سەعاتی دووی دوای نیوەڕۆ نەوەکان مەیتەکەیان هەڵگرت، ئارام و بە کاوە خۆیە دەوری گوندیا گێڕایان. لە سەر هەموو چوارڕێێک ڕایان دەگرت. گەورە کچ لە بەر پەنجەرە سەریان دێنادەرو دەسکە ڕیحانەیان داوێشتە سەر مەیتەکە. گوندییەکان بە سەری پەتی لەگەڵ تابوت دەڕۆیشتن. دەتگوت بە ڕاستی خودایان مردوە. هەموویان سەبرو بە کاوەخۆ دەبزووتن. دەرفەتیان دەدا بە بابە گەورە تا لە سەرخۆ ماڵاوایی لە گوندی بکات. بەڵام لە پڕ کە بەرەو گۆڕستان دەبزووتن، لەدەرەوەی گوندی پیتروکڤالو هەروەک ئاسمان کون بووبێ، باران دایدایە. گوندییەکان لە خۆشیان هاواریان دەکرد. چەند مانگ بوو بەئاواتی باران بوون. مەزرایان دەهات وشک ببێ. سوپاس بۆ خوا کەوا باراندی. ژنان ڕوومەتی ڕەشئەسمەریان کە وەک مەزرا تینووی ئاوبوو، وەبەر بارانەیان دەدا.

پیرە مێردێک لەبەرخۆیەوە وتی:« بابە گەورە بۆتە باران و دیسان دەچێتەوە ناخی زەوی. »

یەکی تر گوتی :« ئەو لە خەم وخەفەتی ئێمە ئاگادار بوو، هەر بۆیەش بوو بە باران و ئاومان دەدا. »

ئاخرەکەی هەموویان بە تەڕی گەیشتنە قەبرستان. دووکەس لە نەوەکانی پیرە مێرد باسکیان

هەڵکردو قەبریان هەڵکەند. خاکی قەبرەکە سوورو نەرمو پڕلە ڕەگە گیاو کوێ ماسیلکە بوو. دەتگوت پێشتر دەریا ئەم ولاتە شاخاویەی داگرتوە. باران هەر وادەباری ولێی نەدەکردەوە.

زۆر بە پەواشی بابەگەورەیان دە قەبری‌نا. زیندوەکان هەریەکە مستە خۆڵێکیان بەسەرداکرد. پاشان لە ژێر ڕێژنەی باران بۆ ماڵێ گەڕانەوە. ئێستا ئیتر بە پەلە بوون و غاریان دەدا زووتر بگەنە سەر سفرەی نانی خەتمی مردووەلە گۆشتی ئەویەرانە رەشە بخۆن کە بابە گەورە بۆ مردنی خۆی داتابوو. شەرابیشی بە سەرداکەن.

کسماس دوور لەوانیتر لە سە نیوتەختێک دانیشت. گیانی کوشراو ولەشی هیلاک بوو. چاوی لەسەریەک دانان، تا بەرلەوەی بەردو چیا بکەوێتە ڕێ، تۆزێ بحەسێتەوە. بە هاریدیموس گوترابوو، فانۆسێک پەیداکاو خۆشی بۆ ڕۆیشتن ئامادە بێ. ئەم دوانە دەبوایە پێش گازیوەی بەیانی‌بگەنە ئوردوگای پالەوان میکێلس. کسماس تەنیا چەند دەقیقەیەک خەوی لێکەوت‌و هەر لەو چەند دەقیقەیەدا دەریچەی دڵی بەسەر باوکی رەحمەتیدا کرایەوە. کسماس بە باشی باوکی دەبینی کە پێش ماڵێ ڕاوەستابوو، دەیویست لە پلیکانی ژوورەکەی‌سەرکەوێ. تەنانەت لاقی لەسەر پلەی یەکەمیش داتابوو. کسماس ترسا، ژنەکەی لەو سەرە نوستبوو. پیرە مێرد دەچوو بیترسێنێ. کسماس چوە پێش‌و لە پیرەمێردی پرسی:

. بابە بۆکوێ دەچی؟ خاڵێکی لەسەر لارووەمەتی ڕاستەی هەبوو. رەحمەتی ئاوری‌دایەوە، نیگای وەحشیانەو سمێلی شۆڕ ببوونەوە. دەسماڵێکی رەشی لەسەری بەستبوو کە خوێن لە ریشوەکانی دەچۆڕاوە. زاری برینداربوو بە پەمۆ بەستبوویان.

مردوو نیوچاوانی تێکنابوو، تەماشای دەکرد. دیاربوو زۆر تورەبوو.چونکە دانی لێک دەدان‌و گرێکی سوور لە کونە تفنگانی دەهاتە دەر و رووەمەتی روتاک دەکرد. لە پڕ زاری لێک کردەوە، لۆکەکە کەوت‌و برینەکە وەدیار کەوت. وەک وەحشیان نەڕاندی، سەبوکە لاقی لەسەر پێژەداناو سەر کەوت. کسماس جارێکی دیکەش هاواری کرد :

. بابە دەستی لێ‌مەدە ئەوە ژنی منە. دەستی درێژ کردتابابی ڕابگرێ و نەهێڵێ لە پلیکانان سەرکەوێ. بەلام مردوو ون بوو. بوویەدوکەڵ ئیتر کسماس هیچی نەدی، تەنیا لەسەر پلیکانان دەنگی هەنگاوی قورسی دەبیست.

هاواری کرد، لەخەو راپەڕی، چاوی هەڵێنا، دیتی میوان لەسەر سفرە کۆبوونەوە. بەرانە رەش کە تازە لە تەندووری هاتبوە دەرێ، لە سەر مەجومعەیەکی مس کەوتبوە سەر پشت‌و هەر چوا دەست‌و لاقی دەحەوای کردبوو. سەروشاخی پێوە مابوون، دەتگوت زیندوە.گوندی‌یە برسیەکان کەوتبوونە سەری‌و گۆشتیان داروبەش دەکرد. نەوەکانی پیرەمێرد چەند گۆزە شەرابیان هێنا ونانی خەتمی مردوو، وەک میوانی‌و جێژنی گەورە دەست پێکرا.

گەرێک شەراب و دەورێکی دیکەش میوانی بە کەیف کردبوون. شادیەکەیان تەنیا لەبەر شەراب نەبوو، لە بەر بارانێ بوو کە بەسەر مەزرای تینوودا باری بوو. لە خۆشی ئەوەش بوو کە مەرگ جگە لە پیرە مێرد ،دەستی لەکەسیتر نەدابوو. جابۆیە تارێکیش لە خواردنەوە خافڵ نەبوون. دەیانخوارد ودەیانخواردەوەو سەرخۆش بوون. لاقیان بۆ سەما وەخروو هاتبوو.گەورە کچ و بوکەکان بە لەنجەولار دەهاتنو دەچوون و خزمەتیان دەکرد.

شەراب قفلێ لە زار دەکاتەوە. ستاروپلیوسی دارتاش کە باشترین گۆرانی بێژی گوندی بوو، کەمی مابوو تێی هەڵکات. بەلاّم ئەوانەی لە پەنای دانیشتبوون زوو وریایان کردەوەو زاریان بەست. قەشەش بزنەوەی ئەهێڵێ مەسەلەکە گەندی دەربێ، دوای جامە شەرابێک دەستی بە دوعا خوێندن کرد.

کسماس هەستا، پای کاترینای ئامۆژنی بانگ کردە ئەولاو گوتی:

- ئامۆژن من ئەمشۆ دەچمە چیا کن مامم. هیچ پەیامێکت هەیە بۆی؟ ژن هەناسێکی هەڵکێشاو گوتی :

- ئاخ... چما ئەو گوێ دەداتە پەیامی کەس؟ ئەگەر فیکرێکی بە مێشکی دابێ، دنیاش خەرابێ لە فیکری خۆی پاشگەز نابێتەوە. مەگەر خوا یارمەتیمان بدات.

- ئامۆژن گیان ! یانی ئەو بەزەیی بە کورەکەشی دانایە؟

- بۆچی، بەزەیی بەو دادێ، چونکە لەم دنیایە لەو بەدەر کەسێتری خۆش ناوێ. بەلاّم بەقسەی کەس ناکات. تەنیا وەدوای فیکری خۆی دەکەوێ. بەڵێ.. رۆڵە، لە پیاوێکی بەزەیی بە خۆشی دانەیە، ئیتر چاوەروانی چت لێ دەبێ. کاترینا چاوەکانی سرپەوەو بێدەنگ بوو.

کسماس لە هاریدیموسی چوە پێشو پێی گوت :

- هاریدیموس ! تۆش باشت خواردو خواردەوە. بە راستی بۆ مەرگی بابە گەورەم جێژنێکی باشت گرت. ئێستا با بڕۆین .

نۆکەری پیر سەری بەرداوەو گوتی : « ئەی ئاغا باران دەبارێ. لە دەرێ هەورووبارانێکە پیاو لوتی خۆی نابینێ. »

ئەوەی بابە گەورە بە توندی گوتی :« دەبێ هەر بڕۆین. بالاّ وەرێ کەوین. »

هاریدیموس هەناسێکی هەڵکێشاو لەعنەتی بۆ چارەنوسی خۆی نارد کە ئەبهێشت تاوێک ئاسودە بێ. بە تایبەت ئێستا کە تازە دەیویست جەمێکی باش بخوار بخواتەوەو پشوێک بدات! گوتی باشە بابڕۆین .

کسماس گوتی : « وەپێش کەوە ئاخر فانۆسەکە بە تۆ تیە ؟ »

ئاهەنگی تازیە کەم کەم دەبوو بەگۆرانیو شادی. ستاروولیوس لە قەشەی پرسی:

- باوکی پیرۆز ئیجازەیە من گۆرانیەکی چیایی بڵێم؟ بێ ئەوەی چاوەروانی وەلاّمیش بێ، تێی هەڵکردو بە دەنگی وەک زەنگوڵەی خانوی لەرزاند.:

- گەنگێ هەوای خۆش دەبێ؟

- گەنگێ مانگی شەوبە دەگەرێتەوە

- تا من تفەنگەکەم هەڵگرم !...

## ١٤

هاریدیموسی پیر ، فانوس بە دەستەوە بە کوێرە ڕێگای مارپێچدا لە چیاسەردەکەوت.هێشتا هەرسەرخۆشبوو بە لادادەهات و

لاقی دەخلیسکاو ڕمبەی لە عەرزی دەهێنا.پاشان بە خەجاڵەتی هەڵدەستاوە و دەکەوتە ڕێ. لە بەر خۆیەوە دەیگوت :

- وای لەو شەرابە لەعنەتیە، شەراب ئاوی شەیتانە! دڵی بۆ ئاخافتن تەنگ دەبوو. لە کاتێکا لەبەر باران وەک مشکی نێو ئاوی لێهاتبوو، ڕاوەستاو گوتی :« ئەرباب بۆوا بێدەنگی؟ من ئەوە دەخنکێنم، هەر بۆیەش وەعەرزی دەکەوم.

- زۆر گوتن قەدەغەیە هاریدیموس . دەبینی ئەوە لافاو هەستاوە. توندتر بڕۆ بگەینێ.

کسماس بە پەلە بوو کە پێش ڕووناکبوون بگاتە لانی پاڵەوان میکێلس، نەکا لە ئۆزدەروی تورکانەوە ببینرێ. گزیاڵێ باران دەباری. ڕەگەکانی زەوی دەماسان. ئاوەکان بە دەنگی قاقا لە بەرزاییەکانەوە دەرژانە خوارێ. جاروبار برووسکێک وەک شیر بە ئاسماندا دەخوشی. گرمەی هەور لە چیاو دۆڵ دەنگی دەدایەوە. پاشان دوو بارە دەنگی ئاوەکان دەهات کە بۆ دەشتێ دەچوونە خوارێ.

چاوساغی پیر جارێکی دیکەش کەوتە پاڕانەوەو گوتی :

- ئەرباب بۆخاتری خوا زارلێک کەوەو قسێکی بکە. لەو دنیای کە تۆ سەفەرت بۆ کردبوو،خەبەر چیبوو؟ داخوا فەرەنگیەکانیش هەروەک ئێمە ئینسانن، یا شەیتانن؟

بەلام کسماس حاڵو حەوسەلەی ئاخافتنی نەبوو. ماتو بێدەنگ، لەتاریکیو لە بەر باراندا بۆ پێشەوە دەچوو. نەیدەویست ئەو دەمە پیرۆزانە بە زۆربلێی ئاڵۆز بکا. شادیەک هەموو لەشی داگرتبوو. وەک گاشە بەردێک لە بەردەکانی کریت ئارامو بێدەنگ خۆی لە بەر باران ڕادەگرت و هەر چەندی زیاتر تەڕ دەبوو، پتر هەستی دەکرد کە نەشەی خاک و بارینی ورتکە بەرد، کار دەکەنە سەر ئێسکانی.

زستان بوو ، دوورگەی کریت بە باران تەڕ دەبوو. بارانی کارچاک ئەم ئاگرەی دەکوژاندەوە کە

تورک ده گوندو کلیسایان بەردابوو. ئاگری گوندەکانی تورک تشینیشی دادەمرکاند کە مەسیحی دەیانسوتاندن. تورک و فەلە بۆ کاول و ویرانەکانیان دەگەرانەوە. بە زەحمەت بەردێکیان لە سەر بەردێک دادەناو میچێکیان دروست دەکردوماڵەکانیان سەر لەنوێ ئاوەدان دەکردەوە. کریتی هیلاک وبریندار کە لە بەر تین و تورەیی دەلەرزی، دیسان دەکەوتەوە بەر دەستی تورکان. لەوکاتەدا پاڵەوانەکان لە ئەشکەوتان لێک‌کۆدەبوونەوە تا بریاربدەن. پەیامی خەلیفەیان دەخوێندەوەو دیسان دەیانخوێندەوە.

تا بەیاشی نێوەرۆکی تێبگەن. دەنگی یونانیان گوێ دەدایەدلگیر دەبوون. جنێویان دەدا،بە هەرەشە چاویان لە ئاسمان دەکرد. مستیان لە عەرزی دەداو ئاخرەکەی تەسلیم دەبوون. قەمەکانیان دەکالانی دەناوەو جارێکی دیکەش چەکەکانیان لە بن عەرزی دەشاردەوەو دەگەرانەوە سەر کاری خۆیان.

خەڵکی کاندیش تورەو بێدەنگ دوکانەکانیان دەکردەوە. جرتیاران زەویەکانیان دەکێلاودایان دەچاندن و چەرخی قورسی ژیان وەگەر دەکەوتەوە. پالەوان پولیکسینگیس لە چیا هاتە خوار،تیتوڵێکی رەشی لە فیسەکەی درود بوو. شەمێکی بۆ سن‌میناسی پشتیوانی شاری کاندی هەڵکرد. تاوێک لە بەرامبەر پەیکەری راوەستاو دەستی کرد بە گازندەو سکالاو پاشان چوو دوکانەکەی کردەوە. بۆ ئەوەی کەس نەیبینێ و چاوی بە کەس نەکەوێ، دەچوە ژووری دوکانەکەی قەنەنەی دەکێشاو چاوی دە نوختەیەک دەبری. تەماشای کۆلانی دەکرد، بەلام ئەو خەڵکەی نە دەبینی کە دێن و دەچن. ئاگای لەو گوندیانە نەدەبوو کە بە باری پورتقاڵ و لیمۆ وتارنگی و شەراب و رۆنی زەیتونی بەرماوی تالانی شاری کانەوە دەهاتنە نێو شار. ئەو هیچ شتێکی نەدەدیت. ئێستا داخی دەخوارد کە بۆچی‌چیای بە جێ هێشتوەو خۆی واترسەنۆک و خۆڕی نیشانداوە. لە بەر خۆیەوە فیکری دەکردەوە : « من نەدەبوایە گوێ بدەمە قسەی خەلیفە و یونان. پاڵەوان میکێلس کارێکی باشی کرد کە مایەوە. منیش دەبوایە لەو سەرە بمێنمەوە و لە گەڵ ئەو بمرم. ئیتر ژیان بەکاری چیم دێت. هێندێ جار دێتە سەرم کە بۆ چیا بگەرێمەوە.

لولەی قەلیانەکەی لێک هالاند و لە بەر دەرگای دوکان راوەستاو هەناسەیەکی هەڵکێشا.لەو کاتەدا مانولیوس قەشە بەوێدا رادەبرد. باعەبای چەوری دەهاژاند. ئەو لەکاندی نەبزووتبوو. هەروا نوێژی لەسەرمردوان‌دەکردولەرێوورەسمی‌ناشتنیانیدا بەشدار دەبوو. دە بشوشتن و پیرۆزی دەکردن. پارەو خواردەمەنی لێدەداو ملی تەستوردەکرد. لەو رۆژەدا قەشە جامی شەرابی تایبەتی نوێژی‌مسی بە دەستەوە بوو، مورتزوفلوس بە رەنگی بۆرکاو وبەچاوی گریانەوە لە پێشیدا دەرۆیشت. بەرۆژی روناک فانۆسێکی پێکراوی بە دەستەوە بوو.

پاڵەوان پولیکسینگیس نیشانەی خاچی کێشا. لە خەبەرێکی ناخۆش ئاگاداربوو. ئێستا قەشە دەچوو لەسەر مەیتی پاڵەوان ستیفانیس نوێژێ بکات کە لە کاتی گەرانەوەیدا بە پاپۆری خۆی بۆکاندی، هەرتک لاقی بە نارنجۆکی پەریبوون و مرد بوو. لە بەر خۆیەوە گوتی :

ـ خوا لیی خۆشبێ. ئەوپیاوانە مرد و پیاوانە ژیا. سەری راوەشاندو راست ئەو دەمەی‌کە دەبویست بچێتەوە ژووری دوکانێ، چاوی بە باکێش کەوت خۆی لە پەتانیەک وەرپێچا بوو دەلەرزی و لە بەر خۆیەوە وەک شێتان ورتەی دەکرد. دوو رۆژ بوو ئەو کەمانچە ژەنە وەک

-گیانێکی سەر لێ شێواو بە کۆڵانەکانی کاندیدا دەسوڕاوەو هێشتا نەیتوانیبوو بڕیار بدات. داخوا مەیخانەکەی بکاتەوە، ژن و دوو کیژەکانی بێنێتەوە کە پەنایان بۆ گوندی گێورگێکاروس بردبوو، ژیانی ئاسایی خۆی دەست پێ بکاتەوە، یان واز لە هەموان بێنێ و بچێتەوە کن پاڵەوان میکێلس و پێی نیشان بدا کە ئەویش پیاوەو نابێ وەک سەگ چاوی لێ بکەن.

پێش دووڕۆژ کاتێکی پاڵەوان میکێلس وەلامی نامەی خەلیفەی پێدا دەناردەوە، پێی گوتبوو: « بڕۆ باکێش لە ئەمانی خوای دابی، بڕۆ بە سلامەت. دەزانم تازە ناگەڕێیەوە، چونکە تۆ باکێشی وەدەبێ هەر وەک باکێش ڕەفتار بکەی. »

ئێستا باکێش بیری لە قسەکانی پاڵەوان میکێلس دەکردەوە. لەکاتێکا هەزار خەیاڵی شەیتانی بە مێشکی دادەهات، فرە نارەحەتبوو. قسەکانی پاڵەوان میکلس جارێک ڕەگی غیرەتی دەبزاوت وبڕیاری دەدا بچێتەوە چیا، تا بەو بەرازە نیشان بدات کە خەراپی تێنگەیشتوە. جارێکیش دەکەوتە فیکری ژن و منداڵی و مەیخانەکەی و رای خۆی دەگۆری.

کە چاوی بە پاڵەوان پولیکسینگیس کەوت ڕاوەستاو لە بەر خۆیەوە گوتی :« ئەی، دەجاوەرە ئەوەش یەکێک لە پاڵەوانە ناودارەکانە کەوا کلکی دە نێو گەڵی گرتوەو تەسلیم بۆتەوە! بۆچی ؟ چونکە ئەو کارە بە قازانجی کریتە ، تۆش ئەی باکێشی پڕ لە ئەسپێ، دەتەوێ بە ئاقڵی کەمی خۆت بیتزوویەوە . ڕێگات بگرەو بڕۆ کابرا ، هیچ شەرمیش مەکە. ڕۆیشتن و شەرکردن زۆر دژوارەو لە توانا بەدەرە. بەلام لەوە دژوارتر ئەوەیە کە ئەو پێشقەرەولانە وەک پاڵەوان خۆ هەڵدەسێنن و هەر لەو کاتەشدا فەرمانی چەک دانان دەدەن. »

باکێش بە دیتنی پاڵەوان پولیکسینگیس شادبوو لەبەر خۆیەوە گوتی : « واباشە بچم بیدوێنم. ئەو تینم وەبەردەنێ. منی هەژار ژن و منداڵم هەیە نابێ بمرم . » بەو خەیاڵە لێی وەنیزیک کەوت. و گوتی :

- سلاو من لە چیاوە دەگەڕێمەوە. سلاوی زۆریش .

پاڵە وان پولیکسینگیس بە نیشانەی بێدەنگ کردنی دەستی هەڵێناو گوراندی و گوتی: بڕۆ گوم بە.. بەجهەنەم ..

دیتنی باکێش نارەحەتی دەکرد.چونکە کردەوە شەرمایەکەی خۆی وەبیردەهێنایەوە. باکێش بە قسەی ئەو زۆر نارەحەتبوو.

- سەیرە ئەو پاڵەوانە ئاگر خۆرە ! ئەویش وەک سەگ چاوی لێدەکا. تۆش ؟! ڕاوەستە ! ئێستا حاڵیت دەکەم.!

- من دووبارە دەگەڕێمەوە بۆچیا، من مەتەرێزی خۆم چۆڵ ناکەم. ئەگەر پەیامێکت هەیە...؟

لە ڕاستیدا باکێش بڕیارێکی وای نەدابوو. تەنیا دەیویست پاڵەوان پولیکسینگیس نارەحەت بکا. پاڵەوان بە زەردە خەنەیەکی گاڵتە گوتی :«چۆن باکێش تۆ ؟ تۆش دەچیەوە چیا ؟ دەبێ زۆر ئازا بی؟ »

- بەڵێ پاڵەوان دیارە دڵو غیرەتی دەوێ. هەر ئەو غیرەتە لەعنەتیەشە کە دنیا بەرێوە دەبات. ئەوەی گوت وبێ ئەوەی چاوەڕوانی وتەیەکی تر بێ، بزر بوو.

باکێش لە پڕ دیتی کە بڕیاری داوە ، بڕیاری داوە تەسلیم نەبێ و کارێک بکات کە هەرتک

پاڵەوان تەریق بنەوە. ئەگەر خودایێکیش هەبێ، ئەوا ئاگای لە ماڵ و حاڵەکەی دەبێ و کچەکانیشی بە شوو دەدات.

باکێش بە ڕێگادا نەدەڕۆی، بەڵکوو دەفڕی. چوە نێو کلیسای سن‌مێناس و شەمێکی پێکرد. کلیسا خەڵوەت و بۆنی عەتری لێ‌دەهات. سن‌مێناس بە جلی زێڕین و بە ڕوخساری ڕەش‌ئەسمەر و بە سواری ئەسپی بۆزەی دەهاتێ. وادەهاتە بەرچاو کە باکێش پیرۆز دەکات و پێشی دەڵێ: «سەر کەوتوو بی. تۆ ڕێگایەکی ڕاستت هەڵبژاردوە. دڵنیا بەمن ئاگاداری کچەکانت دەبم و دو مێردی قیت و قۆزیشیان بۆ پەیدا دەکەم. سەرکەوتوو بی، پاڵەوان باکێش»

باکێش شادو کەیف خۆش نیشانەی خاچی کێشاو لە کلیسا هاتەدەر. لە جێگایەک دەنگی قسان دەهات. سەری هەڵێنا لە پشتی پەنجەرەی خەلیفەی چاوی بە سەروسەکوتی تووکناوی هاریلاتوس کەوت. واقی وڕما لەوەی کە ئەو سوتخۆرە دزە، ئەو چەوسێنەرەی فەقیروهەژاران لە بارەگای خەلیفەی چدەکا؟ دیاربوو کە باکێش نەیدەتوانی مەبەستی خەلیفە لە بانگ کردنی کەسێکی ئاوا تێبگات. خەلیفە ئەو دەوڵەمەندە سوتخۆرەی بۆ ناتخواردن بانگ کردبوو. هەردوکیان خەریکی قاوەخواردنەوەی پاش نانی بوون. پیرە مێرد لەم کارە مەبەستێکی هەبوو. ئەو مەسیحیانەی کە پەنایان بۆ ئاتین و «پیرە» بردبوو گەڕابوونەوە بۆ گاندی. ماڵەکانیان بە چۆڵ و وێرانی دۆزیبۆوە. تورک سندوق و دەرک و پەنجەرەیان شکاند بوون تا ئاگری پێ بکەنەوە. بێجگە لە دیواری ڕەش‌وڕووت هیچیان نەمابوو. خەلیفە هاریلاتوسی سەرافی بانگ کردبوو تا بە زمانی خۆش وای لێبکا بەڵکوو پارەیەک بە سوتی کەم بە قەرز بدا بە مەسیحیە لێقەوماوەکان تا خانوەکانیان ئاوەدان کەنەوە. هاریلاتوس لە ڕەوەندی شۆرش داسەروەت‌و سامانێکی زۆری وەسەریەک نابوو. گوارە و ئەنگوستیلەو بەردی بەقیمەت وملوانکەو سکەی عەنتیکەوشتی بە نرخی دیکەی بە قیمەتی هەرزان لە موحتاج و فەقیرانی کڕیبوو، سندوقی پڕ کردبوو لە ئاڵتون و جەواهیرات.

خەلیفە دەیویست لە کاتی قاوە خواردنەوەدا بە وریای و بە پارێز مەسەلەکە بێنێتە گۆڕێ‌و باسی بکا، تا دەگاتە سەر ئەسڵی مەبەست. لە سەرەتاوە باسی خودای بۆکرد و گوتی: ئادەمیزاد لە تەماعی ماڵو سەروەت‌دا، ڕوحی خۆی لە دەست دەدا..

پاشان بە سەبرو ئەرم هێنایە سەر باسی‌ڕۆژ و نیشتمان و گوتی: «زۆر لە هاونیشتمانانی ئێوە بوون بەئەبەدی و دنیا بە چاکە باسیان دەکات. چونکە گیانی خۆیان فیدای نیشتمان کردوە. نابێ لە بیر بەرینەوە کە فیداکاری تەنیا بە بەخشینی گیان نیە، بەڵکوو لەوەشدایە کە هەر کەس‌چی لەدەست دێ‌و چی پێدەکرێ بیکات. بۆ نمونە لە کاتی قەیران‌و تەنگانەدا بە پارە یارمەتی نیشتمان و هاونیشتمانان بدا. بەڵام خوداش بێکار نیە، ئەویش دەفتەری خۆی دەکاتەوەو ناوی هەموو فیداکارەکان بە پیتی زێڕ تۆمار دەکات. لە پەنا ئاوەکانیان ئەو پارەش دەنووسێ‌کە بە کازاڵچی مەسیحیەت داویانە.

سەرافی تاجسن بە خوێن ساردی قاوەی دەخواردەوەو سیغاری دەکێشاو لە پەنجەرەوە سەیری خانوە وێرانەکان و دوورتریش تەماشای شەپۆلی دەریای دەکرد. وتەکانی خەلیفەش وەک با بەبن گوێی دا تێ دەپەڕین. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «کابرای قەشە دەیەوێ فریوم بدا. خەریکە دڵم

ئەرم بکار بە هاندانی‌غیرەت و دەمارگرتن سندوقەکانم خالی بکات. ئەی بەدبەخت ! خەیاڵت خاوە ! هەرلەسەر ئەو هەوایە بە !

کاتێک خەلیفەوتەکانی تەواو کرد، سەراف قونچکە جغارەکەی لە ژێر سیغاردا کوژاندەوەوزۆر بێ ئەدەبانە رووی کردە خەلیفەو هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی :

- باوکی پیرۆز وتەکانت هەموو لە گەڵ شەوەع دێنەوە من زۆر جار سەبارەت بەو فەرمایشتانەی تۆ بیرم کردۆتەوە و هەموو جارێ دڵم پڕبوە و بە خۆم گوتوە :« خۆزیا منیش وەک خەڵکی دیکە بام، خۆزیا توانیبام تفەنگ هەڵگرم و گیانم بکەمە قوربانی نیشتمان . » یان دەمگوت :« ئێستا کە خودا غەزەبی لێگرتووم و بە نیوە ئینسانی دروست کردووم، خۆزیا ئەوەندە پارەم هەبایە دابام بە برایانی دینی‌و تۆزێ لە رەنج و دەردی ئەوانم کەم بکردایەوە.» خودا لە رۆژی جەزادا رەحمم پێبکات.

بەڵام حەیف کە منیش تابوت بووم. بەڵێ باوکی پیرۆز من ئەمادم. هەرچەند لە بارەی منەوە قسە زۆرن و من بە سوتخۆر دادەنێن، بەڵام کاروکاسبی من لە برەو کەوتوە. بەڵێ باوکی پیرۆزبروا بکەکاتێ هەتیوێک‌یا بێوەژنێک، ئەنگوستیلەیەکی بچوک دێنێتە لای من و دەزانم کە مەجیدیەک پتر ناهێنێ، من دوو مەجیدی دەدەمێ. دەزانم زەرەرمە، بەڵام چبکەم؟ ئاخر منیش ئینسانم و رەنج دەکێشم. من باخێکی رەزم هەبوو فرۆشتم، باخێکی زەیتوونم هەبوو فرۆشتم. ئەو خانوەی ئێستا هەمە لە بارمتەم داناوە. خوای من شاهیدە باوکی پیرۆز ئەوەی گوتم راستە.نازانم دوارۆژم چی بەسەر دێت. ئەو خێرو چاکەی بە دەروویەری خۆمی دەکەم، منی ماڵوێران کردوە. کاتێ تۆ لە دوات ناردم، لە خۆشیان دڵە کوتەم گرت. بە خۆم گوت :« خودا داد پەروەرو سەخیە وپاداشی چاکە دەداتەوە. بێگومان خەلیفە لەوەزعی نالەباری من ئاگادارە و دەزانێ لە چ حاڵێک دام. خوا لەدڵی ئاوەو منی بانگ کردوە تا لە سندوقی کلیسا بارمتەیەکم پێ بکا » من دەزانم، سوپاس بــــــو خوا کەسندوقی شارداری پڕە !

خەلیفە واقی ورمابوو. لە دڵی خۆیدا گوتی :« ئەی مەلعون، ئەی جانەوەری ناتەواو، ئەی جولەکەی پیس! » ئیتر ئەیدەتوانی چاوی بەو ناپیاوە کورتە بکەوێ. قاوەکەی پێداکردو بە ناڕەحەتیەکی ئاشکرا تەسبیحەکارەبایەکەی وە گەڕان خست.

هاریلائوس‌لائە چکۆڵەکانی لە سەر تەخت هێنا خوار و دەستەکانی رێکخست و گوتی :

- هەوا ساردە، زستان داهاتوە. راستی باوکی پیرۆز ئەمساڵ بەبێ خەڵوز و لیباسی گەرم و خواردنی تێروتەسەل چیمان بە سەر دێت؟ من بە ناچار گشت مامرەکانی خۆم فرۆشت. لانی کەم بەبانیان هێلکەیەکم دەبوو کە بیخۆم ئەویش ئەما. خودا خۆی لە فریامان کەوێ. راست بۆوە، دەستی خەلیفەی ماچکرد و دووبارە گوتی :

- باوکی پیرۆز دوعامان بۆبکە! بە ئیجازەت لە خزمەت مەرەخەست دەبم. حالم باش نیە، دەچمەوە ماڵێ تۆزێ بحەسێمەوە.

* * *

منداڵ بە هاوارو قیژەقیژ بە بێ ئەزمی لە مەدرەسە وەدەردەکەوتن. چس‌گورک، ئەو شەوە پتر

لە کاتی خۆی نەوانی ڕاگرتبوو. سبەی شەو وچانی جێژنی نۆئێل دەست پێدەکرا. ئەو ویستبووی لەو ڕۆژەی ئاخری ساڵدا قسەیان بۆ بکا. مامۆستا ئێستا قەڵەوتر و بە هێزتر ببوو. ژنەکەی زگی پڕبوو، ئەمەش خۆشی‌شادی خستبوە دڵی چس‌گورکەوە. لە پێشدا بە چاوی سوک تەماشایان دەکرد. بەلاّم ئێستا بە سەر منداڵاندا زاڵببوو. نەیاندەوێرا گاڵتەی پێبکەن.

بەڵێ چس‌گورک ئەو ڕۆژە مناڵەکانی ڕاگرتبوو تا بۆیان ڕوون کاتەوە کە مەسیح چۆن هاتۆتە سەر دنیاو «هیرود»ی جنایەتکاریش کە زۆر وە پاشای کاندی دەچوو . چۆن ویستبووی بیکوژێ. بەلاّم چونکە خودا ئەت ڕێگای تەداوە زوڵم بەسەر داد دا سەرکەوێ، دەستی خستەنێو، کوری خۆی ڕزگارکرد. ئەو چیرۆکی ژیانی مەسیح و سەردەمی منداڵی و قوتابخانەی بۆ زارۆکان گێڕاوەو گوتی:« مەسیح قوتابیەکی زۆر باش بوە، ڕێزی لە مامۆستاو لە دایک و بابی گرتوە. ئەت درۆی نەکردوە. ڕوونیشی کردەوە کە چۆن لە چوار مێخەیان داوە. کەوابوو «هرود» ڕاست وەک ئەو پاشایانە بوە. واتە هەر ئەو ڕیش و فیس و زیپکانەی سەرلوتی هەبوە. بەهەرداش بەو قەدو مێزەرییەوە ڕاست وەک سولەیمانی قولە ڕەش بوە. بەلاّم ئێوە ئەوەی لە کن باس مەکەن. مەسیحی فەقیر دەردێکی زۆری کێشا. جنێویان پێداو بە قامچی لێیاندا، لیباسەکانیان دراند. ئاخرەکەی تاجی درویان بەسەر داگرت. لەوەش خەراپتر چوار مێخەیان کێشا. کریتیش چارەنووسێکی وەک مەسیحی هەبە.بەلاّم ڕۆڵەکان من قەولتان پێدەدەم مەسیح زیندوو دەبێتەوە. دڵنیا بن کریتیش ئازاد دەبێ. ئەوەندەیە ئەگەر ئێمە پیرە مێردیش نەتوانین ئازادی کریت بە چاوی خۆمان ببینین، بێگومان ئێوە دەیبینن. تەنیا ئاگادار بن لە کاتی وچاندا بەدفەری نەکەن. ئەو دەرسانەی خوێندوتانە چەند جار دووپاتیان کەنەوە. ئەم دوو گۆرانییەش لەبەر بکەن.:

- « لەوێ لە سەر چیا ....» و « شیری نەرم و تیژی من ..» سرودی میللیی - ش لەبەر بکەن.

باکێش ڕاوەستا ئازارۆک ڕادەبرن. چس‌گورک بە دوای منداڵاندا دەهات. باکێش چەندمانگ بوو نەیدیتبوو. لە پێشدا نەیناسیەوە. پاشان پێی گوت :« سلاّو ئاغا مامۆستا ! بە...بە.. عەجایب بووی بە دێو. دەڵێی گۆشتی شێرت خواردوە. پاشان بە فیزەوە گوتی:« من دەچمەوە چیا. تۆ هیچ پەیامێکت بۆ پاڵەوان میکێلس برات نیە؟»

چس‌گورک تێکچوو. دەستی باکێشی گوشی و گوتی :«ئافەرین ... تۆ پیاوێکی ڕەشیدی. بڕووە کە تا ئێستا ئەوەم نەزانیبوو.»

- ئەی مامۆستا ئەو قسانە چیە دەیانکەی ! من ئەت ڕەشید نەبووم. بەڵکوو تازە وام لێهاتوە. مرۆڤ ئەگەر لە نێو کوێران دانیشێ، دەبێ دەست بەچاوان بگرێ. پاڵەوان میکێلس منی ئازا کردوە

- پێی بڵێ منیش لێرە ئەرکی خۆم بە جێ دەگەیێنم. من بەرپرسی کۆشێنک منداڵی کریتیم لە ئەستۆیەو تێدەکۆشم تا کریت لە ناخیاندا زیندوو کەمەوە. بیان کەمە کریتێکی ئەوتۆ کە لە ڕادەی تواناداتوندو تیژ و تۆڵە ئەستێن بن. بەڵێ حەقەن ئەوەی پێ بڵێ. من بۆیە لە چیا گەڕاومەوە، بڕوام هەیە کریت سەر دەکەوێ. بڵێ ئەویش بگەڕێتەوە.

- دڵنیا بە پێی دەڵێم. بەلاّم ئەوەش بزانە کە ئێمە لە چیا دەمێنینەوە. خوا حافیز مامۆستا.

. سەر کەوتوو بی باکێش! تاوێک هەرواڕاما تا پاڵەوان باکێش بەفیزو شانازی بۆلای دەروازەی لازارە کەوتە ڕێ و هەروا تەماشای دەکرد.

* * *

دوای ڕۆیشتنی ‹ هاریلاتوس › خەلیفە هەستا، نایبی خۆی بانگ کردو گوتی :

. کوڕم زۆر هیلاک و شەکەتم. بەم حاڵەش دەبێ بچمە سەردانی پاشا. پاش چەند مانگ ئەوە هەوەڵین جار پێکەوتنی ئێمە دەبێ. من نەمدەویست ئەوی لە بارەگای خەلیفە نشینەدا ببینم، ئەویش منی لە بارەگای خۆدا وەرنەدەگرت. ناچار بڕیارماندا لە ماڵی ئەرکانالدولە چاومان بە یەکتر بکەوێ.

نایبی خەلیفە کە کابرایەکی گوندی ڕەش‌ئەسمەری ڕەشیدو چوارشانە بوو پرسی : « باوکی پیرۆز ئەگەر دەتەوی ئەو کەرە چکۆلەت بۆ جل‌بکەین سواری بە. وادیارە زۆر هیلاکی. » نایبی خەلیفە بۆ مل ئەستوری بە ناوبانگ بوو، کاتێک بە کوچەو کۆلانەکاندا لەگەڵ خەلیفە دەڕۆیشت، دەتگوت شێرێکی بە دواوەیە. خەلیفە گوتی :

. کوڕم باوایێ هەقتە. کەرەکەی جل کەن. ئەو کابرا پیسە منی وەگیان هێناوە. نایبی خەلیفە کەری جل کردو هێنایە حەساری. پاشان باسکی خەلیفەی گرت و سواری کرد. خۆشی هەوساری گرتە دەست و کەوتە ڕێ.

لەوکاتەدا پاشا مامرێکی تەواوی خوارد بوو. گۆزە شەرابێکیشی بەسەرداکردبوو. بانگی سولەیمانی کردو گوتی :

. ها سولەیمان ! من دەچمە دیداری ئیمامی کافران. دەبێ بە تورک و فەلان رابگەیێنین کە شەر تەواو بوو. گورگ و مەر پێکەوە ئاشت بوونەوە. ئەسپی من بێنەدەرێ، چونکە ناتوانم بڕۆم. کاری وا هەر پاشیش نیە. تۆش پێویستە لەگەڵم بێی. من زۆرم خواردوەو خەوم دێت. لە کۆلانی ئاگات لێم بێ وەعەرزی نەکەوم.

بەڵام ڕاست لەوکاتەدا کە لە پلیکانان دەهاتە خوارێ، دوو مرۆی ڕووناکدڵ و بە ناوبانگی‌کاتی، واتە ‹ باربایانیش و ئەفەندم › باسکی یەکتریان گرتبوو لە بەر دەمی سەوز بوون. هەرتکیان بەلادادەهاتن و ئاتا پێدەکەنین و یەکتریان لە ئامێز دەگرت، باربایانیس بە مەستی ئەفەندی بانگ کردبوو گوتبووی: « دانیشە ئەفەندم چەندی دەتەوی بخۆو بخۆوە. »

ئەفەندی وەک لە گێژەی بەربوویێ کەوتە سەر خواردن و گوتی : « سوێند بخۆ کە بە زۆری تووشی گوناحم ناکەی »

. مە ترسێ ئەفەندم ! لەعنەتی! سوێند دەخۆم نەگۆشتی بەرازت بدەمێ و نەشەراب. ئەوانە بۆ خۆم دەخۆم.

ئەفەندم گوتی: « خواردنەوەی شەراب گوناحێکی گەورە نیە و دەتوانم شەراب بخۆمەوە. » باربایانیس پێی چەقاند و گوتی:« نا ئەفەندم، من ناهێڵم گوناحی تۆم بێتەسەر، بۆ هێندی بووتەوەی ویژدان شەرابی ڕێویت دەدەمێ. »

. نا...نا... باربایانیس ! شەرابی ڕێوی دڵم نارەحەت دەکا، منیش شەراب دەخۆمەوە.شەراب

گرنگ نیە، تەنیا گۆشتی بەرازە کە.... هەرتک پێکەوە گۆزە شەرابێکیان خواردەوە و سەرخۆش بوون. لە پڕ باریابانیس گوتی : « دەڵێی چی شپرێنکارییەکی پچوک بکەین. نەزەرت چیە ؟»

. هەر چۆنێکی تۆ بتەوێ ئامادەم. تەنیا بەو مەرجە مەجبوورم نەکەی بە نێوەراستی شەقامیدا برۆم.

. نارەحەت مەبە، لەکۆڵت دەکەم و بە شەقامدا دەتگێڕم. جا گوێ بدەیە : تۆ تورکی و من فەلە. دەتەوێ بمکوژی؟ ئەگەر دەتەوێ بمکوژی. هانێ ئەوە خەنجەرو بمکوژە.

ئەفەندم هاواری کرد: « ئاخ.. باریابانیس بۆ خاتری خودا..خەنجەر توڕ هەڵدە . ئەو قسانە مەکە. من لە خۆ دەچم.»

. زۆر باشە منیش نامەوێ تۆ بکوژم. کەوابوو تورک و مەسیحی گشتیان دەبێ وەک ئێمە بن. واتە برای یەکتر بن. بێگومان تۆ ئەو دێڵە سەگەت دیتوە کە شیری دەدا بە گجولەکانی خۆشی و بە ئەرخە پشیلەش. گریتیش دەبێ وابکات. ئێستا بزانە من بیرم لە چی کردۆتەوە؟ هەرتکمان دەستی یەک دەگرین و دەچینە کن پاشا و پێی دەڵێین :

. بزانە تورک و فەلە چۆن پێکەوە بوونە دۆست؟ ئەفەندی عوسمانیەو منیش دیاردەی دنیای مەسیحیەتم. دەبینی پێکەوە بووینە برا. کە وابوو بڵێ شەراب بێنن !»پاشای مەلعون پیاوێکی باشە لە بەر پێکەنین دەکەوێ. بە سولەیمان دەڵێ:« شەراب بدە بەوانە. رەحمەتی خوای لە هەرتکیان.» پاشان پاشا دوو نیشانەی جەواهیر دێنێتەدەرو هەریەکەی یەکمان بە سنگیەوە هەڵدەواسێ. ئێمە بەسەر دانواندن پاشەو پاش دەگەڕێینەوە. تۆ عوسمانی و من مەسیحی، زڵێ تێک دەگرین و بە شەقامدا دەڕۆین

لە پێشدا دەچینە کلیسا دوعا دەکەین. پاشان دەچینە مزگەوت، لە دوایە دەچینە قاوەخانە گەورەکەی وسیناغا. لەوێ لاوانی تورک گۆرانی دەڵێن و هەر کەس گوێی لە دەنگیان بێ، هۆشی نامێنێ. دەیانەوێ یەکیتی رابگەیێنن.؟ زۆر باشە، ئەوەش یەکیتی. بژی باریابانیس، بژی ئەفەندی، بژی یەکیتی. ئێستا تێگەیشتی ئەفەندی؟ موافیقی؟

ئەفەندی کە لەترسان ئارەقەی کردبوو، گوتی:

ئەدی شەقام چ لێ بکەین؟

. گوتم مەترسێ... من لە کۆڵت دەکەم و بە شەقامدا دەڕۆین. من مەلەش دەزانم. تەنیا راوەستە با شیرو نیشانەکانم هەڵگرم. باریابانیش شیری لە دیواری هێنا خوار و لە قەدی بەست و پاشان سندوقێکی‌چکۆڵەی کردەوە، میداڵێکی تەنەکەی هێنادەرو لە سنگیدا. وەک لە پێشدا گوتمان ئەو میداڵە دەستێکی‌گەورە بوو دەیانگوت بۆ چاروزاریە خۆیانەوە هەڵدەواسن.

باریابانیس گوتی :

بە ناوی عیساو محمد بۆ پێشەوە. ئەفەندم تکا دەکەم تۆش هەر ئەم دوو ناوە بێنە و وەپێش کەوە.

. باشە. بەلام من لە پێشدا ناوی محمد دێنم. دەنا کارمان سەر ناگرێ.

. زۆر باشە چۆنت دەوێ وابکە. ئەفەندم گوتی « بە ناوی محمد و عیسا !» هەرتک پێکەوە لە پێشدا لاقی راستەیان لە دەرگا بردە دەر. کاتێک گەیشتنە کۆلانێ، ئەفەندم گوتی :

ـ دەڵێی چی باربایانیس ! عەلیاغای فەقیریش لە گەڵ خۆمان بەرین. ئەو نەتورکەو نە یونانی. ئەپیاوەو نەژن. بەلام هەرتکیانیشە. با بچین ئەویش بەرین. ئەگەر ئەو لەگەڵبێ، لە راستیدا نوێنەری هەموو میللەتان چۆتە کن پاشا.

باربایانیس کە لە خۆشیان دەیویست هەموو دنیا لە باوەش بگرێ، گوتی:« باوابێ ئەفەندی لەعنەتی! بزنا! ئەویش گیان لەبەرێکە . هەرچەندە دیار نیە ژنە یاپیاوە. بەلام ئەو فەقیرەش هەقیەتی میداڵ وەر بگرێ. هەرتکیان بە رزخی دەریادا هاتنە خوارو گەیشتنە گەرەکی پاڵەوان میکێلس و لە دەرگای عەلیاغایاندا. لە حەساوێ دەنگی تەق تەقیلان هات و پاشان دەنگێکی گیراو گوتی: « کێ یە ؟»

ـ دوو کەس لە دۆستانی تۆن عەلیاغا، دەرگا بکەوە بە قازالجتە.

ـ برۆن بە دوای کاری خۆتاندا. من دەترسێم. دۆستی چی؟ کام دۆست ؟

ئەفەندم هاواری کرد : « منم عەلیاغا، منم .. ئەفەندیە تەرسە !»

دەرگا کرایەوە. سەروکەللەی پیرە مێردێکی خواجەی رەنگ زەردی چرچ وەدەر کەوت. لەو کاتەوە کە جیرانەکانی ئەلە رۆیشتبوون، ئەو فەقیرە نەیدەوێرا بچێتەکن هیچ کەس. مەسیحی بروایان پێ نەدەکرد و موسوڵمانیش دەریان دەکرد. هەموو رۆژێ بەیانی دەچوە مەزرایە، سەوزی کۆ دەکردەوەو بە بێ رۆن زەیتون دەیخوارد. گۆزەوی دەچنی و دەیفرۆشت. لە چاوە روانی ئەو رۆژە کە خەڵک ناقڵ بۆو دراوسێکانی بێنەوە سەرژیانی خۆیان، نانێکی ئەمر نەژی پەیدا دەکرد. ئەوکاتەی دراوسێکانی دەگەرانەوە رۆژگاری ئەویش خۆش دەبوو. دەچوە دیتنیان، ئەوانیش قاپە چێشتی گەرمیان لە پێش دادەنا.

باربایانیس بەزەیی بەو پیرە مێردە هەژارە داهات و گوتی: « وای عەلیاغا ! ئەوە بۆ وات لێهاتوە ؟»

ـ نەخۆشم باربایانیس . زۆر نەخۆشم. سەیرم کە ناتوانم دابنیمەوە. هەمورلەشم دێشێ. منی هەژار !

ئەفەندم پرسی : « ئامادەی لەگەڵ ئێمە بێ بە کن پاشای؟»

پیرە مێرد ترساو گوتی:« کن پاشا ! بچین چبکەین ؟ من ناچمە هیچ کوێ ..»

باربایانیس گوتی: « بە قازالجتە، تۆش میداڵ وەر دەگری ..»

پیرە مێرد لە کاتێکا دەرگای لەسەر پێوە دەدان گوتی :« بۆ خاتری خوا وەدوای کاری خۆتان کەون و دەست لە من هەڵگرن .»

باربایانیس بە ئەفەندی گوت : « وازی لێ بێنە با برۆین. ئەو کابرایە کەلاکە و دە بزوێ .»

هەرتک کەوتنە رێ. گەیشتنە مەیدان و لە بەرماڵی پاشا راوەستان. لەوکاتەشدا پاشا دەهاتە دەرێ. کاتی پاشایان دیت، گوتیان: « پاشا ئەفەندم ! تاوێک راوەستەو تەماشامان کە .

پاشا کە ئەوانەی دیت، دای لە قاقای پێکەنین و گوتی :

کەللە کەر چتان دەوێ، ئەم گاڵتەیە چی یە ؟

ئەفەندم وەک هەمیشە دێخوێنی پسابوو، شاڵواری بە دەستی راگرتبوو تا نەکەوێ، شیری درێژی باربایانیسی لە لاقانی تێ پەریبوو، دەهات بکەوێ. هەرتکیان کاتی رۆیشتن بەلادادەهاتن.

لە پێشدا نوێنەری بوتانیەکان وەدەنگ هات و گوتی :

پاشا ئەفەندم ! من ئیتر ئەو باربابانیسی رێوی فرۆش نیم، تۆش لە سەر من را بیر مەکەوە. من ئێستا نوێنەری مەسیحیەتم، ئەوەش ئەفەندی ئەرسەیە کە خۆت دەیناسی، بەلاّم ئێستا نوێنەریدەوڵەتی وەسمانیە. ئێمە لە پێشدا ئەو گیایەمان خوارد کە دەڵێن لە بەینی دوو کەسدا شەر سازدەکات. پێکەوە بە شەر هاتین، پاشان هەنگوینمان خوارد و پێکەوە ئاشت بووینەوە. ئێستا پەیماقان بەستوەو بووینە برای یەکتر. بێگومان پاشا ئەفەندم تێدەگەی، وانیە؟ تۆ دێڵە سەگێکت دیوە کە شیر دەدا بە گجولەکانی خۆشی و بە بێچوە پشیلەش. ئێمە پێکەوە گوتومانە کریتیش هەر ئاوایە. کەوابوو لەسەر چی دەبێ شەر بکەین. کریتیش مەمکی هەیە و شیریشی هەیە. هەموو دەتوانن بیخۆنەوە و تێریش بخۆن .تێدەگەی پاشا ئەفەندم ؟ با پێکەوە یەک بگرین، یەکترمان خۆش بوێ. خۆش رابوێرین و شادی بکەین. بە تایبەت کە ئێستا من بووم بە خاوەنی ئەوەیەک. بژی یەکێتی !

پاشا قاقا پێکەنی و گوتی :

ـ سولەیمان، لام وایە ئەو کابرایە شێت نیە. ئەگەر خەڵک وابزانن تێناگەن، باوەر بکە ئەو کابرایە لە من و لەخەلیفەش ئاقڵترە. ئیستکانێک ئارەقی بدەیە و هەریەکەش خەرنوێکی شامی یان بدەیە.

بارباتیس گوتی : « چۆن پاشا ئەفەندم میداڵمان نادەیەی ؟»

ـ تۆ کە میداڵت هەیە، ئەوەت بەسە.

ـ ئەدی هاقاڵەکەم ؟ میداڵ نادەی بە ئەفەندی ؟

پاشا گوتی : « سولەیمان ! داوە یەنێک بدە بەو هەتیوە با شاڵوارەکەی پێ ببەستێ. میداڵو شتنیە، برۆن گوم بن .»

* * *

کاتێک پاشا گەیشتە ماڵی «ئەرکان‌العولە» دیتی کەری خەلیفە لەوێ بەستراوەتەوە. کەیف خۆشبوو گوتی :« سەیرە خەلیفە زووتر هاتوە، دیارە تەسلیم بوە.» سولەیان پاشای هێنا خوار و چوە حەساری. پیرە کچێکی رەق و درێژ کە سووروسپیاوی کرد بوو، هاتەدەرو پاشای بە خێر هاتن کرد. پاشا بە سەرو روێکی خۆش چوە ژوور. خەلیفە لەبەری هەستاوپاشاش سەری بۆ داتواند. خۆی خستە نێو مۆبێلێکی نەرم و دەستبەجێ تەسبیحی کارەبای هێنا دەری.

پیرە کچ هاتە ژوورێ، بەلاّم گورج گەرابەوە تا ئەم دوو پیاوە مەزنەی کاندی بە ئەنبابترانن بە ئازادی لەبارەی چارە نووسی ولاتەوە قسە بکەن.

ماوەیەکي زۆر هەرتکیان بێدەنگ بوون خەلیفە دەستەکانی بە ئاگر گەرم دەکردەوە. دەلەرزی، هەستی دەکرد کە حاڵی باش نیە. پاشا خەوی دەهات و بارێشکی دەهاتێ. خەلیفە باوێشکی پاشای دیت، خۆشی دەستی پێکرد. لە ئاخریدا بۆ ئەوەی سەرە تای ئاخافتن دامەزرێنێ گوتی :

ـ پاشا ئەفەندم ئەمرۆ هەوا زۆر ساردە.

ـ بەڵێ خەلیفە ئەفەندم ، ئێستا زستانە . دیسان بێدەنگ بوونەوە. پاسارییەک هات لەسەر

چوار چێوەی پەنجەرە نیشت. چاوێکی لە پاشا وله خەلیفە کرد بە جیکە جیک فڕی و دوور کەوتەوە. پاشاش لە ئاگر وەنیزیک کەوت. بە زەحمەت زاری لێک کردەوەو گوتی :

ـ وادیارە ئاگری خەڵوز سەرە گێژە دێنێ. من سەرم دەسوڕێ.

خەلیفە باوێشکی هاتی و گوتی : « ئەگەر خەڵوزەکە باشی نەگرتبێ وایە ـ »

جارێکی تر مات و بێدەنگ بوونەوە . پاشا هەستی کرد دەستی زۆر لە مەنقەڵی ئاگر بردۆتە پێش. دەستەکانی لەسەر ئەژنۆیان دانا. پیرە کچ نیگەرانبوو. گوێچکەی بە دیوارەوەنا، هیچی وای نەبیست کە وە گفتوگۆ بچێ. تەنیا پرخەی گوێ لێبوو. گوتی واباشە قاوەیەکیان بۆ ساز کەم تا خەویان بڕەوێ. پاشان چوە متبەق و کەتری لەسەر ئاگری دانا.

دوای تاوێک دەرگا کرایەوە. پاشا چاوی هەڵێنا، پیرە کچی دیت بە کەشەفی قاوە هاتە ژوورێ، بە شێوەی گاڵتەپی خەلیفەی نیشانداو گوتی: « فەقیرە خەوی لێکەوتوە. پیرە مێردە ، ئیتر تاقەتی نەماوە. »

بۆنی قاوە خەلیفەی لە خەو ڕاپەڕاند. فنجانێکی لە سەر کەشەف دەست دایەو گوتی:

ـ دوا ڕۆژت خێر بێ. بە ڕاستی من پێویستم بە قاوە هەبوو، چونکە دەهات خەوم لێ بکەوێ.

هەرتک بە ئێشتیا قاوەیان دەخواردەوە. خەلیفە پتر لە جاران خۆی تورە نیشان دەدا. ڕووی کردە پاشاو گوتی :

پاشا ئەفەندم ئەمساڵ گەنم زۆر باش دەبێ. پاشا لە وەلام دا گوتی : « جۆش هەر وا خەلیفە ئەفەندم. »

پاشا هەستاو گوتی : « چاو پێکەوتنێکی باشبوو. هەرتکمان خۆشمان ڕابوارد. با جارێکی دیکەش یەکتر ببینین و پتر قسە بکەین. خەلیفە لە کاتێکا تەکانی خۆی دەدا کە هەستێ گوتی : « زۆر رم پێخۆشە پاشا ئەفەندم ... »

دەنگو باسی کۆبوونەوەی دوو پێشەوای کاندی ، بۆ وتووێژ لە بارەی کاروباری وڵات و گێڕانەوەی ئاشتی، خەڵکێکی زۆری لە بەرامبەر ماڵی پیرە کچ دا کۆکرد بۆوە. خەلک چاوە ڕوانی ئەوەبوون کە پاشا و خەلیفە دەست لە دەستی یەکدا لەو ماڵە دێنە دەرێ.

دوکتور ‹هاساپاکیس› یش کە بە وێدا رادەبرد ڕاوەستا. کە چاوی بە ‹ئاریستوتلیس› ی دەرمانفرۆش کەوت. لێی پرسی :

ـ ها ..ئاریستوتلیس خەبەر چیە؟ کێ مردوە..؟

ـ فاڵی خەراب لێ مەدە . پاشاو خەلیفە لەو ماڵە خەریکی گفتوگۆن، تا ئاشتی بەر قەرار بکەن. یەکێک لە پشتی پەنجەرەوە ئەوانی دیوە، گۆیا ئامێزێک کاغەزو دەفتەریان لە پێش کۆ بۆتەوە.خەلیفە دەنووسی وپاشاش قسەدەکا و دەستڕادەوەشێنێ .بەم زوانە هەرتکیان نوسراوەکان مۆر دەکەن. ئەرێ بای ‹ماسل › حاڵی چۆنە ؟

دوکتور شانی هەڵتەکاندو گوتی :«چۆن بوو هەروایە. ماوەیەکە بۆ حەساتەوە ناردومەتەوە گن برایەکەی. »

هەوای زاری دوکتور وە شادی دەچوو. چونکە توانیبووی شەری ژنەکەی لە سەر خۆی کەم کاتەوەو لە گەڵ قەرەواشەکەی بە تەنیا لە ماڵێ بێ.

لەوکاتەدا گەنەوان لە قسە کردن دابوون ئاغا دیمیتروس بە شەلەشەل لە سەری کۆلانێ وەدەر کەو ت. دیمیتروس کە بە قسەی خۆی بۆ دامرکاندنەوەی خەم و خەفەت چەند مانگ بوو لە چیاو لە گوندەکان دەسوڕاوە، ئێستا گەڕابۆوە نێو شار. ئەو بە هەڵکەوت قسەی دەکرد. گوندییەکان دەیانگوت جنۆکە لاڵیان کردوە. ڕێزیان لێدەگرت. جاروبار نانیشیان دەدایە. ناتەکەی وەردەگرت و بە ڕێگاوە ملی دەبەر خواردنی دەنا و دەچوە گوندێکی دیکە. چەترەکەشی هەمیشە پێبوو. یان هەڵیدەدا، یا بە دەستیەوە دەگرت. تا ئەو دەمەی کە کریت بۆ ئازادی شەڕی دەکرد، ئاغا دیمیتروس کوری پاڵەوان ‹ پێتسوکولوس› لە چیاو چۆڵ دەخولایەوەو خەفەتی دەخوارد. بەلام ئێستا کە ولاتەمێندی بۆتەوە، ئەویش هاتۆتەوە سەر خۆو گەڕاوەتەوە کن پای ‹ پینلۆپی›خێزانی. پێلاوی دڕاو ولیباسی شڕو شاڵواری فرە گوشاد بیوو. دەتگوت دامێنی ژنانە. بە سەری رووت و بە شەلەشەل دەهاتە پێش.

دوکتور کە خۆی زەلامێکی قەڵەو بوو، بە پێکەنینەوە گوتی :« کابرا چەندە لاوازە، شاڵوارەکەی پوچاوەتەوە.»

ئاریستوتلیس گوتی: « نارەحەت مەبە زوو پڕ دەبێتەوە » بەلام لە راستیدا وەک ئەوە دەچوو کە بخوازێ بێژێ :« ئەو هەموو دەرد و کوێرەوەرییە، لە چاو دەردی بێ دەرمانی من هیچە!» کەوتە بیری دەرمانخانەی خۆی. یادی ئەو دوکانەی کە لە باشترین شوێنی شەقامی شارو یادی نەبوونی کوڕێک کە دوای مردنی دوکانەکەی بۆ بە جێ بێلێ.

بەلێ... کە دیمیتروس نیزیک بۆوە، دوکتور پێی گوت : « خۆش هاتی ئاغا دیمیتروس ! حاڵت چۆنە ؟»

لە وەلامدا گوتی :« سوپاس بۆ خوا. بەلام ئەوەندەی بسوڕێمەوە، لاقم نەماون. » پاشان ڕێگای خۆی گرتە بەر.

دەرمانفرۆش لە کاتێکا سەیری دیمیتروسی دەکردلە بەر خۆیەوە گوتی:
- لەم دنیایە تەنیا ئەحمەق خۆشبەختن. ماڵوێران ئەوانەن ئاقڵیان هەیە.
دوکتور گوتی:« ئەی وای... من لە بیرم چوە .. خوا حافیز »
- چییە ؟ چیوە ؟ ئەخۆشت هەیە ؟.

ئەو ژنە جولەکەی کە برازای پاڵەوان میکێلس لەگەڵ خۆی هێناویە، گۆیا لە ترسان منداڵی لە بەرچوە. منداڵەکە کیژێکی موو زەردی جوان بوە . تۆ ئەوت دیوە ؟

دەرمانفرۆش بە شەیتانی گوتی : « پیاو ژن نەهێنێ باشترە لەوەی کە ژنی جولەکە بێنێ.» پاشان هەستا سەر پەنجان تا بزانێ لە حەساری ماڵی ‹ئەرگان‌الدولە› چباسە. خەڵکی دیکەش کەوتبوونە جم وجۆڵ و تەماشایان دەکرد.

خەلیفەی زەلام و رەشید بە ڕیشی چەرمووک و باڵای بەرز لە حەساری دەهاتە دەر. قۆڵی دە قۆڵی پاشای کرد بوو، بۆ لای کۆلانێ دەهاتن و بە کاوە خۆ هەنگاویان داوێشت.

تورک و مەسیحی ڕێگایان بۆ دەکردنەوە تا وەسیاتی و کریت کە تێکەڵ ببوون، تێپەڕن. پاشا کە خۆی بە پاسکی خەلیفەوە هەڵواسیبوو، بزەی لە سەر لێوان راست و چەپ سلاوی لە خەڵک دەکرد.

بەلأم خەلیفە بە نێو چاوانی گرژ خۆی هاویشتبوە سەر وەکاز و بە پەلە بوو کە زووتر لە دەست ئەم تورکە نەجاتی بێ. نایبی خەلیفە کەری هێنا پێش و سولەیمانیش بە ئەسپەوە ئامادە بوو.

* * *

لەو کاتەدا لە ماڵی خەسووی نوئیمی قیامەت بوو. ژنی جوان تەواوی شەو نە خەوتبوو. هەمیشە لە فیکری مێردەکەی و ئەو چیایەدابوو کە دەیویست لێی سەر کەوێ. لە بیری ئەم کورەی زگی دابوو کە بە لینگە فرتە، بوونی خۆی رادەگەیاند. ترسێکی نادیار خەوی لێ حەرام کردبوو. هەرەشەیەکی خەیاڵی لە ژوورەکەیدا دەهات وەدەچوو. لەشێکی نەدیتراو... دەنگێکی نادیار... تارماییەک... داخوا تارمایی مەرگ بوو؟ کاتێکی ئەوانەی بە خەیاڵدا دەهات، لای بەیانی بوو، تارەقەیەکی سارد بە قژەکانیدا دەهاتە خوارێ. لە جێ هاتە دەرێ. دەهات بخنکێ. پەنجەرەی کردەوە. هەوای ساردی دەرەوە کاری لە ئێسکانی دەکرد. کە رۆژهەلات، نوئیمی لە پلیکانان هاتە خوار و دیتی خەسووی ئاگر دەکاتەوە. پێی گوت :. دایە حاڵم باش نیە. دەچمە دەرێ هەوایەک لێمدا.

خەسووی سەری هەلێناو تەماشای کرد، ترسا. رەنگی بە روانەوە نەمابوو. ئاڵقەیەکی رەش بەدەوری چاوەکانیدا هاتبوو. بە دڵسۆزی و خۆشەویستی پرسی :« رۆڵە بەو بەیانە بۆ کوێ دەچی؟ تۆ نابێ خۆت ماندوو بکەی.»

نوئیمی دوودڵ بوو. شەرمی دەکرد باسی ترسی بەیانی بکاو بە ئاشکرا بڵێ دەبەوێ بچێتە کلیساو بە تۆک و دوعا ئەو ترسەی لەسەر خۆ لابەرێ. خەسووی دیسان پرسی :« چۆن؟ ئەت دەزانی دەچیە کوێ ؟؟

. بۆ چی ؟ دایە دەمزانی . دەچوومە کلیسا. تا شەمێک هەڵکەم.

خەسووی هاواری کردو گوتی:« ئاخ .. رۆڵە تۆ ئەوت هاتە خەوێ ؟»

. بەڵێ دایە...

خەسووی بە سەر سوڕ مانەوە تەماشای نوئیمی کرد و چەندەگەی لەرزی. کە وابوو ئەوهێشتا تەواو نەمردوە. بەڵێ خۆی دەیزانی کە مێردەکەی تەواو نەمردوە ، بەڵکوو وەک دوکەڵ لە هەوا بڵاو بۆتەوە. خانوەکەی گەمارۆ داوە. ویستوویە بێتە ژوورێ، خەریک بوە بەلأیەک بە سەر بووکەکەی بێنێ. پاشان هەروەک لەوەی بترسێ، نەکا مردوو گوێی لێ بێ دەنگی نەرمتر کردەوەو گوتی :

. رۆڵەکەم برۆ شەمێکی بزووشن کە و لە بەری بپارێوە بەزەیی پێت دابێ، بەلأم بۆخاتری خوامەڵێ کە منداڵت لە زگی دایە.

. نا دایە .. پێی نالێم .

. ها... وەرە ئەم چارشێو شانەی منیش بە شانت دادە با سەرمات نەبێ.

کلیسا چۆڵ بوو، نوئیمی شەمێکی پچوکی هەڵگرت و راست بۆ لای وێنەی زەلامی مریەمی پاکیزە چوو -کە لە لای چەپی دەرگای پیرۆز بوو، لەقیرە نەیدەوێرا کە لەگەڵ خەزووری رەحمەتی قسە بکات، دەیویست کە حەزرەتی مریەم تکای بۆبکا.

نوئیمی چوکی داداو مارەیەکی زۆر مات و تەنیا دەوێنەی مریەم دەڤیکری. مریەمی پاکیزە توند منداڵەکەی خۆی دەنامیزێ گرتبوو. ڕوومەتی بە ڕوومەتیەوە نووساندبوو. دەتگوت لەوە دەترسێ کە منداڵەکەی لێ بستێنن لە جیاتی شتیاری. خاچێکی پچوکی لە داری بۆ منداڵەکەی واگرتبوو.

نوئیمی هەستا، شەمەکەی ڕوشن کرد، زاری بردە پێش و وێنەی‌مریەمی ماچکرد. ئەو هێشتا نەیدەزانی دوعا بکات. لە گەڵ مریەم دەستی بە قسان کرد. دەتگوت لە گەڵ دراوسێکی باش و دڵسۆز دەردی دڵ دەکات.:

- ئەی دایکی پیرۆز ! من ژنێکی جولەکەم و لەو سەری دنیاوە هاتووم. وازم لە ئایینی باووباپیری خۆم هێناوە و بووم بە مەسیحی. ئەی دایکی پیرۆزا من فرە پێویستم بە تۆ هەیە. یارمەتیم بدە. پێی بڵێ کە چیتر شەوانە بۆ ئازارو ئەزیەتی من نەیەت. پێی بڵێ خەراپەم لەگەڵ نەکات. من جگە لە خێرو خۆشی بۆ بنەماڵەی ئەو ئاواتێکی دیکەم نیە. من کورەکەی ئەوم خۆش دەوێ. بێجگە لە ئەڤینی ئەو لەم جیهانەدا دڵخۆشیەکی دیکەم نیە. ئاخ ... ئەی دایکی پیرۆز... من نهێنیەکی تر لە گەڵ تۆ باس دەکەم بەلام تۆ بەوی مەڵێ. سێ مانگی تر وەک تۆ کوڕێکم دەبێ، دەترسم منداڵەکەم لێ بستێنێ. تۆ نابێ بێڵی ئەو دەست لە منداڵەکەم بدا. من خۆم خستۆتە ژێر پێی تۆ ئەی دایکی پیرۆز، ئەی دایکی هەموو دایکانی جیهان ، ڕوحمێکم پێ بکە!

چاوەکانی هەڵێناو تەماشای مریەمی کرد. دیتی کە مریەم بە ڕوخسارێکی خەمبار تەماشای دەکات. لە پڕ وای زانی کە پەردەیەک لە تەسرین نیگای مریەمی لێڵ کردوە. نوئیمی ترسا. گوارە ئاڵتونەکانی کە کەسماس بۆی کڕیبوو لە گوێی هێنا دەرو بە وێنەی مریەمی داکرد و گوتی : ئەی مریەمی پاکیزە ! جگەلەوە چیتر شک نابەم. ئەوانە با یادگاری منبن بۆتۆ. گەڕایەوە بۆ ماڵێ. ماریا ڕووی لێ وەرگێرا. خەسووی پیر چوە کنی و گوتی :

- باشە ڕۆڵە شەمت هەڵکرد ؟ دەنگی ئەوت بیست؟ ئەو هیچی بە تۆ گوت ؟

نوئیمی گوتی : « دایە من دەچم بنوم، ماندووم .» لە پلیکانان سەرکەوت، پشووی چاک نەدەهات. نارەحەت بوو. لە سەر هەمان تەختە ئاسنە دوو نەفەریە کە خەزووری لە گەڵ ژنەکەی لەسەری نوستبوو ڕاکشا. دەترسا چاو لەسەریەک دابنێ و مردوو لە بەر دمی لە تاریکیدا سەوز بێ. لە خوارێ سەعات زەنگی لێدا، دەنگی خۆشی بانگدەرەکان لە سەر منارەکانی شار بەرز بۆوە. بوو بە نیوەڕۆ. نوئیمی زاری تاڵبوو، بۆنانخواردن نەهاتە خوارێ. دوای ئەوەی لە تەماشا کردن ماندوو بوو، چاوی لەسەر یەک دانان ، خەوی لێکەوت یان نا، خۆشی نەیزانی. بەلام پاش ئەوەی کە پێلوەکانی وێک نان، بە قینێکی مەترسیدار هەستی کرد کە کەسێک بێ ئەوەی دەرگا بکاتەوە هاتۆتە ژوورێ. نوئیمی‌لە پەنا تەخت بوو بە گلۆڵە، هێزی خۆی کۆکردەوەو چاوی هەڵێنا کەس نەبوو! لە گەڵ ئەمەش هەستیدەکرد کە یەکێک لە ژوورەکەیە. لەکاتێکا لە ترسان دەلەرزی چاوەکانی تەواو لێک کردنەوە وگوتی :« خۆیەتی... خۆیەتی ...!»

چرا کوژابۆوە و ڕوخسارەکان ون ببوون. هەرچەندی تەماشای دەکرد پتر هەستی دەکرد کە هەوای نێوان دوو پێچکی تەختەکەی بارستایی زیاتر دەبێ و شکڵ بە خۆوە دەگرێ. لە پێشدا دوودەمانچەی زێو کە بە تاریکی دەدرەوشان، دەرکەوتن. پاشان ملێکی ئەستوور و سمێڵی رەش و

دووچاوی تیژبین وەدیار کەوتن. زەلامێک لە نێوان دوو پێچکی تەختەکە وەنیزیک کەوت لە حەوا دەگەڕا. نوئیمی قیژاندی و هاواری کرد :

. یا مریەمی پاکیزە، یارمەتیم بکە ! وەدەری نێ ! بەلاّم کابرا پتر دەهاتە پێشێ. تا دەهات چاوی گەورە ترو وەحشیتر دەبوون. ئێستا ئیتر دەنگی ددانەکانی باش دەبیسرا. کابرا گەیشتە بان سەری نوئیمی و ڕاوەستا. نوئیمی جارێکی دیکەش هاواری کرد: یا مریەمی پاکیزە وەدەری نێ... دەری کە !

بەلاّم کابرا لەپڕ دەستی هەڵێناو لێفەی لەسەرتەختەکەی لاداو مستێکی توندی لە زگی نوئیمی دا. ژنی چارە رەش قیژاندیو لە تەخت کەوتە خوارێ. خەسووی دەنگی هاواری بیست و بە غار وەسەر کەوت. دیتی بوکەکەی لە خوێنیدا گەوزیوە. هاواری کرد :« هۆی ماریا بکە دوکتوری. خوشی‌منداڵە پچوکەکەی هەڵگرتەوە. لاجانگی نوئیمی بە گولاو داماڵی. چراکەی پێکردەوە و چاوەروانی دوکتوری بوو. لەوێ دانیشت و بە سەبروکە دەگریا. بۆ مردنی نەوەکەی هەدای نەدەدا. ئاخرەکەی نوئیمی بە رەنگی‌بزرکاو چاوی هەڵێنا و مات و پەشێو سەیری دەوروبەری خۆی کرد و دانی پێنکەوە دەنان کە هاوار نەکا. دیتی خەسوی لە بان سەری دانیشتوە و لاجانگی بە گولاّو دادەماڵێ. نوئیمی دەستی بۆ درێژ کردو گوتی :

. دایە ئاخ... دایە ئاخ... ژانێ دەکا. پاشان چاوەکانی لێک ناوە.

دایک لە پەنای دانیشت. بیری لە کورەکەی دەکردەوە. کورەکەی ئاگای لە بەدبەختی ئەو نەبوو ئەو لەم سەعاتەدا لە کوێ بوو. لە حەساری ماڵێ بابە گەورەی چی دەکرد ؟!

* * *

بەلاّم کسماس ئیتر لە حەساری ماڵێ بابە گەورەی نەبوو. بە تاریکی و باران بە کوێرەرێدا بەرەو چیا دەچوو. بێ ئەوەی دەنگ بکا بە دوای هاریدیوسی پیردا دەرۆیشت وئاخرین دەمەکانی ژیانی بابەگەورەی بە ترس و ئافەرینەوە وەبیر دەهێنایەوە.

پیرە مێرد لە بن دارە لیمۆ ڕاکشابوو. ڕاست لەوکاتەدا کە عیزرائیل دەیویست بێتە سەرێ ئەو پرسیارانەی « لە کوێوە هاتوویت و بۆ کوێ دەچی » بە مێشکی دا هاتبوو، ئارامی گیانی تێکدابوو. سێ پاڵەوانی مەست لە بن گوێی زار ئاواڵە دانیشتبوون و چیرۆکی ژیانی خۆیان گێڕابۆوە کە پڕ بوو لە تورک کوشتن و ڕابواردن، ئەوان دەیانگوت و دەیانگوتەوە.

بەلاّم وشەکان بۆ قووڵایی و مەزنەتی ژیانی ئەوان تەواو نەبوون، ناچار روویان کردبوە مامۆستای مەدرەسەو داوای یارمەتیان لێ کردبوو. مامۆستای مەدرەسە لە جیاتی وەلاّمدانەوە بە کەمانچە دەستی بە خوێندن و گریان کرد بوو. ئەوەدەم بابە گەورە چاوی لەسەر یەکدانابوو. بۆیەک لێوەکانی لێک کردبۆوە. دڵی وەک زەویەکی تینوو کە تاوی باران بخواتەوە، دەنگی کەمانچەی خوارد بۆوە. لەشی وەک ئادەمیزادی خەو لێکەوتوو هێدی و ئارام لە ئامێزی مەرگدا حەسا بۆوە.

کسماس بە خۆی گوت :

. بنەماڵەی من رەشید و بە توانان ریشەی ئەوەندە قووڵە ئامان قەت نایێ شەرمازی بکرێ. خوا

بکا خوێنی نوێبمی خوێنی کریت پیس نەکاو کوڕی من ئینسانێکی تەواوکریتی بێتە سەر دنیا. بەرەیەکی ئەوتۆ تابێ لە مەزنایەتی بکەوێ. چونکە حەیفە ڕەگەزی ئاوا بفەوتێ.

هاریدیوس لە پڕ ڕاوەستا. بێدەنگی لەشی گران کرد بوو. پتر خۆی پێ ڕانەدە گیرا. سەفەر لە چیا بە پێیان، بێ ئەوەی ڕێبوارەکان پێکەوە قسەبکەن و گاڵتەو گەپێک و گۆرانی و جاروبار ڕاوەستان نەبێ و پارووە نانێک بخۆن و گەروو تەر بکەنو بحەسێنەوە، تامو چێژێکی نیە بەلاّم ئەوکابرا فەرەنگیە سەیرە. زەمانی نەدەگەڕاو تاوێک ڕانەدەوەستا و هەرهاریدەدا، هاریدیوس وەدەنگ هات :« ئەرباب چیاسە بۆچی وارادەکەی؟ بۆدیتنی پاڵەوان میکێلس وابەتاڵوکەی؟ لەعنەت لە زاتی، ئەگەر بەقسەم دەکەی هەر دەبێ نەیبینی. هەتا دەرەنگترو کەمتر بێ باشترە.پیرێ بابە گەورەت منی ناردە خەبەری بدەمێ بۆ ئاخرین دیدار لە چیا بێتە خوار،چونکە لە سەرە مەرگ دایە. بەلاّم کاتێک ئەو بەرازە ڕووی تێکردم و چاوم بە بیچمی دڕندەی کەوت، هۆشم لە سەریدا نەماو کەمی مابوو بکەوم.»

کسماس بێ ئەوەی بوێستێ گوتی :

- نارەحەت مەبە هاریدیوس . بۆ من فەرق ناکا، چونکە ئەو مامی منە. خوێنێ ئێمە یەکە و من لەوی ناترسێم.

- یانی تۆ غیرەتی ئەوەت هەیە قسە لە قسەی ئەو بکەی؟ من گرێوێ دەکەم کە تۆ ناوێری.!

- بۆ چی ؟ دەوێرم .. جارێ بێدەنگ بە باهرێین . کەسماس نەیدەویست ئەوسەعاتە خۆش و بێدەنگیە بە قسەی بێ جێ بە فیرۆ بدات.چونکە ئەو تەنیا بیری لە ڕیشەی بنەماڵەو لە بابە گەورەی دەکردەوە. دە فیکری پاڵەوان میکێلس دابوو، ئەم دارە زەلامو ئەستورەی بنەماڵە، لق و پۆپێکی هەبوو، ئەویش پاڵەوان میکێلس بوو. کێ چوزانێ لەوانەیە دوا ڕۆژی کریت بە دەستی ئەو بێ. دەبوایە چۆن بیدوێنێ؟ باسی چی بکار چی پێ بڵێ.ج شەیتانێک چوبوە کلیچەی؟ خەلیفە پێی گوتبوو کە سوورتانی دژی عیسای مەسیح خەتای ئەو بوە. ئێستا دەیویست ئەو پەڵە شەرمایە لە داوێنی خۆی بشواتەوە. هەر بۆیە نایەوێ تەسلیم بێ. ڕەنگەبخوازێ بە مردنی خۆی سزای خۆی بدات. کسماس بە خەلیفەی گوتبوو:«زۆر باشە،بەلاّم ئەوە بە قازانجی کریتە» خەلیفە ماوەیەک بێدەنگ بوو. چونکە ئەوەی دەیویست بیڵێ، هێندە دڵگر نەبوو، هەر بۆیەش بە هەست و گومانەوە وشەکانی دەردەبڕی. ئاخرەکەی لەبەرخۆیەوە گوتبووی:« خوا لیم ببوورێ، بەلاّم لام وایە مامت شەیتانی لە ناخی دایە. ئەو شەیتانەش کریت نیە.» چس‌گورکی مامیشی گوتبووی:« ڕازێک لە ژیانی پاڵەوان میکێلس دا هەیە، ڕازێکیش لە بارەی ژنێکی تورکەوە لە نێوان ئەو وپاڵەوان پولیکسینگیس دا هەیە. خەڵک هێندێ قسان دەکەن. ئەو دێوانە بوە و ئیتر دەسەلاّتی دڵی خۆی نیە.

هاریلاتوسی کورتە بالاش ڕۆژێک بە شەیتانی پێی گوتبوو :« ئەو ئێرەیی بە پارێزەرانی ئارکادی دەبا. ئەو حەسودەو بڕیاری داوە وەک دژی ئارکادی خۆی بتەقێنێ. تا دوای مردنی خەڵک حکایەتی قارەمانەتی بگێڕنەوە...»

کسماس لە بەرباران و خلیسکان بیری دەکردەوە کە: ڕەنگە هەموو هەقیان بێ. ئێستا کە دەچوە کن پاڵەوان میکێلس دەبوایە چی پێ بڵێ.؟ چۆن دەیتوانی قانیعی بکا کە پاشا گوتوویە

ئەگەر لە چیا بێتە خوارێ و بە چەک و ئالاوە تەسلیم بێ. ئاڵێک لە سەری گەم نابێ. کەوابوو باشترە پێشنیاری پاشا قبوڵ بکات. پێی بڵێ کە خەلیفە دەیەوێ تەسلیم بێ، پاشای یونانی تکای لێکردووە. بێگومان بە گاڵتە شان هەڵدەتەکێنێ. چونکە ئەو بۆ ئادەمیزادان ڕێز قایل نیە. ئەگەر پێی بڵێ کە هیچ کەس نەتورک و یونانی و نە ئورووپایی لایەنگری ئەو نین، وتەیەکی بێ جێیە. چونکە ئەو کەسێکە لە تە نیایی دەترسێ، نەک لەمەرگ. لەواتەیە مەرگی خۆی لە خوا بخوازێ.

کسماس بە قوڵی بیری دەکردەوەو ئەم قسانەی لە ئاقڵی خۆیدا ئاوڕتوێ دەکرد .بەڵکوو کار بکەنە سەر ئەو جاوتەوەوە درندە و ئاقڵی بکەن. خەفەتی گەورەو جۆر بەجۆرهەناویان دەکوشی ؛لەشی لەپڕ نەخۆشی نوتبەی کە کسماس تۆوی ڕەگەزی خۆی بە ئەمانەت تێدا چاند بوو، دیار نەبوو چ کوڕێک بەر هەم دێنێ. کاتێ کسماس بیری لەو کوڕە دەکردەوە،دەلەرزی. بیری لەوە دەکردەوە کە لە ئورووپا چاوی پێکەوتبوو. فیکری لە بێنادی و فەسادو خەراپەو بڕسەتی خەڵک دەکردەوە. هەروەها لە خۆی دەپرسی کە کام ڕێگا بگرێتە پێش و لەم خەباتەدا جێگای ئەو لە کوێیە؟ بابە گەورەی لام خەباتەدا نەخشی هەبوو. باوکی و مامیشی هەروەها، بەڵام ئەو چی؟ خۆی نەیدەزانی کام ڕێگا هەڵبژێرێ بۆ ئەوەی بگاتە ئەم ئەنجامە کە بێژێ : «منیش لەم بەرەیەدا مەتەرێزێکم هەیەو ئامادەم بەرگری لێ بکەم و کەس ناتوانێ دەستی بۆ درێژبکات...» کسماس لەم شەوەدا بۆ هەوەڵین جار لە هیچو پوچی خۆی تەریق دەبۆوەو ڕەنجی دەکێشا.

باران لێی کردەوە. ئاسمان هەر چەند ئاوی پێی بوو، بەسەر کڵێساکاندا ڕژاند بووی. بابێکی ساردو توند هەورەکانی لێک بڵاو کرد. چەند ئە ستێرە وەدەر کەوتن. هاریدیموس بۆ تەماشای ئەستێرەکان ڕاوەستا و گوتی :

. ئیوە شەو لایداوە، ئێمە چاک هاتووین. فەقیرە دیقی دەکردو دەیویست شتێک بڵێ : ئەرباب بۆ خاتری خودا با لەبن ئەم گاشە بەردە پشوێک بدەین و سیغارێک بکێشین.

. ماندوو بووی هاریدیموس ؟

. دیارە کە ماندوو بووم. ئاخر من پیر بووم. لاقم بە گران لە دوو دێن .

بەڵام پیرە مێردی شەیتان ماندوو نەبوو، تەنیا لەداخان وەدەنگ هاتبوو. هەرتک لەبن گاشە بەردێک ڕاوەستان. کسماس سیغارێکی دایە. هاریدیموس لە فیکری ئەوەدابوو چۆن سەری باسێک داگیرسێنێ. تەماشایەکی ئاسمانی کرد جێگای باس نەبوو. پاشان کەوتە بیری گوندی خۆی وبیری کریت و کاندی. بەڵام ئەو پیاوەی لە فەرەنگ گەڕاوەتەوە. ئەوانەی هەموو لەبەر بوون. کەوابوو ئەم مەسەلەیەش تامێکی وەهای نەبوو لەنەکاو ‹ئاندرولیوس› مامی وەبیر هاتەوە کە کابرایەکی وردو چکۆلە بوو. مامی ئەو کابرا لوت بەرزەی فەرەنگی کە نایەوێ دوو قسانی دەگەڵ بکا، لە چاو مامی ئەو چبوو.؟ ‹مەبەستی پاڵەوان میکێلس بوو› بەڵێ پاڵەوان میکێلس لە بەرامبەر مامی ئەودا مێشولەیەکیش نەبوو. دەیویست ئەوە بە کسماس بسەلمێنێ. هاریدیموس یەک دوو نەفەسی لە سیغارەکەیدا و ڕووی کردە کسماس و گوتی:

. ئەرباب تۆ دەزانی گەورەترین درندەی دنیا کێ یە؟ ڕەنگە بڵێی شێرە. نا...واتیە.گەورە ترین درندەی دنیا ئادەمیزادە.

ڕەنگە بپرسی بۆچی؟ چونکە شەر دەکار ڕەک مامی تۆ تورکان دەکوژێ؟ یان چونکە بە

بارمەتی شەیتان چەکی داهێناوە کە شێران بکوژێ؟ نەخێر وانیە. ڕاوەستە بەڵگەت بۆ بێنمەوە. من مامێکم وەبەر ڕەحمەتی خودا کەوتوە. ناوی ئاندرۆلیوس بوو. نەقیرە لە بەو چکۆڵەیی پێیان دەگوت < جندوکە> بە ڕێگادا نەدەڕۆی. بەد بەختە وەک کللۆ هەر هەڵدەبەزیەوە. هەمیشە لە بەر ژان هاواری بوو. دوکتور گوتبوویان بەردی گورچیلەی هەیە و دەیکوژێ. بەڵام ئەو ... بەراستی ئادەمیزاد چی‌یە؟

پاچ و قوڵنگی هەڵگرت و لە بەرامبەر چیای <ونیریتو>، لە کن گوندەکەی خۆی چۆکی دادا و خەریکی کێو هەڵکەندن بوو. ساڵێک ، دوو ساڵ، سێ ساڵ گوندی‌یەکان گاڵتەیان پێدەکرد. دەیانگوت :« لەعنەتی چدەکەی؟ داخی دڵت بە کێو دەڕێژی؟» ئەو بە بێ ئەوەی سەر هەڵێنێ هەڵکەندنی درێژە پێدەداو دەیگوت : « بەڵێ‌لە گەڵ کێو نیم و دەردی دەدەمێ.» ساڵی سێ‌یەم هەر لە بن ئەو کێوە دەستیکرد بە دروست کردنی خانوو. دیسان گوندی‌یەکان گوتیان :« لەعنەتی خانو دروست مەکە، ئێمە قازانجی تۆمان دەوێ. ئەوەی خانو ساز بکا دەبێ ژنیش بێنێ.» مامم لە وەڵامدا گوتی: « ئەحمەقینە من هەر ئەوەم دەوێ. دەمەوێ ژن بێنم و منداڵان پاشەکەوت بکەم تا بۆ هەڵکەندنی ئەم چیایە یارمەتیم بدەن.» گوندی پێدەکەنین و دەیانگوت : « کێ مێرد بە جنۆکەی وەک تۆ دەکا؟» ئەو لە وەڵامدا دەیگوت : « هەموو کەس دەتوانێ پێڵاوی لاقی خۆی بدۆزێتەوە ئاخرەکەی منیش ژنێک هەر دەبینمەوە..» لەو کاتەدا کە ئەو خەریکی خانو بوو، بیوەژنێکی‌ناحەزی خەڵکی گوندی دراوسێ بەوێدا ڕادەبرد. چوە مالی ئاندرولیوس . حەسارو مەتبەق و ژووری خەو ودانیشتنی دیت و خۆشی لێ هات. چاوێکی لێ داگرت و گوتی: « ئاندرولیوس ! من لەو ماڵەی تۆ خۆشم هاتوە. تۆ تێژی چی؟ مامم گورج لێی تێگەیشت. بە دوو قسە گەیشتنە یەک و زەماوەندیان کرد، مامم شەو لەگەڵی نوست و بەیانی بە قوڵنگەوە چۆوە زگ چیا. بەڵێ ئەوەندەی کێو هەڵکەند تا لە لایەکی حەساری خانوەکەی تەویلەیەکی لێ ساز کرد. دیسان گوندی‌یەکان گوتیان : « لەعنەتی تۆ خەریکی شار دروست بکەی؟»

- دیارە دەمەوێ شار دروست بکەم. خێزانم منداڵی هەیە . دەبێ بۆ منداڵەکانم ژوور دروست بکەم.»

- بۆ گورچیلەت ژان ناکا ؟

- بڕۆن تەمبەڵی بێکارە ! من کاتی ئەوەم نیە هەست بە ژان و دەرد بکەم . کات بە سەر دەچوو، ژنەکەی‌دوو دوومنداڵی‌دەبوون ئەو هەر کێوی هەڵدەکەند. کێوئەشکەوت و کەلێنی تێکەوتن. ئاندرولیوس کێوی دەخوارد. سەیربوو لە سەرەتاوە مامم هەر جنێوی دەدا. کێو بەربەرەکانی دەکرد. پاشان زانی کە کێو تەسلیم بوە. منداڵەکانیشی گەورە بوون. ئەوانیش دەکێوی بەر بوون. هەڵیان کەندو داپڕیان کرد. خانویان لێ دروست کردن. ئەوانیش ژنیان هێنا، منداڵیان بوون. بەڵام ئیتر مامم ئاندرولیوس پیر ببوو. نەیدەتوانی وەک ڕابردووکێو بکۆڵێ، شەوێکیان لە چیا دەگەڕاوە بە خەیاڵی داهات کە دەمرێ. کەوتە سەرتەخت. منداڵ و نەوەکانی بانگ کردو وەسیەتی کرد کە لە کێو بینێژن و قوڵنگیشی لەگەڵ دەقەبری نێن. پاشان دەستەکانی وەک خاچ لە سەر سینگی داناو تەواو بوو.

ئەربابە ئەگەر ڕۆژێک ڕێگات بکەوێتە گوندی <وینراتو> داوا لە خەڵک بکە ملکی

ئاندرۆلیوست نیشان بدەن. ئێستا بۆتە گوندێکی گەورە. هاریدیوس بێدەنگبوو. کەیف خۆشبوو کە توانیویە چی لەدڵدابوو بە زیرەکی بەو فەرەنگییەی بڵێ.

کسماس گوتی:« هاریدیوس ! من جانەوەرێکی تر دەناسم لە شێر و لە مامی تو دڕندەترە.

ـ ئەوە کامەیە ؟

ـ کرمی عەوزییە.

هاریدیوس نیشانەی خاچی کێشاو لە بەر خۆیەوە گوتی:« ئەرباب بۆ خاتری خوا زمانت بگەزە و لەو قسانە مەکە. پاشان تفێکی لە عەرزی کرد و گزێچانی دەست دایەو بە ناڕەحەتی گوتی :

ـ یاڵاّ .. ئەرباب با بڕۆین !

کەم کەم بەیانی بەردەدا کە کسماس لە بستوی چیای سلنا گەیشتە ئۆردوگای پاڵەوان میکێلسی مامی. هاریدیوس ڕاوەستاو گوتی:« ئەرباب ! لێرەوە ئیتر بۆ خۆت بڕۆ. ئەگەر کارەکەت تەواو کرد وەرەوە ئێرەو پێکەوە دەگەڕێینەوە. لێم ببورە ئەرباب کە ناتوانم لە گەڵت بێم. چونکە نامەوێ مامت ببینم.

پاڵەوان میکێلس تەواوی شەو نەنوستبوو. لە بەیانیەوە لە دیدەوانی وێستا بوو. دووربین بە چاوەوە مەتەرێزەکانی دوژمنی هەڵدەنا. عەسکەری تورک وردە وردە دەهاتنە پێش و جێگای خۆیان قایم دەکرد. ئەوان بە پەلە نەبوون چونکە هەستیان کرد بوو تفەنگچیەکانی مەسیحی کەم بوونەوە و چەکو قۆرخانەشیان لە کەمی داوە. ئەوەشیان دەزانی کە لە نانی جۆ بەدەرهیچیان نیە بخۆن. تورک گەمارۆیان دابوون نەیاندەهێشت کەس لە خەتی گەمارۆ تێپەڕێ. تەنیا کەسێکی زۆر شارەزا بایە بەشەو دەیتوانی خۆ بگەیە نێتە مەتەرێزی مەسیحیەکان.

پاشا پەیتا پەیتا پیاوی دەنارده کن پاڵەوان میکێلس بەڵکو تەسلیم بێ. لە قوستەنتەنیەوە نامەیان بۆ پاشا نوسیبوو کە بەرژەوەندی دەوڵەتی وەسمانی پتر لە تەسلیم بوونی شۆڕشگێڕان دایە ، نەک سەرکوت کردنیان. بەم جۆرە کریت جارێکی دیکەش بە مەیلی خۆی ژێردەستی ئێمە قەبوڵ دەکات و ئوروپا بۆ دەست درێژی هیچ بیانوی نامێنێ.

هەر ڕۆژی پێشوو پاشا قاسیدێکی ناردبوە کن پاڵەوان میکێلس و پەیامی بۆ نارد بوو: ئەوە ئیتر ئاخرین ئاگاداری منە. لە ئێستاوە تا سبەی نیوەڕۆ مۆڵەتت دەدەم ئەگەر تەسلیم بیو بە ڕێگای خۆت دا بڕۆی، بە لێن دەدەم کە دەستت لێ نادەم. ئەگەر وانەکەی. سوێند بە محمد هەمووتان لە شیشی کەباب دەدەم و دوای هەموان تۆ ورد ورد دەکەم.»

پاڵەوان میکێلس تەواوی شەو لە فیکردابوو کە بڕیاری چی بدات. ئەو لە فیکری خۆیدا نەبوو، لە بەر هاورێکانی. چونکە ئەو بڕیاری خۆی دابوو. دەیزانی ڕزگار نابێ و نەیدەویست بیێتە هۆی مەرگی ئەوانیش. بۆیە پێشنیاری کرد کە هەر کەس لە هەڵبژاردنی ڕێگای خۆیدا سەر بەستە، ئاخرین پەیامی پاشای بە هاورێیانی خۆی ڕاگەیاندبوو. تا شەو دەرفەتی بیرکردنەوەیان هەبێ و بەیانی وەلامی بدەنەوە.

کەس لە هاورێیانی شەو چاوی لێک نەنابوو. کاتێک زەردە لە سەرانی دەدا. هەموویان بە سەرورویی قرژن وکراسی خویناوی هاتنە مەتەرێزی پاڵەوان میکێلس و لەدەوری کۆبوونەوە و چاوەڕوان ڕاوەستان .دەهوابە لە پێشدا ئەو دەست پێبکا.

بەلام ئەو لە بەردەکانی پێش خۆی رامابوو، هەوڵی دەدا بەسەر هەژانی دڵیدە زاڵ بێت. ئەو ئەگەر ویستبای وەدەنگ بێ، دەبوایە دەنگێکی پیاوانە لە گەرووی بێتە دەر، نەک نالەو شیوەن. کریت، تراساکی، ژنی چەرکەسی، دێری سوتاو، هەر یەکە بروسکێک بوون لە ناخیدا پزیسکیان دەدا. جنێوێکی لە زاری دەرپەڕی. بەردێکی بەدەستەوە بوو وەهای رێک گوشی کە دەستی پڕ بوو لە خوێن. سەیری دۆستانی خۆی کرد کە لە دەوری کۆ بوونەوە. تەماشای تورکانی کرد کە لە داوێنی چیا بوون. چاوی لە ئاسمانی بان سەری کرد و بە خۆی گوت : ئازادی یا مەرگ! ئازادی و مەرگ ئەم وشانەن کە دەبێ لە ئالای خۆم بیان نوسم. بەڵێ... ئالای خەباتگێڕێکی راستە قینە، دەبێ ئاوا بێ. .ئازادیو مەرگ! »

هەستی کرد حاڵی باشتر بوو. دوای چەند ساڵ تازە شتێک تێگەیشتوە. تینێک هاتە دڵی، رووی کردە یارانی و بە نیگایەکی هێدیو ئارام دەستی بە قسان کرد: « ئێوە هەموتان لە پەیامی ئەو سەگە ئاگادارن. هەموتان پیاون، ریش و سمێڵتان هەیە وبۆ ئازادی شەر دەکەن. کەوابوو بە سەر بەستی بدوێن. ئێمە نە فیشەکمان هەیەو نەتانو نە هومێد. تورک لەشکرێکی تەواون و ئێمەش دەستەیەکی کەم. سوێند بەو شیرەی کە جگە لە خودا نایدەمە دەست کەسیتر، هەر کەس دەیەوێ بە بێ شەرم و رووده‌روایسی دەتوانێ بڕوا. بە راستی بزانن من دڵم نایەشێ. من دەمێنمەوە، ئیتر قسەم نیە .»

ماوەیەکی درێژ کەس لە جێی خۆی نەبزوت. خۆر لە ئاسمان بەرز دەبۆوە. عەسکەری تورک لە تەپلێانداو دەیانەویست بێنە پێش. پاڵەوان میکێلس جارێکی تر گوتی : « خێرا بە سەر بەستی قسەبکەن ! »

کابرایەکی لەڕی لەش داگیرساو، تفەنگێکی قایش بەن بەدەستەوە بوو، وەدەنگ هات و گوتی : «ئێوە هەموتان دەزانن ، قەت لە بەر تورکان هەڵنەهاتووم. کەوابوو لەوەی ناترسێم کە بە ترسەنۆکم بزانن. بیروڕای خۆم رکوراست دەردەبڕم ، ئەی پاڵەوانان. ئێمە بۆ هیچ دەمرین. بەڵێ ..بۆ هیچ ! زیانی ئەو کارەساتە بۆ دنیای مەسیحیەت پترەتا دەگات بە خۆمان. کریت جارێکی دیکەش رادەپەڕێ و ئێمە ئەوێ رۆژێ زیندوو نابین تا لە شۆڕشی داهاتودا یارمەتی میللەتەکەمان بدەین. بارودۆخێکی ئێستا ئێمە تێیدا ین، ژیانمان لە مردن پتر بۆ کریت قازانجی هەیە. ئەو کارە شەرم بێ یا نەبێ، بۆ من گرنگ نیە. دەبێ بزانین قازانجی کریت لە چیدایە.؟ گرنگ بەرژەوەندی کریتەو هیچیتر.!»

پاڵەوان میکێلس سەری داخستبووگوێی دەدایە. کاتێکی کابرا تەواو بوو لێی پرسی:

. قسەکانت تەواو بوو یانارۆس ؟

. بەڵێ تەواو بوو.

پاڵەوان میکێلس رووی کردە تەفەری پەنا دەستی و گوتی:« ئاش بە نۆرەیە ، ئێستا نۆرەی مستیکری یە ! »

مستیکری سمێڵەکانی بادار رووی وەرگێراو دەیویست چاولەچاوی پاڵەوان بیڕێ و ئاخرەکەی گوتی :« من دوێنێ شەو لەگەڵ دوو شەیتانان لە کێشەدابووم. یەک دەیگوت بڕۆ دەنا لەو شەرە نەجاتیت نایە.ئەوی تریان دەیگوت: مەڕۆ، چونکە هەرچۆنێک بێ نەجاتیت نایە. ئەودوو شەیتانە

تایەبانی لە ناخی منداکێشەیان بوو. ئاخرەکەی بەکێیان سەرکەوت.»
پاڵەوان میکێلس چاوێکی لێکردو پرسی: «کامیان سەر کەوت؟»
- تۆ سەرکەوتی. پاڵەوان میکێلس! لە عنەت لەو ڕۆژەی لە گەڵ تۆ بووم بە ئاشنا.
- باشە ... مەبەست ...؟
- من نارۆم.
پاڵەوان میکێلس ڕووی کردە کایامبیس و گوتی: «تۆ دەڵێی چی کایامبیس.؟»
کایامبیس هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: «من تازە ژنم هێناوە. ژنێکی جوانم هەیە. هێشتا لە ژیان چێژم نەکردوە.هەر ئەو داخە من دەخوا»
- باشە ئێستا باسی ژن لەولا دابنێ. من لەگەڵ پیاو قسەدەکەم.
- منیش ئەی پاڵەوان میکێلس، لە عنەت لەو ڕۆژە دەکەم کە تۆم ناسی. منیش هەر قسەی میستیکری دەکەم. پێم خۆشە بڕۆم، بەلام لە تۆ شەرم دەکەم و نارۆم.
پاڵەوان میکێلس ڕووی کردە تیئودۆریسی برازای کە لەو کاتەدا تفەنگی خاوێن دەکردەوە و عەمباری دەکرد، گوتی:
- تۆ دەڵێی چی .. چلۆن... بڕیاری چت داوە؟
تیئودۆریس چرژا، بە چاوێکی قیزو ئافەرینەوە تەماشای مامی کرد و گوتی :«سمێڵ زەلام پێت وایە هەرتۆ غیرەتت هەیە؟ من نارۆم.»
دوو پیاوی زەلام کە هەرتک لاچاێنگیان سپی‌بوو، بێدەنگ بوون و قسەیان نەدەکرد بە دوای یەکدا گوتیان:
- منیش نارۆم....منیش نارۆم..
ئەوانی دیکە کە بیست کەسێک دەبوون سەریان بەرداوەوە هیچیان نە دەگوت.پاڵەوان میکێلس ڕووی دەوان کردو گوتی:
-کاتێکی زۆرمان نیە. ڕۆژ وەدرنگی دەکەوێ. ئێوەش قسەی خۆتان بکەن. دەتانەوێ بڕۆن، یا دەمێننەوە. هەمووتان ئازادن. ئێشەلا خۆشبەخت دەبن. کراسوگئورگیس شتێکی بە سرتە بەوەی پەنا خۆی گوت. پاشان دەستی بە سنگیەوە ناو هەستا بەدەنگێکی گیراو گوتی: . برایان لێمان ببوورن. ئاخر ئێمە خوشکمان هەن دەبێ بەشوویان بدەین. منداڵی‌چوکمان هەن، ژنمان هەیە، جگە لەوەش بە مردنی ئێمە کەس قازانج ناکا. کە وابوو ئێمە دەڕۆین.
ماستراپاسیش گوتی :«برایان بمان بەخشن، ئێمەش دەڕۆین.»
پاڵەوان میکێلس هەستاو گوتی: «بەخێر چن برایینە، بە سلامەت. خودای من شاهیدە دڵگیر نابم. سلاوی من بە ژیان بکەیێن! بەلام زووتر وەرێکەون و یەک یەک بە خشکە بڕۆن تا نەکەونە بەر سێرەی دوژمن. زووبن، تا نەبوتە ئێوەڕۆ.»
هەر بیستیان تێکڕا گوتیان: بمان بەخشن، خوا بتابەخشێ.
پاڵەوان میکێلس گوتی :«ئێوە بەخشراون و لەعنەت لەو کەسەی خەراپەتان دەڵێ. ئێشەلا بە سلامەت دەچنەوە.»

ئەوانەی مابوونەوە شەش[1] کەس بوون. پاڵەوان میکێلس تەماشای کردن وگوتی :

ـ باشە ، ئێستا ئێمە حەوت کەسین. هەر ئەوەندە بەسن. بەڵکو زۆریشن. ئاقڵ حوکم دەکا کە ئێمەش بڕۆین. بەڵام دڵمان ناهێڵێ بڕۆین. کە وابوو نارۆین.

١ - لە ئینگلیزیەکەدا نووسراوە: پێنج کەس مابوونەوە لە گەڵ پاڵەوان میکلس کە گوتی ئێمە شەش کەسین. «وەرگێڕ»

دەمرین و خۆمان فیدای کریت دەکەین. قەی ناکا. خەڵک دەڵێ چی با بڵێن. مردنی ئێمە لە رێگای نیشتماندا لە ژیانی ئەوان بەکەلک تر دەبێ. کریت پێویستی بە باوکی باش نیە، بەڵکوو موحتاجی دێوانەی وەک ئێمەیە. چونکە دێوانە دەیکەنە ئەبەدی.

تەماشایەکی ئاسمانی کرد. خۆر هەروا بە رێگای خۆیدا دەهاتە پێش. دیسان گوتی:

ـ باشە ئێستا دەست دەنە تفەنگان، لەجێیەک مەمێننەوە. مەتەریزان بگۆرن، دوژمن نابێ بزانی کە ئێمە حەوت کەسین. بە ناوی مەسیح . راست لەوکاتەدا پلاو دەبوون و فەرماندەیان لە پشتی مەتەریزدا بە جێ دەهێشت، دەنگی لاقێک هات و سەروکەللەی کساسی دەرکەوت. پاڵەوان میکێلس ئاوری دایەوە ، دیتی و بانگی کرد :

ـ ئەوە کێیە، سەرت دانوێنە گوللەت وێنەکەوێ. داوەرە بزانم تۆکێی ؟

ـ برازاتە پاڵەوان میکێلس، کساسی برازاتە.

پاڵەوان نێوچاوانی تێک نا و هەستی کرد دەبێ ئەو دیدارە بەچ نیازێک بێ؟ بە لاتاو گوتی:« بەخێر هاتی! کارت بێرە چبوو؟ »

رێوی چکاری بە بازارە ؟

کساس لێوەکانی گەست. تا لەتورەبووندا قسەی ناشیرین نەکات. بزەیەکی تاڵی هاتە سەرلێوان و گوتی :

ـ نە من رێویم و نە ئێرەش بازارە . من پیاوم و برازای تۆم پاڵەوان میکێلس!

ـ پیاو ئەو کەسەیە شەڕ دەکا و هیچی تر. ئێستا لەکن من لە سەر زگ راکشێ وپێم بڵێ بزانم بۆ هاتووی! بە کورتی بیبڕەوە کارم هەیە. جارێکی تر تەماشای رۆژی کردو بە هاڤالاتی گوت : «کوڕینە ئامادەن؟ تفەنگەکان عەمبار کەن و چاوەروانی ئاماژەی من بن. لە داوێنی کێو هاواری ساماتاک دەبیستران. کساس لە پەنا مامی درێژ بوو، بە کەلێنی بەردانێدا چاوی بە رێزی عەسکەری تورک کەوت کە لە چیا سەر دەکەون. چیا لە پەپاخ بەسەران سوور هەڵگەڕا بوو.

پاڵەوان میکێلس لە کاتێکا دەیروانیە عەسکەری تورکان، بە برازای گوت:

ـ باشە، قسە بکە، بۆ هاتووی؟ کێ تۆی ناردوە؟ کساس لە وەڵام دا گوتی : « کریت »

پاڵەوان تورە بوو بە بۆڵە بۆڵ گوتی :

ـ قسەی بێجێ مەکە مامۆستا ! رک و راست قسە بکە و جارێکی دیکەش مەڵێ کریت منی ناردوە. کریت منم. کساس گوێی دابوە قسەکانی مامی و تەماشای دەکرد. ئەو تێگەیشتبوو لە گەڵ چ کابرایەکی کەللە رەق بەرەو روو بوە. دەمە تەقە لەگەڵ ئەو فایدەی نیە. جابۆچی خۆی

سوک بکاو بپارێتەوە. مامی بڕیاری خۆی دابوو. خۆداش نەیدەتوانی پەشیمانی کاتەوە.

دڵی پڕ لە قینی کساسی وەلێدان کەوت. ئێستا ئیتر لە بەکار هێنانی وشەی قوڵبەر زبرەکانە شەرمی دەکرد.

پاڵەوان میکێلس بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، گوڕاندی و گوتی:

- باشە کەوابوو لێرە چدەکەی؟

کساس بە کەللە شەقی وەڵامی دایەوە گوتی :

- هیچ ! ئیتر نەمدەویست ئەم وشانە بە سەر زماندا بێنێ کە لە مێشکمدا کۆی کردبوونەوە.

پاڵەوان میکێلس بە هەوایەکی گاڵتە جار گوتی :« کەوابوو هاتبووی مامت ببینی بارەکەڵا... »

- هەڵێ هاتم تۆ ببینم و پێت بڵێم کە سیفاکاسی پیر بە ڕەحمەت چوو.

پاڵەوان میکێلس تفەنگەکەی لە عەرزی داناو نیشانەی خاچی کێشاو گوتی :

- خوای لێ خۆشبێ. ئەو کرێکارێکی بە شەرەف بوو. باشی کار کردو موچەی باشی وەرگرت. ئێستاش چۆتە خەوی ئەبەدی.

زۆر باشە ئێستا ئیتر برۆ بە سلامەت. ئێمە لێرە شەر دەکەین .

- پەیامێکت نیە ؟

- گوتم برۆ بە دوای کاری خۆت دا.

- بۆ ژنت بۆ کورت ؟

- دەمارەکانی پاڵەوان ئەستور دەبوون و بەری چاوی تاریک دەبوو. دەستی گەورەو بە باروت و خویناوی درێژ کردو لە سەرزاری برازای داناو دەم و چاوی بە خوێن و باروت کرد، پاشان نەڕاندیو گوتی :

- بە هومێدی خوا برایان ، ئازادی یامەرگ ' سێبەری گرت و کردی بە تەڵە.گرمەی تفەنگان لەچیا دەنگی دەدایەوە.

لە نەکاو گوللە باران لە لایەن تورکانەوە دەست پێکرا. ریزەی گوللە حەشری دەکرد. دەنگی تۆپێک هات و گوللە تۆپ لە پشت سەری پاڵەوان میکێلس وەعەرزی کەوت. گوللە عەرزی دڕی و بەردی ڕەحەوا خست. نەڕەتەیەکی بە سام هات. کاپامیس لە سەر گاشە بەردێکی خلۆر بۆوە و لە بەر پێی پاڵەوان میکێلس وە عەرزی کەوت. یەک دوو جار زاری لێک کردەوە کە شتێک بڵێ، بەڵام شەپۆلێکی خوێن دەنگی لە گەرووی دا خنکاند.

لە خوارەوە شەیپوورچی تێیان توڕاند. عەسکەری تورک دەیان نەڕاند وەدەرویش لە کاتێکا ئاڵای پێغەمبەریان هەڵگرتبوو، کەوتبوونە پێش لەشکری.

تێئودوریس هاواری کرد :« بە کۆمەڵ دەسرێژیان لێ بکەن و ئەو سەگانە بکوژن. دەنگی لەشکر کە دەهاتە پێش پتر دەبیسرا. پاڵەوان میکێلس غاریدا کە کاپامیس بگرێتە باوەش، دە کساسی هەڵەنگوت کە لە سەر زگ ڕاکشابوو. تووڕە بوو گوتی :« تاخ تۆ هێشتا لێرەی ماموستا ؟ برۆ بە دوای کاری خۆت داو خۆدەکاری پیاوان هەڵمەگرتێنە».

کساس نەدەبزوت. بە ڕوومەتی خوێناوی لە کاتێکادڵی توند لێی دەدا، گوێی هەڵخستبوو. بابی ئەو شەرکەرە ئازایە. باپیرو کریت، لە هەناویدا وەخەبەر هاتبوون. هەوەڵجار نەبوو کە ئەو

بەشەڕ دەهات، بەڵکوو ئەم شەڕە لەپێش هەزار ساڵ دەست پێکرابوو، ئەو هەزار جار مرد بوو، زیندوو ببۆوە. پاڵەوان میکێلس هاواری کرد :

- ئەی برایان دێری ئارکادی وەبیر بێننەوە. تا هەناسەی دوایی دەبێ پیاوانە بێنینەوە. دەنگی پشروی بە تاڵوکەی عەسکەری تورک دەهات وەنیزیک دەکەوت. میستیکری هاواری کرد : هەموومان فەوتاین ! ئیئودوریس دەنگی دا : بێدەنگ بە .!

خوێن لە نێو چاوانی دەهاتە خوار و دەچوە دە چاوانی و هیچی نە دەبینی. چاوی بە سەردەستەی پاک کردەوە، لە پڕ تورکی لە پێش خۆی دیت. تفەنگی فڕێدا و هاواری کرد :

- کورینە ئیتر تفەنگ بە کار نایە. هەڵکێشنە خەنجەران. خەنجەری هێنا دەرو دەروێشێکی پەلامار دا کە لە هەرای شەڕ گەرم داهاتبوو، لە دەستەی خۆی تاق کەوتبۆوە. تەوەرزینی بەدەوری سەریدا هەڵدەسوڕاند و دەهاتە پێش. ئیئودوریس گەیشتبوە دەروێش کە گوللەیەکی وەسەر دڵی کەوت و تخێڵ بوو. لە پشت پاڵەوانانەوە دەنگێک هات گوتی:

- ئافەرین کورینە ! بژی پاڵەوان میکێلس!

پاڵەوان میکێلس دەتکەکەی ناسی و ئاوڕی داوە. لە خۆشیان گەشایەوە گوتی : ئاخ .. باکێنش ئەوە تۆی ؟ تۆگەڕایەوە. ؟

- بە منت گوتبوو : کە باکێنشم و کردەوەشم دەبێ باکێنشانە بێ. ئێستا قسەکەت وەرگرەوە پاڵەوان .!

- من قسەکەم وەرگرتەوە برام . وەرە پەنا من . باکێنش بازدی دا کە بچێتە پەنا پاڵەوان میکێلس، بەلام ڕاست لەو کاتەدا گوللەیەک وەسەری کەوت و بە عەرزی دادا. فرمێسک لە چاوی پاڵەوان میکێلس ڕژانە خواری. مەیتەکەی دەئامێزی گرت و نێو چاوانی ماچ کرد. زارو سمێڵی خوێناوی بوون.

هەناسەی سەربازانی تورک لە دوورەوە دەبیسرا. پاڵەوان میکێلس ئاوڕی داوە، کسماسی دیت، بە سەری خۆی داداوهاواریکرد :

- برۆ... تا کات هەیە رابکە ..

- نە خێر من ناڕۆم ...کسماس ڕاست بۆوە، تفەنگ و فیشەکدانی کاپامیسی دەست دابوو لەمەی لە پشتی کردەوە.

پاڵەوان میکێلس بە سەر سوڕمانەوە تەماشای کردو گوتی :ئ کەوابوو تۆ ناتەوێ بڕۆی ؟!

- نا... نەخێر ناڕۆم ... ڕوخساری پاڵەوان بروسکی دا. سەری کسماسی دە باوەشی گرتو هاواری کرد:

- سلاوت لێ بێ برازای من کە وابوو تۆش خۆت فیدادەکەی؟ ئاخ .. ئەی کریتی ئەبەدی .

دەنگی هەورە تریشقە هات. بایەکەی خەست هەڵیکرد و ئاسمان لە هەوڵی سەبێنۆوە گرژ ببوو. ڕەنگێکی بە ترسی گرتبوو. لە دوورەوە چەند قەلە ڕەشە دەیانقڕاند.

میستیکری ڕاست بۆوە، لەوە پەشیمان بوو کە ئاوێک ترسا بوو. ئێستا مەرگ لە بەر چاوی دیاردەیەکی پیرۆز بوو. بەڵێ مەرگ، مەرگە هەمور شوورەییەک دەشواتەوە. نیشانەی خاچی کێشار قەمەی لە کالانی هێنا دەر و هاواری کرد :

ـ ئازادی یا مەرگ !

لە کاتێکدا لە مەتەریز دەر دەپەڕی، دەستەیەک عەسکەری پەلامار دان کە لە چیا سەر دەکەوتن. پێنج شەش تورک دەوریاندا، مستەبگری بە گژیان داچوو. کوشت و کوشتار دەست پێکرا، زۆری پێنەچوو، تورکی دیکەش گەیشتن. تورک لە عەرزیان دا، دەروێشێک چۆکی لەسەر سینگی داداو وەک بەران سەری بڕی.

پاڵەوان میکێلس کە چاوی لەو کارەساتە بوو، هاواری کرد:

ـ کەس لە مەتەریزی خۆی نەیەتە دەر. بە کۆمەڵ تێکرا دەسرێژ بکەن. بەڵام ئێستا لە دوو کەس پتر نەمابوون. ئەوانیش هەر ئەو دوو پیاوە زەلامە بوون کە لاجانگیان سپی ببوو. هەرتک لە پشت گاشەبەردان چوو بوونە دەمەتەریز و بێ ئەوەی خۆ بزێون، سێرەیان لە تورکان دەگرت و گوللەیەکیان بە فیڕۆ نەدەچوو.

پاڵەوان میکێلس هێدی و ئارام لە مەتەریزی خۆی دانیشتبوو. هەر تورکێکی سەری وەدەر نابایە وەسەر یەکی دەکێڕا. گوللەیەک لایەکی ڕوومەتی بردبوو، گوللەیەکیش ڕانی کون کرد بوو. خوێن لە بەدەنی دەچۆڕاوە. بەڵام هەستی بە ژان نەدەکرد. جاروبار تەماشای برازای دەکرد کە لە پەنای ئەو شەڕ دەکا.

هاواری کرد : « ئافەرین برازای من . بە ڕاستی بابت زیندوو کردەوە. بە خێر هاتی ئەی کۆستاراسی برام !

کسماس کە لە جامی فیز سەر خۆش ببوو، گوتی « سڵاوت لێ بێ ئەی مامی من !

ئیتر نەدەناسراوە. خۆشیەکی لە وەسف نەهاتوو هەموو لەشی داگرتبوو. هەستی دەکرد کە سووکتر بوە. لە ڕاستیدا هەر لەو کاتەدا کە بۆ نیشتمان گەرا بۆوە، ئیتر بیری لە هیچ شت نەدەکردەوە. دایک و ژن و کوری لە بەر چاوان ون ببوون. بێجگە لەو ئەرکی پیرۆز و قەدیمی هیچی بۆ نەمابوو. لە کاتێکدا تەماشای تورکانی دەکرد، دەینەڕاندو دەیگوت :

ـ ئازادی یا مەرگ ... ئازادی یا مەرگ ...جگە لەوە شادی و ڕەنج و هەموو هەستێکی دیکەی ئەبوو.

لە پڕ هەوا تاریک بوو، بە فڕ بە پێدەنگی دەستی بە بارین کرد. تەپەڵی ڕۆژ لە پشت هەورە سوورەکان ئاوا دەبوو. لە پڕ دەنگێک بانگی کرد: « ها ئەی پاڵەوان میکێلس ، لە ئاسمانم دەوبستی و لە عەرز کەوتیە بەر چنگم. میژەری کەسکی مەلای شاری کاندی لە پشت گاشە بەردێک وەدەر کەوت.

پاڵەوان میکێلس لە کاتێکدا سێرەی لێ گرتبوو گوتی : « حاجی سڵاو.. وەرە خۆش هاتی ئەوەی گوت و گوللەیەکی لە ژێر چەنەگەی مەلای دا. خوێن فڕکەی کرد دەتگوت مەشکەی شەراب دراوە.

سەربازی تورک وەسەر مەتەریزی ئەو دوو پیاوە لاجانگ سپیە کەوتن و لەتو پەتیان کردن. پاشان ڕوویان کردە ئەو مەتەریزەی کە تەنیا ئەو دووشۆڕشگێڕەی تێدا مابوون. تورکێکی زەلام کە دەرەجەی لەسەر شانی بوو هاواری کرد:

ـ مە هێلن دەرچن ، سەریان ببڕن .

ئەو تورکە قامچێکی درێژی بە دەستەوە بوو لە پشتی سەربازانی دەدا عەسکەری تورک هێرشیان بۆ سەر مەتەریزەکە دەست پێکرد.

پاڵەوان میکێلس رووی کردە کساس و گوتی :

- مەترسێ برازای من. بیر لە تەجاتی ئێمە ناکرێتەوە. بژی کریت.!

هەر تک هەڵیان گێشا خەلجەوان و هێرشیان برد. بەفر تەرمی کوژراوەکانی دادەپۆشی، پەپاخی سوور سپی دەبوون.

دوو سیسارگە کەچەڵە لە ئاسمانێ وەدەر کەوتن و بۆ لای ئەوان دەهاتن. لە حەوا دەسوڕانەوەو کەلاکیان بۆن دەکردن.

لە جەنگەی شەڕدا مام و برازا لێک جیا بوونەوە. عەسکەری تورک کساسیان گەمارۆ دابوو. تەن بەتەن بە شەر دەهاتن. لەهەموو لاوە هەر خەلجەریوو دەوەشا. پاڵەوان میکێلس کە براکەی لە مەترسیدا دیت، چەند کەسێکی لێ کوشتن کە گەمارۆیان دابوو. بە هاوارێوە چوو بانگی کرد :

- خۆ بگرە برازای خۆشەویستم گەیشتمێ.

یەکێک لە تورکەکان لە کاتێکا سەری براوی کساسی بۆ داوێشت، بە لاتاو بانگی کرد:

- ها بیگرە ، ئەوە دیتە خزمەتت...

پاڵەوان میکێلس دەستی درێژ کرد و سەری براوی کساسی لە حەوا گرتەوە و وەک ئاڵا بەرزی کردەوە . رووناکیەکی وەحشیانە سەرو چاوی رووناک کرد. داخوا ئەو شادیەی ئەو غەیرە ئینسانی، یا مەلەکوتی، یا بەرهەمی کەللە رەقی و یا یەکەم زانینی مەرگ بوو ؟ داخوا ئەڵێنی بێ پایانی کریت بوو ؟

پاڵەوان میکێلس سەری براوی کساسی زۆر بەرز کردەوەو هاواری کرد :

- ئازادی یا.....

بەڵام بۆی تەواو نەکرا. گوللەیەک وەزاری کەوت و یەکی دیکەش مێشکی بڵاو کرد. پاڵەوان میکێلس بە سەر پشت دا کەوت و مێشکی بە سەر بەردەکاندا پەرش و بڵاو بۆوە.

«تەواو»

## نوسراوەکانی وەرگێڕ:

١ - کاروانێک لە شەهیدانی کوردستانی ئێران
٢ - وەلامێک کوردی و فارسی
٣ - لە دەوری ڕێکخراوی لاوانی حیزبی دیموکرات کۆ ببنەوە
٤ - ڕەخنەو لێکۆڵینەوەی کتێبی جوسێنی مەدەنی
٥ - پەروەی شەڕی پارتیزانی
٦ - چەند قسەیەک لەگەڵ خەبات
٧- کوردو فەرهەنگی بێگانە.
٨- لێکۆڵینەوەی کورتەباسێک لەسەر سۆسیالیزم (کوردو فارسی)
٩- تایبەتی کۆنگرەی شەشەم.
١٠ کۆماری دیموکراتی کوردستان یا خودموختاری؟
١١- یادی هێمن.
١٢- لە پێناو چی‌دا؟
١٣- لە بیرەوەریەکانم: بەرگی ١، ٢، ٣، ٤، ٥، ٦، ٧.
١٤- یادانەوە.

---

## بەرهەمەکانی کراون بە کوردی:

١- دایک- مارکسیم گورکی.
٢- ژیان و کردەوەکانی لێنین.
٣- ئەفسانە کوردیەکان- ڕۆدێنکۆ.
٤- زەوی بچووک- برژنێف.
٥- مەسەلەی کورد لە پارلەمانی سوید.
٦- کۆمەڵە چیرۆکی هەڵبژاردە لە ئەدەبی بێگانە.
٧- باسەی پتچینەی تاهووری سۆسیالیستی.
٨- حەمە چکۆل (ئینجە مەمەد)- یاشار کەمال.
٩- نوسولی سەرەتاییەکانی فەلسەفە- ژۆرژ پولیتسێر.
١٠- نامەی گوللەبارانکراوەکان.
١١- کورتە مێژووی کۆماری بولغارستان.
١٢- ڕەوشی کوردان- مێژووی بابان و ئەردەلان.
١٣- ئازادی یا مەرگ- کازانزاکیس.

## چاپکراوەکانی وەزارەت ساڵی ١٩٩٦

١-میکانیزمە بنەرەتیەکانی رستەسازی .. د شێرکۆ بابان .

٢-سەعید زەبۆکی لای خۆمان .. رۆمان .. کەمال سەعدی .

٣-البعد القومي للتغيرات في الحدود الادارية لمحافظة كركوك .. د خليل اسماعيل محمد

## چاپکراوەکانی وەزارەت ساڵی ١٩٩٧

١-کلولاش .. رۆمان .. عبدالله سەراج .

٢- مەم وزین .. علی فتاح دزەیی .

٣-پشکۆ و خۆڵەمێش .. ئازاد عبد الواحد .

٤-دەردە کورد.. حمود زامدار .

٥- باڵەبان .. وریا ئەحمد .

٦-چیرۆکی فۆلکلۆری ..محمد رشدی دەزیی .

٧-کوردستانی خوارووی رۆژ هەلات .. د. رشاد میران .

٨-ووشەو زارەوەکانی باباتاهیر .. د. محمد نوری‌عارف .

٩-حەمەدۆک .. یەشار کەمال

١٠- کورتیەک ژ دیروکا ئەلیانوسا ..د. بێوار خنسی

١١-رۆمانی درز.. کەکە مەم بۆتانی .

١٢-میکانیزمەبنەرەتیەکانی رستەسازی .. د. شێرکۆ بابان

١٣-أرض الاجداد.. شعر .. سرياني .. كوركيس يوسف

١٤-کورسی کورسی .. نەجات رەفیق حلمی .

١٥-ئولو فەلسەفەیا زەردەشت .. میر ئال زیلانی

١٦-ئەفسانەی تۆفانی سۆمەری .. نەجم خالد ئەلوەنی .

١٧-دەروێشی عەبدی .. شاکر محمدأمین رۆژبەیانی .

١٨- مەولودنامەی کوردی .. محمد رشاد مفتی .

١٩-کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلام .. حەمە کەریم عارف .

٢٠-تاریکستانی لم .. سەلاح عومەر .

٢١-ئازادی یا مەرگ .. کەریم حسامی .

ژمارەی سپاردن بەکتێبخانەی نیشتمانی

ژمارەی ( ٣٥٩ ) ساڵی ١٩٩٧ ی دراوەتێ

چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیری / هەولێر

